رۆمانی

چیرۆکی دوورگە( 2 )

# ئاوخواردنەوی مێرووله

یاشار کەمال

بۆ کوردی: ڕێباز مستەفا

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

هەولێر - 2012

## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **ئاوخواردنەوی مێرووله**
- نووسینی: یەشار کەمال
- وەرگێڕی کوردی: ڕێباز مستەفا
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- بەرگ: هۆگر سدیق
- چاپی یەکەم: ٢٠١٢
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٦٠٠٠ دینار
- چاپخانە: خانی (دهۆك)
- ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٦٦)ی ساڵی ٢٠١١ پێدراوە.

**زنجیرەی کتێب (٦٣٤)**

**ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی**
**رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە**
**www .Kurdchap.com**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# بەشی یەکەم

بەلـەم ئـارام لـەنێو تـاریکی شـەودا هاتـەدەر، رەنگـی دەریـا سـپی بـوو، ئـەو ئەسـتێرانەی کـە لێکلێکـە لەئاسمانـەوە سـەرەوژێر دەبوونـەوە، لـەنێو تۆپـەڵێك رۆشنایيدا دەرژانە نێو دەریاوە، لەو ئانەدا، لەپشت تەمێکی تەنکدا، بتەوێت یان نا، دوورگەیەك بەدیارکەوت، بەلەموان بەهێمنی سەوڵەکانی خستنە نێو ئاوی دەریاکەو ماوەیەك ئاوا مایەوە، ماندووو لێبڕاو سـەیری دەوروبـەری دەکـرد. سێ ماسـی، یـەك دوای یـەك لەئاوەکـە قەڵـەمبازیان دا، هەرسـێکیان لـەنێو رۆشـناییێکی پەمەیـیدا دەدرەوشانەوە، دەنگی سێ باڵندە، پەیاپەی لەسێ لاوە دەکەوتە بەرگوێ. لـەو دەمـەدا رەنگی دەریا ئەرخەوانی هەڵگەڕا.

بەلـەموانی مانـدوو، گیـانی هاتەوەبـەرو سـەوڵەکانی خسـتنەوەکار. دەریـا زیـاتر سـپی بوو. بەلەموان بەسەوڵلێدانەوە بەنێو رۆشناییێکدا تێپەڕی. دوندی چیای بەرامبەر روون دەینواند. هێڵێکی سووری زۆر باریك تا دەهات کاڵتر بـووەوەو لەبەرچـاویدا بـاڵی لێکـداو رۆیشت. بەلەموان کە نوقمی نێو سەرسامی بووبوو، دووبارە سەوڵەکانی دانانەوە.

کوریکە سوورەی باخچەی هـەنارانی کـەلی دوورگـە لێـواری دەریایـان داپۆشـیبوو. سێ ماسی یەك بەدوای یەك لەنێو ئاو هاتنەدەرو قەڵـەمبازیان دا، هەرسـێکیان وەکـو هێڵێکـی سوورباو درەوشانەوەو لەبەرچاوان ون بوون. شنەبایەکی سـەحەری لـەلای لێـوارەوە بـۆنی نەرمو وروژێنەرانەی دەریای لەگەڵ خۆدا هێنـا، کـە لەگـەڵ بـۆنی گیـاو پـووش و پـەلاش و گەڵای چای دوورگەو گوڵان ئاوێتە بووبوو.

بەلەم کە دەتگوت کەسی لەنێودا نیە ئاوا بەخولانەوە تا لێوارەکە چووە پێش، چیوای نەمابوو نووکی بەلەمەکە بـەزنارەکانی لێـوار بکێشـێت کـە بەلـەموان هاتـەوە سـەرخۆی و لەشوێنی خۆی هەستا. بەلـەم، نـەرم نـەرم، دەلەنگیـەوە. دەریـا کەوتـە شـەپۆلدان. چـیای بەرامبەر شین هەڵگەڕاو خـۆری سـوور، کـە لـەتێکی لەکـەلی چیاکە دەرکـەوتبوو، لەپشت هالاوی ئاوی دەریاکە مابووەوەو ئاوا دەتگوت لەنێوەڕاسـتی دەریـادا نیشـتۆتەوەو لەکـەنار

پیرەدارێکی گەورە دەلەرایەوە، ریزی خانووەکان لەنێو تاریکایی گورگەمێشدا، لەودیو تەمێکی تەنکدا دەردەکەوتن‌و ون دەبوون‌و لەبەرچاوان گەورەو بچووک دەبوونەوەو تەپۆلکەی ئەولای خانووەکان دیمەنێکی خەیاڵاوی هەبوو.

تەوژمی لەسەرخۆی ئاوەکە، بەلەمی بەهێواشی لەلێوار هەلگرت‌و بۆ ناو ئاوەکەی کشاند، بەلەم هەندێکجار بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە. بەلەموان لەحاڵەتێك دابوو کە ئەگەر شەپۆلێکی بچووکیش تەکانی دابا، دەکەوت.

نوقمی نێو خەیاڵ بووبووو بەهیچشێوەیەك نەیدەتوانی بەسەرخۆیدا زاڵ بێت. هەندێك تروسکایی تێکەڵ‌و پێکەڵ دەکەوتنە پێش چاوانی‌و دەبوونە تۆپەڵێك رۆشنایی‌و چاوەکانی دەزووراندنەوەو تۆپەڵە گولّی شۆڕبووەوە بۆ لێوی ئاوەکە هەندێکجار دەردەکەوتن‌و هەندێکجاریش لەبەرچاوان ون دەبوون.

ماسیەکان لەنێو شەپۆلی دەریا هەڵبەزو دابەزیان بوو. دەوروبەر هەندێکجار رۆشن دەبووەوەو تا مۆخی ئێسقانی رۆدەچووە نێو رۆشنایی‌و دەهاتەوەدەر، پاشان دەچووەوە نێو دڵی تاریکی‌و یەکسەر دوای ئەوە هەموو لایەك رەنگی شینی دەگرتەخۆ، لەو کاتانەی کە هەموو لایەك نوقمی نێو رەنگی شین بووبوون، کەمێك ئەولاتر سێ ماسی بەپوولەکەی درەوشاوەیانەوە، یەك دوای یەك لەئاو هەڵبەزینەوە. شنەبایەکی نەرم هەڵیکردو ئاوی دەریا لۆنگی دا.

بەلەموان، نوقمی نێو خەیاڵ، بەلەمەکەی بەرەو لای چەوو لی خوار هەڵدێرگەکە کشاند. چووە سەر هەڵدێرگەکەو لەباخی هەناران وەژوور کەوت. باش شارەزای باخی هەناران بوو. زەردەواڵە لەسەر گولان هەڵنیشتبوون‌و دەنگی وزەوزیان لەو ناوەدا دەزرنگایەوە، لەگەڵ بینینی ئەو زەردەواڵە وزەوزکەرانە بەباڵە درەوشاوەو لەرزانەکانیانەوە هاتەوە سەرخۆی، بەڵام لەماندوویێتیان خەریك بوو دەمرد. بەشێوەیەك کە ئەگەر کەمێکی دیکە بەپێوە مابایەوە خۆی پێڕانەدەگیراو دەکەوتە ئەو گۆڕە. سێ مەلی هەنجیرخۆر دروست بەسەر سەریدا تێپەڕین‌و بێئەوەی بزانێت لەکوێوە هاتن، دوورکەوتنەوە. ئەو بایەی لەسەر پشتەملی خۆی هەست پێکرد، کە لەباڵی مەلە هەنجیرخۆرەکان بەجێما. رەنگی زەردباوو درەوشاوەی بێهاوتای ئەو باڵندانەی لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ هەڵدەفڕین‌و دەنیشتنەوە، دڵی مرۆیان تەسکین دەدا. هەموو ترس‌و نیگەرانیەکانی دەروونیان وەلاناو ناخیان پاك‌و ئارام کردەوە. هەنگاوی یەکەمی هەڵێنا،

بەڵام هەر کە ویستی هەنگاوی دووەم هەڵێنێت, ئەژنۆی شل بوونو راقەنایە ئەو گۆڕە، دەمانچەی بەر پشتی کە لەگەڵ بەربوونەوەی کەوتبووە ژێریو ئازاری پێگەیاندبوو، کەمێك بۆ پێشەوە راکێشاو یەکسەر خەوی لێکەوت.

هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو کە ڤاسیلی بەلەمەکەی لەنێو دەریادا بینی.... سەوڵەکان بەئارامی بەرز دەبوونو نەوی دەبوونەوە، هەندێکجار بتەوێت نەتەوێت لەنێو شەپۆلە رەنگاوڕەنگەکانی دەریادا لەبەرچاوان ون دەبوو، هەندێکجاریش ماوەیەکی زۆری پێدەچوو دیسان بەدیار دەکەوتەوە.

ڤاسیلی کترێکەی لەئاوی کانیەکە پڕکردو داینایە سەر ئاگر، ئاگری نێو گۆڕکەکە نێڵەنێڵی بوو.

یەکەمجار لێنا لەماڵێ هاتەدەر، ئینجا پویراز موسا. پویراز زۆر بەسەیری تەمەشای ڤاسیلی کردو گوتی: "ڤاسیلی ئەمڕۆ تۆ جۆرێك دێیتە بەرچاو".

"چۆن دێمە بەرچاو؟"

"ئەمڕۆ سەیر دیاریت".

"لەتاریكو روونـدا پێموابێت بەلەمێکم بینی.. خەریك بوو بۆ ئەملایە دەهات. پاشان ون بوو، چوزانم رەنگبێت لەنێو تەمەکەدا مابێتەوە".

"باشە، چی تێدایە؟"

"وەکو تۆ خەریك بوو دەهات".

سەوڵەکانی نزم دەبوونو ئینجا دوای ماوەیەك بەرز دەبوونەوە؟ سەوڵلێدەر ماندووو داهێزراو بووبوو؟ خەریك بوو لەماندوویێتیان دەمرد؟ دەستەکانی گۆد بووبوون؟ بێخەوی بڕستیان لێبڕیبوو؟ چاوەکانی شین بوونو مووزەردو چوارشانەو چەناگەی قووڵو لووتی هەڵۆیی بوو؟، ئەگەر نەهاتبێتە دوورگە ئەی دەبێت بۆ کوێ چووبێت؟

ڤاسیلی بەیەك فڕ چایەکەی خواردەوە. هەستاو بەرەو لای ئاشە هەواییەکە چوو. بۆنێکی گرمخاو لەنێو ئاشەکە دەهات. چووە نهۆمی دووەمو لەسەر رۆخی پەنجەرە دانیشت. نە رەفتە سەوزەکە لەنێو ژوورەکە مابوو، نە رەفتە پەمەییەکە. پەرەی لووتی کەوتنە لەرزینو گەورە بوون، بۆنی سینەو بەرۆکی وروژاوو ئارەقاویش نەهات.

لەئاشەکە چووەدەر، چووە ئەشکەوتەکە، بەرلەوەی پێ بنێتە نێو ئەشکەوت، گەڕایەوەو رووەو لای هەڵدێرگەکان بۆلای باخی هەناران رۆیشت.

کوریکە سوورەی هەناران شەپۆلئاسا تروسکەو باقو بریقی باڵی زەردەواڵە پڕ سەرو سەداو وروژاوەکانی بەرەو لای دەریای رەنگاوڕەنگ سەرەو ژێر دەکرد. گەیشتە نێو باخ. هەر گەیشتە نێو باخ مارێکی شینی بینی کە خاڵی سپیی بچووك بچووکی تێدابوون و بەسەر شارە مێروولەیەکدا بۆ نێو پنجە دڕکێك خشیو لەبەرچاوان ون بوو.

ڤاسیلی چەند جارێك بەدەوری پنجە دڕکەکە خولایەوە، هەموو ئەو ناوەی بەچاوان پشکنی، لەکاتێکدا کە زۆر دەترسا پێلەقەیەکی لەپنجە دڕکەکەدا، بەڵام مارەکە نەهاتەدەر. پنجە دڕکەکانی دیکەشی لێککردنەوەو پشکنینیو تەماشای کردن، شوێنەواری مارەکەی بەدینەکرد، ماری شینی خاڵدار ئیدی ون بووبوو!

لەهەڵدێرگەکە هاتەخوارو بەرەو لێوار رۆیشت. خوار هەڵدێرگەکان لەهەندێك شوێن بەدرێژایی سێ تا چوار مەترو لەهەندێك شوێنیش بەدرێژایی بیست، بیستو پێنج مەتر بەلم داپۆشرابوو، ماوەیەك نیگەران و نائارام بەسەر لمەکەدا رۆیشت، هاتنی بەدزی ئەو پیاوە بۆ دوورگە ئەوەی نیشان دەدا کە هەمان ئەو کەسە بێت. بەلەمەکەی لەکوێ شاردۆتەوەو لەچ کەندێك خۆی حەشارداوە؟ تا دەهات نیگەرانیەکەی زیاتر دەبووو ئەو نیگەرانیەی دەبووە تووڕەیی. پێپیلکەیەکی کەوتە بەرچاو کە لەئاوڕێژگەی هەڵدێرگەدا هەڵکەندرابوو، شوێنپێیەکیش لەخوار پێپیلکەکە دیاربوو، شوێنپێیەکە تا کلکەی هەڵدێرگەکە درێژبووەوە، هەم ترساو هەم کەوتە وروژانیش. رۆشناییەك خزایە ناخیەوە. دیمەنی کوریکە سوورەی هەناران لەدەریای دەداو سێبەرو رەنگدانەوەی سووربا و دیسان بەسەر بەردەکان دەلەرایەوە، کاتێك خەریك بوو لەکلکەی هەڵدێرگەکە دەگەڕایەوە، لەپڕ بەلەمەکەی بینی، بەهاوارکردنێکەوە گوتی: "لێرەیە"بەرەو ماڵ، بەسەر لمو چەوەکەدا پێی پێوەنا، کاتێك بەسەر ئەو بەردانەی کە پنك پنکی سووریان پێوەبوو بەسەردەکەوت، چاوی بەگوڵێك کەوت، رەنگە وەنەوشەییو شینباوەکەی دەدرەوشایەوە.

کاتی خۆی کە لەچاناك قەلاش، دوای نەبەردێکی سەخت لەنێو کەندڕێکی پڕ لەچەمەن راکشابوو، گوڵێکی وای بینیبووو نوقمی نێو تەماشاکردنی بووبوو، لەو ئانەدا گوللە تۆپێك لەنزیکیەوە زرمەی لەعەرد هەڵسااندبووو ئەو ناوەی هێنابووە لەرزەو دەنگی ناڵەو نووزەو نرکەنرکی برینداران بەرز بووبووەوە، لەو نێوەدا دەست، پێ، کەللەسەر، پارچەو تیکەتیکەی جەستەو خوێنی مرۆڤ بەو ناوەدا پەرش و بڵاوبووبوونەوە، ڤاسیلی ماوەیەك لەنێو تاریکیدا ون دەبێتو گوڵە شینباوەکە لەنێو

ڕۆشـناییەکی سـەیر گـەورەترو قەبـەتر بووبـوو، ڤاسـیلی کاتێـك چـاوی هـەڵێنابوون کـە سوورایی خوێنی قوڵی لەگەڵ ئەو ڕۆشناییە وەنەوشـەییو شـینباوە تێکـەڵ بووبـوو، دوای ئەوەش خوێنێکی سووری بەدی کردبوو.

ڤاسیلی گوتی: "دۆزیمەوە. دۆزیمەوە. ئیدی دۆزیمـەوە. بەلـەمی ئـەو پیـاوەم بینـی کـە هاتۆتە دوورگە. لەسەر چەوو لمەکان.. خۆیەتی".

"بەچی دەزانی ئەمە هەمان ئەو کەسەیە؟"

"ئەگەر ئەو کەسە نەبێت ئەدی چما ئاوا بەدزی دێتە دوورگە؟ ئەوم بینی تەواو وەکو تۆ بەترس‌و دڵەڕاوکێوە سەوڵی لێدەدان. دەریاش سپی سپی بووبوو، پاشـان ڕەنگـاو ڕەنـگ بوو. سەرم لەئاشیش دا لەوێ نەبوو".

لێنـا گـوتی: "دیـارە خۆیـەتی، دڵـم ئاگـای دەدات کـە لـەم ڕۆژانـە دێـت... لەخەویشـدا بینیم.. تاناسیشم بینی رایکردبوو".

پویراز موسا تەنها بەتەڵخیەوە پێکەنی.

تفەنگەکانیان هەلگرتن‌و بۆ دۆزینەوەی کابراکە وەڕێکەوتن. "ئەگەر تۆزقاڵێك عەقڵی لەسەر دابێت خۆی لەباخی هەناران ناشارێتەوە"

پویراز بێدەنگ بووو بیری دەکردەوە.

ڤاسیلی لەپێشەوەو ئـەویش بەدوایـدا لەتەپۆلکەکـە وەسـەرکەوتن‌و لەسـەرەوە هـەموو دوورگەیان خستە ژێر چاودێریەوە.

ئەگەر کابرا بهاتبایەتە ئەسکەلە، لێنا هەرچۆنێك با نەیدەهێشت بڕوا.

"ئەشکەوتەکە..".

ڤاسیلی گوتی: "بینیم".

سەرەنجام بەرەو باخی هەناران ڕۆیشتن. کە گەیشـتە بـاخی هـەناران تـەواو هەسـتیان لەخۆیان بڕی، تەنانەت بەچرپەش لەگەڵ یەك نەدەدوان.

ئارامو بێسەدا باخی هەناران گەڕان، باڵندەیەکیش باڵی لێکنەدەدا. فەزای نێو بـاخ پـڕ بوو لەزەنگەسوورە، ئەو زەنگەسوورانەی کە باڵە ڕەنگاوڕەنگـەکانیان دەدرەوشـانەوە. مـارە شـینە خاڵدارەکـەیان لەپشـت دارهـەنارە پیرەکـە لەبەردەمـدا قـووت بـووەوە، لەسـەرەخۆ بەرەو بـەردەکانی لای هەڵدێرگەکـە دەڕۆیشـت. وەك بڵێیـت کـەمێك لەسـەر هەرێزەکانـدا هەڵوەستەیەکی کرد، کەمێك سەری بەرزکردەوەو سەیرێکی کردن.

پویراز بەهیواشیەوە گوتی: "ڤاسیلی، هێلانەی پەڕەسێلکەکانت لەئاشدا بینین؟"
ڤاسیلی بەسەر سوڕمانەوە گوتی: "بینیمن".
"فەرخەکانیان فەراژی بووبوون؟"
ڤاسیلی گوتی: "نازانم، هێشتا دەنووکە گەورەو کراوەکانیان زەرد بووو هەر جیکەجیکیان بوو".
"واتە هێشتا زۆری ماوە تا بتوانن بفڕن".
"زۆر"
"مارەکان ناتوانن بچنە سەریان‌و لەنێو هێلانەکانیان بیانخۆن، وانیە؟"
ڤاسیلی بەئەدایەکی دڵنیاوە گوتی: "ناتوانن بیانخۆن".
"باشە"
پویراز هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵکێشایەوە.
تاوێك دواتر هەردووکیان یەکجێ راوەستان، پیاوەکە هەردوو قاچی لەژێر زگیدا خڕ کردبوونەوەو خەوی لێکەوتبوو، دەستێکی نابووە ژێر سەری‌و دەستەکەی دی خستبووە بان سەری.
ڤاسیلی پرسی: "چی بکەین؟"
"هیچ ناکەین".
ڤاسیلی دەمانچەکەی لەبەرپشتی دەرهێنابوو.
"ئەمە بۆ چیە ڤاسیلی؟"
ئەدایەکەی گاڵتەئامێز بوو.
"ئەدی نابینیت؟ بۆ ئەوم..".
"کێ دەڵێت ئەوە".
"چۆن ئەو نیە، تۆ قەت ئەوت بینیوە؟"
"نەمبینیوە".
"پێتوانیە یەکێك بێت لەوانەی بینیتن‌و دواتکەوتن؟"
"رەنگە".
"بااشە؟"
"تۆ تائێستا کەست لەخەودا کوشتووە، ڤاسیلی؟"

ڤاسیلی تەواو حەپەسا.

"نە، نەمکوشتوە".

"کەوایە ئەم دەمانچەیەت بخەرەوە نێو کیف".

"ئەی چی بکەین؟"

"لــەوێوە، لــەژێر ئــەو دارهــەنارە پــیرە دادەنیشــین‌و چــاوەڕێ دەکــەین تــا لەخــەو هەڵدەستێت.. بەردەممان بەردێکی گەورەی لێیە، دەیبینیت؟ "

"دەیبینم".

دانیشتن‌و پشتیان بەدارهەنارەکەوەدا.

"کەوایە مارەکان ناتوانن بەدیوارەکەدا هەڵگەڕێن‌و فەرخە پەڕەسێلکەکان بخۆن".

"ناتوانن بیانخۆن".

"کەواتە ناتوانن قووتیان بدەن. لـەلای ئێمـە مارەکـان بەهێلانـەی پەرەسـێلکەکان فێـر بووبوون".

"دیارە دیواری ماڵەکانتان ساف نەبووە".

باسێکی سەرنجڕاکێشیان سـەبارەت بەفەرخـە پەڕەسـێلکەو مارەکـان نـابووەوە. پـویراز بەنەرمیەوە گوتی:

"دەزانیــت ڤاســیلی، تــەنها لەکلــەك دەتــوانن رەگ‌و ریشــەی مارەکــان دەربێــنن. مــار هەرچەندە گەورەش بێـت". بێـدەنگ بـوو، لێوەکـانی تەڕکردنـەوەو چاوێکی بەدەوربـەری پیاوە خەوتووەکەدا خشاند.

هــەروەها بەغەلێفــەی هەنگــەکان، مێروولــەکان، ئــەو زینــدەوەرە لاکــڕەنگین‌و ئــەو خاڵخۆڵەکانەی کە لەسەر پەلکی درەختـان دەهـاتن‌و دەچوون. "دەزانیـت ڤاسـیلی لەکلـەك هەرکە مارێکی بینی هەرچەندە زۆریش دووربێت، یەکسەر بـۆی شـۆڕدەبێتەوە، تەنانـەت ئەگەر مارەکـە لـەناو گیـاو گـۆڵ‌و پنجەکانیشـدا بێـت، کلکی دەگرێـت‌و لەگـەڵ خۆیـدا بـۆ ئاسمـان بـەرزی دەکاتــەوەو لەبەرزاییـدا بەریدەداتــەوە، مــار دێتــەخوارو دەکەوێتــە ســەر زەوی‌و هــەموو بڕبڕەکــانی پشــتی لێکهەڵدەوشــێنەوەو جووڵــەی لەبــەر دەبڕێــت، ئینجــا لەکلەك دێت‌و دەیخوات.. ئێستا ئەوان بیانەوێت فەرخە پەڕەسێلکەکان بخۆن، بزانم چۆن چۆنی دەیانەوێت...!"

"دەتوانم بڵێم هیچ لەکلەکێك ناهێتە ئێروکانە".

"لەکلەکەکان دەچنە هەموو شوێنێك، مەگەر دەشێت شوێنێك هەبێتو لەکلەکی لێنەبێت؟"

"رەنگە هەبێت، ئێرە ماری زۆرە".

"لەکلەکیش زۆر دەبن".

پیاوە خەوتووەکە هەناسەیەکی هەڵکێشایەوەو خۆی وەرگێڕایە سەر تەنشتی چەپی.

"سەیر بکە خەریکە خەبەری دەبێتەوە".

"ئەگەر ئێرە ماری زۆرە، دڵنیابە لەکلەکیشی زۆرە".

ڤاسیلی گوتی: "نیە"

"هەیە"

ڤاسیلی گوتی: "باشە".

"هیچ مارێك ناتوانێت بەدیواری ئاشەکەدا هەڵبگەڕێت".

ڤاسیلی گوتی: "هەڵیشنەگەڕێت، نەشتوانێت بڕوا، فەرخەکان خۆیان لەهێلانە دەکەونەخوارێ".

"دایکیشیان هەڵیاندەگرنەوەو دەیانخەنەوە نێو هێلانەکان".

"فەرخەکان بەنووکی کراوەیانەوە چ هەرایەك دەنێنەوە کاتێك کە دایکیان لەدەرەوە دێتەوە، دایکیان کاتێك خواردن دەخاتە نێو قوڕگی فەرخەکان تا دەتوانن دەمیان لێکدەکەنەوەو دەکەنە جیکە جیکێك نەبێتەوە. وەکو منداڵانی بەرمەمکان، تۆ ئەو دەمە بیانبینە کە تەواوێك برسی دەبن، زمانی سووریان لەنێو دەمی هەڵپچڕاویاندا دەلەرزێو بەزمێك دەنێنەوە دونیا بەسەری خۆیاندا وێران دەکەن".

پویراز گوتی: "منداڵانی بەرمەمکان بەنازو نووزن"

ڤاسیلی گوتی: "بەنازو نووزن".

سەریان نایەوە بەرخۆیانو تاوێك بێدەنگ بوون. پویراز هۆیەکەی دیار نەبوو، ئاهێکی هەڵکێشاو بەشەرمو تەریقبوونێکەوە گوتی:

"منداڵە کچۆلەکان بەنازو نووزن، لەسەروچاوەکە ماسی هەیە؟"

ڤاسیلی بیری کردەوەو گوتی: "نازانم، نازانم هەنە یان نا، زەینم نەداوەتێ".

"دوورگەی کابا".

"بەهەشتە".

"دێیت بچینە ئەوێ؟"

"ئـەوێ دارزەیتـوونی زۆرە، هـەر دارزەیتـوونێکی ئـەوێ بەقـەد دارچـنارێکە، ئەگـەر بتەوێت موتربەشیان بکەیت هەر درەختێکیان پێنج سەد کیلۆ زیاتر بـەر دەگرێـت. زەوی تەختو هەمواریشی زۆرە".

"چەند سەر بزنـی لـێن؟ دەزانم، ناکرێـت ئـەو بزنـە شـینانەی خـدری زینـدە سـەلامی خوای لـێبێت سەر ببڕێنو گۆشتیان بخورێت. نابێت شیریشیان بخورێتەوە؟"

ڤاسیلی گوتی: "دەبێت ئەمە لەقەشە یان لەمەلا بپرسین".

پویراز بەسووربوونێکەوە گوتی: "دەکرێت شیریشیان بخوێینەوە. بۆ نابێت؟"

ڤاسیلی گوتی: "نازانم".

پیاوە خەوتووەکە بەپرخە پرخەوە لەم تەنیشت بۆ ئەو تەنیشت خـۆی وەرگێـڕا، زۆر سەیریش ناڵەیەکی کرد. پویراز بیریکردەوە. ئەوانـەی ترسێك هەڕەشـەیان لێـدەکات ئـاوا لەخـەودا دەنـاڵێنن. لـەپیاوە خەوتووەکـە ورد بـووەوە، تـەنها هـەر لایـەکی دەموچـاوی دەبیندرا، هەرێزەکە رۆچووبووە نێو سمێڵە زەردو راکشاوەکەی.

مـارێکی شـین کـە پنکـی سـپی پێـوە بـوون، لـەدرزی بـەردێك هاتـەدەر، سـەری بەرزکردەوەو درێژووکە سوورەکەی دەرهێنا، بـەرەو لای پیـاوە خەوتووەکـە خشـی، لـەلای قاچـەکانیەوە بـۆ لای سـەری وەرسـووڕا، بەپشـتی هەڵگـەڕا، درێژووکـە سـوورەکەی دەرهێنایەوە، یەك بەبەژنی کابرا راکشا، دەمی بردە لای گوێی پیاوەکەو بۆنی کرد.

ڤاسیلی یەکسەر دەستی دایە بەردێكو هەستایەوە. "خەریکە پێیەوە دەدات!"

پویراز پێی گرتو گوتی:

"دانیشە، پێیەوە نادات، مرۆڤ لەخەودابێت تەنانەت ماریش پێیەوە نادات".

ڤاسـیلی خـراپ وروژابـوو. بـەو بـەردەی بەدەسـتیەوە گرتبـووی دووبـارە لـەجێی خۆی دانیشتەوە".

مارەکـە بـەدەوری پیـاوە خەوتووەکـەدا گـەڕا. هەنـدێکجار رادەوەسـتا، سـەری هەڵـدەبڕی، درێژووکـە دووسـەرەکەی دەردەهێنـا، فشکەفشـکی دەکـرد، ماوەیـەك ئـاوا سـەری خـۆی بەرزدەکردەوە، ئینجا بێئەوەی لەجێی خۆی بجووڵێت سەری نەوی دەکردەوەو کەمێك دەخشی.

"یانی بزنەکانی پیرخدر ژمارەیان زیاد نابێت؟"

"مەگەر دەکرێت زیاد نەبن، کاریلەی زۆرجوانیان لێدەکەوێتەوە، گەش، شـینی مەیلـەو کاڵ، بزۆز".

"ئەگەر کەس نەیانخوات رۆژ بەڕۆژ زیاتر نابن؟ وایلێدێت لەدوورگە دەرزی هەڵاوێیت بەعەردی نەکەوێت. بەشێوەیەك مرۆ نەتوانێت هەنگاوێك چیە هەڵبێنێت".

"ئەگەر وایلێهات لەبرسان دەمرن. رەنگبێت، رەنگبێت هەر لەخۆیانەوە ژمارەیان کەم بێتەوە".

"ئەو دوورگەیە گورگو مرۆڤیشی لێنین تا بیانخۆن".

"بەشکم هەڵۆ هەبن. لەناوچەی ئێمە هەڵۆ رۆدەبنە کاریلەکانو دەیانڕفێننو بەرزیان دەکەنەوەو لەگەڵ خۆیاندا دەیانبەن".

"ناوەڕاستی ئەم دەریایە کوا هەڵۆی لێیە؟"

"ئەی چی؟"

"ژێر ئەم دەریایە پڕیەتی لەکەشتیو بەلەمی ماسیگرانو لاشەی سەرنشینەکانیان".

"چۆن...؟"

"لەبەرئەوەی ئەوانە نازانن کە ئەو بزنانە هی خدری زیندەن. هەرکە ئەو کەشتیو بەلەمانە لەدوورگە نزیك دەبنەوە، بزنەکان دێنە سەر زنارەکانو رادەوەستنو سەیریان دەکەن. سەرنشینی کەشیتیەکانیش لەنگەر دەگرنو بەخەیاڵی ئەوەی کە گۆشتی ئەو بزنانە دەرمانی زۆر دەردانە، دێن پێنج، شەش سەرێکیان لێدەگرنو دەیانبەن. هەرکە ویستیان سەری یەکەمین بزن ببڕن، لەپڕدا خدر سەلامی خوای لێبێت، لافاوێك دەنێرێتو دەریا دەکەوێتە شەپۆلانو کەشتیەکە گل دەداتو دەیخاتە ژێر ئاوەوە، هەر کەسێك دەستی لەو بزنانەی پیر خدر دابێت، هەزار مەتر دوورنەکەوتۆتەوە کە دەریا دەمی لێککردۆتەوەو کەشتیو بەلەمەکەی هەڵلوشیوە، ئێستا کەشتیو بەلەمێکی زۆری ماسیگران، بەهۆی ئەو بزنانە لەژێر ئاوی دەریا کەوتوون".

"ئەی ئەو بزنانەی کە دەگیرانو لەو کاتەدا لەنێو کەشتیو بەلەمەکان دەبوون، چیانلێدەهات؟"

"ئەوان دەرباز دەبن، خدر لەهەرجێیەکی دەریا بێت دەیاندۆزێتەوەو هەڵیاندەگرێتو دەیانباتەوە دوورگەی کابا. خوا بەسەر کەسی دانەهێنێت رۆژێك دەست لەبزنەکان بدات!"

پویراز گوتی: "دۆزیمەوە. دۆزیمەوە خدر خۆی گۆشتی بزنەکانی دەخوات. دەڵێن، گۆشتی بزنی شین زۆر بەتامە".

ڤاسیلی پرسی: "ئەولیاو ئەنبیاش گۆشت دەخۆن؟"

پویراز گوتی: "دەخۆن، ئەوان فریشتە نین، مرۆڤن، مرۆڤ گۆشتی بزن دەخوات. نەك هەر دەیخوات، لەڕاستیدا شێتی گۆشتی بزنی شینە".

مارەکە سەری خستبووە سەر قاچی پیاوەکەو لێیخەوتبوو. ڤاسیلی گوتی: "سەیربکە، سەیربکە! ئێستا کە لەخەو هەستا، خۆر بەرە بەرە خەریکە لێیدەدات، کەمێك لەشی گەرم دابێت بەخەبەر دێتەوەو مارەکەش هەر لەگەڵ خۆجووڵاندنی پێیەوە دەدات و دەیکوژێت".

"پێیەوە نادات".

"دەدات"

"تۆ چۆن دەزانیت؟ مەگەر مارگری؟"

"ئێروکانە ماری زۆرە، ژەهری ئەو مارە خاڵدارانە بچێتە لەشی هەرکەسێك یەکسەر دەیکوژێت".

پویراز هەستایەوە، بەدوای ئەویشدا ڤاسیلی... یەك، دوو هەنگاو دەچوونە پێش، پاشان یەکسەر رادەوەستان، پیاوە خەوتووەکە کە مارەکە لەسەر قاچەکانیدا پەپکەی کردبوو، دەتگوت جادووی لەوان کردووە. ماوەیەك لەنێو باخی هەنارانەدا گەڕان و دواتر هاتنەوە لای پیاوەکە راوەستان، مارەکە سەری خستبووە سەرقاچەکانی پیاوەکەو جەستە شینەکەی پان کردبووەوە، پیاوەکە خەوتبووو بەئارامی هەناسەی دەدا.

ڤاسیلی گوتی: "خۆریشی لێبدات لەخەو هەڵناستێت، سەیربکە مارەکەی چۆن گرتۆتە ئامێزو لێیخەوتووە!"

پویراز گوتی: "لێیخەوتووە".

بەرەو ماڵ بوونەوە، لێنا بەپیریانەوە هات، بەدەربڕینێکی نیگەران و ترسئامێزانە گوتی: "تا ئێستا لەکوێ بوون؟ چیتانکرد؟"

پویراز گوتی: "مارێکمان بینی".

"پەنا بەخوا، کوڕم چیتانکرد؟ ئەو دوورگەیە ماری زۆرە، هاوین دابێت دەبێتە ژاوەژاوی ماران، بەتایبەت مارێك هەیە پنکی سپی تێدان و لەبەر تیشکی خۆر دەبریسکێتەوە، هەر پێوە بدات... ئەو مارە پیاوو منداڵی زۆری لەم دوورگەیەو دوورگەکانی دی کوشتوون، جارێکی دیکە لەو مارانە نزیك نەبنەوە کە پنکی سپیان پێوەیە. وەرن دابنیشن با نانەکەتان بۆ بێنم بیخۆن".

"دایکە، دیسان..".

"گۆشتاوێکی بەتامم لێناوە، هەروەها برنجیش..".

پـویراز لـووتی بـۆ هـەوا هـەڵبڕی‌و لەکاتێکـدا کونـە لووتـەکانی وەك تفنکـی ئەسـپ کرابوونەوە، ئاوا هەواکەی بۆن کرد.

"ئۆووە، چ بۆنێکی خۆشە! گۆشتت لەکوێ پەیداکرد؟"

"دوێنێ ڤاسیلی سێ باڵندەی هێنان".

ڤاسیلی گوتی: "مەلی هەنجیرخۆر".

بە مگێزەوە نانەکەیان خـوارد. پـویراز چـووەوە ژوورەکـەی خـۆی لـەنهۆمی سـەرەوەو بێئەوەی جلەکانی داکەنێت لەسەر تەختە خەوەکەی راکشاو چاوی بڕیە بنمیچی خـانوو، لەبەرخۆیەوە گوتی: "دەرکـەوت، ئـەمیر راسـت دەکـات کـە دەیگـوت لـەکونی مـاریش خـۆم وەشێرم ئەوانە دەمدۆزنەوە".

هـەروا بیریکـردەوە، دەبێـت ڤاسـیلی تێبینـی ئـەوەی کردبێـت. هـەموو شـتێك وەك رووناکیی رۆژ ئاشـکرابوو، چـۆن کەسـێکی وردی وەك ڤاسـیلی ئـەوە تێبینـی ناکـات؟ هـەر لەگـەڵ ئـەوی بینـی چـاوەکانی بروسـکەیان دا، چ دەکرێـت؟ بـەڵکو کەسـێکی بەدبـەخت‌و بێچارەش بێت، کێ دەڵێت! بەڵکو هەر لەپیاوەکانی شێخی کۆچەرەکانیش نـەبێت... بـەڵام ئەگـەر پیـاوی شـێخ نیـە بۆچـی وەکـو دزان هاتۆتـە ئـەم دوورگـە چۆڵە؟ ئێـرەی چـۆن دۆزیوەتەوە؟ خوا دەزانێت چەند مانگە دەگەڕێت تا ئێرەی دۆزیوەتەوە، بێچارەیە ئازایـە. ئەوانە لەمنداڵیەوە ئاوا رادەهێنن‌و پـەروەردەیان دەکـەن. یەکـەمجار فێـری تەقـەکردنیان دەکـەن، ئینجـا شـوێنهەڵگرتن، پەیوەنـدیکردن لەگـەڵ خـەڵك‌و ناسـینیان، خۆشـاردنەوە، راکــردن، ژیــان بردنــە ســەر لەشارۆچـکەکان، شــارەکان‌و هوتێلــە گــەورەکان، پاشــانیش پەیوەندیگرتن لەگەڵ کەسانێك لەعارەبستان، ئێـران‌و ئەنـەدۆڵ. ئەمانـە دوای کوشـتنی ئەو کەسەی مەبەستیانە هەڵنایەن. لەسەر لاشەی کوژراوەکە رادەوەستن‌و چاوەڕێ دەکەن داخـۆ چ بەڵایـەکیان دێتـەڕێ، ئەمـە نەریتێکـە لەرۆژهەڵاتـدا هەیـە. کاتێـك بکوژ لەسـەر تـەرمی کوژراوەکـە چـاوەڕێ راوەسـتاوە، یـان دێـن پارچـە پارچـەی دەکـەن‌و پارچـەکانی هەڵدەدەنە بەر سەگان، یان فڕێی دەدەنە زیندان. ئەو پیـاوەی کـە مـار لەسـەر قاچـەکانی خەوتووە یەکێکە لەوانە. چ بکەین چ نەکەین؟ هیچ رێگە چارەیەکی بەمێشکدا نـەدەهات. کوشتن‌و لەنێو بردنیشی هیچ سوودێکی نەبوو، تازە ئیدی دوورگەیان دۆزیبووەوە.

غایلەی تێکەڵو پێکەڵی بۆ دەهاتن. گا پیاوەکەی دەکوشتو تا ئەوپەڕی رەشبینی شۆڕ دەبووەوە، گا بەوتنی پیاوێکی ئاوارەیە، دڵی هێور دەبووەوەو لەتاریکیو رەشبینی دەهاتەوەدەر، پاشان خێرا دەگەڕایەوە نێو قووڵایی تاریکیو بیرکردنەوە لەمردن، لەنەمری، لەوەی کە هەزاران هەزار ساڵ بەسەر مەرگیدا تێپەڕیوەو تەنانەت گەردیلەیەکیش چیە لێینەماوەتەوە، بەیەکجاری لەنێو چووە، ئەبەدیەت کە هیچ، ئەگەر شتێك لەسەرووی ئەبەدیەتیش هەبێت... ئێستا ئەو لاوە بەگەڕانو ماندووبوونێکی زۆرەوە هاتووەو ئێرەی دۆزیوەتەوە، یان دەکوژرێت یان دەکوژێت. کێ هەیە بیەوێت بمرێت؟ کوشتنیش شتێکی وەکو مردن وایە. پیاو، هۆکارەکەی هەرچیەك بێت، چۆن دەتوانێت کەسێك بکوژێت؟

پشیلە نارنجیەکە لەسەر تەختە خەوەکە وەرکەوتبووو تووکی دەبریسکایەوە. گوتی، دەکوژێتو لەپڕ هەموو گیانی لەرزی، مووی لەشی راست بوونەوە، نەیتوانی بگاتە ئەبەدیەت، بگاتە نەمان. زۆری نەمابوو عەقڵی لەدەست بدات. بۆ ئەبەدیەت رۆیشت. ئەبەدیەت بێڕاوەستان، خێرا خێرا دەڕۆیشت.

ئایا ترسی مردنو لەنێوچوون هۆی شێتبوونو بێڕەحمی مرۆڤەکانە؟ ڤاسیلی گوتبووی لەترسی مردن لەمەکتەبی راهیبەکان هەڵاتم. لەوێ مەرگو تاریکی لەهەموو لایەکەوە گەمارۆی مرۆڤ دەدەن. دەستو پێی مرۆڤ لەنێو ئەو تاریکیە ئەنگوستەچاوەدا لەبڕست دەکەون. یانی مرۆڤ هەرچەند لەمەرگ بترسێت بەهەمان رادەش خوازیاری مەرگە؟ ئەمە درۆیە.

تێبینی کرد کە پشیلەکە لەسەر لێفەکەی راکشاوەو خەوتووە، بێخەیاڵ خنگە خنگیەتی. لەو دەمەدا لێنا هاتەژوورو گوتی:

"هەستە، کوڕم، پیاوەکە وا هات، ئەوەی کە چاوەڕێی بوویت".

پویراز بەبزەیەکەوە گوتی: "کەواتە هات؟ ئێستا چی لەگەڵدا بکەم؟"

"بیکوژە. یەکسەر بیکوژە. چ زۆر گۆڕی ئامادەکراو زۆرە. کاتی خۆی بۆ ئەو سەربازە بریندارانەی کە بەکەشتی دەیانهێنان، هەڵکەندراون. بەرلەوەی کەشتیی پڕ بریندار بگات، گۆڕەکانیان هەڵدەکەند. رۆژانە زۆر لەسەربازانی بریندار دەمردن. کوڕم بیکوژە تا نەیکوشتوویت".

"رەنگە ئەو نەبێت دایکە".

"تۆ چۆن دەزانیت ئەو نیە، دەمانچەیەکی ئەوەندە گەورەی بەقەدیەوەیە، چۆن دەشێت ئەو نەبێت؟ چاویشی لەچاوی مار دەچێت، ئێوەی تورك دەڵێن چاوی قەلەڕەش، قەلەڕەش زۆر شوومە".

دەمانچەی خالی خێرا لەژێر بالیفەکەدا دەرهێناو دایە دەستی. دەستەکانی پویراز دەلەرزین. لێنا بەتەواوی ئەوەی تێبینی کرد.

هەرچووینەخوار، یەکسەر لێیدە. ئەگەر نەیکوژیت، ئەو تۆ دەکوژێت، با ڤاسیلی بیکوژێت. ئەو زۆر کەسی لەچاناك قەلا کوشتوون. لێڕاهاتووە".

لێنا ئەمەی بەیۆنانی دەربڕی.

"نەکا یۆنانی بزانێت؟"

"یاللا ئیدی تۆش، سەرمەخەرە سەرم، پویرازەکەم".

پویراز لەپێش‌و پشیلەکە بەدوایەوە لەپلیکانەکان دابەزین، لێنا لەسەرەوە مایەوە، خوێن‌و کوشت‌و برێکی زۆری بەچاوی خۆی بینیبوو، بەرگەی بینینی خوێن‌و کوشتاری زیاتری نەبوو. گوێی هەڵخست‌و چاوەڕێی بیستنی دەنگی تەقە بوو،خۆزگە پویراز ئەو پیاوەی نەکوشتبا، بەڵام ئاخر چار نیە، ئەو بۆ کوشتنی پویراز هاتبوو، بەڵکو کەسێکی دیکەش بووبێت‌و بۆ کوشتنی پویراز نەهاتبێت. لەو حاڵەتەدا ئەو گەنجە چ تاوانێکی هەیە، مەگەر دایك‌و باوکی نین؟

پویراز دەیناسێت، دەزانێت چ جنۆکەیەکە! ڤاسیلی نەرم کرد، بەدوو رۆژ توانی نەرمی بکات. لێنا قسەکانی ئەوی کاتێك کە بەچرپە لەبن گوێدا سەبارەت بەکابرایەك کە بڕیاربوو بێت‌و ئەو بکوژێت، بیستبوون. کاتێك ئەو قسانەی بەڤاسیلی گوتبوون، ڤاسیلی زیاتر خۆشیویستبوو، ئەو قسانە تەنها بەکەسانی جێی متمانە دەگوترێن. ڤاسیلی لەخۆشحاڵیان خەنی بووبوو، هەستابوو پویرازی گرتبووە باوەش‌و فرمێسکی لەچاوان هاتبوون:

"یانی تۆ ئەوەندە متمانە بەمن دەکەیت؟"

پویراز ئەو مرۆڤە راستە، لەبەرامبەر ئەو قسانەی ڤاسیلی هیچی نەگوتبوو. پویراز پیاوەکەی کە لەسەر تەختی چنارەکان دانیشتبوو، بینی. تەماشایەکی سەروسیمای کرد، رەنگی دەم‌و چاوی کابرا سوورێکی مەیلەو بۆر وەك رەنگی بۆری بیابانشینەکان وابوو، بیابانشینەکان تۆ دەڵێیت هەموویان لەیەك کارگە هاتوونەتەدەر، گشتیان لەیەك دەچن.

پیاوەکە هەر لەگەڵ بینینی پویراز هەستایەوە. ڤاسیلیش لەگەڵ ئەودا هەستا.
"خۆشهاتی، سەفات هانی".

"مەمنوونم".

"ڤاسیلی، میوانەکەمان لەسەر تەختی خاڵی دانیشتووە، بالیفێك، پشتییێك شتێك نیە؟"

ڤاسیلی چووەوە ماڵێ. لێنا لەبەردەم پلیکانەکان لێینزیکبووەوەو گوتی:

"چی بوو ڤاسیلی، کابرایەکە نیە؟"

"خۆیەتی".

"ئێ، ئێوە چتانکرد؟"

"دەڵێیت برای خۆیەتی، چیوای نەمابوو بیگرێتە ئامێزو ماچی بکات. دەڵێیت برایەتی".

"ئەو پیاوە شێتە. تۆ بیکوژە، یەکسەر!"

"تووڕە دەبێت. قبوڵ ناکات. تۆ بۆ هەرسێکمان قاوەبێنە".

"بۆ هەرسێکتان، ئاوا، دەبەنگینە!"

کاتێك ڤاسیلی، بەپلیکانەکاندا هەڵدەگەڕا گوێی لێبوو لێنا تووڕەیەو هەر بۆڵە بۆڵێەتی.

کەمێك دواتر، لێنا قاوەکانی بەسەر سینییێکی زیوینەوە هێنان‌و بێئەوەی تەماشایان بکات چوو لەسەر تەختی ژێر چنارەکەی ئەولاتر دانیشت. نەیدەتوانی چاو لەچاوە ترسناکەکانی پیاوەکە هەڵگرێت. بەشێوەیەك سەیری ئەو چاوە تیژو مەرگهێنەرانەی دەکرد دەتگوت سیحری لێکراوە. چاوەکان هەندێکجار تاریك دادەهاتن، هەندێکجار شەرمن، هەندێکجاری دیکە تووڕەو ترسناك، هەندێکجاریش ئەندیشمەندو نەرم، بەحەپەساویەوە سەیری پویرازیان دەکرد، وەك پڵنگێکی تووڕە، بەچەشنێك دەتگوت دەیەوێت پویراز لەتوپەت بکات، بەو چاوە ئەژدیهایی‌و ئاگراویانە...

"بەخێرهاتی ڕێبوار، لەکوێوە دێیت، بۆ کوێ لەسەر خێر، ناوت چیە؟"

"لەشوێنێکی زۆر دوورەوە دێم‌و بۆ شوێنێکی زۆر دوور دەگەڕێمەوە... ناوم کەریمە".

"جیهانگەڕیت، ڕێبواریت؟"

"شتێك لەوانە، چۆنی دەتەوێت وایدابنێ، یەکێك لەکوڕە مامەکانم لەم دەڤەرانە ون بووبوو، ئەوە دەزانین لەسەربازی رایکردووەو چۆتە سەر یەکێك لەم چیایانەی بەرامبەر".

"سۆراخێکت کردووە؟"

"ڕەنگبێت.... لەئێوە ئەو سێ کەسە زیاتر کەسی دی لەم دوورگەیە هەیە؟" پویرازە گوتی: "ئەرێ" بەپێکەنینەوە پشیلەکەی نیشان دا کە لەسەر تەختێکی دیکە لەگەڵ کرمێکی سەوزباو یاری دەکرد: "ئەرێ ئێستا وا خەریکە لەهۆوە یاری دەکات. عەباس".

هەر لەگەڵ ئەوەی ناوی عەباس لەدەمی پویراز هاتەدەر، دەموچاوی کابرا گۆڕا، چاوەکانی بریسکانەوەو کپ بوونەوە، روخساری حاڵەتێکی شادی بەخۆوە دەگرتو وشەی "دۆزیمەوە، دۆزیمەوە"ی لەدەم هاتەدەر، کەریم ئەم چەند وشەیەی ئەوەندە خێرا قووت دانەوە کە کەس تێبینی نەکرد، تەنها دایکە لێنا نەبێت کە چاوی لەدەمی نز کردبوونەوە، لەجووڵەی لێوەکانیەوە تێگەیشت کە کابرا قسەی زۆر گرنگی لەدەم دەرچووبوون.

دوای ئەوە، کابرا پشیلەکەی گرتە باوەشو دەفکر راچوو، رۆچووبووە نێو خۆیەوە، دەتگوت لەجیهانێکی دیکە دایە. ئەو قسانەی کە دەکران یان نەیدەبیستن، یان ئەگەر دەشیبیستن هیچی نەدەگوت، هەر ئەوە نەبێت کە لەبەرخۆیەوە دەیگوت: "دۆزیمەوە".

سفرە راخرابوو، بۆنی خۆشی ساوار کە لێنا بەرۆنی حەیوان لێینابوو، ئەو ناوەی داگرتبوو، فەرموویان لەکەریم کرد، دەستی بۆ خواردن نەبردو ئاوا مایەوە.

بەلەمی قەدریی بەلەموان بەپرتەپرتەوە لەئەسکەلە لەنگەری گرت، مەلەك خانم لەبەلەمەکە دابەزیو هاتەژێر دارچنارەکان.

"نۆشی گیان".

لەبەری هەستان.

"فەرموو، مەلەك خانم، فەرموو".

مەلەك خانم، ئاماژەی بۆکەریم کرد کە گرمۆڵە بووبوو:

"ئەمە کێیە؟"

لینا گوتی: "ئەمە هەمان پیاوەکەیە".

پیاوەکە گوتی: "ئەز کەریمم". هەستا پشیلە "عەباس"ی هێشتا بەئامێزەوە بوو.

"ئەو بەلەمە ماتۆڕدارە دەتوانێت بمگەیەنێتە شارۆچکە؟"

پویرازیش هەستا، پشیلەکەی لەکەریم وەرگرتو داینایە سەر عەرد، ئینجا دەستی کەریمی گرتو بردیە سەر ئەسکەلە. قەدریی بەلەموان خەریکی ماتۆڕەکەی بوو. ئەوانی کە بینین پشتی راست کردەوە. پویراز پێیگوت:

"کاك کەریم دەبەیتە لێوار، ئەگەر ویستی تا شارۆچکە لەگەڵیدا برۆ".

یەکدیان گرتە باوەشو خواحافیزیان کرد.

"بەلەمەکەی کاك کەریمیش بەبەلەمەکەی خۆتەوە ببەستەوە!".

# بەشی دووەم

لێنا پرسی: "ئەمە هەمان پیاوەکە بوو؟ بەمن وابێت خۆی بوو".

ڤاسیلی گوتی: "لەو دەچوو، دەتگوت خۆیەتی. لەپویرازیش دەچوو وانیە؟"

لێنا گوتی: "ئەریێ، بۆچی نەتکوشت؟"

"پیاو چۆن دەتوانێت کەسێك لەخەودا بکوژێت؟ تەنها مارەکان فەرخەو زەرنەقووتە لەهێلانەکانیاندا دەخۆن".

پویراز موسا لەبەرخۆیەوە گوتی: "تەنانەت مارەکانیش شتی واناکەن. پەرێشانو ئاشوفتەحاڵ، لەخەیاڵی خۆیدا بۆ شوێنە زۆر دوورەکان ڕۆیشتبووو تاكو تەنیا مابووەوە، کاتێك دەستەکانی بەتەنیشتی کەوتنەوە، سەری هەڵبڕیو رووی بەرەو دەریا وەرگێڕا، بەلەمی قەدریی بەلەموان دوورکەوتبووەوەو کەوتبووە پشت تەمی سەر دەریاکە.

لەکاتێکدا تەختەکانی ئەسکەلە لەژێر پێیەکانیاندا قرچەقرچیان بوو، گەڕانەوە سەرکانیەکەو لەسەر تەختەکانی ئەوێ دانیشتن. لەو دیوەوە لەژێر سواندەی خانووێکدا پەڕەسێلکەکان هەرایەکیان نابووەوە ئەوسەری دیارنەبوو، بەڵام ئەوان دەنگی باڵندەکانیشیان نەدەبیست. هەرسێکیان بیریان لەو کابرایە دەکردەوە کە ناوی کەریم بووو کاتێك خەریك بوو سواری بەلەمی قەدریی بەلەموان دەبوو تەواو پەشۆکابوو، قاچەکانیشی تێکدەئاڵان. هەرسێکیان پێکەوە بیریان کردەوە، کابرایەکی سەیرە. پویراز موسا بیریکردەوە، دێهاتیەکانی دێی ئێمە چوونەتە کوێ، ئایا عارەبەکان لەگەڵ خۆیاندا بردوویانن بۆ بیابانەکان؟ نەکا بردبیانن و لەقەدپاڵی چیایەکدا هەموویان کوشتبن؟ ئەو پیاوەی کە ڕۆیشت هەموو شتێکی دەزانی، بۆچی پرسیاری لەو نەکرد؟

ڤاسیلی بیریکردەوە، نەزانیمان کرد، ئەو دیسان دەگەڕێتەوە، رەنگبێت ئەمجارە بەدە چەکدارەوە بگەڕێتەوە، هەمووومان دەکوژن. جێگامان دەدۆزنەوە. ئێمە هیچ، ئەم لێنایە چ گوناهێکی هەیە.

لێنا لەسەر یەك لێوەكانی دەجوولاند، وەك ئەوەی دوعا بكات، بەڵكو ئەو پیاوەش نەبێت، بەڵكو كەسێكی تربێت. ئەگەر كابرا خۆی بێت بۆچی ناوی كەریم بوو، هەر توركێك دەبینی ناوی كەریمە. لەگوندەكەی مەلەك خانمیش ناوی سەد كەس لەپیاوەكانیان كەریم بوو. چۆن دەبێت هەمان كابرا بێتو پویراز نەیكوژێت؟ كیسە كیسە فیشەك، تفەنگی لوولە درێژو دەمانچەو خەنجەرێكی زۆر لەماڵێدا هەبوون. ئەگەر كابرا هەمان كابرابوو...

پویراز بەزەردەخەنەوە هەستا:

"با باخچەكە ئاو بدەین. سێ رۆژە ئەو تەماتەو باینجانو بیبەرانە ئاو نەدراون.... بیر لەچی دەكەیتەوە ڤاسیلی، كەشتیەكانت لەدەریای رەش ژێر ئاو كەوتوون؟"

"نە ژێر ئاو نەكەوتوون. با هەستین شینایییەكان ئاو بدەین".

"بابڕۆین. منیش دەبێت چێشت لێبنێم. حەزتان لەچیە؟"

پویراز ئەنگوستی شادەی دانایە سەر گۆنای خۆی، هەر كاتێك داوای خواردنێكی بەدڵی خۆی كردبا وایدەكرد. لێنا لەدڵی خۆیدا گوتی، ئەم كوڕەی ئێمە پەنجەكانی چەند جوانن.

"حەزت لەچیە، زووبە".

"دایە، دایە لێنا، چ بێت باشە؟".

"بڵێ كوڕم، هەرچی بتەوێت لێیدەنێم".

"بەڕاست؟"

لێنا وەكو هەمیشە خاچی كێشا:

"بەڵێ، پێمگوتی كە بۆت لێدەنێم، قەت درۆم لەگەڵ كردوویت، پیازەكانی باخچەش سەریان دەرهێناوە، تەڕو تازە".

"چۆن زانیت. حەزم لەچیە؟"

"من دەزانم كوڕەكەم چیدەوێت.. نیس".

پویراز بەرلەوەی ئەو بڵێت نیسك گوتی كفتەی نیسك!"

"یاللا تەماتەكانی من ئاودێری بكەن، منیش شتێكی واتان بۆ چێدەكەم كە..".

ڤاسیلی دەمێك بوو سەتڵی گەورەی شۆڕكردبووەوە ناو ئاوو داهاتبووەوەو لەكانیەكە ئاوی هەڵدەهێنجا. كاتێك سەتڵەكەی دەردەهێنا گوتی:

"ئەم کانیە ئەوەندە گەورەیەو ئەوەندە ئاوی تیایە سێ گوندان تێراو دەکات".

سەتڵە مسیە گەورەکەی هەڵگرتو بەرەو باخچەی پشت ماڵێ ڕۆیشت، تا هەوا تاریك داهات هەرخەریکی کارکردن بوون. هەموو لایەکی باخچەیان ئاودێری کرد، بەچەشنێك کە هیچ جێیەك نەمابوو ئاو نەخواتەوە.

لێنا دەمێك بوو چێشتی ئامادە کردبوو، ئەو ناوە پڕبوو لەبۆنو بەرامەیەکی ئیشتیاهێنەر. دەستو دەمو چاوە ئارەقاویەکانیان شتنو بەو خاولیە گەورەیەی کە بەدرەختەکەوە هەڵواسرابووو بۆنی سابوونی لێدەهات وشکیان کردنەوە، زۆر ماندوو بووبوون، هەر لەنانخواردن بوونەوە نووستن. پویراز شەو خەونی زۆر ناخۆشی بینین، ئەو ئەژدیهایانەی کە ئاگر لەدەمیان دەهاتەدەر پەلاماریان داو بەزمانە سوورەکەی خۆیان لەنێوجێ هێنایانەدەرو هەڵیانلووشی. سواری یەکێك لەو ئەژدیهایانە بوو، ئەو بیابانانەیان لەمسەر تا ئەوسەر پێکرد، کاتێك گەیشتنە نزیك مەمکە خوێناویەکان کە لەشوێنی خۆیان دەجووڵانەوە، ئەژدیهاکان راوەستان. هەڵۆکان دابەزیبوونو هەر هەڵۆیەك یەکێك لەو مەمکانەی هەڵگرتبووو لەکاتێکدا وەك باران خوێنیان بەسەر بیابانەکەدا لێدەچۆڕا بەرەو ئاسمان بەرز دەبوونەوەو باڵیان لێکدەدا.

هەڵۆیەکی چاو قەلەڕەش هات کە هەندێکجار شێوەی وەك مرۆڤ لێدەهاتو هەندێکجاریش دەبووەوە هەڵۆ، مەمکێکی جووڵەداری لەسەر عەرد رفاندو لەکاتێکدا کە خوێنی لێدەچوڕا بەرەو کەشکەڵانی ئاسمانی برد. باڵندەیەك کە بەرسینەیەکی شین، باڵی زەردو چاوانی یاقووتی هەبوونو لەچیاکانی دوورەوە هاتبوو، تا دەهات گەورە دەبووو باڵەکانی بەسەر مەمکێکی خوێناوی، کە لەنێو لی بیابانەکە کەوتبوو، فش کردبوونەوەو رێگەی نەدەدا هیچ هەڵۆیەك لێینزیك ببێتەوە. هەڵۆکان کە تا دەهات ژمارەیان زیادی دەکرد، ئەو بیابانەیان داپۆشیبوو، بەباڵی لێکنزیکیانەوە بەدەوری باڵندە باڵزەردەکە دەخولانەوە. خوێن وەك باران لەو مەمکە خوێناویانە دادەچۆڕا، کە بەدەمی هەڵۆکانەوە بوون. پویراز نوقمی نێو ئارەقە بووبوو. سێ جار زیڕاندی، هەرسێ جار لێنا لەخەو راپەڕیو چووە ژوورەکەی پویراز بەئەدایەکی پڕ لەمیهرو خۆشەویستیەوە پرسی: "کوڕم، چی بووە، بۆ لەخەودا هاوار دەکەی؟"

خوا دەزانێت چ بەڵایەکت بەسەر هاتووە کە بەئێمەت نەگوتووە... خوا دەزانێت ئەو چاوانەت چ کارەسات و نەهامەتیەکیان بینیوە، ڤاسیلیش وەکو تۆیە، ئەویش لەخەو هاوار

دەكــات. ڤاســيلی دوای ئــەوەی لەجــەنگ گەڕایــەوە لەگــەڵ هیچــكەس قســەی نــەدەكرد. بەردەوام لەگەڵ درەختو باڵندەو خاكو دەریـا دەدوا، لەسـەر بـەردێك دادەنیشت، چاوی دەبڕیـە دەریـاو تـا هـەوا تاریـك دادەهـات ئـاوا سـەیری دەریـای دەكـرد. جـاری وا هـەبوو تەنانەت لەشەوانی ئەنگوستەچاویشدا ئـەو هـەر رووەو دەریـا دەیڕوانـیو تـا بـەیانی ئـاوا دەمایەوە. خەڵكی دوورگە دەیانگوت ڤاسیلی جەنگ لەسەری داوە.

ئـەو شـەوە پـویراز تـا بـەیانی هـاواریكرد. لـەنێو جێـدا رادەپـەڕیو لێنـا تەنانــەت چركەیەكیش چیە نەیتوانی چاولێكبنێت.

پـویراز كاتێـك خۆرهـەڵات لەسـەر جێـدا دانیشـتو لامپایـەكی بینـی كـە لـەژوور سەریدا دادەییسا:

"دایكە، لامپاكەم نەكوژاندەوە، چیبوو؟"

"هیچ نەبوو كوڕەكەم".

پویراز گوتی: "دایكە تۆ چەند باشیت" دەستێكی بەنەزرە قوربانیەكەیـەوە داهێنـا كـە بەگەردنیەوە شۆڕ بووبووەوە. "تا بەیانی باران نەباری؟"

لێنا بەدەنگێكی خەماویەوە گوتی: "نەباری".

"سوور؟"

"نەباری"

لەنێوجێ هاتەدەر، لەگەرماوەكەدا لـەماوەی چـەند خولـەكێك ریشـی تاشـی، كۆلۆنیـای لیمـۆی لـەدەمو چـاوی هەڵسویی، سـەرو قـژی بەشـانە ئێسـقانیەكە شـانەكردو چاوێكی بەباڵاپۆشەكەی داگێڕا... باڵاپۆشێكی شینباو فیت بەئەندازەی خۆی بوو.

لێنا گوتی: "ئەم باڵاپۆشەت زۆر لێدێت. دەتەوێت چێشت لەدەم كانیەكە بخۆیت؟"

"لەنێو بەلەمدا دەیخۆین".

ڤاسیلی هاتە ژوور، لێـو بـەبزەوە گـوتی: "قولابـەكانو دانـەخۆرەكانم ئامـادە كـردوون، كرمی دانە خۆرەكانیش كاتێـك بـەدەوری دوورگـەدا دەسـووڕێینەوە، دەگـرین". روخساری پویراز زەردو لێوەكانیشی كەمێك شین هەڵگەڕابوون.

چوونە دەرێ، هـەتاو بـوو، رووناكی بـاڵی بەسـەر هـەموو لایـەك كێشابوو، دەریـا هێنـدە بێدەنگو ئارام بوو، كە مێرووله دەیتوانی ئاو بخواتەوە. دەوروبـەر بـەو رۆشـناییو تروسكەیە كە لەماسیەكان كاتێك لەئاوەكە خۆیان تێهەڵدەدا رەنگی دەدایەوە، دەدرەوشایەوە.

سواری بەلەم بوون، ماتۆڕەکەیان گڕدا، بەرلەوەی بەدەوری دوورگەدا بخولێنەوە چوار کرمیان بەسەر قولابەکانەوە کرد کە زۆر درێژ بوونو پشتیان مەیلەو شین دەیڕوانی. ڤاسیلی ماسیەکانی پارچە پارچە کردو لەسەر تەختەیەك داینان، ئینجا هەڵیگرتنو بەقولابەکانیەوە کردنو هەڵیدانە ناو دەریا. پارچەکانی تریشی بۆ لای پویراز راگرتن. بەئارامی بەلەمی بۆ پێشەوە لێخوڕی. کەمێك دواتر، پویراز خێرا قولابەکەی راکێشایەوە. لۆفەرێکی گەورە پێوەبووبووو خۆی تێهەڵدەداو وەکو چرا دەبریسکایەوەو دەکوژایەوە. هەر ئاوا کە بەتاسەوە لەماسیە جووڵەدارەکە رامابوون، ڤاسیلی قولابەکەی خۆی راکێشا. لۆفەرێکی دیکەش بەقولابەکەی ئەو وەبووبوو، کە بەپشتی شینیەوە روو لەهەتاو هەڵدەبەزیەوە. لەوەرزی بەهارو پایزدا، کاتێك ماسیی لۆفەر بکەیتە کەبابو بیخۆیت، ماسی بۆنی دەریای بەهاری لێدێت، بەچەشنێك وەك بڵێیت شنەیەکی نەرمی بەهاری لەدڵت بداتو رۆشنایی دەریا بەتەواویەوە دەروونت تژی بکات.

مرۆڤ دەتوانێت ئەو بۆنە لەسەراپای بوونی خۆیدا هەست پێبکات "ئێستا، دایە لێنا ئەگەر ئەم ماسیانە ببینێت لەخۆشیان شێت دەبێت. ئەو دەزانێت مرۆڤ کاتێك ماسیی لۆفەری بەهارو پایزان بخوات، بۆنی دەریا بەهەموو بوونی خۆیەوە هەست پێدەکات".

بەدەم قسەکردنەوە ژمارەیەکی زۆر لۆفەریان گرتن. دیاربوو لۆفەرێکی زۆر داگژابوونە ئەو شوێنەوە، هەروا سەیریان کرد، دروست لەبەرامبەر دوورگەی کابان.

ڤاسیلی گوتی: "ئەرێ دوورگەی کابایە، سەر هەڵبڕەو سەیر بکە، بزنە شینەکانی خدر ببینە، لەسەر کەڤرەکان وا خەریکن سەیرمان دەکەن. بزنەکانی خدر لە مرۆڤ ناسڵەمنەوە".

پویراز گوتی: "بزنەگەلێکی چەندە جوانن! موویان لەشینیان دەبریسکێتەوە. بۆچی بسڵەمێنەوە، خۆ ئەوان نازانن مرۆڤەکان چ جۆرە جانەوەرێکن، ئەو جانەوەرانەی کە یەکدیش دەخۆن. کەوابوو بۆ دەبێت رەم بکەنو بسڵەمێنەوە". ڤاسیلی پێکەنی:

"دەستەکانی خۆش، پیرخدر کە ئەو کەشتیانەی بزنەکانی دەدزن نقومیان دەکات. کارێکی باش دەکات، ئەگەرنا چما ئەو بزنانە لێرە دەمان؟"

"نەدەمان"

"تەنها دەکرێت شیریان بخورێتەوە. شیریان دەرمانی هەموو دەردێکە. پیاوێك هەبوو بەناوی باربا دیمتری، کە سەدو بیستساڵ ژیا، هەمیشە سواری بەلەمەکەی دەبوو، دەهات

شیری بزنەکانی دەدۆشیو شیردانێکی پڕ دەکردو دەگەڕایەوەو تا چۆڕی لێدەبڕی دەیخواردەوە. تا تەمەنی سەدو بیستو حەوت ساڵی هەموو ڕۆژێ دەچووە ڕاوە ماسی، ماسی دەگرتنو دەیفرۆشتن، شیری دەخواردەوە، نانی گەنمەشامی، هەرجارێکیش بیتوانیبا گاماسیەك بگرێت ئەویشی دەخوارد، پاشان ڕۆژێك، ڕۆژێك، ڕۆژێك کە دروست پێی نابووە تەمەنی سەدو بیستو حەوت ساڵیەوە لەسەر دوندی ئەو زنارە قووچە، کاتێك خەریك بوو بزنێکی دەدۆشی، قاچی هەڵخلیسکاو لەسەر ئەو زنارانە غل بووەوەو کەوتەخوارەوەو مرد. ڕۆژێك کە ماسیگرەکان بەم ناوەدا تێدەپەڕن دەبینن هەموو بزنەکان لەپێدەشتەکە خڕبوونەتەوە، ماسیگرەکان دەچن دەبینن باربا دیمتری وا زاری لێبەش بۆتەوەو یەك بەخۆی لەو گۆڕە ڕاکشاوە. ماسیگرەکان دەڵێن وای، وای ئەوەی کابرا دەیداتە بەر داس، وا نایەتەوە. سەیربکەن ئەو کە شیری بزنەکانی دەدزی، خدر نەوەدو نۆ ساڵ بەرگەی ئەوەی گرتو دواجاریش ملی گرتو لەو سەرەوە فڕێی دایەخوارەوە. بزنەکان زۆر خەمبار بوون. هەموو بزنەکانی دوورگە لەبان زنارەکان هاتنەخوارێو بەدەوری باربا دیمتری بازنەیان بەستو ماتەمیان گێڕا. ئاخر لەنێو هەموو بنیادەمو بوونەوەرەکانی دی باربا دیمتری بوو کە زۆر لەگەڵ ئەو بزنانە تێکەڵاوی هەبوو، چونکە ئەوان دەمان تەنانەت مەلانی دەریاش نەدەهاتنە ئێروکانە، نە هێلانەیەکیان لێرە چێدەکردو نە هێلکەیان دەنایەوەو نە بەسەر ئاسمانی ئێرەدا هەڵدەفڕین".

لەنزیك دوورگەدا چەند ماسیێکی دیکەیان گرت. بەلەمیان ڕاکێش ڕاکێش بەسەر لمەکەدا تا نزیك دارزەیتوونەکان برد. نیوەڕۆ داهاتبوو. ڤاسیلی چەقۆیەکی کە وەکو گوێزان تیژ بوو لەگیرفان دەرهێنا، بەپێی پێویست لۆفەرەکانی پاککردنەوەو خوێی لێدان. پویراز بەچیلکەی دارزەیتوون ئاگرێکی کردەوە، لەدەستوبردێکدا ئاگرەکە بڵێسەی بەرزبووەوە.

پویراز گوتی: "وای، گڕو ڕۆشناییەکەی وەکو گزرەی دارکاژ وایە".

ڤاسیلی گوتی: "ئەگەر وەك دارکاژیش نەبێت بەهەرحاڵ دارزەیتوونیش دارێکی ڕۆندارە، یەکسەر گڕ دەگرێت".

"چ بزانم، من تا ئێستا ئاگرم بەداری زەیتوون نەکردۆتەوە".

ئاگرێکی گڕداری تا ڕادەیەك گەورە هەڵایسا. ماسیەکانیان دانانەسەر پەنگرەکان، کە کەمێك گڕەکەیان دامرکابووەوە. بۆنی ڕۆنی سووتاو سەرتاسەری دوورگەی داگرتبووو

ئـەو دوكەڵـەی لەماسـیە برژاوەكانــەوە بـەرزدەبووەوە هـەموو دوورگـەی گرتبـووە خـۆی. پـویراز هـەر كـە سـەری هـەڵبڕی بینـی وا لەسـەر زنارەكـان مێگەلـە بزنێـك راوەسـتاوەو هەمەتەی خوارەوە دەكەن. خـدر سڵاوی خـوای لێبیێـت چـەند بزنـی هـەبووە. ئاشكرایە لـەپێناوی بزنێـك كەشـتییێكو دە بەلـەمی ماسـیگران نـوقمی ژێـر ئـاو بكـەیت، لـەبڕی كەوچكێك شیر، بەدبـەختێكی تەمـەن سـەدو بیستو حـەوت ساڵە لـەبان ئـەو زنارانـەوە تێهەڵدەیـە خـوارەوە، بێئـەوەی تەنانـەت ئـەبرۆ تێكبنێیـت، ئـاوا بزنـەكان ژمارەیـان زۆر دەبێت. ئێستا باشیشە بستە عەردێك ماوە تا پەنای بۆ بێنینو ورگی خۆمان تێر بكەین.

لەكاتی نانخواردندا هیچ قسەیەكیان نەكرد.

دوای ئەوەی ماسیەكانیان بەنان خـوارد، لـەوێ هاتنـەخوارەوەو لـەو ئـاوە زوڵاڵـەی كـە لەپای زنارەكاندا وەك بێرمەیەكی بچووك كۆبووبووەوە، خواردیانەوە.

دەنگی "ئۆووە "لەقوڕگی پویراز هاتەدەر.

"مـن لەتەمـەنی خۆمـدا خـواردنێكی ئـاوا بـەتامم نـەخواردووە. هـەموو گیـانم بـۆنی دەریای گرتووە. من دەریام خواردووە، دەریام خواردۆتەوە، سەراپا بوومەتە دەریا".

"مــرۆڤ كاتێــك لۆفــەرە بــەهاریو هاوینیــەكان دەخــوات، هەســتێكی وەهــای لا دروست دەبێت".

دەسـتەكانیان بـەلی ژێـر ئاوەكـە شوشـتن، دەسـتیان بـۆنی ماسـی نـا، بـۆنی دەریایـان لێدەهات.

زەویە هەموارەكەیان لەوسەر بۆ ئەوسەر تەی كرد، لەولاتر ژێر دەریـا پـڕ بـوو لـەورد بەردی سوور، سەوزو قاوەییو رووناكیەكی نەرمی خۆر لەو ژێر ئاوەوە دەلەرایەوە.

"باربـا دیمـترِی هـەر شـەش مـانگو سـاڵێك یـەكێك لەدۆسـتەكانی خـۆی رازی دەكـردو لەگەڵ خۆیدا دەیهێنایە ئێرە. بەدۆستەكانی دەگوت سەیر بكەن ئێرە تەواو هـەفتاو یـەك دارزەیتـوونی لێیـە. ئەگـەر ئـەو دارزەیتوونانـە موتربـە بكـرێن چـەند سـەوەتە زەیتـوون بەردەدەن، لێكیدەوە، هەموویان چەند سەوەتە زەیتـوون بـەردەدەن؟ ئەگـەر زەیتوونـەكان بفرۆشیت چەند ساڵان دەتوانیت بەو پارەیە بژیت، سێ ساڵ، جگە لـەوە شیری بزنـەكانی خدریش هەیە".

"ئەو هەموو ساڵە هەوڵی داو تەمەنی خۆی گەیاندە ئاخری، كەچی نـەیتوانی كەسێك رازی بكـات كـە لێـرە نیشـتەجێ ببێـت، بەحەسـرەتی دوورگەكەیـەوە سـەری نایـەوە. نـە

لەدوورگەکەیدا مردو نەتوانی بڵێت دوای مردنم لەم دوورگەیەم وەشێرن. هەر مردنی بەمێشکیشدا نەدەهات، بەڵام لەدوورگەکەیدا مرد. ئەوەش بۆ ئەو شتێکی بەهادار بوو. کارێکی زۆر خراپمان کرد عەقڵمان پێدانەشکا کە لەم دوورگەیە بینێژین".

پویراز شەرمنانە پێکەنی:

"زووبە، ئێمەش با جارێکی دی ئەم درەختانە بژمێرین".

پویراز لەپێش‌و ڤاسیلی بەدوایدا بەژماردنی درەختەکان تا ئەو سەر رۆیشتن، دوای سەدو یەك درەخت. باربا دیمتری ژماردنی درەختەکانی نەزانیوە. زووبە، با جارێکی دیکەش رووپێوی زەویەکان بکەین".

زەویە تەختاویەکانیان لەمسەرەوە تا ئەوسەرو لەوسەرەوە تا ئەمسەر بەهەنگاوەکانیان رووپێو کردن، قەڵەم‌و کاغەزیان دەرهێنا، بەوردی حێسبیان کرد، زەوی تەخت‌و هەموار پازدە هەزار مەتر بوو.

"وای، گێلینە، بۆچی نەهاتن لێرە نیشتەجێ بن، دەتوانیت پێنج هەزار مەتری لێبکەیتە باخ‌و تا دەتوانیت شەراب دروست بکەیت، لەدوو هەزارو پێنجسەد مەتریشدا دەکرێت گەنمەشامی بڕوێنیت‌و هەزار مەتریش سەوزەو شووتی‌و کاڵەك".

ڤاسیلی بۆی زیاد کرد: "بیست دانە غەڵێفەی هەنگیش. گوڵەکانی دوورگە بەشی ئەو هەموو هەنگە ناکەن. لەنێوەڕاستی ئەم دەریایە لەبرسان دەمرن".

"بەڵام هەنگەکان دەتوانن زۆر بەخێرایی بفڕن. لێوارەکان زۆر دوور نین، سپێدان دەڕۆن‌و خۆیان لەشیلەی گوڵان تێر دەکەن‌و دەگەڕێنەوە، ئێرە دەبێت لەوەرزی بەهاردا ببینیت، هەموو لایەکی پڕ دەبێت لەگوڵ، چین چین".

"هەنگەکان ئەگەر برسی بمێننەوە ئەو کەسانەی دێن لێرە ئاکنجی دەبن دەیانفرۆشن. تازە، بەلەمی ماتۆڕداری نوێش دەکڕن‌و ئەگەر ماسیگری باشیش بن ماسیان دەگرن، لەهەمووی زیاتر".

ڤاسیلی گوتی: "ئێرە پڕیەتی لەماسی".

پویراز گوتی: "ئەرێ پڕە لەماسی، دەریایەك لەشوێنێکی ئاوا کپ‌و لاپەڕگە، ئەوانیش رێگە بەماسیگرانی دیکە نادەن بێنە دەریای ئەوان".

"بەڵام شیری بزنەکان، لەو شیرە ماست‌و پەنیر دروست دەکەن، پەنیری هیچ شوێنێك ناگاتە پەنیری بزنان. نقیشکی بزنیش. هەرکەسێك بهێتە ئێرە دەوڵەمەند

دەبێت. دوو دانە خانووش دروست دەکات، هەریەکەیان دوو نهۆم، یەکیان لەملای کانیو ئەوەی دیش لەولای".

"هەرکەسێك بهێتە ئێرەو لێرە ئاکنجی ببێت، تاکو نەبیندرێت لەهەردوو لای کە بەسەر دەریادا دەڕوانێت درەخت دەڕوێنێت".

"دوورگەی کابا زۆر جوانو بەپیتو بەرەکەتە... خدریش باڵی خۆی بەسەر ئەم دوورگەیەدا کێشاوە. خدر هەم ئەو هاوسەرگیریانەی لێرە بەڕێوە دەچن پیرۆز دەکاتو هەم ئەو منداڵانەی لێرە لەدایك دەبن بەختەوەر دەکات".

تا نیوە شەوێکی درەنگ لەکاتێکدا هەوڵیان دەدا لێنەگەڕێن ئاگرەکە دابمرکێتەوە دەربارەی دوورگەی کابا قسەیان کرد، لەبارەی دوورگەو ئەو کەسانەی بڕیاربووە بهێنە ئێرەو لێرە نیشتەجێ ببن زۆر خەیاڵی سەیریان بەمێشکدا گوزەرا.

"ئەگەر ئەو کەسانە خۆیان بیانەوێت هیچکەس ناتوانێت بیاندۆزێتەوە". ڤاسیلی بەدڵنیاییەوە گوتی: "هەرگیز ناتوانن بیاندۆزنەوە".

ڤاسیلی بەدڵنیاییەوە گوتی: "هەرگیز ناتوانن بیاندۆزنەوە".

"کێ بەعەقڵی دادەشکێت، دوورگەیەك لەنێوەڕاستی دەریایەکی چۆڵو هۆڵ".

"کێ بەعەقڵیدا..".

کاتێك لەبەر ئاگرەکە هەستان شەو چەند لەمێژ بوو لەنیوەی ڕەت دابوو. بەلەمیان بەرەو دەریا لێخوڕی. بریسکەی ماسیان دوورگەی گرتبووە خۆیو زنارەکانی ڕۆشنو دووبارە خامۆشی دەکردنەوە.

ئاسمان پڕ لەئەستێرە بووو سپێتی نیشتبووە ژێر دەریاو لەرەلەری بوو.

"دایکە لێنا لەنیگەرانیان مردووە".

ڤاسیلی گوتی: "مردووە، ئەگەر هەموو ژێر دەریاش بپشکنین تازە هیچ، لێنا چ دەکات، دەچێتە کوێ"

"ناتوانێت بچێتە یۆنان؟"

"ئامادەیە بمرێتو لێرە نەڕوات. تا دوایین هەناسەی لێرە لەچاوەڕوانی کوڕەکانیدا دەمێنێتەوە".

"وا دەزانێت کوڕەکانی دەگەڕێنەوە؟"

"ناچارە وابزانێت، ناتوانێت بەجۆرێکی دی بیربکاتەوە. ناتواندرێت لێنا لەم دوورگەیە دوور بخرێتەوە. خۆی دەکوژێت".

"مەلەك خانم، قەدریی بەلەموان؟"

"ئەوان دوای ئێمە یەك رۆژیش لێرە نامێننەوە".

بێدەنگ بوون، بچووكترین جووڵە لەدەریا بەدی نەدەكرا. ڤاسیلی لەپشت سووكانی بەلەمەكە بوو. هەردووكیان رۆچووبوونە نێو خەیاڵی دوورگەی كابا.

دەریا دەتگوت سێڵاوی زێڕە، لەهەر سات و لەهەر جووڵەو تەكانێكیدا بریسكەی ماسیەك و لەلایەكی دی ئەستێرەكان.. لەگەڵ ورشەی ئەستێراندا خولیان دەخوارد، ئەستێرەكان بێپسانەوە وەك هێڵێكی باریك بەبەرچاویاندا دەخشین. لێنا لەسەر ئەسكەلە چاوەڕێی دەكردن.

"دایكە لێنا تا ئێستا نەخەوتوویت؟"

لێنا بێئەوەی قسەیەك بكات وەرسووڕایەوەو رۆیشت چووەوە نێو جێگای. ڤاسیلی گوتی: "زۆر تووڕەیە، ئیدی ماوەیەك قسەمان لەگەڵ ناكات".

پویراز گوتی: "من چاكی دەكەمەوە".

"زۆر زەحمەتە".

"سبەی دەیبینیت".

پشیلەكەش لەسەر ئەسكەلە چاوەڕێی ئەوان بوو، كاتێك تێبینیان كرد كە خەریك بوو حەسرەتبارانە دەیمیاواند، ڤاسیلی بەڕاكردن رایكردو هەڵیگرت و دەستیكرد بەلاواندنەوەی".

"واتزانی تۆمان لەبیركردووە، وانیە؟ تۆش وەكو دایكە لێنا زیز بوویت، ئەری؟ سەبرت هەبێت، ببینە چەندە شتم بۆ هێناویت، سەیرت هەبێت!"

ئەو لەتە ماسیانەی هەلگرت كە لەسەر تەختەی پێشەوەی بەلەمەكە داندرابوون، هەر لەو نزیكەو لەسەر چەمەنەكە داینان و پشیلەكەی دانا. پشیلە برسیی بوو، پەلاماری لەتە ماسیەكانی داو لەتێكی گەورەی هەلگرت و زۆر خێرا بۆ پشت چناری برد.

ڤاسیلی گوتی: "دڵی عەباسی برادەرمان شاد كرد".

ماسیەكانیان لەنێو لەگەنەكە هەلگرتن و بردنیانە ماڵێ و یەكسەر چوونە نێو جێگاوە.

هەتاو داكەوتبوو كە لەدەنگە دەنگ و هەراو زەنایەك بەئاگا هاتن، هەرسێكیان جیاجیا هەستانەوەو رایانكردە لای پەنجەرەكان، سێ بەلەمی ماتۆڕدار هاتبوون و لەئەسكەلە لەتەك یەك لەنگەریان گرتبوو، سەر ئەسكەلە پڕی خەڵك بوو، هێشتاش كەسانی دی بێپسانەوە لەبەلەمەكان دادەبەزین... منداڵ و پیرو گەنج، نیگەران،

پەرێشـانحاڵو واقوڕمـاو. بـۆ ئـەوەی ترسـی خۆیـان بشـارنەوە سـەرو سـەداو دەنگـە دەنگیان نابووەوە.

دوای بەتاڵبوونی بەلەمەکان، پیاوێکی کراوات لەمل، کە لەپشت هـەموویان دەڕۆیشت ئەوانی بردە ژێر دارچنارەکانو گوتی: "دانیشن".

منداڵەکان یەکسەر لەسەر تەختەکان دانیشتنو جێگایەك بۆ گەورەکان نەمایەوە.

پیاوە کراوات لەملەکە گوتی: "ئێـرە دوورگـەی کارینجایـە. بڕیـارە لێـرە ئـاکنجی بـبن. دەوڵەت ئێرەی داوەتە ئێوە، دەڵێـی بەهەشـتە. هـەموو جێگایـەکی دەریـای سـپیو دەریـای ڕەش بگەڕێن ناتوانن شوێنێکی وەك ئەم دوورگەیە بدۆزنەوە. دەریاکەی تژی ماسیە".

لەو دەمەدا. لێنـاو مەلـەك خـانم لەپێشـەوەو پـویرازو ڤاسـیلی بەدوایانـەوە گەیشـتنو لەدەم کانیەکە راوەستان.

"ئەمە کاك پویرازە، ئەمـەش ڤاسـیلی هـاوڕێی، ئەمـەیان قـەدریی بەلەموانـە، خـاوەنی جوانترین بەلەمی ماتۆڕداری ئەم دەریایەیـە. ئەمـە مەلـەك خانمـە، دایکـی بـەڕێزی کاکـە قـەدریی بەلـەموان، ئەمەشـیان دایکـە لێنایـە، تاقانـە دایکـی ئـەم دوورگەیـە، چـوار کـوڕی چونکە لەپشتیوانەکانی مستەفا کـەمال پاشـان، ئێسـتا لەئەنقـەرە لای پاشـان. لێنەگـەڕان هیچکەس لەم دوورگەیە بمێنێتەوە تەنانەت تاناسیش، هـەموویان ڕەوانـەی یۆنـان کـردن، تەنها دایکە لێنا نـەبێت، کـاك ڤاسـیلیش لەچـاناك قـەڵاو دوملوپنـاردا جـەنگاوەو بۆخـۆی قارەمانێکە، ئەستەنبۆلیە. هەروەها دۆسـتو هـاودەمی جـەنابی سـەروان پـویراز موسـایە، کـە مـەدالیای زێـڕی سـەربەخۆییان بەنـەواری سـوورەوە پێبەخشـیوە. پـویراز نازناوێکـە لەکاتی شەڕی ژێرزەمینیی لەدژی یۆنانیەکان پێیدراوە".

رووی کردە پویراز موساو بەخەڵکەکەی نیشان دا.

"جـەنابی سـەروان، ئـەو دەمـەی لـەم ناوچـەیە دژی دوژمـن شـەڕی کـردووە دوورگـەی کارینجای کەوتۆتە بەردڵ، بەزێڕو ئاڵتوونێکی بێحەدو حیساب هاتۆتە ئێـرەو خانووێـكو ئاشکێکی کڕێوە". دەستی راستی درێژ کردو خانووەکەی نیشـان دان "ئـەو خـانووە، هـەمان ئەو خانووە جوانەیە کە جەناب سەروانی ئێمە کڕیویەتی".

هــەموو پیاوەکــان بــەپێوە راوەســتابوون. بەروخســاری هــەڵبزڕکاوو دەمو چــاوی لۆچاویەوە پویراز موسا بیریکـردەوە، دەوری چاوی ئـەو کەسـانەی لـەژێر تیشـکی خـۆردا کاردەکـەن ئـاوا لۆچـیان تێدەکـەوێت، ئەمانــە جێــی ئومێــد نــین، چــۆن هــاتوون ئــاوا دەگەڕێنەوەو دەڕۆن. ئەمانەش لەدوورگەدا نامێننەوە.

"بەخێر بێن"ێك لەلێوەكانی پویراز هاتەدەر، هیچكام لەتازە هاتووەكان سەریان هەڵنەبڕیو سەیری پویرازیان نەكرد، پویراز بایەخی پێنەدانو بەئەدایەكی نەرمو دۆستانە دەستی بەقسان كرد:

"ئەم دوورگەیە دوورگەیەكی گەورەو جوانە. سەیری ئەم دۆڵە بكەن. لێرەوە تا سەر گردەكە هەموو بەدرەختی زەیتوون داپۆشراوە. هەر درەختێك نزیكەی دوو خەروار بەر دەدات. ئەم دوورگەیە پارچەیەكە لەبەهەشت. من كاتی خۆی هەر چاوم بەئێرە كەوت شەیدای بووم، لەو تەمەنەمدا هاتم، تاكو تەنیا خۆم لێرە پەنادا. ئەم دوورگەیە بەشی هەموومان دەكات. تەنانەت بەشی دوو ئەوەندە كەسەش دەكات. خانووەكانیشی زۆر جوانن. بەچەشنێك تەنانەت لەشارەكانیشدا وێنەیان پەیدا نابێت، سەیر بكەن لەهۆوەش خانوو هەیە. ئەو خانووانە هی چێشتلێنەرەكانن، ئەو چێشتلێنەرانەی كە چوونە ئەمریكا.... لەبەرئەوەی پارەكەم تێیهەڵنەهێنا، نەمتوانی یەكێك لەو خانووانە بكڕم. ئەوانە بەخۆڕایی دەدەنە ئێوە، ئێستا خۆتان سەرپشكن".

پویراز سەیری كرد كەس گوێ لەقسەكانی ناگرێت، هەریەكەیان بیر لەشتێكی دی دەكاتەوە، بەروخساری هەڵبزڕكاو، سەرو ریشی ئاڵۆزكاو، بەپشتێنی سوورو ورشەدار، كڵاوی سوور بەسەرەوە كە هەندێكیان بێگوفكەو هەندێكیشیان بەگوفكە.

پیاوێك كە ریشی سپیو باڵایەكی بەرزی هەبوو هاتە پێش، دەستێكی لەبەر پشتێنەكەی راكرد:

"ئێمە نەماندەویست بێینە ئێرە. بەزۆر هێناینیانە ئێرە".

بێدەنگ بوو.

"ئێستا پیاسەیەك بەنێو دوورگەدا بكەن. باش تەماشای هەموو شوێنەكانی بكەن، لەهاتنتان پەشیمان نابنەوە".

پیاوە باڵابەرزەكە كە لەپێش هەمووان راوەستابوو، گوتی: "ئێرە ئەگەر بەهەشتیش بێت بەكەڵكی ئێمە نایەت..".

"لەسەرتاسەری توركیا دوورگەیەكی ئاوا جوانتان دەست ناكەوێت".

پیاوە بەتەمەنەكە گوتی: "ئێمە تووتنەوانین، نەماندەویست بێینە ئێرە. ناچاریان كردین، هەموو شتێكمان لەوێ بەجێما".

"قەدریی بەلەموان بەنێو دوورگەدا دەتانگێڕێت".

"سوپاس، پێویست ناکات. ئێمە تووتنەوانین. لەم دوورگەیەدا خاکێك بۆ چاندنی تووتن دەست ناکەوێت، ئێمە لەتووتنەوانی بترازێت کارێکی دیکە نازانین. پیاوێکی دی کە ئەویش پشتێنێکی سووری بەستبوو، شەلوارێکی رەشی پڕ لۆچی لەپێی دابوو، پێستی دەمو چاوی ئەسمەرو چاوی دەتگوت چاوی مانگان، خۆی کۆکردەوەو چەند وردە هەنگاوێك بۆلای پویراز هاتو لێینزیك بووەوە، لەپڕدا تووڕەیی دایگرتو قاچی راستی لەهیکەوە بەعەردەکە داکێشاو گوتی: "ئێوە چرای ژیانی ئێمەتان کوژاندەوە، بوونە هۆی ئەوەی ماڵەکانمان چۆڵو هۆڵ وەمێنن. هەڵتانخەڵەتاندین.. کەس لەئێمەی نەپرسی پێتانخۆشە بچنە تورکیا یان نا، هەموومانتان وەکو ماسی لەئاو دەرهێناو لێرە ماوینەتەوە. تێگەیشتن برایانی دینی یاللاّ برۆن سواری بەلەمەکان ببنەوە".

خەریکی کاری تووتنەوانی بوون. جەنگ کۆتایی هاتبوو، تووتن پارەیەکی باشی دەکرد، زەویەکانیان پڕ پیتو بەرەکەت بوون. باخی زەیتوون، هەنار، هەنجیرو توویان هەبوو، رۆژێك هەئیەتێك هات، هەموو دارو نەداریانی ژماردو هاوێری کردو هەریەکە پارچە کاغەزێکی دانە دەست. هیچکەس نەیدەتوانی شتێك لەسامانو دارابیەکەی خۆی بفرۆشێت. هەندێکیشیان کەلوپەلەکانیان بەنرخێکی زۆر کەم فرۆشت. چاوەڕێیانکرد. بەمانگان کەس لای لێنەکردنەوە. لەدێهاتەکانیان مانەوەو لەبیرکران. پاشان رۆژێك ژمارەیەك چەکدار بەدەرکەوتن، کەسانێکی رەقەکارو توندوتیژ بوون، گوتیان: ئامادەبن. خەڵکی گوند واقیانوڕما. لەماوەی چەند رۆژدا بەپای پیادە وەڕێکەوتن، پیرو منداڵە نەخۆشو لەپەلوپۆ کەوتووەکان ماندوو شەکەت گەیشتنە بەندەرێك. ئەسکەلەی بەندەرەکە وەکو رۆژی مەحشەر وابوو. هەزاران کەس لەدەوروبەری ئەسکەلە لەو گۆڕە، لەژێر رەحمەتی باو باران، چاوەڕێی کەشتی هەڵمیان دەکرد، کە بڕیار بوو لەتورکیاوە بێن.

پیرو زارۆکەکان لەبەر نەخۆشیو گرانەتا لەنێو چوون. دوای ماوەیەکی زۆر چەند کەشتییێکی بچووك بەدووکەڵکێشی کۆنو خوارو خێچو پەرپووت گەیشتن. دوورخراوەکان کە لەبەر باران دەتگوت مشکی لەئاو هەڵکێشراون، لەکاتێکدا کە بەسەر شانو ملی یەکتردا هەڵدەگەڕان، سواربوون. هەیفی سوور ئەگەرچی لەئەسکەلە چەند ئاگردانێکی بۆ لێنانی چێشت دروست کردبووو چەند بنکەیەکی بۆ چاودێری تەندروستی کردبووەوە، بەلاّم نەیتوانی بوو رێ لەبلاّوبوونەوەی نەخۆشیو مەرگو میر بگرێت.

کەشـتیە بچـووکە خـوارو خێچـەکان بەشـێوەیەك بـوون، کـە ئەگـەر شـەپۆلێکی بەتەوژم لێیدابان هەموویان نوقمی ژێر ئاو دەبوون. کاتێك کە کەشـتیەکانیان بینـی زەندەقیان چوو، نەیاندەویست سواری ئەو کەشتیە پەڕپووتانە بـبن، بـەڵام بـەزەبری شەق‌و شوللاق سواریانکردن.

دوای چــەندان ڕۆژ گەیشــتنە ئەســکەلەکانی ئەنــەدۆڵ. تەلــەفاتێکی زۆریــان لــەنێو کەشـتیەکان دا. لەئەسـکەلەکانی ئەنەدۆڵیشـدا بـاران دەبـاری، لـەو نـاوەش کەسـانێکی زۆر لەنێو چوون. پاشان بەهۆکاری نادیـار ئـەو خەڵکـەیان لەئەنـەدۆڵ بـۆ ناوچـە جیاجیاکـان ڕەوانە کرد، هەندێك بۆ دێهاتـە شـاخاویە کوێستانیەکان‌و بەشێکیشیان بـۆ پێدەشـتە پـڕ لەگرانەتاو نەخۆشیەکان. ئەو گوندە ڕۆمیە چۆڵکراوانەی کـە هەنـدێك لـەو خەڵکانـەیان بـۆ نـاردبوون سـووتا بـوون. خـاکێکی بـەپێزیان هـەبوو، خـانووە سـووتاوەکانیان دروسـت کردنەوە. پیشەکاران لەگوندەکانـەوە ڕایـانکردە شـارەکان‌و ئەمـەیان لـەبیرخۆ بـردەوە کـە چاو لەیارمەتی کـەس بکـەن. هەنـدێك لەدێهاتیـە لێـوار دەریاییـەکانی یۆنـان بـۆ دەشـت‌و بیابانـە وشـك‌و برینگـەکان‌و دێهاتیـە شـاخاویەکانیش بـۆ زەویـە زەمەنـدو باتلاخیـەکانی باشوورو باشووری ڕۆژهەڵات ڕەوانەکران‌و لەبەر گەرماو گرانەتاو جۆرەها پەتا لەپـەلوپۆ کەوتن‌و لەنێو چوون. کەسانێك کە نەیانتوانی لەگەڵ کەش‌و هەوای ئەو ناوچەیە رابـێن، بەرەو ناوچەکانی ئەنەدۆڵ شۆڕبوونەوەو کەسانێکیش کە توانیـان شـوێنێکی تـا ڕادەیـەك گونجاو بۆ خۆیان بدۆزنەوە هـەر لـەوێ مانـەوە. ئەنـەدۆڵ تـازە لەشـەڕ دەربـازی بووبـوو. یارمـەتی دەوڵـەت بـەس نـەبوو. خـەڵکی هـەژارو نـەداری ئەنـەدۆڵ تـا توانیـان یارمـەتی کۆچبەرە تازەکانیان دا.

"یاللا سواری بەلەمان ببنەوە!"

ئەو دوورگەیە حەوتەمین جێگا بوو کە سەریان پێدا گرتبـوو. لەئەنـەدۆڵی ناوینـەوە هــاتبوون، نــەتوانیبوویان خانووێــك بــۆ خۆیــان دابــین بکــەن‌و نــە بســتێك زەوی، گیرفانەکانیشیان داتەکا بوون. خـوا دەسـت بـەباڵی دێهاتیـەکانی سـەر ڕێگایانـەوە بگرێـت. هەرچی هەیانبوو، تەنانەت ئەگەر لەتە نانێکیش با لەگەڵیاندا دابەشیان دەکرد. هەندێك لەگوندەکان ئەوانیان بەسەر ماڵانـدا دابـەش دەکـردو خـواردنی باشـیان دەدانـێ، هەنـدێك لەگوندەکانیش بەپێچەوانە لێنەدەگەڕان بهێنە نێو گونـدەکانیان‌و لەسـنووری گونـدەکانی خۆیانیان دەردەکردن.

لەزۆر شوێنی ئەنەدۆڵدا کە جەنگ وێرانی کردبوو، ئاشووبو هەرجو مەرج بەردەوام بوو، بێسەرایی بوو، گۆشت دادەندرایە بەر ئەسپو کاو جۆ دادەندرا بەردەم سەگ. لەو بارەیەوە کۆچبەرەکان نیگەرانو پەرێشان بوون.

عوزێر خان زۆر نیگەران بوو. چەرکەسەکان، چەچەنەکانو قەفقازیەکانی دیکەش رێی کۆچو ئاوارەییان گرتبووە بەرو لەقەفقازەوە چووبوونە دەشتەکانی ئەنەدۆڵو بیابانەکانی عارەبستانو لەوێوە بۆ عێراق، سعودیە، ئوردنو میسر، بەتایبەتی لەجەنگی بالکانەکان، جەنگی دووەمی جیهانیو جەنگی رزگاریدا ئەنەدۆڵ پڕ بووبوو لەو کۆچبەرانەی کە لەبالکان، قەفقازو ئەنەدۆڵی رۆژهەڵاتەوە دەهاتن. ئەنەدۆڵی هەژار، هەژارتر بووبوو.

فرمێسك لەچاوەکانی عوزێر خاندا قەتیس مابوونو هەر نرکەو ناڵەی بووو هەرچی لەدەستی هاتبا بۆ ئەو کۆچبەرانەی دەکرد.

لەو میانەدا، ئەو کەسانەی کە نەیاندەتوانی لەو شوێنانە بمێننەوە کە وەك پەناگا بۆیان دیاری دەکرا، رەوانەی شارۆچکەکان دەکرانو ئەو کەسانەش کە جێگایەکی گونجاویان دەست نەدەکەوت، چەند رۆژێك دەمانەوەو ئینجا دووبارە وەڕێ دەکەوتنەوە.

بەڕێوەبەری ناحیە، بەڕێوەبەری داراییو کاربەدەستانی دیکەی شارۆچکە، بەسەرپەرشتی عوزێرخان، هەرچی لەدەستیان هاتبا بۆ کۆچبەرە ماندووو داماوەکانیان ئەنجام دەدا...

بۆ نەخۆشەکان دوکتۆرو دەرمان، بۆ برسیەکان خواردنو کەمە پارەیەك. ماسیگرانی کەنارەکان بەلەم بەلەم ماسی، گوندیەکان ئاردو ساوارو رۆنیان رەوانەی شارۆچکە دەکرد. خوێندنگەی یۆنانیەکان چۆڵ کرابووو کرابووە خەوگەو ئەو کلیمو مافوورو نوێنانەی کە لەیۆنانیەکانەوە بەجێمابوون خەڵکەکە دەیانهێنانەوە خوێندنگاکان. لەو خوێندنگایانە مەنجەڵی گەورە گەورە خرابوونە سەر گۆڕكو چێشتیان بۆ ئەو داماوانە لێدەناو چەند رۆژ خواردنی گەرم ئەو برسیانەی دەهێنایەوە سەرخۆو لەجێی نەرمو گەرمدا پاڵیان دەدایەوەو دەحەسانەوە.

وەهاب بەگ قۆڵی هەڵماڵیبووو لەگەڵ دەستەی کۆچبەرانی شارۆچکە، دێ بەدێ، کێڵگە بەکێڵگە، کێوو دەشتو دوورگەکان دەگەڕاو شوێنێکی گونجاوی بۆ ئەو کۆچبەرانە دابین دەکرد کە روویان لەشارۆچکەکە دەکردو لەو شوێنانەی ئاکنجی دەکردن. عوزێر

خان دەیگوت: "کەسێك لەئێش‌و ئازار دەگات کە خۆی ئێش‌و ئازاری بینیبێت، ئەو سێ جەنگە پشتی شکاندین. دوای ئەو سێ جەنگە هەموو شتێك ژێرو ژوور بوو. ئەو سێ جەنگە مرۆڤبوونی لێسەندین.. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا تۆزقاڵێك مرۆڤایەتی لەبوونماندا ماوە کە..". چنگێك قورگی دەگرت‌و ئەشك لەچاوەکانی هەڵقەیان دەبەست‌و لێوەکانی دادەنانە سەریەك، چاوە شینە گەشەکانی بووبوونە دوو کاسەی خوێن.

لەو میانەدا، بەلەم بەلەم منداڵ‌و پیرو نەخۆش دەهاتنە دوورگەو دەگەڕانەوە، هیچکامیان لەئادەمیزادان نەدەچوون. لەچواردەوری خۆیان دەڕوانی‌و ئینجا بەخێرایی بەرەو لای بەلەمەکان رایاندەکرد. هەندێکیشیان تەواوی رۆژ لەمسەری دوورگە دەچوونە ئەوسەری‌و ئۆقرەیان نەبوو، هەندێکی دیکەیان دەرکەی خانوو، دووکان‌و ماڵی چێشتلێنەرەکانی کلکەی دوورگەیان یەك یەك دەکردەوە. سەرێکیان بەژووریٰ دادەگرت‌و پاشان دەهاتنە ژێر چنارەکان کۆدەبوونەوەو دەکەوتنە قسەو مشتومڕکردنەوە. هەندێکیان پێیانخۆش بوو بمێننەوەو هەندێکیش دەیانویست بڕۆن. سەرەنجام سواری بەلەمان دەبوون‌و لەکاتێکدا سەیری دوورگەیان دەکرد، دوور دەکەوتنەوەو دەڕۆیشتن. بەلای هەموو ئەوانە دوورگەکە پارچەیەك بوو لەبەهەشت، بەڵام با پارچەیەکیش بێت لەبەهەشت چی لێدەچێندرێت؟ هیچ... نەدەتتوانی بزنێکی لێ بەخێو بکەیت، نە مەڕێك‌و نە ئەسپێك، ئەی کەوایە ئەوانی پێشتر لێرە بوون‌و رۆیشتوون، لێرە چیانخواردووە؟ چیانخواردۆتەوەو ئەم خانووە جوانانەیان چۆن دروست کردووە؟ چ کاڵاو شمەکێکیان لەم دووکانانە فرۆشتۆتە کڕیارەکانیان؟ ئایا ماسیگریان کردووە؟ یانی پێویستیان بەفێربوونی ماسیگری نەبووە؟ بۆ ماسیگری بەلەمی ماتۆڕدارو بەلەم‌و قولابیان گەرەك نەبووە؟ ئەو باخە چین چینانەی بەقەد ئەو گردەوە، ئەو دارزەیتوونانەی ئەو پێدەشتە، ئەو غەڵێفانەی مێشەهەنگان، ئەو هەڵۆژەو دارهەنارانە بەشی چەند کەسانی دەکرد؟ حکومەتیش هیچ یارمەتی ئەو کەسانەی نەدەدا کە ماڵ‌و حاڵی خۆی جێهێشتبێت... کەس ناخورێنێت پشتی من، جگە لەپەنجەی دەستی من.

ئەو گوندە سوتماك‌و وێرانەی سەر ئەو شاخە، ئەو زەویە هەموارو دێمەی کە هەرگیز گاسنی بەخۆوە نەدیوە، ئەو حەمکە خانووە کە لەگەڵ زەویدا تەخت کراون، ئەو وێرانانەو ئەو دوورگانەی هێندەی لەپی دەستێك، کە دەڵێی بەهەشتن، هەر کامەیان بگریت ئومێدێکە، جوانترین‌و فراوانترین دوورگەکان، گوندەکان‌و شارۆچکەکان

کامەیان بگریت ئومێدێکە، جوانترین و فراوانترین دوورگەکان، گوندەکان و شارۆچکەکان ماوەیەك بوو پڕبووبوون لەخەڵك، کۆچبەران ماوەیەك پێشتر لەو دوورگەو لادێیانەدا نیشتەجێ کرابوون، ژمارەیەکیان کە لەشوێنی نالەبارو ئالوودە بەپەتاو نەخۆشیو زەوی بێپیتو بێبەرهەم نیشتەجێ کرابوون، لەبەرئەوەی نەیانتوانیبوو لەو جۆرە شوێنانە بژین، دەست بەتاڵو پەرێشانحاڵ رێگەیان گرتبووەبەر بۆ دۆزینەوەی شوێنی دی... هەندێکیان کە لەئاقاری نێوان گوندەکاندا نیشتەجێ کرابوون، رووبەڕووی تووڕەییو ناڕەزایەتی دانیشتوانی ئەو گوندانە بووبوونەوە. ئەو کەسانەی کە دوو دووو سێ سێ پەنایان بردبووە بەر ماڵی کەسانی ئەو گوندو شارۆچکە گەورانە، لەخۆشحاڵیان خەنی بووبوون. هەندێکیشیان کە پێشتر یان دواتر لەوان هاتبوون، لەهاوسێو خزمو کەسو خوشكو براکانیان دابڕابوون. لەو ئاشووبو بێسەراییەدا هاوشاریو باوكو دایکی خۆیانیان لێ ون بووبوونو کەسانێکیش کە لێیاندەبڕاو زەوی بەرپێیان گیری دەکردن، بەناچاری دەمانەوە.

لەناکاو ئەو هاتنو چوونەی کۆچبەرەکان بۆ دوورگە راوەستا. ئەو کەسانەی کە سەرگەردان لەدوورگەدا مابوونەوە دەستیان نەدەچووە هیچ کارێك، تەنانەت نەدەچووە راوەماسیش، لەبەیانیەوە تا شەو دادەهات لەژێر دارچنارەکان دادەنیشتن، چاویان دەبڕیە دەریاو لەچاوەڕوانی بەلەمێکی بچووك، یان بەلەمێکی ماتۆڕدار جار جار تەنها چەند وشەیەکیان لەدەم دەهاتەدەر. تەنها مەلەك خانم رۆدەچووە نێو خەیاڵو دەریا هەموو شتێکی لەبیردەبردەوەو لەکاتێکدا چیای بەرامبەری نیشان دەدا، دەیگوت بەو چیایە دەڵێن قازداغی هەزارو یەك کانی. لەوێ کچێکی زەرد هەبووە کە هەموو قازو باڵندەو پەزە کێویەکانی لەدەوری خۆ کۆدەکردنەوەو لەگەڵیان بۆ ئەملاو ئەولا رۆیشتووە. ئەو چیایە زێدی منە، باوکی ئەمە - قەدریی بەلەموانی نیشان دەدا- نوور بباریتە گۆڕی، بۆ شوانەتی هاتە گوندەکەی ئێمە. من عاشقی بوومو ئەویش عاشقی من بوو. پێکەوە رامانکرد, کۆچەرەکان بۆ لەوەڕگا دەچوونە کوێستان، باوکی ئەمە شوانێکی لێهاتوو بوو، چوو بوو بەشوانی ئاغایەکی کۆچەرەکان کە مێگەلێکی گەورەی بزنو مەڕی هەبوو، براکانم کاتێك پێیانزانی ئێمە رامانکردووە، هاتنە کێوی مەزنی هەزارو یەك کانی کە بماندۆزنەوە. ئەگەر ئێمەیان بدۆزیبایەوە دەیانکوشتین. سێ لاو کە تا ددان چەکدار بوون، ئەو سەرچیا گەورەیان بەدوای ئێمەدا لێکدابوو. کۆچەرەکان هەرزوو ئێمەیان

ئاگـادار کـردەوە. بـەنیازی ئـەوەی پـەنا ببەینـە بـەر حکومـەت ئـەویمان بەجێهێشـتو رامانکرد، بەڵام چونکە ئەوێ جەندرمەی لێبوون هاتینـە ئـەو شارۆچکەیە. بـاوکی ئەمـە رۆیشت، بـاوکی ئـەم قـەدریی بەلەموانـەی مـن، بـوو بەشـاگردی پیاوێـك کـە ئـەم بەلەمـە ماتۆڕدارەی دایە ئێمە. ئەو ساڵە ماسییێکی زۆریـان راوکـردو پارەیـەکی باشـیان پێکـەوەنا، ئینجـا لەشارۆچـکە خانووێکمـان دروسـت کـردو لەباخچەکەشـیدا دارپرتـەقاڵمان چـاندن. دارپرتـەقاڵەکان گەورە بوون، ئەو ساڵەی کە هاتین ئەم قەدریی گیانە هاتـە دونیـا. کاتێـك درەختەکان هاتنەبەر، بەلەموان تەواوێك گەورە بووبوو. ئەو سـاڵە هـەموو پرتەقاڵـەکانی باخچەی، چ ئەوانەی لاسووتاوو چ ئەوانـەی زەرد بووبـوون، خـواردن. نـە مـنو نـە بـاوکی نەمانتوانی یەك پرتـەقاڵیش چیە لەدەستی دەربێـنینو تامیـان بکـەین. ئـەم بەلەموانـە کاتێك کـە منـداڵ بـوو بـاوکی بردیـە نێـو بەلەمـە ماتۆڕدارەکـەی سـەرۆكو لـەوێ کردیـە شاگردی خۆیان. کارێکی چـەند باشـی کـرد کـە بردیـە ئـەوێ. ئـەو دارپرتەقاڵانـە زۆریـان پرتەقاڵ دان، هەم لێمانخواردنو هەم فرۆشتنیشمان. بەلەموان پاشـان دڵـی ئێشـا، چـونکە تۆزێکیش پرتەقاڵی نەدەخستە دەمیـەوە. زۆری نـەبرد جـەنگ هەڵگیرسـا. کەشـتیگەلێکی بەگەورەیی کێوێك هاتنە ئەوبەری دەریای چاناك قەڵا. دەستیان کرد بەسەربازگیری، هەر کەسـێکیان بگرتبـا دەیـانبرد. مـن بـەباوکی ئەمـەم گـوت سـەیر بکـە، مـەڕۆ بـۆ سـەربازی، هەرکەسێك بچێتە ئەوێ ناگەڕێتەوە. وەرە بـا رابکـەین بـۆ چیـای ئێمـە، رابکەینـە چیـای هەزارو یەك کـانیی ئێمـە، کـە هـەرکانییێکی بـۆنی پوونگـەی لێـدێت. سـەیر بکـە، بووینـە خاوەن کوڕ، تۆش دەزانیت، کـە منـداڵی ئـەو کچـەی رەدوو دەکـەوێت کـوڕ بێـتو کوڕەکـە لــەباوەش بگرێــتو بچــێتەوە لای مــاڵی بــاوان، ئــەوان نــەك هــەر نــایکوژن، بــەڵکو لەخۆشحاڵیاندا ئاهەنگیشی بۆ دەگێڕن. منیش زۆر حەزم لێیە بیانبینینەوە. باوکی ئەمە لەشێتی داو گوێی لەقسەم نەگرت. رۆژێك بەیانی زوو هەڵیانگرتو بردیان، کەوتمـە دوای بینــیم جێگایــەك پــڕە لەهاوتەمەنــەکانی ئــەو. دایکــان دەگریــان، خوشــکان، برایــانو نۆبووکـەکان پەرێشانو نیگـەرانن. مـن نـەگریام، ئـاوا لـەوێ راوەسـتام. بـاوکی ئەمـە ئـاوا سەیری کردمو پاشان سەری خـۆی داگـرتو ئیـدی نـەیتوانی سـەیرم بکـات. شـەو داهـاتو هـەوا تاریـك بـوو، دواتـریش رۆیشـتبوون ئـەو کەشـتیانە نـوقمی ژێـر ئـاو بکـەن. لـەنێو کەشـتیەکانەوە دایانگرتبوونــە بــەر رێژنــەی گــوللان. حەســەن تۆپــاڵی ســەرباز هاتــەوە. حەسەن تۆپاڵ قارەمانێك بوو بۆ خـۆی، یـەکڕیزو بێسـپانەوە دەگریـا، لێمپرسـی چبووە؟

گـوتی، هـیچ مەپرسـە، ئـەوەی تـۆ لەسـەنگەری تەنیشـتمەوە بـوو. گوللـە وەك بـاران بەسەرماندا بارین. بەردو خاكو خوێن لەهەواوە رژایـە سـەرمان، كاتێـك ئـەو دووكەڵـەی دەوروبـەرمان رەویـەوە سـەیرمكرد قاچـەكانم نـەماون، گـوتم خوایـە قاچـەكانم لـەكوێن؟ پاشـان هـەموو دونیـا تاریـك داهـات. لای دكتۆرەكـان كـە هاتمـەوە پرسـیم چـی روویـدا؟ خودایە چی روویدا، تۆزو هەواو خوێن. تـۆزو هـەواو خـوێن. بـەو چیایەی بەرامبـەرمان دەڵێن چیای هەزار كانی.

لـەوێ رۆژێـوە تـا ئێسـتا مەلـەك خـانم هـەموو رۆژێـك لەگـەڵ كۆمـەڵێك، دێـت لـەژێر دارچنارەكان دادەنیشنو چاوەڕێی تێپەڕینی بەلـەمێكی ماسـیگری یـان بەلـەمێكی ئاسـایی دەبن، بەڵام لەدونیایەكی كشومات بەولاوە هیچیان نەدەبینی، نیگای مەلەك خـانم لەسـەر چیای قازداغی دەگیرسایەوەو دەسـتیدەكرد بەقسانو پێـدادەهات. چـیای قـازداغی، بـەردە مەرمەڕەكانی قازداغی، بێرمەی حەسەن بوغلـدو، هەكایەتـەكان، ئەفسانەكان، مانگـەكانی خدر ئەلیاسی عەلەویەكان، سەمای سەدان كەس لەو مانگانەدا، لەو سـەماكردنەدا، كچـانو كـوڕان دەسـتكەكانیان لێكدەكردنـەوەو دەخولانـەوەو لـەنێو ئـەو جلوبەرگـە سـپیانەیاندا دەبوونە باڵندەو دەكەوتنە باڵەفڕێ. باوە پیرەكان شەست هـەفتا سـازیان پێكـەوە دەژەنـی، لـەنێو سـەمادا مـرۆڤ زینـدوو دەبـووەوە، وەك ئـەوەی چـووبێتە بەهەشـتو گەڕابێتـەوە. خۆیان دەشـۆن، پـاكو خـاوێن دەبنـەوە، دروسـت وەك ئـەوەی تـازە لـەدایك بـووبن، بـەڵام قــەدریی بەلــەموان نەیــدەتوانی هــەموو جارێــك دانیشــێتو گــوێ لەقســەكانی بگرێــت. هەفتــەی دووجــاران بــۆ كڕینــی شــتومەكو خواردەمــەنی دەچــووە شارۆچــكە. كاتێــك دەگەڕایەوە كە دایكی ماندوو بووبوو، دەنگی ئیدی ئەو ئەفسوونەی پێشتری نەدەما.

رۆژێك بەیانی زوو، ئەو دەمەی ئاسـۆ خـەریك بـوو روونـاك دەبـووەوە، دونـدی چـیای قازداغی زەردە لێیدا. مەلەك خانم وەكو رۆژانی دی دەستی كردەوە بەقسانو گێڕانـەوەی بیرەوەریەكانیو گوتی: "ئەو چیایەی كە لەوێیە". بەدەستی ئاماژەی بەچیایەكە كرد.

ڤاسیلی گوتی: "چیای قازداغیە. ئێمەی یۆنانی پێیدەڵێین ئیدا. ئەوێ شوێنگەی ژیانی خواكان بووە".

مەلەك خانم كـە دەمو چـاوی رەنگێكـی پەمـەیی تۆخیـان گرتبـوو، بەدەنگهەڵێنانـەوە گوتی: "بیستم، هەموو دێهاتەكانی ئەو چیایەو هەزارو یەك كانیەكەشی شارەزام. چ خواو موا لەوێ نین. لەكۆشكی بلوری خواكانیش چ باسێك نیـە. ئێـوەی یۆنـانیش مرۆڤگـەلێكی

سەیرن. کچی زەردیش لەویٚ نیە. زۆر لەمێژە چۆتە بەر دلۆڤانی خوا. لەقازو مازانیش خەبەرێك نیە. تەنها شوێنگەی کچی زەردی پارێزکار ماوە. من بینیومە. بەتاوێران دیواریان هەڵناوە. کچی زەرد کاتێك کە ماندوو بووە لەویٚ دانیشتووە، هەڵۆشی لێبوون، هەڵۆی زۆر، هەندێکیان سوور بوونو مسی. دەڵێن لەزەمانی بەریٚ لەهەزار کانیدا خواوەندی زۆر هەبوون. مەگەر خوا دەتوانێت جیٚو مەکانێکی هەبێت؟ خواکان چوونە کویٚ؟ مردن؟ ئەو خوایەی تۆ باسی دەکەیت چۆن دەشێت بمرێت. تۆ بێدەنگ بە، مەگەر عەقڵت لەدەست داوە؟"

هەستا، دەستی خستە بەر پشتێنی، گوتی: "ئێوەش ئەگەر خەیاڵ دەکەن کە بەهاتنی سیٚ رووتو رەجاڵ دوورگەکەمان ئاوەدان دەبێتەوە، وەکو ئەم ڤاسیلە عەقڵتان لەدەست داوە. هیچ نەبێت بڕۆن بەخواکانو کچی زەردو ئاژەڵەکانی بێژن بهێنە ئێرە. بەمشێوەیە دوورگە ئاوەدانتر دەبێتەوە". دەنگی خۆی بەرز کردەوە. "یاللاّ رابن بتانبینم، بێچارەینە! کارو ماسیەکان چاوەڕێتانن. ئەوەندەی ساوار بخۆین ورگمان هەڵمساوە".

رۆیشت دەستی پویرازی گرت، رەفتاری نەرمو نیان بوو لەگەڵیدا:

"هەستە برا، هەستە کوڕەکەم. پویراز ئۆغلووی هێژا، تۆ سەیری ئەمانە مەکە. ئێمە لێرە پێنج کەسین. ئێمە بەسین هەم بۆ خۆمانو هەم بۆ ئەم دوورگەیەو هەم بۆ چیای بەرامبەرمان، هەزار کانی".

پویراز بەپێکەنینەوە هەستایە پیٚو گوتی: "بەسین. تەنانەت دەتوانین کاری زیاتریش بکەین مەلەك خانم. خوشکی گەورەی من، خوشکی عاقڵی من".

دەستی لێناشی گرتو هەڵیساند، کاتێك لەگەڵ ئەو دەدوا ئەدای قسەکردنی پڕبوو لەمیهرو خۆشەویستی:

"لێنا عاقڵە، هەم خۆی جوانە، هەم دڵی، ئێمەش فریوی ئەو شێتانەمان خواردو بەرۆژان چاومان بڕیە ئەو دەریایە چۆڵە. نایەن، با قەت نەیەن، بابچنە جەهەننەم. ئەگەر بێن، زەیتوونەکان، تریٚو باخچە پڕ لەسەوزاییەکان، هەنارە پەمەییەکان کە هێندەی شووتی دەبنو هەنجیرە هەنگوینیەکانمان دەقاپێننو هیچشتێك بۆ خۆمان نامێنێتەوە، تەنانەت هەنارەکانی باخچەی منیش دەدزن". قۆڵی لێنای گرتو پێکەوە بەرەو دارزەیتوونەکان وەڕیٚ کەوتن.

پویراز گوتی: "یاللاّ ڤاسیلی بەلەم ئامادە بکە، قەدریی بەلەموان تۆش وەرە. ماسیو هەموو شتێکی دیکەمان لەبیر کردوون. بەقەولی مەلەك خانم باشتریش کە نایەن. ئەگەر

بێن، مەگەر دەیانەوێت گیانێکی دیکەمان پێببەخشن. هەرکەسێکی بیەوێت لەنێو ئەو مەحشەرەڕا بێتە ئێرە بۆ خۆی دەردێکی بێدەرمانی هەیە. دێن ئەوجا دەبێت بەرگەی دەردو ئازارەکانیان بگرین".

لەو ماوەیەی کە خەریکی قسان بوو، ڤاسیلی بەلەمی ئامادەکردبووو ماتۆڕەکەی داگیرساندبوو، رۆیشتنو سواربوون. ڤاسیلی ئەوانی بردە شوێنێك لەنزیکی دوورگەی کابا کە پڕبوو لەماسی. خولەخولی ماسیان بوو تا هەوا تاریك داهات هەر ماسیان گرت.

پویراز گوتی: "ماسیگریش کارێکی باشە وانیە. ئێرە هەمیشە ئاوا ماسی زۆرە؟ هەمیشە ئاوایە هەر ماسییێکت بووێت لێرە هەیە؟"

ڤاسیلی گوتی: "ئۆوو، چدەڵێیت برا، ئێمە لێرە ماسیمان دەناردنە ئەمریکا، زەیتوونی بەستەبەندکراو، بەسەوەتە هەناری پەمەییو گەرای ماسیمان دەناردن. تۆ چدەڵێیت برا. لەئیتاڵیاو ئینگلستانو فەڕەنسە قوماشو لەسوێدەوە ماتۆڕ بۆ بەلەمەکانمان دەهات. ئەو دووکانانە پڕ پڕ دەبوون.

گرانترین کراسو پێڵاو لێرە دەفرۆشران، لەئەستەنبۆلو ئزمیرو حەلەبو بەغداو شام بۆ کڕینو فرۆشتن دەهاتنە ئێروکانە. کەشتی خاوەن خانووەکانی دەربەندی دوورگە لەئەسیناو ئەستەنبۆلو ئەمریکا کۆمپانیای بازرگانیان هەبوو".

"بەڕاستتە؟"

"بەڵێ، ئەی چی! چێشتلێنەرەکان پێش ئەوەی جەنگ هەڵبگیرسێت، هەر کە بۆنی هەڵگیرسانی جەنگیانکرد سواری کەشتیەکانیان بوونو رۆیشتنو تەنانەت سەیری دواوەی خۆیشیان نەکرد، وەك ئەوەی لێرە لەدایك نەبووبن، لێرە گەورە نەبووبنو نانو نمەکی ئێرەیان نەکردبێت".

"بەڕاستتە؟"

"خانووەکانیان ئاوا چۆڵو هۆڵ مانەوە. ئەو کۆچبەرە پێپەتیانەش دوورگەی ئێمە پەسند ناکەن. راستیت بووێت بەرگەگرتنی ئەمە بۆ من سەختە، بۆ منیش سەختە، بەڵام بەدبەختانە چیبکەن، ماسیگر نەبن ئەم دوورگەیە هیچیان ناداتێ"..

"باشە ئەوانیش باببنە ماسیگر".

"تۆش بڕۆ زەوی بکێڵە، بکێڵەو دروێنە بکە. دروێنە بکە بزانم چۆن دروێنە دەکەیت".

"خەڵکی ئێمە، پیرو لاو، کاتێك کە لێرە دەڕۆیشتن هەموویان گریان. بیکێڵە، خۆ تووتنەوانی کارێکی ئەوەندە سەخت نیە"

"هەڵبەتە كە سەختە، ماسیگری كارێكی سادەیە؟ كەسێك كە شارەزا نـەبێت دەتوانێـت ماسی بگرێت؟"

"ناتوانێت بگرێت".

"زوو دوورگە پڕ دەبێت لەخەڵك. شوێنێك كە بەقودرەتی خوا دروستكرابێت، مەگەر دەشێت ئـاوا چـۆڵو هـۆڵ بمێنێتـەوە؟ بەمزووانـە خـەڵكانێكی زۆر دەبیـنین، كەسـانێكی برسی، نەخۆشو تادار، شێتو وێت، كەسانێك كە شێوەیان لەمرۆڤ ناچێت، كەسـانێك كـە هەزار جار لەبازنەی گەمارۆی ئاگرو مردن دەربازیان بووە. پاشان حەسرەتی ئـەم ڕۆژانـە دەخۆین. خۆزگە كەس نەدەهات. ئەنەدۆڵ هێشتا شێواوە، هێشتا هێـور نەبۆتـەوە، هێشـتا لەسەر پێیە، كۆچبەرەكان هەموو ئەنەدۆڵیان پڕكردووە. ئەنەدۆڵ لەسەر پێیـە، بـەژنانی مێرد لەدەسـتداو، دایكـان، منـداڵانی بێبـاوك كـەوتوو، شارۆچكە سـووتماكەكان، هـەزارەها سەگی بێمێگەل لەمسەر بۆ ئەوسـەر دەڕۆنو دەگەڕێنـەوە. مەترسـە بەمزووانـە ئەوەنـدە خـەڵك ڕوو لێـرە دەكـەن، كـە دوورگـە پـڕ دەبێـت لەخـەڵكو جێگـا نامێنێتـەوەو ئـەوانی درەنگ بگەن نیگەرانو داماوانە دەگەڕێنەوە".

"ئەگەر وایە بۆچی ئەو هـەموو ماوەیـە لێـرە لەئەسكەلە دانیشـتووین، چـاوەڕێی چی دەكەین؟"

"كونجكۆڵی، چاوەڕێین ببینین كەی دێـن، چ جـۆرە كەسـانێك دێـنو ئەوانـەی كـە دێـن جنن یان پەری. ئادەمیزاد تا ماوە كاری چاوەڕێكردنە".

ماسیەكانیان خستنە نێو دوو پەقرەجو لەبەلەم دابەزین، بەلەمیان ڕاكێشایە سەر لـی قەراخ ئاو. قـەدریی بەلـەموان چـرا دەسـتیەكەی داگیرسـاندو بەپەقرەجەكانـەوە لەبەلـەم دابەزیو دەستیكرد بەپاككردنەوەی ماسیەكان.

پویراز پرسی: "خانمەكان لەكوێن؟"

ڤاسیلی بەدەنگی بەرز بانگی كرد: "دایە لێنا، مەلەك خـانم!" كـەس وەڵامـی نەدایـەوە. لەكاتێكدا لەبەرخۆیەوە قسەی دەكرد، چووە لای قەدریی بەلەموانو پرسی: "ئەو خانمانە دەبێت چووبنە كوێ؟"

قەدریی بەلەموان گوتی: "مـن دەزانم دایكـم چۆتە كوێ. لەوەتـەی هاتووینەتـە ئێـرە هەموو ڕۆژێك كەللـەی سـەحەر دەچێتە سـەر ئـەو كانیـەی سـەرەوەو لـەوێ دادەنیشـێت، لـەوردە بەردەسـپیەكانی نێـو كانیەكـە ئـەو كاتـەی كـە تیشـكی خۆریـان لێـدەداتو

دەبریسکێنەوە، رادەمێنێت. ئاوا چاویان تێدەبڕێت، پاشان بەڕاکردنەوە دەگەڕێتەوە ئێرەو لەسەر ئەسکەلە دادەنیشێتو نەك وەك ئێمە کە سەیری دەریا دەکەینو چاوەڕێ دەکەین کەسێك بهێت، بەڵکو تەماشای ئەو چیایەی بەرامبەری خۆی دەکات. ئەگەر ئێستا بچین دەبینین ئەوو دایکە لێنا لەسەر رۆخی کانیەکە روونیشتوونو لەئاوی کانیەکە نز بوونەتەوە. ئێستا لەمساتەدا لەوەها شەوێك کە تریفەی مانگ لەئاوەکە دەدات. من بچم بیانهێنمەوە، تۆش ئەو ماسیانە پاك بکەوە".

بۆلای سەرەوە، بۆلای کانیەکە چوو. تریفەی مانگ سێبەرەکەی بۆ پێشەوە دەبرد، ئەوانی لەسەر رۆخی کانیەکە لەکاتێکدا هەردووکیان بۆلای ئاوەکە داهاتبوونەوەو کڕوکپ بیریان دەکردەوە، دۆزییەوە. تەنانەت چرپەی پێی ئەویشیان نەبیست.

"دایکە لێنا!"

مەلەك خانم گوتی: "سەیربکە، سەیر، ببینە بەلەموانی من، چی دەخولێتەوە".

"چی دەخولێتەوە، تریفەی مانگە شەو؟"

"تریفەی مانگە شەویش دەخولێتەوە، دەخولێتەوە، ئەو نیە، ئەو نیە، ئەو زیندەوەرانەی کە دەخولێنەوە، سەیر بکە بەلەموانەکەی خۆم. لەکانیەکانی کێوی ئێمەشدا ئەو زیندەوەرانە ئاوا دەخولانەوە. لەمسەری ئاوەوە بۆ ئەوسەر، ببینە، لەچاوقوچانێکدا، ناخەون، شەوان لەبەر تریفەی مانگە شەویشدا خول دەخۆن، ببینە سێبەریشیان دەکەوێتە ژێر ئاوەکەوە، سەیر بکە، سێبەریان لەژێر ئاوەکەدا هەڵدەبەزێتەوە، هەڵدەبەزێتەوە، سەیر بکە!"

"هەستە دایکە، ئێمە لەماسیگرتن گەڕاینەوە".

"رابە خوشکە لێنا رابە. ماسیگرەکانی ئێمە گەڕاونەتەوە، رابە." مەلەك خانم دەستی لێنای گرتو هەڵیستاند.

"چەند جوان لەسەر ئاوەکە یاریان دەکرد، لەژێر ئاودا دەبریسکانەوە، سێبەری زیندەوەرەکان دەکەوتە سەر وردە بەردە سپیەکانی ژێر ئاوەکەو لەچاوقوچانێکدا باڵیان لێکدەداو دەڕۆیشتن. چەندیش جوان".

بەلەموان لەپێشو ژنەکان بەدوایدا چوونە ئەسکەلە. پویراز ئاگرێکی گەورەی کردبووەوە. ماسیان خستنە نێو خوێ. بۆنی چڕی رۆنی ماسی ئاسمانی دوورگەی پڕ کردبوو. ماسیەکانیان لەبەر رووناکیو لەدەوری پەنگرەکان، کە کەمێك لەولاتری

ئاگرەکە کۆیانکردبوونە، خواردن. دەستیان لەسەر کانیەکە شوشتن، گەڕانەوە ماڵێ و یەکسەر خەوتن.

ئیدی لەسەر ئەسکەلە دانەدەنیشتن، نە چاوەڕێی بەلەمی ماتۆڕدارو بەلەم و کەشتیی چارۆکەداری چێشتلێنەرەکان بوون، نە چاوەڕێی تێپەڕینی کەشتییێکی بچووکی نێو تەم و مژی دوور. هەرتەنها مەلەك خانم بەبیانووی بەڕێکردنی ئەو کەسانەی کە بۆ ماسیگرتن دەڕۆیشتن، دەچووە ئەسکەلەو کاتێك ماسیگرەکان ماتۆڕی بەلەمەکانیان پێدەکردو لەو دیو دوورگە لەبەرچاوان ون دەبوون، دەچووە ژێر چنارەکان و دادەنیشتە سەر تەختێك، چاوی دەبڕیە قازداغی هەزارو یەك کانی. کەمێك دواتر لێناش دەهات و دادەنیشتە سەر تەخت و دروست وەکو مەلەك خانم گەردنی هەڵدەکێشاو بەچاوانی بچووکیەوە دەیڕوانیە قازداغی، کاتێك هەستیان دەکرد ماندوون هەڵدەستان، مەلەك خانم لەپێش و لێنا بەدوایەوە. دەڕۆیشتن و لەوێ چاوەڕێیان دەکرد تا زیندەوەرەکانی نێو ئاوەکە دەهاتنە دەرو بەسەر ئاوەکە دەخشین. زیندەوەرەکانیش ئەوانیان زۆر لەچاوەڕوانی نەدەهێشتەوە. بەخێراییەکی یەکڕەوتی لەمسەری ئاوەکەوە بۆ ئەوسەر دەخشین و دەگەڕانەوە.

هاوکات. سێبەریشیان لەژێر ئاوەکە بریسکەی دەهات و بەسەر وردە بەردەکاندا دەچووو دەهات، هەندێك عەندەدیلە بەباڵە تیژەکانیان هەوای ژوور سەریان شەق دەکردو لەکانیەکە نزیك دەبوونەوەو یەکسەر بەهەمان خێرایی بەرەو ئاسمان تێهەڵدەچوونەوەو لەسەر دەریا لەبەرچاوان ون دەبوون.

"لەقازداغی ئێمەش عەندەدیلەکان ئاوا بەم خێراییە کە بەچاو نەدەبینران، دەهاتن و هەرکە نووکی یەکێك بەباڵەکانیان لەئاو دەدا ون دەبوون لەقازداغی ئێمەدا. هەزارو یەك کانی".

زۆربەی کانیەکان لەنێو زنارەکانەوە هەڵدەقوڵێن. نێو کانیەکان بەزۆری بەوردە بەردی سپی داپۆشراون. زیندەوەرەکان بەسەر ئەو وردە بەردە سپیانەدا دەخشن و لەمسەر بۆ ئەوسەر بروسکەئاسا دێن و دەچن. تیشکی خۆر بەر زنارەکانی دەوروبەر دەکەوێت، ئەو نێوە پڕ دەبێت لەپوونگی کێوی بەگوڵی وەنەوشەیی، کە تا ئەژنۆ بەرز دەبێتەوە. بۆنی پوونگە مرۆ دەخاتە حاڵەتی مەستبوون و کار لەهەموو بوونی دەکات، کار لەزنارەکان، درەختەکان، گژوگیاکان، گوڵ و گولیلکەکان، خاك، ئەو باڵندانەی بۆ

ئاوخواردنەوە دێنەخوارێ، دەکات. کار لەو مارانەی بەملاو ئەولاودا دەخشن، زەردەواڵەی زەرد کە دێنە سەر ئاو، مێشە هەنگو زەنگەتەی سوور، دەکات. بۆیە هەنگوینی ئەم ناوە بۆنی پوونگە دەدات.

"ئاە، ئاە! سێوە لاسوورو ئاسکە قاوەییو ڕەشەکانی قازداغی ئێمە، ئاە!"

خۆر بەهێمنی لەرۆژئاوابووندا دادەنیشتە نێو دەریا. هەستان. لێنا داهاتەوەو سەبرۆکە چرپاندیە گوێی مەلەك خانم: "دەمەوێت شتێکت نیشان بدەم، بەلاّم بەهیچکەسی مەڵێ، باشە؟"

مەلەك خانم گوتی: "بەهیچکەسی ناڵێم".

"کەواتە وەرە".

لەکاتێکدا سەرچڵو قەدی گیاکانیان لێکدەکردنەوە، بەدەوری دەوەنەجارەکاندا دەخولانەوە، کە بەگوڵی زەردو پەلکی مس ڕەنگیانەوە داپۆشرابوونو هاتنە نزیك دەوەنە پانو پۆرەکان، کە گەلاّو پەلکەکانیان وردو قاوەیی تۆخ بوون.

لێنا بەدەنگێك کە دەبیستراو نەدەبیسترا، گوتی: "وەرە لێرە لەتەك منەوە لەسەر دەم رابکشێ".

ئەو خۆی یەکسەر راکشا، لەبەردەمیدا شتێکی شینباو لێکبووەوە کە دڵی تژی بوو لەشادومانی، دەوروبەر پڕبوو لەبۆنو بەرامەیەکی مەستکەر.

مەلەك بەگومانو دوودڵیەوە هەروا بەپێوە راوەستا بوو، لەنێو دڵدا بەحاڵی پیرەژن پێدەکەنی.

"زوو لەتەك من رابکشێ. گەرەکمە بتبەمە بەهەشت، ئێستا هەر ئێستا وەرە!" ئەدای دەنگی لێنا ئەوەندە فەرامدەرانە بوو کە مەلەك خانم یەکسەر لەکاتێکدا کەمێکیش شەرمی دەکرد، لەتەك ئەودا راکشا.

"بنۆڕە، بنۆڕە! بۆن بکە".

وەنەوشە لاربووەوەکان دەوری دەوەنەکانیان داپۆشیبووو دەتگوت هەموو ڕەنگە شینەکانی دونیا لەژێر ئەو دەوەنانە کۆبوونەتەوە.

دوو ژن ماوەیەکی درێژ، لەکاتێکدا هیچ ئاگایان لەخۆ نەمابوو، لەسەر دەم راکشابوونو ئاوا مانەوە.

لێنا گوتی: "مەلەك خانم هەستە، لەم جۆرە دەوەنانە زۆر هەن".

هەستان‌و ڕۆیشتن‌و لەژێر دەوەنی دیکەشدا ڕاکشان‌و هەستانەوە، ڕەنگی شین‌و بۆنی وەنەوشەکان کاری لەمۆخی ئێسقانەکانیان کردبوو.

سوێندیان خوارد کە ئەم ڕازە گەورەیە بەهیچکەس نەڵێن.

مەلەك خانم‌و لێنا دیسان لەسەر تەختەکان دادەنیشتن‌و بێئەوەی قسەیەك لەگەڵ یەك بکەن چاویان دەبڕیە قازداغی. پیاوەکان هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو چووبوونە ماسیان. ئەمڕۆ بڕیاربوو ماسییێکی زۆر بگرن‌و بەیارمەتی قەدریی بەلەموان بیانێرن بۆ بەڕێوەبەری ناحیە. وەهاب بەگ، عوزێرخان‌و بەرپرسی تاپۆ، شایانی ئەوەن باشترین ماسیەکانی دەریایان بۆ ببردرێن.

سەریان بەرەو لای بەلەمێکی ماتۆڕداری نارنجی وەرسووڕاند، کە بەخێرایی خەریك بوو دەهات‌و سەیریان کرد بزانن بەلەمەکە دەچێتە کوێ. بەلەم هات‌و بەرامبەریان تێپەڕی‌و ڕۆیشت تا گەیشتە دەربەندەکەو لەوێوە گەڕایەوەو هاتە ئەسکەلەو لەوێ لەنگەری گرت. پیاوێك لەنێو بەلەمەکە بازی هەڵدایە سەر ئەسکەلە. قەدو باڵایەکی زۆر بەرزی هەبوو، بەڕیشێکی درێژی بۆر، شاڵێکی سوور، گۆنای قۆپاو، شەلوارێکی شین لەپا، کڵاوێکی سووری گوڵینگەدار، ئەبرۆی پڕو چاوانی شین‌و بەسپیلکەی زۆر گەورەیان. بەدوای ئەودا ژنێکی قەڵەو هاتەدەر، بەسنگێکی زۆر بەرجەستە، قژی زەردی چندراو، چوست، ران‌و کەفەڵی پان، دامەنی گوڵدار بەگوڵی سوورو شین‌و نارنجی، کە چەند منداڵێك دەوریان گرتبوو، منداڵەکانی یەك یەك هەڵدەگرت‌و دەیدانە دەست مێردەکەی کە لەسەر ئەسکەلە ڕاوەستابوو. پیاوەکەشی منداڵەکانی بەڕیز لەسەر ئەسکەلە دادەنان. منداڵەکان کە بەڕیز لەتەك یەکدی لەسەر ئەسکەلە ڕاوەستابوون، نە دەنگێکیان لێوە دەهات، نە ڕیزەکەیان تێکدەداو نە کەمترین جووڵەیان دەکرد. هەر شەش منداڵە وردیلەکانی سەر ئەسکەلە کچ بوون‌و دامەنەکانی ئەوانیش وەکو هی دایکیان گوڵی ڕەنگاوڕەنگیان هەبوو. قژی هەر شەش کچۆلەکان بەجوانی هۆندرابووەوەو لەنێوەڕاستی هۆنینەوەکەدا سنجاقێك‌و لەناوەڕاستی هەر سنجاقێکدا پارچە زێڕێکی بەگەورەیی سنجاقەکان چندرابوو.

ژنە سنگ‌و مەمك بەرجەستەکە لەتەك پیاوەکە ڕاوەستا. لەیەکەم نیگادا جگە لەسنگ‌و بەرۆکی گەورەی، نازو غەمزەیەکیش لەسیمایدا بەدیدەکرا. بەچاوانی شینی سەرنجڕاکێش، کەزی‌و بسکێکی پانی چندراو، ڕەفتەی وەنەوشەیی ئاوریشمێکی جوانی

سحرئامێز بوو، سەرەڕای سنگی گەورەو رانە قەڵەوەکانی، ژنێکی سحرئامێز بوو. ژنایەتی لەسەرو سیمایدا دەبیندرا.

کابرای بەلەموان دەستێکی بۆ هەڵتەکاندنو لەگەڵ دەنگی پرتەپرتی ماتۆڕەکەی لێیان دوور کەوتەوەو رۆیشت. لەو دەمەدا مەلەك خانم بەرەو لای ئەسکەلە چووو لەبەردەم ئەواندا وەستا: "بەخێربێن، فەرموون بۆ ژێر چنارەکان".

منداڵەکان بێئەوەی ریزی خۆیان تێکبدەن، لەکاتێکدا سەریان لەبەرخۆیان نابووەوە، بەدوای دایکیاندا کەوتنەڕێ، چاویان بڕیبووە مەلەك خانم، بەڕیز لەسەر ئەو تەختەی کە نیشانیان دابوو دانیشتنو چاویان بڕیە کانیەکە. پیاوەکەش هاتو لەهەمان ئەو شوێنەی مەلەك خانم بۆی دیاریکردبوو، دانیشت. نیوە لەمنداڵەکان لای ئەو دانیشتن. لەو ئانەدا لێناش لەنێو قامیشەلانەکە هاتەدەرو هاتەلای ئەوانو بەزمانی تورکی گوتی: "بەخێربێن". دواتر بەیۆنانی قسەی لەگەڵدا کردن. پیاوەکەش بەیۆنانی وەڵامی دایەوە. ماوەیەك گفتوگۆی نێوانیان درێژەی هەبوو. لەو ماوەیەی کە ئەوان خەریکی قسەکردن بوون، منداڵەکان لەگەڵ یەك سەرگەرمی پستەپستکردن بوون و بەشەرمو تەریقبوونەوە پێدەکەنین.

پیاوەکە گوتی: "ناوم هوسمەنە".

"ناوی منیش لێنایە. لێنا پاپازئۆغلو. ئەمەش مەلەك خانم، خەڵکی ئەم چیایەی بەرامبەرە، قازداغی هەزارو یەك کانی".

هوسمەن بەسەر سڵاوی لەمەلەك خانم کرد.

مەلەك خانم هاتو دانیشتە سەر تەختێکی رووبەڕووی هوسمەن. لێنا بەدەست قازداغی نیشان دا.

مێردی مەلەك خانم لەجەنگدا بووە گەردو لەنێو چوو. دایكو باوكو خزمەکانی هێشتاش لەسەر ئەو کێوەن. تورکەکان پێیدەڵێن قازداغی. کچێکی زەرد لەوێ قازی بەخێو دەکرد. ئێمە پێیدەڵێین ئیدا. لەزەمانی زۆر زوودا مەریەمی پیرۆز لەوێدا ژیاوە، تۆ ناوی ئیدای هەزارو یەك کانیت تا ئێستا بیستووە؟"

هوسمەن گوتی: "بیستوومە. ماشەڵڵا، ماشەڵڵا، کێ هەیە لەیۆنان ناوی ئیدای نەبیستبێت".

"ئەوێ وڵاتی مەریەمی پیرۆز بووە. لەوێ منداڵەکەی هێناوەتە دونیا. کوڕەکەی لەوێ چۆتە ئاسمان".

مەلەك خانم بەواقوڕماویەوە سەیری لێنای کرد. چما تا ئێستا نەیگوتبوو مەریەمی پیرۆز لەچیای قازداغی ژیاوەو ئێستا دەیڵێت؟ نەکا مەبەستی لەمەریەم، کچی زەرد بێت، کە پارێزگاری لەقازو کەوو قورینگەکان دەکرد.

"تۆ تا ئێستا قازداغیت بینیوە، برا؟ لەوێ کچێك هەبووە، کچەکە ئەوەندە جوان بووە کە هەمووان عاشقی دەبوون. کچە بایەخی بەهیچ کامیان نەدەدا، قژی دەتگوت ئاوەریشم، چاوەکانی وەك چاوی ئاسکان، بەژنو بالآی وەکو نەمامی تازە هەڵچوو بووە. تۆمەتی دەخەنە پاڵ، براکانی بڕیار دەدەن بیکوژن. شەوێك باوکی هەڵیدەگرێت لەگەڵ خۆیدا دەیباتە سەر چیای قازداغیو بۆ ئەوەی مەرگی کچەکەی نەبینێت لەوێ بەرەڵلای دەکات،. کچەکە نامرێت. شوورەکان شیری دەدەنێو قازو قورینگەکان هێلکەو کەوەکانیش گۆشتی دەدەنێ. لەوێ لەسەر ئەو چیایە گەورە دەبێت. لەگەڵ گیانداران‌و ئاوی ڕەوان‌و باو گوڵان. درەختەکانی سێوو هەرمێو گێلاس‌و گوێز، بەری خۆی پێدەدەن‌و هەنگەکانیش هەنگوینی سپی شانەکانیان".

"ماشەللا، ماشەللا!"

"ئەو کەسانەی ئەویان لەنێو گیانداران‌و باڵندەو شوورو ورچەکانی چیا دەبینی دەیانگوت، وای، وای ئێمە چ هەڵەیەکمان کرد کە بوختانمان بەنەزەرکردەیەکی وا بێگەردو جوان کرد، وای، وای. ئێستا ئێمە نە لەم دونیایە جێگایەکمان هەیەو نە لەو دونیا..".

"ماشەللا، ماشەللا!"

"من خەڵکی ئەو چیایانەم، بەوێ دەڵێن قازداغی هەزارو یەك کانی، کە هەزار جۆرە گوڵ‌و باڵندەی لێن. پیاوەکەم بۆ کارێك هاتبووە چیای ئێمە، هەرکە چاومان بەیەکدی کەوت عاشقی یەکدی بووین. هەردووکمان لەئاگری عەشقی یەکدی دەسووتاین. دواتریش لەچیای هەزارو یەك کانی‌و هەزار گوڵ رامکردو رەدووی خۆشەویستەکەم کەوتم".

مەلەك خانم، پاشان باسی چوونی هاوسەرەکەی کرد بۆ جەنگ‌و هەموو ڕووداوەکەی موو بەموو بۆ باسکردن.

کە ئەو قسەکانی تەواو کرد، لێنا دەستی پێکرد. پاشان لێنا قسەکانی تەواو کردو دووبارە مەلەك خانم دەستی پێکردەوە. تا ئێوارە، ئەو کاتەی ماسیگرەکان لەراوەماسی گەڕانەوە درێژەیان بەقسەکانیان داو رێگەیان نەدا پیاوەکە یان ژنەکەی یەك قسەش چیە بکەن.

لەو بەلەمەی کە بەسەر لمەکەدا راکشرا، یەکەم جار پویراز بازی هەڵداو دواتر ڤاسیلی، بەلەمەکەیان گرتو بەسێ نۆبەت راکێش راکێش بەسەر لمەکەدا هێنایان. نوقمی نێو شادی بوون. قەدریی بەلەموان ئەو ماسیانەی گرتبوونیان خستنیە نێو سەبەتەیەکی تا رادەیەك گەورە، هەرکە ئەو کەسانەی بینی لەژێر دارچنارەکە دانیشتبوون، سەبەتەکەی خستە سەر سەریو لەنێو بەلەمەکە خۆی فڕێدایە سەر لمەکە.

"سەیربکەن کێ هاتۆتە دوورگە! میوان هاتوون!"

پویرازو ڤاسیلی سەریان هەڵبڕیو سەیری ژێر دارچنارەکانیان کرد، یەکڕاست بەرەو لای ئەوان چوون. کاتێك خەریك بوون نزیك دەبوونەوە هوسمەنیش بۆ پێشوازیکردن لەوان هەستایە سەرپێ.

هەرسێکیان لەسێ شوێنی جیادا بەهوسمەنیان گوت: "بەخێرهاتی!" هوسمەن گوتی: "سوپاستان دەکەم. من ناوم هوسمەنە".

هاتنو پێکەوە کەمێك لەولاتری ژنەکان، لەسەر تەختەکان دانیشتن. هوسمەن گوتی: "من هەمان ئەو کەسەم کە ماوەیەك پێش ئێستا بەسێ بەلەمی ماتۆڕداری شینەوە هاتمە ئێرەو ئەم دوورگە بەهەشتیەم پەسند نەکردو گەڕامەوە. هەموو شوێنێك گەڕامو هەموو شوێنێکم بینی، دواتر بەخۆمم گوت تەنانەت ئەگەر بڕیاربێت لەبرسانیش بمرم، باشترە لەگەڵ هاوسەرو شەش کچەکانم لێرە بمرم، بۆیە گەڕامەوە".

"بەخێر بێیت، تا ئێستا گۆڕی کەسێکی برسیت بینیوە؟ ئەم دوورگەیە تەنانەت دەتوانێت سەد خێزانیش بژێنێت. لێگەڕێ ئەوانەی کە رۆیشتن هەر ئاوا بەگەمژەیی بمێننەوە. تۆ هاتوویت بەتەواوی لێرە بمێنیەوە ئیدی؟"

"هاتووم بمێنمەوە، بینیم لەهەموو دونیادا شوێنێك لێرە جوانتر دەست ناکەوێت، ئەگەر دەستیش بکەوێت ئەو شتەی کە دونیا دەکاتە دونیا... هەندێك کەس هەن کە بەهەشت دەکەنە دۆزەخ، هەندێکیش هەن کە لەدۆزەخ بەهەشت دروست دەکەن. ئێرە بۆ خۆی بەهەشتێکە. ئیشاڵلا کارێك دەکەین کە جوانتریش ببێت. هەموو لایەکی ئەنەدۆڵ گەڕاین، بەچەشنێك کە بڕستێکمان نەمابوو. لەوێ دەبێت لەنێو مردنەکاندا یەکێکیان هەڵبژێریت. خەڵکانێکی زۆر لەگرانەتاو برسێتی گیانیان لەدەست دا".

حاڵەتی روخسارو دەربڕینی تاڵ بوو.

"نووکە ئەو شوێنە جوانو ئەو خەڵکە باشەم دۆزینەوە، ئێوە هەرکارێك بکەن ئێمەش هەمان کار دەکەین".

مەلەك خانم هەستاو هاتە پێش‌و راوەستا. گوتی: "هوسمەن، هوسمەن، گوێ بگرە چ دەڵێم. من لەبەرخاتری ئەم ڤاسیلی‌و ئەم خوشکە لێنایەم. ماڵە سپیە وەك گوڵەکەم‌و باخچە گەورە پرتەقاڵیەکەی خۆمانم لەشارۆچکە جێهێڵا و هاتمە ئەم دوورگەیە".

"کارێکی باشت کردووە مەلەك خانم".

"بەڵێ کارێکی باشم کرد، خانووەکەی شارۆچکەم لەنێو باخچەی پرتەقاڵان بوو. لێرە لەبەردەم ماڵەکەم بڕیاربوو ئەو قەدریی بەلەموانە پێنج دارهەنار بڕوێنێت، کە هەر یەك لەهەنارەکانی هێندەی شووتییێك بن‌و تفریان پەمەیی‌و وەك پەردە وابن، بەڵام گفتەکەی نەهێنایە جێ".

هوسمەن بەپێکەنینەوە گوتی: "قەیناکا مەلەك خانم، من باخەوانی دەزانم، لەزمانی دارهەناران دەگەم، پێویست بکات سەرتاسەری دەریای سپی دەگەڕێم‌و دارهەناری وات بۆ پەیدا دەکەم کە تفریان پەمەیی‌و ناسك بێ‌و دەیانهێنم لەباخچەکەتیان دەچێنم".

"بژیت براکەم هوسمەن".

ساتێك بێدەنگ بووو لەفکر راچوو، ئینجا رووی کردە لێناو گوتی:

"خوشکە لێنا، خوشکە لێنا هەستە، ئەمانە لەڕێی دوورەوە هاتوون، لەدەریاوە هاتوون، لەبرسان مردوون، هەستە، ئاگر هەڵکە. ژنەکەی هوسمەن، تۆش هەستە! تۆش یارمەتی خوشکە لێنا بدە. ناوت چیە؟"

ژنەکە لەشوێنی خۆی هەستا، گوتی: "سەبیحە".

"بەلەموان، تۆش ماسیەکان پاك کەوە، بۆ میوانەکانمان ماسیی باشت گرتوون ئیدی، مەگەر نە؟"

"ئەمجارە، لەشانسی ئەوان ماسیی زۆرمان گرتوون".

بەلەموان، سەبەتەی پڕ لەماسی لەنێو بەلەمەکە هەڵگرت‌و چووە قەراخ ئاوو لەسەر چیچکان دانیشت‌و دەستی کرد بەپاککردنەوەیان، زۆر بەدەست‌و برد بوو، لەماوەیەکی کورتدا هەموو ماسیەکانی پاککردنەوەو چوو ماسیەکانی نێو لەگەنەکانیشی هێنان.

"دایکە، باش نەبوو ئەو هەموو ماسیەمان گرتن".

"دایك بەقوربانت بێت بەلەموانەکەی خۆم. دایك بەقوربانی ئەو چاوە رەشانەت". لێنا قاقا پێکەنی‌و گوتی: "بەلەموان، خێزانەکە گەورە بوو، سەیر بکە شەش کچی جوان لەوێ دانیشتوون، قژی هەمووشیان زێڕینە".

لێنا هەرکە قسەکانی خۆی تەواو کرد، یەکسەر چووە ماڵو قاپو چەنگاڵو کەوچکی هێنا. ئەو کچەی کە لەکچەکانی دی گەورەتر بوو، بێئەوەی کەس پێیبڵێت هەستاو بەشەرمەوە گوتی: "دایکە لێنا بێڵە یارمەتیت بدەم".

"دەوەرە".

پێکەوە رۆیشتن، لەباوەشی کچەکە نانو لەنێو دەستەکانی لێنا چەند خوێدانو خاولی... لێنا خوێدانەکانی لەسەر مێز دانانو خاولیەکانی بەلکی دارچنارەکە هەڵواسینو سابوونە پەمەییەکەشی لەسەر بەردی سەرکانیەکە دانا.

چیلکەو دارەکان هی دارزەیتوون بوون. لێنا گوتی: "داری زەیتوون رۆناوینو زوو ئاگر دەگرنو پەنگرەکانیان زۆر باشە.

هەر سێ ژنەکان لەسێ لای جیاوە ماسیەکانیان لەخوێ هەڵکێشانو دایاننانە سەر پەنگران. یەکەمجار منداڵەکانیان بانگی سەر سفرە کردن. کچە گەورەکە بۆ منداڵەکان ماسی هێنانو خستنیە نێو قاپو بۆ هەر کچێك ماسیەکی دادەنا. منداڵەکان ئەوەندە برسی بوون کە، ماسیەکانی بەردەمیان هەر بەئیسقانەوە خواردنو تەواویان کردن. کچەکە بێڕاوەستان ماسی دیکەی بۆ دەهێنان. کچۆلەکان، دوایین ماسیان پێنەخورا، لەنێو قاپەکە مایەوە.

"یاللا. بەڕێزان ئێوەش لەبرسان مردن".

"ئێوەش وەرن مەلەك خانم".

مەلەك خانم گوتی: "وا دێین. سەیربکەن چەند ماسی لەسەر پەنگران ماون".

"دایکە لێنا".

"بێژە پویرازەکەم. ئەگەر شتێکت پێویستە با بیهێنم. هەم ماستیکا دێنم. هەم شەڕاب". رووی کردە کچەکە "تۆ ناوت چیە؟"

کچەکە بەشەرمو لێو بەبزەوە گوتی: "نەرمین".

"زووبە، وەرە نەرمین با بچین شتو متیان بۆ بێنین. یانی ئاوە حەیاتەکە. کچەکە پێکەنی، ئەو قسەیەی نەبیستبوو.

چوونە خانووەکەی تاناسی پیاوچاك، کچەکە بەسێ شووشەی ماستیکا هاتەوەو لێنا بەسێ بوتڵی پڕ شەڕابی سوور.

خۆر لەئاوابوون دابوو، تا توانیان خواردیانەوەو نانەکەیان خواردو تەواوبوون.

هوسمەن وەرسووڕاو شتێکی چرپاندە گوێی پویراز:

پویراز گوتی: "نە، نە، پێویست ناکات بچنە هیچ لایەك".

هوسمەن کیسەیەکی لەگیرفانی هێنایەدەر، کە گوڵدوزی کرابووو گوتی:

"ئەمە بگرە، هەمووی هەر ئەوەندەیە، من لەوێ، لەیۆنان لەوانی دی زووتر لەمەسەلەی گۆڕینەوە ئاگاداربوومەوە. دارو نەداری خۆم فرۆشتو زێڕم کڕی. ئەگەر ئەوەم نەکردبا ئێمەش وەکو ئەوانی دی لەنێو دەچووین. زێڕەکان هەم ئێمەیان رزگارکرد، هەم ئەوانەی لەگەڵ ئێمەبوون. بەهەرحاڵ، پارچە نانێکمان پەیداکرد کە لەبرسان نەمرین".

پویراز قەیتانی کیسەکەی کردەوەو سکەکانی لەسەر لەپی دەستی دانان، سکە زێڕەکانی یەك یەك ژماردن. دوای ئەوەی کە هەموو سکەکانی ژمارد، بەسەر سامیەوە گوتی چەند زۆرن.

"هێی هوسمەن تۆ پیاوێکی دەوڵەمەندیت".

هوسمەن گوتی: "نا، هێشتاش، لەوانە زیاتر." سەری نایەوە بەرخۆی "ماوەیەکی زۆرە لێرەو لەوێ ئاوارەین. بەزەحمەت توانیمان خۆمان بگەیەنینە ئێرە. دوورگەکەی ئێوە. ئەو پارانە با لای تۆبن. لەم دەڤەرە کەس گوێبیستی زێڕی ناپلیۆنی نەبووە. ئەو ناپلیۆنیانەیان بەنرخی دراوی عوسمانی خورد کردەوە، ئەویش بەهەزار تکاو رجا".

پویراز گوتی: "باشە، ئەگەر پێویستی کرد دەچینە لای سەڕافێك لەشارە گەورەکان بۆمان دەگۆڕێتەوە. ئێستا ئەمشەو لای ئێمە دەمێنیەوە، یەك نوێنمان هەیە. ڤاسیلی تۆ لەخانووە کۆنەکەت شتێکت بۆ نووستن نیە؟"

ڤاسیلی گوتی: "هەمە"و بەهوسمەنی گوت: "لەگەڵ من وەرە با بچینە خانووە کۆنەکەمان نوێنەکان بێنین".

چوون لەخانووە کۆنەکەی ڤاسیلی لێفەو دۆشەكو سەرینیان هەڵگرتنو هێنایانن.

"هەم دەتوانن لێرە لەسەر تەختەکان دۆشەك رابخەنو بنوونو هەم دەتوانن بێنە ماڵی ئێمە".

هوسمەن گوتی: "نە، ئەمشەو لێرە دەخەوینو سبەینێ هەموومان پێکەوە دەچین یەکێك لەخانووەکان هەڵدەبژێرین. لەژێر دارچنارەکان شەونمیشمان لێنادات".

هەموو بەرەو نوێنەکانیان چوون. لەدەریا بترازێت دەنگی هیچشتێك نەدەهات.

هوسمەن بەدەنگی باڵندەیەك كە لـەدوورەوەو لەكەشـكەلانی ئاسمـان دەبیسـترا لەخـەو هەستا. جلەكانی پۆشین‌و بۆ قەزای حاجـەت چـووە پشـت قامیشـەلانەكە. بـۆنی نێرگـزی بۆهات. پاشان بۆ تەماشاكردنی دەریا راوەستاوەكە كە جۆرەها رەنگـی جیاجیـای بـەخۆوە گرتبوو چووە سەر ئەسكەلە. كاتێـك چـاوی بەرۆشـناییەك كـەوت كـە لـەقوولایی دەریـاوە دەدرەوشایەوە، حاڵەتێكی سەیری بەسەرداهات. لەسەر بەرزایی چیای هەزاركانیی ئیـداش رۆشناییەك شـەپۆلی دەدا. هـەمووان لەخـەو دابـوون. بـەمیهرو خۆشەویسـتیەوە چـاوێكی لەوانەی نووستبوون، كرد. لەلای قامیشەلانەكەوە بۆنی نێرگـزی بۆهـات. بـۆلای ئەسـكەلە گەڕایەوە، لەوێ رۆیشت‌و لەبەرامبـەر كلێسا راوەسـتاو پاشـان بـەرەو لای دارزەیتوونـەكان كەوتە رێ‌و لەسەر رێگا بـەنێو گوڵـە هێرۆكانـدا تێپـەڕی. ئینجا چـووە سـەر تەپۆڵكەكـە. هالاو لەسەر رووی ئاوی دەریا هەڵدەستا. بایەكی نەرم كە شەپۆلئاسا دەشـنا، بـۆنی گـوڵ‌و دەریاو گژوگیای دێنا. هاتە ژێر دارهەرمێیەك كە تەواو بەگوڵ داپۆشرابوو. لەسەر گەلای گوڵەكان، زەنگەتەكان باڵەكانیان لێكنابوو، وەركەوتبوون.

خۆر هەلات‌و هێندەی دارسپینداریك بەرز بووەوە، سێبەری دارهەرمێیەكە تا ئەولاتر درێــژ بـــووەوەو زەردەواڵـــەكان لەخـــەو هەســـتان. ماوەیـــەك هـــەرئاوا بەباڵـــە لێكنەكراوەكانیانـەوە بێئـەوەی جووڵەیـەك بكـەن، مانـەوە. پاشـان ئـارام ئـارام باڵـەكانیان كەوتنە لەرزین. یەكەمجار باڵی چەند دانەیەكیان دەدرەوشایەوە. دەنگی وزەوز لەللك لكی دارهەرمێیەكـە بـەرز بـووەوە. پاشـان یـەك یـەك‌و دوو دوو هـەڵفڕین. ئـەو زەردەوالانـەی لەسەر گوڵەكان مابوونەوە بەقاچە پرزەدارەكانی پێشەوەیان چاوە درشـتەكانی خۆیانیـان دەخوراند. ورشـەی بـاڵی زەردەواڵـەكان لەدەوروبـەری دارهەرمێیەكـە لەتۆپـەڵی رۆشـنایی دەچووو دەنگی وزەوزیان لەدارەكە دەبیسترا. هوسمەن لەكاتێكـدا كـە لـەو رەنـگ‌و ورشـەو رۆشـناییە، كـە شـەپۆلیان دەدا مەسـت‌و سەرسـام بـوو، هاتـە ژێـر دارچنارەكە. سـەبیحەو منداڵـەكان هەسـتابوون‌و دەسـت‌و دەم وچـاویان شوشـتبوو. هـەر لەگـەڵ ئـەوەی بینیـان، بەڕاكردن چوونە لای. هەستی خۆشحاڵی لەڕوخساریدا دەبندرا. بەمانگان، بەڵكو بەسـالان تــا ئــەو رادەیــە هەســتی بەخۆشــحاڵی نــەكردبوو، یــالڵا رابكــەن بــۆ لای گوڵــەكانی دارهەرمێیەكە، زەردەواڵەكان، باڵندەكان، رۆشناییە شەپۆلاوی‌و شینباوەكان..".

ئـەو خۆشـحاڵی‌و وروژانـەی كـاری لەمنداڵـەكان كـرد، ئـەوان كـە لەخۆشـیان هاواریـان دەكرد، بەدەوری دارهەرمێیەكەدا كەوتنە خولانەوەو راكردن.

خۆر لەتەپۆلکەکەی ئەوبەری دابوو. هوسمەن کەمێك لـەولاتر ڕاوەسـتابووو تەماشـای مندالّـەکانی دەکـرد، کـە هـەموو گیانیـان ئارەقـە بـووو بێڕاوەسـتان دەخولانـەوە. پاشـان تەماشای سەبیحەی کرد، سەبیحە بەدەمی بەپێکەنینەوە نوقمی نێو شادی بوو، بەتاسەوە سەیری دارهەرمێیەکەی دەکرد.

بۆنی پوونگەی کەوتە بەرلووت، هەروا ئەو تیشکە درەوشاوەیەی بینی کـە ئـەو نـاوەی گرتەخۆ، هوسمەن باش ئاشنای ئەو بۆنە بوو.

لەچیاکانی لای ئەوانیش بۆن‌و بەرامەی وا دەهات. ئـەو چـیایانەی کـە ئیـدی هـەرگیز نەیدەتوانی بیانبینێتەوە.

بەخۆی گوت، کارێکی باشمکرد، کارێکی زۆر باشمکرد. دووبارە دەسـتم بەگونـدو مـالّ‌و کێوو بەندەنی خۆم‌و هەروەها بەبۆنی ئەم پوونگەیە گەیشتەوە.

کارێکی باشمکرد، زۆر باش. مرۆ دەتوانێت تەنانەت سەد سالّ لێرە بژیت. ئەگـەر ئـەو خەڵکە برسی مانەوە ئێمەش با برسی وەمێنین. قەدریی بەلەموانیش هێشتا زۆر گەنجـە، ڕەنگبێت تەمەنی بیست سالّیش نەبێت، جگە لەوە کەسێکی زۆر باشیشـە. ڕەنگبێـت مـرۆ لەشوێنەکانی دیکە بتوانێت سەد سالّ بژیت، بەلاّم لەم دوورگەیەدا ئەگـەر پـەنجا سـالّیش بژیت سەرو زیـادە. مـرۆڤ لـەجیاتی ئـەوەی سـەدو پـەنجا سـالّ بـەترس‌و دلّـەڕاوکێ‌و وەك ئـاواران بـژیت‌و هـەموو کەسـێك بەچـاوی دوژمـن سـەیر بکـات باشـترە ژیـانی خـۆی بەبۆنکردنی ئەو بۆن‌و بەرامە خۆشە، بەسەیرکردنی ئەو خۆرەی کە لەو قەدپالّە دەدات، بەگوێگرتن لەدەنگی دەریا، بەخۆشۆرین بەرتیشکی خۆرو بەئەستێرەکان‌و بـەو دەریایـەی کە سپێدان جۆرەها ڕەنگ بەخۆوە دەگرێت‌و گولّ‌و گولیلکی تیا دەپشکوێت، بباتە سەر.

دەستەکانی بەهەردوولادا کردنەوەو هەناسەیەکی قوولّی هەڵکێشا، سوپاس سوپاس بـۆ ئەو بۆن‌و بەرامانە، بۆ ئەو هەوایە، ئەو دەریایە، ئەو خاکە، سـوپاس، سـوپاس. لەکاتێکـدا خـەریکی سوپاسـکردن بـوو چـاوی بەکچـەکانی کـەوت، وەك ئـەوەی زەبرێکـی پێبکـەوێت. کچـەکان بـەخێرا خـەریك بـوون گـەورە دەبـوون‌و هەریـەکێکیان دەتگـوت فریشـتەیەکە هێنــدە جوانــە. لــەو دوورگــە چــۆلّ‌و هۆلّــە کــێ دەیانبینێــت تــا بیانخوازێــت. لەبــەر گەڕانەوەمان بۆ ئـەو دوورگەیـە لەخۆشـیان خـەنی بووبـوون. وەلـێ چـیوایان نـەماوە بـۆ شـووکردن، بـەلای زۆرە حـەوت، هەشـت سـالّ، لەمالّێـدا دەمێننـەوە، بێمێـردو بێعەشـق‌و بەختەوەری، جوانکیلەکانی خۆم، ناتوانن بـۆ خۆیـان ببنـە کابـان، دادەڕزێـن‌و پـەژمووردە دەبن، ناگەنە سی سالّ‌و پیر دەبن.

یانی هیچ کەسێك نایەتە ئەم نێوە؟ ئەگەر بڕیارە بهاتبان تا ئێستا هاتبوون. دەترسن بێنە ئێرە. منیش ترساوم. چەپو راستو پێشو پاش دەریایە. تەنانەت ئەگەر پارچەیەکیش بێت لەبەهەشت، لەسەر چنگێك خاكو خۆڵیت. ئەدی ئەوانەی لێرە ژیاون؟ جگە لەوە، ئەو خانووانەیان کە دەڵێی کۆشکن، چۆنو بۆچی لەسەر ئەم زیندانەدا چێکردوون؟ ئەوان کچو کوڕیان نەبوون؟ کچانی شۆخ لەگەڵ کوڕانی لێوەشاوەی خۆیان زەماوەندیان نەکرد؟ یان مەلەك خانم بۆچی رایکردو دوای چیای هەزارو یەك کانیی خۆی گەڕایەوە بۆ ئێرە؟ کچانی ئێمە لەم زیندانەی ئێرە دەتوانن بۆ کوێ رابکەن؟ دەتوانن کێ بدۆزنەوەو کێ پەیدا بکەن؟ دوودڵ بوو، ئاگرێك کەوتبووە هەناوانیو دەیسووتاند.

کە ئاوڕی لەلای راستی خۆی دایەوە سەیریکرد پویراز بوو بەلێوانی بەبزەوە بۆلای دەهات، خۆشحاڵ نەبوو.

"بەیانیت باش دۆستی من".

"بەیانیت باش".

"باش خەوتیت؟"

"لەژیانمدا ئاوا بەئاسوودەیی نەخەوتووم".

"ئەی بۆچی سەروسیمات پەشۆکاوە؟ مەگەر دەشێت سیمای کەسێك کە باش خەوتبێت ئاوا پەشۆکاوو ئاڵۆز بێت؟"

بەدڵنیاییو راشکاوانە گوتی: "دەبێت".

"چۆن؟"

هوسمەن بەتووڕەییەوە گوتی: "ئەگەر تۆش کچێکی قژکاڵت هەبوایە کە رۆژ بەڕۆژ گەورەتر دەبوو...".

پویراز بەئەدایەکی بێپەرواوە گوتی: "ئەمە شتێکی گرنگ نیە، نیگەران مەبە، تا ئاخیری ساڵێ دوورگە پڕ دەبێت لەخەڵك. تۆ خۆت بینیت کە ئەنەدۆڵ چۆن پڕ بوو لەخەڵك. هەموو لایەکی وڵات پڕبووە لەکۆچبەران. هەمووان بەدوای بستە خاکێكو بنمیچێکدا وێڵن. تۆ ئێستە ژنو منداڵەکانت هەڵبگرەو لەم خانووانە تا خانووی چێشتلێنەرەکان یەکێکیان هەڵبژێرە، دووکانێکیش هەڵبژێرە".

هوسمەن بەدەنگهەڵبڕینێکەوە گوتی: "من چ لەدووکان بکەم، من وەرزێرم".

لەوەی دەنگی خۆی بەسەر پویرازدا هەڵبڕیبوو، نیگەران بوو گوتی: "بمبوورە برا. تۆ گەرەکتە چاکە لەگەڵ مندا بکەیت. ئینجا منیش...".

"گرنگ نیە، ئەو جۆرە شتانە هەردەبن. مرۆ کاتێك کەوتە ژێر فشار، نازانێت چی بڵێتو چی بکات". ئاهێکی هەڵکێشا: "هیچکەس نازانێت تا ئێستا چی بەسەر مندا هاتووە".

هوسمەن گوتی: "بەسەر ئێمە هەمووومان. ئەو جەنگە چ بەلایەکی بەسەر ئێمەدا هێناوە، مرۆڤبوونی لێسەندووینەتەوە، مرۆڤبوونمان، شەرافەتمان، هەرچی هەمانبووە لێمانیسەندووە... دڵیشی لەنێو سنگدا نەهێشتووین. هیچ دڵێکی بۆ نەهێشتووینەتەوە. لەشوێنی دڵمان بەردێك ماوەتەوە. ئەویش بەردێکی بەسەهۆڵبوو".

هوسمەن کاتێك باسی لەئێشو ئازارەکانی دەکرد، هەموو ئەو ئێشو ئازارانە سیمایان دەدەگرت. ئەو سیما ئازاردیوە سەرتاپای پویرازی هێنایە لەرزین، سەرتاپای ئەو پویرازەی کە زۆر شتی بینیبوون:

ساری قامیش، هەزاران سەربازی بەسەهۆڵبوو کە بەپێخاوسی لەچیاکانی ئەللاهوئەکبەر برسیو تینوو بۆ پەیداکردنی پارووێك نان چەندین رۆژ، لەسەر یەك پیادەڕۆییان کردبووو لەبەر تیفۆس وەك گەلای درەخت هەڵوەریبوون، ئەو ئێزدیانەی کە قەلاچۆ کرابوون، ئەو مەمکانەی بڕابوون، مەمکی ئەو کچۆلانەی کە وەکو مراوی سەربڕاو لەنێو چەوو لە داخبووەکانی بیابان..

"سەیر بکە هوسمەن، ئێستا دەمەوێت نامەیەکت بدەمێ، ئەو نامەیە دەبەیتو دەیدەیتە وەهاب بەگی بەڕێوەبەر، ئەو دەتنێرێتە لای ئەنجومەن، تۆ داوایان لێدەکەیت خانووێكو دووکانێکت بدەنێ، ئەوان پارەت لێوەرناگرن، قەباڵەکە وەردەگریتو لەگەڵ قەدریی بەلەموان دەگەڕێیتەوە. ئەگەر بڵێیت نا نا". بزەیەکی تەڵخی کەوتە سەر لێوان "واتە نامەوێت لەو زیندانە بەهەشتیە بمێنمەوە". دەستی بردە گیرفانی کیسەی هوسمەنی دەرهێنا ."بیگرە ئەمە پارەکانت بڕۆ ئینشاللا پەشیمان نابیتەوە. بتەوێت دەتوانین خانووەکەو دووکانەکە وەربگرین، تا پایز ئەگەر دوورگە پڕ نەبوو لەخەڵك، لەم نزیکانە خانووێکت بۆ پەیدا دەکەین. جارێ دەبێت بنمیچێك هەبێت لەژێریدا وەحەوێیت".

لەو میانەدا، مەلەك خانم، لێنا، سەبیحەو منداڵەکان، کە قژی خۆیان شوشتبووو هۆنیبوویانەوە خەریکبوون دەهاتنە ژێر چنارەکان. ژنو منداڵەکان یەکسەر ئاگرێکیان کردەوەو کترێکی گەورەیان دانایە سەر سێپای گۆڕکەکە.

"ئێمە دەمانەوێت تا کلێسا بچین، تا ئێوە چایەکە دەم دەکەن، دەگەڕێینەوە. مەلەك خانم، قەدریی بەلەموان لەکوێیە؟ دایکە لێنا، ڤاسیلی هێشتا لەخەو هەڵنەستاوە؟"

مەلەك خانم گوتی: "هەردووکیان خەریکی ریشتاشینن، ئێستا دێن، ئێوە بڕۆنو خێرا بگەڕێنەوە".

تا کلێسا رۆیشتن، کاتێك گەڕانەوە سەیریانکرد هەمووان لەدەوری سفرە دانیشتوونو چاوەڕێی ئەوانن.

هەرکە چێشتیان خوارد، کچەکان هەستانو چوون بەڕیز لەسەر تەختەکان دانیشتن. پیاوەکان بەرەو لای ئەسکەلە چوون. قەدریی بەلەموان سواری بەلەمەکەی خۆی بووو ماتۆڕەکەی داگیرساند، پویراز دەستی هوسمەنی گرت:

"زێڕەکانی تۆ سوودیان لێوەرناگیرێت، نرخەکەی نازانن، زێڕی ناپلیۆن لەزێڕی عوسمانی گرانترە، لەم شارۆچکەیە بەنرخی زێڕی عوسمانی وردی دەکەنەوە. کەوایە وریابە، ئێستا زوو بڕۆ، خوا ئاگادارت بێت، بەخێرچیت".

ڤاسیلی بەپێکەنینەوە گوتی: "شتێکت لەبیرکرد، هوسمەن کام خانوو دەکڕێت؟"

"نە ڤاسیلی ئەوانە وەك ئێمە خانوو بەپارە ناکڕن، ئاڵوگۆڕ دەکرێنو قەرەبوو وەردەگرن، واتە دەستی بەسەر دادەگرن. لەجیاتی ئەو خانووە یان ئەو کێڵگەیەی کە لەیۆنان هەیانبووە، یان دارایی نەگوازراوەی دیکەی هەیانبووبێت، هەمان ئەو شتانەیان لێرە پێدەدەن، باش حاڵی بوویت ڤاسیلی؟ لەجیاتی هەرشتێك کە لەوێ بەجێیانهێشتبێت، لێرە هەمان ئەو شتانەیان دەدەنێ".

"بەڵێ تێگەیشتم، ئەمەم خۆ دەزانی".

"بەلەموان وەرە ئێرە، هوسمەن تۆش وەرە".

قەدریی بەلەموان بێدەنگ بوو، پاشان بازی دایە سەر ئەسکەلە:

"فەرمووو سەرۆك"

"دەبێت لەگەڵ هوسمەنی برامان برۆیتو سکەیەك زێڕی بۆ ورد بکەیتەوە".

رووی کردە هوسمەن:

"فەردەیەك ئارد، هەندێك ساوار، رۆنو برنج دەکڕیت، پاشان قەدری پێتدەڵێت چی بکڕیت. دۆشەك، قاپو قاچاغو هەرچی بۆ ماڵێك پێویستە... بگرە، ئەمە".

هوسمەن گوتی: "باش تێگەیشتم".

"بەیەك چارەكی ئەو سكە زێڕەی لەدەستتە دەتوانیت هەموو ئەو شتانەی كە پێمگوتی بكڕیت. سكەی نێو دەستت زێڕی ڕەشادیە".

سواری بەلەم بوون. بەلەم بەوپەڕی خێرایی ئاوەكەی شەق دەكردو كەفاوی دەكردو بۆ پێشەوە دەڕۆیشت.

هەركە ئەوان ڕۆیشتن ڤاسیلیش چووە نێو بەلەمەكەی خۆی، كەوتە چاككردنەوەی قولابەكانی.

"ئامادەیت ڤاسیلی؟"

"ئامادەم".

پویراز خۆی هەڵدایە نێو بەلەم. ماتۆڕەكە كەوتەكار.

"ئەمڕۆ دەبێت زۆر ماسیان بگرین. منداڵەكان وەك دێوان نان دەخۆن. هوسمەن چۆن توانیویە خواردنیان بۆ فەراهەم بكات؟ سەیر بكە چەندیش تۆكمەو تەندروستن. گۆنایان خوێنی لێدەچكێت، ماشەللایان لێبێت".

"زێڕێكی زۆری لەیۆنانەوە هێناوە. سكەیەك زێڕی ناپلیۆنی بۆ خۆی سامانێكە، هوسمەن پیاوێكی عاقڵە. بیری هەموو شتێكی كردووە ئینجا هاتۆتە ئێرە. نەیویستوە منداڵەكانی ناڕحەت بن".

كچەكان لەپێشەوە، ژنەكان بەدوایاندا، لەلای دارزەیتوونەكانەوە بۆ سەر تەپۆلكەكە چوون. منداڵەكان هەركە دەریای كاكی بەكاكیی دەوراندەوری دوورگەیان بینی لەشوێنی خۆیان مالق مان. هەرە بچووكەكەیان نەیتوانی پێش لەخۆی بگرێتو گوتی: "دەریا چەند گەورەیە". لەوێ لەسەر بەردەنووسە سپیەكە دانیشتو بەدەستەكانی روخساری خۆی داپۆشی، ئەوانی دیش لەملاو ئەولا دانیشتن.

منداڵەكان لەتەپۆلكەكە هاتنەخوارێو چوونە لێوار، دەیانویست یەك بەیەكی كۆشكەكان بگەڕێن، دەتگوت ئەو كۆشكە چۆڵانە بەرەو روویان دێن، رایانكردو چوونە نێو قامیشەڵانەكە، لەبەردەم قامیشان راوەستان، دواجار بەسەر ترسدا زاڵ بوونو چوونە نێو قامیشەكانەوە. نێو قامیشەڵانەكەیان پێخۆش بوو. خۆیان لەپەنا ئەو قامیشانە حەشارداو یەكدیان ترساند. پاشان بەهەستێكی پڕ لەترسی راستەقینەو شەلاڵی ئارەقە لەنێو قامیشەڵانەكە هاتنەدەر. ماوەیەك تا وشكبوونەوەی ئارەقەكەو رەوینەوەی هێواش هێواشی ترسەكەیان، لەلێوار دەریا راوەستان. كاتێك ترسەكە

بەتەواوی ڕەویەوە، چوونە نێو باغی دارهەنارەکان. لەلایەك هاتنە نێو باخو لەلاکەی تردا دەرچوونو چوونەوە لێوار دەریا. کەوتنە دوای وردیلە ماسیەکانی کە لەلێوار کەڵەکەیان بەستبوو. تا دڵ حەز بکات کەیفیان کرد. پاشان لەلێواری هەڵدێرگەکە بەیاری کەوتنە دوای بەچکە ماسیەکان، سەرکەوتنو چوونە نێو باغی دارهەنارەکانو بەترسو دڵەڕاوکێو دەستپاچەییو لەکاتێکدا هەوڵیان دەدا خۆیان لەدیدی کەسانی دی وەشێرن، چوونە نێو دارەکان. زەردەواڵە لەگوڵی دارهەنارەکان وەرهاتبوونو وزەوزێك بوو نەبێتەوە. ئەو گولیلکانەی کە لەدرەختەکان هەڵوەریبوون ئەو نێوەیان سوور هەڵگەڕاندبوو. کچەکان تا گوێزرینگی قاچیان کەوتبوونە نێو ئەو گولیلکە وەریوانە، لەلایەکی دیش بەگاڵتە یەکدیان دەترساند.

لەم دونیایە تەواو نوێیەدا، لەم شوێنە بێهاوتایەی کە لێیبوون هۆکارگەلێکی زۆر هەبوون بۆ ترسان. هۆکارگەلێکی یەکجار زۆر. لەباغی هەناران، لەکاتێکدا کە یەکدیان دەترساندو یاریان دەکردو دەیانقیژاند، لەناکاو لەشوێنی خۆیان حەپەسان. چاوەکانیان گەورەبوونو مووی جەستەیان راست بوونەوە. ڕەنگ لەڕوخساریان نەما. مارێکی شین ئارام بەبەرامبەریان ڕەت دەبووو دەم دەم هەڵوەستەیەکی دەکرد، وا پێدەچوو هەندێکجار سەری خۆی بەرزبکاتەوەو ملی هەڵبکێشێتو دەنگێکی وەك کفەکفی لێوە دەهاتو زمانە دوو درێژووکەییەکەی بۆ لای کچەکان دەردەهێنا. منداڵەکان نەیاندەتوانی لەشوێنی خۆیان بجووڵێن. گرمۆڵە بووبوون، شڵەژابوونو دەتگوت جادوویان لێکراوەو نەیانتوانی چاو لەسەر مارەکە وەلابەن، وشك هەڵاتبوون، زمانیان لەگۆ کەوتبوو، تەنانەت نووزەیەکیان لێوە نەدەهات. مارەکە خشیو لەنێو گوڵە هەنارەکان لەسەر عەردەکە لەبەرچاوان ون بوو. منداڵەکان هەروا لەوێ راوەستابوون. بەچاوانی حەپەساو روو لەو شوێنەی کە مارەکەی پێداخشی بووو ڕۆیشتبووو ئێستا هیچی لێنەبوو، ماوەیەك بەهەمان شێوە بەحەپەساوی لەشوێنی خۆیان مانەوە.

کچە گەورەکە کەمێك خۆی جووڵاند، ئەوانی دی سەیرێکیان کرد، حاڵەتەکەیان بەشێوەیەك بوو دەتگوت هیچشتێك نابینن، چاویان بڕیبووە ئەو جێگایەی کە هیچشتێکی نائاسایی لێنەبوو. کچە گەورەکەیان بەهاوارکردنێکەوە گوتی: "مار! مار!"و گەڕایەوەو لەکاتێکدا کە خۆیان بەقاپۆڕی دارهەنارەکان دەکێشا، رایاندەکرد. ئەوانی دیکەش بەکەوتنو هەستانەوە بێڕاوەستان رایانکردو هاتنەوە ئەسکەلە، سنگیان وەك

هەنبانەی کوورەی ئاسنگەر بەرزو نزم دەبووەوە، کە دانیشتنە سەر تەختەکانی ژێر دارچنارەکان، شەلاڵی ئارەقە بووبوون. بەچەشنێك دەتگوت لەنێو ئاو هاتوونەتەدەر.

کاتێك لێناو دایکیان لەنێو قامیشەڵانەکە هاتنەدەر، هێشتا دەموچاویان ئارەقەی لێدەچۆڕاو هەناسەبڕکێیان بوو. هەرکە چاویان بەدایکیان کەوت، گەشانەوە. "تا ئێستا لەکوێ بوون منداڵینە؟ لەو دوورگە چۆڵو هۆڵەدا چیتانکرد؟"

کچە چکۆلەکە گوتی: "ئێمە مارێکی زۆر گەورەمان بینی!" دەستەکانی لێککردنەوە "ئا ئەوەندە گەورە!"

"ماری چی کچێ، مەگەر ئەم دوورگەیە ماری لێهەن؟ مار لەکوێوە هاتوون؟" لێنا گوتی: "ئەم دوورگەیە ماری وای لێهەن بەقەد ئەژدیهایەك". ژنەکە ڕەنگی هەڵبزڕکا:

"یانی ئەو مارەی ئەو کچانە بینویانە ماری ڕاستەقینە بووە؟"

کچە چکۆلەکە گوتی: "ڕاستەقینە بوو دایکە. کاتێك ئەو مارە گەورەیەمان بینی هەمووومان لەترسان وشك بووین، مردین، بەڵام پێیوەنەداین، زمانیشی سوور سوور بوو. من دوای ئەوەی کە مردم، بەخورتی چاوەکانم قوچاندن‌و دواتر مارەکەم نەبینیەوە؟"

هەموو شتێکیان لەسیرەوە تا پیاز گێڕایەوە، ئەوەی کە چۆن بەدوورگەکەدا گەڕابوون، تەنانەت بۆ نێو قامیشەڵان‌و دواتر بۆ سەر تەپۆلکەکە چووبوون‌و لەسەر تەپۆلکەکەڕا دەریا چەندە گەورە بووە، یان بینینی گوڵەهەنارو مارە ڕەشە درێژو گەورەکە، کە بەبەردەم چاویاندا تێپەڕیبووو لەژێر گوڵەهەنارەکاندا ون بووبوو. ڕوخسارە ئارەقاویەکەیان لەترسان سوور هەڵگەڕابوو.

"مارەکە هەرکە ئێمەی بینی لەشوێنی خۆی هەڵوەستەی کرد. چاوە سوورەکانی دەبریسکانەوە. درێژووکەکەی دەرهێناو بۆ لای ئێمە فیشکاندی. فیشکاندی‌و کە هاتە بەر هەتاوەکە چاوو پشتی دەبریسکانەوە".

دایکیان بەلەسەرخۆییەوە گوتی: "بێئیزنی من نەچنە هیچ لایەك".

لێنا بەئەدایەکی دڵنیایانەوە گوتی: "لێیانگەڕێ با بچن، ماری ئەم دوورگەیە کاریان بەمنداڵان نیە، وەکو ماری لێوارەکانی دی نین".

کچە گەورەکە گوتی: "وایە، هیچ لەمارەکانی دی ناچن".

دایك هەر تەنها گوتی: "کە ئاوا".

لێنا گوتی: "هەڵبەتە ئێمە لەگەڵ ئەو مارە گەورە زمانسوورانە گەورەبووین".

دایك گوتی: "كەوایە بابچن لەگەڵ مارەكاندا یاری بكەن".

لێنـا كـە رۆنـدك لەچـاوەكانی قـەتیس مـابوون، گـوتی: "مارەكـانی دوورگـەی ئێمـە لەمارەكانی دی جیان".

دەوروبەری شەو، ئەو كەسانەی بۆ ماسیگرتن چووبوون گەڕانەوە. مەلـەك خـانم، لێنـا، ژنەكـەی هوسمـەنو مندالـّەكانی لەئەسـكەلە بـەڕیز وەسـتابوونو چـاوەڕێی هاتنەوەی ماسیگرەكان بوون. كاتێك پیاوەكان گەیشتنو بەلەمەكانیان راكێشایە سـەر چەوو لمەكە، كچەكان بەهۆراكێشان بۆلای ئەوان چوونو یەكسەر خۆیان گەیاندە نێـو بەلەمەكان. كچە چكۆلەكە هەرچی دەیكرد نەیدەتوانی خۆی هەلّداتە نێو بەلەمەكە. ڤاسیلی هەلێگرتو داینایە نێو بەلەم. كچەكان وەكو پشیلە سەریان بەهەموو لایـەكی بەلەمەكە دادەگرتو پێیدا هەلّبەزو دابەزیان بـوو، دەسـتیان بەسـەوڵو ماتۆڕەكانـدا دەهێنـاو دەتگـوت هــەموو بەلەمەكـە بـۆن دەكـەن. پاشـان لەگەنــە ماسـیەكانیان دۆزینــەوە. لـەنێو لەگەنــە پــڕ ئاوەكانــدا ماسـیەكان مەلـەیان دەكـرد. مندالـّەكان بەسەرسامیەوە سەیری لەگەنەكانیان دەكرد.

ڤاسـیلی، بـە سـەبەتە حەسـیری گـەورەوە هـات و سـواری بەلـەم بـوو و دەسـتیكرد بەهەلگرتنی ماسیەكانی نێو لەگەنەكان و خستنیە نێو سەبەتەكە.

كچەكان كەمێك لەولاتر بێجووڵە راوەستا بوونو سـەیری ئـەو دیمەنـەی بەرامبـەریان دەكرد. تا ئەودەمەی لەگەنە پڕ ماسیەكان بەتەواوی بەتالّ كـران ئـەوان ئـاوا مانـەوە. كـە ڤاسیلی لەبەلەم دابەزی ئەوانیش بەدوای ئەودا دابەزین. ڤاسـیلی سـەبەتەكەی هـەلگرتو بردی لەسەر چەوەكەی لێواری دانا. كچەكانیش بەدوایدا رۆیشتن. دەریا سـاف بـووو وردە شەپۆلەكانی لەلێواریان دەدا. كچەكان بـەڕیز لەسـەر چـەوەكە راوەسـتان. ماسـیەكانی نێـو سـەبەتەكە هەلّبـەزو دابـەزیان بـوو، ماسـیەكی تاڕادەیـەك گـەورە هەلّبەزیـەوەو لـەنێو سەبەتەكە هاتەدەرو كەوتە سەر چەوەكان. یەك دووجار هەلّبەزیەوە، ماوەیـەك لەهـەمان ئــەو جێیــە مایــەوەو پاشـان مــرد. چـاوی كچـەكان زەق بـووەوە. تیشـكی خـۆر لـەكاتی ئاوابووندا بەسەر قژە زەردەكەیان دەبریسكایەوە. كەس نازانێت بـۆ مندالّەكان یەكڕاسـت بۆلای قامیشەلانەكە رایانكردو لەپەنا قامیشەكاندا لەبەرچاوان ون بوون.

كـەمێك دواتـر ڤاسـیلی هاتـە نزیـك سـەبەتەكانو بەژنـەكانی گـوت: "جووڵـەجووڵی ماسیەكان تەواو بوو".

ژنەکان کە هەریەکەیان چەقۆیەکی لەدەست بوو، هاتە لای سەبەتەکان، لەسەر چەوەکە دانیشتن و دەستیانکرد بەپاککردنەوەی ماسیەکان، ورگ و پوولەکەکانیان. ڤاسیلی و پویراز کە چووبوونە نێو دارزەیتوونەکان هەریەکەو بەباوەشێك چیلکەی زەیتوون گەڕانەوە.

پویراز گوتی: "ماسیەکان زۆرن، خەڵکی دوورگەش زۆرن، ئەم چیلکەو دارانە بەش ناکەن".

چەند جارێکی دی چوونە نێو دارەکان و چیلکەو داریان هێنا.. کاتێك خۆر خەریك بوو ئاوا دەبوو، ئاگریان کردەوە. ئەو نێوە بەگڕی ئاگرەکە رووناك بووەوە. هەرکە ئاگرەکە پەنگری کردن، ژنەکان بەماسی پاککراوەو خوێلێدراو گەڕانەوە.

لەخانووی چێشتلێنەرەکان مێزێکی درێژیان هێناو لەپێش تەختەکانیان داناو چەند هێرباریێکی مس و چەند کاسەو گۆزەیەك ئاوو هەندێك نان و خوێدانێکیان لەسەر مێزەکە دانابوو.

ڤاسیلی گوتی: "دەبێت سەبر بگرین؟"

پویراز لەوەڵامداوە گوتی: "ئەوان تا سبەینێ ناتوانن بێن".

کاتێك دەستیانکرد بەبرژاندنی ماسیەکان، هەرکە بۆن و بەرامەو دووکەڵی رۆنی سووتاوی ماسیەکان بڵاوبووەوەو ئەو نێوەی داگرت، سەرو کەللەی منداڵەکان بەدەرکەوت، بەڕیز لەپشت مێزەکە لەسەر تەختەکان دانیشتن. ماسیەکان بۆنی دەریایان دەدا. لەماوەی نانخواردندا خۆشحاڵی و هەستی بەختەوەریی خۆیان بەئاشکرا دەربڕی. منداڵەکان لەخەنی خۆشیان هەر ئەوەبوو بەباڵ نەفڕن. ئەو شەوە بەوپەڕی ئاسوودەییەوە خەوتن. هەر لەگەڵ ئەوەی بەلەمە ماتۆڕدارەکەی قەدریی بەلەموان لەدوورەوە بەدەرکەوت، هەمووان هاتن لەژێر دارچنارەکان راوەستان، قسەیان دەکردو پێدەکەنین. منداڵەکان کە زەینیان هەر لەسەر دەریابوو. بەئارامی لەشوێنی خۆیان هەستان و چوونە سەر ئەسکەلەو بەڕیز راوەستان. تیشکی خۆر لەکەزیە زێڕینەکانیانی دەداو دەبریسکایەوە. بێئەوەی چاو لەبەلەمەکە وەربگێڕن کڕو بێدەنگ چاو لەڕێ بوون، ئەو بەلەمەی کە دەریای سامناکی شەق دەکردو کەفێکی سپی لەدوای خۆی جێدەهێڵا و دەهاتە پێش، ئەوانی سەرسام کردبوو. ئەوان بەکەشتیێکی بچووك هاتبوونە ئەوێ، بەڵام نە دەریایان بەو شێوەیە بینیبوو، نە کەفی ئاوەکە. لەکەشتیەکەدا لەسەرەوەی سەرەوە

بوون. ژنانو منداڵەکان دەرشانەوە، لەکاتێکدا پیاوەکان دەمیان لێکنەدەکردەوە، خۆیان وێکهێنابووەوەو دەستەکانیان خستبووە ژێر باخەڵیانو روخساریان پڕ لۆچ بووبووو بەلچو لێوی شۆڕبووەوەیان چووبوونە نێو فکرو خەیاڵان. لەلایەك کەشتی بۆنی لێدەهات، کەپوویان لەبەر ئەو بۆنە گرژ دەبوو، تا ئەوکاتەی دەیانتوانی نەدەچوونە دەستشۆییو بەرگەی فشاریان دەگرتو چاوەڕێیان دەکرد، کاتێکیش دەچوونە دەستشۆییەکە هەندێکیان لەهۆش دەچوون، جگە لەوەش دەریا دەیهێنانو دەیبردن، کەشتی غژە غژی دەکرد، کەس نەیدەتوانی بەپێوە بووەستێتو لەترسی ئەوەی کە هەر ئێستا کەشتی نوقم دەبێت، دڵیان دادەخورپا. کچەکان کەشتیەکەیان لەبیر کردبوو، گەشتەکەیان بەکەشتی وەك دێوەزمەیەکی ترسناك، یان وەك چاڵێکی زۆر تاریك لەیادەوەریان رەش بووبووەوە، بەڵام کاتێك پێیاننابووە سەر وشکایی رەوشیان خراپتر بووبوو. برسیەتیەکی زۆریان چەشتبوو، هەندێکجار لەگەرماو بێئاویدا ئازاریان چەشتبوو، تەنانەت دڵۆپە ئاوێکیان دەست نەکەوتبوو، لەبەر تیشکی داغی خۆرەتاو هەڵقرچابوون، مێشو مەگەزی سەیرو جۆراوجۆر تێیانەوە هاڵابوون، بەوزەوز وەك هەورێکی خەستو تاریك پەلاماری دابوون. پێیانیەوە دابوون، خواردبوونیانو نەخۆش کەوتبوونو لەهۆش چووبوون. هەستیان بەسەرما کردبوو، تووشی لەرزوتا بووبوون. لەسەر خاکێك کە لەبەر گەرما نەدەکرا دەستی لێبدەیت، لەژێر تینی خۆرەتاوێك کە هەر گڕو گەرمای دەردەدا، راکشابوون. ددانیان لەسەر یەك گیرساندبوونو لەماندوێتیان لەپەلوپۆ کەوتبوون.

پاشان سووتابوونو بەهەر جۆرێك بووە هەوڵیان دابووە خۆیان بگەیەننە بەر سێبەرێك، بەبایەکی فێنك یان ئاوێکی سارد. هێزو بڕستیان بەتەواوی لەدەست دابووە، بەڵام پاشان بەهەر چۆنێك بووبێت هێزو توانای خۆیان کۆکردۆتەوەو لەوێ هەڵاتوون.

دەریا کەفی دەکرد، بایەکی ساردو بۆندار دەهاتو ئێستا باوکیان بەبەلەمێکی ماتۆڕدارەوە لەدەریاوە دەهاتەوە.

تا بەلەمەکە نزیکتر دەبووەوە وروژانی ئەوان زیاتر دەبوو. رەنگی دەمو چاویان پەمەییەکی تۆخ هەڵگەڕابووو دیسان شەڵاڵی ئارەقە بووبوون.

ئەو بەلەمەش هەر نایەتە پێش، بۆچی ئاوا بەئارامی دێتە پێش؟ ئەوانەی دانیشتبوون متەقیان نەدەکرد، هەموویان سەریان نابووەوە بەرخۆو بیریان دەکردەوە.

جارجار سەریان هەڵدەبڕیو سەیرێکی ئەو بەلەمانەیان دەکرد کە دەهاتنو پاشان دووبارە سەریان دەنایەوە بەرخۆیان.

سەبیحە خانم هەر لەوێ دانیشتبووو دەستی لەئەژنۆیان وەرێنابوون، چاوەکانی رووەو کەسەکانی دەوروبەری بەدوای شتێکدا دەگەڕان. دوای شتێکی ون بوو، جادوو، شادییێکی بێکۆتایی، ئومێد، یان نەمر، ناخیان پڕبوو لەئەڤینو دڵسۆزییێکی گەرمو گوڕ. ماوەیەکی زۆربوو لەوێ بۆ ئەوێ راونرابوون. لەئاوارەییدا مابوونەوەو کەوتبوونە بارودۆخێکی خراپتر لەمەرگ.

لەکاتێکدا کە فرمێسك لەچاوانی قەتیس مابوون، بەدڵێکی تژی لەئومێد، بەوپەڕی ئارامیو نەوازشکارانە دەستی خستە سەردەستی مەلەك خانم کە لەتەکی دانیشتبوو. مەلەك خانمیش سەیری ئەوی کردو زۆر گەرمو گوڕانە بەبزەیەك وەڵامی دایەوە. سەبیحە خانمو وروژا.

"ئێمەیان لەبەرزاییەوە هێنایەخوار. بەئێمەیان نەگوت بچینە کوێ، چیبکەین. ئێمەیان بردە خانووێکی گەورە وچۆڵ. لەوێ لەگەڵ ئەو گوندیانەی کە لەجەنگەڵو کوێستانەکان هاوردبوونیان چاوەڕێمان کرد. لەرێگادا زۆر لەبەتەمەنەکان لەنێو چووبوون. سواری کەشتیان کردین. کەشتی چیوای نەمابوو نوقمی ژێر ئاو بکەوێت. پێنج شەوو پێنج رۆژی رەبەق هەڵبەزو دابەزی کرد، بەڵام نوقم نەبوو. لەبەر بۆنی گەنیوو لەبرسان مردین. تەرمی ئێمەیان هاوردو فڕێیاندایینە خانووێکی گەورەی کەنار دەریا. لەوێ زۆر چاوەڕێ ماینەوە. زۆر لەپیرەمێردو پیرەژنەکان مردن. زۆربەمان نەخۆش کەوتین. ئێمەیان بردینە شوێنێكو لەوێ دایاناین. گوتیان ئێرە دێیە، وای خودێ، نەمانتوانی بێژین ئێرە کوێی دێیە، قۆنداغی تفەنگی جەندرمەکان کەوتنەکار، سەیرمانکرد وا جەندرمە خەریکن دەمانکوژن. ئەو دێیەی ئەوان دەیانگوت گشت خانووەکانی سووتابوون، نە درەختێك بەپێوە مابوو، نە گیاو گوڵو باغچەیەك، هەموو لایەك رەش هەڵگەڕابوو. وای، هەرئاوا، لەکاتێکدا دەمانگوت ئەمە ئیدی چ کارێکە، هەفتەیەك لەوێ ماینەوە، لەسەر عەرزی رەقو رووت راکشاینو خەوتین، دێهاتیەکانی گوندە نزیکەکان نانیان بۆ هێنایناو مەنجەڵیان خستنە سەر گۆڕکانو چێشتیان بۆ چێکردین. پاشان ئێمەیان هەڵگرتو بردنیانە گوندێکی رەقەنو سووتاوی قەدپاڵی چیایەك، ئا بەمشێوەیە بۆ ئەملاو ئەولایان دەبردین. دواجار بردنیانین بۆ دەشتێکی کاکی بەکاکیو لەوێ بەرەڵڵایان کردین. هەموو لایەك گژوگیاو باتلاخ بوو.

دێهاتێکی چۆڵو هۆڵ لەوێ هەبوون، کە دەیانگوت پڕو ئاوەدانن، دانیشتوانی ئەو دێیانە چوونە ئەو کوێستانەی بەرامبەرمان، کە زستان دابێتەوە دەگەڕێنەوە. گوتمان ئێمە ببەنە ئەوێ. گوتیان ئەوێ خاکێکی لێنیە لەبرسان دەمرن. خانووچکەیان بۆ دروستکردین کە دیوارەکانی لەقامیشو بنمیچی پووشو پەلاش بوو. گوتیان ئێستە ئێوەش ئەو کارە بکەن. باتلاخەکە لەبەرامبەرە. دەتوانن قامیش ببڕنەوە. ئێمەش ئەو کارەمان کردو بێدەنگ ماینەوە. پارەشیان دا. پاشان زیندەوەری وردیلە هێرشیان هێنایە ئەوێ، کە ئێمە تا ئەوکات ئەو جۆرە زیندەوەرانەمان نەبینیبوون، خەڵکی ناوچەکە، دەشتنشینەکانی ئەوێ بەو زیندەوەرانەیان دەگوت زیندەوەرە ئێسقاندارەکان، مێشوولە وەکو گەواڵەی هەور بۆمان دەهاتن‌و دەم‌و چاومان وەك دەبدەبە دەپەنمان. نۆبەتێ دەستی پێکرد، لەماوەی چەند مانگ، نیوەی خەڵکەکە لەنێو چوون. رۆژانە ژمارەی مردووان ئەوەندە زۆر بوو، کە ئەو مردووانەی لەبەر تای مەلاریا دەسووتان نەیاندەتوانی بیاننێژن. گەرما وەکو ئاگر نێڵەنێڵی بووو تەنانەت نەیدەهێشت هەناسە بدەین. مردووەکانمان بۆنیان کرد. لەشوێنە دوورەکان گوندیەکان هاتن‌و لەکاتێکدا لەبەر بۆنی تەرمی مردووان خەریك بوو جگەریان لەتلەت بێت، لەو دەشتە خێرا خێرا تەرمەکانیان خستنە ژێر خاکەوە. ئەوانی دیکەمان کە مابووینەوە شەوێك لەوێ هەڵاتین، لەکێوێك تێپەڕین‌و گەیشتینە بیابانێکی بێدارو درەخت‌و وشك‌و برینگی کاکی بەکاکی. تا لەبیابانەکە دەربازمان بوو نیوەمان مردن‌و بەجێمان. باوك‌و دایکی هوسمەن لەو بیابانە وشکە مردن. شەوێ دی قسەمان لەگەڵ کرد، ئەگەر لێرە کارەکانمان باش بووو جێگیر بووین دەچین تەرمەکانیان دێنینەوە دوورگە. ئەم دوورگە گۆڕستانیشی لێیە، بینیمان جوانە".

مەلەك خانم گوتی: "بیانهێننەوە کارێکی باش دەکەن. لێرە ژیان‌و کاروبارتان باشتر دەبێت".

ڤاسیلی گوتی: "وایە". چاوی پڕ ئاو بوون. پویرازیش لەکاتێکدا فرمێسك لەچاوەکانی قەتیس مابوو گوتی: "ئێسك‌و پروسکەکانیان دێنینەوە".

لێنا گوتی: "زۆرباش دەبێت، زۆر زۆر باش. کوڕی من پویراز زۆر عاقڵە".

لەو ماوەیەدا بەلەمەکە لەئەسکەلە لەنگەری گرتبوو. خێرا خۆیان گەیاندە ئەسکەلە.

هوسمەن لەبەلەمەکە بەبازدانێك خۆی فڕێدایە سەر ئەسکەلەو بەخۆشحاڵیەوە بەرەو لای ئەوان رایکردو هات لەبەردەم پویراز راوەستا.

"بەسێیەکی یان ڕەنگبێت بەچواریەکی ئەو سکەیەی پێتدابووم چیوای نەمابوو یەك لەسەر چواری شارۆچکەکە بکرم. پێشتر لەڕێگا وەك دیاربوو کلاویان نابوومە سەر. خۆزگە هەر یەکەمجار یەکسەر بهاتبامە ئێرە". پویراز پێکەنی، دەستی درێژ کردو داینایە سەر شانی ئەوەوە.

سەبیحە هاتو لەنزیك ئەوانەوە راوەستا. قسەکانیانی بیستبووو لەخۆشحاڵیان قریت قریت پێدەکەنی.

"کاك پویرازی بەڕێز بڕیارە تەرمی باوكو دایکیشت بێنێتەوە، لێروکانە لەو گۆڕستانە جوانە بیاننێژێت، بەڵکو مەلایەکی نوورانیش لەشارۆچکە بێنینو لەسەر گۆڕیان قورئان بخوێنێت".

"بەلام باوكو دایکی من گۆڕیان نیە. ئەوان هەر لەوێ لەنیوەڕاستی ئەو بیابانە لەو دەشتە وشكو برینگەدا ماونەتەوە".

هوسمەن لەو قسانە پەشیمان بووەوە. دەمو چاوی لۆچیان تێکەوت. یەکسەر گوتی: "نە، نە، نە، بگەڕێین، دەیاندۆزینەوە".

لێنا گۆتی: "دەگەڕێین. نابێت لەوێ بمێننەوە. لەناوەڕاستی ئەو بیابانە گەرمە، گۆڕستانی ئێمە زۆر جوانە".

هوسمەن خۆی کۆکردەوە گوتی: "گۆڕستانێکی زۆر جوانە".

پویراز پرسی: "باشە ئێستا بزانم چیتکڕی؟"

"دەبینیت، ئەو شتانەی کە بۆ ماڵێك پێویستن، کڕیمانو هێنامانن".

هوسمەن دیسان کەیفی سازبووبووەوە.

"کەوابوو، یاللابابڕۆین بارەکان دابگرین".

بە شەوقو زەوقەوە بەرەو لای بەلەمەکە چوون. قەدریی بەلەموان زووتر کاری داگرتنی بارەکانی دەستپێکردبوو. هەمووان پێکەوە سواری بەلەم بوون. بەلەمەکە تەواو هەژایە سەریەك. چیوای نەمابوو وەربگەڕێت، بەلام هیچیان نەکەوتن. هەمووان بەوپەڕی هێزو توانایانەوە کەلوپەلی نێو بەلەمەکەیان هەلگرتو بردیان دایاننایە سەر ئەسکەلە. قەدریی بەلەموان ئارەقەی کردبوو. بەخۆشحاڵییەوە بزەیەکی کردو گوتی: "ئەگەر من نەدەبووم، ئەو هوسمەنە، هیچ کەسی وەك ئەوم نەبینیوە، ئەگەر لێگەڕابام هەموو شتی شارۆچکەکەی دەکڕیو لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە".

هوسمەن گوتی: "ئەم شتانەم گشتی بەبەشێك لەسكەیەك كڕیون. ئەگەر لەیۆنان بێت ئـەو هـەموو شـتە بـەدە سـكەش ناتوانیـت بكڕیـت. وای، وای لەهـەموو جێیـەك فێڵیـان لێكـردووم. خۆزگـە كاتێـك دەهاتینـە ئەنـەدۆڵ نەدەچووینە هـیچ لایـەكو ئـەو هـەموو پارەیەمان بەهەدەر نەدەدا.

وەرە! بـەو پارەیـە دەمتـوانی چـوار بەلـەمی مـاتۆڕدار بكـڕم". خـەریكبوو بەپەنجـەی ئاماژەی بۆ بەلەمەكەی قەدریی دەكـرد: "وەرە! لەمـەش گـەورەتر مخابن، پارەیـەكی زۆرم لەدەست چوو".

پویراز گوتی: "هێشتاش پارەیەكی زۆرت هەیە هوسمەن. هێشـتاش هەرچی بمانـەوێت دەتوانین بیكڕین. نووكە ئـەم شمەكـەی كڕیوتـە بـا هـەر لێـرە بێـت، بـا بچـین خـانووێكی جوانو ڕێكو پێكت بۆ هەڵبژێرین".

وەپێش كـەوت، ڕۆیشـت، لەیەكـەم خـانوو دەسـتیانپێكرد. دەرگـای هـەموو خانووەكـان دەتـوانین بڵـێین كراوەبـوو. ئـەو دەرگایانـەی كـە كـەمێكیش كـراوە بـوون هـەر بەئاسـتەم دەسـتت پێوەنـابوان دەكرانــەوە. زۆربــەی خانووەكـان دوو نهـۆمی بـوون. خـانووە یـەك نهۆمیەكان لەپشت خانووە دوو نهۆمیەكانەوە بوون.

پـویراز لەپێشـەوەو ئـەوانی دی بەدوایـەوە لەیەكـەم خـانوو وەژووركـەوتن، هـەموو خانووەكە گەڕان، هاتنەدەر، پویراز سەیری چاوەكانی هوسمەنی كـرد. ئـەو بێـدەنگ بـوو، روخساری هەندێكجار وشك هەڵدەهات، هەنـدێكجار تێكـدەئالا، بێئـەوەی قسـەیەك لەگـەڵ یەكدی بكەن چوونە نێـو خـانووێكی دیو هاتنـەوە دەرێ، پـویراز جارێكی دیكـە سـەیری چاوەكانی هوسمەنی كردەوە، ئەمجارەش هوسمەن متەقی لەبەر نەهاتەدەر. ئـەوانی دیـش قسەیەكیان نەدەكرد. ئاوا درێژەیان بەتەماشاكردنی خانووەكان دا. عەسر داهاتبوو هێشتا نانیان نەخواردبوو، تەنانەت بیریشیان لێنەكردبووەوە. یەكەمین كەس كە بەبیری هاتەوە مەلەك خانم بوو.

"وای، بڵــێم خــوا چــیتان لێبكــات، ئەوەنــدە خانووەكــان گــەڕاینو لەپلیكانــەكان وەسەركەوتینو دابەزین، ئاوی ئەژنۆمان ڕژا. ئێوە لەبرسیەتی ناگەن؟"

پویراز گوتی: "بەدی چۆن خانم، ئەژنۆكانی منیش شل بوون. بـا خانووەكـانی دی بۆ سبەی لێبگەڕێین. ئەگەر سبەینێش خانووێكمان دەست نەكەوت خۆمان كۆشـكێك دروست دەكەین".

لەنێو هەمووان تەنێ لێنا بزەیەکی بۆ کرد.

هاتنە ژێر دارچنارەکان شەکەتو ماندوو لەسەر تەختەکان روونیشتن. کچە زەردەکان دیسان لەسەر تەختەکان خۆیان پێکەوە چەسپاندبووو دانیشتبوون. "مەلەك خانم چیبوو دەتگوت لەبرسان مردین؟"

مەلەك خانم گوتی: "مردین، لێنا سەبیحە هەستن؟"

لێنا گوتی: "کەمێك سەبرکە با پشووێك بدەین".

کەمێك دواتر هەستان کچەکانیش پێکەوە هەستانو بۆ کۆکردنەوەی دارو چیلکە بۆ نێو دارزەیتوونەکان پێیانپێوەنا، لەوێ کاتێك خەریك بوون دارو چیلکەیان کۆدەکردەوە چاویان هەر بەدوای مارە شینەکەوە بوو، کە زمانێکی دووسەرەو چاوانی سووری هەبوو. هەموو مارەکان چووبوونە باغی دارهەنارەکان، نەیانتوانی بیدۆزنەوە، بەڵام زۆر دەترسان، تەنانەت لەرزیش دایگرتن.

ئاگر کرایەوەو مەنجەڵ خرایە سەر سێپای ئاگردانەکە. لێنا، سەبیحە، مەلەك خانم لەبەردەم ئاگردانەکە لەسەر چیچکانەوە دانیشتبوون، ئەوانی دیکەش بەڕیز لەسەر تەختەکان دانیشتبوونو چاویان بڕیبووە مەنجەڵەکە. کاتێك رۆنەکە، کە لەسەر ئاگردانەکە قرچابووەوە، بەجزەجزەوە رۆکرایە سەر ساوارەکە، بۆنو بەرامەیەکی سەیر ئەو ناوەی داگرت. زەردەواڵەو پەپوولەکان داگژانە ژێر دارچنارەکانو ئەو نێوەیان پڕکرد. منداڵەکان چوونەوە ماڵو بەسفرەو بەباوەشی پڕ لەنان، بەغاردانەوە گەڕانەوە. ڤاسیلی مێزەکەی راکێشاو بردی داینایە پێش تەختەکان. تەختێکی درێژیشی لەتەنیشتەوە دانان. برنجەکەیان دوای ئەوەی کەمێك دێمی دا، هێنایانو رۆیانکردە نێو خوانچەیەك کە لەنێوەڕاستی مێزەکە داندرابوو. کەوچکە دارینەکان کەوتنەکار.

پویراز گوتی: "ئای، ئەگەر ئەم ساوارە پیازێکی لەسەردەبوو، ئەوجا تامەکەیت دەبینی".

کچە گەورەکە گوتی: "هەیە". کەوچکەکەی داناو یەکسەر هەستا. لەچێشتخانەکەدا بینیم".

رایکردو منداڵەکانی دیش بەدوایدا. زۆر زووش گەڕانەوە. کچە زەردە گەورەکە پیازێکی دانایە بەردەم پویراز. کچەکانی دیشی یەکەو پیازێکیان بۆ ئەوانیدی دانا.

پویراز پیازەکەی خۆی بەمستێك پلیشاندەوە. ئەوانیدیش... ژنەکان پیازیان نەدەخوارد. کچەکانیش نەیانخوارد.

هەر کە خواردنەکە تەواو بوو هوسمەن گوتی: "بوەستن، سەبر بگرن من ئێستا دەگەڕێمەوە". رایکردە نێو بەلەمەکەو بەخۆیو سینییێك پاقلاوە گەڕایەوە. دەنگی شادمانی هەمووان...

سیمای گشتیان خەندان بوو، بەڵام هوسمەن زۆر دەفکران راچوو بوو. پویراز گوتی: "سەیر بکە هوسمەن، ئەو خانووانەی نەمانبینیون دەیانبینینو کامەیان لەهەمووان جوانترە هەڵیدەبژێرین".

قەدریی بەلەموانیش بەخۆشحاڵیەوە گوتی: "هەڵیدەبژێرین. ژمارەمان زۆرە، جوانترینیان هەڵدەبژێرین". هەستا، دەستەکانی لێککردنەوەو درێژەی بەقسەکردن دا: "من ماندووم". بەرەو ماڵی خۆیان رۆیشت.

منداڵەکان بۆ لای ئەسکەلە بۆ بینینی شتە کڕدراوەکان چوون، لەوێ بەدەوری شتەکانەوە بازنەیان بەست، دەستیان لەهیچشتێك نەدەدا. تەنها سەیریاندەکرد. دەمێك دواتر هەر لەو شوێنەی کە دانیشتبوون خەویان لێکەوت.

بەیانی زوو، دیسان هەمووان پێکەوە بۆ سەیرکردنی خانووەکان چوون، کەلوپەلێکی زۆر لەخانووەکان جێمابوو. دەتواندرا بەو کەلوپەلانە چەند ماڵێك دابنێیت. خانووەکانی ئەملایەیان بێئەوەی کەس دەنگێکی لەبەر بێتەدەر یەك بەیەك گەڕان. دوای نیوەڕۆش چوونە سەیرکردنی خانووی چێشتلێنەرەکان، یەك بەیەك لەهەمووانیان نۆڕی. شتومەکێکی زۆری بەکەڵکیشیان لەو خانووانە دۆزیەوە. کە گەڕانەوە ژێر دارچنارەکان خۆر بۆ پشت تەپۆلکەکە هەڵکشابوو. هاتن لەژێر دارچنارەکان دانیشتن. هەمووان سەریان دانەواندبووو ئاوا کپو بێدەنگ دانیشتبوون.

"چیە دراوسێکان، وەکو ئاشی ئاو لێبڕاوتان لێهاتووە".

مەلەك خانم گوتی: "وایە".

"تۆ چیتە هوسمەن، دەڵێی هیچ یەك لەخانووەکانت پەسند نەکردووە". "من سبەیو دووسبەیش بەتەنیا دەچمو سەیری خانووەکان دەکەم، دواتر...".

"ئەگەر دیسان خانووێکت نەدۆزیەوە؟"

"دەیدۆزمەوە".

"ئێمە سبەی دەچینە راوەماسی. تۆ خۆت بەتەنێ بڕۆ سەیری خانووەکان بکە".

ئـەوان نزیکـەی پێـنج ڕۆژان چـوونە ڕاوەماسـی، هوسمـەنیش بێڕاوەسـتان هـەموو خانووەکـانی دوورگـەی بەسـەر کردنـەوەو سـەیری کـردن. هـەر خـانووێکی لانیکـەم سـێ جاران بینیبوو. ئەگەر خانووێکی زیاتر پەسند کردبا یەك دانە ڕۆژ تیای دەمایەوە".

چـەند ڕۆژی درێـژە دەکێشا تـا هوسمـەن خانووەکـان ببینێـت؟ نـە هوسمـەن ئـەوەی دەزانیو نە ئەوان. هوسمەنیان بەتـەواوی لـەبیر کردبـوو. هەنـدێکجار یـەکێك لـەوان لـەو کاتەی هوسمەن لەخانووێکەوە بۆ خـانووێکی دیکـە دەچـوو ڕێکدەکـەوت بیبیـنن. هـەموو ڕۆژێك لەگەڵ تاو هەڵدەهات لـەنێو نـوێن دەهاتـە دەرو وەڕێدەکـەوتو شـەو دەگەڕایـەوە، کفتو ماندوو.

ژنـەکان دیسـان بـۆ شـوێنی پێشوویان گەڕانـەوە، لەسـەر ئەسـکەلە دانیشـتن، قاچـیان بەتەختەکانی ئەسکەلەدا شۆڕکردنەوە، چاویان بڕیـە دەریـاو چـاوەڕێی بەلـەمو کەشـتیە ڕەنگاوڕەنگو نوقمی نێو نوورو ڕۆشناییەکان مانەوە، کە دەبوا لەولاوە بێن.

کچەکانیش لەتەکیان دانیشـتنو وەك ئـەوان قاچـیان شـۆڕکردنەوە، یـەك دوو ڕۆژ کـە لەگەڵ ژنەکان سەیری دەریای چۆڵیان کـردو هیچشـتێکیان بـۆ سـاغ نـەبووەوە. بـەئارامی لەشوێنی خۆیان هەسـتان. خـەریکبوون بەبێـدەنگی دەڕۆیشـتن کـە مەلـەك خـانم ئـەوانی بینـیو لێیپرسـین: "چیبووە کچـەکان، شـوێنێکتان تـەڕبووە؟ بـۆ کـوێ دەچـن؟ دەریـا زۆر سەرنجڕاکێشە. تازە، قازداغی لەدوورەوە سەرنجڕاکێشتریشـە. یۆنانیـەکان پێیـدەڵێن ئیـدا. ڕەنگبێت ئیداش هەر ماناکەی هەمان قازبێت".

لێنا گوتی: "نە، نە، نە، ئەو چیایە، ئیدایـە، ئیـدا قـاز نیـە. گـرنگ نیـە بـا تورکـەکان پێیبلێن قاز".

مەلەك خانم بەلێبڕاویەوە گوتی: "قازە!" بەڵام کە سەیری ڕوخساری لێنای کردو زانـی نیگـەران بـووە، قسـەکەی خـۆی چاککرد: "نـە جـانم، ڕەنگبێـت قـازیش نـەبێتو ئیدایـە. چیایەکی وا مەزن چۆن دەبێت قاز بێت؟"

لێنا بەبیستنی ئەو قسانە پێکەنین گرتی.

لـەم میانــەدا، کچـەکان بــەهێمنی بــۆ لای بـاغی هــەناران ڕۆیشــتن. لــەنێو دڕكو گژوگیاکاندا بەسەختی دەیـانتوانی ڕابکـەن. چـوونە لێـواری دەریـا. لەسـەر چـەوو لـمەکان ئاسـوودەتر دەیـانتوانی ڕابکـەن. تـا ئـەو جێیـەی کـە لـمەکان کۆتاییـان هـاتو زنـارێکی نووکتیـژیان لەبەرامبـەر بەدەرکـەوت ڕایـانکرد. هەڵگـەڕان بـەو زنـارە لـەبڕینی دەریاکـە

سەختتر بوو. سەرکەوتوو نەبوون، گەڕانەوە، هەر لەگەڵ ئەوەی درزێکیان دۆزیەوە کە لەئەنجامی سێڵاوی ئاو دروست بووبوو، پێیدا هەڵگەڕانو بەهەنگاوی خێرا خێرا خۆیان گەیاندە نێو باغی هەناران. نەیانتوانی بچنە نێو دارەکان پەنجا هەنگاوێك لەولاتر لەژێر تاقە دارهەنارێکی پیر راوەستان، کە قاپۆرێکی خوارو خێچی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لقو پۆپەکانی بەهۆی ئەو هەموو گوڵو کوریکەی کە دایبوو لار بووبووەوەو سێ چوار هەنار لەلقەکانی سەرەوە بەرچاو دەکەوتن. گوێقولاغ چاوەڕێی مارەکەیان دەکرد. مار بەو درێژووکە سوورو دەرهاتووەیو پێستە شینو خاڵە سپیەکانی سەر پێستی مەیلەو قاوەییو بریقەداری لەنێو گوڵە هەناریەکان دێتەدەر، ئەوان هەترەشیان دەڕژێت، هەموو گیانیان دەکەوێتە لەرزین، مار باڵدەگرێت، سوور سوور، دەکەوێتە دوایان، ئەوان رادەکەنو دێنەوە ژێر دارچنارەکان، کاك پویرازی بەڕێز دەمانچەکەی لەنێکی هەڵدەکێشێت، مارەکە بەرلەوەی کە بەژەهرە کوشندەکەی بتوانێت ئەوان بکوژێت، دەپێکێت. مار بەخولانەوە لەئاسمانەوە دەکەوێتەخوارو ئەوانیش دێنەسەریو وای مار وای مار دەڵێنو دەگرین.

لەوێ، لەوسەری دونیا، لەشەمەندۆفەرێکی گەورەو زۆر بۆگەناوی دەبەزیبوون. لەگەڵ پیادەبوونیشیان لەبەر گەرمای زۆر روخسارو پێو پلو هەموو بەدەنیان سووتابوو. لەلایەکی دی مێشەکان، لادێیەکان پێیاندەگوتن مێشوولە، جێیەکی ساغیان لەبەدەندا نەهێشتبوون. کچەکانی ئەو گوندە یەکدەنگ دەیانگوت، مارەکانی ئەملایە زۆر گەورەن، باڵیان هەبوو، دەفڕینو تا ئاسمان بەرزدەبوونەوە. کچێك مارێکی زەردی هەبوو دەفڕی، مارەکە شەوان دەهات لەئامێزی کچەکە دەڕازاو خەوی لێدەکەوت. بڕیار وابوو، کە کچەکە گەورە بوو مێرد بەمارەکە بکات. باوکی کچەکە زۆر لەدەستی مارەکە تووڕە دەبێتو کاتێك کە مارەکە بەباڵەفڕێ خەریکبووە بێتە لایان بەدەمانچەکەیەوە لەئاسماندا دەیپێکێتو دەکەوێتە سەر زەوی. کچەکە زۆر گریاو، بەڵام ئیدی مارەکە مردووە. لەکلەکەکان لاشەی مارەکەیان لەگەڵ خۆ هەلگرتووەو بۆ کەشکەلانی ئاسمان بەرزیان کردۆتەوە.

چاویان بڕیبووە گوڵەکانی ژێر درەختان، بەڵام ئاسەواری مارەکە دیارنەبوو، توند خۆیان بەیەکەوە چەسپاندبووو چاوەڕوان بوون. بەو خەیاڵەی کە مارەکە دێتو پەلاماریان دەدا، ساتێك چیە پێڵووی چاوەکانیان دانەدەخست، ماوەیەکی درێژ ئاوا

مانــەوە. ســێبەری هــەورێك كــە لەبڵنــدایی چــیاكە راكشــاو بەســەر ئاســمــانی دوورگــەدا چەرخێكی لێدا، سێ جاران بەبەر چاویاندا تێپەڕی. دوای رۆیشتنی دوایین سێبەر، هەروا توند بەیەكەوە نووسابوون كە قاچەكانیان ئــەوانی هــەڵگرتو تــا یەكــەمین بــاغ بردیــانی. لەوێ لەجێی خۆیان رەقهەڵاتن، نەیانتوانی تەنانەت هەنگاوێك بۆ پێشەوە هەڵێنن.

بە تونــدی دەلــەرزین، نــەدەیانتوانی هــەنگاوێك بــۆ پێشــەوە بچــنو نــە هــەنگاوێك بــۆ گەڕانــەوە. ماوەیــەكی درێــژ ئــاوا لــەرزین، تــا ئەودەمــەی باڵندەیــەك كــە نەدەبینــدرا لەسەرچڵی درەختێكــی هــەنار هەڵنیشــتو چــڵە هەنارەكــەی لەرانــدەوەو چــەند كوریكــە هــەنارێك هــەڵوەران. هــەر لەگــەڵ ئــەوەی چــڵەدارەكە بەدەنگــەوە لەرایــەوەو كوریكــەكان هــەڵوەرین، كچــەكان بەهــەموو هێزیانــەوە بــۆ دواوە تــا پشــت قــاپۆری دارهــەنارە پیرەكــە رایانكردو لەوێ بەهەناسەبڕكێوە، لەكاتێكدا چاوەكانیان زەقبووبووەوە راوەستان. پێكــەوە نووســانو چــاوەڕێیانكرد تــا مارەكــە بەباڵــەفڕێوە بێــت، بــەڵام ئاســەوارێك لەمارەكــە دیارنــەبوو، چــی بەســەر ئــەو مــارە درێــژو گەورەیــە هــاتبوو، لــەكوێ ماوەتــەوە. چــاویان بڕیبووە ژێر دارەكان، دەتوانین بڵێین چاویان نەدەتروكاند.

ســێ دانــە ســێبەری هــەوری دیــان بەپێشــدا تێپــەڕین. ســەریان هــەڵبڕیو ســەیری هەورەكانیان كردو یەكسەر چاویان بڕیــەوە ژێــر دارەكــان. مــار، لــەو ماوەیــەدا نــەهاتبوو. هەمووان پێكەوە هەناسەیەكی قووڵیان بەنیشانەی ئاسوودەیی هەڵكێشا. ماوەیــەكی درێــژ لەچاوەڕوانی مانەوە، قاچیان شل بوون، ئــەژنۆیان لــەرزی، هــەوا گــەرم داهــات، ئارەقــەیان كرد. هەورێكی زۆر گەورە بــەئارامی بەســەر ســەریاندا تێپــەڕی. كــەمێك فێنــك بوونــەوە. هەر لەگەڵ تێپەڕینی هەورەكە. وەكو خەواڵووان بۆ نێــو دارهــەنارەكان شــۆڕیان كــردەوەو لەوێ لەژێر یەكەمین دارهەنار راوەستان. كەمێك دواتر، دیسان باڵندەیــەك هــاتو لەســەر لكێك هەڵنیشت، كە بەهۆی ئەو گوڵە زۆرانەی پێیەوە بوو شۆڕبووبووەوە. لكە درەختەكە دەنگی لێوەهاتو هەرچی گوڵی سووری پێیەوەبوون هەڵوەڕین. باڵندەكەیان بینی، رەنگــی مەیلــەو شــینێكی تــۆخ بــوو، رەنگــە شــینەكەی بەســەر گوڵەكانــدا شــەپۆلی دەدا. رەنگــە شینەكەی باڵندەكە بەسەر گوڵە هەڵوەریوەكان رەنگــی دابــووەوەو ئــەو گــوڵو كوریكانــەش رەنگێكی شینی تۆخیان بەخۆوە گرتبوو.

جارێكی دی وەكو خەواڵووان، یەك بەدوای یــەك تــا بــن دارهــەنارە پیرەكــە ســەرەوژێر بوونەوە، دیسان چاوەكانیان زەقكردنــەوەو لــەژێر دارەكــان رامــان. ســەیرێكی ئــەو دەوەنــە

گەزەی تەنیشت خۆشیان کرد. تا ئەو دەمەی لکە تۆپەڵیەکانی دەوەنە دڕکاویەکانی بەرامبەریان، کە گوڵی وەنەوشەییان هەبوو لەرانەوە لەوێ راوەستان، لکی دەوەنە دڕکاویەکان کە بەهۆی ئەو باو زریانەی بەتوندی لەدەوروبەری هەڵیکردبوو، دەلەرانەوە.

کچە گەورەکە گوتی: "مار، مار، سەیر بکەن لکی دەوەنەکە چۆن دەجووڵێت، سەیر بکەن، سەیر بکەن!"

چاوەکانیان تا توانیان زەقکردنەوەو سەیریانکرد. جووڵەی لکی دەوەنەکە تا دەهات زیاتر دەبوو، بەرەو لای دارهەنارەکان رۆیشتن، لکی دەوەنە دڕکاویەکان زیاتر تێکدەئالاْن‌و زیاتر دەلەرینەوە. باڵندە شینە هەڵنیشتووەکەش رووی لەلایەك کردبووو بەلاچاویێکیەوە سەیری دەوەنە دڕکاویەکەی دەکرد. کچە گەورەکە گوتی: "باڵی هەیە!"و رەنگی زەرد زەرد هەڵگەڕا، دەمی وشك بووەوەو هەموو گیانی کەوتە لەرزین.

لەو نێوەدا باڵندە شینەکە کە رەنگەکەی بەملاو ئەولادا رەنگی دەدایەوە، باڵەکانی لێکدان‌و هەڵفڕی، لەو شوێنەی کە لێیەوە هەڵفڕیبوو تا لای دەریا هێڵێکی شینی درێژی بەدوای خۆی بەجێهێشت، کە ئاوی لەچاوان دەهێنا. پاشان باڵندەی دی هاتن‌و لکی درەختەکانیان داپۆشی. لکەکان لەرینەوە، گوڵەکان وەك باران داباڕین.

دارهەنارەکان هەژانەوەو گوڵەهەنار لەو گۆڕە بڵاوبوونەوە. باڵندە زەردباوەکان، پەپووسلێمانەکان، باڵندە باڵزێڕینەکان‌و خاڵخاڵیە شینباوەکانیش بڵاوبوونەوە. دارهەنارەکان کەوتنە وشەوش، خرۆشان، زەردەواڵەکان بریسکانەوەو خامۆش بوونەوە، پەپوولەکان لەدەریاوە هاتن، بەهەزار رەنگی جیاجیاوە. زەوی سێ جار لەرزی. کچەکان زۆرترسان. وەکو خەوالْووان بۆ ئەملاو ئەولا رۆیشتن، ویستیان خۆیان بگەیەننە ئەو دەوەنەی کە لکەکانی چووبوونەوە نێو یەك‌و دەلەریەوە، بەلاْم نەیانتوانی. مارە باڵدارەکە لەژێر ئەو دەوەنەوە بوو، نەدەهاتەدەر. کۆشی خۆیان پڕی بەرد کردو بەردیان لەدەوەنە دڕکاویەکە گرت، بەو خەیاڵەی کە مارە باڵدارەکە بێتەدەر، چاوەڕێ مانەوە. لەترسان زمانیان لەگۆ چووبوو، بەتوندی دەلەرزین. مار نەهاتەدەر. خۆر لەگەل ئاوا بووو هەوا تاریك داهات، بەلاْم ئەوان هەر خەریکی ئەو یاریەی خۆیان بوون. دەنگی دایکیان لەژێر دارچنارەکان دەهات، لەپڕ بەهۆش هاتنەوە، بەرەو لای دەنگی دایکیان رایانکرد. لەژێر چنارەکان، کاك پویراز، ڤاسیلی‌و ئەوانیدی دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر چاوەڕێی هوسمەنیان کرد، لەدەوری سفرەی نانخواردن کۆبوونەوە.

ماسی گەورە گەورەیان خستنە سەر پشکۆی گەش. بۆنی مگێزداری رۆنی ماسی سوورکراوە سەرانسەری دوورگەی داگرتو بەسەر هەموو بۆنەکانی دی زاڵ بوو. هوسمەن لەدوور دوورەوە بۆنی ماسی کردو زانی کە زۆر برسیەتی. ئەوەندە گەدەی دەخووسایەوە. پێدەچوو کە زۆر لەمێژبێت نانی نەخواردبێت، هەنگاوەکانی خێرا بوون، بەرلەوەی ماسیەکان بخەنە سەر سفرە گەیشتە ژێر چنارەکانو لەتەك پویراز دانیشتو گوتی: "وڕوکاس بووم، نازانم کام خانوو هەڵبژێرم. هەموویان جوانن، بەڵام یەکێك لەهەموویان جوانترە".

"کامە؟ کەوابوو یەکێکت پەسند کردووە؟"

"پەسندم کردووە".

"سبەی کەلوپەکان دەبەینە ئەوێ".

"جارێ راوەستن. راوەستن ببینم چۆن دەبێت، بەڵکو بتوانم خانووە هەر جوانەکە بدۆزمەوە".

پویراز بێدەنگ بوو. ئەو قسەی کردو قسەی کرد، بەڵام پویراز لێوی لەلێو هەڵنەبڕی.

"زویر بوویت؟"

"زویر نەبووم".

"چیبکەم. خانووەکان هێندە جوانن هەریەکەیان دەڵێی کۆشکی بلوورینە، چۆن دەکرێت مرۆ ئەو خانووانە ببینێتو دەستیان لێهەڵبگرێت؟ من ئەگەر لەجێی ئەوان بام، دەستم دەدایە تفەنگەکەمو دەچوومە سەر ئەو تەپۆلکەیەو تا دوا دڵۆپی خوێنم دەجەنگام. ناتوانم لەو خانووە جوانانە یەکێکیان هەڵبژێرم، نازانم چیبکەم، وڕوکاس بووم. تۆ لێم زوویر بوویت؟"

"زوویر نیم".

هوسمەن درێژەی بەقسەکانی دا. یەك بەیەك باسی دەکردن. کەلوپەلە دارینە دەستکردەکانو نەخشو نیگارە جیاجیاکانی ناو خانووەکان. "وێنەی هەموو شتەکانی ئەم دونیایەیان بەدیواران هەڵواسیبوون. دەریاکان، هەورە سپیەکان، مانگەکان. هەورە شین شینەکان، باڵندەکان، ماسیەکان، زەردەواڵەکانو زۆر شتی دیکە. ئێستا تۆ وەرەو یەکێکیان هەڵببژێرە! تف! سەیر بکە کەوتوومەتە چ رۆژگارێك!"

هوسمەن باسکردنی خانووەکانی تەواوکردو کەوتە باسکردنی دوورگە. جا باسی چی نەکرد! دارە زۆر گەورەکە کە لكو پۆپەکانی لەبەر ئەو هەموو گوڵەی پێیوەبوون

داهاتبووەوە، بەهۆی خرۆشانی ئەو زەردەوالانـە هـاتبووە جۆش‌و مـرۆ بـەبۆن‌و بەرامـەی گوڵە سپیەکانی مەست دەبوو.

هوسمەن تا زیاتر قسەی دەکرد، زاتر مەست دەبوو.

"یاللا ئێوە لەجێی من، ئەگـەر توانیتـان لـەم بەهەشـتەدا جێگایـەك بـۆ خۆتـان پەیـدا بکەن، خوا ئێرەی دروستکردووەو جوانی هەموو دونیای لێکۆکردۆتەوە، دڵم نایە پابنێمە سـەرخاکەکەی، گەلایـەك لـەدرەختێك بکەمـەوە، زینـدەوەرێك یـان زەردەواڵەیـەك ئـازار بدەم. لەدانیشتن لەسەر ئـەو تەپۆلکەیـەو سـەیرکردنی دەوروبەرەکـە تێرنـابم. ئەگـەر تـا ئاخری عومرم لەم دوورگەیەدا بگەڕێم دیسان هـەرلێی تێـر نـابم. لەرۆشـنایی خاکەکـەی، دەریاکەی، زەردەواڵەکانی، پەپوولـەکانی، بـۆن‌و بەرامـەی گوڵـەکانی تێرنـابم. سـەرم کـاس دەبێت. لەبەندە خۆشەویستەکانی خوا بوومە کە هاتوومەتە ئێرە. ئێوە تا ئێسـتا جارێـك زەردەواڵەیەکتان گرتووە کە بۆنی بکەن؟ بۆنێکی مەستکەرانەیان هەیە. ئێرە زیاترە".

پـویرازو ئەوانیـدی کـە مـات‌و سەرسـام بـوون‌و دەمیـان قولانجێـك لێکبـەش بووبـووە گوێیـان لەقسـەکانی ئـەو گرتبـووو ئـەویش باسـی ئـەو کانیـەی دەکـرد کـە رەنگدانـەوەی تروسکەی ئاوەکـەی بەسـەر بـەردە شـینەکەوە دەلەرایـەوەو وردە بـەردە سـپیەکانی ژێـری دەدرەوشـانەوەو هـەروەها باسـی لـەدەریا، بـۆن‌و بەرامـەکان، شـنەی بـای سـپێدان‌و دارهەرمێیە گەورەکە دەکرد، راحەت وەك ئاوی رەوان دەیگێڕایەوە.

روویکردە پویراز، چاوی برِیە نێو چاوی‌و پرسی: "زویر بوویـت، مەگـەر نـە؟" پـویراز بەوپەڕی نەرمی، بەترسەوە نەوەك ببێتە مایەی ئازاردانی، بەگەرمی‌و میهرەبانانە گرتـە باوەش، هەستاو بەرەو لای ماڵەکەی چوو. ئەوانیدیکەش هەستان، هوسمـەن لـەو جێگایـە مایەوە کە لێیدانیشتبوو، سەبیحە بەئەدایـەکی میهرەبانـەوە گـوتی: "هوسمـەن، هوسمـەن، هەستە بڕۆین، منداڵەکان خەریکە دەنوون، هەستە".

هوسمـەن بەئەدایـەکی ئەوپـەڕی بەختەوەرانـە گـوتی: "ئێـوە بـڕۆن بخـەون، مـن لێـرە دەمێنمەوە".

کچەکان نانی بەیانیان خوارد، هەستان‌و بەرەو لای دارهەنارەکان کەوتنەڕێ. سـەبیحە پرسی: "بۆ کوێ منداڵینە؟"

"یاری".

"یاری، لەکوێ؟"

کچەکان بێدەنگ بوون، دەمێك ئاوا بێدەنگ بوونو نەیانتوانی وەڵامی دایکیان بدەنەوە.

بچووکترین کچیان گوتی: "دەچینە لای دارهەنارەکان، بۆ یاریکردن لەگەڵ مارەکان. ئەو مارانەش هەموویان رۆیشتنو ئیدی نەهاتنەوە". دلگران بوو.

دایکیان پێکەنی:

"بڕۆن یاری بکەن ببینم. بڕۆن لەگەڵ فیلو پڵنگە نادیارەکان یاری بکەن، بەڵام زوو بگەڕێنەوە".

کچە بچووکەکە بەشانازیەوە گوتی: "ئەمڕۆ مارە باڵدارەکە دێت، باڵەکانیشی شینن، وەکو باڵندەی شین، باڵەکانی زۆر گەورەن. ئێمەش زۆری لێدەترسین، لەترسان خۆمان تەڕ دەکەین".

چوونە لێوار، لەسەر لمەکان دەستیانکرد بەراکردن، هاتنەوە ژێر دارهەنارە پیرەکە راوەستانو لەقاپۆری درەختەکە وردبوونەوە. ئەو گوڵو کوریکانەی کە هەڵوەریبوون تا گوێزرینگی پێیان دەهاتو رەنگیان گۆڕابوو بۆ ئەرخەوانییێکی کاڵ، کچەکان بەباشی تێبینی ئەوەیان کرد.

کچە گەورەکە بەدەربڕینێکی نائومێدانە گوتی:

"ئیدی هیچ مارێك نایە، نە خاڵدارەکەیو نە باڵدارەکەی".

کچە بچووکەکە لەولاوە بەتووڕەییەوە گوتی:

"دێت، واشدێت کە ئێمە لەترسان بەخۆماندا بمیزین، هەمووومان".

"کارێکی باش دەکەیت. بێئەدەب! ئەگەر ئەم قسانە لەبەردەم کاك پویرازدا بکەیت، ئەوسا دەبینی چی روودەدات. باوکم تۆ... باش ئاقڵت دەکات".

"باوکم ناتوانێت هیچم لێبکات".

"ئاوا، ناتوانێت، ئێستا دەبینی. لەبیرت چووە، لەو گوندە چووبووینە سەر زنارەکەو نەتدەتوانی ببێیتەخوار. نەباوکم دەیتوانی بەزنارەکەدا هەڵگەڕێتو نە هیچکەسی دی. یەکێك پەیدابوو کە تەنافبازبوو، تۆی هێنایەخوار. باوکم پارەیەکی زۆری دا بەو کابرایە. دواتریش تۆی... لەبیرتە؟"

"لەبیرمە".

کچە بچووکەکە زیزبوو، دەمو لووتی تێکناو ئیدی دەنگی نەکرد، بەڵام ئەمڕۆ هەم مارە درێژە خاڵدارەکەو هەم مارە باڵدارەکە، لەوێ لەنێو دەوەنەکانەوە بەفشفشکردنەوە دێن. ئەویش لەبنەوە سەیری کچە گەورەکە دەکات. ئەویش لەترسان خۆی تەڕدەکات.

لەوێ لەژێر دارهەنارە گەورەکە لەتەك یەكدیەوە راوەستابوون. لەباغی رووبەڕووەوە کەمترین جووڵە بەدینەدەکرا. نە زەردەواڵەیەك هەڵدەفڕی، نە باڵندەیەك لەسەر لکی درەختێك هەڵدەنیشت و نەکەمترین شنەبایەك دەجووڵا. ئەو دەوروبەرە وا کشومات بوو دەتگوت دونیا مەحو بۆتەوە. تەنانەت دەنگی دەریاش کە کەمێك لەولاتر بوو، نەدەبیسترا.

دەتگوت دەریاش لەگەڵ باڵندە شینەکە لەشەقەی باڵی داوەو رۆیشتووەو جێگاکەی خاڵی بووە.

منداڵەکان متەقیان نەدەکرد، هەر لەوێ، لەشوێنی خۆیان رەق هەڵاتبوون. تەنانەت گەڵایەك نەدەجووڵا، لەگەڵ ئەوەشدا چاویان بڕیبووە دەوەنەکان و ژێر درەختەکان. ترسیان لەبیرکردبووو بێباك بووبوون، ئەمە چەندی پێچوو دیارنەبوو. هەتاو، بەورشەیەك بەرەنگی سەوز، وەنەوشەیی، شینی رۆشن و پەمەیی لەدوورەدەستی دەریادا ئاوابوو. جگە لەدارهەنارەکان سەیری هیچشتێکی دیکەیان نەدەکرد.

لەناکاو کچە بچووکەکە هاواری کرد: "مارەکە لەوێیە، مارەکە لەوێیە، لەنێو دەوەنەکە".

هەر لەگەڵ ئەوەی هاواریکرد، بەرەو لای دارهەنارەکان پێی پێوەناو گەیشتە نزیك دەوەنەکە، لەدەوری دەوەنەکە، لەکاتێکدا کە بۆ سەرێ و خوارێ هەڵدەبەزیەوە یارییێکی سەیرو سەمەرەی دەستپێکرد.

منداڵەکان بێئەوەی دەرفەتێکیشیان هەبێت بۆ نیشاندانی ئەو سەرسامیەیان، لەشوێنی خۆیان وشکهەڵاتبوون، تەنانەت نەیانتوانیبوو بشترسن. کچە بچووکەکە لەدەوری دەوەنە چڕەکە، بەخێراییەکی زۆر دەخولایەوەو قاچەکانی خۆی تەکان دەدات.

کچە بچووکەکە لەپڕ ون بوو. منداڵەکان نەیانزانی چی روویدا، هەموویان پێکەوە بەرەو دارهەنارەکان رایانکرد، بەدەوری دەوەنە دڕکاویەکە سووڕانەوە، پاشان خزانە نێو دارەکان، کچە بچووکەکەیان بینی وا خەریکە لەملا بۆ ئەولا رادەکات. بۆ ئەوەی بیگرن رایانکردە لای ئەو. کچەکە ئەوەندە بەخێرایی رایدەکرد، کە هەموو باغەکەیان لێکدا، بەڵام نەیانتوانی بیگرن.

ماندوو بوون. زۆریان ئارەقە کردبوو، ناچار بوون هەر لەو شوێنەی راوەستابوون، دابنیشن. کچە بچووکەکەش دانیشت. ئەویش ماندوو بووبوو، هەناسە بڕکێی وێکەوتبووو سینگی وەکو هەنبانی کوورەی ئاسنگەران بەرزو نزم دەبوو.

دوای ئەوەی هەناسەیەکی هەڵکێشاو پشووێکی دا، هەستاو بۆ لای خوشکەکانی چووو لەبەرامبەریان راوەستا، گوتی: "بەبێ ماریش ترسام. نە مارم بینی، نەهیچشتێکی دی، لەترسانیش خۆم تەڕکرد".

یەکەم کچە گەورەکە، دواتر ئەوانی دی بەدوایدا وەکو ئەوەی گوناهیان کردبێت لەنێو دارهەنارەکان هاتنەدەر.

هەر هاتنەدەر کچە گەورەکە گوتی: "بەڵام من نەترسام". خەمێکی گەورە بەسیمایەوە دیاربوو، ئاهێکی هەڵکێشا، درێژەی دایێ "نە مارێك هەبوو نە هیچشتێکی دی".

کچەکانی دیکەش یەك یەك دەستیان بەقسان کرد:

"منیش نەترسام، منیش نەترسام، منیش..".

بەر لەئاوابوونی خۆر، هاتنەوە ژێر دارچنارەکە.

دایکیان بەشەوقو زەوقەوە بەپیریانەوە چوو.

"چیتان لێهاتووە منداڵینە؟ روخسارتان بۆ والێهاتووە؟ چیبووە؟

ئێوە باشن؟

"هیچ نەبووە".

کچە بچووکەکە هاتە نێوەوە:

"مار نەبوو، رایکردووە. ئەوەندە سەبرمانگرت بەڵکو بێت، نەهات، دەبێت قەت نەیە. من خۆم بەتەنیایی یاری مارم کردو زۆریش ترسام. ترسام بەڵام... ئەمانە هیچ نەترسان".

هوسمەن لەسەر تەختەکە دانیشتبووو خۆی گرمۆڵە کردبوو. نیوە خەوتوو، نیوە بێدارو نیوە لەنێو خەیاڵ. خانووەکان بەرەنگی جیاجیا لەبەرامبەر چاوەکانیدا ریز بووبوون لەپشت تەمێکی چڕ بەئارامی تێدەپەڕین. نەیدەتوانی یەکێکیان هەڵبژێرێت. دوای ئەوەی کە هەموو خانووەکانی بەبەرچاویدا تێپەڕینو رۆیشتن هەستاو دوای ئەوەی کە چاوێکی بەدەوروبەری خۆیدا گێڕا، بەرەو لای خانووی چێشتلێنەرەکان کەوتەڕێ. بێئەوەی خانووێك ببینێت بەبەرامبەریان رەت بووو لەزنارەکانی دەربەند گەڕایەوە. دیسان بێئەوەی هیچشتێك ببینێت، بەپێش خانووەکاندا تێپەڕی. ئەوەندە ماندووو شەکەت بوو، ئەوەندە بەپلیکانەکاندا هەڵگەڕابووو هاتبووەخوار، هەموو ئازای بەدەنی دەئێشان. هاتەوە ژێر دارچنارەکەو

لەسەر تەختەكە دانیشتو خۆی گرمۆڵە كرد. لەوێ هەستا رۆیشت سەرێكی لەكلێسا دا، چووە ژوورو هاتەدەر، لەكلێساوە بەرەو لای دارهەرمێیەكە، لەوێوە بەرەو لای دارهەنارەكانو لەوێشەوە چووە نێو خانووەكانو نەفەسی تازە كردەوە، لەناكاو خۆر دەركەوت، ئەو دوندەی چیا كە خۆر بەنووكە تیژەكەی دەكەوتو نوقمی نێو رۆشنایی بوو، دەتگوت كە براوە لەهەوادا ماوەتەوە.

دوند لەكاتێكدا دەتگوت دەیەوێت داكۆكی لەرۆشنایی دەوروبەری بكات دەخولایەوە. هوسمەن لەلایەك تەماشای دوندەكەو لەلایەكی دی سەیری خانووەكانی دەكرد، هات لەبەردەم ئەو خانووە راوەستا، دەرگای كردەوەو بەخێراییو بەپلیكانەكاندا هەڵگەڕا. لەهۆڵەكە تێپەڕیو چووە هەیوانەكەو رووی كردە چیاكە، دوندی چیاكە هەروا دەسووڕاو خوار دوندەكە سێبەر بووو چیا لەنێو تەمو مژدا هەڵكشرابووو بتەوێت نەتەوێت دەجووڵا. دەریاش ئارام بووو نوقمی نێو رۆشنایی بوو، رەنگی جۆراو جۆری بەخۆوە دەگرت، لەلایەكی دی ماسیەكی درێژو گەورە قەڵەمبازێكی دا، تاوێك درەوشایەوەو خامۆش بوو.

هوسمەن گوتی: "دۆزرایەوە، سوپاس بۆ خوا ئەمەش چارەسەر بوو". یەكسەر خۆی رێكو كۆ كردەوەو بەرەو لای چیاكان رایكرد. پویراز لەوێ نەبوو، بازی دایە سەر پلیكانەكان: "دۆزرایەوە، كاك پویرازی بەڕێز، بوو، لەكوێی؟" هەناسە بڕكێی بوو.

"لێرەم هوسمەن، وا دێم".

هوسمەن بێڕاوەستان لەپلیكانەكان بەسەر دەكەوتو دادەبەزی، ئارامو ئۆقرەی نەبوو.

لێنا لەتەك شومینەكە دانیشتبووو خۆی گرمۆڵە كردبوو، سەیری هەڵسوكەوتەكانی هوسمەنی دەكردو بەخۆی دەگوت. ئەم پیاوە چی بەسەر هاتووە. لێنا دەترسا لێینزیك ببێتەوەو هۆی ئەو بێئارامیەی لێبپرسێت.

هوسمەن لەهۆڵەكە بۆ هەیوانو لەهەیوانەكە بەرەو لای شومینە دەڕۆیشتو دەگەڕایەوەو ئاوا لەپلیكانەكان بەسەردەكەوتو دەهاتەوەخوار. پویراز جلەكانی كردبوونە بەرو حازرو ئامادە لەنێو دەرگا بەدەركەوت. هوسمەن لەكاتێكدا دەیگوت: "دۆزرایەوە، دۆزرایەوە". چووە نزیكی، "دۆزرایەوە، دۆزرایەوە، گوێت لێنیە؟"

وەكو شێتان پێدەكەنی.

"چی دۆزرایەوە؟"

هوسمەن دەستی گرتو لەپلیکانەکاندا هێنایەخوار، لەبەرامبەر چنارەکان بەرەو لای سەرەوە رۆیشتو لەبەردەم خانووێکی رەنگ بنەوەشەییو دوو نهۆمی، کە باخچەیەکی گەورەی هەبوو، راوەستان "ئەمەیە دۆزیمەوە، دۆزیمەوە، ئەمەیە".

پویراز گوتی: "پیرۆزە!" هێشتا وڕو کاس بوو.

لێناش بەدوای ئەواندا هاتبوو. ئەویش لەتەنیشت هوسمەن راوەستا بوو گوتی: "پیرۆزە هوسمەن! ئەویش حەپەسابوو.

هوسمەن بەدەستێکی دەستی پویرازی گرتو بەدەستی دی دەستی لێناو گوتی: "وەرن، سەرنجام دۆزیمەوە، ماندووبوونەکەم بەفیڕۆ نەچوو".

ئەوانی بردە هەیوانەکە، چیاکەی نیشان دان.

"سەیری بکەن، سەیری بکەن، چیاش هۆو لەوێیە، چیای ئیدا".

# بەشی سێیەم

بەلەمــە ماتۆڕدارەکــەی قــەدریی بەلــەموان لەئەســکەلە لەنگــەری گرتبــوو. لــەنێو بەلەمەکە، یەکەمجار پیاوێکی بەتەمەن هاتەدەر بەپشتێکی کووڕەوە، ریشێکی ئاڵۆزکاوی پۆخڵ، کـە وەکو کەپـەنك تێکئـاڵۆزابووو گۆناکانی پێکداقوپابوون، هـەر ئیسك‌و پێست بوو. دەتتوانی پەراسووەکانی بژمێریت. شەلوار، کراس‌و ژێر شەلواری تیتڕتیتڕ بوون.

روخساری هەموو چرچ‌و لۆچ بوو. چاوە کت‌و کوێرە شینەکانی لـەنێو ئـەو روخسارە لۆچاویەدا دەقووڵدا چووبوون. لەکاتێکدا بۆ چـەپ‌و راسـتی خـۆی دەخولایـەوە سـەیرێکی دەوروبـەری خـۆی کـرد. پشـتی کـەمێك زیـاتر چـەمایەوە، قاچـەکانی توانـای رۆیشـتنیان نـەبوون، ئـارام ئـارام ئـەژنۆکانی چـەمانەوەو هـەر لـەوێ لەسـەر تەختـەکانی ئەسـکەلە دانیشـت. دوای ئـەویش ئـەوانی دی لەبەلەمەکـە دابـەزین، ژنـەکان، کچـەکان، منداڵـەکان، گەنجـەکان، پیرەژنـەکان‌و پیاوەکـان، هـەموویان نیـوە رووت، جلوبـەرگی دڕاوو پـڕاو. جلـە دڕاوەکانیان بەچەشنێك بوون کە سنگی کچ‌و ژنـەکان لـەو گـۆڕە بـوو. منداڵـە وردیلـەکان تــەواو رووت بــوون، پــەتێکی ئەســتووری رەنگــاوڕەنگ بەپشــتێنی هــەموو منداڵەکانــدا ئاڵێندرابوو. هێندە لاوازو کزبوون کە توانای بەپێوە راوەستانیان نـەبوو، بـەملاو ئـەولادا دەهەژان. نەیاندەتوانی هـەنگاوێك چیە هـەڵێنن. تـەنها تـا لای پیـاوە پیرەکـە، کـە هـەروا بەچـەماوەیەوە لەسـەر تەختەکـە بـوو دەهـاتن‌و هـەر لـەوێ دادەنیشـتن. بەلەمەکـە یـەك یەك‌و دوو دوو بێڕاوەستان لێیدادەبزین‌و خاڵی دەبوو.

پویراز دواجار هاتە ژێر دارچنارەکان‌و بەرەو لای ئەو تازە هـاتووە پەڕپووتانـە چـوو. قەدریی بەلەموانی بینی کە لەبەلەم دابەزیبوو خەریك بوو دەهات.

"لەوێ چ خەبەرە قەدریی بەلەموان، ئەمانە کێن؟"

قەدریی بەلەموان بەدەنگێکی کزەوە گوتی: "نازانم، بەڕێوەبەری ناحیە بـانگی کـردم‌و گـوتی هـەموو ئەوانـەی کـە لەحەوشـەن هـەڵیانبگرەو بیانبـە لای کـاك پـویراز. ئەمانـە لەحەوشـەی ناحیـەدا دانیشـتبوون‌و نەیانـدەتوانی لەشـوێنی خۆیـان بجـووڵێن. ئەمـەیانم بـەرز دەکـردەوە، ئـەویان دەکـەوت. ئـەوم دەگـرت تـا نەکـەوێت یـەکێکی دیکـە دەکـەوت.

منداڵەکان بەسەرپێوە بوون، وەکو ئێستا. سەیرمکرد وانابێت، چوومە بازاڕ دۆستە ماسیگرەکانی خۆمو گەنجەکانی شارۆچکەم بانگکرد، هاتن ئەوانەیان سواری بەلەمکرد".

پویراز داهاتەوە شتێکی چرپاندە گوێی قەدریی بەلەموان: "من چیبکەم لەگەڵ ئەمانە قەدریی بەلەموان، هەموویان خەریکن دەمرن".

قەدریی بەلەموان سەری خۆی لار کردەوەو گوتی: "من چیبکەم سەرۆك پویراز، بەڕێوەبەری ناحیە سێ ڕۆژی تەواو بەدوامدا گەڕابوو. خۆزگە نەچووبامە شارۆچکە".

"نە، نە، باشتر، با زوو بیانبەین لەسەر تەختەکاندا دابنیشن".

قەدریی بەلەموان بەکابرا بەتەمەنەکەی گوت: "تۆ هەستە ئاپۆ، تۆ ساغی دەتوانی بەپێیان بڕۆیت".

پیاوە پیرەکە بەباڵا چەماوەکەی یەکسەر هەستاو گوتی: "من خۆم دەڕۆم".

چووە ژێر چنارەکە.

مەلەك خانم قۆڵی گرتو داینیشاندە سەر تەختەکە.

دوورگەییەکان، هەمووان کەوتنە خۆو بەیارمەتی منداڵەکان ئەو خەڵکە بەلەنگازو رووتو رەجاڵەیان بردە ژێر چنارەکان. هەندێکیان دانیشاندنە سەرتەختەکانو ئەوانەی توانای دانیشتنی سەر تەختەکانیان نەبوو، لەسەر چیمەنەکانی دەوروبەری کانیەکەیان درێژکردن.

پویراز بەنیگەرانیەوە گوتی: "لێنا، مەلەك خانم، ئەمانە خەریکە دەمرن، هەرچی شەکر هەیە بیهێننو شەربەت بگرنەوە، ئەگەر نا ناتوانین رزگاریان بکەین، ئەمانە لەبرسان وایانلێهاتووە.

ڤاسیلی، هوسمەن، قەدری، سەبیحە ئێوەش بڕۆن شەربەت بگرنەوە، بجووڵێن.

هوسمەن گوتی: "ئێمە دونیایەك شەکرمان هەیەو بەڕاکردن رایکرد.

کەمێك دواتر سێ سەتڵی پڕ شەربەتیان هێنا، پویراز بەچەمچەیەکی گەورە شەربەتی لەپەرداخان دەکردو سەتڵەکانی تێکدەدا. کچەکانیش بەخێرایی شەربەتیان هەڵدەگرتو دەیاندایە نەخۆشەکان.

زۆری نەبرد سەتڵی یەکەم خاڵی بووو هی دووەم نیوەو سێیەمین سەتڵ هێشتا تەواو پڕبوو.

"لێنا ئەمڕۆ دەبێت بۆ ئەمانە برنج لێبنێیت، پیازو دۆشاوی تەماتەشی تێبکە. با رۆنی زۆر نەبێت، پونگەشی تێبکە".

لێنا بەئەدایەکی تایبەت تووڕەیی خۆی دەربڕی: "چیتریش بکەینە چێشتەکە؟"

پویراز گوتی: "تووڕە مەبە دایکە لێنای هێژام. ئەمانە خەریکە لەبرسان دەمرن. چێشتەکە نابێت قورس بێت. سێ رۆژی دیکە ماسیان دەدەینێ، لەماوەی هەفتەیەك چاکدەبنەوە".

پیاوە پیرەکەش سەری هەڵبڕی:

"من زۆر حەز لەماسی دەکەم. وای زوو ماسیم بدەنێ، مێشکی ئێسقانەکانم لەبرسان وشك بووە. چێشتەکە کەی دێنن؟".

"دواتر"

"بەڕێز پێیانبڵێ پەرداخێکی دیکەم شەربەت بدەنێ، ئەم شەربەتە هێنامیە سەرخۆ".

پویراز رووی لەسەبیحە کرد:

"تۆ لێرە بەدیار منداڵەکانەوەبەو هەرکەس شەربەتی ویست بیدەرێ، هێشتا سەتڵو نیوێك شەربەتمان ماوە، ئەگەر تەواویش بوو دیسان دروستی بکەن، چی زۆرە شەکر زۆرە".

کچە گەورەترەکە پەرداخێك شەربەتی بردو دایە دەستی پیاوە پیرەکە، پیرەمێرد شەربەتەکەی فڕکرد، لەچاوترووکانێکدا چۆڕی لێبڕی.

"پەرداخێکی دی، پەرداخەکانی ئێوە زۆر بچووکن، خوا دەست بەباڵتانەوە بگرێت، پەرداخێکی دی".

پیرەمێردەکە چوار پەرداخ شەربەتی لەسەر یەك فڕ کردن.

"ئۆووە قوربانی خوا بم، ئەم شەربەتەش خواردنەوەیەکی چەند بەتامە".

لەچاوقوچانێکدا شەربەتی نێو سەتڵەکان تەواو بوو. هەمووان شادو خۆشحاڵ بوون. ئارام ئارام دەهاتنەوە سەرخۆ.

"یاللا ئێمە بابچین بگەڕێین بۆ ئەم دۆستانە لێفەو دۆشەكو بالیف بێنین". هوسمەن گوتی: "ئێوە بوەستن من دەزانم کام خانوو چ جۆرە شمەکی لێیە. خانووی یەکێ لەچێشتلێنەرەکان تا بنیمچی نوێنە. تۆ لێرە بمێنەوەو پێمانبڵێ نوێنەکان ببەینە کام خانوو".

"یاللا ئێوە بڕۆن، منیش خانووێك دەدۆزمەوە تاکو جێی ئەمانەی تیابێتەوە". ئەوان رۆیشتن، پویراز چاوێکی بەیەکە یەکەی ئەو تازە هاتووانە داگێڕا. هیچکامیان لەحاڵەتی

مردندا نەبوون، دڵی گەشایەوە، ئەگەرچی بۆنێکی گران لەلای ئەوانەوە دەهات، بۆنێك لەبۆنی گەنیو و مەرگ دەچوو.

پیاوە بەتەمەنەکە گوتی: "پیاڵەیەك شەربەتی دیکەم بدەنێ".

پوپیراز چوو لەو شەربەتی لەبنی سەتڵەکانەوە مابوو پەرداخێکی پڕکردو هێنای دایە پیاوە بەتەمەنەکە.

"خوا دەست بەباڵتەوە بگرێت، منیش کە پشتم راست بووەوە، نەك لەو شەربەتە، بەڵکو شەربەتی هەنگوینت بۆ دروست دەکەم".

بە شێوازێکی نارێکی شێوەزاری دەریای رەش قسەی دەکرد.

چاوەکانی یەکێك لەگەنجەکان کراوە بوون. پوپیراز سەیرێکی کردو پەرداخێك شەربەتی کە لەبنی سەتڵەکانەوە مابوو، دایە دەست.

"ئێوە چەند دەبێت لەو حاڵو بارە دان؟"

گەنجەکە گوتی: "زۆر دەمێکە، زۆر دەمێکە حاڵمان ئاوایە کە دەیبنیت. چەند مانگە هیچکەس ئاورێکی لێنەداوینەتەوە، خەڵك بەزەلالەت چوو. کەسانێکی زۆر وەکو ئێمەمانان ئاوارەی کێوو بەندەنان بوونو لەرێگادا هەروا رادەقەنانو بەجێدەمان، تەنانەت خەڵکەکە نەیدەتوانی مردووەکانیشیان بنێژنو هەر ئاوا وازیانلێهێنانو رۆیشتن، زۆر یەکجار زۆر!".

لەقووڵایی دڵەوە ناڵاندی، ویستی قسە بکات، نەیتوانی. فرمێسك لەچاوەکانی هەڵقەیان بەست. قاچە براوەکەی راستی رووتو قووت بوو، قاچی چەپیشی کە بەشەلوار داپۆشرابوو، لەبنەوە لێبووبووەوە. سەردەستی کراسەکەشی لێبووبوونەوەو سەر دەستە رووتەکانی پڕبوون لەمێشو مەگەس. تەنانەت توانای ئەوەی نەبوو مێشەکانیش لەخۆی دوور بکاتەوە.

"قاچەکەت لەکوێ لەدەست داوە؟"

"لەئەللاهو ئەکبەر".

پیرەمێردەکە قسەی ئەوانی بڕی:

"ئەزیش شەربەتی هەنگوینت بۆ دروست دەکەم کاکی بەڕێز. ماسیشت بۆ دەگرم، ئەویش چ ماسییەك، لەو مەرجانە سوورانە. من لەکاتی خزمەتی سەربازیم لەدەریای سوور زۆر مەرجانم دەگرتن. کاتێك دەڵێن دەریای سوور هەمان ناوچەکانی کاناڵە. ئەگەر

کەمێك ورگم تێر ببێت. تۆ سەیری بکە، لەماوەی دوو رۆژدا دێمەوە سەرخۆم، لەم دەریایەدا سوورە دەست دەکەوێت؟"

"بەڵێ".

"کەوایە باشە".

سەبیحەو منداڵەکان هەم زۆر نیگەران بووبوونو هەم ماندوو. لەسەر یەکێك لەتەختەکان پاڵیان بەیەکێك لەچنارەکان دابووەوەو خۆیان خڕکردبووەوە، لەروخساریان حاڵەتێك لەئازار، تاسانو خەفەت بەدیدەکرا. سەریان نابووە بەرخۆو لەئەرزەکە رامابوون.

پویراز گوتی: "باش دەبن دۆستان، باش دەبن، باش باش".

ئەم قسانەی وا بەئومێدو باوەڕ بەخۆبوونەوە دەربڕین، کە ئەوانەی بیستیان باوەڕیانکردو خۆشحاڵ بوون.

"سەبیحە، منداڵەکان، یاللا با ئێمەش بچین لەخانووەکان قاپو هیربارو کەوچكو کاسەو ماسە بێنین".

سەبیحە گوتی: "هەر خانووێك بگریت ئەم شتانەی لێن. تەقەتیان کردوون. ئێوە چەندی بتانەوێت قاپو هیربارتان بۆ دەهێنم".

پویراز خۆشحاڵ بووو روخساری کرایەوە.

یاللا زووبن".

"کچەکان ئێوەش وەرن".

سەبیحە لەپێشو کچەکان بەدوایدا، لەچاو هەڵێنانو داهێنانێکدا لەبەرچاوان ون بوون.

لەحەوشەی خانووەکەدا مەنجەڵێکی گەورە قوڵپ قوڵپ دەکوڵی، بۆنی نەعنا ئەو ناوەی داگرتبوو. پویراز بەئارامی بۆنی نەعنای هەڵدەمشت. دایکی بەبیرهاتەوە. دایکی ئەویش ئەو چێشتەی نەعنای دروست دەکرد، بۆنەکەی هەموو لایەکی پڕدەکرد. جگە لەوە ئاشی ماشی دایکی... ئێستا ئەوان لەکوێن؟ لەکوێی دونیان، دایكو باوكو براکانی خۆی هێنانەوە بەرچاو، گوندیەکان، رەنگبێت دایکی وەکو ئەوەی لەژێر چنارەکە دانیشتووە قژی تێکئالابێتو مەمکەکانی چرچو شۆڕ بووبنەوە، چاوەکانی بەقووڵ داچووبن، دەمو چاوی هەر تەنها ئێسكو پێست مابێتەوە. هیچکەسی نیە کە قەنداوێکی بداتێ.

لەپڕ شانەکانی داکەوتن، نەیتوانی بەپێوە بوەستێت. دەستی لەتەختەکەی بەردەمی گرت، هەوڵیدا دایكو باوکی لەزەینی خۆ دووربخاتەوە، بەتایبەتی دایکی کە گەردنێکی درێژ، چاوانی گەورەی ئاسمانی، قژێکی بۆرو قەدو باڵایەکی باریکی وەك بلووری هەبوو.

خوا بەزیادی بکات، سەبیحە لەگەڵ منداڵەکان بەگونیەیەك کە بەکۆڵیەوە بووو جرینگ جرینگ دەنگی دەهات، لەپێچی دیواری خانووی رووبەروویان وەرسووڕایەوە، بەدوایشیدا منداڵەکان هاتن، لەکاتێکدا کە هەریەکەو یەك دوو قاپی مسی تەنی گرتووو جامێکی ئاوی لەدەست بوو، بچووکتریشیان قابلەمەیەکی پێبوو، هاتن لەبەردەم پویراز راوەستان. سەبیحە ئەو **گونیەی** بەکۆڵیەوە بوو دایناو ئەو شتانەی تێیدا بوون یەك یەك لەسەر تەختەکە هەڵیچنین. پویراز ماتو حەپەساو مابوو.

"ئەگەر من نەبووام هیچکەس نەیدەتوانی ئەم قاپو هیربارانە پەیدا بکات. منیش ئەو دەمەی کە هاتمە ئێرە ئەم کارەم ئەنجام دا، قاپەکانم هەر لەو شوێنانەی کە ئەوانە دایاننابوون قایم کردن. ئێمە هەموو دارو نەداری خۆمانمان فرۆشتبوو تەنها خانووەکە نەبێت. نەمانەدەتوانی قاپو هیرباران لەگەڵ خۆمان بێنین، ئەگەر بمانویستبا بشیانفرۆشین کەس نەیدەکڕین. منیش هەرچی کە هەمان بوو قایمم کرد. هەر ماڵێك بگریت قاپو هیرباری خۆی هەیە. منیش لەو قاپانە هەڵدەگرم، جا هەرە جوانەکانیان".

پویراز کە روخساری لەخۆشیان دەبریسکایەوە گوتی: "هەرە جوانەکانیان پەیدا بکەو هەڵیانبگرە".

قاپەکانیان لەسەر ئاوی دەریا شوشتن، پاشان وشکیان کردنەوەو لەسەر مێزەکە هەڵیانچنین، هەمووان چاویان بڕیە قاپو هیربارو جامە بەتاڵەکان.

پویراز گوتی: "ئاشەکە خەریکە پێدەگا"و هەستا، بەرۆخ خانووی لای راستدا تێپەڕیو چوو لەبەردەم دەرگای حەوشەی دوو خانووی گەورە راوەستا، دەرگای کردەوەو چووە ژوور، دەرگای خانووەکەی کردەوەو بۆ سەرەوە چوو، ژوورەکان گەڕا، بیریکردەوە چەند زۆر ژووری هەن. خانووێکی جوانو رێکوپێك بوو، تەنانەت تۆزە گەردێکی پێوە نەبوو.

ئەوانەی بۆ هێنانی نوێن چووبوون بەبارێك لێفەو دۆشەك گەڕابوونەوە "ئامادەین نوێنەکان هەلگرین". چووە لای باغلەمە نوێنەکان راوەستا. "قەدریی بەلەموان، لەوێوە لێفەو دۆشەکان هەلگرەو بیانخەرە سەر پشتم، ئێوەش هەڵیانگرنو بەدوای مندا وەرن. سەرینەکان بدەنە منداڵەکان با بیانهێنن".

ئەو کۆچبەرانە کە نوێنەکانیان بینیبوو، هەم گەورەکانو هەم منداڵەکان، روخساریان گەشابووەوەو بتەوێت یان نا چاوەکانیشیان دەبریسکایەوە.

"با نەچینە سەرەوە، نوێنەکان هەر لەژوورەکانی خوارەوە دابنێن، ئەو کلۆڵانـە توانـای ئەوەیان نیە بەپلیکانەکاندا هەڵگەڕین. دۆشـەکەکان بەدرێـژی پـان بکەنـەوە. ئەمشـەو بـا ئاوا بخەون. کە ئاشەکەیان خوارد دێنە سەرخۆ. ئەمانە چەند خێزانن؟ دیارنیە رەنگبێت یەك خێزانیش بن".

کاتێك دەگەڕانـەوە ژێـر چـنارەکان بـۆنی خەسـتی نـەعناو بـۆنی ترشـی هـەناریان بـۆ دەهات، قەدریی بەلەموان پرسی: "ئەمە ئیدی چیە؟"

پـویراز لەخۆشـحاڵیان گـوتی: "بـۆنی ئاشـە بەلـەموانی خـۆم بـۆنی ئـاش. ئێسـتا تـۆ سەبرێك بگرە. با زستان دابێت ئینجا چ جۆرە ئاشێکت بۆ لێدەنێن. دایکە لێنـاو مەلـەك خانم لێیگەڕێن با زستان دابێت".

هاتن لەتەك مێزەکە راوەستان، هوسمەنو سەبیحە مەنجەڵی چێشتەکەیان لەناوەڕاسـتی مێزەکـە دانـابووو تەختەکانیشـیان لـەدەوری مێزەکـە ریـز کردبـوون. پـویراز بەئارامیـەوە گوتی: "ئەوانەی دەتوانن بەپێوە بوەستن، بێنە ئێـرە سـەرمێز، ئەوانـەیش کـە نـاتوانن بـێن، ئێمـە بۆیـان دەبـەین". رووی کـردە مەلـەك خـانم کـە لەتەکیـەوە بـوو، مەلـەك خـانم چەمچەیەکی دارینی لەسەر مێزەکە هەڵگرت. قسەکانی پویراز خۆشحاڵیان کردبوو.

پیرەمێردەکە گوتی: "یەکێکتان بێت من هەڵسێنێتەوە".

ڤاسیلی چوو بەرزیکردەوە. پیرەمێرد بۆ ئەوەی کـە لەسـەر مێـز دابنیشێت، بێئـەوەی کـە داوای یارمـەتی لەڤاسـیلی بکـات، بەپشـتێکی کۆمـەوە چـوو دانیشـت. "یـاللاّ چـما راوەستاون، ئەم قاپە قووڵەی پێش من پڕ پڕ بکەن".

مەلەك خانم کە خەریك بوو پێدەکەنی، ئـەو قاپـە قووڵـەی کـە پیرەمێردەکـە بـۆلای ئەوی درێژ کردبوو پڕی کردو کەوچکێکی داریشی دایە دەست. دوای پیرەمێردەکە چـەند کـچو کـوڕی گـەنج هـاتن. سـێ ژنـی نیـوە رووتـیش هـاتن لـەنێو کچـەکان دانیشـتن. چەمچـەکەی دەسـتی مەلـەك خـانم وەکـو مەکینـە کـاری دەکـرد. هـەر قـاپ پڕدەکـرانو دەڕۆیشتنو قاپی بەتاڵ دەهاتن.

لەپڕ دەستی مەلەك خانم وەك بڵێیـت لەجووڵـە کـەوت. پـویراز بەپاڕانـەوەوە گـوتی: "مەلەك خانم چدەکەیت، ئێمەش وا لەبرسان دەمرین".

پیرەمێرد بەدەربڕینێکی سەرزەنشتکارانە، نیوە گاڵتەو نیوە جیددی گوتی: "جارێ ئێوە سەبر بگرن. مەگەر ئێوەش وەکو ئێمە چل ڕۆژ برسێتیتان چەشتووە؟ جارێ ڕاوەستن تا ئێمە ورگمان تێر دەکەین ئینجا. ئێوە نۆ مانگان چۆن لەسکی دایکتان ماونەتەوە؟"

پویراز گوتی: "ماوین ئیدی، نانی موفت ئاوی موفت. سەبرمانگرت ئێستاش خەریکە لەبرسان دەمرین. لانیکەم هەریەکەو کەوچکێك ئاشمان بدەرێ مەلەك خانم، مەگەر چ ڕوودەدات؟!"

پیرەمێرد گوتی: "مەلەك خانم یەکەو یەك کەوچك ئاشیان بدەرێ، لەپشکی ئێمە بیاندەرێ... لەدەریا بۆ ئەم پیاوە ماسیی قزلئالا دەگرم. بەمن ئێژن پیری ماسیگرەکانی دەریای سوورو دەریای ڕەش. تۆ ئەگەر نەهێڵیت لەبرسان بمرم، منیش دونیایەك ماسیت بۆ دەگرم".

پویراز جامەکەی نێو دەستی درێژ کرد، مەلەك خانم جامەکەی پڕکرد، هەمووان بەڕیز ڕاوەستابوون، جامی هەموویان پڕکرا. ئاشەکەیان هەر بەپێوە خوارد.

"ئامادەبن، دەبێت دۆستەکانمان ببەینە خانووەکە تاکو خەوێکی ئاسوودە بکەن‌و بێنەوە سەرخۆ، لەماوەی دوو ڕۆژدا باش باش دەبن".

پیرەمێرد پرسی: "ئەو خانووە لەکوێیە؟ یاللا وەپێش کەون، من بگەیەننە ئەوێ".

هەستاو وەڕێکەوت. قەدریی بەلەموان ژێر باڵی گرت. پیرەمێرد قبوڵی نەکرد، لەلایەکی هۆڵی گەورەی خانووەکە فانۆسێکی مەلەوانی‌و لەلای دیکە چراگازیەك، بەپلێڵەی شووشەیی گەورەوە کە گوڵی شینباوی هەبوو، دەسووتان. نوێنەکان، لەمسەر تا ئەوسەر ڕاخرابوون. دۆشەکەکان لەتەك یەکدی ڕاخرابوون‌و سەرینەکانیش هەروا.

هەمووان لەنێو نوێنەکانیان ڕاکشان. بۆنێکی خەست ژوورەکەی داگرت. پویراز بیری کردەوە، لەبەرەکانی شەڕ، سەنگەرەکان ئەو جۆرە بۆنەیان لێدەهات "لێرە لەڕۆخ ئاگردانەکە گۆزەیەك ئاوو پەرداخێك دابنێن"و کاتێك کە دەهاتەدەر گوتی: "خەوێکی خۆشتان هەبێت".

"سوپاست دەکەم کوڕم، خوا خێرتان بنووسێت، ئەمشەو دەمەوێت خەوێکی سێ مانگی بکەم. ئێسقانەکانم هەست بەحەسانەوە بکەن. بەیەك شەو دەبمە منداڵێکی تازە لەدایکبوو. ژنەکەشمان لێیدا ڕۆیشت".

"ئیشاللا سبەی یەکدی دەبینینەوە بابە، ئینشاللا!"

ژمارەیەك لەتازە هاتووەكان بەیانی زوو لەخەوهەستانو چوونە لێواری دەریا، لەپەنا هەڵدێرگەكان ورگی خۆیان بەتاڵكردەوەو بەپەلەبەردەكانیش خۆیان سڕیەوە.

پاشان لەسەر كانیەكە ڕێزیان گرت. سابوونێكی بۆنداری پەمەیی لەسەر بەردێك داندرابوو، سێ خاولیش بەلكێكی نەویی دارچنارەكەوە كرابوون.

دەستو دەموچاویان بەسابوونی بۆندار شوشتو بەخاولیەكان وشكیان كردنەوە.

هوسمەنو قەدریی بەلەموان مەنجەڵی چێشتە بۆنخۆشەكەیان هێناو دایاننایە سەر مێزەكە، مەلەك خانم ئەو كاسەو قاپانەی كە بۆ لای درێژ كرابوون پڕكرد. پیرەمێرد یەكەمین كەس بوو كە خۆی گەیاندبووە سەرمێزەكەو لەوێ كپو بێدەنگ چاوەڕێی دەكرد. مەلەك خانم هەر كە ئەوی بینی پێكەنیو گوتی: "چۆن بوو ئێوەم نەبینی كاكە". خۆی بۆلای كاسە پڕ چێشتەكەی بەرامبەری درێژ كرد: "نۆشی گیانت بێت، نۆشی گیان".

"مەمنوونم مەلەك خانم، سوپاسی هەمووتان دەكەم، زیندووتان كردینەوە، ئێوە نەبان هەموومان لەنێو چووبووین".

مەلەك خانم وەكو كچێكی گەنج، سوور هەڵگەڕا.

"ئێمە كارێكمان بۆ نەكردوون، بەخێربێن بۆ دوورگەكەمان سەرسەرو سەرچاو".

"ئێمەتان لەبرسێتیو مەرگ ڕزگار كرد".

مەلەك خانم بەخۆشحاڵیو لەكاتێكدا كە چاوەكانی لەخۆشیان دەبریسكانەوە، شەرمنانە گوتی: "ناوت چیە بەڕێز؟"

"پێمدەڵێن وەلی نیشانچی".

"خوایە هەزار ساڵ بەم ناوە تەمەن بكەیت. منیش غەریبەم، خەڵكی ئەو چیا شینەی ئەوبەرم. ئێمە بەو چیایە دەڵێین قازداغی، یۆنانیەكان پێیدەڵێن ئیدا. ڤاسیلی جارێك لەدەمی دەرچوو كە یۆنانیەكانیش پێیدەڵێن قازداغی، بەلام ئەوان لەكۆن پێیاندەگوت ئیدا. هاولاتیانی ئێمەش پێیدەڵێن چیای هەزار كانی. هەزار كانی...!"

دەستیكرد بەچیرۆكی كچە زەردەكە، پاش چیای هەزار كانی، لەپەڕەندەو خشۆكەوە بگرە تا زیندەوەرەكانی یەك بەیەك بۆی باسكرد، وەلی نیشانچی كەوچكی لەنێو دەستو ئاوا مابووەوە، بەگوێیەك نا، بەهەزار گوێ گوێی دابووە مەلەك خانم. مەلەك خانم هەم قسەی دەكردو هەم كاسەكانی پڕدەكردن لەچێشت.

كاتێك مەلەك خانم بۆ تەنیا ساتێك بێدەنگ بوو، وەلی نیشانچی گوتی:

"چ زێدو چ چیایەکی هەزار کانی جوانت هەبووە مەلەك خانم".

"خواوەند هیچکەس لەماڵو حاڵو ژیانی خۆی جوداو دەربەدەر نەکات، کاك وەلی نیشانچی. چیاکەی من بەهەشتی ئەم دونیا گەورەیە، لەئەزەلەوە، ستڕانبێژان ستڕانیان بۆ ئەم چیای هەزار کانیە گوتووە".

"خوا تەمەنی درێژ هەم بداتە تۆو هەم بەچیاکەت، مەلەك خانم، ستڕانبێژەکانیشتان کەم نەبنەوە".

"سەلامەت بیت کاك وەلی نیشانچی".

وەلی نیشانچی سەرمەست بووبوو، چووبووە نێو خەیاڵێکی قووڵو ئەو دەستەی کە کەوچکەکەی گرتبوو دەلەرزی.

هیچکەش لەو خانووەی کە درابووە میوانەکان نەمابوو، هەمووان لەژێر دارچنارەکان لەسەر تەختەکان دانیشتبوونو بیریان دەکردەوە.

ئەم رەوشە، کە بەیانیان ئاشی نەعنا، نیوەڕۆیان ساواری چەورو شەوانیش دۆڵمەی گەڵامێو لەگەڵ سرکەی هەناریان دەخواردو سێ رۆژ بەردەوام بوو، سەر لەبەیانی رۆژی چوارەم بڕیار بوو هوسمەنو پویراز بەبەلەمەکەی قەدری بچنە راوەماسی.

وەلی نیشانچی کە هەواڵی چوونی ئەوانی شەوی پێشتر بیستبوو، سپێدە زوو لەخەوهەستا بووو هاتبوو لەسەر تەختەی ژێر چنارەکان دانیشتبووو چاوی بڕیبووە دەرکەی ماڵی پویراز.

لەپڕ چاوەکانی لەقوڵتی چاوەکانیدا سووڕان، یەکپێ هەستا بەرەو لای ئەسکەکە چوو، شوێنێکی خاوێنی دۆزیەوە، رووەو قیبلە راوەستاو نوێژی دابەست. لەکاتی نوێژکردن زۆر ئازاری دەکێشا، کە ئەژنۆکانی دادەهاتنەوەو راست دەبوونەوە، پشتو گەی دەستەکانی قرچەقرچیان دەهاتو ئازاریان دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا بەڕوویەکی خۆشەوە درێژەی بەنوێژکردنەکەی داو سوپاسی خوای کرد کە دوورگەیەکی ئاوا جوانو فراوانو شوێنێکی وای بۆ ژیانو هەروەها ئەو کۆشکە رەنگاو رەنگانەی بەدیواری وێنەدارەوە پێبەخشیبوون.

نوێژەکەی بەجۆشو خرۆشەوە خوێندو بەتوانایەکی لەرادەبەدەر دوعای خوێند. پێیوابوو دوندی چیاکانی بەرامبەر رۆشن بوونەوە، زۆری نەمابوو بۆ دەرکەوتنی گزنگ. ئەستێرەی گەشاوەی لای رۆژهەلات لەنێو ئاوی زولاڵدا رەنگی دەدایەوە. بایەکی نەرم

لەسەر ئاوەکە هەڵیدەکردو جەستەی مرۆی دەهێنایە لەرزە. گوێی لەچرپەی پێیەك بوو کە لەدوایەوە دەهات، هەرچەند زۆر بەنوێژکردنەکە ماندوو بووبوو، بەڵام هەر درێژەی پێدا. دەنگی پێیەکە هات لەبان سەری راوەستا.

نیشانچی لەحاڵەتی کڕنۆش بردن دابوو، هەستایەوە، لەسەر ئەژنۆکانی دانیشت. بۆلای راستو چەپی سڵاوی دایەوە، ویستی هەستێتەپێ، نەیتوانی. دەستێکی بەهێز ژێر باڵی گرتو بەرزیکردەوە. نیشانچی ئیدی پشتی چەماوە نەبوو. "ئوووە کاکە پویرازی بەڕێز تۆش بۆ نوێژکردن هەستاویت؟"

پویراز گوتی: "دەبێت بچینە راوەماسی، گوتم ئەم خەڵکە بەباشی تێربکەین".

"منیش دەبەی، مەگەر نە؟"

"تۆ نابەم، چونکە هێشتا باش نەبوویت".

نیشانچی هەڵچوو:

"ئەوەی کە باش نەبووە تۆو باوکتە، مەگەر من چمە، سەیرم بکە چ کێماسیەکم هەیە؟ چاوەکانم باش لێکبکەوەو سەیریان بکە!"

گوتی: "بینیومە، پێناچێت ئەوەندەش باش بیت. تۆ دەبێت جارێ ئەوەندە ماسی بخۆیت تا دێیتەوە سەرخۆت".

"رۆڵە گیان، نازانم بای پویرازی، رەشەبای ئەستێرەی باکووریت، چیت؟ تۆ خۆت بەچی دەزانیت، بزانە خەڵکەکەت چەند کەس دەبن؟ حەزت لێیە خۆت بەسوڵتان سلێمان دابنێ، مەگەر ئەم دوورگەیە ئەگەر هەموو لایەکیشی پڕبێت چەند کەس دەگرێت؟ دوورگەش پڕبێت هەموومان لەبرسان دەمرین. بینیت مرۆڤ کە برسیش ببێت چی لێنایە... مەگەر ئێمە ئەو هەموو ماوەیە برسی بووین چیمان لێهات، بینیت کە سێ کەوچك ئاش چووە ورگمان بووژاینەوە". پێکەنی "تۆش چ ئاشێکی بەتامت لێنابوو، لەو دایکە جوانەتەوە فێری بوویت؟"

پویراز بەشێوەیەکی ئەنقەستانە دەنگی خۆی بەرزکردەوەو رەگی ملی راست بوونەوە:

"تۆچۆن دەزانیت دایکی من جوانە؟ لەکوێت بینیوە؟"

"ئاشکرایە".

پویراز بەئەدایەکی تووڕەترو بەدەنگێکی بەرزتر گوتی: "بەچی ئاشکرایە؟"

"بەتۆ، کوڕەکەم، تۆ قەت خۆتت لەئاوێنەدا نەبینیوە؟"

پویراز نەرم بوو، بتەوێت نەتەوێت بزەی هاتێ، تووڕەییەکەی دامرکایەوە.

"بینیومە".

"بینیت، باشتکرد، کوڕەکەم، مرۆڤێکی وەك خۆت لێوەشاوەو بەبەزەییت بینیوە؟"

"نەمبینیوە".

"تا ئێستا بینیوتە ژنێکی ناشیرین منداڵێکی جوانی ببێت؟"

"نەمبینیوە".

"تۆ ماوەی سەربازیەکەت لەکوێ بوو؟"

"ساری قامیش".

"ئەسپێ نەیانخواردیت؟ لەسەرما رەق نەبوویتەوە؟ نەکا لەسەربازی هەڵاتبیت؟"

"هەڵنەهاتووم".

"رەحمت بەهیچ کەسیش نەکردووە، مەگەر نە؟"

"ئەمەیان نازانم ئیدی".

نیشانچی چەند هەنگاوێك لێینزیك بووەوە، دەستی راستی گرتو گوشی:

"ئەگەر من ببەیتە راوەماسی، یەك دونیا ماسیەسوورەی دەریای سوورت بۆ دەگرم. ئەز ماسیگرم، ئەوەندە بەسە سەیرێکی دەریا بکەم، دەزانم کوێ زۆرماسی لێیە. من خەڵکی دەریای رەشم. ماسیگری دەریای سوور، لەجەنگی تەنگەش بووم. فەرماندەی سوپاکەی ئێمە، سێ ساڵ ئەو ماسیە سوورانەی خوارد کە من لەدەریای سوورم دەگرتنو هەڵمساو وەکو بەرمیلی لێهات، کاتێکیش وەکو بەرمیلی لێهات، رۆیشتو خۆی رادەستی ئینگلیزەکان کرد، ئێمەش لەنێوەڕاستی بیابان ماینەوە، برسیو تینووو پاپەتی، یەك یەك لەنێو چووین، ئەفسەرەکەمان نەیتوانی هیچ کارێك بکات، ئێمەی بردە بیابانی یەمەن، تا گەیشتینە ئەوێ، زۆرمان لەرێگادا تەلەف بووین، کە گەیشتینە یەمەن لەو سوپا مەزنە تەنها مشتێك سەرباز مابوونەوە. تۆ کارێکی باشتکرد راتکرد".

"رامنەکردووە".

"راتکردووە کوڕم، راتکردووە دلاوەرەکەم، تۆ جوان جوان راتکردووە".

"تۆ بەچی دەزانیت، ئەگەر رامکردبا پێمدەگوتی رامکردووە. بۆچی پێمدەڵێیت راتکردووە؟"

"مەگەر کەسێك لەجەنگی ساری قامیش بەسەلامەتی گەڕایەوە؟ تۆ بڵێ گەڕایەوە؟ بڵێ! مەگەر نیوەی سوپا نەبووە خۆراکی ئەسپێیان؟ مەگەر نیوەکەی دیش لەچیاکان لەسەرمان ڕەق نەبووەوە؟"

"بەڵێ، بەڵام من رامنەکرد".

"باشە، راتنەکردووە، بەڵام ئەمڕۆ دەبێت من ببەیتە راوەماسی. ببینە کوڕە جوانەکەم، بەچاوەکانی خۆتت بینی، دەستەکانم بەدەستنوێژن، دەمم پڕ لەنزایە، دونیایەك دوعات بۆ دەکەم".

پویراز دووبارە بەئەنقەست خۆی تووڕە نیشاندا:

"من دوعای هیچکەسم ناوێت".

"تۆ نەتەوێت، لێ من ببە".

پاشان لەبەرامبەر پویراز راوەستاو بەدەنگی بەرز گوتی: "ئیدی بەسە، لەخۆڕا هەڵمەچوو. تووڕەم مەکە، ئێستا سواری بەلەمێك دەبم‌و لێرە دەڕۆم. دوورگەو گەورەییەکەی خۆت بۆ خۆت".

ئاواڕیان لەدەنگی ئەو پێیە دایەوە کە لەلای وردە بەردەکانەوە هات. ڤاسیلی، قەدریی بەلەموان‌و هوسمەن بەدەم قسەکردنەوە خەریکبوون دەهاتن.

"سەیر بکە برا، سەیر بکە کوڕە جوانەکەم، ئەمن ئەمڕۆ ببەرە دەریا. جا ببینە چۆن دەبێت! سەیر بکە، ماسیگری شارەزا، لەدەریا چ ماسیگەلێك دەگرێت‌و چ شوێنگەلێك بۆ ماسیگرتن دەدۆزێتەوە".

"سەیر بکە مامە نیشانچی، ناکرێت سێ ڕۆژی دیکە بتبەینە ماسیگرتن؟ تۆ تا ئەوکات چاك دەبیەوە".

نیشانچی بەوپەڕی تووڕەییەوە ئاوڕی لەوانە دایەوە کە خەریکبوون دەهاتن:

"هۆی منداڵینە، مەگەر من چیمە، ئەو پیاوە لەبەیانیەوە یەکڕیز پێمدەڵێت تۆ چاك ببەوە، چاك ببەوە دەتبەم بۆ راوەماسی. من چیمە؟ ئەو دەبێت خۆی چاك ببێتەوە". دووبارە دەستی پویرازی گرت‌و بەنەرمی، بەڵام لێبڕاوانە گوتی: "ئەگەر تۆ ئەمڕۆ نەمبەیتە راوەماسی، منیش لەم مەملەکەتەی تۆ تەنانەت ئەگەر بەهەشتیش بێت دەڕۆم، ئەگەر لەبرسانیش بمرم هەر دەڕۆم. تۆش ئەمە دەزانیت‌و زۆر نیگەران دەبیت".

پویراز لەکاتێکدا وایدەنواند گوێ بەقسەکانی ئەو نادا، رووی کردە قەدریی بەلەموان:

"بەلەموان، تۆ بەلەمەکە ئامادە  بکە، ئەمڕۆ وەلی نیشانچیش لەگەڵ ئێمە دێت".

"ئا، ئێستا قسەکەت بووە قسە پویراز!"

وەپێش قەدریی بەلەموان کەوتو چوو لەسەر ئەسکەلە راوەستاو چاوەڕێ ما تا قەدریی بەلەموان بەلەمەکە لەئەسکەلە نزیك بکاتەوە. هەر لەگەڵ ئەوەی بەلەم لەئەسکەلە نزیك بووەوە خۆی فڕێدایە نێویەوەو دوای خۆ هەڵدانەکە ئووهێکی هەڵدا.

"هەزار جار سوپاس بۆ خوا".

ئەوانیدیش سواری بەلەم بوون. ماتۆڕەکە کەوتەکار.

لەنێو سندوقەکەی خوارێ ژمارەیەکی زۆر قولابی ماسیگرتن هەبوون. قەدریی سەندوقەکەی هێناو داینایە بەردەم نیشانچی. وەلی نیشانچی بەدەستە شارەزاکانیەوە قولابێکی هەڵبژاردو گوتی: "ئەمە، بەکەڵك دێت". هەستا وەرسووڕاو چاوێکی بەدەریادا گێڕا. لەدوورەوە کەشتییێك بەرەو لای باشوور دەڕۆیشت، دووکەڵ لەدووکەڵکێشەکەی بەرز دەبووەوە.

کپو بێدەنگ سەیری دەریایان دەکرد. بەلەم بێهیچ گرفتێك دەچووە پێش. ڤاسیلی لەنێوان دوورگەی کاباو کارینجا راوەستا. هەردوو دوورگەکە لەپشت تەمو مژدا وەك خەیاڵ بێت دەهاتنە بەرچاو.

"ئێرە باشە؟"

هیچکەس دەنگی نەکرد. قولابەکانیان خستنە نێو ئاو. وەلی نیشانچی، هەردوو چاوە شینە بریقەدارەکانی بڕیبوونە دەریاو نێوچاوانی لۆچ لۆچ بووبووو ئەبرۆکانی وێکهێنابوونەوەو لەداوی قولابەکەی رامابوو. دەستی راستی بەخێرایی کێشایەوە دواوەو بەهەمان خێرایی بردیەوە پێش، پاشان دەستیکرد بەڕاکێشانی داوەکە. هەمووان چاویان بڕیبووە نیشانچی. نیشانچی داوی قولابەکەی بەئارامی رادەکێشاو بەوردی لەبەرپێی هەڵیدەوێزنیەوە. ڤاسیلی بیریکردەوە، نیشانچی لەماسیگرتن لەوە شارەزاترە کە خۆی دەیگوت. بەسەر قولابەکەوە، مەرجانێکی گەورە بریسکایەوەو ون بووەوە.

دەستی پیرو پڕ لۆچو پۆچی نیشانچی درێژکراو ماسیەکەی گرتو لەچاوقوچانێکدا مەرجانەکە لەنێو لەگەنە گەورەکە دەستیکرد بەمەلەکردن.

هەمووان واقیان وڕمابوو. بچووکترین جووڵە لەسیمای نیشانچی بەدی نەدەکرا. قولابەکەی بەوپەڕی خێرایی شۆڕ دەبووە نێو ئاوو دەهاتەوە دەر. کەمێك دواتر،

نیشانچی بەخێرایی قولابەکەی راکێشاو دووبارە فڕێیدایەوە نێو ئاو. پاشان دووبارە بەهێمنی قولابەکە راکشرا. هەمووان بەچاوانی زەقبووەوەیان لەنیشانچی نزیك بوونەوە، قولابی خۆیان لەبیرکردبووو تەنانەت هیچ ئاگایان لەوە نەمابوو کە داخۆ ماسیەك دەم لەقولابەکەیان دەدات یان نا.

هەر لەگەڵ ئەوەی قولابەکە شۆڕبووەوە ناو ئاو، وەلی نیشانچی سەری خۆی بۆ ئاسمان هەڵبڕیو چووە خەیاڵەوە، هاوکات لەگەڵ ئەوەی سەری نەوی کرد، قولابەکەشی راکێشا. دیسان بەسەر قولابەکەوە مەرجانێك هەڵدەبەزیەوەو بریسکەی رەنگە تەواو پەمەییەکەی بەسەر ئاوی دەریادا رەنگی دەدایەوە.

ئەوانیدی راوەستان، قولابەکانیان لەنێو ئاوی دەریا لەبیرکردبوو، هەموو هەستو زەینیان هەر لەسەر دەستو روخسارو قولابەکەی نیشانچیو ماسیەکانی نێو بەلەمەکە بوو، کە تا دەهات ژمارەیان زیاتر دەبوو... نیشانچی شەشدانگ هەستی لەلای قولابەکەی بووو ئیدی ئاگای لەهیچشتێك نەبووو چاوە بچووکە شاهێنەکەی خۆی بڕیبوونە دەریاو تەنها دەستەکانی کاریان دەکردو هیچ جووڵەیەك لەروخسارو جەستەیدا بەدینەدەکرا. ئەوانیدیکەش لەشوێنی خۆیان رەقهەڵاتبوون. دەریا ئەوەندە هێمن بوو کە مێروولەکان دەیانتوانی ئاوی لێبخۆنەوە.

نیشانچی مەرجانێکی زۆر گەورەی لەئاو هێنایەدەر. ماسیی کەللەبۆر بەو پەڕی هێزیەوە بەسەر قولابەکە بۆ ئەملاو ئەولا خۆی هەڵدەدا، بەچەشنێك کە نیشانچی ئیدی توانای ئەوەی نەبوو ماسیەکە، کە بەهەموو هێزی خۆی تەکانی دەدا لەقولابەکە بکاتەوە.

"وا داوەکە دەپسێنێت، ئەمە لەقولابەکە بکەنەوە".

ڤاسیلی خۆی هەڵداو ماسیەکەی گرت، ماسی بەهەموو هێزی خۆی هەڵدەبەزیەوەو تەکانی دەدایە بەرخۆی، ڤاسیلی نەیدەتوانی لەقولابەکەی بکاتەوە. سەرەنجام هەم ڤاسیلیو هەم ماسیەکە ماندوو بوون. ماسیەکە کەوتە سەر تەختەکان. گیاندانەکەی زۆری پێچوو، بۆ دوایین جار خۆی هەڵکێشایەوەو وێکهاتەوەو ئارام ئارام لەجووڵە کەوت.

رۆڵەکانی من، من ماندوو بووم. هێشتا دەستم گەرم نەبووە. زۆر دەمێکە ماسیم نەگرتوون. ئەگەر مانگێکی تەواو بێمە راوەماسی ئینجا دەستەکانم رادێنەوە، ئەوسا دەتوانم هەمان نیشانچی جاران بم.

ئەوانیدی ماوەیەك دواتر هاتنەوە سەرخۆو لەکاتێکدا پێدەکەنی بەسەر سەرسامیەوە سەیری وەلی نیشانچیان کرد.

ڤاسیلی گوتی: "قەدریی بەلەمەکە ببەرە ئەولا!"

رۆشنایییەك بەسەر رووی دەریاکەوە بووو شنەبایەکی نەرمیش هەلێکردبوو، هەڵیدەکردو لێیدەکردەوە.

کاتێك ماتۆڕەکە کەوتەکار، دەنگی خۆشحاڵانەو لەهەمانکات ماندووی نیشانچییان بیست: "منداڵەکان ژێر دەریا لەرەلەریەتی لەمەرجان".

سەریانهەڵبڕیو سەیری ئەویانکرد. چاوە شینەکانی ئەو کە بریسکەیەکی شینباویان هەبوو، لەبزۆزیو شادیدا بریقەیان دەهات.

بەرەو لای رۆژئاوا سەرەوژێر بوونەوە، دوورگەی کابا لەپنتێکی زۆر دوور بەجێ مابوو. قولابەکانیان خستنە دەریاو چاوەڕێیانکرد. ماسیەکان دەستیانکرد بەدەملێدانی قولابەکانی ئەوانیش. تا شەو ژمارەیەکی باش چیپورا، لوفەرو لورکیان گرتن. وەلی نیشانچیش بەسەریانەوە وەستابووو بەسەر سوڕمانەوە لێیدەڕوانینو کاتێکیش ئەو ماسیانەی دەبینی کە بەسەر نوکی قولابەکانیان هەڵدەبەزینەوە لەخۆشیان زاری تا بناگوێی لێکدەبووەوە.

پویراز بەدەنگێکی گڕەوە گوتی: "ئەم ماسیانەی کە گرتوومانن نەك هەر ئێمە، بەڵکو دەتوانن یەك شارۆچکەش تێر بکەن. یاللاّ زووبن با بڕۆین خۆمان بگەیەنینەوە دوورگەو ماسیەکانمان بخۆین. مردین لەبرسان".

وەلی نیشانچی گوتی: "مردین".

هەمووان پێکەوە پێکەنین.

کاتێك بەلەمەکە خەریکبوو لەئەسکەلەدا لەنگەری دەگرت، ماوەیەکی زۆر مابوو رۆژ ئاوا ببێت، لەلای رۆژئاواش هەورەکانی سەردەریا سپی سپی بوون.

هوسمەن، ڤاسیلیو قەدریی بەلەموان، ئەو ماسیانەی کە رووپانکردبوونە نێو سەبەتەکان بەزەحمەت بۆیان هەڵدەگیران.

پویراز کەمێك لەسەر ئەسکەلە راوەستا، بەوردی سەیرێکی ئەو سەبەتە پڕ ماسیانەی کرد، کە خەریکبوون هەڵیاندەگرتو گوتی: "زۆرمان ماسی گرتوون مەلەك خانم! سەیرکە دایکە لێنا خەریکە تەماشای ماسیەکان دەکات، دەمی لەخۆشیان کراوەتەوە".

لێنا گوتی: "وڕوکاس بووم، ماسیێکی چەند زۆر! دەمو دەستەکانم کراونەتەوە، ئەو هەموو ماسیەتان لەکوێی پەیداکردن، دەریاتان لەماسی بەتاڵ کرد، هەرچی ماسی لەنێو دەریا هەبوو گرتووتانەو هێناوتانە".

"زۆربەیان نیشانچی گرتوونی".

"ئەو ئیدی کێیە؟"

"هـۆو ئـەوە". وەلی نیشانچـیان نیشـان دا، کـە لەسـەر تەختـەکانی ئەسـکەلە خـۆی وێکهێنابووەو دانیشتبووو قاچەکانی شۆڕی لای ئاوەکە کردبوون.

"ئەو پیرەمێردە؟"

پویراز گوتی: "خۆیەتی".

ڤاسیلی هاتە نێو باسەکە:

"من لەتەمەنی خۆمدا ماسیگری وام نـەدیوە، ئـەم دەریایـەش نەیـدیوە". سـەبەتەکەی هەڵگرتو داینایە سەر وردە بەردەکان.

نیشانچی لەشـوێنی خـۆی هەسـتا، چـەند هـەنگاو چـووە ئـەولاتری پـویراز. "پـویراز، کوڕم، چەقۆیەکم بۆ بێنە، دەبێت ئەم ماسیانە زوو پاك بکەینەوە".

وەلی نیشانچـی ئێسـتا بـۆ مرۆڤێکـی زۆر خاکـەڕاو شـەرمێون گۆڕابـوو. ڕەنگبێـت هەمیشەش هەر ئاوابووبێت، سەختی، خوڵق‌و خووی مرۆڤ دەگۆڕێت.

"چەقۆیەك بدەن بەنیشانچی".

مەلەك خانم ئەو چەقۆیەی لەدەستی بوو بۆلای ئەوی درێژکرد: "بگرە برا وەلی نیشانچی".

بەئەدایەکی زۆر خاکەڕایانـە، بـەدەنگێکی کـە بەئاسـتەم دەبیسـترا هاتـە پـێش، بـۆلای لێـوار ڕۆیشـت، لـەپێش تەپۆلکـەی ماسـیەکان دانیشـت‌و دەسـتەکانی بەوپـەڕی خێرایـی کەوتنـەکار. لەماسـیەکانی لای دەسـتە چـەپیەوە ماسـییێکی هەڵـدەگرت‌و بـەخێرایی پـاکی دەکردەوەو دایدەنایە لای دەستە ڕاستیەوە.

پویراز پرسی: "ئەوانیدی لەکوێن؟".

مەلـەك خـانم ئـاهێکی هەڵکێشـاو ڕۆنـدك لەچـاوانی ئەڵقـەیان بەسـت، گـوتی: "لەژوورەوەن، لەژوورەوەن، هەر نایەنەدەر، جلەکانیان تیتڕ تـیتڕو دڕاون، شـەرمێ دەکـەن. رووتی رووتن".

روخساری پـویراز زەردهەڵگـەڕا، لێوەکـانی لـەرزین، بـەقاچ لەدواخۆکێشـان چـوو لەسـەر تەختەکان دانیشت، دەم‌و چاوی گرتە نێو دەستەکانی‌و هەنیشکەکانی دانانە سەر ئەژنۆکانی.

"سەیر بکەن، سەیر بکەن، وەرن ئێرە سەیر بکەن، ئێمە ماسییێك پاك ناکەینـەوە ئـەو دووانیان پاك دەکاتەوە! سەیری دەستەکانی بکەن، نابینـدرێن، ئاگای لەخۆی نەماوە".

پویراز، لەشوێنی خۆیەوە بەئارامیو خەمگینانە سەیری کرد. چووە لێوارو لەلای دەستە راستی نیشانچی راوەستا، چاوی بڕیبووە دەستەکانی نیشانچی، بێئەوەی چاو لەسەر دەستەکانی، کە دەتگوت دەیانەوێت بفڕن هەڵگرێت، لەوێ مایەوە. بەلەموانو ڤاسیلیش وازیان لەپاککردنەوەی ماسیان هێنابوو، هاتبوون هەروا چەقۆ بەدەست بەدیار نیشانچیەوە راوەستابوون. ژنەکان هاتبوونو بەڕیزەوە لەپشت سەری نیشانچی ریزیان بەستبوو. نیشانچی، پێدەچوو تێبینی ئەوەی کردبێت هەمووان چاویان بڕیوەتە دەستەکانی ئەو، بۆیە خێرایی دەستەکانی زیاتر بوون.

تا ئەودەمەی نیشانچی کاری پاککردنەوەی ماسیەکانی لای دەستەچەپی تەواو نەکردبوو، هیچکەس نەیتوانی لەجێی خۆی بجوولێتو چاو لەسەر دەستەکانی ئەو لابدات.

هەرکە کاری پاککردنەوەی ماسیەکان تەواو بوو، نیشانچی چەقۆکەی بەجوانی شوشتو داینایە سەر وردەبەردەکانی لای چەپیو دەستی راستی خستە سەر وردەبەردەکانو هەستایەوە. ماندووو دیسان پشتی چەمابووەوە. بۆ سەر کانی چوو، سابوونەکەی لەسەر بەردەکە هەڵگرت، پاشان دووبارە لەشوێنی خۆی داینایەوە.

یەکەمجار دەستی راستی، پاشان دەستی چەپی ماوەیەکی باش بۆنکرد، دەستەکانی بۆ دوولاکردنەوە، چەند جارێك بەتەواوی خۆی لێککێشایەوە، ئینجا لەکاتێکدا دۆخینی شەلوارەکەی دەکردەوە، بەرەو لای دەوەنەکان رۆیشت. لەنێو دەوەنە گەزەکان دانیشتو بەهەستێکی خۆشەوە قەزای حاجەتی کرد. بەگەڵای گوڵێکی نەرمو پانیش کە لەبەرامبەر خۆی لەبڕکەکەی کردبووەوە، باش باش خۆی پاککردەوە.

هێشتا خۆرئاوا نەبووبوو کە ئاگر کرابووەوەو کۆمە پەنگرێکی گەش لەنێوەڕاستی ئاگرەکە نێڵەنێڵیان بوو. ڤاسیلیو قەدریی ئەو ماسیانەی کە نیشانچی پاکیکردبوونەوە دەیاندا بەژنەکانو ژنەکانیش ماسیەکانیان لەخوێ دەدانو دەیانبردن دەیانخستنە سەر پەنگرەکان.

پویراز گوتی: "یەکەمین ماسی بدەنە خاڵ وەلی نیشانچی. گەورەترین مەرجانی بۆ جیابکەنەوە".

دەنگی نیشانچی لەنێو دەوەنەکانەوە هات: "خاڵە وەلی نیشانچی قوربانی ئەو زمانە جوانەت بێت. خاتوونەکان ماسیێکی گەورەو جوانم بۆ بێنن. نانێکی نەرمیشی لەگەڵ بێت. با لەو ماسیە مەرجانە سوورانەبێت. لەو مەرجانانەی کە لەدەریای سوور راوکراون".

"ئەوانەی کە نەیاندەتوانی بێنە دەرەوە، ژنەکان و کچەکان ماسیان بۆ بردن، یەکەمین ماسیە بۆ میوانەکانە. ئەوان زۆریان برسیەتی چەشتووە. ماسیەکی زۆریش هەیە مەگەر نا مەلەك خانم؟"

"ماسی زۆرە، ئەوەندە کە ئەگەر خەڵکی گوندێکی گەورە بیانخۆن و بەئەسپ و سەگەکانیشیان بدەین هێشتا تەواو نابن".

خۆر هێشتا ئاوانەبووبوو کە هەموو ماسیەکانیشیان خواردو تەواویانکردن، وەلی نیشانچیش ماسیە مەرجانەکەی خۆی خواردبووو رۆیشتبوو بخەوێت. لەخەویدا ئەو ماسیە دەست پێڕانەگەیشتووانەی دەبینین، کە لەبنی ئاوی دەریاوە کە خۆر لێیدەدا، بەهەزاران دەنگەوە دەدرەوشانەوەو لەملا بۆ ئەولا، دەڕۆیشتن و کە رووبەڕووی بەربەستێك دەبوونەوە وەك بروسکەو با لەبەرچاوان ون دەبوون.

چوونەوە ماڵەکانیان، وەلی نیشانچی لەوێ، پشتی بەقاپۆری دارچنارەکەوە دابووو خەوی لێکەوتبوو. هیچکەس دڵی نەدەهات لەخەوی هەستێنێت. کارێکی باشیان کرد. خوا دەزانێت چەندە خەونی خۆش، رەنگاورەنگ و درەخشانی دەبینی.

پویراز موسا، خەمگین بوو. ئەو مرۆڤە لەت و پارو رووت و برسیانە دڵی ئەویان سەخت خستبووە ئازارەوە، سەدان سەربازی بەسەهۆڵبووو وشکهەڵاتووی لەچیاکانی ئەللاهو ئەکبەر بینبوو، کە روخساریان ئاوسابووو چاوەکانیان لەقوڵتی چاویان دەرپەڕیبوو. کۆمەڵکوژیی ئێزدیەکان و مەمکی بڕاوی لەو گۆڕەکەوتووی کچان و دیمەنی ترسناکی دیکەش بەئەندازەی برسیبوونی ئەم مرۆڤانە نیگەرانیان نەکردبوو. لەلایەکەوە دڵی پڕبووبوو لەئازارو زۆر نیگەران دەبوو، لەلایەکی دیکەشەوە چاوە پڕ لەسۆزەکانی بەئەندازەیەك لەخۆشیان تژی دەبوون، دەیویست گشت مرۆڤەکان بگرێتە باوەش.

لەنێو جێدا ئەم تەنیشت و ئەو تەنیشتی کرد، لەدڵی خۆیدا گوتی ئێستا تا بەیانی خوا گەورەیەو خەوی لێکەوت.

پویراز کە بەیانی زوو لەخەو هەستابوو، لێنای بەدوای ڤاسیلیدا نارد.

"پێیبڵێ با زووبێت، پاشان ریشمان دەتاشین".

ڤاسیلی زۆر زوو هات:

"چیبوو؟ دەڵێی حاڵت هیچ باش نیە".

"باشم بەڵام زۆر نیگەرانم".

"بۆچی نیگەران بوویت؟ دوێنی خۆ فرە شادو کەیفخۆش بوویت".

"سەیرێکی حاڵو وەزعی ئەمانە بکە. ئێستا کەمو زۆر رەوشی هەموو خەڵکی ئەنەدۆڵ ئاوایە. ئاوایە؟"

"ئەگەر هەمووشیان لەو رەوشەدا نەبن، سەرانسەری دەریای رەش لەهەمان ئەو رەوشە دایە. ئێمە خزمو کەسمان لەوێ هەبوون. هیچ هەواڵێکیان نازانم".

خوایە لەهیچ شوێنێکی دونیا کەس بەم حاڵو رەوشەی ئەمانە نەبێت".

"زۆری وەکو ئەمانەم بەچاوانی خۆم بینین، بەڵام رەوشی ئەمانە زۆر کاریان تێکردووم".

"جەنگ. ئەویش خۆ تەواو بوو".

"بەر لەجەنگیش هەر وەهابوو".

"دوای جەنگیش هەروا دەمێنێتەوە".

"ئینشاللا وا نامێنێتەوە".

بەرەو لای دۆڵی دارزەیتوونەکان رۆیشتن.

"ئەمانە حاڵو رەوشیان هیچی بەسەر هیچەوە نەماوە، یەکەم دەبێت جلوبەرگیان بۆ دابین بکەین. هەموویان رووتو رەجاڵن. چ کارێکیان بۆ بکەین؟"

ڤاسیلی گوتی: "چ کارێکیان بۆ بکەین؟"

لەژێر دارزەیتوونێکدا دانیشتن، ماوەیەکی درێژ قسەیانکرد.

ڤاسیلی گوتی: "ئەمرۆ رۆژێکی گەرم دەبێت. بێچارەینە، لانیکەم بڕۆن لەژێر دارچنارەکان دانیشن. لەناو ئەو ژوورە لەگەرمان دەبرژێن".

پویراز گوتی: "وای، وای، بیرم لەوە هەرنەکردبووەوە، لەگەرمان دەمرن، منداڵی کوێستانو دەریای رەشیش بن".

"لەناو ئەو منداڵانەی کوێستان، خاڵە وەلی نیشانچی چۆنە بۆتە ماسیگر". "ئێستا سەبرت هەبێت، مەسەلەکە کەمێك ناڕۆشنە، بەزوویی ناسنامەی وەلی نیشانچی دەزانین، بەبڕوای من ئەو پیاوە دەریای ئێمەش وەکو لەپی دەستی خۆی شارەزایە".

"منیش لەگەڵتدا هاوڕام. ئەگەرنا چۆن هەر کە قولابی هەڵدایە نێو ئاو لەیەك چاوقوچاندندا.. مەگەر لەسەر رووی دەریا نووسرابوو مەرجانەکان لەکوێن..".

"لەچاوقوچانێکدا.. ماسیەکان دەتگوت خێرا رادەکەن تا لەژێر قولابەکەیدا ریز ببەستن بۆ ئەوەی پێوەببن".

"هەوا ئەمڕۆ گەرم دەبێت. چیرچیرۆکەکان هەر لەئێستاوە دەستیان پێکردووە".

"بابڕۆین لەمەلەك خانم بپرسین بزانین دەتوانێت بۆ ژنەکان کراس بدرویت، بلێین ئەگەر چەرخێکی درومان بکڕین دەتوانێت کاری پێبکات".

"بابچین بپرسین".

چوون لەدەرگای ماڵی مەلەك خانمیان دا.

مەلەك خانم گوتی: "کێیە؟"

"ئێمەین مەلەك خانم، منو ڤاسیلی".

"ئێوە بڕۆنە ژێر دارچنارەکان، من هەرئێستا دێمە ئەوێ".

بە قاوەجۆشو فنجانەکانیەوە هات.

بێئەوەی قسەیەك بکات ئاگری کردەوە، ئاوو شەکرو قاوەی رشتە نێو قاوەجۆشەکەو داینایە سەر ئاگرەکە. بۆنی خۆشی قاوە ئەو ناوەی داگرت. کونە لووتی هەردووکیان وەکو تفنکی ماینان بەلەرەلەر کرانەوە. سەریشیان تەواو وەکو ئەسپان بۆ سەرەوە بەرزبووەوە.

کەمێك دواتر فنجانی سەر بەکەفیان داندرایەپێش. مەلەك خانمیش فنجانێکی سەربەکەف بەدەستەوە، هات لەتەکیان دانیشت. پویراز نیگایەکی وردی لەمەلەك خانم کرد. خانم ئەمڕۆ جوانتر دەینواندو لانی زۆر هەر سی چل ساڵ دەهاتە بەرچاو.

پویراز بەدرێژی باسەکەی بۆ مەلەك خانم روونکردەوە. چاوەکانی مەلەك خانم سەرەتا تەڕبوون، پاشان ئاوا ماوەیەك گریا. دواتریش خرۆشا.

"هەم دامەن، هەم کراسو هەم شەلوار دەدروم، هەرچی هەبێت، کارکردن بەچەرخی درومانیش دەزانم، تەنها ناتوانم چاکەت بدروم. چونکە ئێمە چاکەتو ئێلەگمان لەدەرەوە دەکڕین".

کەمێك دواتر قەدریی بەلەموانیش هات. شتەکەی بۆ ئەویش روونکردەوە.

بەلەموان گوتی: "ئووهووو، دایکم وەکو ئیدریس پێغەمبەر، پیری دروزیەکان، بەدەم ئەللا ئەللا دەدرویت".

"یاللا با ریشمان بتاشینو چێشتی بەیانیمان بخۆین، تا ئێمە ریشمان دەتاشین مەلەك خانم چێشتی بەیانیمان بۆ ئامادە دەکات".

"زوو ئامادەی دەکەم، ئێوە بەدوای کاری خێردا دەڕۆن. خودا پشتو پەناتان بێت".

کاتێکیش کە خەریك بوون دەڕۆیشتن، لەدوایانەوە گوتی: "دەزانن چەند قوماشی پێویستە بۆ دامەنو کراس؟"

"نازانین".

"من دەزانم. یاللاّ برۆن، گەڕانەوە پێتاندەڵێم بنووسن کە دەبێت چی بکرِن". سوپاس خانم، خوا لەم دونیایەو لەو دونیا چاکەت بۆ بێنێت".

مەلەك خانم، تا ئەوان گەڕانەوە چای ئامادەکردبووو سفرەی راخستبوو. هەرسێکیان جوانو خاوێن ریشیان تاشیبووو جلوبەرگی باشیان کردبووە بەر. مەدالیا زێڕەکەی پویراز بەقەیتانە سوورەکەی سەرسنگی دەهەژایەوەو چەکمە ئاوەزێنەدارەکانی دەبریقانەوە.

مەلەك خانم پویرازی دانیشاندو پێیگوت: "بنووسە بزانم".

هەموو ئەو شتانەی نووسین کە پێویستبوون بۆ ئەوانەی رووت بوونو لەشەرمان نەیاندەتوانی لەژوورەکان بێنە دەرەوە، ئەوەی کە چەند کەس، چەند کەسیان پیاون، چەندیان ژنن، چەند کچو چەندیشیان کوڕن، چەند منداڵیان هەن، بۆ شەلوار، کراسو ژێرپۆشەکان چەند مەتر قوماش پێویستەو چ رەنگێك بێت.

"لەگەڵ چەرخی درومانەکە دەبێت بەکرەی سوور، شین، زەرد، سپی، سەوزو رەشیش بکرِی. دەرزیو سامتنیش داوی سووریش دەبێت زۆربێت".

مەلەك خانم تا سەر ئەسکەلە لەگەڵیان چووو بەرِێی کردن. زۆر خۆشحاڵ بوو. تا دوورکەوتنەوە هەر دەستی بۆ رادەوەشاندنو بەدرەقەی کردن. ئینجا رایکرد بۆ ماڵی میوانەکان. ئەوان هەر لەگەڵ بینینی مەلەك خانم خۆیان لەژێر مەلافەو لێفەکان شاردەوە.

"مژدەم پێیە بۆتان، دۆستانمان چوونە شارۆچکە، برِیارە قوماش بکرِن، چەرخی درومانیش دێنن. من جلکتان بۆ دەدروم. لەئێوە کەس درومانان دەزانێت؟"

پیرەژنێك گوتی: "هەموومان دەزانین، بەلاّم خەدیجە لەهەمووان شارەزاترە، ئەو کچی شارۆچکە بوو، لەوێوە بووە بووکی ئێمە.

"سەلامەت بن".

مەلەك خانم هەر کاتێك ئەوانی دەبینی، نیگەران دەبووو دڵی دەگوشرا. گوتی: "گەورەترین ستەمی خواوەند بەرامبەر ئادەمیزاد نەداریە. خودایە رەگو ریشەی ببرِێتەوە. خوا دوژمنیش گرفتاری ئەو دەردە نەکات".

نیوەڕۆ کەمێکی لادابوو کە گەیشتنە شارۆچکەکە، یەکەمجار چوونە لای سەرتاش، کابرای سەرتاش بەدەست لەسەرسنگەوە پێشوازی لێکردن. پویراز پرسیاری باشترین پارچەفرۆشی لێکرد، هەروەها ئەوەشی لێپرسی داخۆ لێرە شوێنێك هەیە چەرخی درومان بفرۆشێت...

ئینجەلیك ئوغور بەربەری نوری، ناونیشانی دوو دووكانی پێگوت. قـەدریی بەلـەموان گوتی: "تێیگەیشتم، پێدەزانم".

سەرتاش گوتی: "ئەو رووتو رەجاڵانە رژاونەتە هەموو شوێنێك، بەجلوبەرگو كنجی دڕاوو پـارە پـارەو هـەر ئێسـكو پێسـت، رۆژانـە مێگـەل مێگـەل دێـن بێـرەدا رەت دەبـن. لـەكوێوە دێـنو بـۆ كـوێ دەچـن. خـوا دەزانێـت. نـەخۆشو مردووكانیشـیان بەسـەر كۆڵیانەوەنو لەگەڵ خۆیان دەیانبەن.

ئێژن ئەوانە ئەو خەڵكەن كە سەربازانی یۆنانی گونـدەكانیانی سووتاندوون. چـوزانم گوتم لەگـەڵ یـەك دوو كەسـێكیان كـە بـەرێگادا دەڕۆن قسـە بكـەم، قسـان ناكـەن، دەمیـان لێكناكەنەوە. زوێرن. خۆشیان نازانن لەكوێوە دێنو بۆ كوێ دەچن".

پویراز گوتی: "وای، وای".

سـەرتاش گـوتی: "وای بۆچـی؟" پاشـان گـوتی "نـەوەكانی نیشـتمانو ئـاڵا خۆشەویستەكەمانن". لەكاتێكدا چاوی بڕیبووە مـەدالیای سەرسنگی پـویراز گـوتی: "وای، واای، هاوڵاتیـانی قارەمـان، مـەزن، بـەرز، ئێـوە لەتۆرەمـەی گورگـە بۆرەكـان نـین كـە لەئاڵتاییەكان هاتوونەتەخوارێ. ئێوە.. ئێوە".

"سوپاس برا، ئێمە دەڕۆین، سوپاس".

سەرتاش ناڕەحەت بوو، بەڵام بەسـەرخۆی نـەهێنا. لەدوایانـەوە چـەند جـار "وای، وای"ی بەبـەرزی گـوت. دەیویسـت درێـژە بـە(وای وای) ەكـانی بـدات، بـەڵام نـەكرا. لەمسـەر تـا ئەوسەری بازاڕ گەڕان، چوونە دوایین دووكان، دووكانێكی گەورە بـوو، هەرچیەكی پێویست بوو لەو دووكانەدا دەست دەكەوت. پیاوێكی ریش چەرمووو رووخۆش پێشوازی لێكردن.

"فەرموون، خۆشهاتن".

"دەمانەوێت كەمێك شتومت بكڕین. قومـاش بـۆ دامـەن. ژێركـراسو كـراس بێگومـان پێڵاویشتان هەن".

پیرەمێردەكە گوتی: "زۆر، لەهەر جۆرێكی. ئەو شتانەی كە لەئزمیریش پەیدا نابن".

سەر رەفەكانی لای راستو چەپی دووكانە گەورەكە پڕبـوون لەپارچـەی رەنگاورەنگ. پارچـەكانو پێڵاوەكـان هـەر لەسـەر رەفـەكان دانەنـدرابوون، بـەڵكو تۆپـە قوماشـەكان تـا بـەردەم مێـزو تـا بەردەرگـەی دووكـان داندرابوونـە سـەریەك. پیرەمێـرد، تۆپـە قوماشـە كوڵكنو چاپكراوەكانی هەڵدەگرتنو دایدەنانە سەر مێزەكە. هەروەك پیرەمێـرد ئەوانـەی لەسەر رەفەكان دێنایەخوار، پویرازیش سەیری ئەو كاغەزەی دەكرد كە بەدەستیەوە بوو.

سەرمێزەکە پڕبوو، پیرەمێرد هەناسەیەکی هەڵکێشایەوە. پویراز ئەوکاتەی پیرەمێردەکە خەریکبوو هەناسەی تازە دەکردەوە، بۆلای پارچەیەکی کولکن کە گوڵی شینباوی هەبوون خۆی درێژکردو پرسی: "ئەمە چەند مەترە؟" پیرەمێرد وەڵامی دایەوە.

"ئەمە هەر ئاوا دەکرم. بالێرەبێت".

پیرەمێرد تۆپە قوماشە کولکنەکەی لەسەر گونیەکی پڕی تەنیشتی دانا. پاشان پویراز تۆپە قوماشەکانی یەك یەك نیشانی پیرەمێرد دان، لەو قوماشانە بۆ دامەن، لەوە نیو تۆپ، لەوەی دی دە مەترو بەکورتی لەماوەیەکی کورتدا پارچەی تایبەت بەژنان‌و منداڵانی هەڵبژارد.

"بۆ شەلوار".

"هەموویان رەش بن؟"

"رەش بن".

"بۆ چەند کەس؟"

"دەتەوێت ئەم تۆپە دابنێم. هەمیشە پێویستتان دەبێت".

پویراز هەڵیبژارد، پیرەمێرد تۆپە قوماشەکانی یەك یەك لەسەر رەفەکان هەڵدەگرتن‌و دەیبرین.

ڤاسیلی‌و بەلەموان لەسەر گونیەکان دانیشتبوون‌و بەکونجکۆڵیەوە سەیری ئەوانیان دەکرد.

دووکاندار ئەو پارچەو تۆپە قوماشانەی کە بڕیبوونی لەچەند مەترە قوماشی کۆنەی وەرێنان‌و گوتی: "فەرموون بەڕێز، ناوی بەڕێزیشتان ئەگەر بفەرموون".

"پویراز".

"کاك پویراز، هەزار ساڵ بەم ناوەتەوە تەمەن بکەیت. تۆ هیچ مامەڵەت نەکرد. زۆر گەنجی، بەڵام ئاشکرایە پیاوێکی زۆر بەئەزموونی، منیش چاوێك لەو فاتۆرەی نرخەکان دەکەم‌و هەرچی لەدەستم بێت بۆت دایدەشکێنم، ئاشکرایە کە مەبەستت نیە دووکان بکەیتەوە".

پویراز پێکەنی: "نە".

دووکاندار دەفتەرێکی بەرگ پێستی لەچەکمەجەکە دەرهێنا، سەیری کرد هەندێك شتی لەسەر کاغەزێك نووسین. یەك دوو دەفتەری دیکەشی دەرهێنان، دووبارە هەندێك شتی نووسین.

"دەزانم ئەمانەت بۆ کێ کڕین لاوۆ، هەمیشە ئاوا پایەبەرزو سەرفراز بیت. خوا تەمەن درێژت بکات".

ئەو کاغەزەی کە ژمارەکانی لەسەر نووسیبوون داینایە بەردەم ئەو. پویراز سەیریکرد، لەخۆشیان پێکەنیو گوتی: "سوپاست دەکەم بەڕێز". ئەو پارە زیوانەی کە لەکیسە سەوزەکەیەوە دەریهێنان، ژماردنیو دایانە سەر مێزەکە.

"با قاوەتان بۆ بێنم".

"پەلەمانە، باشتر وایە پێڵاوەکانیش دیاری بکەین... پێڵاوێکمان بۆ ماسیگرتن دەوێت. بۆ ماسیگرێکی پیر".

پیرەمێرد دەستی گرتو بردیە بەشی دواوەی دووکانەکە: "لێرە هەڵبژێرە، کامەیانت دەوێت".

"کوڕەکان، وەرنە ئێرە".

ڤاسیلیو بەلەموان یەکسەر هاتن.

"لەم پێڵاوانە یەکێکیان بۆ وەلی نیشانچی هەڵبژێرن".

"ئێمە چۆن بزانین ژمارەی پێی نیشانچی چەندە".

"ئێوە هەڵبژێرن، من دەزانم".

دوای ئەوەی ماوەیەك ئاوا لەنێو پێڵاوەکان گەڕان، جووتێك چەکمەیان دۆزیەوە کە ساقەکەی کورتو پێستێکی ئەستووری ئەوەندەی پەنجەیەك ئەستووری هەبوو.

ڤاسیلی گوتی: "ئەوەتا، ئەمە چەکمەی ماسیگرەکانە، ئەرێ، ئەمە، زۆر گرانە".

پویراز چەکمەکەی هەلگرتو دایناییە سەر مێزەکە، پاشان بەخۆشیەوە گوتی: "دۆزیمەوە. دروست بەپێی نیشانچی دەکات".

دووکاندار کە چاوەکانی تەڕبووبوونو دەستەکانی دەلەرزین. چەکمەکانی هەلگرت:

"فەرموو کوڕم پویراز، پارەی ئەمانە وەرناگرم، بۆ هاوڕێیەکەتیان ببە".

ماتو سەرسام بوون. پویراز نەیدەتوانی دەستەکانی درێژ بکاتو چەکمەکان وەربگرێت.

"برا، برا، ئەمانەش من دەیاندەم بەتۆ. خۆ نابێت هەر تۆ هەمووی بدەیتە ئێمە".

"سوپاس مامەگیان".

دەستەکانی بردنە پێشو چەکمەکانی هەلگرتنو دایناییە سەر پارچەکان.

"ئێستا ڕێگەبدەن با قاوەتان بۆ بێنم، کوڕەکان".

ڤاسیلی گوتی: "من تۆم ناسیەوە. بەتۆ دەڵێن خەیری ئەفەندی".

"کوڕەکانیشم دەناسیت؟"

ڤاسیلی سەری نەوی کرد: "دەیانناسم".

"لەکوێ دەیانناسیت؟"

"منیش لەشەڕی چاناك قەڵا بووم".

ئیدی هیچ قسەیەکیان نەکرد، ئاوا کپو بێدەنگ مانەوە.

پویراز هەموو شتێك تێگەیشتبووو زۆر نیگەران بوو، قەدریی بەلەموانیش لەهەموو ڕووداوەکان ئاگادار بوو.

قاوەیان هێناو هەر زوو خواردیانەوەو لەدووکانەکە چوونەدەر. پیرەمێرد لەدوایانەوە گوتی: "کوڕەکانم سەرمان لێبدەن، ئەگەر پێویستتان بەهەر شتێك هەبوو بەچاوان بۆتانی ئەنجام دەدەم".

هەر کەمێك دوورکەوتنەوە ڤاسیلی گوتی: "هەردوو کوڕەکانی خەیری ئەفەندی لەچاناك قەڵا کوژران". ئاهێکی هەڵکێشا: "دوو کوڕە گەنجی بەژن وەك شاخەی شمشاڵ، هەردووکیان ئەفسەری یەدەك بوون".

"وای خولخولەو داوەکانمان لەبیرکرد، دۆخین بۆ شەلوارەکانیش پێویستە، دەبێت دۆخینی شەلواریش بکڕین".

"با بگەڕێینەوە".

"ناتوانین بچینەوە لای خەیری ئەفەندی، پارە وەرناگرێت".

ڤاسیلی گوتی: "دووکانێکی دی کەمێك لەولاتر هەیە".

لەبەردەم دووکانەکە بوون، چوونە ژوورێ، ئەو شتانەی کە پێویستیان بوون کڕیانن "زووبن کوڕینە، بجووڵێن. بەرلەوەی کەسێك بمانبینێت دەبێت خۆمان بگەیەنینەوە بەلەمەکە".

قەدریی بەلەموان لەژێر ئەو **گونیەی** کە تازارکی پڕ شمەك بوو دوولا بووبووەوە:

"هەندێك شتی دیکەش بکڕین؟"

"بوەستە سەرۆك بەقوربانت بم. لێبگەڕێ با بگەینەوە بەلەم، پاشان هەرچی بتانەوێت دەگەڕێمەوەو دەیکڕم".

"بۆ ئێلەگەکان دوگمەمان کڕیون یان نا؟"

خەیری ئەفەندی دووگمەشی دانان. من بەچاوەکانی خۆم بینیم".

گێلینە چەرخی درومانمان لەبیرچوو. ئێوە لەنێو بەلەمەکە دانیشن من دەچم لەخەیری ئەفەندی وەریدەگرمو دێمەوە".

پویراز خێرا گەڕایەوەو چووەوە لای خەیری ئەفەندیو پێیگوت چەرخی درومانەکەمان لەبیرکردووە.

"چەرخێکی درومانی زۆر باشم هەیە کە کاری کردووە، زۆر هەرزانم کڕیوە، بەهەمان ئەو نرخەی کڕیومە بۆتانی دادەنێم".

دەرگای تەنیشتی کردەوە، چووە ژووریٚ، بەچەرخێکی درومانی پاكو خاوێن گەڕایەوە، چەرخی دانایە سەرمێزەکە، سەرەکەی هەلگرت، خستیە کار.

"دەرزیشتان هەن؟ زۆر دەرزیمان دەوێن، لەدوورگە خۆت دەزانی دەرزی دەست ناکەوێت".

خەیری ئەفەندی چەکمەجەی خوارەوەی راکێشاو سیٚ قوتوو دەرزی دەرهێنانو دانیە پویراز.

"پارەکەی وەرناگرم".

"سوپاست دەکەم خەیری ئەفەندی".

خەیری ئەفەندی نرخی چەرخە درومانیەکەی پێگوت.

"بەهەڵە نەچیت خەیری ئەفەندی، ئەو پارەیەی تۆ دەیڵێیت هی سیٚ پیاڵەیە، جگە لەوە چەرخەکە نویٚ نوێیە".

"من چیبکەم، فرشیارەکەی بەوەندە پێیفرۆشتم. نویٚ نوێیە. منیش دەمویست بیبەمەوە ماڵەوە. بووە قسمەتی ئێوە".

پویراز پارەکەی دانایە سەرمێز. خەیری ئەفەندی بەشێوەیەك سەیری دەکرد دەتگوت دەیەوێت شتێکی سەیری لێبپرسێت.

"کوڕم تۆ لەکویٚ، لەکام بەرەی شەڕ بوویت؟"

پویراز ئاسوودە بوو، تێگەیشت بۆچی ئاوا خەمگینانەو سەیر تەماشای.

خەیری ئەفەندی ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا. مووەکانی پویراز راست بوونەوە. ئەگەر پێشی بەخۆی نەگرتبا، هەر لەجێی خۆی دادەنیشتو بۆ حاڵی ئەو هەزاران مرۆڤەی بووبوونە سەهۆڵ هۆڕ هۆڕ دەیدایە پرمەی گریان. بۆ ئەوانەی لەبەر ئەسپیٚو برسیەتی

مردبوون، بۆ حاڵی ملیۆنان کەس کە لەخانەو کاشانەی خۆیان ئاوارە بووبوون. هەروەها بۆ حاڵی وەلی نیشانچیو ئەوانەی لەبەر رووتیو بێبەرگی، رۆژانێکی زۆر نەیانتوانیوە لەماڵ بێنەدەرو بووبوونە ئێسكو پێست.

چەرخی درومانەکەی گرتە ئامێز. لەکاتێکدا بەملاو بەولادا رادەهەژا، چووەدەر. چاوەکانی رەشکەو پێشکەیان دەکرد. چیا بەبەفرو مرۆڤە بەسەهۆڵبووە ریزبەستووەکان، مردووە وشکهەڵگەڕاوەکان بەچاوانی دەرپەڕیویانەوە، ئەو پەپوولە شینباوە تامەزرۆیانەی کە هەر یەکێکیان بەقەد باڵندەیەك دەبوونو وەکو گەواڵەی هەور لەسەر پەڕەی گوڵان هەڵدەنیشتنو هەڵدەفڕین.

سواری بەلەمەکە بوون، چەرخی درومانەکەی دایە قەدرییو خۆی لەوێ لەسەر کورسیەکە پان کردەوە...

ڤاسیلی بەنیگەرانیەوە پرسی: "چیتە؟" بەلەموان کە چەرخەکەی دانابووە نێو کابینەی بەلەمەکە بۆلای ئەوان هات، روخساری پویراز تەواو سپی هەڵگەڕابوو، ترسا.

"چیبووە؟"

پویراز ئارام خۆی کۆدەکردەوەو خوێن بۆ دەمو چاوی دەگەڕایەوە. "خەیری ئەفەندی لێیپرسیم لەکوێ سەرباز بووم، پێمگوت. ئاخێکی وای هەڵکێشایەوە وامزانی دڵی لەسنگی هەڵقەنا، دڵی منیش لەجێی خۆی داتەپی. هەر ئەوەیە".

رووی کردە ڤاسیلی: "خەیری ئەفەندی منداڵی دیکەشی هەبوون؟"

"نازانم، پێموانیە".

پویراز کە رووی لەدەریا بوو سیمای کرایەوە، تەنانەت بزەش کەوتە سەر لێوانی:

"یاڵلا بابڕۆین کوڕینە. تا نیوەشەو دەگەینەوە دوورگە، مەگەر نە؟"

"چیدەڵێیت سەرۆك، زۆری ماوە بۆ شەو". سەیری خۆری کرد.

"زۆر، بەلەمەکەی ئێمەش فرە باشە، ئەو ناوە دەبوژێنێتەوە".

پویراز سەیرێکی بەلەموانی کردو پێکەنی. بەلەموان لەژێر ئەو نیگایەدا تلایەوە. "ئەزانم بەلەموان، ئێرەت بوژاندۆتەوە".

بەلەموان، لەشەرمان بووە قەترەیەك ئاوو رۆچووە عەردەوە. "مەبەستم ئەوە نەبوو، دەمویست بڵێم خێرایی ماتۆڕەکەی زۆر زۆرە. ئیدی.. داوای لێبوردن دەکەم سەرۆك. خەیری ئەفەندی پیاوێکی فرە باشە.

بەیانی ئەگەر چوومە شارۆچکەکە پرسیارت بۆ دەکەم داخۆ مندالّی هەیە یان نا".

"سوپاس بەلەموان". پێدەکەنی "کەوایە گازی دەیێ".

بەلـەم بـەخێرایی دەچـووە پـێش. پـویراز، پێڵاوەکـانی نیشانچـی هـەلگرتنو بـەوردی سەیری کردن. ڤاسـیلی هـاتو لەتـەکی دانیشـت. گـوتی: "چـەکمەی زۆر جوانـت کـڕین بـۆ وەستا نیشانچیمان".

"بەڕاستی چەکمەی جوانن؟"

چەکمەکانی بەرزکردنـەوە. کـەمێکی دوور خسـتنەوە. سـەیری کـردن. ڤاسـیلی گـوتی: "بەڕاستی جوانن".

قـەدریی بەلـەموان بـۆ ئـەوەی کـە تـا زووە بگەنـەوە دوورگـە، واپێـی لـەگاز دەنـا کـە ماتۆڕەکە بەتوندی دەلەرزی.

پویراز نیگەران بوو، بیریکردەوە رەفتاری لەگەلّ ئەودا باش نەبوو، بێچارەیە لـەوەی کـە ماتۆڕی بەکارهاتووی لەوەستاکەی خۆی وەرگرتووە. دلّتەنگە ئێستا ئەگەر پێیبلّێم گازەکـەی کـەم کـەوە ماتۆڕەکـە خەریکـە داغـان دەبێـت، رەنگـە دلگـیر ببێـت. نیـوە شـەو نـەبووبوو گەیشتنەوە دوورگە. لێنا، مەلەك خانمو هوسمەن لەسەر ئەسکەلە چاوەڕێیان بوون.

ڤاسیلی یەکێك لەگونیە پڕەکانی هەلگرتو ئەوەکەی دیکـە بەلـەموانو چـەکمەکانیش پویراز. بردیانەوە مالّێ. نانی ئێوارەیان لەنێو بەلەمەکـە خواردبـوو. لـەرێگادا هـیچ یـەك قسەیەکی نەکردبوو، پویراز بیری لـەدایكو بـاوكو گونـدە ونبووەکـەی خۆیـانو هـەروەها نیشانچی کردبووەوە. کێ بـوو، ئـەو پیـاوە رازدارە چ ئەسـلّو نەسـەبێکی هەیـە. تـا زیـاتر بیری لەو دەکردەوە، دلّی زیاتر رۆشن دەبووەو ئومێـدی زیـاتر، بەچەشـنێك کـە تـا ئێسـتا وەها ئومێدێکی هەست پێنەکردبوو، میهرەبانییێکی گەرم، کە ئەوی گرتبووە بـاوەش. وەلێ نیشانچی سەیری هەر لایەکی دەکرد تووشی سەرسوڕمانو حەپەسـان دەبـوو. ئایـا هەلّـەی دەکرد، یانی دەکرێت لەماوەی چەند رۆژێك مرۆڤێك بناسیت؟ ئەو پیاوەی کـە بینیبـووی پیاوێـك بـوو لەبـەرگی هـەزار کەسـێتیدا. نیشانچـی کـام یـەك لـەو کەسـێتیانە بـوو؟ خـوا دەزانێت تا زیاتر ئاشنایەتیان زیاتر بێت چ شتگەلێك لەو دەبینێت؟ چ کەسـێك دەتوانێـت لەسەرەتای ئاشنایەتیدا تا ئەو رادەیە خۆی بشارێتەوە. لەبارەی ئەوەوە بیری لـەزۆر شـتی دی دەکـردەوە. چـیدەگوت، پـیری تورکمـەن لـەبیابانی عارەبسـتاندا نـۆ سـالّان سـەربازی کردبووو لەم دونیایەدا مرۆڤی لەهـەموو بوونـەوەرەکانی دی زیـاتر دەناسـی. گـەورەترین

کونجۆڵیی مرۆڤ بەدواداگەڕان، دۆزینـەوەو ناسـینی مرۆڤەکانـە. مـرۆڤ بەوپـەڕی شـەوق‌و زەوقەوە بۆ دەرککردنی مرۆڤەکانی دی هەوڵ دەدات، هەمیشەش سەری بەتونـدی لەبـەرد دەدات، لەبەردی بەردەستێ. تا بەیانی چاوی نەچووە خەو، زۆر دڵنیگەران بوو.

بەیانی زوو هەستا، چووە ژێر چنارەکان، لێنـا کترێـەك ئـاوی بـۆ گـەرم کردبـوو، دەم‌و چاوی کەفاوی کردن. جویزانی ریش تاشینەکەی تیژکردەوەو ریشی جوان‌و خاوێن تاشی، پاشان بەسـەر وردە بەردەکانـدا تـا ئـەو دەمـەی کـە یەکـەم گزنگـەکانی خـۆر دەرکـەوتن‌و لەدەریایان دا، بەرەو لای باکوور رۆیشت. نەیدەویست بگەڕێتەوە. ئەگەر نیشانچی لەسـەر رێی دەرکەوێت! هـەم زۆری پێخۆشـبوو ببیبینێـت‌و هـەم زۆریـش لـەبینینی ئـەو دەترسـا. ئـەمڕۆ جلوبەرگـە شـینەکەی نەپۆشـیبوو، مەدالیاکـەی لەبـەرۆکی نـەدابوو، چـەکمە ئاوەزێنـەدارە بریقـەدارەکانی نەکردبوونـە پـێ، شـەرمی کردبـوو. جگـە لـەوە، لـەوەی نیشانچی بەبینینی ئەو چ بیرکردنەوەیەکی دەبێت، دەترسا.

بەخێرایی بەرەو لای چنارەکان گەڕایەوە. ڤاسیلیش ریشـی خـۆی تاشـیبووو چاوەڕێی ئەوی دەکرد.

"ڤاسیلی زووبە بڕۆ بانگی مەلەك خانم بکە، گونیەکانیش هەلگرەو بیانهێنە با دایکـە لێناش بێت. هوسمەنیش بابێت". ویستی بلێت با نیشانچیش بێت. نـەیتوانی. تفـی دەمـی قووت دایەوە. ڤاسیلی تێگەیشت. "دەبێت بانگی وەلی نیشانچیش بکەم. مەگەر نە؟"

کەمێك دواتر ڤاسیلی بەگونیـەك بەکۆڵـەوە، مەلـەك خـانم، قـەدریی بەلـەموان، لێنـاو دوای هەمووانیش نیشانچی بەحاڵەتێکی وێکهاتووەوە کە سـەیری هـیچ لایـەکی نـەدەکرد. هـەروەها هوسمـەن بالاّبـەرز وەکـو شـتڵە نـەمام‌و بـەدوای ئەویشـدا ژنەکـەی دەرکـەوتن، ڤاسیلی گونیەکەی دانایە عەرز.

"قەدریی بەلەموان، گونیەکە لەسەر تەختەکان روو بکە".

بەلەموان زارکی گونیەکەی کردەوەو تۆپە قوماشەکانی، قوماشـە کوڵکنـەکان، قوماشـە رەنگاورەنگـە تایبەتـەکانی شـەلوار، بـەکرەو داوەکـانی رووکردنـە سـەر تەختـەکان. چـەکمەکانی نیشانچـیش لـەپێش هـەموو شمەکـەکانی دی دانـان. لـەبنی گونیەکـەش بوخچەیەکی گەورەی خامی چندراو هاتەدەر.

پویراز بەوروژانـەوە پرسـی: "ئەمـە چیە؟ ئـەم بوخچـەیە لـەکوێ هاتـەدەر؟" ڤاسـیلی خـەریکبوو پێدەکـەنی، خـۆی درێـژکردو زارکـی بوخچـەی لەسـەر تەختەکـە کـردەوە،

**لەناویدا نوقلێکی سەوزباوی هەڵگرت، گوتی: "ئەمانەش هی منداڵەکان، خوا دەزانێت ئەم منداڵانە چەند دەبێت نوقڵیان تام نەکردووە".**

**پویراز گوتی: "رەنگبێت لەتەمەنیاندا هەر تامیان نەکردبێت، باپیرە گەورەی هەموویان لەبیابانی یەمەنو قەفقازو باڵکان مانەوەو پلێتی ملو نیشانەیەکیشیان نەهاتەوە".**

**ئاوا کە خەریکبوو قسەی دەکرد لەژێرەوە چاوێکی دەدایە نیشانچی. روخساری نیشانچی وەك بەردی لێهاتبوو تەکانی نەدەخوارد.**

**"هۆی ڤاسیلی، کوڕە ڤاسیلی، تۆ هیچ گەورە نابیت. هیچ. هەمیشە ئاوا دەمێنیەوە. شتێکی چەند عاقڵانەت کرد، بۆ ئەو نوقڵانە!"**

**ڤاسیلی زەوقی بووبووەوە.**

**"زووبە بڕۆ منداڵەکان بانگ بکە. ئەگەر رووتیش بن بڕۆ گشتیان بێنە".**

**وەلی نیشانچی بەدەربڕینێکی لێبڕاوانەوە گوتی: "بیانهێنە، منداڵەکان بێنە. ئەگەر نەیانویست بێن پێیانبڵێ من بانگیانم کردوون. ئەوان نەیاندەویست بێنە ئێرە، دەیانگوت دوورگەیە. چەندین رۆژ بۆم باسکردنو تاریفی ئێرەم کرد تا توانیم بیانهێنمە ئێرە. ئەگەر نەهاتبان تا ئێستا هەموویان مردبوون.**

**هەر دەیانگوت ئەو دوورگەیە زیندانێکە. ئێستاش هەم خەڵکەکەی ئێرەیان بینیو هەم زیندانەکەش".**

**ئەم وەلی نیشانچیە ئەو وەلی نیشانچیە نەبوو کە وەکو گەڕیدەکان لەم دێ بۆ ئەو دێو لەم کێو بۆ ئەم کێو دەگەڕاو لەگەڵ هەموو کەس دەدوا، لەسەیرکردنی هیچشتێك نەدەپرینگایەوە، ناوەکەی دەبووە مایەی ژێربوونەوەی منداڵانی چاوبەگریان، سەردەمانێك کە رێگاکان نا ئارام دەبوون، قسەی هیچکەس جگە لەقسەی ئەو گوێی پێنەدەدرا. ئەم وەلی نیشانچیە ئەو وەلی نیشانچیە نەبوو کە بووبووە پیری دەریاکان. ئەو کە سواری ئەسپە جوانەکان دەبوو، بەلەمەکانی دەریاکانیان دەبڕی. ئەم وەلی نیشانچیە ئەو وەلی نیشانچیە هەڵۆئاسایەی جاران نەبوو. ئەمە ئیدی ئەو وەلی نیشانچیە نەبوو کە دوای نۆ ساڵ سەربازی بەپای پیادە لەبیابانەکانی یەمەنەوە هاتبووەوە چیاکانی دەریای رەش، پیاوانی ئازای لەدەوری خۆی کۆکردبووەوە، سامانی دەوڵەمەندەکانی بەسەر هەژاراندا دابەشکردبووو کەوتبووە زیندانو دوای مانگێك دیواری زیندانی (سینوپ) ی بڕیبووو هاتبووەدەرو حەوت دەریای بۆ ژیانو مانەوە هەڵبژاردبوو. بەخۆی گوتبوو: بێخەبەر نەبیت وەلی نیشانچی، تۆ گوێز فرۆشێکی بێچارەیت.**

منداڵە رووتو ڕەجاڵەکان هاتنو لەبەردەم پویرازدا ریزیان بەست "ڤاسیلی نوقڵ بدە منداڵەکان!"

"بەدوای یەکدا ریزبن ببینم".

منداڵەکان بەدوای یەکدی ریزبوون. سەریان لەبەرخۆ نابووەوەو دەمو چاویان داکەوتبوو.

"یەکەم. وەرە".

منداڵی یەکەم تا نزیك ڤاسیلی هاتە پێشو راوەستا. نەیدەتوانی سەری هەڵبڕێتو سەیری ڤاسیلی بکات.

ڤاسیلی پێنج دانە نوقڵی رەنگاو رەنگی گەورەی نێودەستی بۆلای منداڵەکە درێژکردن. منداڵەکە نوقڵەکانی وەرگرت. لەشوێنی خۆی نەجووڵا. ڤاسیلی کانیەکەی نیشان دا:

"بڕۆ لەوێ بوەستە!"

منداڵەکە، بەروخسارێکی پەشۆکاوەوە چوو لەڕۆخ کانیەکە راوەستا. منداڵەکان یەك یەك هاتنو نوقڵیان وەرگرتو چوون لەکەنار کانیەکە بەڕیز راوەستان.

"تەواو، نوقڵەکانتان بخۆن، پاشان بەرلەوەی تەواوبن ئاگاداربن نەیانخۆن بۆ ددانەکانتان خراپە".

هەمووان پێکەوە دەستیان کرد بەخواردنی نوقڵەکان. لەگەڵ دەستکردنیان بەخواردن لەخۆشییان هاواریان کرد. سەیری یەکدیان کرد، هەموویان خەریکبوون پێدەکەنین. لەکاتێکدا لەخۆشیان هاواریان دەکرد، باڵیان گرتو بەرەو لای لێواری دەریا فڕینو تا ئەو زنارە رایانکرد کە لەلێوار دەریاکەو لەسەر لمەکان بووو رەگی زەردباوی هەبووو نیوەی لەنێو دەریاکەبوو. لەنێو درزی زنارەکە زەردەواڵە خورماییەکان لانەیان چێکردبوو، تۆپەڵێك زەردەواڵەی تووڕە بەردەوام لەلانەکە دەچوونە ژوورو دەهاتنەوەدەر. لەوێ گەڕانەوە، بەنێو قامیشەڵانەکەدا خولێکیان لێدا، لەوێ لەژێر تاقە دارزەیتوونەکە دانیشتن، لەکاتێکدا باوەڕیان بەهەستی بەختەوەریی خۆیان نەدەکرد، ئارام ئارام نوقڵی نێو دەمیان بەشێوەیەك کە زیاتر چێژی لێوەربگرن دەخواردو دەیانمشت، ئەوەندە ئاوا مانەوە تا نیوەڕۆ داهات.

"نوقڵێکی زۆر لەنێو تووڕەگەکە ماوە ڤاسیلی یەکەو دانەیەکیش بدە بەئێمە. پاشان تووڕەگەکە ببەو بیدە بەمەلەك خانم با ئەویش بەسەر ژنو کچەکاندا دابەشیان بکات".

مەلـەك خـانم تـوورەگەكـەی وەرگـرتو بـۆلای ماڵـەكان رۆیشـت. "بـۆ منداڵـەكانی هوسمەنیش دایانبنێت".

ڤاسیلی چوو هەشت دانەی لەنێو توورەگەكە هەڵگرتنو دانیـە هوسمـەن. "ئەمانـە بگـرە، بیانبەنە بیاندە بەمنداڵەكانت، یەكێكیشیان بۆ خۆت، ئەم دانە سوورەشیان بۆ سەبیحە".

هوسمەن بەراكردن بۆ ماڵەوە چوو.

لەدەوری كانیەكە منداڵەكان لەپێشتر، گەورەكان لـەدواوە چـاویان بڕیبـووە توورەگـەی نوقڵەكانو بەئومێدەوە چاوەڕوان بوون.

مەلەك خانم لەكاتێكدا توورەگەكەی بەدەستەوە بوو یەكـەمجار چـووە لای نیشانچیو سـێ دانـە نـوقڵی بـۆلای ئـەو راگـرتن. نیشانچـی دەستەپاچـە بـوو. ویسـتی شـتێك بڵێـت، نەیتوانی. دوای ئەو نوقڵەكانی بەسەر ئەوانی دی دابەشكرد، هەر كەسەو پشكی خۆی كـە سـێ دانـە نـوقڵ بـوون وەردەگـرت، بـۆلای تەختـەكانی ژێـر دارچـنارەكان رایـدەكردو دەستیدەكرد بەخواردنی نوقڵەكانو لەژێر دارچنارەكان دادەنیشتن.

"وەرن منداڵینە وەرن!"

مەلـەك خـانم هـەر ئـەو رسـتەیەی لـەدەم هاتـەدەر، سـەیریكرد منداڵـەكان بەدەسـتی درێژكراویانەوە كردوویانەتە هەراو زەناو قەرەپەسـتەیەك نەبێتـەوە. "نـە، بڕۆنـە دواوە، بەریز بوەستن، ئا بەمجۆرە".

ئەو منداڵەی كە لەدواوەی هەمووان وەستابووو دەستی درێژ نەكردبوو لەهەمووانیش گەورەتربوو بانگكردو پێنج دانە نوقڵی خستە سەر لەپی دەستی.

"مەڕۆ، بوەستە!"

منداڵەكە چوو لەهەمان شوێنی پێشووی راوەستا.

هـەر منـداڵێك كـە پشـكی خـۆی وەردەگـرت دەكشـایەوەو كـپو بێـدەنگ دەچـوو بەریز دەوەستا.

دوای ئەوەی كە سێ جاران بانگی منداڵەكانی كـردو نـوقڵی دانـێ گـوتی: "تـەواو بـوو!" منداڵەكان بێدەنگو لەسەرخۆ گەڕانەوەو رۆیشتن.

مەلەك خانم گوتی: "من ئێستا دەگەڕێمەوە". لەكاتێكدا توورەگەكەی بەدەستەوە بـوو كـە هێشـتا تـەواو نـەبووبوو، تـەكانی دەداو رۆیشـتو كـەمێك دواتـر بەدەسـتی بـەتاڵ گەڕایەوە. هاتو بەئارامی دەستی بەسەر چەرخی درومانەكە كـە لەسـەر لێوی تەختەكە

داندرابوو داهێنا، زارکی بەدەستە شارەزاکانی خۆی کردەوە، چەرخەکە نوێ نوێ بوو، چاوەکانی بریسکانەوە.

"ئەمە کوێی کۆنە، نوێ نوێیە. ئەو خەیری ئەفەندیە پیاوێکی باشە. حەیفە، هەردوو کوڕەکانی لەگەڵ ئەوانەی ئێمە، لەوێ، لەگەڵ گەردو خۆڵ تێکەڵ بوونو بوونە هەڵمو دووکەڵ. خەیری ئەفەندی ئەمەی باوەڕنەکرد، ڕۆیشت بەمانگان لەگۆشەو کەناری جیاکانی چاناك قەڵاو دەشتەکانی گەڕا، بەڵام تەنانەت یەك ئەنگوستی یەکێك لەکوڕەکانیشی نەدۆزیەوە، دوای ئەوەش لەهەموو دونیا زیز بوو".

مەلەك خانم دوای ئەوەی سەیرێکی بەکرەو پارچەکانی کرد، هات لەتەك پویراز دانیشت، دانەیەك نوقڵی لەگیرفانی دامەنەکەی دەرهێناو خستیە دەمیەوە. گوتی: "ئەمەش پشکی من. "پێکەنی".

ڤاسیلی گوتی: "ئەوەش پشکی تۆ، حەڵاڵت بێت".

مەلەك خانم نوقڵەکەی دەمژی.

"ئەم چەکمانە هی کێن؟"

"هی نیشانچین".

نیشانچی لەجێی خۆی هەستاو بەتەڕدەستییێکی چاوەڕواننەکراو گەیشتە سەر چەکمەکانو هەڵیگرتنو هاتەوە لەجێی خۆی دانیشتەوەو بەچاوانی وەك چاوی هەڵۆ سەیری ژێرەوەو ناوەوەو چەرمو ساقەکانی کردو پۆتینە کۆنو دڕاوەکانی خۆی، کە ئەنگوستەکانی تێدا دیاربوون داکەندنو یەکسەر چەکمەکانی کردنە پێو هەستا. لەوێ بۆ نێو قامیشەڵانەکەو لەقامیشەڵانەکە بۆ ئەسکەلەو دواتر بۆ لێواری دەریاو لەوێوە بۆ ژێر چنارەکان دەڕۆیشتو دەگەڕایەوەو هەندێکجار خێراییەکەی زیاتر دەکردو جارجاریش دەهاتو لەسەر تەختەکان دادەنیشتەوە، قاچەکانی درێژ دەکردن، لەچەکمەکانی ورد دەبووەوەو دەیگوت: "من ئەو ڕەنگە زەردەم پێجوانە".

دووبارە هەڵدەستا، یەکەمجار وەك فەنەر لەسەر قاچەکانی ڕادەوەستاو ئینجا هەڵدەستایەوە، دەڕۆیشتو دەگەڕایەوە، درێژەی بەدانیشتنو هەستانەوە دەدا، بەلارەلارە دەکەوتەڕێ، دەگەیشتە تەختەکان، لەسەر تەختەکان دادەنیشت، قاچەکانی درێژ دەکردنو سەیری چەکمەکانی دەکرد.

"ئەمانە دەبێت جووتێك گۆرەویشیان هەبێت".

ڤاسیلی بەڕاکردن رایکردە ماڵەوەو بەجووتێك گۆرەوی گەڕایەوە گوتی: "بگرە!"و بۆلای نیشانچی رادان. نیشانچی هەر لەگەڵ ئەوەی گۆرەویەکانی وەرگرتن، چووە سەرکانی لەسەر بەردەکە دانیشت، چەکمەکانی داکەندنو بەهێواشی لەولای دانان، پێیەکانی خستنە بەر شێرەی ئاوەکەو جوانو خاوێن بەسابوون شوشتنی. پاشان بۆ ئەوەی وشك ببنەوە بەرەو خۆر بەرزی کردنەوە، لەلایەکی دی نەیدەتوانی چاو لەسەر چەکمەکان هەڵبگرێت.

پێی وشك بووبوونەوە کە گۆرەیەکانی پۆشین، چەکمەکانیشی کردنە پێ، هەستا، دووبارە چەند جارێك دانیشتو هەستایەوە.

مەلەك خانم چەرخە درومانیەکەی، کە مارکەی سینگەر بوو دەسووڕاندو چەرخەکە وەك سەعات کاری دەکرد. مەلەك خانم گوێی دابووە دەنگی چەرخەکەو رۆچووبووە فیکرو خەیاڵانو دەستەی چەرخەکەی بێئیرادە دەسووڕاند.

"خاڵۆ نیشانچی دەکرێت بێیتە ئێرە".

"هاتم".

هات لەبەردەم پویراز دانیشت.

"مەلەك خانم دەیەوێت شەلوارو ئیلەگو جلەکانی ژێرەوەت بۆ بدورێت بۆیە دەیەوێت ئەندازەت بگرێت".

مەلەك خانم لەبەردەمی راوەستا، ماوەیەك ئاوا تەماشای کرد، پاشان لەقاچەکانیەوە تا کەمەرو لەدەستەکانیەوە تا شانەکانی ئەندازە گرتو کشایەوەو ماوەیەك سەراپای نیشانچی تەماشاکرد. کاتێك نیشانچی بینی ئاوا تەماشای دەکات خۆی رێکخستەوە.

"هەموویت ئەندازە گرت خاتوون؟"

"گرتم".

"یەکەمجار دەبێت شەلوارو شتومەکەکانی خاڵ نیشانچی بدوریت".

"بەلەموان بڕۆ لەماڵەوە مەقەسم بۆ بێنە".

"ئێستا گۆرەویشم هەیە. ئەگەر مەنجەڵێکیش هەبوا، ئاوم گەرم دەکردو خۆم دەشوشت. خۆشوشتنێکی تەواو".

"ئەی وای لەبیرمان چوو، کوڕەکانم لەپێش دووکانێکی مسگەری بینیم، مەنجەڵی گەورەو بچووکیان لەسەر یەك دانابوون، پێموابێت ئەو مەنجەڵانە لەوانە بەجێماون کە رۆیشتوون، هەرکاممان ویستبان بەیەك دانە قرۆش دەمانکڕی".

قـەدریی بەلـەموان کـە مەقەسـەکەی هێنـابوو، گـوتی: "مـن دەچـم چـەندی بتـەوێت مەنجەڵان دەکڕمو دەیانهێنم".

"چــەند رۆژێکــی دی دەچــین، شــتومەکمان زۆر پێویســتە، ئــەوانیش دەکــڕینو دەیانهێنین. پویراز بانگی ڤاسیلی کرد: "ڤاسیلی لەکوێیت؟"

"وادێم سەرۆك".

"دەبەی بەتاڵی بەنزینت هەیە؟"

"سێ دانەم هەن سەرۆك پویراز".

"هەرسێکیان بێنەو بەگەڵای وشك ناوەوەیان وشك کەوە تا بـۆن بەنزینەکـە نامێنێـت، ئینجا بەئاوی دەریا بیانشۆ، پاشان پڕیان دەکەین لەئاوو ئاوەکـە گـەرم دەکـەینو سـەرۆك نیشانچی دەبەینە گەرماوی ماڵێ، بەڤاڵبێك سابوونی بۆندارو خاولیەکەوە.. دەیشۆین".

"ناکرێت، تـا جلـەکانو جلـەکانی ژێـرەوە تـەواو نـەبێت ناکرێـت، نـاتوانم خـۆم بشـۆم. دوای ئەو خۆشوشتنە جوانو خاوێنە دووبارە بێم هەمان ئەو جلە دڕاوو پـڕاوو چڵکنانە بکەمـەوە بـەرم، خۆشوشـتن بـەچ کـەڵك دێـت.. تـازە ئـەو جلـە بزگـوڕ بزگوڕانـە کـە هـی زەمانی نوح پێغەمبەرن پڕن لەئەسپێ".

هەستێکی منداڵانەی بۆ دروست بووبوو، بەردەوام پێدەکەنی.

"منـیش ئەگـەر بمـەوێت بـاش بـاش خـۆم بشـۆم، سـەرو ریشـم بتاشـمو پاکیکەمـەوە، گۆرەویو چـەکمەکانم دەربێـنم، جلوبەرگـە کۆنـەکانم دەبێـت داکـەنمو وەکـو ئـەوانی دی رووت ببمــەوەو تــا ئــەو دەمــەی جلــە نوێیــەکانم ئامــادە دەبــن لــەماڵێ نەیەمــەدەر". بەچاوەکانی کە ئێستا وەك تۆپەڵێك رۆشنایی سەوزباویان لێهاتبوو سـەیرێکی تکاکارانـەی لەمەلەك خانم کرد.

مەلـەك خـانم بـەدەربڕینێکی نـەرمو نیانـەوە گـوتی: "سـەرۆك نیشانچی مـن هـەموو جلوبەرگەکانت تا شەو دادێت تەواو دەکەم".

سوپاس، هەربژیت خاتوونی رەسەنزادەی من".

"قەدریی بەلەموان جارێکی دی بڕۆرەوە ماڵێ، کراسـەکەی مـن ببـەو بیـدە بـەو ژنـەی کە درومانکاری دەزانێت با بیکاتە بەریو بێتە ئێرە".

"سەرچاوەکانم دایکە".

ئـەو ژنـەی کـە درومانکـاری دەزانـی کراسـەکەی مەلـەك خـانمی کردبووەبـەرو قـژی هۆنیبـووەوەو هـات، ژنێکـی بـەژنو باڵابـەرز بـوو، بەچـاوانی شـینی گـەورە، روخسـارێکی

دلگـر، بـەرز، گـەردنێکی وەك گـەردنی قـازو قـژێکی سـووربـاو. مەلـەك خـانم چـاوێکی بەسەرتاپای ژنەکە داگێڕاو بیریکردەوە، کراسـەکەمی چـەند لێجوانـە. هـەروا کـە خـەریك بـوو بەسەرسامیەوە لێیـدەڕوانیو لـەدڵی خۆیـدا دەیگوت، کـێ ژنێکـی وا جـوانی بینیـوە، کاتێك پێیە بێپێڵاوەکانی ئەوی بینی دڵی ئێشا.

"وەرە دانیشە لای من کچم. پێڵاوت نەبوو؟"

"لەرێگا دڕیا".

خەمێکی قووڵ لەسیمایدا بەدیدەکرا. چنگێك قوڕگی مەلەك خـانمی گرتبـوو، فرمێسك لەچاوەکانی هەڵقەیان بەست. کێ دەزانێت چی بەسەر ئەو گەنجە جوانە هاتووە!

پویرازو ڤاسیلیو هوسمـەنو بەلـەموانیش بەحەپەسـاویەوە چـاویان بڕیبـووە ژنەکـە. هاتبوونە خرۆشو نەیاندەزانی چی بکەین.

"دەبێت جلوبەرگەکانی ئەم نیشانچیە ئامادە بکەم، دەبێت هەر ئێستا دوو کراسـان بـۆ تۆ بدروم، بەلەموانیش دەنێرمە شارۆچکە تا جووتێك پێڵاوت بۆ بکڕێت".

سوپاست دەکەم خاتوونی من".

"تۆ دەتوانیت بڕی کچەکەم".

"کەمێکی لێدەزانم خاتوونی من".

"من ئێستا خەریکم شەلوارەکەی سەرۆك نیشانچی دەبـڕم. ئەندازەکـەیم هەیـە". ژنـە گەنجەکە چاوی لەسەر دەستەکانی ئەو، کە خەریك بوو پارچەیەکی رەشی بـۆ شـەلوارەکە دەبـڕی هەڵنــەدەگرتو مەلــەك خــانم ئــەو وردبوونەوەیــەی ئــەوی زۆر پێخــۆش بــوو. نیشانچی کە پێڵاوە کۆنەکانی خۆی کردبوونە پێ، بەچاوە هەڵۆییـەکانی سـەیری هـەموو لایەكو هەموو شتێکی دەکرد، ئەویش لەبینینی ژنەکە سەرسام بووبووو بـیری دەکـردەوە ئەوەی ئێمەش ئەوەندە جوان بوو. ئەگەر مرۆڤ بتوانێت بـەبینینی وەهـا جوانیـەك ئـاوا سەرســام بێــت، کەوایــە ئــەو جــەنگو گۆشــتی یەکــدی خواردنــەو ئــەو هــەموو سـووکایەتیکردنە بۆچـیە، بۆچـی دەبێـت ئـاوا دوژمنایـەتی لەگـەڵ ئـاوی رەوان، باڵنـدەی ئاسمانـانو ئـەو پەپوولەیـەی لەسـەر پـەلکی گـوڵان هەڵدەنیشێت، بکات؟ مەگـەر شـێتن ئەمانـە؟ شێتن؟ تەمـەنم گەیشـتە ئێسـتاو زۆرم شـەڕ، کوشـتو بـڕ، سـتەمکاری، دۆسـتی، خۆشەویستی، بەختەوەری، عەشقی تاسەبار بینیون، بەڵام سەرم لەکاری مرۆڤ دەرنەکرد. بوونەوەرێکی چەنـدە سەیرو شێتە. هاوکات لەگەڵ گوتنی رسـتەی خـوا لێتـان نـەبوورێت،

هەستایەوەو تفێکی گەورەی رووکردە سەر عەرد، دەستو پێی بەتوندی دەلەرزین. سەیری حاڵو رۆژگاری من بکەن، پێمبڵێن، مرۆڤ ئەو بوونەوەرەیە ئاوا بکەوێتە حاڵو رۆژگارێکی وا.

"سەرۆك نیشانچی، ئێستا کە کەمێك هاتوویتەوە سەرخۆتو هەستایتەوە، وا چاکە ئەمڕۆ دوورگەت نیشان بدەم".

"خاسە، خاسە، خاسە، منیش هەر ئەوەم دەویست، بەڵام نەمدەتوانی بیڵێم. تا زووە با بەڕێبکەوین. ئێرە ماریشی لێن؟"

"لێی هەن، بۆ دەپرسیت؟"

هەر خاکێك ماری تیابێت خاکێکی پڕ پیتو بەرەکەتو بەخێرو بێرە. خەڵکی ئەو جۆرە شوێنانە بەئاسانی نەخۆش ناکەون. لێرە مار زۆر هەن؟"

"نازانم، من تازە هاتوومەتە ئێروکانە".

"ئەم دوورگەیەت کڕیوە؟ ئەم خانووانە دەفرۆشیە ئێمە؟"

"من لێرە تەنها خانووێکم کڕیوە، یەك دانە ئاشیش".

"دەتەوێت ببیە ئاشەوان؟"

"نازانم".

"سەربازی راکردوویت؟"

"نە".

"چوویتە سەربازی؟ لەکوێ؟ شازدەییت؟"

"چۆنت زانی؟"

"زۆر گەنجیت. چونکە چوویتە سەربازی ناشێت لەشازدەیی بترازێت شتێك بیت. ئەوانیان کە هێشتا زارۆك بوون بردنە سەربازی. کاتێك هەموو سەربازەکان کوژران ئەنوەر پاشا زارۆکەکانی بردە جێی ئەوان. بۆ ئەوەی کە ئەو زارۆکانەش بەکوشت بدات. زارۆکەکانیش کوژران. منداڵێکی پازدە ساڵە چوزانێت شەڕکردن چیە. زۆربەی هەرە زۆریان نەیاندەزانی تفەنگیش بەرزکەنەوە. تۆ لەکامە بەرەی شەڕ بوویت؟"

"لەساری قامیش، ئەللاهو ئەکبەر".

"ئەسپێ نەیانخواردیت؟ نەبوویتە سەهۆڵ؟ ئەنوەر پاشا مرۆیەکی بێبەزەییو ستەمکارو بێعەقڵ بوو. تۆی نەکوشت؟"

"هیچ دڵێك لەسینەیدا نەبوو".

هەرئاوا بەدەم قسەکردنەوە، چوونە لێواری دۆڵی دارزەیتوونەکانو لەوێ بەگردەکەدا هەڵگەڕان، لەوێ دانیشتنو پشتیان بەبەردە نووسەکەوە دا. سەرۆك نیشانچی قسەیکردو پویراز گوێی گرت. پویراز قسەیکردو سەرۆك نیشانچی گوێی گرت. هەردووکیان بۆ ئەوەی نەبنە مایەی ئازاردانی ئەویدی، خۆی لەدەربرینی قسەو باسە سەرەکیەکان دەبوارد.

بەیانیان بەرلەوەی هەتاو هەڵبێت لەماڵ دەچوونەدەر، لێنا نانو چای دەدانێ، پاشان هەندێك خواردنی بۆ دادەنانو بەڕێی دەکردن.

رۆژێك سپێدە زوو پویراز ئەودەمەی خەریکبوو بۆ لای دارچنارەکان دەچوو، نیشانچی نەبینی، لەکاتێکدا بەیانیان کە دەهات نیشانچی دەبینی لەسەر یەکەم تەختەدا دانیشتووەو چاوەڕوانی ئەوە.

"لێنا ئەو پیاوە لەکوێیە؟ بەڵایەکی بەسەر نەیەت، قەت نەبووە وەدرەنگ بکەوێت".

لێنا گوتی: "نیگەران مەبە، هەنووکە پەیدا دەبێتەوە".

پویراز بەردەوام لەکانی بۆ ئەسکەلە، لەئەسکەلە بۆ پشت قامیشەڵان، بۆ ماڵەوە، لەوێ بۆ لێوار دەڕۆیشتو دەگەڕایەوە، چاویشی لەسەر ئەو رێگایە هەڵنەدەگرت کە دەبوا ئەوی لێوەهاتبا. دڵەڕاوکێکەی هێواش هێواش دەگۆڕا بۆ تووڕەبوون.

ئاسۆ رۆشن بوو، شتێکی ئەوتۆ بۆ هەڵهاتنی خۆر نەمابوو، بەڵام ئاسەوارێکی نیشانچی دیارنەبوو.

لێناش نیگەران بووبوو، دەیگوت: "دەبێت بێتەوە، دێتەوە". ئەویش نەیدەتوانی چاو لەسەر رێگاکە هەڵبگرێت، خەمو پەژارەی پویراز کاری کردبووە سەر ئەویش. "سەیربکە وا خەریکە دێت".

نیشانچی جلە نوێو چەکمەکانی کردبوونەبەر. پشتێنێکی سپی لەپشتی ئاڵاندبووو ریشی تاشیبووو قژە هەمیشە تێکئاڵۆزاوەکەی شانە کردبوو. پویراز بۆلای رۆیشتو گرتیە باوەش.

ئەو کە پێدەکەنی گوتی: "حەمامێکی باشم کرد، پاشان چوومە نێو جێم، لەهەموو تەمەنمدا خەوی وام نەکردووە".

"منیش نەمدەزانی تۆ هێندە گەنجی".

نیشانچی دەستی خستە سەر دەستیو وا بەنەرمیو دڵسۆزانە دەستی پویرازی گوشی کە میهرو خۆشەویستی هەموو جەستەو رۆحی پویرازی گرتە خۆی. یەکەمین جار بوو کە پویراز وەها خۆشەویستیەك لەجەستەی خۆیدا هەست پێبکات. ئەویش دەستی خۆی خستە سەردەستی نیشانچی.

لێنا گوتی: "ئەمڕۆ نیوەڕۆ لێرەبن. هوسمەنو قەدریش دروست دەمی نیوەڕۆ بڕیارە لەماسیگری بگەڕێنەوە، ئەوانیش دێنە ئێرە."

پویراز گوتی: "باشە، دروست نیوەڕۆ، ئێمە، هەر لێرە، لەژێر دارچنارەکانین". قەدریی بەلەموانو هوسمەن دروست دەمی نیوەڕۆ، هەردوو لەگەنەکانی ماسیانیان پڕکردبوونو لەدەریا گەڕابوونەوەو چاوەڕێی ئەوانیان دەکرد.

کاتێك ئەوان گەڕانەوە، بەلەموان ماسیەکانی لەلای دەستە چەپی خۆیدا کۆکردبوونەوەو پاکیکردبوونەوەو بەئاوی دەریا دەیشوشتنو ئینجا دایدەنانە سەر وردە بەردەکانی لێوار. مەلەك خانم ئەوانی لەدوورەوە کە خەریك بوون دەهاتن، بینین. تا لای دەوەنە گەزەکان، کە لەپشت قامیشەڵانەکە بوو رۆیشتو بەپیریانەوە چوو.

"زوو هاتنەوە، هەموو جلەکانم ئامادەکردوون، ئەو کچە، خەدیجەش باش یارمەتی دەدام. هەموویان جلوبەرگەکانی خۆیانیان پۆشیوە، بەڵام هەر پێخاوسن. هیچ کامیان تەنانەت قرۆشێکیان نیە".

"چەند ماڵ دەبن؟"

"خەدیجە بێوەژنە، دوو منداڵی هەن".

"خەدیجە هەمان ئەو ژنەیە کە درومانکاری دەزانێت؟"

"زۆر یارمەتی دام، ئەگەر ئەو نەبا نەمدەتوانی جلەکان تەواو بکەم، هاوسەرەکەی لەچاناك قەڵا کوژراوە، براکانیشی لەبیابان نەگەڕاونەتەوە. هیچ کەسیان نیە گشت خاوو خێزانو کەسو کارەکانی لەدەست داوە".

"بەخەدیجەوە دەبنە چوار ماڵ، وانیە؟ بلا لەماڵەکانی خۆیان دابنیشنو لەوە زیاتر هەست بەپەرێشانی نەکەن".

سەرۆك نیشانچی دەبێت تۆ خانووەکانیان بۆ دیاری بکەیت، تا هەریەکەو لەو خانووەی پێیان باشە نیشتەجێ بن. پاشانیش دەچینو قەباڵەکانیان وەردەگرین".

دانیشتنە سەر سفرە، خوانچە نانێکی گەورەیان دانابووە نێوەڕاستی سفرەکە، لەکوێیان پەیدا کردبوو! ماسیەکان چزەچزیان بوو بەسەر ئاگرەکەوەو بۆنێکی خۆشو

مەستکەر لەگەڵ دووکەڵ ئەو ناوەی پڕ کردبوو. یەکەمجار کچەکانی گۆڕین، بەدوای ئەوانیش میوانان‌و منداڵەکان، لەکاتێکدا کە جلی رەنگاورەنگیان پۆشیبوو، هاتن‌و کپ‌و بێدەنگ بەڕیز لەسەر تەختەکان دانیشتن. گشتیان پێخاوس بوون. مەلەك خانم گوتی: "یەکەمجار بدەنە منداڵەکان، ئەوان زوو برسی دەبن".

دوای ئەوان ژنەکان هاتن. دامەنە رەنگاوڕەنگەکانیان لەگەڵ رۆیشتندا بەرزدەبوونەوە. پێخاوس بوون.

بەدوای ئەوانیشەوە پیاوانی پیرو گەنج هاتن، کە شەلواری رەش‌و نوێ‌و ئێلەگی خەتخەتیان لەبەر بوو، پێخاوس بوون.

بەیانی رۆژی دووەم، ڤاسیلی بێئەوەی شتێك بەکەس بڵێت، لەگەڵ قەدریی بەلەموان، چووە شارۆچکەو یەکڕاست چووە دووکانی خەیری ئەفەندی. خەیری ئەفەندی وەکو دۆستێکی چل ساڵە پێشوازی لێکرد.

ڤاسیلی هەموو رووداوەکەی بەوردی بۆ خەیری ئەفەندی باسکرد.

"کەوابوو پویراز بەگ پارەی کڕینی ئەو هەموو شتانەی لەگیرفانی خۆی دا، وایە؟". بەدەستەکانی روخساری خۆی داپۆشی، هەنیشکی دایە سەرمێزەکەو کەوتە بیرکردنەوە. "پویراز بەگ پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندە؟"

"پێموانیە. کەسێکی زۆر باش‌و بەڕێزە. زۆری ئازارچەشتووە. لەساری قامیش جەنگاوە، سەدو پەنجا هەزار سەربازی بینیوە کە بوونەتە سەهۆڵ یا ئەسپێ خواردوونی، لەلیوایەکی گەورە تەنها ئەو ماوەتەوە".

"ئەو خەڵکە کاتێك هاتنە دوورگە رووت‌و قووت بوون؟"

"نیوە رووت بوون، وەکو ئەو زارۆکانە بوون کە تازە لەدایك دەبن. تەنها بەدەوری کەمەریان لەجیاتی پشتێن دۆخینێکی خوری ئاڵێندرابوو".

"گشتیان بێپێڵاو؟"

"وەلی نیشانچی چەکمەکانی کردنە پێی، یەك بەپێی خۆی بوون. پیاوێکی پیرە. ماسیگرێکی پلە یەك. ژێرو ژووری حەوت دەریاش دەناسێت".

روخساری خەیری ئەفەندی زەرد هەڵگەڕا، ریشی خوراند، دەستی پێداهێنا. هەستایە پێ:

"ئێوە جارێ لێرە بمێننەوە، من دەمەوێت بچمە شوێنێك هەوڵ دەدەم زوو بگەڕێمەوە، تا ئەو کاتەی دەگەڕێمەوە دووکانەکە بەجێمەهێڵن. ئەگەر کەسێکیش بۆ شتکڕین هات، هیچ مەفرۆشن".

حاڵـەتی دەمو چـاوی وردە وردە تـەڵخ دەبـووو دەکشـا. سـەری نایـەوە بـەرخۆیو لەدووکان چووە دەرەوە، سەرەتا چووە لای وەهاب بەگ. ڕەوشی ئەو ئاوارانەی بۆ باسکرد کە چووبوونە دوورگـەی کارینجـاو، هـەروەها ئـەو کارانـەش کـە پـویراز بـەگ ئـەنجامی دابوون، وەهاب ئاگری لەهەناوان بـەربووو چاوی پـڕی فرمێسك بـوون. هەسـتاو پێکـەوە چوونە لای عوزێر خانو ڕەوشەکەیان بۆ ئەویش باسکرد. عوزێر خان کە دڵی پڕبووبـوو لەخەم، نەیتوانی پێش بـەخۆی بگرێـت، دەسـتی بـەگریان کـرد. دڵـی بـەوەی کـە خـەیری ئەفەندی هەردوو کوڕەکانی لەدەست دابوو بووبووە کەبابو هەمیشە بەکوڵ بۆی دەگریا.

بەڕێوەبەری ناحیەش زۆر نیگەران بوو. یەکسەر ئەنجوومـەنی نیشـتەجێکردنی بـانگ کـرد، ئەنجوومـەنی نیشـتەجێکردن لەبەڕێوەبەرایـەتی ناحیـە کۆبـووەوە. حـەفتاو پێـنج لیرەیان بۆ ئاوارەکـانی دوورگـەی کارینجـا دابـین کـرد. هـەمووان لـەوەی کـە ئەنجوومـەنی نیشتەجێکردن پارەیەکی وای هەیەو بۆ ئاوارەکانی دوورگـەی کارینجـای تـەرخان کـردووە سەریان سووڕمابوو.

ڤاسیلیو قـەدریی بەلـەموان یەکسـەر هـەمان ڕۆژ گەڕانـەوە دوورگـە، بـەیانی زووش گشـت ئاوارەکانیـان سـواری بەلەمەکـەی قـەدریی کـردنو بـەرەو شارۆچـکە کەوتنـە ڕێ، لـەدووکانی خـەیری ئەفەنـدی هەناسـەیان تـازەکردەوە. خـەیری ئەفەنـدی پێشـوازییێکی گـەرمی لێکـردن. جێگایەکی زۆر بۆ دانیشتن نەبوو. ژنەکانو منداڵەکان بەپێوە ڕاوەستابوون.

کەمێك دواتر دوو گونیەی پڕ پێڵاویان هانین. خەیری ئەفەندی گوتی: "ئەو گونیانـە لەنێوەڕاستی دووکانەکە هەڵبڕێژن".

هەڵیانڕشـتن، ئـەو پێڵاوانـە، کـە ژێرەوەیـان لەپێسـتی ئەسـتوورو لای سـەرەوەیان لەپێستی بزنو مانگا دروست کرابوون، هی دێهاتیەکان بوون.

"یاللاّ وەرن، هەرکەسەو پێلاوێك کە بەپێی بکات بدۆزێتەوەو بیکاتە پێی".

هەموویان لەسەر گردۆلکەی پێڵاوەکان خڕبوونەوە. هەرکەسەو ئەو پـێڵاوەی ژمـارەی پێی بوو پەیدای کردو بەدەستی بەپێڵاوەوە دەکشایەوە.

هەموویان پێڵاوی خۆیان دۆزیەوەو چوونە لای ڕەفـەی پارچـەکانو بـەڕیز ڕاوەسـتان. ڤاسیلی ئەفەندی ئێستا لێرە چەند خانوو هەن. هەر خانووەو چەند کەسـی تێـدا دەژیـن، بۆم بنووسەو بۆم بێنە".

"سەرچاوان، خەیری ئەفەندی، دەینووسم".

لەو دیو مێزەکە راوەستا، لەماوەیەکی کورتدا هەمووی نووسیو دایە دەستی خەیری ئەفەندی. خەیری ئەفەندی سەندوقێکی لەدارگوێز دروستکراوی دانایە سەر مێزەکە، کلیلی خستە نێو قفڵەکەو کردیەوە. دەرکی سەندوقەکە سێ جار تەقتەقی کرد.

"وەرە ئەم کاغەزە بخوێنەوە، سەرۆکی خێزانەکان یەك یەك لەگەڵ ژنو منداڵەکانی بێنە لای من، بخوێنەوە!"

ڤاسیلی خوێندیەوە، پیاوێکی لاوازو باڵابەرز کە روخسارێکی درێژووکانەی هەبوو لەگەڵ ژنو منداڵەکانی کە بەدوایەوە بوون، لەکاتێکدا کە پێڵاوەکانیان بەباوەشیانەوە توند گرتبوو، هاتن لەبەردەم مێزی خەیری ئەفەندی راوەستان. خەیری ئەفەندی بڕێك پارەی لەسەندوقەکە دەرهێناو ژماردی، هەم کاغەزەکەی خوێندەوەو هەم سەیری ژنو منداڵی ئەو پیاوەی کرد، پاشان پارەکەی بۆلای پیاوە لاوازەکە درێژکرد.

پارەی نێو سەندوقەکەی بەهەمان شێوە لەنێوان خەڵکەکە دابەشکردو هەستا. گوتی: "دۆستان، هاوڵاتیانی زۆر بەڕێز، ئەنجوومەنی ئێمە ئەم پارەیەی لەبودجەی تایبەتی جەنگ بۆ ئێوە دابین کردووە، تاکو بتوانن پێداویستییەکانی خۆتانی پێدابین بکەن. پێڵاوەکانیش دیاری منن بۆ ئێوە. بەسەلامەتیو خۆشی بیاندڕێنن. پیرۆزتان بن".

ڤاسیلی گوتی: "سوپاست دەکەم خوا لێت رازی بێت. دڵو پێی ئەو خەڵکەت شاد کرد. خوایە دونیاو ئاخیرەتت پڕ خێرو بەختەوەری بێت. تەنها سەرۆك وەلی نیشانچیمان لەبیرکرد بیهێنین".

"ئێستا لەکوێیە؟"

"لەدوورگەیە".

"بۆچی؟"

گوتیان: "ئێمە بەدوای داچووین، بەڵام ئەوان خەریك بوون دەچوونە دوورگەی کابا بۆ راوەماسی".

"چیبکەین؟".

"هیچ ناکەین".

"بۆچی؟"

"چونکە پویراز ئاغا نازناوی (باوك)ی پێداوە".

خەیری ئەفەندی گوتی: "ئەو چەکمەی هەیە، وانیە؟"

ڤاسیلی گوتی: "هەیەتی، جا تۆ بڵێ  چ چەکمەیەك".

چوونە بازاڕ، هەر کەسەو بۆ خۆی وردەواڵەی پێویستی وەك چەرخ، گاز، خوێ، بیبەر، شەکر، چای، دەرزیو داوو سابوونی کڕیو خستیە نێو گونیەکانو کاتێك گەڕانەوە نێو بەلەم، کە شەو داهاتبوو.

کاتێك گەڕانەوە دوورگەو رووبەڕووی ئاگرێکی گەورە بوونەوە کە لەژێر دارچنارەکان کرابووەوە. ئەوانەی کە لەدوورگە مابوونەوە لەسەر ئەسکەلە چاوەڕێی ئەوانیان دەکرد. یەك یەكو دوو دوو لەبەلەم هاتنەدەر. لەکەسیان نەبیستبوو کە هەرکامیان بەپێلاوەوە لەبەلەمەکە پیادە دەبێت، بەڵام دەیانزانی.

پویراز پرسیاریکرد: "دەتوانن رێیماڵی خۆتان بدۆزنەوە، وانیە؟"

هەمووان پێکەوە بەپێکەنینەوە گوتیان: "دەیدۆزینەوە".

"زووبن، شمەکەکانتان ببەنەوە ماڵێ دایاننێنو وەرنەوە ئێرە، تا ئێستا ئێوەمان بەزگی برسی هێشتۆتەوە، زووبن، وا خەریکە بەیانی دادێت".

ئەوانیش خەریکبوو لەبرسان دەمردن، زوو گەڕانەوە. تا ئەوان گەڕانەوە دەنگی چزەچزو بۆنو بەرامەو دووکەڵی ماسیان، ئەو ناوەی پڕکردبوو. بۆنی ماسی برژاو ئەو بن چنارانەی داگرتبوو. بۆنو بەرامەیەك کە بۆی هەبوو هەرکەسێکی برسی لەپەلوپۆ بخات.

ژنانو کچانی چارۆگە بەشانی لادێیی لەچیاکانەوە دارژابوونە شارۆچکە. رۆن، ماست، پەنیر، میوەو کەوشو کاری ئەو کێوانەو رەفتەی چندراوو پارچەی خوری تایبەت بۆ شەلواریان دەفرۆشت، بەڵام نیشانچی زۆر گەنج بوو، تازە سمێڵی گوگرە بووبوو، لەراوەماسی دەگەڕایەوە، سەراپای پوولەکەی ماسیان بوو. بەهەرجێیەکدا دەڕۆیشت بۆنی دەریاو ماسی لەدوای خۆی جێدەهێشت. کاتێك خەریك بوو بەنێو بازاڕدا دەگەڕا سوڵتانی بینی، لەوێ لەبەرامبەر کەنیشکەکە رەقهەڵات. دڵی بەتوندی کەوتە لێدانو نەیدەتوانی چاو لەسەر کچەکە هەڵبگرێت. کچەکە هەر تاوێك نا تاوێك سەری هەڵدەبڕیو نیگای لەگەڵ نیگای نیشانچی تێکهەڵدەنگوتو یەکسەر چاوەکانی دەدزیەوە. نیشانچی دوای ئەوەی چەند جار ئاوا نیگای لەگەڵ نیگاکانی کچەکە تێکهەڵنگوتن، بەرەو ماڵەوە بەڕاکردن رایکرد، جلوبەرگە تازەکانی پۆشینو گەڕایەوە لەژێر درەختێك راوەستا. کەنیشکەکە هەر لەگەڵ ئەوەی سەری بەرزکردەوە، دیسان نیگاکانیان تێکگیربوون. وەك بڵێیت کچەکە بزەیەکی بۆ کردبێت وابوو، یان ئەو وای بۆچوو. هێشتا

خۆر ئاوا نەبووبوو کە ژنانی لادێی ئـەو شمەکانـەی هێنابوویـان فرۆشـتیان. ئەوانـەی کـە زووتریش شتەکانی خۆیان فرۆشتبوو چاوەڕێی ئەوانی دیکـەیان دەکـردو رۆژ ئـاوابووبوو کە هەموو پێکەوە گەڕانەوە. دامەنی کراسـەکانیان کـە بـەخۆیان دوریبوویـان لـەدواوەیان دەخشاو پێشبەندە سوورو سپیو سەوزو رەشەکانیشیان لـەدواوەیان. قاچـەکانی نیشانچـی ئـەویان بـەدوای ئـەو ژنانـە راکێشا کـە کچـەکەیان لەگـەڵ خـۆدا دەبـرد. هەریەکێکیشـیان سـەوەتەیەکی گـەورەی بەکۆڵـەوە بـوو. بـەئارامی بـەدوای یەکدیـدا دڕۆیشـتن. گەیشـتنە دامـێن چـیایەکی شـینباو، کـە زنارەکـانی تیـژو وەك دەمـی تـیخ وابـوون، ماوەیـەك لـەو قەدپاڵـە راوەسـتانو چـاویان بـۆ سـەرەوە هـەڵبڕی، پاشـان دەسـتیان کـرد بەهەڵگـەڕان بەهەورازەکە. وەلی نیشانچی کەوتـە دوایـان. ژنـەکان تـا زیـاتر دەچـوونە پـێش خێراییـان زیاتر دەبـوو. نیشانچـی نەیـدەتوانی بـەپێی ئـەوان بـڕوا، وردە وردە دوا دەکـەوت. کاتێـك خۆر سەر دوندی چیاکەی بەردا ئیدی ژنەکانیش لەدوندی چیاکە لەبەرچـاوان ون بـوون. نیشانچی زیاتر پێی هەڵێنان. خێرا خێرا هەناسەی دەدا، تا هەورازەکە رکتر دەبوو سـنگی ئەویش وەك کوورەی ئاسنگەر زیاتر بەرزو نزم دەبووەوە. لەترسی ئەوەی نـەکا کچـەکەی ون کردبێت، دڵی داخورپا بـوو. بەلاکـەلاك بەبـەردەلانێك هەڵگـەڕاو خـۆی گەیانـدە سـەر ترۆپکی زنارێك. ژنەکان، لەو خوارەوە وەك خۆیان دەڕۆیشتنو هیچ گۆڕانێـك لـەرەوتیان بەدینەدەکرا. یەك بەدوای یەك بەڕیز بەدۆڵێکدا رێچکەیان بەسـتبوو، نیشانچـی غیرەتـی دایە بەرخۆ، لەو بەرزاییەوە بۆ خوارەوە پێی پێوەنـاو خـۆی گەیانـدە سێسـەد هـەنگاوێك نزیکـی ئـەوان. چـوار پێـنج ژن پێکـەوە لەیەککاتـدا ئاوڕیـان لـەدواوە دایـەوە. نیشانچـی راوەسـتا، ماوەیـەك چـاوەڕێ مایـەوە، پاشـان کەوتـەڕێ. خـۆر ئـاوابووو مـانگ دەرکـەوت. لەپشت زنارەکـان، لـەنێو رۆشـناییەك درەوشـانەوەو خزانـە نێـو تاریکیـەوە، هـەزار چـاوی درەوشاوەی پشیلان لـەنێو تاریکیـدا... نیشانچـی هـەموو گیـانی کەوتـە لـەرزین، زنارەکـان لەنێو دڵی تاریکیدا دەریایەك بوون جیاواز، دەریایەکی درەوشاوەو شەپۆلاوی.

بە هەورازێکی سەرەو ژوورتـرو رکتردا هەڵگەڕان. پاشان کـەمێك سـەرەوژێر بوونـەوە، خـۆر دەرکـەوت، کـەمێك خـوارەوەتر، لەسـەربانی خـانووە قووڕەکـانی پێدەشـتێکی نێـو زنـاران، دووکـەڵی سـۆپاکان وەك دارچـەلاکێك بـۆ ئاسمـان بـەرز بووبـووەوە. لـەرووبارێك پەڕینـەوە، زۆربـەی ژنـەکان پێخـاوس بـوون، لەکاتێکـدا کـراسو دەرپـێ فـشو فۆڵـەکانی خۆیان کەمێك هـەڵکردبوو لەئاوەکـە پەڕینـەوە. ئەوانـەی پێڵاویـان هـەبوو پێڵاوەکانیـان

داکەندنو خستیانە نێو سەوەتە گەورەکانی سەرکۆڵیانو تا گەیشتنەوەماڵەکانیان هەر بەپێخاوسی ڕۆیشتن. وەلی نیشانچی بۆ ئەوەی کەنیشکەکە گوم نەکات، بێئەوەی کەوشەکانی دابکەنێت لەڕووبارەکە پەڕیەوە. ژنەکان هەر لەگەڵ ئەوەی گەیشتنەوە نێو دێ پەرتەیان لێکرد، کچەکە چووە ماڵێکی ئەولای دێیەکە. هەمووان لەماڵەکاندا بێدار بووبوونەوە، باوك، دایك، براو خوشکەکان... وەلی نیشانچی لەژێر یەکێك لەدرەختەکانی بەردەم خانووەکە ڕاوەستا. نەدەیتوانی بچێتە پێشو نەدەشیتوانی بگەڕێتەوە. کچەکە چەند جارێك هاتە دەرەوەو نیگاکانیان گرتەیەك، کچە بەردەوام دەڕۆیشتو دەهاتەوەو پێدەکەنی. پاشان دایکی کچەکە هاتەدەر هەندێك شتی گوتو گەڕایەوە ژووری. وەلی لەقسەکانی حاڵی نەبوو. کەمێك دواتر دوو گەنج لەماڵەکە هاتنەدەر، هەر لەگەڵ هاتنەدەر سەیرێکی دەوروبەریان کرد، ئینجا یەکسەر گەڕانەوەو چوونەوە ژووری. دوای ئەوان باوکێکی باڵابەرزی ڕیش سپی کە ڕیشەکەی دەبریسکایەوە هاتەدەر، میهرو خۆشەویستی لەچاوە شینو گەورەکانی دەبیندرا. بەپێکەنینەوە گوتی: "خۆشهاتی میوان، چما لەژێر ئەو درەختە وەستاوی، فەرموو بۆ ژوورەوە!"

"بەختەوەرم، بۆلای تۆ هاتووم".

"فەرموو وەرە ژووری!"

قۆڵی نیشانچی گرتو بردیە ژووریو لەسەر تەخت داینشاند. دایكو خوشكو براکان بەخێرهاتنیان کرد. کچەکەش هاتو بەخێرهاتنی کرد. ئەمجارە بەئاشکرا پێکەنیو گوتی: "بەختەوەرم".

نیشانچیش بەشەرمێکەوە پێکەنی.

کچەکە ڕۆیشتو بەخاولییێك بەسەر شانو قاڵبە سابوونێکی پەمەیی بۆندار بەدەستێكو مەسینەیەکی مسی سپیکراوەوە بەدەستەکەی دیکەوە هاتەوە.

"فەرموو میوان!".

نیشانچی سەری دانەواند، چووە دەرەوە، سابوونەکەی لەدەستی کچەکە وەرگرت، کچەکە بەمەسینەکە ئاوی بەدەستی داکرد. سابوونە بۆندارەکەی کەفاوی کردو دەستو دەمو چاوی شوشت. بەخاولی وشکی کردنەوەو هات لەتەك پیرەمێردەکە دانیشت. سفرەیەك لەنیوەڕاستی ژووری لەسەر کلیمێکدا ڕاخرا. بۆنی پونگەی ئاشی ماست، کە لەنێو قابلەمەیەکی مسی تا ڕادەیەك گەورە بوو، نێو ژوورەکەی پڕکرد. کەوچکی

دارینیان بەکارهێنا، کە بەشێوەیەکی جوان دروستکرابوو. نیشانچی لەهەموو تەمەنی خۆیدا ئاشێکی پونگە ماستی وای نەخواردبوو. هەموو گیانی بۆنی پونگەی گرت. جگە لەوە نانی گەنمەشامی برژاو، بەو ئاشە پونگە ماستە بووبووە خواردنێکی بەهەشتی.

کچەکە دەستوبرد سفرەکەی کۆکردەوە.

لەگەڵ تەواوبوونی نانخواردنی بەیانی لاوەکان وە دەرکەوتن، کچەکەو دایکیشی بزربوون. نیشانچیو باوکە ریشچەرمووەکە بەتەنێ مانەوە. ماوەیەکی درێژ بەبێدەنگی تێپەڕی. هەردووکیان سەریان لەبەر خۆیان نابووەوە. پیرەمێردەکە لەسەر تەختەکە پاڵکەوتبووو تەسبیحە نەوەدو نۆ دانەییەکەی لەکاتێکدا لەژێر لێوەوە نزای دەخوێند، دەژمارد. لەپڕێکدا سەری هەڵبڕی. گۆنا گەشەکانی سوور هەڵگەڕان. بەحاڵەتێکی کە کەمێك نیگەران دەینواند، بەدەربڕینێکی کە بەزەحمەت دەبیسترا گوتی:

"گەنجۆ، داخوازییێکت هەیە بەو سپێدە زووە هاتوویتە ماڵەکەم؟"

"دواکارییێکم هەیە، بەفەرمانی خواو فەرموودەی پێغەمبەر بۆ خوازبێنی کچەتان هاتووم".

"کەسێکت نەبوو بۆ خوازبێنی کچەکەم بنێریت؟"

"هیچکەسم نیە، باوکم، باوە پیرەم، گشتیان بۆ شەڕ رۆیشتنو نەگەڕانەوە. من تازە هاتبوومە دونیا کە باوکمیان بۆ سەربازی بانگکرد. ئەویش نەگەڕایەوە، تەمەنم نۆ ساڵان بوو کاتێك کارتی تەواوبوونی خزمەتەکەی هاتەوە".

"ئاە کوڕەکەم، ئەزیش نۆ ساڵان سەربازیم کرد. باوکم، باپیرم، براکانم هیچکامیان نەگەڕانەوە". ئاخێکی هەڵکێشا: "خوا دەزانێت ئێسكو پروسکیان لەکوێ ماوەتەوە".

گۆنای پیرەمێرد وردە وردە سوورتر هەڵدەگەڕان. فرمێسك لەچاوانی قەتیس مابوون.

"کارەکەت چیە؟"

"ماسیگرم".

"ماسیگریش تەواو وەك سەربازی وایە، سەختە، هەرکەسێك دەچێتە دەریا ناگەڕێتەوە".

"ئەمە کەمێك پڕوپاگەندەیە، یەك کەس لەهەزار کەس کە دەچێتە دەریا رەنگە نەگەڕێتەوە".

"دەبێتە خۆراکی ماسیەکان".

"دەبێتە خۆراکی ماسیەکان".

"کچەکەمت لەکوێ بینیوە؟"

"لەبازاڕدا بینیم، کاتێکیش بینیم ئیدی نەمتوانی بگەڕێمەوەو بڕۆم، هەموو ژنەکان هەستانو کەوتنەڕێ، منیش قاچەکانم هەڵیانگرتم بەدوای ئەواندا هێنامیان. زۆر هەڵمدا بگەڕێمەوە، لێ نەمتوانی. دەتگوت قاچەکانمیان بەچڵ گوریسان گرێداونو رامدەکێشن. شەو داهات. مانگ دەرکەوت. زنارەکان رۆشن بوونەوە. چیاکان بۆلام هاتن. لەهەموو لاوە دەنگەکان گەمارۆیان دام، سەدان دەنگ تێکەڵ یەکدی بوون، زەوی وەکو جۆلانە هەژایە سەریەك، چیاکان بەردەوام هەڵبەزو دابەزیان بوو. ئەمنیش زەندەقم چوو. سایەی ژنەکان لەپێشمەوە دەڕۆیشتو ئەمە هێزی وەبەردەنام دواجار ئەمماڵەم دۆزیەوە".

لێوەکانی پیرەمێرد لەرزین:

"تۆ ماسیگری، هەرکەسێك بچێتە دەریا ناگەڕێتەوە. من چۆن دەتوانم کچەمت بدەمێ، کوڕم؟"

"تۆش کاتێك هاوسەرگیریت دەکرد، باوکی کچەکە نەیدەزانی بچیە سەربازی رەنگە نەگەڕێیتەوە؟"

"دەیزانی".

"باشە؟"

"ئەوانیش ئەوەیان دەزانی کە ئەگەر بچینە سەربازی رەنگە نەگەڕێینەوە".

"ئەگەر پێتخۆش نیە ئیدی ماسیگری ناکەم، بەلەمێکم هەیە، بەلەمێکی گەورە. خانووێکیشم هەیە لەشارۆچکە، لەپەڕگەی ماڵانە. ئەگەر پێتباش بێت هەموویان دەفرۆشمو دێمە ئێرە، لەرۆخ ماڵی ئێوە خانووێك دروست دەکەم. کێڵگەکانی من بەروبوومیان ئەوەندە زۆرە کە ئەگەر سوارێك بچێتە نێو گەنمە شامیەکانم تێیدا ون دەبێت. هەر ریشەیەك لەگەنمەشامیەکان دوو سێ دانە دەگرێت".

"سەیرە... ناوت چیە؟"

"وەلی نیشانچی".

"ئەو نیشانچیە چیە، تۆ هێشتا نەچوویتە سەربازی؟"

"هێشتا نە، هێشتا ناوم نەهاتووە".

"نیشانچی؟ نیشانەچیەتی لەکوێ فێربوویت؟"

"ئەو نیشانچیەیتە لەو جۆرە نیشانچیەتیانە نیە کە تۆ مەبەستە".

"ئەی چ جۆرە نیشانچیەتیە ئەمە؟"

"عەرزی بەحزووری گەورەم بێت، لەشوێنێکی دەریادا دەتواندرێت ماسیێکی زۆر راو بکرێت، ئەگەر وشك ببێتە دەردەکەوێت ئەو شوێنە شوێنێکی باشە، ئەندازەی دەگریت، بەرەو لایەکەی دیکە وەردەسوڕێیتو نیشانەیەك دادەنێیت. ئەوسا ئیدی دەزانیت نیشانەیەك لەوێ هەیە، هەمیشە لەو جێگایەدا کە نیشانە دادەنێیت، لەڕاستیدا ئەو شوێنەیە کە ماسیەکانی لێکۆدەبنەوە. یەکێکیش ئەوەیە کە لەقوولایی دەریادا کەڤرو زناری وا هەن، ئەو زنارانە شوێنگەی باشترین جۆری ماسیەکانن. ماسیگرە شارەزاکان دەتوانن بەیەك نیگاکردنی رووی دەریا شوێنی ژیانو خڕبوونەوەی ماسیەکان دیاری بکەن، ئەوە هەمان ئەو شوێنەی نیشانەکانە. هەر ماسیگرێك کە بتوانێت ئەو جۆرە نیشانانە زیاتر دابنێت، مانای وایە ماسیگرێکی شارەزاو وەستایە. من ببوورە، من من گوتن رەفتاری شەیتانە. لەنێو هەموو ماسیگرەکان ئەو کەسەی کە لەهەمووان زیاتر شوێنی ماسیەکان پێدەزانێت منم".

"یانی دەتەوێت نیشانەدانان وازلێبێنیت؟"

"وازی لێدێنم".

"یانی دەتەوێت بێیتە نێو ئەم زنارانە بژیت؟"

"بەڵێ".

"ئێرە هیچ دەریایەکی لێنیە".

"نیە، دەزانم".

"ئێرە خاكو کێڵگەشی لێنیە".

"ئێوە هەرچۆنێك دەژین....".

"رازیت؟"

"رازیم".

"دەبیە شوانی بزنان".

"دەبم، زۆر حەز لەبزنان دەکەم".

"زۆر باشە، کچەکە رای چۆنە؟"

"ئەمەیان نازانم، لەکوێ بزانم، خوا رووڕەشم نەکات".

"قسەت لەگەڵ کچەکە کردووە؟"

"لەکوێ دەمتوانی قسەی لەگەڵدا بکەم. هێشتا هیچ نەبووە".

"دەتەوێت بانگی بکەم لێیبپرسم؟"

"خۆت دەزانیت".

"کەوابوو، تۆ بڕۆ دەرەوە. هەرکاتێك بانگم کردی وەرە ژوورێ".

نیشانچی چووە دەرێ.

"ئەو کوڕە گەنجە دەناسیت؟"

"نایناسم باوکە، دوێنێ بەیانی هەر بەرامبەرمان بوو. بەدرێژایی ڕێگاش بەدواوەمانە بوو تا ئێرە".

"ئەوت دەوێت؟"

"هەرچی تۆ بێژیت باوکە".

"ماسیگرە. بەلەمیشی هەیە. لەشارۆچکە خانووی خۆی هەیەو خانووەکەشی باخچەی هەیەو رەزو باخو کێڵگەی پڕ بەرهەمو بەپیتو بەرەکەتی لەگونددا هەیە. وەك دەڵێت کێڵگەی گەنمەشامیەکانی بەشێوەیەکە ئەگەر سوارێك بچێتە نێویەوە بەچاو نابیندرێت. ئەوەندە بەروبوومی هەیە. ئێستا ئەو داوای تۆ دەکات. رات چیە؟"

"هەرچی تۆ بێژی باوکە".

"ئەگەر ئێمە بمانەوێت بەلەمو خانووو کێڵگەکانو هەموو شتێکی دەفرۆشێت، دێتە ئێرە نیشتەجێ دەبێت. پێدەچێت منداڵێکی باش بێت کچم".

"هەرچی تۆ بێژی باوکە".

"خراپ عاشق بووە، بەیەك نیگا بەدڵێك نا بەسەد دڵ عاشقت بووە".

"بەیانی بینیمی. ئیدی بەرامبەری ئێمەی بەرنەدا، بۆتە عاشق".

"بێژە کچم، ئەو کوڕەت دەتەوێت کە عاشقت بووە؟"

کچەکە سوور سوور هەڵگەڕا، سەری بەنیشانەی رازیبوون نەوی کرد.

"ئێستا کە رازیت بڕۆ براکانت بانگ بکە".

کچەکە بەدوای براکانیدا چوو کە لەنێو چیمەنەکانی ژێر درەختی پشت ماڵێ دانیشتبوون.

بە شەرمێکەوە بانگیکردن: "باوکم کاری پێتانە". خەریکبوو دەلەرزی. لەتەك نیشانچی کە لەسەر بەردێکی ژێر درەختێکی گەورە دانیشتبوو، تاوێك بێدەنگ بووو

گوتی: "بوو". پاشان پێکەنیو وەڕێکەوت. مشتومڕی باوكو كوڕەكان لەژوورێدا درێژەی كێشا.

"تۆ چۆن دەتوانیت کچەکەت بدەیتە کەسێك کە یەکەمجارە دەیبینیت؟"

"من یەکەمجار نیە ئەو کەسە دەبینم، لەئەزەلەوە دەیناسم".

"چۆن دەیناسیت باوکە؟"

"کچەکە خۆی دەیەوێت، کارم بەشتەکانی دیکەشەوە نیە، با کچیشم بیت، خۆ فەرمانڕەوای دڵی نیم،".

پاشان لەبارەی عیشقی ئاگرین قسەی بۆ کردن. کوڕەکان زۆر کەوتنە ژێر کاریگەری قسەکانی باوکیان، گوتیان: "تۆ چۆن پێتباشە باوابێت باوکە".

"بڕۆن بانگی ئەو لاوە بکەن بابێت".

بانگیانکرد. نیشانچی پێی نایە ژووری، دەمی تا بناگوێی کرابووەوە، سەراپا چاوەڕوان بوو. پیرەمێردیش داوای لێکرد دابنیشێت.

"ئەو کارانەی دەتەوێت بیانکەیت بیانکە کوڕم. قسە لەگەڵ سوڵتانیش بکە، هەرکاتێکتان پێباش بوو زەماوەندەکە وەڕێبخەن. بەمن بڵێ لێرەبێت یان لەشارۆچکە. ئەگەر بتەوێت لێرە بمێنیەوە، دەبێت بزانم تا دەست پێبکەم".

"گەرەکمە لێرە بمێنمەوە".

"ئێرە هەموو لایەکی بەردەڵانو ڕەقەنە، لەسەر ئەو کێوانە دێهاتێکی زۆر هەن، هەمووشیان لەنێو بەردەڵانو زناران دان".

"لێرە دەمێنمەوە".

"ئێمە نیوە برسیو نیوە تێرین".

"گەرەکمە لێرە بمێنمەوە".

"ئەو نێوە هەموو غەریبەن، غەریبایەتی ئەستەمە، زۆرترین ئەو کەسانەی دەچنە غەریبایەتی ناگەڕێنەوە. ئێمە گەنمەشامی لەبستەخاکێك کە خۆمان دەیبەین لەنێو زنارەکان هەڵیدەڕێژین دەچێنین".

"دەمێنمەوە.

"باشە، چدەڵێیت؟"

"منیش بەتوورەکان خۆڵ دەبەمو لەبستە خاکێکدا گەنمەشامی دەچێنم".

"خۆت دەزانیت".

چوونە دەرێ، خانووەکە لەلای سەرەوەی زەوییێکی هەموارو پانەگۆڕ، نزیك زنارێکی یەکپارچە دروست کرابوو. دارگوێزی گەورە گەورە لەنێوان ماڵەکەو زنارەکان، تا ترۆپکی زنارەکان هەڵکشابوون‌و لق‌و پۆپ‌و گەڵاکانیان خانووەکەیان داپۆشیبوو.

"لەو زەویەدا دەتواندرێت چەند خانوو دروست بکرێن؟"

نیشانچی بەنیگاکانی دەوروبەری بەسەر کردەوەو گوتی: "پێنج خانوو".

"کەوایە سوڵتان لەگەڵ خۆتدا ببەو شوێنی خانووەکەتان دیاریبکەن".

پیرەمێرد لەگەنجەکە دوورکەوتەوەو رۆیشت.

ئەو رۆیشت، کەمێك دواتر سوڵتان هات.

گۆناکانی سوڵتان سوور هەڵگەڕابوون‌و سەری دانەواندبوو.

"سوڵتان، چاوێك بەو نێوەدا بخشێنەو بێژە خانووەکە لەکوێ دروست بکەین".

سوڵتان سەری دانەواند، بەرەنگێکی سوورهەڵگەڕاو رۆیشت‌و چووە ژێر سێ درەختەکە راوەستا، کە لق‌و پۆپەکانیان تا سەر زنارە گەورەکەی نێوەڕاست کە رەگی سوورباوی هەبوون کشابوون. سەری هەڵبڕی‌و بۆلای نیشانچی وەسووڕا. دڵی نیشانچی کەوتە تەپەتەپ. دەست‌و پێی گۆدبوون. گوتی: "ئێرە".

نیشانچی بیریکردەوە، دەنگی لەخۆیشی جوانترە، سەری لەگێژەوە چوو. لەوێ لەشوێنی خۆیدا رەقهەڵاتبووو بەتاسەوە سەیری سوڵتانی دەکرد. عەشق‌و شەیدایی هەموو گیانی داگرتبوو. نەیدەتوانی وەها پەرجوویێك باوەڕ بکات.

چاوانی گەورەو شینی کە بەقووڵی دەیانڕوانی. گەردن درێژ وەکو گەردنی قاز. قژێکی بۆری گروازەیی، نێو چاوانێکی پان، پەنجەی راکشاو بەژنێکی باریك‌و درێژ. نیشانچی لەسەیرکردنیدا تێر نەدەبوو.

سوڵتان دووبارەی کردەوە: "ئێرە".

نیشانچی نوقمی خەون‌و خەیاڵی ئەو پەرجووە بووبوو.

سوڵتان دەنگی هەڵبڕی: "ئێرە، ئێرە".

نیشانچی هاتەوە سەرخۆی. حەپەسانەکەی نەما:

"ئێرە کوێیە؟"

سوڵتان بەشادمانیەوە پێکەنی:

"ئەو شوێنەی کە بڕیارە خانووی لێدروست بکرێت".

نیشانچی سەیری هەرچوارلا، درەختە گەورەکان‌و زنارە ساف‌و لووسەکانی خوارەوەی کردو گوتی: "ئێرە".

پیرەمێرد لەژێر درەختەکانی بەرامبەر ماڵێ راوەستابووو چاوەڕێی ئەوان بوو.

"پەسندتان کرد؟"

"پەسندمان کرد".

"سوڵتانیش پەسندی کرد؟"

نیشانچی تەماشەیەکی راست‌و چەپی خۆی کرد، سوڵتانی نەبینی. سوڵتان چووبووەوە ماڵێ.

گوتی: "هەردووکمان.." پاشانیش گوتی: "خوا حافیز باوکە، من دەڕۆم".

پیرەمێرد بەسەرسوڕمانەوە گوتی: "پەلەی چیتە. ناتەوێت بزانیت ناوم چیە، من ناوم — موسلیم - ە، لەم دەڤەرە پێمئێژن ساری موسلیم".

گەڕایەوە ماڵی. سوڵتان لەبەردەم دەرگاوە بوو". خواحافیز سوڵتان سڵاو بگەیەنە بەدایك‌و براکانت. من هەر کە بەلەم‌و خانوو کێڵگەکانم فرۆشتن دێمەوە".

وەرسووڕاو بەبزنەڕیکەوە وەڕێکەوت، بەسەر بەردەکاندا بەلێ لێ‌و لۆ لۆ گوتنەوە رێی خۆی گرت‌و رۆیشت.

کاتێك گەیشتەوە شارۆچکە، کە خۆر خەریکبوو هەڵدەهات.

بەلەمەکەی نوێ‌و رێکوپێك بوو، کڕیاری زۆر هەبوون. بەبرادەرەکانی خۆی گوت دەیەوێت خانووو بەلەم‌و کێڵگەکانی بفرۆشێت. برادەرەکانی گوتیان شێت بووە. بەلەم بێڕاوەستان فرۆشرا. خانووە دوو نهۆمیەکەی تەختەبەندو جوان بوو. خانووەکەش لەماوەی هەفتەیەکدا فرۆشرا. پارەیەکی زۆری بۆ کێڵگەکانی داوادەکرد. کڕیارەکان پێی خۆیان چەقاند. لەکاتێکدا کە نیشانچی لەبێقەراریدا خەریکبوو دەمرد، کێڵگەکانی فرۆشتنە ئەو کەسەی کە لەهەمووان زیاتر پارەی پێداو کەوتە رێ. لەبەردەلانە رەقەنەکاندا وا بەخێرایی دەڕۆیشت، کە ئەو دەمەی گەیشتەجێ ماوەیەك وڕوکاس بوو.

ساری موسلیم ماوەیەك بوو وەستاکارو دارتاشەکانی ئامادە کردبوون. خانووەکەیان لەماوەی سێ مانگدا لەسەر ئەو پارچە زەویەی بەرامبەر سێ درەختەکە دروست کرد. وەلی نیشانچی بۆ ئەوەی خانووەکە زووتر تەواوبێت ئەوەندە کاری کردو خۆی ماندوو

کرد، شەنگی لەبەر نەمابوو. کاتێك خانووەکە تەواو بوو سێ شەوان‌و سێ رۆژان لەسەریەك نەیتوانی لەنێو جێ بێتەدەر. کاتێکیش لەنێو جێ هاتەدەر، زەماوەندەکە وەڕێخرا، خەڵکی هەموو دێهاتەکانی ئەو کوێستانانە بۆ سەر زەماوەندەکە بانگهێشت کرا. بەتواناترین کەمانچە ژەنەکان، سەما کارەکان، ستڕانبێژەکان، یۆنانیەکان، لازەکان، گورجی‌و چەرکەسەکان هاتن، میواندارییەکی شکۆدار بوو. میواندارییەك کە بووە وێردی سەرزاران.

ئەو زستانە بارانێکی باش باری. سێڵاو لەنێو زنارەکان راسان‌و تاشە بەردی گەورە گەورەیان لەگەڵ خۆ بۆ دەریا راماڵین. ئەو خاکەشیان راماڵی کە لەنێو زنارەکان گەنمەشامیان لێچاندبوون‌و بردیانە نێو دۆڵەکانی خوارێ، بەهار داهات، سەبەتەکانیان خستنە سەرکۆڵیان‌و پیرو لاو بەرەو بیابانەکان کەوتنەڕێ.

سوڵتان‌و داکیشی بێسەرو سەدا سەبەتەکانی خۆیان هەلگرت‌و رەگەڵ ژنانی گوند کەوتن.

ژنەکان ئارام ئارام لەکاتێکدا لەژێر کۆڵەبارەکانیاندا شەلاڵی ئارەقە بووبوون بەزنارە لووسەکاندا هەڵگەڕان. مام موسلیم لەگەڵ نیشانچی لەزەویە هەموارەکە لەسەر بەردێك دانیشتبوون‌و چاوەڕێی سوڵتان‌و دایکیان دەکرد. گەنجەکانی ئاوایی چووبوونە شارۆچکەکەی لێوار دەریا. ژنەکان کە دەمەدەمی بەیانی وەڕێکەوتبوون، یەك دوای یەك بەڕێدا دەڕۆیشتن. لەشوێنێکی کەمێك خوارەوەتر لەیەك جیابوونەوە. سوڵتان‌و دایکیشی بۆ زەویە هەموارەکەی خۆیان رۆیشتن. مام موسلیم هەستایە پێ. سەبەتەی سەرشانی ژنەکەی وەرگرت‌و لەسەر تاشەبەردێکی سافدا بەتاڵی کرد. سوڵتان بەسەبەتەیەکەوە کە لەژێریدا داهاتبووەوە لەولا راوەستابووو چاوەڕێی یارمەتی دەکرد. نیشانچی هاتەوە سەرخۆی‌و تاوی دایە خۆو سەبەتەکەی لەسەر پشتی هاوسەرەکەی هەلگرت‌و بەتاڵی کرد. بۆنی ئارەقەی جەستەی سوڵتان هێنایە جۆش، زۆریش شەرمی دەکرد.

سوڵتان‌و دایکی هەرکە سەبەتەکانیان لێوەرگیرا یەکسەر وەرسووڕانەوەو بەڕێچکەکەدا رێیانگرت. لەگەڵ ژنانی دیکە هێڵێکی درێژیان بەهەورازکەدا دروستکرد.

نیشانچی گوتی: "باوکە، دەبێت سەبەتەیەکی دیکەش پەیدابکەین بۆ ئەوەی لەکۆکردنەوەی بەروبوومەکاندا لەگەڵ سوڵتاندا کاربکەم".

موسلیم گوتی: "نابێت".

نیشانچی گوتی: "ئاخر بۆ مەگەر مخابن نیە بۆ سوڵتان؟"

موسلیم گوتی: "نە، ئەمە نەریتە".

نیشانچی گوتی: "ئەو نەریتە باتێبکدەین".

موسلیم گوتی: "نابێت".

"نیشانچی گوتی: "دەبێت".

"هیچکەس ئەو تاقەتەی نیە ئەمە کاری ژنەکانە".

"پیاوەکانیش دەتوانن ئەو کارە بکەن".

"نابێت".

"بۆچی؟"

"لەبەرئەوەی کە خۆت دەزانیت سێ کوڕم هەن".

"هەتن، خوا بیانهێڵێت بۆت".

بەمزووانە هەرسێکیان دەبەنە سەربازی. لەهەر ماڵێکی دیکەشدا کە سێ کوڕی ناویان بۆ سەربازی هاتبێت دووانیان دەبەن. لەم چیایانەدا زۆر گوێ نادەنێ، حەزیان لێبییێت هەرسێکیان پێکەوە دەبەن. من نۆ ساڵان لەبیابانی یەمەن سەربازیم کرد. لەوانەی چوون هیچیان نەگەڕانەوە، تەنێ من هاتمەوە، منیش چونکە لەشوێنێکی چیایی بووم کە پێیاندەگوت تاییف، توانیم گیانی خۆم دەرباز بکەم. کوێستان بوو. تۆش بەمزووانە دەچیە سەربازی، ئەوسا هەموو ساڵێ کێ ئەم کارە بکات؟ ئێوەش لەدەریاکانو نێو باغو کێڵگەو ئاسنگەریکردنەکاندا ژنانی واتان هەن کە کار بکەن؟"

"ئۆووە، زۆر".

"بۆچی؟"

"غەریبی، سەربازی".

نیشانچی لەشوێنی خۆی وشك بوو. دەتگوت خەنجەرت لەدڵی داوە، دڵۆپە خوێنێکی لێنایە.

"باوکە من دەچمەوە ماڵێ".

"بەخێرچیت".

نیشانچی زۆری نەمابوو بداتە پڕمەی گریان، بەلاکەلاك بەرەوماڵ بووەوە، لەم بەردو ئەوبەردی بەردەمی هەڵدەنگوتو هەر ورتە ورتی بوو لەگەڵ خۆیداو دەیگوت: بەرگە ناگرم، نا، ناتوانم ئەم رەوشەی سوڵتان بەرگە بگرم. من سوڵتان لەگەڵ خۆمدا دەبەم لەم چیاو ئەم دۆزەخەی ناهێڵم.

هاتەوە ماڵی خۆی. تا دەهات ئازارو خەفەت زیاتر چنگی لەدڵی گیر دەکردو ئەو ئازارە تا دەهات گەورەتر دەبوو. خۆی پێڕانەگیراو چووەوە نێو زەویە هەموارەکە.

"باوکە سەبەتەیەکم بۆ پەیدا بکە، ئەمنیش لەگەڵ سولْتان".

"پێمگوتی نابێت".

زستانو بەهار هاتنو تێپەڕین. سێلاو گلو خاکی زەویە هەموارەکانی نێو زنارەکانی لەگەڵ خۆ راماڵیو لەپێدەشتەکان بەردو شیوو زەویە نزمەکانی پێداپۆشین.

ژنانی سەبەتە بەکۆڵ لەچیاکان داکشانەخوار، سەبەتەکانیان پڕکرد لەگڵو بۆ سەرەوەیان بردنەوە، ئەو رەوشە ئاوا درێژەی کێشا. نیشانچی لەگەڵ سەبەتەکەی پڕ لەگڵی سەرشانی سولْتان راهات. ئەگەرچی نەیدەویست ئەو بەو شێوەیە ببینێت، کەچی لەگەڵی راهات. لەو ماوەیەدا یەکەمین منداڵیان چاوی بەدونیا هەڵێنا، نیشانچی زۆر خۆشحاڵ بوو. زارۆیەك بوو بەقژێکی بۆر. چاوانی شینو جەستەیەکی پتەوو خڕو پڕ. نیشانچی لەوەی کە یەکەمین منداڵیان کوڕ بوو لەخۆشیان لەپێستی خۆیدا جێی نەدەبووەوە. ساڵو نیوێك دواتر کوڕی دووەمیان هاتە دونیا. نیشانچی قوربانیو ئاهەنگو خۆشی بۆ گێڕا. لەهاتنە دونیای سێیەمین کوڕدا دەرفەتی قوربانیو ئاهەنگو شادی نەمابوو، جەنگ هەڵگیرسابوو. ئەوو هەرسێ براکانی سولْتانیان راپێچی بەرەکانی جەنگ کرد، لەدوای خۆیدا پەنجاو شەش بزن، کێڵگەیەکی نێوان زەویە هەموارەکانی نێو زنارەکان، دوو کەسی پیرو ژنو سێ کوڕی جێهێڵان. جیابوونەوە لەسولْتان، بەلای ئەوەوە لەهەموو جیابوونەوەکان سەختتر بوو. دەڕۆیشت کە ئیدی نەیبینێتەوە. گەڕانەوەو مەڕانەوە لەگۆڕێ نەبوو.

لەسێ وڵاتی جیا بەشداری لەسێ جەنگدا کرد. زۆربەی دۆستەکانی لەنێو لمی داغی بیابانەکاندا گیانیان لەدەست دا. لەیەمەن لەگەڵ سێ لەهاوڕێکانی لەسەربازی رایکرد. ئەو سێ هاوڕێیەشی لەنێو لمی سووری بیابان لەدەست دا. دوای چەندین ساڵ. لەیەکێك لەنیوەشەوەکان گەیشتەوە ماڵیو لەدەرگای دا. کەمێك دواتر، سولْتان لەکاتێکدا بۆڵەبۆڵی بووو چرایەکی بەدەستەوە بوو هات دەرگای کردەوە.

ئەوی نەناسیەوە، گوتی: "بەخێرهاتی برا، میوانی بەهەرحاڵ، فەرموو!" هەر سێ کوڕەکانی هەستانەوە. هەرسێکیان بووبوونە سێ کوڕە لاوی بەرکەفتی، سێ کوڕە گەنجی بەوەج، قژبۆر، چاوشینو باڵابەرز بوون. نیشانچی لەماوەی یازدە ساڵدا ئەمە یەکەمجار

بوو تا ئەو رادەیە خۆشحاڵ بێت. تەنانەت ئەو دەمەی گوللە تۆپەکانی بەدەوروبەر کەوتبوون و لەهەموو ئەو تیپە سەربازەی کە پێکەوە بوون تەنها ئەو گیانی بەسەلامەت دەرکردبووو ئەوەندە خۆشحاڵ نەبووبوو. نەیدەتوانی چاو لەسەر سوڵتان و کوڕەکانی هەڵبگرێت. نەیتوانی حاڵی خەسووو خەزووری لەسوڵتان بپرسێت، نزیکەی بەرەبەیان سوڵتان خۆی بۆی باسکرد.

سوڵتان لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر گۆڕابوو، جوانیەکەی جارانی لەدەست نەدابوو. هیچکام لەبراکانی لەسەربازی نەگەڕابوونەوە، کارتی کوژرانیان هاتبووەوە، باوکیان کاتێك کارتی کوژرانی سێیەمین کوڕی بۆ هاتبووەوە، ئیدی بەرگەی نەگرتبووو مردبوو.

نوقمی نێو پڕجۆش و خرۆشترین شادی بوو. لەو ماوەیەدا بزنەکانی بردنە لەوەڕاندن. بزنەکان زیادیان کردبوو. هیچ گرفتێکی نەهاتەڕێ. لەو دەمەی کە لەسەربازی رایکردبوو هیچکەس بەدوایدا نەهاتبوو، نە ئەفسەر، نە سەربازو نەهیچکەسی دی. دەتوانین بڵێین شەڕو جەنگ سەربازی لەبیرکردبوو رۆژگارێکی خۆشی هەبوو. لەتەماشاکردنی سوڵتان تێر نەدەبوو. سوڵتانی بۆ گواستنەوەی خاك لێرەو لەوێ نەدەنارد. نەیدەهێشت لەکێڵگەی نێو زنارەکاندا گەنمەشامی بچێنێت. سەودای دەکرد. دارگوێزی گەورەو رەگاژۆیشی هەبوون.

لەپڕ هەواڵی هەڵگیرسانەوەی جەنگ گەیشت. بەتەواوی جەنگی لەبیرچووبووەوە. یەکەم کوڕە گەورەکەیان برد. دواتر کوڕی دووەم و دوای ئەوانیش سێیەمینیان. لەو سێ کوڕەی سێ نەوەی بۆ بەجێمابوون. کاتێك کارتی کوژرانی هەر سێ کوڕەکانی هاتەوە، هەر سێ بووکەکان منداڵەکانیان دایە سوڵتان و چوونەوە گوندەکانی خۆیان. سوڵتان بەمانگان وشەیەك چیە لەدەمیەوە نەبیسترا. وەکو خەواڵوان لەخەوێکی درێژ درێژەی بەژیان دا.

سوڵتان کە دواتر هاتەوە سەرخۆی، گوتی: "با بزنەکان بفرۆشین و بچینە شارۆچکە، ئێرە هیچ خێرو بەرەکەتێکی بۆ ئێمە نەبوو". لەماوەی چەند مانگێکدا بزنەکانیان فرۆشت و چوونە شارۆچکە.

ئاوارەو بریندارەکان شارۆچکەیان پڕکردبوو. هەژاری و بێدەرەتانیەکی ترسناك وڵاتی گرتبووەوە. دەنگۆیەکی تەکاندەرانە کەوتبووە نێو خەڵکەوە: یۆنانیەکان، هەموو ناوچەکەیان چۆڵ کردووەو چوونەتەوە یۆنان، خانوو، کێڵگەو دێهاتەکانیان جێهێڵاوەو چۆڵ و هۆڵ ماونەتەوە، حکومەتیش ئەو خانووو کێڵگەو زەوی و زارانە دەداتە ئاوارەکان.

نیشانچی گوتی: "بابڕۆین، دەڕۆین لەیەکێك لەدێهاتەکانی لێوار دەریا بۆ خۆمان خانوویێك پەیدا دەکەین. من بەلەمێك دەکڕمو راوەماسی دەکەم. زەویشمان دەدەنێ. دەبێت باخچەیەکی گەورەشمان لەپێش ماڵێ هەبێت، نیوەی دەکەینە گوڵو لەنیوەکەی دیکەشدا سەوزە دەڕوێنین".

بەدرێژی لەو بارەیەوە قسەیان لەگەڵ یەك کرد، سوڵتان هەرچەندە دەیگوت بڕۆین، هەرگیز نەیدەتوانی مردنی کوڕەکانی باوەڕبکات. مسۆگەر کوڕەکانی دوای ئەوەی کە جەنگ کۆتایی هات دەگەڕێنەوە ماڵێو کاتێك دەبینن ماڵەکە چۆڵە، وا دەزانن دایكو باوکیان مردوون، خوا دەزانێت بۆ کوێ دەچن.

"بەڵکو بشیانەوێت بەدواماندا بگەڕێن، بۆ دۆزینەوەمان شار بەشار دەگەڕێن، مخابن نیە بۆ منداڵەکانمان؟"

نیشانچی، رەنگبێت بۆ جاری یەکەم بێت لەکاتێکدا ئازار دڵی پارەپارە دەکرد بەقسەی سوڵتانی نەکرد. وەڕێکەوتن، دوای ئەوەی کە دوو سێ رۆژ بەڕێوەبوون. گەیشتنە گوندێك. گوندەکە لەلێواری دەریا بوو. چۆڵ چۆڵ بوو. لەخانوویێکی دوو نهۆمی بەرووکارێکی رەنگاورەنگو باخچەیەکی گەورە نیشتەجێ بوون. لەلای خوارەوەی خانووەکە بەلەمێکی تا رادەیەك گەورە بەجێمابوو. بەوردی بەلەمەکەی پشکنی. نوێ نوێ بوو. دەتگوت دەریای بەخۆوە نەبینیوە. منداڵەکانیش بەو خانووە خۆشحاڵ بووبوون.

سوڵتانیش خانووەکەی پێخۆش بوو. دوای ئەوەی کە چەند جار گۆشەو کونو کەلێنەکانی خانووەکەی پشکنینو سەری پێداگرتن، هات لەنێوەڕاستی هۆڵەکە راوەستا:

"باشە، جوانە، ئینشاڵلا گوند هەروا بەچۆڵی نامێنێتەوە".

"چۆڵ نامێنێتەوە. دوو رۆژ نابات هەموو خانووەکان پڕ دەبن لەخەڵك. نابینیت رێوبانەکان پڕن لەخەڵکی ئاوارەو کۆچبەر، خەریکن بەدوای گوندو خانوویێکدا دەگەڕێن تا لەو رەوشە دەربازیان ببێت".

"حکومەت لەو خانووانەمان دەرناکات؟ ئەو بەلەمە جوانەت لێناستێنێت؟"

"نایستێنێت".

"بۆ نایستێنێت؟"

"ببینە سوڵتان، من باوکی سێ شەهیدانم ببینە، کارتی شەهید بوونیشیانم پێیە".

"کاتێك کوڕەکانمان بێنـەوە گونـد. چۆن دەتـوانن ئێمـە لێـرە بدۆزنـەوە؟ دامانـا لەشارۆچـکەش بماندۆزنـەوە، خـۆ ئـەم دێیـە پێنـازانن و ناویشیان نەبیسـتووە، چـۆن چۆنی بماندۆزنەوە؟"

"سوڵتان کارتی شەهید بوونیان هاتۆتەوە".

"تۆش دەست هەڵناگریت هەر دەڵێیت کارتی شەهیدبوون کارتی شـەهید بـوون. لـەوێ بەو هەموو لەشکرە کە زەوی لەژێر پێیاندا ناتوانێت خۆی رابگرێت، کێ دەزانێـت ئەوانـە مردوون تا کارتی شەهیدبوونیان بۆ ئێمە بنێرنەوە، پێمبڵێ!"

ئەو رۆژەی کارتی شـەهیدبوونیان هـاتبووەوە سـوڵتان شـیوەن و ناڵـەی زۆری کردبـووو لەغەم و خەفەتی ئەو کۆستە گەورەیـەدا زریکانـدبووی و خـۆی رنانـدبووەوە، زیڕانـدبووی بەچەشنێك کە باڵندەکانیش لەبەر ئەو زریکەیە لەلانەکانیان هەڵفڕیبوون.

پاشـان، هەفتەیـەك یـان دە رۆژ دواتـر سـەردولکەو ئـاهو فیغانـەکانی سـوڵتان لـەپڕ کۆتاییان هات و بزە کەوتەوە سەرلێوانی. دەتگوت ئەو ژنە نیە کـە چـەندین رۆژی لەسـەر یـەك بێپسـانەوە هـەر شـیوەن و ناڵـەی دەکـردو هـاوارو زریکـەکانی نەدەپسانەوە. هێـور بووبووەوەو هەموو شتێکی فەرامۆش کردبوو.

ئەو ژنە چی بەسەرهاتبوو، نیشانچی لەکۆنجکۆڵیان خەریك بـوو دەمـرد، لەکاتێکـدا کـە سـوڵتان رۆژ بـەڕۆژ وەك ئـەوەی هیچشـتێك روویـنـەدابێت ورەو مـۆراڵی تـا دەهـات باشتر دەبوو.

کاتێـك نیشانچـی کـۆتکێکی گـەورەی کـە لـەداری کـاژ دروسـتکرابوو لـەئاوی کانیەکـە پڕکـرد بـوو خـەریکبوو دەهـات، سـوڵتان چـوو کۆتکەکـەی لێـوەرگرت و بردیـە ژووری و گەڕایەوە. قریت قریت پێدەکەنی. لـەم سـاڵانەی دواییـدا نیشانچی تەنانـەت یـەکجاریش ئەوی ئاوا خۆشحاڵ نەبینیبوو.

"تۆ دەتگوت عوسمانی سوپایەکی هەیە کە زەوی خۆی لەبەرناگرێت؟"

"بەڵێ".

"ئەو لەشکرەی تۆ دەیڵێیت چەند کەسە؟"

"بەئەندازەی لمی دەریاکان دەبێت لەشکری عوسمانی...".

بەئەندازەی لم، بەڵێ؟"

"بەڵێ".

"زۆرباشە، وەلی نیشانچی تۆ سەیر بکە ئەو هەموو سەربازە چۆن زانیان کوڕەکانی مـن مردوون‌و کارتی شەهیدبوونیان دۆزینەوەو بۆتیان ناردنەوە؟"

نیشانچی وەڵامێکی پێنەبوو، بێدەنگ بوو.

شارۆچکەکە نزیـك بـوو، بـەڕاکردن رۆیشـت‌و قـاپ‌و هێربـاری بـۆ خـۆی‌و منداڵـەکان‌و نـوێن‌و مێـزو کورسـی، رەنگـی بەلـەم فلچـەو مـافووری کـڕین. بەسـتەیەك شـەکرۆکەی ئاونەباتیشـی بـۆ منداڵـەکان کـڕی. داشـقەیەکی پەیـداکردو هەرچـی کڕیبـووی بـاریکرد. سەرێکی لەبازاڕیش دا، دروست وەکو بازاڕی شارۆچکەکەی خۆیان بوو، نـان، سـەوزە، رۆن، شەکروچا، هەرچی پێویست بوو کڕی‌و لەتەك داشقەچیەکە دانیشت‌و هاتەوە ماڵێ.

سـوڵتان زۆر رای لەنوێنـــەکان بـــوو. خواردەمەنیـــەکانی بردنـــە چێشـــتخانە، لـــەنهۆمی خـوارەوەی خانووەکـە ژوورێـك پڕبـوو لەچـیلکەدارو ئاگریـان کـردەوە، تکـە گۆشـتەکانیان لەسەر پۆلووەکان برژاند. زووتر لەکاتی ئاسـایی چـوونە نێـو جێگاکانیـان، بـەڵام نـەیانتوانی بنـوون. نیشانچـی تـا بـەیانی دڵـی لـەدڵی دا، رەنگبێـت ئـەوەی سـوڵتان دەڵێـت راسـت بێـت، لەشەڕو سەربازیدا زۆر رووداو دەقەومێن‌و دێنـە پـێش. سـەربازانێکی وا هەبوونـە کـە دوای هاتنـــەوەی کـــارتی کوژرانیـــان، تەنانـــەت دوای ئـــەوەی هاوســـەرەکانیان شـــوویان کردبـــووەوە، هاتوونەتەوە. بۆچی نابێت منداڵەکانی ئێمەش بگەڕێنەوە؟ نیشانچـی بـۆ یەکـەمینجار دوای هاتنەوەی کارتی کوژرانی کوڕەکانی، بزە کەوتە سەرلێوەکانی. سوڵتان لەوە بێئاگا نەبوو.

"چیە وەلی نیشانچی، من لەم ساڵانەی دواییدا هیچکات نەمبینیویت ئاوا خۆشحاڵ بیت؟"

وەلی نیشانچی گوتی: "کوڕەکانمان دێنەوە".

"لەخەوتدا بینیت؟"

"لەخەومدا نەمبینوە، دەزانم".

"هەواڵێکت بیستووە، ئەی بۆچی تا ئێستا بەمنت نەگوتووە؟"

"هیـچ هەواڵێکم نـەبیستووە، چـونکە مـن خـۆم لەسـەربازی رامکـردووەو خـۆم دەربـاز کردووە، بۆچی ئەوانیش نەتوانن رابکەن. کێ دەزانێت ئێستا بەکام کێوێکەوەن؟"

"هەڵبەتە وایە، کێ دەزانێت ئێستا لەکام کێودا خۆیان قایم کردووە؟"

"زۆرێـــك لەســـەربازەکان یەکـــەمجار کـــارتی کوژرانیـــان هاتۆتـــەوەو پاشـــان خۆیـــان هاتوونەتـەوە. لەشارۆچـکەکەی خۆمـان کـارتی کـوژرانی دوو لـەکوڕەکانی سـەرۆك عـەلی دورسون پێکەوە هاتنەوە. سەرۆك عـەلی دورسـون سـەرۆکێکی باشـی ماسـیگرانە، پیـاوێکی

باشـە. مـن ماسـیگرتن لـەو فێربـووم. نـاخی حـەوت دەریـای دەناسـین. کاتێـك سـەیرێکی لەدەریا دەکرد دەیزانی ئەو شوێنە ماسی تێدایە یان نا، یان چەند ماسیو چ جۆرە ماسی تێدایە. هەرکە کارتی کـوژرانی کـوڕەکانیـان بـۆ خوێنـدەوە جەڵتـە لێیـداو ئیـدی هـەرگیز نەیتوانی لەجێگادا هەستێت. هەردوو بووکەکانی مێردیان کردەوە. پاشـان رۆژێـك بینـیم شـەهیدەکانمان زیندووبوونـەوە، شارۆچـکە هەژایـە سـەریەك. سـەرۆك عـەلی دورسـونیش لەگەڵ بینینی کوڕەکانی هەرچۆنی بوو هەستایە سەرپێو لەگـەڵ هەسـتاندا کەوتـەخوار، دڵی راوەستاو مرد. ئەو جۆرە سەربازانە کەم نین، ئەوانەی کە چەندین مانگـو چـەندین ساڵ دوای ئەو کارتە هاتوونەتەوە".

"پێمنەگوتی، منداڵەکانی ئێمەش دێنەوە".

نیشانچی بەخۆشحاڵیەوە گوتی: "دێنەوە".

تـا ئـەوان زیـاتر قسـەیان دەکـرد منداڵـەکان لەدەوریانـدا دەخولانـەوەو یـاریی سـەیر سەیریان دەکرد.

سـولتان گرتنیــە بــاوەشو گــوتی: "بوەســتن! بوەســتن منداڵینــە، بڕیــارە باوکــەکانتان بگەڕێنەوە".

منداڵـەکان گوێیــان بەقسـەی نـەنکیان نـەداو بـەردەوام بـوون لەســەر یاریکردنیــان، نیشانچی هەرسێکیانی پێکەوە گرتە باوەش:

"سەیربکەن باوە گەورەتان چیی بۆ هێناون!"

بەستەبەندیەکەی کردەوە، نوقڵە نەباتیەکانی بەسەردا دابەشکردن، منداڵەکان بـەرەو لێـوار دەریـا پێیـان پێوەنـا، پشـتیان بەزنارێکـەوەنا، لەسـەر لمـەکان دانیشـتن، نوقڵـەکانیان لەبەرکیان هێنانەدەرو پێشبڕکێی مشتنی نوقڵەکانیان دەست پێکرد.

باپیریشـیان بەیارمـەتی سـولتان بەلەمەکـەی لـەماڵێ دەرهێنـاو بردیـە سـەر لمـەکانو دەستیکرد بەهەڵکەندنی پەڵە رەنگە درز بردووەکان.

بەلەمێکی نـوێ نـوێ بـوو، رەنگـی هەنـدێك شـوێنانی تێکچووبووو درزی دابـوو، دوای ئـەو پاککردنەوەیـە بڕیـار بـوو بـەیانی رەنگـی بکاتـەوەو دوو رۆژ دواتـر بچـێتە دەریـا، منداڵەکان لەبەر ئەو هەژاریو نەهامەتیە لاوازو بێهێز بووبوون.

سولتان لەپڕدا بەتەواوی گۆڕانی بەسەرداهات، گەڕایـەوە سـەرحاڵەتی بەرلەهاتنـەوەی کـارتی کـوژرانی منداڵـەکانی. نـەوەکانی خۆشدەویسـتن، چـەندین سـەعات یـاری لەگەڵـدا

دەکـردن. لـەلێوار خـەریکی خڕکردنـەوەی بـەردە ڕەنگاوڕەنگـەکان‌و ئەسـپی دەریـایی‌و بەڕووان دەبوو، منداڵەکان سەریان بەخانووە چۆڵەکانی گونـد دادەگـرت‌و دەهاتنـەوەدەرو لەنێو ئەو خانووە چۆڵانە یاریی چاوشارکێیان دەکرد.

نیشانچی شادو خۆشحاڵ لەدەریا گەڕایەوە. لەگەنەکانی ماسی تا دەگرێت پڕبووبـوون لەماسی‌و لەنێو لەگەنەکاندا هەڵبەز هەڵبەزیان بوو.

"سەیر بکەن، سەیر بکەن، وەرن زارۆکنۆ".

منداڵەکان بەڕاکردنەوە هاتن لەسەر لمەکان لەڕۆخ بەلەمەکە بەڕیز ڕاوەستان. ماسـی نێو لەگەنەکان هەڵبەزو دابەزیان بووو ئاویان بۆ ئەملاو ئەولا دەپڕژاند.

منداڵەکان کـڕو بێـدەنگ لـەنێو بەلەمـدا دانیشـتبوون‌و سـەیری ماسـیەکانیان دەکـرد. سوڵتان لەکاتێکدا لەگەنێکی بەدەستەوە بوو هات، نیشانچی لەگەنەکـەی پڕکـرد لەماسـی‌و هەڵیگرت‌و بردیە لێوارەکەو لـەوێ لەسـەر وردە بـەردەکان دانیشـت، دەسـتەکانی ئەوەنـدە خێـرا کەوتنـەکار کـە ئـەو هـەموو ماسـیەی لەماوەیـەکی کورتـدا پاککردنـەوە. سـوڵتان دارەکانی داگیرساندبوون‌و ئاگرێکی گەورەی کردبـووەوەو گۆڕکەکـە پڕبووبـوو لـەپۆلووان، ماسیان دانانە سەر پۆلووەکان.

نیشانچی هەندێك نانشی پەیدا کردبوو. منداڵەکان هەرچـی ماسـیان بـەنان دەخـوارد، تێر نەدەبوون.

منداڵە فراژووترەکەیان دەستێکی بەورگی خۆیدا داهێناو گـوتی: "ئـۆووە، ورگـم وەکـو دەهۆڵ هەڵمسا".

هی دووەمیان گوتی: "ئۆووە وەکو دەهۆڵ".

سێیەمیان گوتی: "وەکو دەهۆڵ".

هەسـتان بەسـەر وردە بەردەکانـدا، بەڕاکردنـەوە بـەرەو لای خـوارەوە، تـا دەوەنەگەزەکانی دەرەوەی گوند ڕۆیشـتن. ئـەولای دەوەنەگـەزەکان قامیشـەڵان بـوو، لـەنێو سێبەری نێوەڕاسـتی شـوێنەکە، مـەلێکی ماسـیخۆرکەی یەکپارچـە سـپیان بینـی کـە قاچ‌و گـەردنێکی درێـژی هـەبوو، بێـدەنگ لەپـەنا دەوەنەگـەزەکان ڕاکشـان‌و دەسـتیانکرد بەسـەیرکردنی ماسـیخۆرکەکان. قاچـدرێژ، دەنـووکزەرد، چـاوانی سـووریان هـەبوون. ماوەیەکی باش بێهـیچ جووڵەیـەك لـەوێ مانـەوە، پاشـان وەك بڵێیـت مانـدوویان بووبێـت لەهیکڕا هەستانەپێ، هاوکات لەگەڵ هەستانی ئەوان، مـەلانی ماسـیخۆڕیش لەکاتێکدا کـە

باڵە درێژەکانیان بەئارامی تەکان دەدا بەرەو لای دەریا دایانە شەقەی باڵان. منداڵەکان تا ئەو دەمەی باڵندەکان لەبەرچاوان ون بوون هەرسەیریان کردن.

لەوە بەدواوە، خۆری منداڵەکان هەڵات. ڕۆژانە لەدەریاوە ماسیی جۆراوجۆر دەهاتنەوە ماڵێ. باپیریان سووپی ماسی، ماسیی سوورکراوەو دۆڵمەماسیو ساردین پڵاوی بۆ لێدەنان، ئەوانیش بەنانی گەورە ئەو خواردنانەیان دەخوارد، ورگیان ئۆوووە، وەکو دەهۆڵ هەڵدەمسا، جارجارەش، کاتێك باپیریان دەچووە شارۆچکە نوقڵو نەباتی بۆ دێنان، نوقڵەکانیان یەکسەر تەواو نەدەکرد. ڕۆژێ یەك دانە یان بەلای زۆریەوە دوو تا سێ دانەیان هەرکاتێك مگێزیان چووبایێ دەخستە زارەوە.

لەلای دەوەنە گەزەکانەوە، بەدارچنارەکان هەڵگەڕان تا گەیشتنە هێلانەکان. لەنێو هێلانەکاندا هێلکەی زۆر بچووكو زەرنەقووتەیان دۆزینەوە کە دەمە زەردباوەکانیان لێکبەش بووبووەوەو جیکەجیکێکیان نابووەوە نەبێتەوە، دەستیان لێنەدان، لەسەر لکی دارەکان روونیشتنو چاویان بڕیە هێلانەکان.

تاوێك دواتر، لەکاتێکدا کە دەخولانەوە لەدرەختەکان هاتنەخوار، بەپێخاوسی لەلێوار دەریا، مەودای نێوان قامیشەڵانیان تا نێو جەنگەڵەکە کە لکی دارەکان لەبەر باڵندە رەنگاوڕەنگەکان بەدی نەدەکران، ڕایانکرد. لەنێو جەنگەڵ فەرخە کوێریشکێکیان دۆزیەوەو بۆ نەنکیان هێنایەوە.

نەنکیان نیگەران بوو، گوتی: "ئەمە یەکسەر ببەنەوە ئەو شوێنەی لێتانهێناوەو دابینێنەوە ئەوێ دەنا دەمرێت".

بەڕاکردن گەڕانەوە نێو دارستانەکەو بەچکە کەروێشکەکەیان لەهەمان ئەو شوێنە دانایەوە کە لێیانهێنابوو. پاشان چوونە گوندەکەو بەترسەوە بەنێو خانووەکاندا گەڕان.

هەر ڕۆژەو یارییێکی تازەیان دادەهێنا، یاریچەیەکی تازەیان دەدۆزیەوە. ئەو خۆشحاڵیە لەڕادەبەدەرەی ئەوان سوڵتانیشی هێنابووە جۆشو خرۆشەوە، ئەو خۆشحاڵیەی ئەوان مانگێکی درێژە کێشا. ڕۆژێك سەرلەبەیانی، لەدەنگەدەنگێك بەئاگا هاتن، کەسانێك کە هاتبوونە دێکەوە بەدەنگەدەنگەوە خانووەکانیان پڕ دەکرد. لەبەیانیەوە تا نیوەڕۆ هەموو خانووەکان پڕبوون لەخەڵك. کەسانێك کە نەیانتوانی خانووێك دەستەبەر بکەن. کپو بێدەنگ ملی ڕێگایان گرتو بەرەو گوندێکی دیکەی چۆڵ کەوتنەڕێو لێرە دوورکەوتنەوە. جموجۆڵو جۆشو خرۆشێکی دیکە بۆ منداڵان

دەستیپێکرد، یەکسەر لەگەڵ منداڵە تازە هاتووەکان بوونە هاوڕێ. تیپە منداڵێکی پێخاوس لەلێوار دەریا، نێو جەنگەڵ، قامیشەڵانو نێو دەوەنە گەزەکانیان کردە مەیدانی یاریەکانی خۆیان. رایانکرد، ماندووبوون، داریان لەکونە زەنگەسوورەکان وەردا، زەنگەسوورەکان بەزۆرانیان وەدا، تا لێواری مەرگ چوونو گەڕانەوە. بەسەر گرووپی دوو کەسیو سێ کەسیدا دابەش بوونو لەگەڵ یەکدیدا کەوتنە شەڕو پێکداهەڵشاخان. دەستو دەمو چاوی یەکدیان خوێناوی کرد. ماوەیەك دواتر برسیەتی لەگوند بلاوبووەوە. منداڵاکان زەردهەڵگەڕانو جموجۆڵو بڕستیان لێبڕا. کۆچبەران، بێبەرنامە بەنێو دێدا دەخولانەوە. نیشانچی بێئەوەی واز لەکارەکەی بێنێت، هەموو رۆژێك بەرلەوەی سپێدە دابێت دەچووە راوەماسی. هەموو رۆژێك لەڕۆژی پێشتر زیاتر ماسی دەگرتنو زۆربەی ئەو ماسیانەشی بەسەر خەڵکە برسیو نەخۆشەکاندا دابەش دەکرد.

لەنێو تازە هاتووەکان، هەندێك لەئاوارە زیرەکەکان چەند کۆنە بەلەمێکیان دۆزیبووەوە. نیشانچیش دەستێکی بۆ پێداهێنابوونو بەسەبرو حەوسەڵەوە فێری راوەماسی کردبوون. ئەو کەسانەیش کە نەیاندەتوانی راوەماسی بکەن دەچوونە شارۆچکەکە، ئەگەر کارێکیان دەست بکەوتبایە دەیانکردو پارووە نانێکیان بۆماڵەوە دەبردەوە.

لەماوەی یەك دوو هەفتەدا هاوبەستەییو هاوکارییێکی برایانە لەدێیەکەدا دروست بووبوو. دروست لەم سەینو بەینەدا جەندرمەکان هاتنە نێو دێو بوونە مایەی نیگەرانی دێهاتیەکان. هەموویان، ئەگەرچی کەمیش بێت، رێگاو کاروبارێك فێربووبوون، قەولی کۆمەكو هاوکاریکردنیان لەدەوڵەمەندانی شار وەرگرتبووو رێوشوێنی کشتوکاڵکردنیان لەزەویە بەپیتەکان دابین کردبوو. فەرماندەی جەندرمەکان ئەفسەرێکی تووڕەبوو، کە قاچێکی دەشەلیو دەستێکی گۆج بوو. گوندیەکانیان لەمەیدانی گونددا کۆکردنەوەو فەرمانی دا: "خێرا، خێرا، تا زووە دەبێت ئەم دێیە چۆڵ بکەنو بڕۆن، زوو، خێرا..!"

گوندیەکان وەکو گورگی بۆر نووزانەوە. دەستەی نیشتەجێکردن ئێمەمانانیان ناردۆتە ئێرە. کەس گوێی پێنەدان.

"برا ئاوارە یۆنانیەکانمان هاتن. لەسەر ماڵو حاڵیان دەربەدەربوونە، لەدەستی کافرەکان دەربازیان بووە، ستەمیان لێکراوە... سەیر بکەن برسیو تینوو لەدەرەوەی دێ چاوەڕێن، ماندوو لێبڕاو، نەخۆش".

گوتیان: "ئێمەش لەماڵو حاڵمان هەڵبڕاوین، ئێمەش ئاوارەین، ئێمەش برسین. ئێمەش دەستەی نیشتەجێکردن ناردوونیەتە ئێرە. ئێمەش لەژێر پێی دوژمن پلیشاوینەتەوە".

"ئەو قسانەتان ناچنە گیرفانمەوە، هەر ئێستا، خێرا!"

گریانو زاری بێسوود بوو.

دەنگێکی لێبڕاوانەو گڕ بەرز بووەوە:

"نێزە بخەنە کار!"

گوندیەکان خۆیان لەلێوار بینیەوە. کۆچبەرە یۆنانیەکان لەکاتێکدا لەلایەن جەندرمەکانەوە دەپارێزران، یەك یەكو دوو دوو، بەیارمەتی ئەو کەسانەی کە لەلایەن دەستەی نیشتەجێکردنەوە هاتبوون، جێگایان بۆ کرایەوە، ئەو کۆچبەرانەی کە لەدێهاتەکانەوە دەرکرابوون تا رۆژ ئاوابوو لەلێواری دەریا چاوەڕێ مانەوە.

لەڕاستیدا، رووداوەکانی وەلی نیشانچی دوای ئەمە دەستیان پێکرد، لەگوندێکەوە بۆ گوندێکی دی، لەشارۆچکەیەکەوە بۆ شارۆچکەیەکی دی چوون، شارەکانو تەواوی لێوارەکانی دەریای رەش لەمسەر تا ئەوسەر گەڕان، لەڕێگاکاندا کەسانێکی ئاوارەی برسیو پەرێشانحاڵی زۆریان بینی، بەهەندێك دێهاتدا رەت بوون کە لەلایەن ئەو سەربازە یۆنانیانەوە سووتێندرابوون کە لەبەر رەوشی نەهامەتباریانەوە رایانکردبوو. هەندێك لەگوندەکانی سەر رێیان چەندین رۆژ لەسەریەك میوانداریان کردن، ئاوو نانیان دانێ. هەندێك لەگوندەکان تەنانەت پارەشیان دانێ. هەندێك لەگوندەکانیش کە لەدەست ئاوارەکانەوە بەتەنگ هاتبوونو چەکیان دەست دابووێ، لێنەگەڕان ئەوان بچنە نێو گوندەکانیان.

وەلی نیشانچی، سوڵتانو نەوەکانیان بووبوونە ئێسكو پێست. سوڵتان جگە لەمنداڵەکانی بیری لەهیچشتێکی دیکە نەدەکردەوە. تروسکاییەکی ئومێد کەوتبووە دڵیەوە. ئەو گڕی ئومێدە تا دەهات گەورەتر دەبوو. سێ دارگوێزەکەی بەرامبەر ماڵیان لەبەرچاوانی بەرجەستە دەبوون. لەبەردەم ماڵی باوکیشی سێ دارگوێز هەبوون، منداڵەکانی لەسەربازی دەگەڕانەوە، بەزووییش دەگەڕانەوە. کارتی کوژرانیان هاتبووەوە، کارتی کوژرانی زۆر لەسەربازەکان هاتبووەوە، پاشان سەربازەکان هەندێکیان بریندارو هەندێکیان پەککەوتەو هەندێکیشیان ساغو سەلیم بۆ ماڵەکانیان گەڕابوونەوە.

منداڵەکانی ئەو بۆ نەگەڕێنەوە، دەگەڕانەوە جا خڕوخڕپن‌و سەرحاڵ. ئەگەر گەڕابنەوە چی دەخۆن، چی دەخۆنەوە؟ لەخەونەکانیدا ئەوانی جوان وەکو ئەو دەمەی بۆ سەربازی دەچوون بینیبوون. ئەوان لەسەرەوە بۆلای خوارێ. کوڕە گەورەکەی لەپێشەوە. بەمووی بۆر، چاوانی گەورەی شین، خەمگین، هێزا، بەقەدو بالایەکی بەرز، سمێڵێکی سوور لەپشت بەردێکی سوورەوە هاتنەدەر. هەریەکێکیشیان شاهینێکی سەوزی بەچاوانی تیژو سینە رەنگاوڕەنگی بەدەستەوە بوو. چوونە سەر دوندی زنارێك کە زۆر بڵندو سەرکەش بووو سوورییەکەی وەکو هەتاو دەدرەوشایەوە. شاهینەکانیان بۆ راو هەڵدان‌و شاهینەکان لەکاتێکدا هەریەکەو ماسییێکی بچووکی سپی بەدەنووکەوە بوو گەڕانەوە. هیچکامیان بەو نێچیرەی خۆی خۆشحاڵ نەبوو. لەدەوروبەری دارگوێزەکاندا چەند شاهینێکی سوور بەئاسمانەوە بوون. دارگوێزەکان بەریان دابوو، نیشانچی لەنێو بەلەم، لەدەریای شینی ئاسمانی‌و سەرنجڕاکێشی ئارامدا لەژێر درەختەکاندا راوەماسی دەکرد. ماسیەکان بەڕەنگێکی شینی دەگمەنەوە لەدەریا دەهاتنەدەر. نیشانچیش هەمان رەنگی بەخۆیەوە دەگرت، لەژێر درەختە شینە دەگمەنەکان گرفتاری گێژەن‌و تۆفان بووبووەوەو لەگەڵ ئاوەکە دەخولایەوە. پۆلە شاهینێکی شینیش کە هەریەکەیان هێندەی هەڵۆیەك دەبوون، گرفتاری گێژەنەکە بووبوون.

منداڵەکان هاتنە نێو دێ. لەماڵێ بترازێت شوێنێکی دیکەیان نیە، لەبەر دەرکە دانیشتوون‌و چاوەڕێی دایە سوڵتانن، ئەگەر نەشهاتبنەوە لەڕێگان، خەریکە دێن. لێرە چەند مانگی ماوە تا بەری دارگوێزەکان پێدەگات. هەر دارگوێزێك رەنگبێت پازدە گونیە گوێز بگرێت، منداڵەکان کۆیان دەکەنەوە، دەیانبەن لەشارۆچکەدا دەیانفرۆشن. گوێزەکانی ئێمە لەسەرتاسەری ئەم چیایانەدا بەناوبانگن. هەردانەیەکی هێندەی مستی منداڵێك گەورە دەبێت. پێویست بەشکاندیش ناکەن. ئەگەر بەدوو دەستت بیانگریت‌و لەنێوەڕاستەوە بیانکەیتە دوولەت، کاکڵە سپیەکە دێتەدەر. سوڵتان ئەگەر وەکو جارانیش نەبێت، هێشتا بەهێزە. دەتوانێت خۆڵ بەکۆڵیەوە هەڵبگرێت‌و بیبات لەنێو زنارەکاندا رووبکات. گەنمەشامی دەچێنن. کوڕەکان ژن دێنن، ژنەکانیشیان دەتوانن خۆڵ هەڵبگرن. نیشانچی‌و نەوەکان لەدوورگەن، جێ‌و رێیان دیارە، دوورگەی کارینجا، بۆ ئەوەی لەبیری نەچێتەوە بەردەوام دووبارەی دەکردەوە: "دوورگەی کارینجا دوورگەی کارینجا...". لێرە، لەسەر وردەبەردەکانی لێوار دانەدەنیشت، کیسە مەخمەڵیە سەوزباوەکەی لەژێر باخەڵی

دەردەهێنـاو پارەکـانی هەڵدەڕشـتە نێـو دامـەنی کراسـەکەیو دەیـژماردن. لەسـەریەك دەیژماردنو دەیـژماردن. ئەگـەر سـواری کەشـتیو بەلـەمیش دەبـوو ئـەو پارانـەی لەگـەڵ خـۆی دەبردنـەوە ناوچـەکەی خۆیـانو هـیچ کـەمو کوڕییێکیشـی نەدەهاتـە رێ. لەگـەڵ ئەوانیدیش دەیتوانی بێئەوەی کاربکات، شـەش مـانگ، سـاڵێك بگوزەرێنێـت. پارەکـانی تـا ئەودەمەی کە بەلەمێکی ماتۆڕدار بۆ ئەستەنبۆل پەیدا دەبێت، ژماردنەوە. کە بەلەمەکـە ئامادەبوو، چووە نێـو دەوەنـە گـەزەکانو کیسـەی پارەکـانی لـەژێر باخـەڵی خـۆی بەسـت. پارەی بەلەمو کەشتیو خواردنو پێداویستیەکانی کـە پێشـتر جیایکردبوونـەوە، خسـتیە بـەرکی کراسـەکەی. دوو شـەوان لەکاروانسـەرایەکی شارۆچکەکە مایـەوە. تـا ئـەو دەمـەی نیشانچیو کۆچبەرەکانی دیکـە سـواری بەلـەمان دەبـن خـۆی لـەنێو دەوەنـە دڕکاویـەکانی نزیك ئەسکەلە شاردەوە. تا ئەو دەمەی کە ئـەوان لەبەرچـاوان ون بـوون لەسـەر پەنجـەی پێیەکانی راوەستاو تا بەلەمەکە بەتەواوی لەمەودای بینین دوورکەوتەوە، بەهەمان شێوە لەجێی خۆی مایەوە. لەناخیدا هەستێکی تێکەڵ، کـە غـەمێکی قـووڵو شـادییێکی گـەورەی بینینی منداڵەکانی بوو شەپۆلی دەدا.

ئەو کەسانەی کە لەئەسکەلە بوون ئەو بەلەمە ماتۆڕدارەیان کە دەچـووە ئەسـتەنبۆل نیشـانی ئـەو ژنـە غـەمگینو جـوانو بەساڵاچـووە داو سـواری بەلەمەکـەیان کـردو بەڕێیانکرد. تەنها هەریەك رۆژ لەئەسـتەنبۆل مایـەوە. لەگـەڵ کەسـانێکی زۆر رووبـەڕوو بووەوە کە دەچوونە دەریای رەش. هەموویان پەرێشان بوون. شارۆچکە بەشارۆچـکەو دێ بەدێ گەڕابوونو بووبوونە ئێسكو پێست، بەنائومێدی دەگەڕانەوە گوندو شارۆچکەکانی خۆیـان. لـەکۆگای کەشـتیدا بەسـەریەکدا کەڵەکـە بووبـوون. بۆنێـك کـە لەبەرگـەگرتن نـەدەهات، نێـو کۆگـای کەشـتیەکەی پـڕ کردبـوو. سـێ بزنیشـیان لەگـەڵ بـارکرابوون. کەشـتیەکە لـەو کەشـتیە بچـووکە کۆنانـە بـوون. سـەفەرەکەی سـوڵتان هەفتەیـەکی درێژەکێشـا. توورەگەیـەکی گـەورەی پـڕ نـانو زەیتـوونو پـەنیری کڕیبـوو، وردە وردە دەیخـواردو وردە وردەش لـەنێو ئـەو کەسـانەی برسـی بـوون، دابەشـیدەکرد. هەفتەیـەك دواتر لەئەسکەلەی شارۆچکەکە لەگـەڵ پـازدە بیسـت منـداڵو ژنو پیـاوی دیکـە دابـەزی، چـوو سـەبەتەیەکی کـڕی، چـووە بـازاڕ، کـەس لـەبازاڕ نـەبوو. گەڕایـەوە، سـەبەتەکەی لەخواردەمەنیو پێداویستی یەك کەس پڕکرد. تەنانەت هێشتا نیوەی ئـەو پارەیـەی کـە لەگیرفانی کراسەکەی بوو خەرجی نەکردبوو. ئەمە خۆشحاڵی کـرد. لەکاتێکدا سـەبەتەی

پڕ لەشمەکی بەکۆڵەوە بوو، ڕێگای شاخی گرتەبەر. ئێستا وەك جاران بەهێز نەبوو، لەکاتێکدا لەڕێگادا لێرەو لەوێ بێنی دەداو دەحەسایەوە، توانی لەماوەی دوو ڕۆژو نیو بگاتەوە ماڵەکەی خۆیان. خانووی چۆڵو دەرگای کراوە هەموو گیانی هێنایە لەرزین، زوو خۆی کۆکردەوەو رایکردە سەرکانیو ئاوی هێنا، هەموو خانووەکەی رشاندو گەسکی دا، هیرەکانی شوشت. ئەو نوێنانەی لەماڵێدا مابوونەوە لەبەر خۆرەتاودا هەڵیخستن. لەژێر دارگوێزەکاندا ئاگرێکی کردەوەو مەنجەڵەکانی خستنە سەرئاگر، لەپشت درەختەکان، لەپەنا بەردێکی سپی گەورە جلەکانی داکەندن. بەقاڵبە سابوونێك جوانو خاوێن خۆی شوشت. جلی خاوێنی پێنەبوو، ئەو جلانەی لەگەڵ خۆی هێنابوونی لەڕێگا دابوونیە ئەو ژنانەی پێویستیان بوو، بەبیریشی دانەهاتبوو لەشارۆچکە جلی تازە بکڕێت. چۆن بەبیری دابێت! جلەکانی شوشتنو لەبەر هەتاو هەڵیخستن، تا وشکبوونەوەی جلەکان لەژوورەوە رووتو قووت لەسەر گونیەیەك راکشاو یەکسەر خەوی لێکەوت. کە لەخەو هەستا خۆر ئاوابووبوو، خێرا چوو جلەکانی هەلگرتنو لەپەنا قاپۆری درەختەکان خێرا خێرا کردنیەوە بەری. دوای ئەوە هەر سێ ڕۆژ جارێك دەچووە شارۆچکە، هەر جارێکیش کە دەچوو سەرێکی بازاڕی دەدا، هیچکەسی نەدۆزیەوە. ئەو شمەکانەی پێویستی بوون لەبازاڕ کڕینی.

وەکو هەمیشە بەرلەوەی خۆر هەڵبێت لەخەو هەستا، خۆی شوشت، قژی شانەکرد، کەزیەکانی کردنەوەو دووبارە هۆنینیەوە. لەنێو دەرگا دانیشت، لەخۆشحاڵیان شاگەشکە بوو، کوڕەکانی لەو سەرەوەڕا دێنەوە، بەرلەوەی بگەنە بەردی ژێر چاڵ، کوڕە بچووکەکە قاقا پێدەکەنێت، دوای ئەویش کوڕە ناوەنجیەکە، لەدوای ئەویشەوە کوڕە گەورەکە... سوڵتان لەگەڵ بینینی ئەوان بەلاکەلاكو ساتمەبردنەوە بۆلایان رادەکات، دەستو پێی شل دەبن، بەعەردی دەکەوێت. ئەمە دڵی دایکە، مەگەر دەتوانێت بەرگە بگرێت؟ کوڕە گەورەکە دەیگرێتە باوەش، دێنەوە ماڵێ، کوڕە گەورەکە بەتریقەی پێکەنینەوە دەیگرێتە باوەشو رایدەهەژێنێت، دەیداتە کوڕە ناوەنجیەکە، کوڕە بچووکەکە لەدەستی برا ناوەنجیەکەی دەیقاپێنێتو دایدەنێتە عەردی. لەبەر دەرکە راوەستاو سەیری کوڕە قژ گروازە، چاوشین، باریكو بەژن زراوەکانی کرد کە لاواز بوونەو گۆناکانیان دەبریسکێنەوە، زمانی لەگۆ کەوتووە. سەتڵەکانیان هەڵدەگرنو دەچنە سەر کانی. تیشکی خۆر لەوردە بەردەکانی ژێر ئاوەکە دەداتو کانیەکە دەدرەوشێتەوە. سەرنشێوەکەش

لەگـەڵ ورشـەی ڕۆشـنایی هـەتاو دەدرەوشـێتەوە. ماسـیە سـوورەکان بـەخێرایی خـەریکی مەلـەی خۆیـانن، لـەژێر دارگوێزەکـان دادەنیشـن. تـا بـەیانی بێئـەوەی چـاولێکبنێن قسـە دەکەن. ئەوان بەدرێژی ئەو شەڕانە دەگێڕنەوە کە بەشداریان تێداکردووە. ڕێژنەی گوللە کـە چـەندین شـەوو ڕۆژ وەکـو بـاران لـەئاسمان دەبـارین. بلاچـکەی بێپسـانەوە. ئـەو ئەستێرانەی کە لـەدوای هەورەتریشقە لـەنێو زگی تاریکیـدا یەکیاندەگرتـەوەو دەبوونـە تۆپەڵێك، بۆ هەمووانی دەگێڕنەوە کە چۆن تۆپەڵە ئەستێرەی نیوەڕاستی دەریایان لـەنێو قـووڵایی ئـاودا شـاردۆتەوە. عـەلی چـاوەش ئـەو ئەسـتێرانەی کـە دادەبـارین هەمیشـە لەنێوەڕاستی حەوت دەریادا دەشاردنەوە.

سـوڵتان سـەتڵەکانی هـەڵگرت، چـووە سـەرکانی. بـەکۆتکێك کـە لـەداری کـاژ دروسـت کرابـوو پـڕی کـردن لـەئاوی زوڵاڵ، لەسـەر کـانی زەنگەسـوورەیەکی تـووڕە بـەوزەوزەوە دەهاتو دەچوو. کوڕەکانی ئەمڕۆ دێنەوە، لەو ئاوە زوڵاڵە دەخۆنەوە، ڕەنگبێـت تـا ئێسـتا بشـهاتبن، پشـتیان بــەقاپۆری درەختەکانــەوە دابێــتو شــەکەتو مانــدوو دانیشــتبن. بەنیگەرانیەوە بۆلای ماڵێ ڕایکرد. هیچکەس لەوێ نـەبوو. لەهـەمان ئـەو شـوێنەی لێبـوو لەسەر ئەژنۆکانی دانیشت.

بەشـێوەیەك بـەئاگا هـات دەتگوت لەخـەوێکی قـووڵ هەسـتاوەتەوە، لەبـەر دەرگـا هەسـتاو بەرەو لای خانووەکانی دێ ڕۆیشت. دەرگای یەکەمین ماڵ تەواو کراوەبـوو، چـووە ژوورێ. هـەر لەگەڵ ئەوەی پێی نایە ژوورێ، دوو باڵندەی گەورە لەکاتێکدا پێکـەوە خـەریکی خـواردن بـوون لەدەرگەوە بەباڵـەفڕە تێیانتەقانـد. ترسـا. یەکسـەر چـووەدەر. ترسـا، بـەڵام پەشـیمان بـووەوە، درێژەی بەگەڕان بەنێو خانووەکانـدا. لـەکاتی گەڕانـدا تێبینـی سـێبەرێکی کـرد کـە لەسـێبەری ژنێك دەچوو بێجووڵە لەنێو دەرگایەك دانیشتووەو خـۆی گرمۆڵـە کـردووە، لێینزیـك بـووەوە. ژنەکە هەروا گرمۆڵە بووبـووو بێجووڵـە دانیشـتبوو، لەگـەڵ دەنگـی پێـی سـوڵتان پشـتی خـۆی ڕاستکردەوە، چاوە گەورەکانی بڕینە سوڵتان. ماوەیـەك بـەنیگاکانی بـەدوای شـتێك گـەڕا، وەك بڵێیـت شـتگەلێکی وەبیرهاتبنـەوە، بەتونـدی هەسـتایەوەو بەهاوارکردنێکـەوە گـوتی: "سـوڵتان، سوڵتان، تۆ کەی هاتیەوە؟ تۆش بەدوای کوڕەکاندا هاتوویت؟"

یەکدیان گرتە ئـامێز، هـەردووکیان پێکـەوە کـپو بێـدەنگ بـەملاو ئـەولادا ڕاهـەژان. لەسەر بـەردێك دانیشـتن، دەنگیـان دەرنـەدەهات، فرمێسـك لەچـاوەکانیان نەدەهاتـەخوار، بێهیچ قسەکردنێك، ماوەیەکی درێژ ئاوا لەسەر بەردەکە دانیشتن.

لەگەڵ چرپەی پێیەك كە لەو لایانەوە هات هەستانەوە. ئەو كەسەی كە دەهات زەینەب لی بوو. چوار كوڕی زەینەیش چووبوونە شەڕو كارتی كوژرانیان هاتبووەوە ئامێزیان لێكدا.

زەینەب لی نە گریاو نە هیچ، لەناخی دڵەوە پێكەنیو گوتی: "چەند باش بوو گەڕایتەوە سوڵتان. هەواڵێكی تازەم پێیە، جەنگ كۆتایی هاتووە، منداڵەكانی ئێمەش كارتی خزمەتی سەربازیان وەرگرتۆتەوەو خەریكن دێنەوە".

هەردوو ژنەكە پێكەوە زەینەب لیان گرتە ئامێزو گوتیان: "بەقوربانی ئەم دەمەت بین كە هەنگوینی لێدەبارێت".

بەخەیاڵی ئەوەی كە كوڕەكانیان گەڕاونەتەوە نوقمی نێو شادی بووبوون.

"با بانگی زەریفەش بكەین تاكو ئەویش بزانێت كوڕەكانی بەرێگاوەنو بەمزووانە دەگەنەوە ئێرە".

زەینەب لی بێئەوەی دابنیشێت بەجێیهێشتن، بەبەردەڵانەكە بەسەركەوتو بەرەو لای زناریكی بڵنددا بایدایەوە. كەمێك دواتر لەگەڵ زەریفە بەتریقەی پێكەنینەوە گەڕانەوە بۆلای سوڵتانو فاتیمە كە لەخۆشیان لەپێستی خۆیان جێیان نەدەبووەوە.

زەریفە بەدەنگێك كە دەزرنگایەوە گوتی: "سوپاس بۆ خوا، سوپاس بۆ خوا كە كوڕەكانمان خەریكن دەگەڕێنەوە. سوپاس بۆ خوای گەورەمان".

"چەند باش بوو كە هاتی سوڵتان. ئەگەر ئەو دەمەی كە كوڕەكانت دەگەیشتنەوە ئێرەو تۆ لەماڵێ نەبایت چیاندەكرد، لەكوێ ئێوەیان بدۆزیبایەوە؟ چەند باش بوو كە هاتی سوڵتان؟"

"رامكرد هاتمەوە".

"جێگای وەلی پێدەزانیت؟"

"پێدەزانم".

زەریفە گوتی: "چ باش، كەواتە پێدەزانیت!"

"ئێمە نازانین. ئەوكاتەی ئەوانەی ئێمە خەریك بوون دەڕۆیشتن، ئێمە لەوێ رامانكرد، زۆر بەدواماندا گەڕان، نەیاندۆزینەوە. وا خۆمان شاردبووەوە ئەگەر سەد رۆژ بەدواماندا گەڕابووان نەیاندەتوانی بماندۆزنەوە. زۆر چاوەڕێیان كردین، پاشان كۆچیانكرد، دێ چۆڵ چۆڵ بووو ئێمەش بێنانو ئاوماینەوە. گیاو گۆڵمان لەچیاو

بەندەن کۆکردەوە، ڕەگو ریشاڵمان لەژێر گڵ دەرهێنان، لەنێو زناران قارچکی گەورە گەورەمان دۆزینەوە کە هەر دانەیەکیان هێندەی قاپێك دەبوون و خواردمان. لەو سەرانە دەنگی باعەباعی بزنێك هات، هەرچۆنێك بوو گرتمان، سەرمان بڕی بۆ ئەوەی گۆشتەکە بۆگەن نەکا هەموویمان پێکەوە سوورکردەوە.

لەماوەی دە پازدە ڕۆژدا کەم کەم خواردمان. ئێستا دوو ڕۆژە هیچمان نەخواردووە. هیچ پارەو پوولمان نیە تا بچین لەشارۆچکە شتێك بکڕین.

چەندین ڕۆژ ماڵ بەماڵی دێمان لێکدا، لەهیچ ماڵێکدا تۆزقاڵێك چیە خواردنمان دەست نەکەوت. دووبارە چووینەوە زگ کوارکان. چیاو جەنگەڵەکان گەڕاین، بەڵام کوارگمان دەست نەکەوتن. چووینەخوارێ خوارێ، لەشوێنێکی نێو جەنگەڵەکەدا بەسەر کوارگان هەڵبووین، تا حەز بکەیت زۆر، هێندە خۆشحاڵ بووین، هێندە خۆشحاڵ بووین هەر مەپرسە، بەڵام دواتر کە سەیرمان کرد هەموویان کوارگی ژەهراوین. گوتمان شوێنێك کە کوارگی ژەهراوی لێبێت هی دیکەشی لێن. گەڕاین و لەشوێنێکی هەڵدێرگە دۆزیمانەوە. لایەکی عەردەکەیان دادڕی بووو ئاوا مابووەوە، کراسەکانمان پڕ کردن لەکوارگ. سوورمانکردنەوەو سێ ڕۆژان لێمانخواردن. دوای ئەوە لەدەورو بەری هەفتەیەك دە ڕۆژ کوارگمان کۆکردنەوە. ئیدی باران نەباری. کە باران وشان، کوارگیش تەواوبوون. ئێمە دووبارە گیاو گۆڵمان رنیەوەو لێمان نا. زگئێشەمان پێگرت. دواجار وایلێهات کە گشتمان برسی بمێنینەوە. ناتوانین بچینە شارۆچکەو ئاشنایەك بدۆزینەوەو داوای لێبکەین کەمێك خواردنمان بداتێ، بەڵام ئەگەر چووینە شارۆچکەو منداڵەکانمان بگەڕێنەوەو ئێمە نەدۆزنەوە؟ یەکێکمان بچێت و دووانمان لێرە بمێنینەوە. هیچکاممان ڕازی نەبووین. ئێمەش تا دەمرین لێرە..گوتمان کاتێك منداڵەکانمان دەگەڕێنەوە لانیکەم تەرمەکانمان ببینن".

سوڵتان قاقا پێکەنیو گوتی: "یاللاّ هەستن بابچینە ماڵی ئێمەو زگمان تێر بکەین. من کاتێك هاتم سەبەتەیەکی پڕ خواردەمەنیم لەشارۆچکە کڕی. یاللاّ بجووڵێن".

تا چاو لێکبنێیت گەیشتنە ماڵێ. یەکسەر داروچیلکەیان کۆکردنەوەو ئاگریان کردەوە. قابلەمەیەك برنجیان لێنا. سوڵتان نزیکەی چوار کیلۆ ڕۆنەکەرەشی کڕیبوو.

پویراز موسا جوانترین خانووی دوورگەی نیشانی نیشانچی داو گوتی:

"ئەم خانووە هی تۆیە، بگرە ئەمەش قەباڵەکەی". خانووەکە نزیك ماڵی پویرازیش بوو. نیشانچی خانووەکەی زۆر بەدڵ بوو. لەژوورەکان ژمارەیەك وێنەو دیمەن بەدیوارەکانەوە بوون. بەڕاکردن گەڕایەوە لای منداڵەکان. منداڵەکان لەنێو قامیشەڵانەکە یاریان بەزیندەوەرانو بۆقە سەوزو کیسەڵەکان دەکرد.

زەردەواڵەیەك بەڕوومەتی کوڕە نێوەنجیەکەیەوە دابووو چاوی چەپی قەپات کردبوو. منداڵەکانی لەقامیشەڵان هەڵگرتنو هێنانیە خانووەکە. پێیگوتن:

"ئێستا ئەو خانووە هی ئێمەیە"و منداڵەکانی گرتنە باوەش. بەردەوام دووبارەی دەکردەوە: "ئەم خانووە، ئەم خانووە، ئەم خانووە". لەو ژوور بۆ ئەو ژوورو لەپلیکانەکان بۆ باخچە رایدەکردو دەگەڕایەوە.

پویراز لەسەر پلیکانەکان گرتیو چەند باش بوو کە گرتی، نیشانچی هەناسەبڕکێی گرتبووو سنگی وەکو هەنبانەی ئاسنگەران بەرزو نزم دەبووەوە.

"نیشانچی، سبەی دەچینە شارۆچکە، دەبێت ئەو ئیشانەی تایبەتن بەخانووەکە تەواو بکەین. جلوبەرگ بۆ منداڵەکان دەکڕین".

"تۆ خۆ هەموو شتێکت بۆ منداڵان کڕیوە. بەتەواوی نۆژەنت کردوونەتەوە".

"ئەوەی چەند جوانیشت هەن. هەریەکیان پارچە زێڕێکە".

شەیدای منداڵەکان بووبوو. "دەبێت لەئێستا باشتر بن. نوێنو قاپو هیرباریش بۆ ماڵێ پێویستن".

نیشانچی کە سەیری چەکمەکانی دەکرد، گوتی: "من کە هیچ پارەم نیە".

سەری دانەواند.

پویراز کە کەمێك تەریقبوونەوەی پێوە دیاربوو گوتی: "من هەمە. بەلەمێکی ماتۆڕداریشت بۆ دەکڕم. بەو کارامەییەی لەماسیگریدا هەتە لەماوەی سێ مانگان پارەی ماتۆڕەکە دەردێنیەوە".

نیشانچی هەر لەگەڵ ئەوەی وشەی بەلەمی بیست، دەستو پێی شل بوون. لێوەکانی کەوتنە لەرزین. تەنها هەر ئەوەندەی پێکرا بڵێت: "ئەمەت بەڕڕڕڕاستە؟" دەستەکانی پویرازی توند گرتنو بەسنگی خۆیەوە نان.

"لێنا پاپازئۆغلو دەناسیت؟"

"دەیناسم".

"لەماڵی ئێمەیە".

"دەزانم".

"دەزانی بۆچی لەیۆنان رایکردووەو هاتۆتەوە دوورگەی ئێمە؟"

"من بەچی بزانم".

پویراز دەستی گرتو بردیە ژێر دارچنارەکانو بەسەرهاتی لێنا پاپازئۆغلوی لەسەر تا بن بۆ باسکرد.

"ئێستا پێوایە کوڕەکانی لای مستەفا کەمال پاشان؟ وای خوشکە لێنای بێچارەم، وای! وەك ئەوەی ئێمە، سوڵتانیش رایکردو گەڕایەوە دێ؟"

پویراز ئاخێکی هەڵکێشاو گوتی: "لێگەڕێ با ماوەیەك تێبپەڕێت، دەچین خوشکە سوڵتان لەوێ لەژێر دارگوێزەکان هەڵدەگرینو دەیهێنینەوە ئێرە".

نیشانچی گوتی: "داواکاریم هەن".

پویراز بەبیستنی وشەی "داواکاری"سەری سوڕماو پێکەنی.

"ئوفەیەك لەدەریای سوور هەبوو بەردەوام دەیگوت داواکاریم هەن، بۆ فەرماندەکەم داواکاریم هەن. منیش بۆ تۆ سەرۆك پویراز داواکاریم هەن".

پویراز گوتی: "داواکاریەکانت سەرچاو. لەوەی کە منت لەجێی ئەو فەرماندەیەی دەریای سوور دانا سوپاست دەکەم".

"منیش سوپاست دەکەم. ئەوەی ناڵێم کە دەستو قاچی نەمابوونو سەربازی راکردوو بوو، هەر لەگەڵ پۆشینی جلوبەرگی نوێ وەکو ئەفسەرانی لێهات. گرووی گرتووە کە بیبەینە نەخۆشخانەی سەربازی. لاوەکانی دیکەش گوتیان ئێمە لەو دوورگە ببەنەدەر، هەر جێگایەکتان پێخۆشە بماننێرنە ئەوێ. ئێمە لێرە دەتوانین چ بکەین، لەبرسان دەمرین. هەمووشمان پاشماوەکانی جەنگینو هەمووشمان پەککەوتەین".

پویراز گوتی: "باشە. پێیانبڵێ بابێن. ئەوان رادەستی وەهاب بەگ، سەرۆکی هۆبەی سەربازی دەکەین. چیانویست بابیکەن. ئەگەر دەمێننەوە تا ئەو دەمەی کاریان دەست دەکەوێت ئێمە پێیانڕادەگەین، بەڵکو بتوانین کارێکیشیان بۆ بدۆزینەوە کە بتوانن خۆیان سەرقاڵ بکەن".

"زۆرم پێگوتن. پێمگوتن ئێوە ناتوانن جێگایەکی وەك ئەم دوورگەیەو کەسانێکی وەك خەڵکی ئێرە بدۆزنەوە، بەگوێیان نەکردم. گوتیان ئیللاو بیللا گەرەکمانە بڕۆین".

قەدریی بەلەموان لەسەر ئەسکەلە چاوەڕێیان بوو.

وەلی نیشانچی بانگیکردن:

"کوڕینە وەرن، دەچینە شارۆچکە".

گەنجێکی شەل، کە دارشەقەکانی کاتێك لەسەر بەردەکان دادەنان دەنگیان دەهات، لەپێش هەموو ئەوانیدیکەوە هات. بەدوای ئەویشدا لاوەکانی دیکە بەجلوبەرگی نوێوە، کە پۆشیبوویان لەپشت ماڵەکان هاتنەدەرو خۆیان گەیاندە ئەسکەلە. قەدریی بەلەموان گشتیانی سواری بەلەم کرد.

وەلی نیشانچی قۆڵی پویرازی گرت:

"ئەمانە هەموویان گەڕابوونەوە گوندەکانیانو بینیبوویان گوند چۆڵە. لەو رۆژە بەدواوە بەدوای دایكو باوكو ژنو براو خوشكو منداڵەکانیدا دەگەڕێنو نایاندۆزنەوە".

# بەشی چوارەم

سوپا لێکهەڵوەشایەوە. نەوەد هەزار سەرباز لەنێو بەفردا مانەوە. جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان تەسلیمی رووسەکان بوو. گوللە قاچی راستی پێکابووو قاچی وەکو کۆتەڵەدار ئاوسابوو. لەقارس دکتۆرێکی رووسی کە سەرگورد بوو، نەشتەرگەری بۆ قاچی کرد. ئەگەر چەند رۆژی دیکەی بردبا، قاچی دەبڕدرایەوە. چاك بووەوە، بەڵام قاچی بەشەلی مایەوە. جەمیل مولازمی یەکەمی پزیشکی ئاژەڵان بەوەندەش شوکر بوو. دەرفەتێکی بۆ رەخساو خۆی لەدیلێتی دەرباز کردو رایکرد. لەلەوەڕگاکانی نێو شاخان تووشی کۆچەرانی کورد بوو، هەر ئێسك‌و پێست مابووەوە. کۆچەرە کوردەکان یازدە رۆژ چاودێریان لێکرد، پزیشکی ئاژەڵان وەخۆ هاتەوە. کۆچەرەکان ئەسپی زۆر جوانیان هەبووو کەسانێکی زۆر ساخلەم‌و تەندروست بوون. جوانیی ژنەکانیان ژنانەو لێهاتوویی پیاوانیان پیاوانە بوو.

پرسیاریکرد: "ئێوە چۆن چۆنی مانەوە، چۆن بەزیندوویی ماونەتەوە؟"

کە جەنگ هەڵگیرسا، کۆچەرەکان پەنایان بۆ هەواران، بۆ دوورترین‌و چۆڵترین شوێنی نێو چیاکان برد، لەوێ لەناوچەیەك خۆیان پەنا داو جەنگ‌و شەڕو شۆڕیان بەچاوان نەبینی.

جەمیل گوتی: "جەنگ تەواو بووە!"

گوتیان: "دەزانین".

جەمیلی دکتۆری ئاژەڵان بەئەسپەکەیەوە بەرەو وان کەوتەڕێ. بەهەر گوندو شارۆچکەیەکدا تێپەڕی چۆڵ‌و هۆڵ بوو. تەنانەت باڵندەیەکیشی کە لەئاسمانی ئەو ناوەدا بفڕێت بەچاوان نەبینی. خانووی دێهاتە چۆڵەکان لەژێر عەرزەوە دروستکرابوون. ئەو خانووانە بەو تەپۆلکە خاکیەو بەو کەندڕەی وەك دەرگا بۆ خانووەکان دادڕابوو، دەزاندرا خانوون. تەنانەت ئەو کونەی کە لەنێوەڕاستی تەپۆلکەکان بۆ دووکەڵکێشی سۆباکان لێدرابوو، ئێستا لەبەرئەوەی خانووەکان چۆڵ بوون هیچ دووکەڵێکیان لێنەدەهاتەدەر.

سێ ڕۆژ لەسەریەك بەسواری ئەسپەكەیەوە هاژۆتی تا گەیشتە هۆبەیەكی رەشماڵان. كە لەكۆچەرەكان جیابووبووەوە نەیتوانیبوو داوای تویشوویێك بكات بۆ رێگاو ئەوانیش عەقڵیان پێدا نەشكابوو كەمە خواردەمەنییێكی بۆ بخەنە نێو خورجینی ئەسپەكەیەوە. لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا بگەیشتبایە هەر كانیەك رادەوەستاو تێر ئاوی دەخواردەوەو ئەسپەكەشی لەدەوری كانیەكە دەلەوەڕاندو ئینجا دە كەوتەڕێ. لەچوارەمین ڕۆژی برسێتیەكەی هەندێك دووكەڵی لەنێو دۆڵێك تێبینی كرد. ئەسپە ماندووەكەی بەرەو لای دووكەڵەكان تاودا. لەسەر رێگاوە سەگی وای هاتنە سەرڕێ كە هێندەی ئەسپێك زەبەلاح بوون. دروست لەو دەمەی دەیویست دەمانچەكەی لەبەر پشتێنی دەربێنێت، چەند ژنێك لەتاوڵەكان هاتنەدەرو ئەویان بۆ تاوڵێكی حەوت چیخی برد. هیچ پیاوێك لەنێو تاوڵەكە بەدینەدەكرا.

پرسی: "پیاوەكان لەكوێن؟"

"ئەوان هەر كە تۆیان بینی رایانكردو هەڵاتن".

"بۆچی؟"

"ئاشكرایە، ئێمە ئەرمەنین، هەر تۆیان بینی كاتێك كە بۆ سەرەوە دەهاتی هەڵاتن".

"بڕۆن پێانبلێن بێنەوە. من دكتۆری ئاژەڵانم، دكتۆری ئەسپو مەڕو بزنو گوێدرێژەكان. جگە لەوە من وا خەریكە لەبرسان دەمرم. چوار ڕۆژە لەئاو بترازێت ئەزرەباتم نەچۆتە هەناوان. چوار ڕۆژە هیچ گیاندارێكم نەبینیوە، تەنانەت باڵندەیەكیش".

یەكسەر سفرەیەك راخراو نانی تەنوور، پەنیری بەگیاو ژاژیو ماست لەسەر سفرەكە ریزكران.

هێشتا لەنانخواردن نەبووبووەوە كە تاوڵەكە پڕبوو لەپیاوانو تا ئەو دەمەی رێبوار لەخواردن نەبووەوە هیچكەسیان قسەیەكی نەكرد.

هەر لەگەڵ ئەوەی دەستی لەخواردن كێشایەوە، كچێك بەلەگەنو مەسینەو خاولیەك لەسەر شان هاتەژوور، ئەو سابوونەی كە بەدەستیەوە بوو بۆ لای ئەوی درێژ كرد، ئاوی بەدەستی داكرد، دكتۆری ئاژەڵان دەستو دەمو چاوی جوانو خاوێن شوشتن، كشایەوەو چوو لەسەر دۆشەكێك دانیشتو پشتی بەبالیفەكان دایەوە.

"بەخێرهاتیت، سەفات هانی".

"راوەستاوبن، سوپاستان دەكەم".

"ئێمە وامانزانی کە ئێوەش".

دکتۆر پێکەنی.

"من مولازمی یەکەمم. مولازمی یەکەمی ڤێرتەرنەری".

سەربوردەی خۆی لەنووکەوە تا ئاخیر بۆ باسکردن، ئەوانیش ئەوەی کە بەسەریان هاتبوو بۆ ئەویان گێڕایەوە. زیندوومانەوەی خۆیان باوەڕ نەدەکرد.

هەموو کۆچەرەکان دەیانزانی ئەوانە ئەرمەنین، بەڵام گوندیەکانو خەڵکی شارۆچکەکان نەیاندەزانی. لەنێو ترسو هەراس دابوون. پەنایان بردبووە نێو چیاکانی دەوروبەری چاڵدێران. دروست ئەو دەمەی گوتبوویان ئیدی دەربازبووین، سێ کۆچەری موسڵمان هاتبوونە ئەو نێوەو لەنزیك ئەوان هەڵیاندابوو، کاتێك روو بەڕووی یەکدی بووبوونەوە، بەخۆشحاڵیەوە یەکدیان گرتبووە ئامێز. کۆچەرە کوردەکان گوتیان: "مەترسن، تا گیانی ئێمە مابێت هیچکەس ناتوانێت دەستتان بۆ درێژ بکات، ئێستا لەبەرچاوی ئێوە سوێندتان بۆ بەقورئان دەخۆین".

دوای ئەوە بوو کە پیاوێك هاتە ئەو تاوڵەی کە ئەوانی لێبوو، تفەنگێکی ماوزەری پێبوو، راستو چەپ فیشەکدانی لەخۆ دابوون. تاوڵ بەتاوڵ دەگەڕاو لەهەر تاوڵێك مەڕێك، سکەیەك زێڕی داوا دەکردو لەم هۆبەیەش پێنج مافووری گەورەی داواکرد، هەروەها داوای ئەسپێکی باشیشی کرد کە بتوانێت مافوورەکان هەڵبگرێت. گوتی: "ئەگەر بێژن ن...ە، نایدەین، منیش سبەینێ راپۆرت دەدەمە حکومەت کە ئەرمەنیەکانو کوردەکان زۆر لەپیاوانی حکومەتیان کوشتووە. حکومەت ئەوە بزانێت وازتانلێدێنێت؟ لەتلەتتان ناکات؟"

هەمان شەو داواکاریەکانی ئەو پیاوەیان جێبەجێ کردن کە فیشەکدانی لەخۆدابوونو خەنجەری چەرکەسی لەبەر پشتێن بوو. پێیانگوت ئەگەر دیسان پێویستیت بەشتێك هەبوو وەرەوە، فەرمانت جێبەجێ دەکەین. شوانێکیشیان رەگەڵ دا تا مێگەلی ئەو مەڕانەی لەخەڵکی ستاندبوون بۆی بگەیەنێتەوە ماڵێ.

دوو رۆژ دواتر مەڕەکان، مافوورەکانو ئەسپەکە لەبەردەم ماڵی کابرا بوون. ئاغایەکی کۆچەری دیکە، لەبەردەم هەمان تاوڵ لەئەسپە عەرەبیەکەی دابەزی، لەکاتێکدا سەری دانەواندبووو شەرمنانە هاتە ژوور، مافووریان لەنێو تاوڵێدا راخست، دۆشەكو بالیفیان بۆ دانان. ئاغا کۆچەرەکە سەیری ئەوی کردو بەئاماژەی سەر تێیگەیاندن بەچ چاوو

رووێکەوە لێرە دابنیشم‌و ئاوا داوای لێبوردنی لێکردن. ئەو کیسەیەی لەبەر دەستیەوە بوو بۆلای ئاغا کۆچەریە ئەرمەنیەکەی درێژکرد، رووی وەرگێڕاو رۆیشت‌و سواری ئەسپەکەی بووەوە، لەکاتی رۆیشتندا گوتی: "ئەو پیاوەی کە بووە مایەی سەرشۆڕیی ئێمە بەسزای کردارەکانی گەیشت"و رۆیشت.

"قەشەتان هەیە؟ دوعا خوێندن دەزانن؟ دوعاکانتان بەچ زمانێك دەخوێنن؟"

"تەنها هێمای خاچکێشان دەزانین، یەك دانە ئینجیلیشمان هەیە، هیچ دوعایەکیش نازانین".

ئاغا کۆچەرەکە هەستا، ئەو کتێبەی کە لەنێو سەندوقێکی زیوین، لەنێوەڕاستی تاوڵەکە داندرابوو هەڵیگرت‌و دایە دەستی ئەوەوە. جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان کتێبەکەی لەنێو سەندوقچەکە هێنایەدەر، سەیریکرد، حاڵەتی روخساری گۆڕا.

گوتی: "ئەمە دەستنووسە".

ئاغا کۆچەرە ئەرمەنیەکە گوتی: "دەستنووسەو بەئەرمەنیش نووسراوە. لەباپیرانمانەوە بۆمان بەجێماوە".

"ئەرمەنی دەزانن؟"

"تەنانەت یەك وشەش نازانین، ئێمە هەمیشە بەکوردی دەئاخڤین. دەتوانم پرسیارێکت لێبکەم؟"

"بپرسە".

"ئێمە دەتوانین دوای ئەوە بچینەوە بنەگەکانمان لەگەرمێن؟"

جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان هەڵوەستەی کردو چووە بیرکردنەوە.

"کۆچەرەکانی دیکە زمانتان لێنادەن؟"

"هەرگیز. ئەوان برای ئێمەن".

"بنەگە گەرمێنەکانتان لەکوێن؟"

"جزیرە، نسێبین، دروستر بڵێم دەوروبەری هەکاری، واتە دەڤەری بۆتان".

"جارێ لەو ناوانە شتێکی شایانی باس نیە".

"هەموو ئێزدیەکانیان قەڵاچۆکردن. ئەوانەی ماویشن پەنایان بردە بەر کێوەکانی شنگال. ئەوانەی کە لەوێوە دێن باس لەکوشتارێك دەکەن باوەڕ ناکرێت. هەموانیان لەمنداڵی حەوتساڵەوە بگرە تا پیری حەفتا ساڵە سەربڕیوە".

"چی بەسەر خەڵکی ئەو ناوچانە هات؟"

"لێرەش کەسانێکی زۆریان کوشتن، ئێزدیەکان، رووباری رووماسی چەندینو چەندین رۆژی لەسەر یەك خوێن بوو. ئەوانەی توانیان رابکەن رایانکردنو چوونە سەرچیاکانی ئاگری. زۆربەشیان ئێمەی کۆچەری بردمانن بۆ ئێران".

پزیشکی ئاژەڵان دروست هەفتەیەك لەنێو هۆبەی کۆچەرە ئەرمەنیەکان مایەوە. ئەوان وەك ئەوەی منداڵێکی خۆیان کە لەسەربازی هاتبێتەوە ئاوا چاودێریان کردو خزمەتیان کرد. ئالیکیان دایە ئەسپەکەیو عەسران تیماریان کرد. خورجینی ئەسپەکەیان پڕکرد لەجۆرەها خواردەمەنی بۆ بەرێکردنی تا ئەو رێیەی کە بەکەنار گۆلاوەکەی خوارێ تێدەپەڕی هاوڕێیەتیان کرد.

لێرە بەدواوە ئیدی شارەزابوو، رێگای گرتو رێگا بردیو گەیاندیە سەر پردی رووماسی. شەوێك لەوێ، لەژێر پردەکە نووست. بەیانی لەگەڵ ئەوەی لەخەوهەستا، چیای سیپانی لەبەرامبەر خۆیدا بینی. سپیەتی گەشی چیای سەرکەش لەئاوەشینەکەی گۆلی وانێ رەنگی دەدایەوە. خۆر هەڵات، رۆشناییەکی سووربا و کە رووی دەریاچەی وانی گرتبوو، بەخێرایی بروسکەیەك رەنگە شینباوەکەی دەریاچەی کردە دوولەتو خۆی گەیاندە قەدپاڵی چیاکە. دەریاچەی وان بەهەزار رەنگەوە درەوشایەوە.

جەمیلی پزیشك لەکەناری ئەم دەریاچەیە هاتبووە دونیا. لەسەر بەردێك دانیشتو تا شەو داهات تەماشای دەریاچەی کرد. دەریاچە هەرساتەو رەنگێکی شینو رەنگێکی سپی دەگرتەخۆ. بڕیار بوو دوای رۆژو نێویێك بگاتەوە وان، ماڵی خۆیان. لەقارس ئەو دەمەی دیل بوو هەواڵی زۆر ناخۆشی لەبارەی وانەوە بیستبوونو باوەڕی نەکردبوون. ئەو شارە، شارەکەی خۆی جوانترین شاری ئەم دونیایە بوو. کێ دڵی دەهات بەڵایەك بەسەر ئەو شارە بێنێت. خوا دەزانێت دایكو باوكو براو خوشكو کەسو کارەکانی چۆن پێشوازی لێدەکەن، بەڵام ناشکرێت بڵێین دڵەڕاوکێی نەبوو. دوای چوونی سوپای رووسی بۆ ئەنەدۆڵی رۆژهەڵات، ناوچەکە چۆڵ بووبوو. ئەمەی دەبیست، دەیزانی، دەیدیت. چ بەسەر وان هاتبوو؟ هەواڵی زۆر ناخۆش لەبارەی وانەوە هەبوون. وان لەماوەی رۆژێکدا سێ جاران دەست بەدەست کرابوو. چەندین رۆژ لەسەریەك جەنگ لەدەوروبەرو ناوشارو قەڵای شار درێژەی کێشابوو، پاشان سوپای رووس هاتبووە نێو شارەوە، هەرکەسێك توانیبووی رابکات رایکردبوو، ئەوەی نەشیتوانیبوو رابکات... بەهیچ شێوەیەك نەیدەویست بیر لەئەوەی

دوایی بکاتەوە، هەر جارەی کە بیریدەکردەوە، دیمەنی کوشتارێکی ترسناكو شارێکی سووتاوو نوقمی نێو خوێنی لەبەرچاوان بەرجەستە دەبوو.

کە شەو داهات بەرەو پردەکە شۆڕیکردەوە. ئەسپەکەی لەنێو گیا چڕوپڕەکانی زەوییێکی بچووك بەستەوە. خورجینەکەی هەلگرتو بەرەو شوێنێکی هێمنو کشوماتی کەنار پردەکە چوو، توێشوەکەی هێنایەدەر، بەشێوەیەك پارووەکانی قووت دەدا کە بەردەوام لەم لاو ئەولای دەڕوانی. خورجینەکەی خستە ژێر سەری. چیای سیپانی سپی سپی لەبەرامبەریدا بەڕەنگێکی رەش دەرکەوت، وەك تەمێکی لێهات، گوللە سوورو بلێسەدارەکانی تۆپ رێگایان لێگرتبووو بەوشەوشو زرمە زرم لەنێو تاریکیدا هێڵی درێژی سوور، سەوز، شینو نارنجیان بەدوای خۆدا جێدەهێشت. کاتێك کە رەنگی تۆپەکانیش نەدەمان، لەنێو ئەو تاریکیەدا نەیدەزانی چ دەکات.

خەوی لێکەوت. سەری لەسەر خورجینەکە دەکەوێتەخوار، گوللە تۆپەکان چیای بەرامبەر دەهێننە هەژان، پزیشك لەپڕ لەخەو رادەپەڕێت، هێڵێکی رەنگاوڕەنگ پەخش دەبێتو دەڕژێتە سەر رووی دەریاچەی تاریکەوە، چیای سیپان دێت، دیوارێك لەتاریکی دروست دەکات کە گوللە نایبڕێت. بەرەو لای دادێتەوە، هەناسە رادەگرێت، خەوێکی قووڵ دەیباتەوە، بێدەنگییێکی کشومات ئەو نێوەی داگرتووە. جەمیلی پزیشکی ئاژەلان زیاترو زیاتر گرمۆڵە دەبێتە نێو خۆی.

ئەژنۆی وێکهێناونەتەوەو چەناگەی خستۆتە سەر ئەژنۆکانیو وەکو ئەنگوتکی هەویر خڕبۆتەوە سەریەك. شارێك خەریکە دەسووتێت، کلێپەو بلێسەی ئاگر تا ترۆپکی بورجەکان هەڵدەکشێن. سەریان دەقرتێتو بەرەو لای دەریاچە هەڵدەفڕن، شین، نارنجی، سەوز. هێڵێکی سووری تۆخ لێرەوە، لەکاتێکدا کە تاریکی شەق دەکات، بەهەڵەداوان باڵدەگرێتو لەچیای سیپان دەنیشێتەوە. پزیشکی ئاژەلان لەدەنگی زرمەیەکی زۆر بەهێزتری تەقینەوەیەك بەئاگادێت، سەیری چیای بەرامبەری دەکات کە ئاگری گرتووەو بلێسەی ئاگر لەخوارێ تا دوندی چیای گرتۆتە خۆو لەهەندێك جێیاندا ئەو هێڵە سوورباوە هەڵفڕیوانە دەپچڕێنو چیایەکە رەنگێکی نارنجی دەگرێتە خۆی.

پزیشك هەستا، ماوەیەکی درێژ ئاوا بەپێوە راوەستا، بێئەوەی بجووڵێت چاوی بڕیە تاریکی. لەدووری دوورەوە، چیای سیپان لەپشت تاریکیدا، بتەوێت نەتەوێت وەك تەمێکی تەنك دەردەکەوتو لەبەرچاوان بزر دەبووەوە.

چەندە ئاوا بەپێوە راوەستا، چیای سیپان، شار، هێڵە سوورەکان، ئەو تیشکە رەنگاوڕەنگانەی کە لەئاسمانەوە دادەبارین بۆ کوێ چوون، هەموو شتێك پاك بووەوە، جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان کەوتەخوارو یەکسەریش خەوی لێکەوت.

کاتێك لەخەو هەستا، خۆر خەریك بوو ئاوا دەبوو، ئاسمان بێئەستێرە بوو. ماوەیەکی درێژ چاوەکانی هەڵگلۆفین، بەردەوام هەوڵی دەدا، بەڵام نەیدەتوانی پشتی راست بکاتەوە. زامی قاچی راستی وا دەزووراییەوە کە خەریك بوو دڵو هەناوی دەربێن. ماوەیەك بوو کە بەهیچشێوەیەك نەیدەتوانی خۆی کۆبکاتەوە. لەکوێوە هاتبووو دەچووە کوێو ئێستا لەکوێیە، چیدەکرد؟ ماوەیەك بوو جەنگ راوەستابوو، بەهار داهاتبووو تیرێژی خۆر بەشکۆوە دەشت، چیاو ئاوەکانی نوقمی نێو رۆشنایی کردبوو.

لەپڕ وەك بڵێیت بەخۆی هاتبێتەوە لەژێر پردەکە بوو. هەنگاوێك لەولاتریەوە ئاوێکی رەوان کە لەژێریدا ماسی دەبریسکانەوە، بەدوای یەکداو لەسەر یەك بۆ سەرەوە هەڵدەبەزینەوەو قەڵەمبازیان دەدا. ئەمانە لەمانگی شەشدا راست بۆلای سەرەوە بەدوای یەکدیدا، لەکاتێکدا کە تاڤگەکان لەدوای خۆیان جێدەهێڵن، دەڕۆن تا خۆیان دەگەیەننە سەرچاوەی ئاوەکان. هەرچەندە ئاوەکە سەرو ژێر لەڕەوت دابێت، بەهەمان ئەندازە ماسیەکانیش بەرەو سەرەوە لەقەڵەمبازدان. بزەیەك کەوتە سەرلێوانی. ماسیەکان بێپسانەوە دەخولێنەوە، بەو ورشەو تروسکانەی کە لەپوولەکەکانی سەر پشتیان رۆشن دەبنو دەکوژێنەوە. دیسان بزە گەوتە سەر لێوانی، بزەکە لەسەر لێوانی وشك بوو. خورجینەکەی هەڵگرتەوە، رۆیشتو داینایە سەر ئەسپەکەی. ئەو سنگە ئاسنەی کە ئەسپەکەی پێبەستبووەوە هەڵیکێشاو خستیە نێو خورجینەکەو یەکسەر سواری ئەسپەکەی بوو. لەپڕ وەخۆهاتبووەوە. خۆیشی لەمە سەری سوڕمابوو. وەبیریهاتەوە کە نانی بەیانی نەخواردووە، لەکاتێکدا کۆچەرە ئەرمەنیەکان خواردنی خۆشو بەتامیان بۆ خستبووە خورجینەوە. ئەسپەکەی خێراتر کرد. ئەگەر قاچەکەیشی ئاوا ئازاری نەدایە... سووتانەکان، خوێنەکان، وەهەمو خەیاڵاتێکی ترسناکی لەدوا بەجێمابوو. ئازاری قاچیشی بەزوویی تەواو دەبێت. لەبنارەکە تۆپێکی زۆر درێژی بینی، ئەسپەکەی بۆلای تۆپەکە رادا. لوولەی تۆپەکە بووبووە دوو پارچە. وەك بڵێیت رۆشناییەك خزایە ناخیەوە، دەتگوت ئیدی لەدەست هەموو شتێك دەربازی بووەو بڕیار وایە بەدیداری دایكو باوكو دەستگیرانەکەی کە لەشارە جوانەکەی

چاوەڕێی دەکەن، شاد دەبێتەوە. ناچنە هیچشوێنێك، ئەمە ئەرزەڕۆم، تەرابزۆن، ئەمە بەدلیس، سێواس، هەموویان لەجێی خۆیان بوون.

لەئەرزەڕۆم بترازێت هیچ شارێکی دیکەی نەبینیبوو. ئاوەدان بوو یان چۆڵ، نەیدەزانی. شادمانی ناخی تا دەهات زیاتر دەبوو. بەرلەوەی خۆر ئاوابێت دەگەیشتەوە شارەکەیو دایكو باوكو دەستگیرانەکەی دەبینینەوە. کاتێك دەستگیرانەکەی هاتەوە یاد، سۆزێکی لەدڵدا هەست پێکرد. هەموو شتێکی لەبیرکردبووو لەنێو بەدبەختیدا پەلەقاژەی بوو. چی بەسەر هاتبوو، ئایا چاوەڕوانی بوو، بۆچ دەبێت چاوەڕوانی بێت، بەڵکو هەواڵی مەرگیشیان پێڕاگەیاندبێت. ئەگەر سەربازێك ئاوا درەنگ بگەڕێتەوە ماڵێ.. دڵی زۆر بێئۆقرە بوو، ئەوان بەچی بزانن سەربازیی مانای چیە... هیچ ئۆقرەو ئارامیەکی نەبوو. پاشان لەدوورەوە بۆنی گوڵێکی بۆ هات کە ئەو زۆر حەزی لێبوو. ئەوان تا کارتی کوژرانیان پێنەگات، مردنم باوەڕناکەن خۆ... دیسان دڵی گەشایەوە. خەریکبوو لەبرسان دەمرد، لەسەر کانییێك ماندوو، بەڵام دڵنیا لەئەسپەکەی پیادەبوو. خورجینەکەی هەڵگرت، پونگەو تەرخوون لەدەوری کانیەکە روابوون، پریاسکەی خواردنەکانی کردەوە، کەمێك تەرخوونی چنی، نانە تەنووریەکەی کردە دوو لەت، ناولەتێکی نانەکەی پڕکرد لەوردکەنانی سەوزەدارو تەرخوون، تاڵیی پەلکی تەرخوون کەمێك زمانی زوورانەدەوە، دوای تێرکردنی زگی، هەستا، پاشان دانەویەوە، بەلەپی دەستی ئاوی خواردەوە، رۆیشت، مێخە ئاسنینەکەی کە حەوساری ئەسپی پێوە بەستبوو لەعەردەکە دەرهێنا، گوریسەکەی هەڵۆێزنیەوەو لەدەوری مێخەکەی ئاڵاند، مێخە ئاسنینەکەی دووبارە خستەوە نێو خورجین، ئینجا بەزەحمەت سواری ئەسپ بووەوە. هەموو جەستەی بەهۆکارێکی نادیار، شل بووبوو. زۆری نەمابوو لەئەسپ بگلێت. قەڵای وان لەدوور دوورەوە وەك تارماییەك دەبیندراو نەدەبیندرا. بۆ ئەوەی دووبارە قەڵاکە ببینێت چاوەکانی بڕینە قەڵا. لەدووکەڵێك کە بەنەتر بۆ ئاسمان بەرزدەبووە بترازێت هیچی نەبینی. بۆلای چەپو راستی راهەژا. قاچی نەدەئێشا، هەموو گیانیو قاچەکانی گۆد بووبوونو بووبووە پارچەیەك سەهۆڵ. سست بوو، لەگەڵ سستبوون کەوتە سەر تەنیشت. خەریکبوو دەکەوت، بەهەر چەشنێك بوو توانی دەست لەملی ئەسپەکەی وەرئاڵێنێت. ئەسپەکە وەرسووڕا یان ئەو سەری ئەسپەکەی وەرسووڕاند، هاتە سەر لێوی کانیەك، لەئەسپ دابەزیو هەر لەوێدا وەك بەردێك راکشا. ئەو رەوشە چەند درێژەی

کێشا، نـەیزانی. ترسـێك زابـووە دڵیـەوە، ترسـێك ئاوێتـە لەگـەڵ شـادی. کاتێـك لەدەرکـە بچێتە ژووری دایکی چۆن رووبـەڕووی دەبێتـەوە، ئایـا دەروازەی ماڵەکـەیان کـە بەبـەردی سووری تۆخ نەخشێندرابوو، وەکو خۆی ماوەتەوە؟ ئایا باوکی زیلان لەنێو جێدا بەئارامی هەڵدەسـتێتو دێـت ئـامێزی بـۆ دەگرێتـەوە؟ دەسـتگیرانەکەی، ماڵـە گەورەکـەیان لـەنێو باخچـەیەکی پـڕ لـەگوڵ بـوو، کـە دارگـوێزی گـەورە گـەورەیان هـەبوو، بـاوکی کچـەکە، گـەورەترین سـەڕافی وان بـوو. ئـەو بـوو کـە کەلوپـەلی ئـاڵتوونیو زیـوینی دەسـتکردی ئەرمەنیـەکانی لێـرەوە دەنـاردە ئـەمریکاو رووسـیا. کچـەکە هـەر جارێـك ئـەوی دەبینـی بـەجۆشو خـرۆشو شـادییێکی لەڕادەبـەدەر، وەك شـێتان رایـدەکردو لەچاوقوچـانێکدا دەهاتنە نێو باخچەکەو خۆی دەخستە نێو ئامێزیەوە، ئایا دیسانیش ئەوە دەکات؟

لـەپڕ خـۆی لـەنێو باخچـەی گـوڵان، نێـوان خـانووە رووخاوەکـان، بنـی بنـەوەی چاڵەقووڵەکانو لەنێو شەپۆلەکانی دەریاچـەکەدا ون کـرد، قـژی رەنگێکـی سـووری تـۆخی گرتەخۆ، لەبەرخۆیەوە پێکەنی، بێئەوەی تێبینی بکات. جارێکی دیکەش کاتێك هاوینێـك لەسـەریەك لەدەریاچـە مەلـەوانی کردبـوو قـژی ئـاوا سـوور سـوور هەڵگـەڕابوو. لـەوە بـەدواوەش لـەژێر کـەڤرەکانی قـەڵا، هاوینـان لـەنێو دەریـا مەلـەوانی دەکـردو بـەکوڕە قژسوورەکە ناوی دەرکردبوو. دووبارە پێکـەنی، بـۆ تاوێـك بووبـووەوە کـوڕە قژسـوورەکە، هەموو ساڵێك بەقژی سوورەوە دەچـووە خوێندنگـە، کـە پشـوو دادەهـات قـژی وەك خـۆی لێدەهاتـەوە. کەسـیش تێبینـی ئـەوەی نـەدەکرد. لەهـەموو جێیـەكو هەمیشـە کـوڕە قژسوورەکە بوو. لەژێر بەفردا مایەوە. خوێن لەسەری بۆ سەر بەفر تنۆك تنۆك دەگۆڕا. قاچەکانی گۆدو بێهەست بووبـوونو ئـەو بێهەسـتبوونە تـا ناوقـەدی چووبوو. هـەڵمێکی تەنك لەدەریاچەی وان هەڵدەستا.

ئەگـەر پـازدە رۆژان لەسـەر یـەك لـەنێو ئـاوی دەریاچـەی وان مەلـەوانی بکـەیت، ددانەکانت سپی سپیو قژت سوور سوور دەبێت. لەتەرخوون بترازێت هیچ گیایەکی دیکـە نیە کە فێنکایی بەهەناوی مـرۆڤ ببەخشێت. تـەرخوون چۆتە نێـو گۆرانیـەکانیش. دڵـی بێئەندازە بۆ وان تەنگ بووبوو. تەرخوون لەکەنار ئاواندا شین دەبوو، لەگەڵ منداڵەکانی دیکە بۆ کۆکردنەوەی تەرخوون تا شوێنە دوورەکانی دەوروبەری شار رایاندەکرد. بەدوای ئەوانیشـدا دەسـتگیرانەکەی بەڕاکردنـەوە دەهـاتو لەهـەمووان زیـاتر تـەرخوونی کـۆدەکردەوە، قـەڵا، لـەلای سـەرەوەی شـار هەڵکـەوتبوو. بورجـە بەردینـەکان لەهەنـدێك

جێگـادا رووخـابوونو بورجـه دروسـتكراوەكان دەتگـوت ئـەمرۆ لەخشـت دروسـت كـراون، مابوون. دیواره بـەرزەكانی شـاریش لەخشـت دروسـت كرابـوون، ئـەو دیوارانـەش دەتگـوت ئەمرۆكـه دروسـت كـراون. شـەوانی پێنجشـەممە، گرووپێـك لەدەهۆڵـژەنو زوڕنـاژەنو بەندبێژەكانی كوردو ئەرمـەنی، ئێـوه بڵێن سـەد ئێمـه دەڵێین سێسـەد، دەچوون لەسـەر بەردەكانی ژێر قەڵا دادەنیشتنو دەسـتیان بەلێـدانی دەهۆڵو زوڕنـاژەنی دەكـرد، بـەنۆره جارێك دەهۆڵكوتەكان دەیانكوتاو پاشان زوڕناژەنەكان فیڕیان دەكردێ.

خەڵكی شار، پیاوو ژنو منداڵ پیرو لاو، لەپەنا دیوارەكان، لـەژێر قـەڵاو بـن زنارەكـان كۆ دەبوونـەوه. دەمـه دەمـی رۆژئـاوا ئـەو كاتـەی كـه خـۆر دروسـت دەگەیشـته سەرچیای سیپان ئاوازی دەستەجەمعی ژنانو پیاوان دەستیپێدەكرد، سـترانه ئەرمـەنیو كوردیـەكان بەسەر ئاسمانی شاردا تێدەپەڕینو خۆیان بەدیوارەكانی قەڵا دادەداو ئینجا راسـت بـەرەو لای دەریاچــه هەڵــدەفڕین. جارێــك ژنــان دەیانچــڕیو جارێــك پیــاوان. زوڕنــاژەنو دەهۆڵكوتەكانیش پێ بەپێی سترانبێژەكان ئیشی خۆیـان دەكـرد. ئـەو دەمـەیش كـه خـۆر لەقەدپاڵی چیا شۆڕ دەبووەوه، ئاگر دەكرانەوه، سەماو هەڵپـەڕكێ دەسـتی پێـدەكرد. بـۆی هەبوو سەد كەس لەو سەماو هەڵپەڕكێیـەدا بەشـداری بكـات. ژنو پیـاو دەسـتی یەكـدیان دەگرتو رەشبەڵەكێك دروست هەر زێنەت بوو سەیری بكەیت، كاتێـك دەسـتیان دەخسـته نێـو دەسـتی یەكـدی، بەشـێوازی كـۆن، بـەئارامیو شەپۆلئاسـا دەجـوولان، كـه شـەویش دادەهات، ئاگری گەوره گەوره دەكرانەوه، دەهۆڵكوتو زوڕناژەنەكانو بەندبێژەكان لەسەر بەردەكان دەهاتنەخوارو هەموویان پێكەوه لەگەڵ ئاوازی دەهۆڵو زوڕنـا دەچـوونه ریـزی سەوزو زەردو سوورپۆشـەكان. هـەموو پێنجشـەممان دەمـه دەمـی ئێـواران ئـەو ئاهـەنگو هەڵپەڕكێیـه دووبـاره دەبـووەوه. هـەموو جـارێكیش بەسـترانو شـێوازی جیـا. بـازاڕی جەواهیرفرۆشـانیش بازاڕێـك بـوو كـه لـەهیچ جێگایـەكی دونیـا هاوتـای نـەبوو، لێـره ئـاڵتوونو زیـو، لەوەتـەی شـاری وان بۆتـه شـاری وان، وەكـو ئـاو لەپەنجـەی خەڵكەكـه دادەبارێـت. بـاوكی جـەمیل دەیگـوت، ئەرمەنیـەكانی ئێمـه ئەوەنـده هونەرمەنـدو دەسـتڕەنگینن كـه زێـڕو زیـو وەكـو ئاوریشـم دەچـنن، بۆیـه ناوبانگیـان لەهـەموو جیهـان بڵاوبۆتەوه. تـاجی سـەری پادشـاكان، ملوانكـەی ملـی شـاژنەكان، كەمەربەنـدی شازادەكان، قەپێلكی كاتژمێره ئاڵتوونیەكان لێرەوه بەمۆری وەستاكانی وانەوه بۆ سەرتاسـەری دونیـا رەوانـه دەكـران. لەلایـەكی دیكـەش موسـڵمانەكان، كریسـتیانەكان، ئاشـووریو ئێزدیـەكان،

بەشێوەیەکی ئاشتیانەو بەبێهیچ دەمارگیریو ڕەگەزپەرستیەك لەتەك یەکدی، یەکدڵو برایانە دەژیان. ئەگەر ڕووداوێك لەشار بۆ یەکێك لەوانە بهاتبایە پێش، شار هەموو رادەبووو بەهانایەوە دەچوو.

بەهیچ چەشنێك کەس بێڕێزی بەکەس نەدەکردو بچووکترین وشەی نابەجێ بەرامبەر بەکەس نەدەبیسترا. باوکی پزیشکی ئاژەڵان کە ڕۆژگارێکی خۆشی بردبووە سەر، دەیگوت: "گشت شارە کۆنەکان بەو شێوەیەن، لەشارە کۆنەکاندا ڕێزو خۆشەویستی نێوان خەڵکی بنەماو پرەنسیپێکە. سووکایەتیکردن بەهەر کەسێك بەگوناحێکی گەورە دەژمێردرێت. لەشار تەنانەت ئاغاش ناتوانێت سووکایەتی بەرەنجبەرەکانی بکات".

باوکی، شارەکەی خۆی تا ڕادەی پەرستن خۆشدەویست. ئا. ئا.. دایکم، باوکم، ئاه، غەزالە، بەهەموو توانای کە بۆی مابووەوە ئاهێکی هەڵکێشا. ئاه غەزالە! حەسرەت خەریکبوو ئاگری بەردەدایە دڵی. ئەگەر جەنگ هەڵنەگیرسابا، بڕیار بوو پایزی ئەمساڵ زەماوەند بکەن. سواری ئەسپ بووو خۆی هەڵدایە نێو دڵی تاریکیەوە، کاتێك چاوی کردنەوە خۆی لەسەر وردە بەردەکانی لێوار دەریاچەی وان بینیەوە. خۆر لەقەدپاڵە بەفراویەکانی چیای سیپانی دابوو. تیشکی خۆر لەدەریای دابووو هەموو لایەك نوقمی نێو ڕۆشنایی بووبوو، ڕۆشناییەکی ڕەنگاڵەیی. تا نووکە تەنێ بەفر، تەنێ بیابانی وشكو برینگ، تەنێ خاكو خۆڵی سوور سوور... سەری لەو ورشەو بریسکە هەزاران ڕەنگیە کە لەدەریا ڕەنگی دەدایەوە، لەگێژەوە دەچوو.

ئەو هێڵە درەوشاوە سووورباوە، هەزاران ڕەنگو ڕۆشنایی شەفکردو دەریاچەی کردە دووبەشو ڕۆچووە نێو بەفرەکانی چیای سیپانو لەوێو لەبەرچاوان ون بوو. هات لەبەردەم گومبەتێك ڕاوەستا. جارێکی دیکە دڵی گەشایەوە. خێری تیابوو سەری ئەسپی بەڕەڵا کرد، ئەسپ دەیبردە کوێ؟ بیباتە هەر جێیەك لەهەمان شوێن لەئەسپ دادەبەزێتو دەبێتە میوانی هەمان ماڵو هەمان دێ. ئەسپ ڕاوەستا. پزیشکی ئاژەڵان چاوەکانی کردنەوە. دوورگەو کلێسای ئاخدەرمانی لەبەرامبەرەوە بوو لەناوەڕاستی ئاوەوە. بۆ یەکەمین جار لەتەمەنی حەوت ساڵیدا لەگەڵ باوکی سواری بەلەم بووبووو هاتبووە ئەو کلێسایە. سەردەمێك لەگەڵ هاوڕێ ئەرمەنیەکانی ڕۆژانی یەکشەممە دەهاتە ئەم کلێسایە. پاشان چووە ئەستەنبوڵو هەم لەکلێساو هەم لەهاوڕێکانی دوورکەوتەوە. ئەسپ گەڕایەوەو بەرەو لای شار کەوتەڕێ. هیچ دەنگێك لەشارەوە نەدەهات.

کاتێـك گەیشـتە دەروازەی شـار جلـەوی ئەسـپەکەی راکێشـا. دەروازەی شـار کراوەبـوو، چاوێکی لەناوەوە کـرد. هـەموو لایـەك چۆڵ بـوو. هـیچ گیانلەبـەرێك بەدینـەدەکرا، دڵـی کەوتە لەرزین. مووی جەستەی راست بوونەوە، بۆچوونەکەی وەڕاست گەڕابوو. ماوەیـەك بێهـیچ جووڵەیـەك بەسـەر ئەسـپەکەیەوە مایـەوە، وەك کەسـێك سـحری لێکرابێـت نـەدەیتوانی بگەڕێتـەوەو نـەدەیتوانی بچێتە نێـو شـار، ئەسـپ کلکـی خـۆی تـەکان داو بەتونـدی سـەری خـۆی راوەشـاند، بـەرەو لای رۆژهـەلآت وەڕێکـەوت، بـەلای چـەپدا وەرسووڕایەوە، هات لەژێر زنارێکی بـەرزی ژێـر قـەلآ راوەسـتا. لـەژێر زنارەکانـەوە بـۆلای خوارەوە بۆ کەناری دەریاچە رۆیشت. لـەپێش زنارێـك کـە نووسـینێکی بەخـەتی بزمـاری لەسەر هەڵکەندرابوو، راوەسـتا. نووسـینەکە لەنێوەڕاسـتی بـەردێکی سـاف هەڵکەنـدرابوو. نووسینەکان لەبەرئەوەی کە کەس نەیدەتوانی تا ئەو بەرزاییە بچێتو تاڕادەیـەك لـەباو بـارانو بـەفرو لافـاو دووربـوون، بەهـەمان شـێوەی خۆیـان مابوونـەوە. دێرینەناسـێکی ئەڵمانی، دارەبەستێکی بەزنارەکەوە هەڵبەستبووو هەوڵی دابوو قاڵب لەبـەر نووسـینەکان بگرێتەوە، زانایەکی تەمەن سی ساڵەی قەد بڵند، چاوانی شینو دیمەنێکی جوان. پسپۆڕی خوێندنـەوەی نووسـراوە بزماریـەکان بـوو. رۆژێـك لـەلای سـەرەوە پیاوێـك بەئەسـپێکی بیابانیەوە هاتبوو. ئەویش تەمەنی سی ساڵە بوو بەقـژێکی بـۆر، زانیـارییێکی بەئەنـدازەی کـابرای پێشـترو دیمـەنێکی رێکـوپێکی وەك ئـەو، تـەنها ئـەو پیـاوەی ئـەمجارە تفـەنگێکی بەشـانەوەبوو. لەبەیانیـەوە تـا شـەو داهـات لـەژێر دارەبەسـتەکە راوەسـتاو تەماشـای ئـەو کابرایەی کرد کە لەوسەرەوە کاری دەکرد. زاناکە هاتەخوار. بەو کاغەزانـەو ئـەو رەنگانـە کە بەدەستیەوە بوون بەرەو لای شار رۆیشت. سوارەکەش تاوی دایە ئەسپەکەیو رۆیشت. بەیانی زوو، سوارەکە بەرلەوەی زاناکە بێت، هاتو لـەژێر دارەبەسـتەکە راوەسـتا، کـەمێك دواتر زاناکەش هات. زانا تێبینی ئەویکردو بەسەر سڵاوی لێکرد، ئەو بایـەخێکی پێنـەدا. سوارەکە ئـەمجارەش تاوێـك چاوی لەسـەر زاناکـە هەڵنـەدەگرت کـە لەسـەر دارەبەسـتەکە دەستی بەکار کردبوو. ئەو رۆژەش تەواو بوو، شـەو داهـاتو زاناکـە بـەرەو شـار چووەوە. رۆژی سـێیەم، سـوارەکە بـەر لەرووناکبوونـەوەی دەوروبـەر، دیسـان لەوێـدا چـاوەڕوانی زاناکەبوو. دوای ماوەیەك زاناکە هات. خێرا بەدارەبەسـتەکەدا هەڵگـەڕاو دەسـتی بـەکاری خۆی کرد، دروست لەوکاتەدا سوارەکە ئەسـپی بـەرەو ژێـر دارەبەسـتەکە هـاژۆت. چـەکی بەدەستەوە گرتبوو، نیشانەی لەزاناکە گرت، لەگـەڵ هاوارێکدا زاناکـە نـوقمی نێـو خـوێن

بووو لەو سەرەوەڕا کەوتەخوار. سوارەکە ئەسپەکەی یەك دوو هەنگاو لەتەرمەکە نزیکتر کردەوە، ماوەیەك ئاوا لەتەرمەکە نز بووەوە. پاشان بەئەسپەکەی وەك بروسکە تێیتەقاندو دوورکەوتەوەو ئیدی لەو ناوە نەبیندرایەوە.

دوای ئەوە قیامەتێك رابوو، ئەڵمانیەکان بۆ پاشا، پاشا بۆ والیی وان، والیی وان بۆ فەرماندەی سوپا فەرمانیان دەرکرد. کە بەزووترین کات دەبێت بکوژەکە بدۆزنەوە. رۆژنامەکانی ئەوروپا بەردەوام لەبارەی چۆنیەتی کوشتنی گەورەترین دێرینەناس و تاکە خوێنەرێکی نووسراوە بزماریەکان، لەقەڵای وان بابەتیان دەنووسین.

ئێستا وەرەو چارەیەك بدۆزەوە!

فەرماندە فەرمانی دەرکرد کە دەبێت بەزووترین کات، بەزووترین کات بکوژ بدۆزرێتەوە، ئەگەرنا هەرچی بەسەرتان هات لەخۆتانەوە بەسەرتان دێت. رۆژێك ئەو دەمەی دەروازەی شارد دەکرایەوە. ژەندرمەکان بەبینینی سوارێك کە لەدوورەوە دەهات خۆشحاڵ بوون و گوتیان: "ئەمەش بکوژەکە، خەریکە بەپێی خۆی دێت". بەڕاکردن بۆلای چوون و بەرۆکیان گرت و لەئەسپەکە رایانکێشایەخوارێ و یەکسەر دانپیانانیان لێوەرگرت و رۆژی دووەم لەنێوەڕاستی شاری وان لەسێدارەیان دا.

زانای قژبۆر، پیاوە لەداردراوەکە، چیاکانی ئەللاهو ئەکبەر... جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان ئەو کاتەی لەدیلی رایکردبووو خەریکبوو دەگەڕایەوە، رێی کەوتبووە چیاکانی ئەللاهو ئەکبەر. بەفرەکان تواببوونەوە. ژمارەیەك لەتەرمی سەربازەکان لێمشت لەگەڵ خۆی رایماڵیبوون و دەیان هەزاریشیان لەدۆڵ و کەندڕو نێو دارستانەکان بەجێمابوون و لەشوێنی خۆیان هەڵمسابوون. سروشت لەخەو هەستابووو لەچیاکان جۆرەها گوڵ و گولیلك سەریان دەرهێنابوو، گوڵ و سونبل و گوڵەزەردو بنەوشەی کێوان تێکەڵ یەکدی بووبوون. پزیشکی ئاژەڵان، کاتێك بەنێو بۆن و بەرامەی گوڵاندا تێدەپەڕی، لەپڕ وەك بڵێیت لەبەردێك هەڵنگوتبێت ئاوا لەدیوارێك لەبۆن و بەرامەی جۆراوجۆر هەڵنگوت. دەتگوت هەناوی بەربوونەتەوە، ئەسپەکەی بۆلای خوارێ هاژۆت. بۆن و بەرامەکان تا دەهات چڕترو خەستتر دەبوون، بەزەحمەت دەیتوانی خۆی بەسەر ئەسپەکەیەوە رابگرێت. جڵەوی ئەسپی بۆلای لووتکەکە وەرسووڕاندو وەڕێکەوت، بۆنێکی تونددو لەبەرگەگرتن نەهاتووی هەست کرد. گەڕایەوە، بەلای چەپ و راستدا خولایەوە.. ئەو چیدیکەی بەبیرنایەت.

کاتێـك بەئاگاهاتـەوە خـۆی بەراکشـاوی بەسـەر پشـتی ئەسـپەکەیەوە بینـی. هـەردوو دەستی لەملی ئەسپەکەیەوە وەرێنابوون. بۆن، بۆن، بۆنەکە تا دەهات زیاتر دەبوو.

ماوەیـەکی درێـژ سـەیری نووسـینی خەتـە بزماریەکـەی کـرد، بەکونجکۆڵیـەوە لـەدڵی خۆیدا گوتی تۆ بڵێیت تا ئێستا کەس ئەوەی خوێندبێتەوە.

بەهیچ شێوەیەك بـیری لـەوە نـەکردەوە کـە وەختـی خـۆی پیاوەکـە ئـەو زانایـەی بۆچی کوشتبوو، پێویستیشی نەبوو بـیر لـەوە بکاتـەوە. دەیزانـی کـابرا حـەزی لێبـوو بیکوژێت، هەر ئەوە.

دیسان ئەسپەکەی هاتەوە دەروازە، تا تاریـك داهـات لەبـەردەم دەروازەی کـراوەی شار راوەستا. چونکە نـەیدەتوانی ئەسـپەکەی یـەك دوو هـەنگاو بـۆ ژوورەوە بهـاژوا، ئاوا لەوێ راوەستابوو.

لەشوێنێکی زۆر دووری شار، لەکـەنار دەریاچـە لەئەسـپ پیـادەبوو، ئەسـپەکەی لـەنێو مێرگێکی جوان بەستەوە. خواردنەکانی لەخورجین دەرهێنان، لەنێو تاریـك‌و روونـدا زۆر بەهێمنی خواردنەکـەی خـواردو تێربـوو، پاشـان لـەو جوێبـارە بچووکەی تەنیشـتی ئـاوی خوارەوەو خورجینەکەی خستە ژێر سەری.

کە لەخـەو هەسـتا تـاو لێیـدابوو، ئارەقـەی کردبـوو، هەسـتا بـەئاوی جۆگاکـە دەسـت‌و دەم‌و چاوی شوشت، خـواردنی دەرهێنـا، کـەمێك قاورمـەی خـوارد، حەوسـاری ئەسـپەکەی گرت‌و بەرەو شار کەوتـەڕێ. قاچـەکانی بـۆ دواوەیـان رادەکێشایەوە، هـەر هـەنگاوێکی کـە هەڵیـدێنا دڵـی تونـدتر دەکەوتـە ترپـەو زیـاتر زەنـدەقی دەچـوو. کاتێـك کـە خـەریکبوو دەڕۆیشـت تـەمێك دەروازەی داپۆشـی. دەروازە دەروازەی سـەلجوقی بـوو کـە لەبـەردی سووری تۆخ‌و سپی بریقەدار دروست کرابووو هێندەی دەرگاو پەنجەرەی گومبەت جوان‌و رازاوەبوو. ئەو تەمەی کە دەروازەی داپۆشیبوو زۆر چڕبوو. ئەو تەمە چڕو تاریکە وەکو بـەردێك لـەدەروازەوە بـۆ سـەر دەریاچـە شـۆڕ بـووەوە. پەیاپـەی تروسـکە لـەنێو تـاریکی دەریاچەکەوە بۆ شار دەپرشان. لەبازاڕی جەواهیرفرۆشان، لـەبازاڕی ئاسـنگەران... لەسـەر دەریاچـەوە هـەورە تریشـقە بـۆ ئـەملاو ئـەولا بلاچـەیان دەدا. پزیشـکی ئـاژەڵان کـە حەوسـاری ئەسـپەکەی لەدەسـتدابوو بـەردەوام لەشـوێنی خـۆی دەخولایـەوەو تەنانـەت نەیـدەتوانی یـەك بست ئـەولاتری خـۆی ببینێـت، تـا زیـاتر دەخولایـەوە تەمەکـە چڕتر دەبوو. ئاوا کە دەخولایەوە لەدیوارێك هەڵنگوت، وای بۆچوو کە شوورەی شار بێت، ترسـا.

لەترسان دەلەرزی. تا ئەژنۆی چووە نێو ئاوەکە. کاتێك بڕیاری دا بگەڕێتەوە، بێدەستی خۆی زیاتر چووەخوار، نەیتوانی هەناسە بدات، خۆی بەحاڵەتی راکشاوی لەسەر لمی نزیك دەروازەی شاربینەوە. حەوساری ئەسپی هێشتا بەدەستەوە بوو. لەدەروازە پڕ نەخش‌و نیگارەکەوە سەیری ناوەوەی دەکرد. وردە وردە تاریکی کۆتایی دەهات. لەنێو دڵی تاریکیدا تارمایی کەسانێکی بینی. هەوا خەریکبوو رۆشن دەبووەوەو مەیدانی شار وردە وردە پڕ دەبوو. حەشاماتەکە هێواش هێواش زیادبوو، مەیدانەکە پڕبوو لەخەڵك. کەمترین دەنگ نەدەبیسترا، بەچەشنێك کە ئەگەر مێشێك بفڕیبا وزەوزی باڵەکانیت دەبیست. ئاپۆرەکە گەورەبوو. شتێك تەقیەوە. شتێکی درەوشاوە. حافز پاشا بەئەسپێیان، یانی بەتیفۆس نەمرد، لەدەستی ئەنوەر پاشا دیقی کرد. حەسەن عزەت پاشا، فەرماندەی سوپا، پیاوێکی ئازاو ژیرو دانا بوو. "گەورەم، ئێمە ناتوانین بەو بەفرو باو بۆران‌و لافاوەی زستان پەلاماری رووسان بدەین، بەڵێ، ناتوانین، ئەنوەر پاشای من، بەهیچ شێوەیەکیش ناتوانین بچینە توران، پاشای من توران زۆر زۆر لێرەوە دوورە، پاشای من سەربازەکان پێپەتین، جلوبەرگە دڕاوو پڕاوەکانیشیان هاوینیە. بەرلەوەی بگەینە ساری قامیش‌و بەرلەوەی کە تەنانەت گوللەیەکیش بتەقێنین، هەمووماں دەبینە سەهۆڵ. پاشای من". جێگری فەرماندەی ئەنوەر پاشا فەرمانی دا، ئێستا، هەر ئێستا بێڕاوەستان هێرش بەرن. زۆربەی ئەو نەوەد هەزار کەسە سەرما لێیدان‌و بوونە سەهۆڵ. ژمارەیەکشیان ئەسپێ لێیدان. پزیشکی ئاژەڵان دەربازی بوو پاشای خۆم، چوار پێنج کەسی دیکە وەك پزیشکی ئاژەڵان دەربازیان بوو ئەنوەر پاشای من. حەسەن عزەت پاشاش دوای سوپای لەنێوچوو، تووشی غەم‌و خەفەتێکی بێوێنە بوو. بەڵێ ئەنوەر پاشای من، تۆ فەرماندەیی سوپات لەعزەت پاشا ستاندەوەو خۆت لەشوێنی ئەو کردە فەرماندەی سوپاو سوپایەکی بەو گەورەییەت تووشی نابوودی کرد. دڵۆپەخوێن بەسەر ئەو بەفرە سپیەدا دەبریقانەوە. سەربازانی رووس قۆڵەکانی پزیشکی ئاژەڵانیان بەهەموو هێزەوە راکێشان‌و لەژێر بەفر دەریانهێنا. هیچ شوێنێکی نەدەئێشا، بووبووە یەکپارچە سەهۆڵ، ئەو بۆیە لەمردن‌و پارچە پارچە بوون دەرباز بووبوو کە کەوتبووە ژێر بەفرەوە، دکتۆرەکان ئەوەیان گوتبوو. تاریکی کەوتە سەر چاوانی‌و کەمێك دواتر نەما. مەیدانی شار چۆڵ چۆڵ بوو. زۆریی لەخۆی کرد کە بچێتە نێو شارەوە، بەڵام تەنها یەك هەنگاو توانی بچێتە پێشەوە، نەیتوانی هەنگاوی دووەمی هەڵبێنێت، لەشوێنی خۆی رەق

راوەستا، بەڵام کەمێك دواتر چەند هەنگاوێك بۆ دەرەوەی شوورەی شار ڕۆیشت، سەیری مەیدانی چۆڵی شاری کردو ئەسپی بۆ پێشەوە لێخوڕی، بەدەوری شوورەکاندا دەخولایەوە. هەرجارێك دەکەوتە بەرامبەر بەردەنووسەکە رادەوەستا، ماوەیەکی درێژ لەنووسینەکان رادەما، شەرمنانە سەری دادەنەواندو بەخێرایی دەستیدەکرد بەخولانەوە بەدەوری شوورەی شار. تا زیاتر دەخولایەوە، زیاتر تووڕە دەبوو، پاشان هاتەوە سەرخۆی. لەحەوتەم ڕۆژدا کەوتە بیری برسێتی، گەدەی خەریکبوو هەلاهەلابیێت. بەهیچشێوەیەك نەیدەتوانی باوەڕ بەوە بکات ئەم شارە بەو هەموو جوانیو پڕ لەجۆشو خرۆشو زیندووە ئاوا بێکەسو تەنیا مابێتەوە. هەرجارێك کە سەیری شاری دەکرد، هەستی بەتەنیایی دەکرد، بەرگەگرتنی خەڵوەتو تەنیایی دەبووە شتێکی نامەیسەر. تا ئێستا زۆر دەردو بەڵاو ناخۆشی بینیبوونو تێپەڕاندبوون، بەڵام هەرگیز حاڵو ڕەوشێکی ئاوای نەبینیبوو. وایهەست دەکرد هەناوی بەتاڵ بوونەتەوە. نە دەیتوانی لەوێ دوورکەوێتەوەو نە دەشیتوانی بچێتە نێو شار. جارجار لەمە زیاتر ئەو کاتەی لەبەرامبەر بەردەنووسەکە دووردەکەوتەوە، بەو تووڕەییە دەهاتەوە سەرخۆیو دەیتوانی ئەگەرچی کەمێکیش بێت بیربکاتەوە. ئەو پسپۆرە سامگرتووەی نووسینە بزماریەکان، ماتداگرتوو، سەرسوڕماو، تاكو تەنیا بەچاوانی شینی منداڵانەی لەبەرامبەر چاوان وێنا دەبووو دەکەوتو هاوکات لەگەڵ دەنگی ڕێژنەی گوللە لەو سەرەوەی داربەستەکە لەکاتێکدا بەبەردەکان دەکەوت دەهاتەخوارو درێژاودرێژ دەکەوتە ئەو گۆڕە. هەمووان هەواڵی لادانی حەسەن عزەت پاشایان فەرمانـدەییو دانانی ئەنوەر پاشایان بیست، هەمووان چاوەڕوانی ئەو فەرتەنەیان دەکرد کە بڕیار بوو بقەومێت. ئەوەی دەبوا ڕوویدات ڕوویدا، نەوەد هەزار کەس لەژێر بەفری چیاکانی ئەللاهو ئەکبەردا نێژران.

ڕەنگبێت سەد، دوو سەد، سێسەد هەزار دەهۆڵژەن. ستڕانبێژ، زوڕناژەن، ڕەنگبێت لەسەر هەمان ئەو بەردەنووسەی خەتی بزماری ئەو زنارە هەڵکەندرابێت، هەمان ئەو شتەی کە هیچکەس چی لێنازانێت، پسپۆری خوێندنەوەی ئەو نووسینە کوژرا. زۆربەی ئەو نووسینانە پەیوەستن بەپادشاکانو فەتحو زەفەرو شەڕو شۆڕەکان. خوا دەزانێت چەند هەزار مرۆڤ لەپێناو ئەو بەردەنووسانە کوژراونو چەند هەزار ڕەگو ڕەچەڵەك لەبنەوە هەڵتەکێندراون. مرۆڤایەتی لەدێرزەمانەوە لەنێو خوێندا پەلەقاژەیەتی.

دڵۆپ دڵۆپ خوێنی گەش لەبەردەنووسەکە داچۆڕا، بەهەر لایەکی قەڵاش خوێن بەسەر بەفردا ڕێچکەی بەست. خوێن سەر بەردەنووسەکەی داپۆشی. لەدەوری قەڵا مردووەکان بەپێوە راوەستانو بوونە سەهۆڵ. پزیشکی ئاژەڵان بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە، لەنێو دەریایەك خوێندا بەدەوری شاردا دەخولێتەوەو دەخولێتەوە، بۆ تاوێك لەبەرامبەر دەروازەی نەخشێندراودا رادەوەستێت. چاوێك بەمەیدانی چۆڵدا دەگێڕێت، مزگەوتی خەسرۆ پاشای بەرامبەر دەیباتەوە سەردەمی منداڵی.

لەدەوری شاردا گەڕا گەڕا، هەرچەندی کردی نەیتوانی بچێتە ژوورەوە، تووڕە بوو، دەستی بۆ دەمی برد، هاتە سەرخۆی، گەیشتە ژێر درەختێك. ئەسپەکەی بەستەوە، چووە لێوار دەریاچە. دەریا دیسان نوقمی نێو رۆشنایی بوو، دەریاچە بەهەزارو یەك رەنگ دەدرەوشایەوە، هێڵێکی رۆشنایی سوورباوی وەك دەمی تیخیش لەپای قەڵاکە دەدرەوشایەوەو لەچیای سیپان وەك ئەوەی بەشمشێر لەتی بکەیت خامۆش بوو. تیشکی خۆر لەورده بەردەکانی نێو دەریاچەی دەدا، ئەو ژێر ئاوه نوقمی نێو پەرتەوو ورشەی بەردەوام بوو، پزیشکی ئاژەڵان چووبووە نێو خەونو خەیاڵو ورشەی رەنگەکانی دەریاچە هیچ ئاگای لەخۆی نەمابووو هەموو رووداوو کارەساتەکانی لەبیرچووبوونەوە، ئازاری قاچو پشتئێشەی نەمابوو. شادیەکی منداڵانەی لەدڵدا بوو، ناشێت ئەوە لەدەست بدات. خێرا لەشوێن خۆی هەستاو بەهەمان خێراییەوە خۆی گەیاندە دەروازە نەخشێندراوەکە، چووە ژوور، کاتێك چاوی هەڵێنان لەناوەڕاستی مەیدانی شاربوو، بەسەرسامیەوە سەیری لای چەپو راستی کرد. بەرەو لایماڵی خۆیان کەوتەڕێ, دەرگا کراوەبوو. هەر دوو پلیکانەی بەهەنگاوێك بڕینو چووە نهۆمی سەرەوە، دەرگای ژوورەکەی خۆیشی کراوەبوو. چووە ژوور، چۆڵو هۆڵ بوو. چووە ژوورەکانی دایكو باوکی ئەوانیش چۆڵو هۆڵ بوون. لەماوەیەکی کورتدا، هەموو کونو قوژبنەکانی ماڵێ گەڕا. لەمەیدانەکە تەنها گوڵدانە سەفالیەکە مابووو چەپکە گوڵێکی سووری گەشی تێدا پشکوتبوو. بەبینینی گوڵەکان غەمگین بوو. وەك بڵێی دەستو پێی هەستیان تێدا نەما، بەڵام هەر زوو هاتەوە سەرخۆیو بەخێرایی لەپلیکانەکان هاتەخوار، وەکو سەردەمی منداڵی یەکڕاست بەرەو ماڵی دەستگیرانەکەی رایکرد، خانووی لەبەردی مەرمەڕی سوورو سپی ئەوانیش چۆڵ بوو. پاشان سەری بەیەك بەیەکی خانووی دۆستو خزمەکانی داگرت، ماندووو شەکەت چووە بازاڕ، چووە نێو بازاڕی

جەواهیرفرۆشان. چرای هەموو دووکانی جەواهیرفرۆشەکان خامۆش بوو. بەرلەوەی بگاتە ئەوسەری بازاڕ گەڕایەوە، بەڕاکردن لەسەحنی مزگەوتی گەورەی خەسرۆ پاشا چووە ژوور، ئاوی فوارەی حەوزە مەڕمەڕە خەتدارو نەخشێندراوە سەوزو نارنجیەکەی سەحن بەفشارێکی زۆر بەرز دەبووەوە، بەژێر شوورەی شاردا رەت دەبووو دەڕژایە نێو دەریاچەوە. ئەگەرچی تینووی نەبوو، لەپی دەستی لەژێر ئاوە رەوانەکە گرتنەوەو سێ مشت ئاوی خواردەوە. بیری لەهیچشتێك نەدەکردەوە. بەنێو شاردا کۆڵان بەکۆڵان دەگەڕاوو لەملا بۆ ئەولا هەدادانی نەبوو.

تا شەو داهات ئاوا. هەر لەگەڵ ئەوەی خۆر چووە پشت چیای سیپان، بەرەو لای ئەسپەکەی چوو، ئەسپی لەدرەختەکە کردەوە، بردی بۆ سەر لێوی رووبارەکە تا ئاو بخواتەوە، پاشان لەنێو مێرگێکی پڕ لەوەڕ بەستیەوە. خورجینەکەی خستە سەرشانی خۆی. هاتەوە ماڵی خۆیانو چووە ژوورەکەی خۆی. خورجینەکەی خستە ژێر سەری. خواردنو خواردنەوەی بەبیرنەبوو، هەر لەگەڵ ئەوەی سەری نایە سەر خورجینەکە خەو بردیەوە.

نزیکەی نیوەڕۆ بوو بێداربووەوە. وەك بەردێك لەو گۆڕە کەوتبێت ئاوا خەوتبوو. لەکاتێکدا کە نەیدەزانی لەکوێیە، وڕو کاس، سەیری ژووری چۆڵ، پەنجەرەو بنمیچی کرد. بنمیچەکەی کاری دەستی وەستایەکی ئەرمەنی بوو. نەخشە دارینەکان، نیگارەکانی قەلای ناوەڕاستو دەریاچەی دواوەی سەرسامکەر بوون. دەریاچەی ئەو نیگارەش دەبریسکایەوەو دەتگوت شەپۆل دەدا. یەکسەر زانی ئەو ژوورەی کە لێینووستووە ژووری خۆیەتی. لەسەر تەختەخەوی چۆڵ، لەسەر تەرۆکی راستی خەوتبوو، هەموو گیانی وەك ئەوەی لەئاوندا بکوترابێت دەئێشا. بەچاوانی بێهەست ماوەیەك سەیری ژوورەکەی کرد، لەڕاستیدا نەیدەویست هەستێتەوە. سەری کەوتەوە سەر خورجینەکە. بەهەمان شێوە لەحاڵی خەوو بێداریدا مایەوە. دەنگێك لەدەرەوە نەدەهات. نە دەنگی باڵندەیەك، نە دەنگی ئاو، نەدەنگی مرۆڤ. بێدەنگییێکی تاقەتپڕوکێن باڵی بەسەر ئەو نێوەدا کێشابوو. کاتێك بەهەستکردن بەئازارەوە لەسەر تەرۆکی راست خۆی بۆ تەرۆکی چەپ وەردەسووڕاند دەنگێکی ئارامی زوڕنایەکی کەوتە بەرگوێ. دەنگی زوڕناکە تا دەهات باشتر دەبیسترا. ئەو دەنگە دکتۆری وردە وردە دەهێنایەوە سەرخۆی.

هەستا بەهەردوو دەستەکانی جلەکانی داتەکاندنو چووەدەر. گەلای سێ دارسپینداره پیرەکانی لای نافوورەکەی مزگەوت، بەو بایەی کە هەڵیکردبوو خشەخشیان دەکرد.

سەری هەڵبڕیو سەیری درەختەکانی کرد، ئاسمان یەکپارچە شین بوو. لەپڕ چەند ڕەوە قورینگ لەسەر چیای بەرامبەرەوە سەرەو ژێر بوونەوە. بەرەو لای دەشتەکەی ئەودیوی چیای سیپان دەچوون. دەچوون تاکو لەو دەشتە هەموارە بەقاچە باریكو درێژەکانیانو بەپۆپنە شۆڕبووەوەکانیان کە بەشنەی با دەلەرانەوە بەناز بجووڵێنەوە. خوا ئاوەدانی بکات، گۆشتی قورینگ حەڕام بووو ڕاوکردنیشی گوناح بوو. دەنگی زوڕناکە لەکام لاوە دەهات. دکتۆری ئاژەڵان گوێی ڕادەدێراو گوێی ڕادەدێراو هەرچی هەوڵی دەدا نەیدەتوانی ئاراستەی دەنگەکە دیاری بکات. لەقەڵا، لەدەریاچە، لەنێو گومبەتی مزگەوت؟ بەڵکو لەهەموو لایەکیش بێت، بەڵکو لەژێر ئەو خاکەشەوە بێت، تەنانەت ئەو دەمەی کە دەموچاوی بەئاوی نافوورەکە دەشوشت، گوێی هەر بۆ دەنگی زوڕناکە هەڵدەخست. زوڕناژەن زوڕناژەنێکی شارەزابوو. ئەوەندە جوانی لێدەدا باوەڕ نەدەکرا. دەنگەکە تا مێشکی ئێسقان کاری خۆی دەکرد.

دەمو چاوی خۆی شوشت، پشتی ڕاست کردەوە، بۆلای قەڵا ڕۆیشت، هیچکەس لەو دەوروبەرە نەبوو. بۆ دواوە گەڕایەوەو بۆلای دەروازە چوو، لەوێش هیچکەس نەبوو، بۆلای باشووری ڕۆژهەڵات، باشووری ڕۆژئاوا.. دەنگەکە هەندێکجار نزیك دەبووەوە، هەندێکجار دوور دەکەوتەوەو هەندێکجاریش نەدەما.

مزگەوتی خەسرەو پاشای بەزەین داهات، دەرگای مزگەوت داخرابوو، پاڵی پێوەنا، دەرگا کرایەوە. سۆفی بینی کە لەبەردەم مینبەردا چۆکی داداوەو زوڕنای بەدەمەوەیەوەو چۆتە نێو ناخیەوەو هیچ ئاگای لەخۆی نەماوەو زوڕنا لێدەدات. بەشێوەیەك کە تەنانەت بەهاتنی پزیشکی ئاژەڵانیش بەئاگا نەهاتەوە. پزیشکی ئاژەڵان بێهەست لەسەر نووکی پەنجەکان هاتو بەسەر کلیمە ڕەنگاو ڕەنگو مافوورەکاندا تێپەڕیو لەچەند هەنگاوێك نزیك لەسۆفی ڕاوەستا.

چاوەکانی سۆڤی داخرابوون. ئەو هەمیشە ئاوا زوڕنای لێدەدا. بەئارامی چوو لەسەر پلەکانی مینبەر دانیشت. سۆڤی تەواوی سروودەکانو سەردولکەی جۆراوجۆری لێدەدان. زوڕنا، ئاوازێکی ماتەمینی بۆ کەسێك یان هەزار کەس لێنەدەدا، بەڵکو سەرنجڕاکێشترین ئاوازی لێدەدا کە تایبەت بوو بەیەکێك لەجوانترینو کۆنترین شارەکانی دونیا.

سۆفی چەند ئاوازی ژەند، جەمیل چەند گوێی دایێ، هیچکامیان تێبینی ئەوەیان نەکرد.

سۆفی زوڕناکەی لەلێوان کردەوە، ڕێك هەستایە پێ، قەڵافەتێکی زراوو درێژی هەبوو، هەر لەو شوێنە کە لێیبوو راوەستا، چاوی بڕیبووە دەرگا، چووبووە بیرکردنەوە، پاشان بێئەوەی سەیری دەوروبەری بکات بەرەو لای دەرگا رۆیشت، زوڕناکە لەنێو دەستی راستی بوو.

"سۆفی!"

سۆفی ئەمجارەش سەیری دەوروبەری خۆی نەکرد، پزیشکی ئاژەڵان بەهەڵەداوان بەرەو لای چوو دەستی گرت.

"سۆفی، منم، جەمیل".

سۆفی ئاوڕی لێدایەوەو بەبینینی بزەیەکی بۆ کرد، ئامێزی لێدا، پرسی: "جەنگ تەواو بوو؟"

جەمیل بەدەنگێکی وەك ناڵەکردن گوتی: "تەواو بوو".

"کەی تەواو بوو؟"

جەمیل گوتی: "زۆر دەمێکە". سۆفی ژێر باڵی گرت. چوونە دەرەوە، سۆفی دەرگای مزگەوتی قفڵ دا. چوونە لای ئاوپژێنو حەوزەکە، لەئاوپژێنەکە وەرسووڕانو لەسەر تەختە مەڕمەڕیەکە دانیشتن. جەمیل تێشووی خواردنەکانی لەخورجین دەرهێنا، کۆچەریەکان خواردنێکی زۆریان بۆ دانابوو، خواردیان، لەحەساری شار چوونەدەرو هاتن لەژێر درەختەکە دانیشتن. لەدەنگی شەپۆلەکان کە بەهەموو هێزیان خۆیان بەلێوارەکەدا دەکێشا بترازێت هیچ دەنگێك نەدەبیسترا.

چیای سیپان بەرامبەریان بوو. چیاکە بەهەموو سپێتیو درەوشانەوەو شکۆی خۆیەوە لەدەریاچە دەنگی دەدایەوەو لەگەڵ دەریاچەکە شەپۆلی دەداو بەسەر دەریاچە، کە دەم دەم دەدرەشایەوە، پەخشو پەڕاگەندە دەبوو. دەریاچە لەبناری چیا بەملاوە، تا لای رۆژهەڵاتو بن قەڵا سات بەسات رەنگی دەگۆڕا، تۆ دەتگوت ئەمە یاریی رەنگو رۆشناییەو دەڕۆیشت بێپسانەوە لەگەڵ تیشکی هەزارو یەك رەنگدا پەرشو پەڕاگەندە دەبووو مرۆی مەستو سەرسام دەکرد. لەلای زنارەکانی قەڵا رێژنە بارانی لەناکاو ئەو ناوەی دادەکوتا.

لەلای رۆژهەڵات، رۆژئاواو گۆشەو کەناری ئەو ناوچەیە دەنگی تۆپان دەهات. ئەمە رووداوێکی ترسناك بوو. سوپای عوسمانی لەباشوورو رۆژئاواوە دەهاتو سوپای رووسیەش لەلای باکوورەوە، تا دەهات لەشار نزیك دەبوونەوە. بۆی هەبوو هەردوو

لەشکر پێکەوە بگەنە شار. خەڵکی شار، کوردانی موسڵمان، تورکو ئەرمەنیە کریستیانەکان بوون. ئەگەر سوپای رووسیە بهاتبایە شار رەوشی موسڵمانەکان ترسناك دەبوو، ئەگەر لەشکری عوسمانیش هاتبا، ئەرمەنیەکانماڵوێران دەبوون.

ئەگەر هەردووکیان پێکەوە گەیشتبان ئەوا شارەکە بەتەواوی وێران دەبوو، داری بەسەر بەردو سەری بەسەر تەنەوە نەدەما، ئەمە جەنگی جیهانی بووو سەبەبکارەکەشی مرۆڤ خۆی بوو. خەڵکی لەترسو هەراسانیدا بوون. بەشکانی شارەکە هەمووان لەنێو دەچوون. ئەوەیان دەزانیو چاوەڕوانی بوون، بەڵام رووخانی ئەم شارە شکۆمەندە سێ هەزار ساڵیە بۆ ئەوان لەهەموو مەرگو ئازارێك گەورەتر بوو.

رۆژێك هەرچۆنێك بوو دەنگی تۆپەکان دامرکایەوە. ئەگەر جار جار زرمەی تۆپێك یان دوو تۆپیش بهاتبا، ئەوا بەنێو شارو قەڵا نەدەکەوتن، بەڵکو بەگردەکانی دەوروبەر دەکەوتنو دونیا کپ دەبووەوە.

یەکەمجار لەشکری رووسی هاتە نێو شارو پاشان لەشکری عوسمانی. لەماوەیەکی کورتدا شار چەند جار دەستاو دەستی کرد، کە شار دەکەوتە دەستی لەشکری عوسمانی ئەرمەنیەکان رایاندەکردو شاریان بەجێدەهێشتو کاتێك دەکەوتە دەستی رووسەکان، ئەمجارە موسڵمانەکان هەڵدەهاتنو شاریان جێدەهێلا، نەبەردێکی بێبەزەییانە لەدەوری شار هەبوو.

سەرەنجام باوەڕپێکراوانو پیاو ماقووڵانی موسڵمانو کریستیان لەشوێنێك کۆبوونەوەو بڕیاریان دا بەتەواوی شار چۆڵ بکەن. ئەو بڕیارە گەیەندرایە هەموو خەڵکی شارەکە.

شاری چۆڵکراو بەمشێوەیە نە وێران دەکراو نە دەسووتێندرا، دواجاریش رۆژێك هەر دادەهات بۆ شارە جوانەکەیان بگەڕێنەوە.

دیسان شەوێکی پێنجشەممە دەهۆڵژەنو زوڕناژەنەکانو سترانبێژەکان لەسەر زنارەکانی لای سەرەوەی شار کۆبوونەوە. ئەمجارە ئاپۆرەکە لەحەد بەدەربوو. دەهۆڵکوتو زوڕناژەنو سترانبێژانێکی زۆر لەدەمێکەوە دەستیان کرد بەژەنینو ئاوازخوێندن.

هەموو شار، منداڵو پیرو لاو لەژێر زنارەکان کۆبووبوونەوە. سترانبێژو ژەنیارە لێهاتووەکان، کە لەبان ئەو زنارانە راوەستابوون، سترانو هەڵبەستو چیرۆکەکانیان بەهەموو زمانەکان تێهەڵکردو دونیایان هێنایە هەژان، کاتێك خۆر لەپشت چیای سیپان ئاوابوو، ئاگری گەورە گەورەیان کردنەوە.

هـەموو ئـەو نـاوە بەبڵێسـەی ئاگرەکـان بـووە نوێـژی نیـوەڕۆ. کـورد، ئەمـەرنی، سریانی، ئێزدیەکان، ئاشووریەکان، موسایيەکان، حـەفتاو دوو میللـەت لـەدەوری ئـەو ئاگرانە بەتەنیشت یەکدیـەوە راوەسـتان، بـەئاوازو گۆرانیچڕین، بەشـێوازی دێرینـی خۆیان هەڵپەڕین.

خـۆر هـەڵات، دەریاچـە رەنگـە شـینە هـەزارو یـەك دیمەنەکـەی خـۆی بـۆ دەوروبـەر پەخش کرد، ئاپۆرەی خەڵکەکە بۆ کەنار دەریاچە رۆیشـتن، لـەوێ بـەڕیز لەتـەك یەکدی راوەستان، دەستی یەکدیان گرت، کپو بێـدەنگ چاویان بڕیـە ئـاوی دەریاچـەو ماوەیـەك ئاوا مانەوە.

پاشـان، وەك ئـەوەی دەنگێکـی وەك قـەرەباڵغیو ئـاپۆرەی خـەڵك لەشـارەوە بـەرگوێ بکەوێت، پاشان نەما.

"شار لەپڕدا وەك مردبێـت کشومات بـوو، مـن لـەبن شـوورەی شـار، لەسـەر کـەڤرەکان وشـك هـەڵاتبووم. ئـەم شـارە دوای ئـەوەی لـەدوای ئـادەمی باپیرمانــەوە دروسـت کـراوە، سووتاو وێران بووە، بەڵام قەت ئاوا چۆڵ نەبووە. شارێك کە ئاوا چۆڵ بمینێتـەوە هـەزار جار لەو شارەی کە بیسووتێننو لەگەڵ خاکدا یەکسانی بکەنو وێرانـی بکـەن زیـاتر دڵـی مرۆڤ دەپچڕێنێت".

ئەم شارە لەتەنیاییو خەڵوەتێکی جەرگبڕتردا نقـوم کـراوە. سـۆفی بـەر لەخۆرهـەڵاتن لەژێر شوورەی شار، هەستا، لەو تاریكو روونە، لەو شارە چۆڵو کشوماتەدا سام دایگـرت. شـار وەك ژیلەمۆیـەکی نادیـار بـوو کـە پێـنج هـەزار سـاڵ بێـت لـەژێر گـەردو غوبـاردا خــەوتبێت. سـۆفی گـوێی بـۆ دەنگـی دەوروبـەر رادێـرا، شمشـاڵەکەی خستەسـەر لێـوانو هەوایەکی کۆنی لێدا، هەوایـەك کـە پێشـتر قـەت نەیـژەنیبوو، لەبەرئـەوەی دڵـی بەرگـەی سۆزی ئەو هەوایەی نەدەگرت. دەنگی شمشاڵەکە ئەو بێدەنگیەی کە ئەو نێـوەی گرتبـووە خـۆی، تـژی کـرد. لەسـەر زنارەکـان بـۆ کـەناری دەریاچـە رۆیشـت، کـە ئیـدی هیچکەسـی لێنەبوو. لەسەر لمەکە ئەژنۆی دادانو ئاوا مایەوە.

سۆفی ماوەیەك بەنێو شاری چۆڵو هۆڵدا گەڕا، کە تەنانەت سەگو پیشیلەکەیشی تێدا نـەمابوو. زنارەکـان، قـەڵا، دەریاچـەو شـاری لـەنوێوە بینـی، لەگەڵیانـدا ژیـا. لەمزگـەوتی خەسرەو پاشا خەوت. هەموو جاجمو مافوورەکانی مزگەوت وەك خۆیان مابوونەوە. نێـو مزگەوتەکـە پڕبـوو لـەرەنگی بەهەشـتی، رەنگـی وا کـە وەك رەنگـی دەریاچـە دەم بـەدەم لەگەڵ رەنگدانەوەی تیشکی خۆر گۆڕانیان بەسەردا دەهات. ورگی خۆی بەقەیسـی وشـكو

لەتکە سێوو مێوژ، کە لەعەمبارەکانو ئەو پەنیرانەی لەنێو گۆزەکان بوون تێرکردو ژاژیو پەنیر تا حەزبکەیت هەبوو، بەلاَم نان دەست نەدەکەوت. رۆژێك سەرلەبەیانی چووە دوورگەی ئاخدەرمان. ئەوێ دەبوا خۆراکێکی زۆری لێبوایە. لەشوێنێکی هێمنو چۆڵدا بەلەمێکی بچووکی بینی. ئەو بەلەمە هەمیشە لەوێ بوو. دوورگە کەسی لێنەمابوو کە سواری بەلەم ببێتو بۆ ئەملاو ئەولای دەریاچە بڕوات. سۆفی بیریکردەوە، لەبیرچۆتەوە. سواری بەلەمەکە بوو، سەوڵەکان لەسەر بەلەم بوون. چووە دوورگە، کلێسا پاكو تەمیز بوو. نیگارە بەرجەستەکانی هەرچوار لای وەك پەرستگەیەك دەینواند. لەسەردەمانی زۆر کۆندا، لەوسەری دوورگەدا یەکێك لەکۆشکە زۆر بەناوبانگەکانی رۆژهەلاَت هەبوو، تاریفکردنی چیرۆكو باسی ئەو کۆشکە زێڕینو بلوورینە وێردی سەرزاران بوو. ئێستا بەشێك لەبناغەو دەرگا مەڕمەڕیەکەی کۆشکەکە هەروەك خۆی مابووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە دوورگە درەختگەلێکی زۆری لێبوو. هیچ درەختێك لەدەوری کلێسا نەبوو. کلێسا لەدامێنی دوورگەکە هەڵکەوتبوو، هەم لەدەریاچەو هەم لەوشکانیدا، تەنانەت لەزۆر دووریشەوە بەدیدەکرا.

دەرگای کلێسا کراوە بوو. سۆفی هەرکە لەدەرگاکەوە سەیرێکی لەنێو کلێسا کرد، کابرایەکی چوار شانەی سەرو ریش هاتووی بینی کە سەری بەتەختەکانی ریزی یەکەم، کە لەداری گوێز دروستکرابوون، کردبوو. لەنێو دەرگا راوەستاو سەیریکرد، ئەوە گەرگوری ماسیگر نەبێت؟

هیچ زیڕوحێك لەنێو دەریاچەی واندا نیە، ئاوەکەی سوێدەی تێدایە. هەمووانیش ئەمە دەزانن. تەنها لەیەك دوو کیلۆمەتری دوورتر لەئاوڕێژگەی رووبارەکاندا کە دەڕێژنە نێو دەریاچە جۆرە ماسیێك دەژی کە پێیدەگوترێت "کەفال باریك". گەرگوری ماسیگر لەکەسە ناسراوەکانی وان بوو. هەمووان دەیانناسی، دڵی پڕاوپڕ بوو لەمیهرو خۆشەویستی، لەسەر زنارەکان ئەو لەهەمووان باشتر دەهۆڵو زوڕنای لێدەداو لەخوار زنارەکانیشدا سەرچۆپیکێشی شاییو هەڵپەڕکێکان بوو. باشترین ژەنیارو سترانبێژی سترانەکانی عەبدالێ زینکێو فەقێ تەیران بوو. دەنگو ئاوازی بەهرەیەکی خوایی بوو.

لەئاخرین رۆژدا، خەڵکی شار، حەفتاو دوو میللەت، وا ژەنیانو خوێندیان کە بەردیان دەتواندەوە.

دەیگوت: "من لەنێو دەریاچەی واندا چاوم بەدونیا هەڵێنان، من لەدەریاچەی واندا لەدایك بووم، من لەنێو دەریاچەی واندا دەمرم".

ئەو کاتەی لەشکرەکانی رووس‌و عوسمانی سەرگەرمی شەڕو نەبەرد بوون، لەهەر لاوە دونیایان ئاگردەدا، گەرگوری ماسیگر لەنێو دەریای وان لەنێو بەلەمەکە بووو تا ئاخیر رۆژ پێی نەنایە سەر وشکانی. رۆژی دوایی چۆن توانیبووی ببینێت یان ببیستێت، دیارنیە، دەستی دایە دەهۆڵەکەی‌و هات تێکەڵی کۆڕی دەهۆڵژەنەکان بوو.

گەرگور لەخەوێکی قووڵ دابوو. قۆڵێکی لەم سەری تەختەکەو قۆڵەکەی دیکەی لەوسەر بوو.

کاتێك سۆڤ نزیکتر بووەوە. گەرگور بەهەشتاوی هەستایەوە، وڕوکاس سەیری دەوروبەری خۆی کرد، لەشتەکانی دەوروبەریدا ورد بووەوە، گەرگور من سۆڤیم، من، منم، سۆڤ. گەرگور ئەگەرچی وڕو دەستەپاچە بووبوو، بەڵام باوەشی بۆ گرتەوە، گوتی، تۆش؟ جگە لەمن کێ دێتە ئێرە؟ چوونە دەرەوە. لەبەردەم دەروازەی دەرگای گەورەدا دانیشتن. منیش لەمزگەوت دەخەوم، چی تیایە، منیش لەکلێسا.

گەرگور، بەتەما نەبوو لەو دەریاچەیەی کە تیایدا لەدایك بووبوو جیابێتەوە، چونکە لێرە لەو دەریاچەیە لەدایك بووبوو، دەیویست هەر لێرەش بمرێت. بۆیە چەندین قوتوە باریکە ماسی‌و ژمارەیەکی زۆر گۆزەی پەنیری بەگیای کڕیبووو لەعەمباری ژێر زەمینی کلێسا، جێیەك کە هیچکەس نەیدەتوانی بیاندۆزێتەوە، شاردبوونیەوە. ئەگەر لەپڕ کەسێکیش بهاتبایەتە دوورگە، خۆی یەکسەر لەعەمبارەکە دەشاردەوە.

سۆڤ خافڵگیر کرابوو، تەنانەت تۆزقاڵێك بیری دەرچوون لەشاری بەزەین دانەهاتبوو.

کاتێك کە یەك یەکی ماڵەکان گەڕابوو. لەیەکێك لەماڵە چۆڵەکاندا سێ گۆزەی پڕ هەنگوین‌و دوو گۆزە پەنیری بەگیاو گونیەك ئاردی دۆزیبووەوە.

پاشان نیو گونیەی ئاردەکەی بۆ گەرگور برد.

سۆڤ دەیتوانی هەمیشە ئارد پەیدا بکات. هەموو دانیشتوانی دێهاتە کوێستانیەکان رایاننەکردبوو. سوپای رووس نەیتوانی تا دوندی کێوەکان بەدوایاندا بچێت.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "سۆڤ وەرە با پێکەوە لێرە بڕۆین، شارەکەمان ئیدی مرد. تەرمەکەشی نەماو بەلاوانەوەو بەوپەڕی شکۆوە ناشتیان".

"ئەم شارە دیسان زیندوو دەبێتەوە".

"وەك چۆن مرۆڤێکی مردوو هەرگیز زیندوو نابێتەوە، شارێکی مردووش هیچکات".

"زیندوو دەبێتەوە. شاری ئێمە بەرلەوەی من بمرم زیندوو دەبێتەوە. من تا دەمی مەرگ چاوەڕێی دەکەم تا زیندوو دەبێتەوە".

"زیندوو نابێتەوە".

"زیندوو دەبێتە رۆڵە، زیندوو دەبێتە جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان. ئەو دەستانەی کە ئاڵتوون وەك ئاوریشم دەچنن، وەك ئەوەی شیشکە چنین بکەن، ئەو ئاڵتونکارانەی کەنار ناوبانگیان لەهەموو رۆژئاواو رۆژهەلاتو فەڕەنگستانو ئەمریکاو عەرەبستان دەنگی داوەتەوە. لێرە بترازێت لەکوێی دونیا دەتوانن هونەرەکەیان نیشان بدەن؟

یان ئەو دەستانەی کە ئەم کلێسایەیان دروستکردووە، لەکوێی دونیادا ئەوەندە هونەر لەخۆیان نیشان دەدەنو گیان دێننەوە بەر بەرد؟ ئەم شارە دیسان پڕ دەبێتەوە لەخەڵك. ئەم شارە زیندوو دەبێتەوە".

جەمیلی پزیشك سەیریکرد هیچ ئومێدێك نیە، ئەو دەیەوێت بمێنێتەوەو تا دەمی مەرگ چاودێری شارەکەی بکات. پێنج شەممانیش لەسەر بەردەکانی ژێر شوورەی شار دابنیشێتو تێهەڵبکاتە دڵئەنگێزترین ئاوازەکانی، بەڵکو رۆژێك گەرگوریش بەدەهۆڵەکەیەوە بێتو پەیوەیوەندی پێیەوە بکات.

"ئەو بەلەمە بچووکە چیلێهات؟"

"سۆڤی پێکەنی:

"گەرگور منی بەو بەلەمە گەیاندە کەنارەکەو بەڕەڵلای کرد".

"بەلەمە ماتۆڕدارەکەی خۆی چی؟"

"ئەوی لەشوێنێك شاردۆتەوە، کە هیچکەس ناتوانێت بیدۆزێتەوە".

پزیشك سواری ئەسپەکەی بوو:

"خواحافیز سۆڤی. ئینشاللا شارەکەمان زیندوو دەبێتەوە".

سۆڤی گوتی: "زیندوو دەبێتەوە. بەخێرچیت، چاوەڕێتم بەم زووانە بگەڕێیتەوە. پزیشك بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە بوو کەوتەڕێ. ماندووو شەکەت بوو. بڕستی نەمابوو کە لەسەر پشتی ئەسپەکەشی خۆی رابگرێت. دیسان جڵەوی ئەسپەکەی بەڕەڵلا کرد. ئەسپ هەڵیگرتو بەرەو لای باشووری برد، تا ئەو دەمەی شوورەو قوللەکان، منارەکانو قەلای شاری وان دیاربوون. بەردەوام ئاوڕی دەدایەوەو سەیری دەکردن. هەقی لەئەسپەکەی نەبوو، ئەسپ هەرجێیەك گەرەکی با دەچوو. نزیك دەمە دەمی نیوەڕۆ هاتو لەبەردەم دەروازەی وان راوەستا.

سۆفی گوتی: "بەخێر هاتیەوە!"

پزیشك گوتی: "من نەگەڕامەوە، ئەسپ گەڕایەوە".

"دەزانم، لەوەها رۆژانێکدا هەر ئەسپەکانن کە دەگەڕێنەوە، رۆژێکیش تۆ دەگەڕێتەوە وان".

"دەبێت دایكو باوکم بدۆزمەوە".

"دەسگیرانەکەشت، بەڵام خاکی عوسمانی زۆر گەورەیە".

پزیشك پێکەنی:

"شارەکانی عوسمانی گشتیان ئاوا چۆڵو هۆڵ بوونە؟"

"چۆڵو هۆڵیش نەبووبن، مردوون".

"بابچینە لای گەرگور".

"چۆن خۆمان بگەیەنینە گەرگور".

"گەرگور من لەدوورەوە دەناسێتەوە".

پزیشك بەسواری ئەسپو سۆفی بەپێی پیادە هاتنە سەر ئەسکەلەی دوورگە، تا رۆژئاوابوو ئاوا لەوێ بەپێوە راوەستانو چاوەڕێیان کرد کە گەرگور بیانبینێتو بەبەلەمەکەیەوە بێتو بیانبات. سەرەنجام کاتێك بینیان کە لەو دەوروبەرە نیە گەڕانەوە.

"گەرگور کاتێك تۆی لای من بینی ترسا".

"گەرگور نەترسێت چیبکات؟"

"گەرگور مرۆڤێکی ئازاو دلێرە، لەو جۆرە کەسانەیە کە هەموو شتێك دەبینن".

"چما دلێك بۆ مرۆڤ ماوەتەوە...". لەناخەوە ئاخێکی هەڵکێشا، درێژەی دایە "مرۆڤ لەمرۆڤبوون کەوتووە، دراوسێ دراوسێی خۆی دەکوژێت، دۆست خوێنی دۆستی خۆی دەڕێژێت. گەرگور نەترسێت چیبکات. ئەو رووداوانەی کە لەوان روویاندا ئەگەر بەر لەجەنگ روویاندابا کەس باوەڕی نەدەکرد. من خۆم لەگەڵ ئەوەشدا ئەو روودواوانەم بەچاوی خۆم بینیوە، هێشتا ناتوانم باوەڕیان بکەم. جەمیل، کوڕم، ئەو چاوە کوێربووانە تۆ بڵێ چیان نەبینی؟ چ دلاوەریو چ مرۆڤدۆستیو چ نامەردیگەلێك".

رۆژێك بەرە بەری عەسر، هەموو خەڵکی شار، لەمنداڵی حەوتساڵە بگرە تا پیری حەفتا ساڵە لەمەیدانی شار کۆبوونەوە. موسڵمانەکان، کریستانەکان،

ئێزدیەکان، ئاشووریو نەستۆریەکان، هەموویان باشترین جلوبەرگی خۆیانیان پۆشیبوو، هەموو ئەو ناوە نوقمی نێو رۆشنایی بوو. بەرەو لای بەردەم قەلا کەوتنەڕێ. دەهۆڵکوتەکان، زوڕناژەنەکان، بەندبێژان، لەبن شوورەو سەردیوارەکان بەڕیز لەتەك یەكدی راوەستان. بەندبێژان تێیانهەڵکردو لەناخی دڵیانەوە ئاوازەکانی خۆیان چڕی. بنیادەم لەوەتەی هەیە دەنگو ئاوازێکی تا ئەو رادەیە غەمگینو دەردناکی نەبیستبوو. مووی جەستەی ئاوازژەنو گوێگران راست بووبوونەوە، پاشان هاتنەخوارو لەتەك یەكدی راوەستان، سەرتاسەری شار بەم حاڵەتە راوەستابوو. لەدەوروبەری قەلا ئاگری گەورە گەورە کرابوونەوە، حەفتاو دوو میللەت تا بەیانی نوقمی نێو بەزمێکی شێتانە خولانەوە.

"کەللەی بەیانی بینیان دەنگو ئاوازەکان کپ بوونەوەو شاریش چۆڵ بووو هەموو لایەك بێدەنگو کاس بووبوو".

"تۆ ئەمە لەکوێ دەزانیت جەمیل، کوڕم؟"

جەمیلی پزیشك بزەیەکی کرد:

"راستە، سۆفی؟"

سۆفی گوتی: "کاتێك کە خۆرهەلات، هەموو خەڵکی شار هاتن لەلێواری دەریاچە راوەستان. کڕو بێدەنگ، چاویان بڕیە شوورەو چیای سیپان. تا نزیك نیوەڕۆ ئاوا وەکو بەرد لەوێ مانەوە".

"نازانم ماڵی ئێمە، باوکم، دایکم، دەسگیرانەکەم، خوشکەکانم، برایەکانم بەدوامدا گەڕان یان نا، ئاوا سەری خۆیان داگرتو نائومێدو دڵشکاو رۆیشتن، مەگەر نە؟"

"ئەوانەی کە رۆیشتوون زوو دەگەڕێنەوە. وان دیسان وەکو جارانی لێدێتەوە، شار لەنێو رۆشنایی زێڕین، لەنێو گۆی ئەم زەویەدا دەدرەوشێتەوە. ئەمە هەمووی راستە. ئەوانەی رۆیشتن ئەگەر لەئاوارەیی بمێننەوە دەمرن. زوو یان درەنگ دەگەڕێنەوە".

"ئەم قسانەت بەڕاستە سۆفی؟"

ئەمجارە سۆفی بزەیەکی تەڵخی کردو گوتی: "بەڕاستمە، سەیرکە شار لەشوێنی خۆیەتی. مزگەوتی خەسرەو پاشا ببینە، وەکو کۆشکی بلوورین لەڕۆخ قەلا دەبریسکێتەوە. کلێسای ئاخدەرمان ببینە، لەکەشتییێکی زێڕین دەچێت لەنێوەڕاستی دەریاچەکە چراکانی خامۆش کردبێت. سەیری قەلای وان بکە، لەوەتەی دونیا هەیە،

وەك خـۆی لـەوێ دانیشـتووە، زنارەکـانی تـا ڕۆژی قیامـەت بەردەنووسـەکانی دەپـارێزن. ئەوان بۆیە شاریان بەجێهێشتو ڕۆیشتن کە نەکوژرێن. دێنەوە".

"ئەم قسانە ڕاستن سۆفی؟"

"ئـەرێ. تـۆش بـەزوویی دەگەڕێیـەوە کـوڕم. بـاوكو دەسگیرانەکەشـت بچـووبنە هـەر کوێیەك دەگەڕێنەوە. ئەوان بۆیە بەمەیلی خۆیان ئـەم شارە جوانـەیان، ئـەم بەهەشـتەی خۆیـان جێهـێلاو ڕۆیشـتن تـا نەسـووتێندرێتو وێـران نـەکرێت. پـەنایان بردەبـەر بـەر فەرماندەکانی ڕووسو عوسمانی".

"ڕاست دەڵێیت سۆفی؟"

سۆفی پێکەنی، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

ئەسپەکە ئالیکەکەی تەواوکردبوو، پزیشـك سـواری ئەسـپ بـوو، سـێ جـاران بـەدەوری قوللـەکان داسـووڕایەوە، هـات لەبـەردەم دەروازەی گـەورەی هەڵکەنـدراوو پڕشـکۆی شـار ڕاوەستا. سەیرێکی سۆفی کردو سەیرێکی قەڵا، ئەسپی بەئارامی هاژوا، ئەسپ هات لەپێش ئـەو زنـارەی کـە بەردەنووسـەکەی لەسـەر بـوو، ڕاوەسـتا. سـەری هـەڵبڕیو تەماشـای نووسینەکەی کرد. هەزاران هەزار کەس، هەزاران ساڵ پێنجشەممان لەسەر ئـەو زنارانـەی پشت بەردەنووسەکە دانیشتوونو دەهۆڵو زوڕنایان لێداوەو هـەموو پێکـەوە یـەك سـەدا، سترانو ئاوازی شادیان خوێندوەو هاتبونەتە جۆشو خـرۆشو خۆیـان بەقـەرزداری ئـەوە زانیوە کە هاتوونەتە دونیا. جەمیلی پزیشك بیریکردەوە، خۆزگە وەك چۆن ملیۆنان سـاڵ نەهاتبووینە دونیا، ئێستاش نەهاتباین، هەر نەهاتباینەتە دونیاو لەرزی.

لەپڕێکـدا ئـەو هـەموو جەنگـە، چـیاکانی ئـەڵڵاهو ئەکبـەری سـاری قـامیش، بەسـەهۆڵبووەکانی نێـو بـەفر، چـاوانی لەقـەپێلك دەرپـەڕیو، نیگـا خەمگینـەکان، تـۆراو، تینووی ژیان... لەچاو هەڵێنانێکدا چاوانی دەرپەڕیو هەرچوار دەوریان تەنی. لـەنێو ئـەو تاریکاییـەدا بروسـکەیانداو کوژانـەوە. پزیشـك ئەسـپەکەی بـەرەو لای لێـواری دەریاچـە هاژۆت، ماوەیەك بەسەر لمەکان داڕۆیشتن، کاتێك گەیشـتنە بەرامبـەر ئاخـدەرمان، ئەسـپ هەر بەخۆی ڕاوەستا. دەریاچە لەپشت کلێساو چیای سیپان، کـە سـەری لـەئاسمانی سـپی خشاندبوو، لەوسەری دەریاچە نـوقمی نێـو ڕۆشـنایی بووبـوون. دەریاچـە کـپو بێشـەپۆل بوو، یەکپارچە شین بوو، سێ پنکە هەوری بەسەردا تێدەپەڕین، خۆیانو سـێ سـێبەر کـە بەنێو دەریاچەکەدا پێ بەپێی پنکە هەورەکان دەڕۆیشتن.

بەنێو دارگوێزو سپینداره بەرزەکاندا تێپەڕی. هێشتا ئەو بێدەنگیەی کە لەنێو دڵی شاره خەڵوەتو چۆڵو هۆڵەکەیدا هەبوو لەگوێیدا دەزرنگایەوەو هەستی پێدەکرد. تەپۆلکەیەکی بینی. گومبەتێك بەسەر تەپۆلکەکە وەبوو، دەتگوت دەخولێتەوەو بۆ ئەملاو ئەولا تەکان دەخوا. ئەو گومبەتەی زۆر باش بەبیربوو.

چەند جار بۆ زیارەتکردن لەگەڵ باوکی هاتبووە ئێرە، باوکی دەستەکانی بەرزدەکردنەوەو رووی تێدەکردو دوعای دووردرێژی دەکردن، لەخوار تەپۆلکەکە جڵەوی ئەسپەکەی راکێشاو بۆ لای گومبەتەکە وەرسووڕا، دەستەکانی بەرزکردنەوە، لەکاتێکدا کە لێوەکانی دەجوولان، ماوەیەکی درێژ دوعای کرد. دوای دوعاکردن ئەسپەکە سەربەخۆ وەڕێکەوت.

دۆڵە دوورو درێژو جەنگەڵیەکە تەواو بووبا دەگەیشتە دەشتێکی فراوان، دوو رۆژی برد تا گەیشتە ئەوسەری دۆڵەکە. ئەسپەکەی ماندوو بوو، لەسەر کانییێك لەئەسپ دابەزی، ئەسپی لەنێو مێرگێکی خۆش بەستەوە، لەسەر زگ لەبەردەم کانیەکە راکشاو دەمی بەئاوەکەوە ناو تاتوانی ئاوی خواردەوە، ئاوێکی زۆر خۆشو سازگار بوو، سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد، لەو دیودا گابەردی قووچ قووچی بەدیکردن. بیریکردەوە ئاوی ئەو کانیە لەنێو ئەو گابەردانەدا هەڵدەقوڵێت، بۆیە ئاوا سازگارە. لەهەموو لایەك بۆنو بەرامەیەکی چڕو جۆراوجۆر دەهات، کاتێك شنەبایەك دەهات لەگەڵ خۆیدا بۆنی چڕی خاکی دەهێنا. زۆر سەرسام بوو. تا ئەو شوێنەی ئەو دەیزانی ئەو کاتەی باران نم نم دەبارێتو خاکەکە تەڕ دەکات، ئەو بۆنەی خاك بڵاودەبێتەوە، جگە لەوە، کاتی هەڵهاتنی خۆر، وەختی جووتکردن، خاك، رۆشنایی، شنەبای سپێدان، گوڵو گیاو گۆڵەکان، گشتیان پێکەوە بۆنو بەرامەیەکیان هەیە مرۆڤ مەست دەکات. لەنێو گشت بۆنو بەرامەکان تەنها دەکرێت بۆنی خاك لەوانی دی جیابکەیتەوە. مرۆ لەخۆشیان شێت دەبێت.

جەمیل دوای نانخواردن ئەمجارە بەلەپی دەستەکانی ئاوی خواردووە، لەڕۆخ کانیەکە راکشا. لەپەنا دارسپیندارەکان سەیری ئاسمانی کرد، نوقمی نێو خەیاڵان بوو. تا ئەو دەمە هەرگیز نەیبینیبوو ئاسمان ئاوا سافو شین بێت. کەمێك دواتر، باڵندەیەك ئەوەندەی کۆتریك دەبوو هەڵنیشتە سەر لکی یەك لەدارسپیندارەکان کە زەردو باریکەڵە بوو. ناخی گەشایەوەو لەخۆشیان خەنی بوو. ئەو هەستی تەنیاییەی لانەما. لەخۆشحاڵیان نەیدەزانی چیبکات.

هەستا، سەری گێژی خواردو زۆری نەمابوو بکەوێت، شنەبایەك هەڵیکرد، دووبارە بۆنی خاکی هێنا. هاتەوە سەرخۆی، یەکڕاست بەرەو لای بەردەڵانەکە رۆیشت. مەودای نێوان کانیەکەو بەردەڵانەکە زۆر بوو. هەموو نێو بەردەڵانەکە گەڕا، نەیتوانی سەرچاوەی ئەو بۆنی خاکە بدۆزێتەوە.

لەپشت بەردەڵانەکە، لەلای سەرەوەی دۆڵەکە، لێڕەوارێکی داربەڕووانی بینی کە سووتاوو رەشداگەڕابوو. بۆنە خۆشەکە، زوڵاڵی خۆی لەدەستدا. بۆنی خاكو هەموو شتێکی دیکەی لەبیرچووەوەو خێرا بۆ رۆخ کانیەکە گەڕایەوە، کانیە لیەکە بەشێوەیەك دەدرەوشایەوە کە دەتگوت نە ئاوە نە رۆشناییە. مەلە زەردەکە کە تاوێك پێشتر لەسەر دارسپیندارەکە هەڵنیشتبوو، هەر لەجێی خۆی بوو.

مەلەکە لەکاتێکدا رەنگە زەردو مەخمەڵیو نەرمونیانەکەی خۆی زیاتر دەکرد، بەبنیمچی ئاسمانەوە چەسپیبووو بیری دەکردەوەو تاو ناتاوێکیش باڵەکانی لێکدەدان. دووبارە شادیی ناخی پڕکرد. دۆڵی سووتاو، لێڕەوار، وانی کشوماتی لەبیرچوون، بۆلای ئەسپەکەی چوو، مێخە ئاسنەکەی کە ئەسپی پێبەستبووەوە هەڵکێشاو خستیە نێو خورجینەکە، ئەسپیش مەست بووبوو، دەستیکرد بەنەرمەغار. نزیکەی نیوەڕۆ بوو، دۆڵەکەی تەیکردبووو قەڵای وان لەدوور دوور دیاربووو هەر لەشوێنی خۆی بوو، لەلای چەپ، بتەوێت نەتەوێت، هەندێك دەنگی بیستن دەتگوت ناڵە ناڵە. جلەوی ئەسپەکەی راکێشا، گوێی رادێرا، دەنگەکان لەپەنا تۆپەڵە درەختە چڕو سووتاوەکانەوە دەهاتن. ناڵەی سەیر، کە تا ئێستا گوێی لێنەبووبوون. بەرەو لای تۆپەڵە درەختە سووتاوەکان چوو.

لەناکاو دەنگەکان نەمان. جەمیل بەدەوری درەختەکاندا سووڕایەوە. ماتو سەرسام ما: ژمارەیەك منداڵی چکۆلە. دە، یازدە، دوازدە ساڵە، گۆنای هەموویان پێکداقوپاو، چاوەکانیان لەقوڵدا چووبوونو پێستی جەستە بچکۆلەکانیان بەئێسقانەوە نووسابوو. ملیان باریك باریك بووبوو. هەندێکیان رووتو قووت بوون وەك ئەسکلێتو هەریەکیان دەتگوت پارچەیەکی کۆنەیە. هەر لەگەڵ ئەوەی سوارەکەیان بینی، رووی هەموویان بۆلای وەرسووڕان، گەردەنیان بۆلای سوارەکە درێژبووەوە، ویستیان قسە بکەن، هیچ کامیان نەیانتوانی. تەنها دەنگێکی وەك ناڵەو گریەیان لێوەهات.

جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان، هیچ برستی لەبەرنەمابووو نەیدەتوانی خۆی بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە رابگرێت، لەو نێوە وشکهەڵاتبوو. لەو منداڵانەی زۆر بینیبوون، ئەمانە

منداڵی ئەرمەنیو کوردو کوردە ئێزدیەکان بوون، کە دایكو باوکیان لەشەڕ لەدەست دابوونو هیچ کەسیان نەبوو، بەڵام ئەو منداڵانەی پێشتر بینیبوونی هیچیان حاڵو رەوشی ئەمانەیان نەبوو. سەدان کەسیان پێکەوە وەك لێشاو لەگوندێك دەچوونە گوندێکی دیکەو لەشارۆچکەیەك بۆ شارۆچکەیەکی دیکە، لەشارۆچکەکان، گوندەکان، خانووەکانو دووکانی گوندو شارۆچکەکاندا هەرچی خۆراکێکیان دەست کەوتبا هەڵیاندەگرتو وەکو با لەچاوتروکانێکدا تێیاندەتەقاندو دەڕۆیشتن. خەڵکی ئەو شارۆچکەو دێهاتانە بەسواری ئەسپەکانیان راویان دەنانو هەریەکێکیان بکەوتبایەتە بەردەست دەیانکوشت. هەندێکجار پێکدادان لەنێو ئەو منداڵو ئەسپسوارانە روویدەداو منداڵەکان بەدارو بەردو لەگەڵ چەکدارەکاندا دەکەوتنە شەڕو رووبەڕووبوونەوەو بەشێوەیەکی بێڕەحمانە بەشەڕ دەهاتن. یان یەکێکیان مەیدانی شەڕەکەیان جێدەهێڵا یان جەنگو پێکدادان تا تاریك دادەهات درێژەی دەبوو. زۆر منداڵ دەکوژرانو خەڵکی ئەو شارۆچکەو دێهاتانە کەلو کۆم دەبوون. جگە لەوە میگەلی لەنێوچوو پەرشو بڵاوو سەگە بەڕەڵلاکان ئەو ناوەیان پڕ کردبوو، بێڕاوەستان لەکێوو گوندو شارۆچکەو دۆڵو دەشتو جەنگەڵەکان دەسووڕانەوەو هەر گیانداریێکیان بکەوتبایەتە سەر رێ لەتو پاریان دەکرد. سەگەکان وەکو گورگانیان لێهاتبوو. ئەم سەگانە سەگی ئەو ئەرمەنیو کوردانە بوون کە کۆمەڵکوژ کرابوون.

جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان، کاتێك بینی هیچ دەنگێك لەمنداڵەکان دەرنایە، ئەسپەکەی بەرەو لای دەشت وەرسووڕاندو منداڵەکان ئەگەر چەند رۆژێکی دیکە ئاوا مابانەوە هەموویان پێکەوە لەنێو دەچوون. ئەسپەکەی خێراتر کرد. خاك لەژێر سمی ئەسپەکەیدا هەڵدەلەرزی. بەو خێراییە گەیشتە نێو شارۆچکەکە. بەرلەوەی جلەوی ئەسپەکەی رابکێشێت، ناونیشانی بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی لەیەکەم کەس کە رووبەڕووی بووەوە پرسی، کابرا شوێنەکەی پیشاندا. دکتۆری ئاژەڵان ئەسپەکەی لەپەیژەکە بەستەوەو پلیکانەکانی دوو دانە سێ دانە بەجارێك بڕینو بەهەناسە بڕکێوە چووە ژووری بەڕێوەبەری ناحیە، سڵاوی سەربازی کرد:

"خەریکن دەمرن، خەریکن دەمرن، خەریکن گیان دەدەن، سەدان منداڵ لەچاڵێکدانو هەمووشیان رووتن، خەریکن دەمرن".

بەڕێوەبەری بەساڵاچوو کە سمێڵێکی گەورەو سپی دەمی داپۆشیبوو، بەخوێنساردیەوە گوتی: "ئێستا دانیشە بەڕێز، ئێستا تۆ جارێ دانیشە، قاوەی ئێمە بخۆرەوە پاشان پێکەوە قسە دەکەین".

شوێنی بۆ دیاریکرد.

"فەرمووو، بەڕێز".

پزیشك لەکاتی دانیشتندا گوتی: "خەریکن دەمرن گەورەم، خەریکن دەمرن. خێرا دەبێت بەهانایانەوە بچین، نابێت لێبگەڕێین لەنێو بچن".

"ئێستا پشوویێك بدە، قاوەیەك بخۆرەوە".

"بەڵێ گەورەم، سوپاست دەکەم گەورەم، خەریکن دەمرن گەورەم".

"کێن ئەوانەی کە خەریکن دەمرن؟"

"منداڵ، منداڵی چکۆلە لەنێو چاڵێکدا خڕبوونەتەوە سەریەك، رووتن، هەموویان هەرتەنها ئێسكو پروسکن، لەنێو چاڵەکە دەنگی ئێسکەکانیان دێت، خەریکن دەمرن، هەرئێستا، خێرا ئەگەر بەهانایانەوە نەچین دەمرن، خەریکن گیان دەدەن، پزیشکێك....".

"گوتت منداڵ؟"

"منداڵ گەورەم، هەر ئێستا، هەر ئێستا".

بەڕێوەبەر پێکەنی:

"گوتت منداڵ؟"

"بەڵێ قوربان، زۆر بچووکن".

"دەزانی بەڕێز، تۆ هەرگیز خۆت نیگەران مەکە، بینایی چاوانم بایەخ بەو شتانە مەدە. گشت چاڵو دۆڵو کەندڕەکانی ئەم گوندو شارۆچکانە پڕن لەئەسکەلێتی ئەوان".

"لانی کەم با ئەوان لەنێو نەچن گەورەم. ئێستا، هەر ئێستا، خێرا پزیشك، دەرمان".

بەڕێوەبەر بەهاوارکردنەوە گوتی: "ئەوان دەمرن".

"تکا دەکەم بەڕێز تۆ چیدەڵێیت؟"

"ئەوان دەمرن، دەبێت بمرن".

"یانی چی بەڕێز، ئەوان منداڵن، منداڵەکانی مرۆڤن، وا دەمرن".

"ئەوان منداڵی مرۆڤ نین، ملازم، بێچوە مارن. تازە تۆ لەکوێ و لەکام بەرەبوویت؟"

"لەساری قامیش".

"لەوێ نەوەد هەزار سەرباز ئەسپێ لێیدانو مردن، مەگەر نا؟"

"بەڵێ گەورەم".

"نیوەشیان بووبوونە سەهۆڵ، مەگەر نا؟"

"بەڵێ".

"تۆ چۆن توانیت دەرباز ببیت؟"

"داستانەکەی دوورو درێژە".

"لەسوپایەکی گەورە چەند کەستان بەزیندوویی مانەوە؟"

"زۆر کەم، بەئەندازەی پەنجەی دەست".

بەڕێوەبەر لێوەکانی وێکهێنانەوەو بەئەدایەکی گاڵتەئامێزانەوە گوتی:

"ئەگەر فریایان نەکەوین ئەو منداڵانەی نێو چاڵەکە دەمرن؟"

"دەمرن گەورەم".

بەڕێوەبەر هەستاو دەستیکرد بەشیڕە شیڕو دەنگهەڵبڕین. ڕەنگی دەمو چاوی سوور سوور هەڵگەڕا. ڕەگی ملی دەرپەڕین. زۆر توند دەستی بەمێزەکەی بەردەمی دادا:

"تۆ دەزانی ئەو منداڵانە کێن ملازم، ئەوان مرۆڤ نین، ڕەوەی کوللەن. ئەوان منداڵ نین، گورگن، ئەوان ئەم وڵاتە مەزنەیان سووتاند، وێرانیان کرد، شارۆچکەو دێهاتەکانیان تاڵان کرد، مرۆڤەکانیان کوشتو دەستدرێژیان کردە سەر کچۆڵان. ئەوانە ئەرمەنین، ئەوانە کوردن، ئەوانە ئێزیدین، ئەوانە کلدانین، ئەوانە قەرەجن، ئەوانە ڕۆڵو زینازادەی حەفتاو دوو میللەتن. هەر چوار کتێب کوشتنی ئەوانەی ڕەوا کردووە. تۆ ئەوان ناناسیت. باشتر کە دەمرن، لەدەستی ئەمانە، ئەو کوللانە، ئەو کەرکەدەنە شێوە ئادەمیزادانە، ئەو گورگە خوێنخۆرانە ئاسوودە دەبین".

ئارەقەی کردو لەشوێنی خۆی دانیشتەوە، دەستەکانی دەلەرزین. قاوەی پزیشکی ئاژەڵانیان هێنابووو لەسەر مێزەکە داندرابوو.

"قاوەکەت بخۆرەوە ملازم! ئێمەش سەربازین".

"بەڕێز خەریکن دەمرن".

بەڕێوەبەری ناحیە تا هێزی تێدابوو هاواری کرد: "قاوەکەت بخۆرەوە!"

پزیشکی ئاژەڵان لەشوێنی خۆی هەستا، لەتووڕەییان هەموو گیانی دەلەرزی، بەرەو لای دەرگاکە چوو، لەپلیکانەکان چووەخوار. مەیدانی شارۆچکەکە کەمێك لەپێشتربوو. ئەملاو ئەولای مەیدانەکە دووکان بوون.

بەهاوارکردنەوە گوتی: "خەریکن دەمرن. منداڵەکان خەریکن دەمرن، سەدان منداڵ لەنێو چاڵێکدا خەریکن دەمرن".

لەنێوەڕاستی مەیدانی شارۆچکەکە هاواری کرد. وەکو شێتانی لێهاتبوو. هیچکەس بۆلای نەهات، هیچکەس لەدووکانەکان نەهاتەدەر، پزیشکی ئاژەڵان تووڕەو بێئۆقرە دەستی کرد بەگەڕان بەنێو یەك بەیەکی دووکانەکان". خەریکن دەمرن، منداڵەکان دەمرن. سەدان منداڵ لەچاڵێکدا خڕبوونەتەوە، رووت رووت، خەریکن گیان دەدەن". ئەوانەی لەدووکانەکان بوون نە تەکانێکیان دەدایە خۆو نە جوولەیەکیان دەکردو نە وشەیەکیان لەدەم دەهاتەدەر، تەنها بەواقوڕماوی‌و دڵسۆزیەوە سەیری روخساری ئەویان دەکرد.

پزیشکی ئاژەڵان ئاوا کە لەمەیدانی شارۆچکەکە وەکو شێتان، دووکان بەدووکان دەگەڕا، پیاوێکی کەڵەگەتی ریش سپی لەبەرانبەریدا راوەستاو گوتی: "بوەستە کوڕم، بوەستە ملازمەکەم، لەم ناوانە منداڵگەلێکی زۆر کوژران، منداڵانێکی زۆر لەبرسان مردن، بەخۆڕا دادو هاوار مەکە، هەناسەت لەبەر بڕاوە، خۆت مەخەرە دەردەسەری".

پزیشکی ئاژەڵان زەرد هەڵگەڕابووو بەواقوڕماویەوە سەیری پیرەمێردەکەی دەکرد.

"ئاوا سەیر مەکە کوڕەکەم، خۆت مەخۆرەوە. لێرە هەمووان بەمردنیان رازین. زۆری پێناچێت مەدالیا بەوانە دەدەن کە منداڵەکانیان کوشتوون. ئەو کەسەی کە زۆرترین منداڵ بکوژێت بەگەورەترین قارەمان ناوزەد دەکرێت. کوڕەکەم ملازمەکەم، سواری ئەسپەکەت بەو بڕۆ. ئەمنیش سەربازم‌و تێتدەگەم.

یازدە ساڵان سەربازیم کرد، هیچ جەنگێك نیە بەشداریم تێدا نەکردبێت. زۆر لەو کەسانە بەشداری شەڕان دەکەن زۆر لەهەست‌و سۆزە مرۆڤایەتیەکانیان لەدەست دەدەن، مێشکیان تێکدەچێت، حەز بەخوێنڕێژی دەکەن. ژمارەیەکی کەمیش دەبنە دوژمنی خوێن‌و خوێنڕشتن‌و کوشت‌و کوشتار. تا ئەوانەی تینووی خوێنن بەڵایەکیان بەسەر نەهێناویت، رێی خۆت بگرەو بڕۆ کوڕەکەم. هیچ رێگایەکی دەرباز بوون بۆ ئەوان لەنێو چاڵەکان نیە. هەر کارێك بکەین ئەوان هەر دەمرن کوڕەکەم.

پزیشکی ئاژەڵان لەشوێنی خۆی رەقهەڵات.

"تۆ لەکوێوە دێیت؟ لەکام بەرەی شەڕبوویت کوڕم".

پزیشکی ئاژەڵان تەنها ئەو کاتە توانی وەڵامی پیرەمێردەکە بداتەوە کە ئەو سێ جار بوو ئەو پرسیارەی دووبارە دەکردەوە.

"لەساری قامیش لەچیاکانی ئەللاهو ئەکبەر".

"لەوانەی کە لێرە لەو ناوچانەی ئێمە بۆ سەربازی چوونە ئەوێ تەنانەت یەك کەسیشیان نەگەڕایەوە".

خۆی درێژ کردو دەستی گرتو دەستی گوشیو پێیگوت: "وای ی ی کوڕەکەم وای!" و لێی دوورکەوتەوەو ڕۆیشت.

پزیشکی ئاژەڵان ئاوا بێئەوەی بزانێت چ دەکات لەنێوەڕاستی مەیدانەکە مایەوە. کەمێك دواتر بێویستی خۆی بەرەو لای ئەسپەکەی ڕۆیشتو بەزەحمەت سواری ئەسپەکەی بوو. بەبەردەم نانەواخانەیەکدا ڕەت بوو کە بۆنی نانی گەرمی بۆ هات. لەبرسان خەریکبوو دەمرد. ماوەیەك لەبەردەم نانەواخانەکە ڕاوەستا، پاشان ئەسپەکەی بۆلای دەرگەی نانەواخانەکە هاژوا.

"سێ نان".

نانەوا سێ نانی گەرمی تازە لەتەنوور دەرهاتووی بۆ درێژکرد، نرخەکەی پێگوت. ئینجا پێیگوت:

"زۆر گرانە وانیە؟ دەمت دەسووتێت". گاڵتەی کردو پارەکەی خستە گیرفانی بەرهەڵبێنەکەی. "ئەم تەنوورە چەندین ساڵ ئاردی بەخۆوە نەدیوە. دوێنێ لەشوێنێکەوە سێ گونیە ئاردمان بۆ هاتووە... خەڵکی شارۆچکە هێشتا نازانن نان دەکەین. تاوێکی دیکە وەك مێرووله دادەڕژێن، لەچاوتروکانێکدا هیچ نانێك نامێنێتەوە".

پیاوە پیرەکەکە لەپزیشکی ئاژەڵان دوورکەوتبووەوە گەڕایەوە، هاتە لایەوە، دەستی خۆی خستە سەر یاڵی ئەسپەکە:

"سەیر بکە ملازمی هێژا، کوڕەکەم، خوا خۆی دەزانێت لەو جەنگەدا چەندین سەختو زەحمەتیت چەشتووە". دووبارە دەستی خستەوە سەر یاڵی ئەسپەکە.

"تا زووە لێرە بڕۆ. تۆ خەریکی گۆبەندێك دەنێیتەوە. ئەو منداڵانە لەنێو ئەو چاڵەدا دەمرن، دەزانیت؟"

پزیشکی ئاژەڵان ئەسپەکەی لێخوڕیو لەشارۆچکەکە چووەدەر. شار ئەوەندە دوور نەبوو. ئەسپەکەی ئاودا. گەیشتە شار. لغاجەکانی ئەسپ کەفاوی بووبوون، والی بەباشی پێشوازی لێکرد. کورسیەکەی بەرامبەر خۆی بۆ دانا. قاوەی بۆ بانگکرد، لەبارەی ساری قامیشو چیای ئەللاهو ئەکبەر پرسیاری لێکرد. تا توانی پێیهەڵدا. یەك دوو دڵۆپ فرمێسك لەچاوەکانی والی غلۆر بوونەوە. کاتێك لەچیای ئەللاهو ئەکبەرەوە باسەکە هاتە سەر منداڵەکان، والی لەشوێنی خۆی وشك هەڵگەڕا.

"بەڵێ گەورەم خەریکە دەمرن".

"با بمرن، دەبێت بمرن".

والی سـەبارەت بەمنداڵـەکانی نێـو چـاڵەکە هـەمان قسـەکانی بەڕێوەبـەری ناحیـەی دەگـوتن، بـەڵام تـووڕە نـەبوو، لەسـەرەخۆ بـوو. دەنگـی گـەورەو پڕبـوو لـەدڵنیاییو باوەڕبەخۆبوون.

"بمرن، دەبێت بمرن، ئاوا ئێمە لەدەستیان رزگار دەبین".

پزیشکی ئـاژەڵان لـەجێی خـۆی هەسـتا، خواردنـەوەی قاوەکـەی لـەبیرکردبوو. والی کـە پیاوێکی زۆر بەڕێز بوو تا بەردەم دەرگا لەگەڵی چوو.

پزیشـکی ئـاژەڵان لەکاتێکـدا کـە "بمـرن، دەبێـت بمـرن، دەمـرن"ی دووبـارەو دووبـارە دەکـردەوە. لەدەرگاکـە چـووە دەرێو ئەسـپەکەی کـردەوە کـە لەحەوشـە بەدرەختێکـەوە بەستبوویەوەو سەری بردبووە نێو جۆڕکەوە. جۆڕکەکەی بەتـەرۆکی ئەسـپەکەی وەکـرد، سـوار بـوو، چـووە دەرەوەی شـار، رێگاکـە بـەنێو دەشـتێکی هـەمواردا رەت دەبـوو کـە کۆتاییەکەی دیارنەبووو کاتێـك بایـەك هەڵیـدەکرد گـەردو خـوڵی هەڵدەسـتاند. پزیشـکی ئـاژەڵان شـڵو گـۆڵ بەسـەر پشـتی ئەسـپەکەیەوە بـووو لـەهزری خۆیـدا، جیـا جیـا، بـیری لەسـەردەمانێکی زۆر دوور، لـەرۆژانی منـداڵی خـۆی، لەدەسـتگیرانەکەیو شـارە چـۆڵو هۆڵەکـەی دەکـردەوە. کاتێـك منداڵـەکانی نێـو چـاڵەکەی دەکەوتنـەوە بـیر، یەکسـەر هەوڵیدەدا لەزەینی خۆیان دەرهاوێت، ئـەوەی دەتـوانی. بووبـووە شارەزای بیرنەکردنـەوە لەجـەنگی دوای جـەنگ. هـەر کاتێـك بـیرەوەری شـەڕێکی لەزەینـدا زینـدوو دەبـووەوە یەکسـەر لـەخۆی دووردەخسـتەوە، بـەڵام وایـدەزانی ئـەو منداڵانـەی کـە لـەنێو چـاڵەکە خـەریکن دەمـرن هـەرگیز لـەبیرەوەریو یادەوەریـدا ناسـڕێنەوەو هەمیشـە لەبەرچـاوانی دەمێننـەوە. نەیـدەتوانی بەڕێوەبـەری ناحیـەو والیو خـەڵکی شارۆچـکەو شارەکەشـی فەرامۆش بکات. حەزی چووبووە نـانی گـەرمو بۆنخـۆش، برسـی بـوو، گەدەکـەی ئاگـاداری دەکـردەوە، بـەڵام دەسـتی بـۆ نانەکـە نەدەچـوو. بیریـدەکردەوە دوای ئـەوە ناتوانێـت خـواردنیش بخـوات. دەتگـوت ئەسپەکەشـی بەئەنـدازەی ئـەو خـەمگین بـوو کـە سـەری دانەواندبووو یاڵەکانی شۆڕکردبوونەوەو رۆیشتنو نەڕۆیشتنی هەست پێنەدەکرا.

دوای ئەوەی کە ماوەیەکی باش رێگاکەی بـڕی، لـەپڕ هاتـەوە سـەرخۆی، ئەگـەر بـۆلای منداڵەکان بگەڕابوایەتـەوەو لەنانەواخانـەی شـار گـونی گـونی نـانی بـۆ بردبـان، رەنگبـوو بیتوانیبا رزگاریان بکات. خۆزگە بیتوانیبا لەشارۆچکەو لەدێدا چەند کەسێکی بەرەحمو بـەزەیی بدۆزیبانـەوە، کـە جـەنگ مرۆڤبـوونی لـەبیر نەبردبنـەوە. خۆزگـە دکتـۆرێکی

بدۆزیبایەوە، هەندێك داوو دەرمانی لێوەردەگرت. کاتێك ئاوا نوقمی نێو خەیاڵ بوو ئەسپەکەشی گیانێکی هاتەوە بەر، سەری هەڵبڕی، ئاوا خەم‌و خەفەتەکانی نەمان، دەستیکرد بەنەرمەغار. جگە لەو بایەی کە بەهۆی رۆیشتنی ئەسپەوە دەهات، بایەکی نەرمیش دەهات.

ئەسپ خەریکبوو ئاوا بەنەرمەغار دەڕۆیشت، کە لەپڕ راوەستاو گوێیەکانی مووت کردن. دەنگە دەنگێك لەملاو ئەولا دەهات.

پزیشکی ئاژەڵان گوێی رادێرا، ئەو دەنگانە لەدەنگی مرۆڤ دەچوون. ئەسپی لێدەخوڕی، هەر لەگەڵ ئەوەی لەگردەکە پێچی دایەوە، لەسەر رێگا رەشاییەکی بەدیکرد کە لەئاپۆرەی مرۆڤ یان مێگەلێك دەچوو کە وەك بڵێیت لەو نێوەدا راوەستابن، بەچەشنێك دەتگوت بەخاکەکەوە چەسپیبن، جڵەوی ئەسپەکەی راکێشاو لەناوەڕاستی رێگاکە راوەستا. دەنگە دەنگەکە جار جار لەگەڵ ئەو بایەی کە هەڵیدەکرد دەهات‌و هەندێکجاریش نەدەما. ماوەیەکی کەم دواتر تێگەیشت کە ئەو رەشاییە ژمارەیەك مرۆڤن. تەنانەت بۆی هەبوو منداڵیش بن. هاتە جۆش‌و وروژان، بەهۆکارێکی نادیار خۆشحاڵیش بوو. منداڵەکان تا نزیکتر دەبوونەوە ئەو زیاتر خۆشحاڵ دەبووو لەلایەکی دی دڵی بەتوندی لێیدەدا. زارکی خورجینەکەی کردەوە، پارچەیەکی گەورەی لەنانێك کردەوەو خواردی. منداڵەکان کە کەمێکی دیکە نزیك بوونەوە بۆ ماوەیەکی باش بێدەنگی باڵی بەسەر ئەو ناوە داکێشا، پاشان هاوکات لەگەڵ گرمژنی تەقینەوەیەك وەکو باڕەکەو پەڕاگەندە بوون.

"بوەستن منداڵینە، هەواڵێکم بۆتان پێیە".

ئەسپەکەی بۆلای منداڵێك کە خەریکبوو هەڵدەهات لێخوڕی، کەوتە دوای. لەوکاتەدا منداڵەکان قۆچەقانیەکانیان دەرهێناو دەستیانکرد بەبەردتێگرتنی پزیشکی ئاژەڵان. ئەو منداڵەی کە پزیشکی ئاژەڵان بەدوای کەوتبوو دروست لەپێش ئەسپەکەوە بوو. پزیشکی ئاژەڵان خۆی لەئەسپ فڕێ دایە خوارێ‌و منداڵەکەی گرت، بۆ ئەوەی خۆی لەبەردی منداڵەکان بپارێزێت لەگەڵ منداڵەکە لەسەر عەردەکە راکشا. بەردبارانەکە هەر بەردەوام بوو، ئەسپەکە هەرجارێك کە بەردێکی بەرد دەکەوت هەوڵیدەدا رابکات، هەڵدەستایە سەر هەردوو پاشووی دواوەو لووشکەی بۆ چەپ‌و راست دەهاوێشتن. پزیشکی ئاژەڵان حەوسارەکەی بەرنەدەدا، ئەسپیش ئەوو منداڵەکەی بۆ ئەملاو ئەولا رادەکێشا.

"هەستە بڕۆ لای منداڵە هاوڕێکانت، من هەواڵێکم پێیە بۆتان، ئەگەر نەهێن‌و گوێ لەمن نەگرن زۆر خراپیان بەسەردێت. هەموو زۆر خراپ پەشیمان دەبنەوە. بەمنداڵەکان بڵێ، من وەك ئەوانی دیکە نیم. من لەجەنگ... یاللا هەستە... تا بەردباران نەیکوشتووین.. هەستە... راکە.. چاوەڕێم".

منداڵەکە هەستا، دەستەکانی وەکو باڵی مەلان لێکردنەوە:

"بوەستن، ئەمە لەوان نیە، ئەمە بریندارە، ئەمە مردووە، ئەو پیاوەش لەو چیایە بووبووە پارچەیەك سەهۆڵ. هەواڵێکی پێیە. دەبێت هەواڵەکەمان پێبڵێت".

رووی کردە پزیشکی ئاژەڵان:

"تۆ هەر لێرە راکشێ، خۆت مەجووڵێنە".

جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "باشە با وابێت".

یەکسەر منداڵەکان گشتیان لەشوێنێکدا کۆبوونەوە، ماوەیەك مشتومڕیان کرد، منداڵێکی باڵابەرزی نیوە رووت لەمنداڵەکان جیابووەوەو بۆلای پزیشکی ئاژەڵان هات‌و بەئەدایەکی تەواو فەرماندەرانە گوتی:

"هەستەوە هاوڕێ!"

پزیشکی ئاژەڵان هەستایەوە.

منداڵە باڵابەرزەکە بەدەوری پزیشکی ئاژەڵان خولێکی لێداو لەبەرانبەری راوەستا، ماوەیەکی درێژ چاوی بڕیە نێو چاوەکانی.

"منداڵینە وەرن، ئەمە پیاوێکی باشە، خراپیش بریندار بووە. مردووە، چونکە لەو چیایەوە هاتووە مردووە".

منداڵەکان کە قۆچەقانیەکانیان بەدەستەوە بوو، یەکسەر هاتن‌و بەدەوری پزیشکی ئاژەڵان بازنەیان بەست، پێدەچوو زیاتر لەسێسەد کەس بن. پزیشکی ئاژەڵان یەکسەر هەستاو دەستیکرد بەقسەکردن. دەنگی گریاناوی بوو. لەبارەی ئەو منداڵانەی کە لەنێو چاڵەکە خەریکبوو دەمردن.

لەبارەی بەڕێوەبەری ناحیە، لەبارەی والی، لەبارەی ئەو کەسانەی توانیبووی قسەیان لەگەڵدا بکات. لەوردەکاریی رووبەڕووبوونەکانیان بەدرێژی قسەی بۆ کردن.

منداڵەکان گوتیان:

"هەربـژیت بـرا، ئەمانـە هـەمووی دەزانـین، تـۆ شـوێنی منداڵـەکان بەتـەواوی بەئێمـە نیشان بدە".

پزیشـکی ئـاژەڵان لەسـەر عەردەکـە دانیشـت. چـیلکەیەکی هـەڵگرتو نەخشـەی شارۆچـکەی، بەرزاییـەکان، گردۆلکـە مێژووییـەکان، دۆڵـە رەشو تاریکەکـەو جەنگـەڵی سووتاو، زنارەکانو چاڵو کەندەکانی یەك بەیەك کێشان.

"دکتۆرێـك پێویستە. چۆن بیدۆزینـەوە، بگـەڕێین، بـەڵکو بتـوانین دکتۆرێـك بدۆزینـەوە. دکتۆرەکان کەسانی باشن. منیش داوو دەرمانو نانو خواردەمەنیەکانی دیکە پەیدا دەکەم".

"پێویسـت نیـە، هیچشـت پێویسـت نیـە. ئێمـە ئـەو منداڵانـە هـەرزوو دەدۆزینـەوەو پێیانڕادەگەین تا باش دەبن".

منداڵەکانی دیکەش گوتیان:

"هیچ پێویست ناکات هاوڕێ.. تۆ مرۆڤێکی باشیت".

"لەبەرئەوەیە کە تۆیان ئاوا کوشتووە".

"ئێمە ئەو شتانەی کە بۆ ئەو منداڵانە پێویستن دەزانین چین".

"تۆ لێرە رابکەو بڕۆ".

"لیروکانە زووتر لەمانە تۆ دەکوژن".

"مەترسە، بەرلەوەی بمرن ئێمە خێرا خۆیان دەگەیەنینێ".

"مەترسـە، لـەو منداڵانـە تەنانـەت یەکیشـیان نامرێـت. سـەیر بکـە، ئـەم توورەگانـەی کۆڵمان پڕن لەخۆراك".

"بەخێرچیت، تۆ مرۆڤێکی باشیت، رابکە!"

منداڵەکان خۆیان بۆ رۆیشتن بۆ ئەو شـوێنە دوورە ئامـادەکردو کەوتنـەڕێ. تۆپـەڵێك گەردو تۆزیان لەدوای خۆیان جێهڵا کە بۆ ماوەیـەکی درێـژ بەئاسمانـەوە دەمـاو لـەو دیـو تۆزو غوبارەکە هیچشتێك بەدی نەدەکرا.

پزیشکی ئاژەڵان سواری ئەسپەکەی بوو، تا رۆژئاوا بوو ئاوا سەیری ئەو تۆزو گـەردەی کرد کە بەدوای منداڵەکانەوە بەجێدەما.

# بەشی پێنجەم

پزیشکی ئاژەڵان لەبەلەمەکەی قەدریی بەلەموان دابەزی. پویراز موسا ئەو کاتەی هێشتا لەبەلەم دانەبەزی بوو، ئەوی ناسیبووو هاتبووە ئەسکەلە، وەکو دوو دۆستی زۆر دێرینی یەکدی، یەکدیان گرتە باوەش. لەو ئانەدا، دانیشتووانی دوورگەش هاتنە سەر ئەسکەلە. پویراز پزیشکی ئاژەڵانی پێناساندن، هەمووان پێکەوە گوتیان:

"بەخێر هاتی!" پویراز موساو پزیشکی ئاژەڵان لەپێش هەموانەوە ڕۆیشتنو لەسەر یەکێك لەتەختەکانی ژێر چنارەکان دانیشتن.

پویراز بەپێکەنینەوە گوتی: "دەمزانی دێیت".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "زۆر گەڕام".

پویراز لەتەوقی سەر تا پێی لێی ورد دەبووەوە. لاواز بووبوو، چاوو گۆناکانی لەقووڵدا چووبوونو ملی باریك بووبوو. جلەکانیشی دڕاوو کراسە سپیەکەشی دزوون بوو.

"چوویتە وان؟"

"دووجار چووم، چۆڵ بوو".

"هێشتا نەگەڕاونەتەوە، نە؟ ئەی سۆفی چی؟"

"نەگەڕاونەتەوە. یەکەمجار ئەنەدۆڵی ناوەڕاست گەڕام. قەیسەری، سێواس، قونیا، ئەنقەرەو یوزقات. هەموو ئەو جێگایانە گەڕام کە ئەگەری ئەوەیان هەبوو خەڵکی وانو ئەنەدۆڵی ڕۆژهەڵات کۆچیان بۆ کردبێت.

دێ بەدێ، شارۆچکە بەشارۆچکە، خێڵ بەخێڵ، کێو، دەشت، جێگایەك نەما سەری پێدانەگرمو نەپرسم، چوومە وانیش، سۆفی وەك خۆی هەر لەمزگەوتی گەورە مابووەوە".

زۆر ماندوو بوو. پێیخۆش بوو قسە بکات، سفرەی دڵی بکاتەوە، نەیدەتوانی، زمانی نەیدەهێنا.

پویراز ئەمەی دەرك کرد، بەدەستەپاچەییەوە گوتی: "تۆ زۆر ماندوویت. هەستە بابچینەوە ماڵێ تا..".

ژێربالّی گرت، چوونەوە مالّێ. کە ئەوان رۆیشتن ئەوانی دیکەی ژێر دارچنارەکانیش بلاّوەیان لێکرد. کەمێك دواتر قەدریی شتومەکەکانی پزیشکی ئاژەلاّنی هێنا. خورجینەکەی کە لەپارچەی مافوور دروستکرابوو، پڕاو پڕبوو، تفەنگە قولە ئەلّمانیەکەی، سێ فیشەکدانی زێڕچن، دوو دەمانچە، ژمارەیەك سەوەتەی بچووكو گەورە کە زۆر جوان چندرابوونو سەندوقێكو زینێكو حەوسارێك.

بەلەموان شمەکەکانی هێنان لەگۆشەیەکی دانان، پویراز گوتی: "وەرە بەلەموان!"و دەستی خۆی بردە گیرفانی.

قەدریی بەلەموان گوتی: "نابێت سەرۆك پویراز، ناتوانم هیچ لەکاك جەمیل وەربگرم، بمبوورە، مەگەر ئەو هاوڕێی تۆنیە؟"

گەڕایەوەو رۆیشت.

پزیشکی ئاژەلاّن ئەوەندە بەو هەلّسوکەوتەی بەلەموان خۆشحالّ بوو کە هەموو ماندوێتی، ئازارو گشت سەختیەکانی بینیبوونی، فەرامۆشی کردن، زەوقی بووەوەو پێکەنی.

"سەرۆك، زووبە وەرە بابڕۆین لەنێو دوورگە بەهەشتیەکەدا بگەڕێین". ئەو ناوهێنانەی سەرۆك چەندە لەپویراز دەهات. بەلەموانو سەرۆکی ماسیگرەکان، سەرپەرشتکاری دوورگە.

"نابێت، تۆ جارێ پشوو بدە. دایکە لێنا ئێستا مەنجەلێك ئاوت بۆ گەرم دەکات، بەباشی خۆت دەشۆیت. پاشانیش تا تێردەبیت دەخۆیت، تەڕو تەمیز دەچیە نێو جێو بەوپەڕی ئارامیەوە دەخەویت".

دایکە لێنا کە لەتەنیشتیان راوەستابوو یەکسەر بەراکردن رایکردە لای گەرماوەکە.

"بوەستە دایکە لێنا، پەلەی چیتە!"

"سەیر بکە کوڕیژگە ناتوانێت بەپێوە رابوەستێت، من پەلە نەکەم چیبکەم؟"

"باشە دایە، بەلاّم کەمێك سەبر بگرە، دەمەوێت قسەت لەگەلّدا بکەم. بانگی کچە گەورەکەی هوسمەنو ئەو ژنەی کە درومان دەزانێت بکە با بێن یارمەتیت بدەن".

"با بێن".

"لەکراسو ژێرکراسە نوێیەکانی من بێنە بۆ پزیشکی ئاژەلاّن".

"دەیدەمێ".

"من شەو دێم، دەچم چەند ماسیەك بۆ پزیشكی بەرام راوبکەم، پزیشکی ئاژەڵان هەرگیز نەیدەویست ئاوا زوو بڕوات. دڵی پڕبووو لێیدەڕژا. دەیویست لەبارەی وانی چۆڵو هۆڵ، لەخەڵکەکە، پاشان سەبارەت بەمنداڵەکان، ئینجا سەبارەت بەو شتانەی بەسەری هاتوون قسە بۆ پویراز بکات. بەدوایدا رایکرد:

"سەبر بکە، مەڕۆ، من ئێستا دەچمە گەرماو، پێکەوەش نان دەخۆین، ماسیش ئەمڕۆ نا با بۆ سبەی بن".

"من زوو دەگەڕێمەوە. لەبرسان نامری".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "نامرم"و گەڕایەوەو بەحاڵەتێکی زیزبوونەوە چوو لەسەر کورسیەکە دانیشتو رووی خۆی بەلای پەنجەرەکە وەرسووڕاند، پویراز لەکاتێکدا بەخێرایی بەرەو لای سەرەوە سەوڵی لێدەدا خەریکبوو لەدوورگە دوور دەکەوتەوە.

هوسمەن سەتڵی پڕ لەدانەخۆرەی ماسیەکانی لەڕۆخ لەگەڵی تایبەتی ماسیەکان دانا. باشترین دانەخۆرەی هەڵبژارد، بەسەری قولابەکەیەوە کردو هەڵیدایە نێو ئاوەوە. ئەم رۆژانە نێوانی لەگەڵ دەریادا باش بوو، یەکسەر ماسیەك دەمی لەقولابەکەدا. ماسیەکی بەهێز بوو، بەزەحمەتەوە رایکێشا. مەرجانێك کە لەبەر رۆشنایی هەتاوەکە ئارامی گرتبوو، کەمێك ورشەی داو دواتر خامۆش بوو. ماسیی زیندوو بەهەموو توانایەوە هەوڵیدەدا، زۆری نەمابوو داوی قولابەکە بپسێنێت. تا ئەو توانی ماسیەکە لەقولاب بکاتەوە، ماسیی تەواو گیانی لەبەرنەما. دووەمین ماسی کە گرتی ماسیەکی تا رادەیەك گەورەی لەتیرەی ماسیی سپی بوو. سێیەمیان لۆفەر بوو.

کە ژمارەی گەیاندنە حەوت ماسی، گەڕایەوە دوورگەو بەڕاکردنەوە هاتەوە ماڵ. لێنا ئەنگوستی دانایە سەر لێوی، وس، خەوتووە، خۆی ششت. پویراز بەدەنگی نزمەوە گوتی: "نانی خوارد؟"

"بێچارە، چما حاڵی خواردنی مابوو، بەپێوە خەریکبوو خەو بیباتەوە". ئەو جۆڕکەی کە بەدەستیەوە بوو بۆلای لێنای درێژ کرد:

"یەکێك لەکچەکانو ژنەکان بانگ بکە بابێن ماسیەکان پاك بکەنەوە. کەی لەخەو هەستا ئەوکات سووریان دەکەینەوە".

"ئەوان خەڵکی چیان، چما دەزانن ماسی چۆن پاك دەکرێتەوە. من خۆم پاکیان دەکەمەوە کوڕم".

لێنا ماسیەکانی هەڵگرتن‌و چووە لێوار، کەمێك دواتر بەماسیی پاککراوەوە گەڕایەوە.

"پاکم کردنەوە رۆڵە".

"دەبێت خوێیان لێبدەین".

"تۆ دانیشە من ئەمە دەکەم".

رانەوەستا، خوێی لێدان.

"با ئەو هاوڕێیەمان هەستێت ئینجا ئاگرەکە دەکەینەوە".

"لەژێر چنارەکان؟"

"لەژێر چنارەکان".

پویراز ئەو رۆژە تا شەو داهات چووە ماڵەوەو هاتەوە ژێر چنارەکان، لەنێو دارهەنارەکان گەڕا، بەدەوری دارهەنجیرەکاندا خولایەوە، هەنجیرەکان زۆریان نەماوە پێبگەن. قەیسیەکانیش هەروا، جا چ قەیسی دەنکخڕ بوون! بەم زووانە پێدەگەن. ئەگەر هەنجیرو قەیسیەکان پێبگەن دەبێت چ بکەن، دەبێت هەمووان لەدرەختەکان بکەنەوەو بیانفرۆشن، بەڵام خۆ لێروکانە کەس پارەی نیە. زەیتوونەکان، هەنارەکان، تەماتەی نێو باخچەکان، باینجانەکان، پیازو بیبەرەکان. هەر خانووەو باخچەی خۆی هەبوو، لەباخچەی هەموو خانووەکاندا سەوزە چێندرابوو، سەوزەکانیش بەم زووانە شین دەبن.

ئەگەر ئەو شتانە کۆ نەکەنەوەو نەفرۆشن لەنێو خاکدا دەڕزن. کاتێك هاتەوە ماڵێ هەوا تاریك داهاتبووو لێنا لامپا گەورە رەنگ شینەکەی پێکردبووو چاوەڕێی بوو. لەپلیکانەکان پێشی لەپویراز گرت:

"ئەو منداڵە مردووە، نەمردووە، چبووە، پویرازەکەم؟"

"هێشتا لەخەو هەڵنەستاوە؟"

"هەڵنەستاوە".

پویراز چووە ئەو ژوورە کە پزیشکی ئاژەڵانی لێنووستبوو، پزیشك وەکو منداڵێك کە زیز بووبێت بەلێوانی شۆڕبووەوە خەوتبوو.

"دایکە هی لەخەو هەستان نیە".

"چیت بۆ لێبنێم؟"

"ماسی، سبەی زوو دەچم هی تازە بۆ پزیشك دەگرم".

"تۆ ئەوت زۆر خۆشدەوێت؟"

"خۆشمدەوێت، بەو تەمەنە زۆر سەختیو ناخۆشیی چەشتووە. ئەو ئازارەی ئەو چەشتوویە ئێمە نەمانچەشتووە. ئەو شتانەی ئەو بینیونی ئێمە نەمانبینیون، سبەی هەموویانمان بۆ دەگێڕێتەوە".

ئاگریان لەژێر چنارەکاندا هەڵگیرساند، لەتەنیشت یەکدیەوە ماسیەکانیان خوارد، باسی رۆژانی بەر لەجەنگیان کرد، لێنا کەمێك رۆندکی باراندن، پاشانیش قوڕگی گیراو نەیتوانی قسان بکات.

زوو نووستن، بەیانی زوو لەخەو هەستان، چون سەیریانکرد پزیشکی ئاژەڵان هێشتا بەلێوانی شۆڕبووەوەی نووستووە. تا نزیکەی نیوەڕۆ چاوەڕێیان کرد، لێ پزیشك هەروا خەوتبوو.

"ئەمە نایەوێت هەستێت. من دەچم ماسیان بگرم دایە".

"زوو بگەڕێوە. مرۆڤ چۆن دەتوانێت ئەوەندە بخەوێت؟"

"خۆ ئەو نەخەوتووە ماندووە، زۆر ماندوو. شەڕێکی بێئامان، یەکێك لەدەربازبووانی سەدان سەربازە. سەرتاپای ئەنەدۆڵ بەدوای دایكو باوکیدا گەڕاوە".

"وای کوڕەکەم وای!"

پویراز بەرەو لای یەکێك لەو نیشانانەی کە وەلی نیشانچی پێیگوتبوو رۆیشت، لەوێ لەرەلەری ماسیان بوو. هەندی بلێیت یەكو دوو ژمارەیەکی زۆر ماسی گرتو گەڕایەوە. پلیکانەکانی دوو دانە دوو دانە سێ دانە سێ دانە بڕینو بەسەرکەوتو خێرا خۆی گەیاندە ژوورەکەی پزیشکی ئاژەڵان، ئەو هێشتا وەك خۆی خەوتبوو. سیمای ئازارێکی لەڕادەبەدەری نیشان دەدا. یانی مرۆڤەکان کاتێك ئاوا دەخەون ئازارو شادیەکانیشیان لەسیمایاندا دەردەکەوێت؟"

سەیری روخساری پزیشکی کرد، دڵی نەهات هەڵیبستێنێت.

"ئەو مرۆیە نەخۆش نەبێت کوڕم؟ مرۆڤ مەگەر ئەوەندەش دەنوێت؟ ئەگەر لێوەکانی ئاوا شۆڕنەدەکردنەوەو دەمی نەدەکردەوەو دەمگوت مردووە. نەخۆشە؟"

"نەخۆش نیە، ماندووە".

"هەڵیبستێنە بەستەزمان، کێ دەڵێت نەخۆش نیە".

"نەخۆش دایکە، ماندووە، وەکو مردووان".

"دەتۆ هەڵیبستێنە، نەخۆشە".

"بۆچی دەبێت نەخۆش بێت دایە لێنا؟ گەنجێکی ساغو تۆکمەیە".

"چ کارەیە؟"

"ڤێرتەرنەرە".

"ڤێرتەرنەر چیە؟"

پویراز بزەیەکی هاتێ:

"دکتۆرە، بەڵام دکتۆری مرۆڤ نا".

"ئەدی دکتۆری چیە؟"

"دکتۆری ئەسپو مانگاو گوێدرێژو سەگو پشیلە، دکتۆری گشت ئاژەڵەکانە، یانی دکتۆری هەموویان..".

لێنا واقی وڕما... پویراز قەت لێنای وا سەرسامو واقوڕماو بەبینیبوو، لێنا گوتی: "کەوایە، کەوایە ئەوانە هەمیشە ئاوا دەنوون، کەوایە قەت نامرن".

پویراز بەپێکەنینەوە گوتی: "نامرن، سەبرت هەبێت, دەبینیت تەنانەت لەخەویشدا پێدەکەنێت".

سەری نابووە بەرخۆو لەپلیکانەکان چووەخوار، چووە نێو زەیتوونستانەکەو پاشان بۆ سەر گردەکەو لەسەر بەردەنووسەکە دانیشت. لەدوورەوە کەشتییێکی گەورەی سپی تێدەپەڕیو دووکەڵەکەی درێژ دەبووەوە، راست بۆ ئاسمان بەرز دەبووەوە.

نەیدەتوانی پزیشکی ئاژەڵان لەهزری خۆی دووربخاتەوە. ئەو منداڵێکی چکۆلەیە، چۆن بەرگەی ئەو هەموو جەنگو ئەو هەموو دەردو ئازارەی گرتووەو دەگرێت؟ لەپڕ ئەوەی کەوتەوە بیر، من چۆنم بەرگەگرت. هێشتاش خەریکم بەرگەی دەگرم. لێناو ڤاسیلی چۆن بەرگەی دەگرن؟ مرۆڤ دەتوانێت ئەو شتانەی ئێمە بینیومانەو بەسەرمان هاتوون بەرگە بگرێت؟ بەرگەریان دەگرێت. لەلایەك بیری لەگوندەکەیانو دایكو باوکی دەکردەوەو لەلایەکی دیکە هەوڵیدەدا ئەو هزرانە یەکسەر لەسەری خۆی دووربخاتەوە. بەردەوام بیری لەدێهاتی چەرکەسەکان دەکردەوە کە نزیکی گوندەکەی ئەوان بوونو قەت نەچووبووە ئەو دێهاتانە. حەزی لێبوو بچێتە ئەو دێهاتانە، بەڵام دەترساو نەیدەتوانی بچێت. گومانی تێدانیە ئەوان شوێنی کەسو کارەکانی پێدەزانن. ئایا لەڕاستی دەترساو زەندەقی لێی چوو بوو؟

ئایا کۆچەرەکان دوورگەیان دۆزیبووەوە؟ ئایا گەنجە رەشتاڵەکە بۆ کوشتنی ئەو بەڕێکرابوو؟ گەر وایە چما لێگەڕابوو وا بەئاسانی بڕوات؟ کوشتنی مرۆڤە لەخوێندا

شەلاڵبووەکان، لەترسان شێتبووەکان، هەوڵدانەکانیان کە رادەستی مەرگ نەبن، چاوە لەمۆڵەقرِاوەستاوەکانیان ئەویشیان دەکوشت، بەڵکو ئەو لاوە بۆ کارێکی دیکەش هاتبێتە دوورگە.

کوشتنی مرۆڤی بێگوناح دڵڕەقانەترین، نزمترین، نەفرەتاویترینو پووچترین کارە. ئایا ئەو مرۆڤانەی لەسەرجەم جەنگەکانی دونیا کوژروان بێگوناح نین؟

ئەو گەنجە تۆکمەیەی کە لێیگەڕابووم پاسەوانی شێخی کۆچەرەکان بوو، بۆ کوشتنی هاتبوو، بەڕەللاکردنی ئەو بەواتای قبوڵکردنی مردن دێت.

سەرتاپای کەوتە لەرزین. مووی بەدەنی راست بوونەوە. ئەگەر دووبارە بگەڕابانەوە، بێچەندو چوون بۆ کوشتن دەهاتن. بێگوناح نەبوو، دەبوا زۆر خێرا بکوژرابوا. خێرا ئەو لاوە چاوشینەی لەمێشکی دەرکرد کە نیگایەکی پاکو سادەی هەبوو. مەرگ، ستەم، خراپەکاریو جەنگی زۆری بینیبوون. ئەو مرۆڤانەی کە ئەزموونێکی زۆریان پێکەوە نابوو لەدوور خستنەوەی هزری خراپ بووبوونە وەستا. پویرازیش یەکسەر ئەوەی مێشکی داگیرکردبوو دووری خستەوە. بیری لەپزیشکی ئاژەڵان کردەوە، بەڵکو تا ئێستا هەستا بێتو جلی پۆشیبێو چاوەڕێی من بکات، هەستا لەبەرزاییەکە سەرەو ژێر بووەوە. دەوروبەری دەریا سافو نوقمی نێو رۆشنایی بوو، هەموو لایەکی دەریا دەبریسکایەوە. چووە دۆڵی زەیتوونەکان. دەبێت بیهێنمە سەر ئەم کانیە. کانیەکە ببینێت هەم شارەکەی لەبیردەکاتو هەم دەریاچەی وانیش...

کاتێك گەیشتە ژێر دارچنارەکان لێنا بەدەنگێکی فرە شادومانانە پێشوازی لێکرد:

"لەخەو هەستا، هەستا! وەرە سەیری بکە چیبووە!"

"چیبووە دایکە؟"

"سەیری بکە، ڤێرتەرنەر هەستا، هەر لەگەڵ هەستان سابوونو تاخمتراشی هەلگرتو یەکسەر چووە سەرکانی، ریشی تاشیو ئەو بۆنەی تۆشی لەرووەمەتەکانی هەڵسووی. پاشان کراسو ژێرکراسم وێدان. ئینجا داوای بۆیاخی پێلاوانی کردو دامێ. هێشتا خەریکە لەهەیوانەکە پێلاوەکەنی بۆیاخ دەکات".

پزیشکی ئاژەڵان بەبینینی پویراز هەستایە سەرپێ:

"سەیر بکە، تەواوم کرد، تەنانەت دەمی چەکمە نوێیەکانیش درزیان تێکەوتبوو. سەیری چەکمەکان بکە، ببینە، نوێ نوێ بوونەوە. هەموو بۆیاخەکەیان هەڵمژی".

"بەڕاستی چەکمەی نوێن".

پزیشکی ئاژەڵان چەکمەکانی لەوێ دانان‌و رایکردە ژوورەوە.

"من لەژێر دارچنارەکان چاوەڕێتم، جلەکانت بپۆشەو وەرە".

لەسەر تەختەکە دانیشت، نیگای کەوتە سەر قامیشەڵانەکە. ڤاسیلی چەند لەنێو ئەو قامیشەڵانە بەچەکەوە بۆسەی بۆ دانابووەوەو هەوڵی دابوو بیکوژێت، چەند ئەژنۆو هەموو جەستەی گۆڵ بووبوو، دەستەکانی چەندە لەرزیبوون، بەڵام بەهیچشێوەیەك نەیتوانیبوو پەلاپیتکەی تفەنگەکەی دابگرێت.

"ئەگەر دیسان ئەو گەنجە رەشتاڵە، ئەو پاسەوانەی شێخ بهێت دەستم نالەرزێت. مەڕی بەردەستی قەساب نابم".

کاتێك ئەو هزرەشی لەمێشکی خۆی دووردەخستەوە، دەنگی پزیشك هات، پویراز ئاوڕی بۆ دواوە دایەوە، یەکسەر هەستایە سەرپێ، خێرا بۆلای چوو، گرتیە ئامێز، پاشان کەمێك کشایەوەو چاوێکی بەسەرتاپای داخشاند.

"جەمیلی برا ئەو جلانەت زۆر لێدێن، ها!"

"لوتفی خۆتە".

"چێشتت خوارد؟"

لەدواوە لێنا هاواریکرد: "نەیخواردووە، نەیخواردووە، چەندی تکاو رجام کرد نەیخوارد، چاوەڕێ بوو تۆ بێیتەوە".

لێنا بەرچایی ئامادەکردبوو. ژن‌و کچەکانی هوسمەن سفرەیان برد لەژێر چنارەکان رایانخست.

"تۆ هیچ لەهەنگەوانی دەزانیت؟"

"من ڤێرتەرنەرم، بەڵێ سەرم لەویش دەردەچێت، دەتوانم نەخۆشیی مێشەهەنگ دەستنیشان بکەم. ئێمە لەباخەکەماندا هەنگەلانی زۆرمان هەبوون. چیە مگێزت چۆتە هەنگوین؟"

"ئێمە هەنگمان هەن".

"لەکوێ؟"

"لەبەرۆژی ئەو گردەی ئەولامان، غەڵێفەکان کەی دەبڕنەوە؟"

"زیاتر لەوەرزی پایزدا".

دەتوانی سەیرێکیان بکەیت، ڕەنگبێت پڕبووبن".

"باشە سەیریان دەکەین، ئەگەر هێڵینگێك هەبێت".

"دەتەوێت هەنگەکان لەهێلینگ بدەیت؟"

"نە، هێڵینگەکە دەکەینە دەمامك، دەنا زارکی غەلێفەکان ناکەمەوە".

"مەگەر چدەبێت ئەگەر بیانکەیتەوە؟"

"چدەبێت؟ هەموو هەنگەکان دادەگژێنە سەروچاوم، خوانەکات بەکەس وە بدەن، زۆر کەس بەپێوەدانی هەنگ مردوون".

"سەیرە، خوا ڕەحمی پێکردووم".

"تۆ هێڵینگەکە پەیدابکە، دەبینی، خۆت تێدەگەیت".

"ئەو ئاشە هەواییەی ئەو دواوەت بینیوە؟"

"بینیومە".

"هەموو کارەکانی ئەو ئاشە تەواو بووە، بەڵام ئەوانەی لێرەن هیچکامیان ئاشی هەواییان نەدیوە، ئەگەر تۆ بیخەیتەکار، منیش هێلینگێکت بۆ دەکرم".

"من تا ئێستا ئاشی هەواییم نەدیوە، بەڵام هەر دەدۆزینەوە چۆن وەکار دەخرێت".

پویراز پێکەنیو گوتی: "وەکارخستنی دەدۆزینەوە. کەوابوو با زوو بچینە سەرگردەکە". چوونە سەرگردەکە، دانیشتنو پشتیان بەبەردە نووسەکەوەدا، ماوەیەك بێئەوەی قسەبکەن سەیری دەوروبەریان کرد. هەموو شتێك بێڕادە جوان بوو. پەڵە هەوری سپی بەسەر سەریاندا ڕەت دەبوونو سێبەرەکانیانی بەرووی دەریادا دەخشاندو ئاوی دەریایان دەلەراندەوە.

"ئێ، چ خەبەر لەدوورگە، کێ هاتووە، کێ ڕۆیشتووە؟"

"هەواڵێکی ئەوتۆ نیە. هوسمەن بەخۆیو شەش کچو ژنەکەیەوە هات، دواتر وەلی نیشانچی بەخێزانە بچووکەکەیەوە. من لەتەمەنمدا کەسێکی وەك وەلی نیشانچیم نەبینیوە، سێ نەوەی کوڕی هەن، لەسێ کوڕەکانی کە چوونەتە سەربازیو ئیدی نەگەڕاونەتەوە، هەر سێ نەوەکانی لەخۆی دەچن. ژنەکەی تا شارۆچکە لەگەڵیان هاتووە، لەشارۆچکە دابڕاوەو ون بووە. هەموو جێگایەك گەڕاون، بەڵام نەیاندۆزیوەتەوە".

"چۆتە کوێ، نیشانچی ناڵێت چۆتە کوێ؟"

"لەدەمی دەرچوو. گەڕاوەتە گوندە چۆڵکراوەکەیان، گوایە لەوێ چاوەڕوانی هەر سێ کوڕەکانیەتی کە وەفاتنامەکەیان هاتۆتەوە".

دەزانم، ژنــانێکی زۆرم لەدێهاتــە چــۆڵەکان بیــنین کــە چــاوەڕوان بــوون، هــەموویان لــەوجۆرە بــوون کــە وەفاتنامــەی کوڕەکانیــان هــاتبووەوە. هیچکــەس نەیــدەتوانی رازیــان بکاتو دڵنیایان بکاتەوە کە کوڕەکانیان مـردوون، نەیانـدەتوانی ئـەو بڕوایـەی کـە رۆژێـك هەر چۆنێك بێت دەگەڕێنە لەمێشكو دڵیـان دووربخاتـەوە. نیشانچـی چ دەکـات، نایـەوێت بچیچت هاوسەرەکەی بێنێت؟"

قسە ناکات، خۆی تەرخان کردووە بۆ نەوەکانی، تەنها هـەر لەگـەڵ ئەوانـە. رۆژەکـانی هەوەڵ قسەی دەکرد، لەپڕ بێدەنگ بوو. لەبیرکردنەوە دایە، بیردەکاتەوە".

ڤێرتەرنـەر دوای ئـەوەی کـە دوورگـەی جێهـێڵا، زۆر شـوێنان گـەڕا، دوو ئەسـپی لـەپا خستبوون، بەهی سێیەم توانیبووی بگەڕێتەوە ئێرە.

دانیشتووانی وان تـا قۆنیـاو مانیسـاو ئـزمیر کۆچیانکردبوو، ئـەو شـوێنانە گـەڕا، زۆر لەوانیەکان، مووشیەکان، ئەرزەڕۆمیـەکانو بەدلیسیەکانی بینیبـوو، بـەڵام دایـكو بـاوكو دەسـتگیرانەکەی نەدۆزینــەوە. بیریکـردەوە بــەڵکو گەڕابنــەوە وان. لــەقۆنیا ئەفســەرێکی دراوسێیانی بینیبـوو، ئـەویش نـەیتوانیبوو خێـزانو کـەسو کارەکـانی بدۆزێتـەوە، تـەنها ئومێدی بەقۆنیا بوو کە لەوێشدا نەیدۆزیبوونـەوە. دووبـارە چـووبووەوە وان، لـەوێ لـەو شارە چۆڵو هۆڵەدا، سۆڤیو هەروەها چەند ژنێکـی بینیبـوون. سـۆڤی هـەمان ئـەو قسانەی بەویش گوتبوون: شارە شکۆدارەکەی خـۆی جێناهێڵێـتو تـا مـاوە لـەوێ چاوەڕێ دەکـات، بەڵام ژنان گەڕانەوە، ئەوان بەو هیوایەی کە کوڕەکانیـان لەچیاکانی ئـەڵلاهو ئەکبـەرەوە دێنەوە، لەچاوەڕوانیاندا بوون.

هیچیان بـۆ خـواردن پێنـەبوو. سـۆڤی خـواردنی دابوونـێ. لەدرێـژایی رێگـادا زۆر منداڵو سەگی بینیبوون. هەم منداڵەکانو هەم سەگەکان تـەنها هـەر ئێسـكو پێسـت مابوونو توانای بەپێوە وەستانیان تێدانـەبوو. کاتێـك لـەلای رۆژئـاوای شارۆچـکەکان گـەڕابوو، بـاخو باخچـەو گونـدو شارۆچـکەی سـووتاوو بەخۆڵەمێشـبووی بینیبـوون. خەڵکەکە گشتیان ئێسكو پێست بوون. سەربازانی تووڕەی یۆنان کاتی راکردن هەموو دێهاتو شارۆچکەکانی سەر رێی خۆیان لەگەڵ خاك تەخت کردبوون. ڤێرتەرنەر کـە نیـازی چـوونە ئەنــەدۆڵی رۆژئـاوای هـەبوو دواتـر بیریکردبـووەوە کـە خـەڵکی ئـەو دێهاتانە خۆیشیان وا لەبرسان دەمـرن، چۆن دەتـوانن میـوان رابگـرن، بـۆ ئەنـەدۆڵی ناوەڕاست گەڕابووەوە.

"چۆن ئەو هەموو مانگە بەرگەت گرت سۆفی! ئەو شارە چۆڵو هۆڵە شارەکەی ئێمەیە سۆفی؟ بێژە سۆفی، شاری ئەو سەدان دەهۆڵکوتو زوڕناژەنەی کە دەچوونە سەر دیواری ئەم قەڵایەو پێکڤە دەیانـژەنیو پێکڤە گۆرانیان دەگوت؟ نەتبینی بۆ ئەوەی لەشارە شکۆدارەکەیان نەسووتێن، چۆن بەدڵی تژی خەمو ئازار، بەحەفتاو دووز مان دوان، ئاوازە خەمگینەکانی خۆیانیان چڕیو ئینجا رۆیشتن؟ وەرە با ئێمەش بڕۆین، شارەکەمان مردووە سۆفی".

"ژنەکانو سۆفیەکان لەشاری مردوو پاسەوانی دەکەن".

"بەڵێ وایە ژنەکانو سۆفیەکان، تۆ بەر لەوەی هێڵینگەکە پەیدابکەیت دەتوانی یارمەتی منو ئەفسەرە شەلەکە بدەیت؟ من یەکێك لەو خانووە گەورانەی لای خوارەوەم گەرەگە.. تاکو ببینم چ دەبێت".

"خێزانەکەت دەدۆزیەوە".

"دەیاندۆزمەوە، تۆش دەیاندۆزیەوە".

"دەیاندۆزینەوە. یاللاّ هەستە بچینەوە ماڵێ، بەڵکو نیشانچی ماسی گرتبنو هێنابنیەوە. سەیر بکە، شاری وانیش خەریکە دێتەوە سەرخۆی، ژنەکان گەڕاونەتەوەو چاوەڕێی کوڕەکانیانن".

"وەکو لێنا".

خەمێك دڵی هەردووکیانی گرتەوە. تا گەیشتنە ئەسکەلە بێدەنگ بوون. لەگەڵ نزیکبوونەوەیان لەئەسکەلە، لێنا هاتە پێشیانو گوتی: "نیشانچی زانیویە میوانمان هەن، چۆتە راوەماسیو چەند خولەکێك بەر لەئێستا یەك گونیە ماسی سپی لەگەڵ خۆی هێنایەوە. دەتانەوێت سفرەکە لێرە یان لەژێر چنارەکان رابخەین؟"

"ئێرە، ژێر چنار، یاللاّ دکتۆر گیان بابچین چیلکە بۆ دایکە لێنا کۆبکەینەوە، دەی بۆ نێو دارزەیتوونەکان".

"زوو گەیشتنە نێو دارزەیتوونەکانو هەریەکەو بەئامێزێك چیلکەی وشکەوەبوو گەڕایەوە".

لێنا ماسی بۆ برژاندن، وەکو گورگی برسی ماسیە برژاوەکانیان خوارد. رۆژی دواتر چوونە شارۆچکەکەو خانوویێکی گەورەی دوو نهۆمیان بۆ ڤێرتەرنەر کڕی. ڤێرتەرنەر پارەی هەبوو، هەرچیەك بۆ ماڵ پێویست بوو کڕیان. گەڕانو هێڵینگێکی بچووکیشیان پەیداکرد، کە سیمەکانی سەوز بوون، ئینجا بەخێرایی گەڕانەوە دوورگە. شمەکەکانیان

بەرێنوێنی لێناو بەیارمەتی ئەوانی دیکە لەماڵەکە دانان. پاشان ژوور بەژووری خانووەکەیان بەسەر کردەوەو سەیری ئەو شتومەكو کەلوپەلانەی لەژوورەکانیان دانابوو کردو بەدڵیان بوو.

لێنا گوتی: "جوانە، باش داندراون".

پزیشك گوتی: "جوانە".

پویراز گوتی: "جوانە".

هەموو ئەوانەی لەوێ بوون گوتیان: "جوانە".

ڤێرتەرنەر لەپویرازی پرسی: "هێڵێنگەکە لەکوێیە؟"

پویراز پێکەنیو گوتی: "سەیر بکە، لەوێیە، بەدیوارەکەدا هەڵواسراوە".

ڤێرتەرنەر چوو، هێڵێنگەکەی لەدیوارکردەوەو هێنای. سەربەندەکەشی لەسەر پارچە ئاسنێك دانابوو، ئەویشی هەڵگرت: "بابڕۆین پویراز".

لەپلیکانەکان هاتنەخوار. پویراز ئاوڕی دایەوەو گوتی: "سەیری خانووەکە بکە نوێ نوێیە".

بەسارسامیەوە چاوی بڕیبووە خانووەکە.

ڤێرتەرنەر بەبینینی شادمانی پویراز خۆشحاڵ بوو، گوتی: "هەرە باشەکەیانت هەڵبژاردووە، زۆریش گەورەیە. تەنانەت پازدە کەسیش دەتوانن تێیدا بحەوێنەوە".

"ئینشاللا بەزووترین کات خانووەکە پڕ دەبێت".

ڤێرتەرنەر گوتی: "ئینشاللا".

بەلای دارزەیتوونەکاندا بۆ سەرەوە رۆیشتن، هەر کە لەتەپۆلکەکە نزیك بوونەوە دەنگی وزەوزی هەنگەکان لەدوورەوە بیسترا.

"غەلێفەکان زۆرن؟"

"زۆرن".

لەکاتێکدا کە پویراز لەوەتەی هاتۆتە دوورگە قەت تا ئەوڕادەیە لەهەنگەلانەکان نزیك نەبووبووەوە.

"ئێستا دەبێت هێڵێنگەکانمان بپۆشین".

ڤێرتەرنەر یەکەمجار بەسەربەندە سپیو گەورەکەوە گەردنو گوێیەکانی خۆی داپۆشین، ئینجا هێڵێنگەکەی خستە سەر دەمو چاوی، لای سەرەوەو خوارەوەی

بەسەربەندەکە داپۆشیو گۆشەکانی سەربەندەکەی لەدواوە لێکگرێدان، هێڵینگ بەتەواوی داپپۆشیبوو.

"زانیمان، لەهێڵینگ دەمامکت دروست کرد. ئێستا لەدەمو چاوت شوێنێك بەدەرەوە نیە تا هەنگ پێیەوە بدەن، تەنها کەپووت گەورەیە، کەپووت بەرزبۆتەوە، هەنگ لەسەری هەڵبنیشێت، لەسەر تەلەکانەوە پێتەوەدەدا".

"ناتوانێت، ئەگەر هەنگ ئەوەندە عەقڵی هەبوایە، ئەو هەنگوینەی کە ساڵێك زەحمەتی پێوە دەکێشێت دەداتە خەڵکانی دیو خۆی برسی بمێنێتەوە؟"

"دزەکان، بۆ ئەوانیش شتێك دادەنێن، ئێمەش دایدەنێین؟"

"ئێمە زیاتر دادەنێین".

"با ئەو غەڵێفانە بۆ ئێمە بن، ئێمە هەردووکمان".

"ئەگەر ئێرە زیاتر ئاوەدان ببێتەوە، قەرەباڵغیەکی زۆر دروست دەبێت، هەمووان داوای ئەو هەنگوینە دەکەن".

"راست دەکەیت، زوو دەچین هەموو ئەو غەڵێفانە لەوەهاب بەگ دەکڕین".

"واباشترە. ئێستا با غەڵێفەکان بکەینەوەو سەیرێکیان بکەینو بزانین چۆن چۆنن".

پزیشکی ئاژەڵان هەنگاوێك لەغەڵێفەکان چووە پێش، پاشان بۆ دواوە گەڕایەوە.

"دەتوانیت کەمێك دوورتر رابوەستیت؟"

"بۆچی؟"

"چونکە دەستەکانت بەدەرەوەن، پێتوانیە ئەو هەنگانەی لەغەڵێفە دێنەدەر بەدەستەکانت وەبدەنو دەستەکانت وەك میزەڵان بئاوەسێن؟"پزیشکی ئاژەڵان دەستەکانی نیشان دان:

"ئەمانە چین؟"

دەستکێشێکی خوری زەرد لەنێو دەستی چەپی بوو.

پویراز گوتی: "لەکوێت پەیداکردن؟" پێی سەیر بوو.

"ئێمە هەنگاوانی دێرینین بەڕێزم".

دەستکێشەکانی پۆشین، زارکی غەڵێفەی هەرە خوارەوەی بەهێواشی کردەوە، چەند هەنگێك وەك تیر دەرپەڕینو بۆ ئاسمان بەرزبوونەوەو رۆیشتن. چەند دانەیەکیش بەدەوری شانە هەنگوینێکی نزیك زارکی غەڵێفەکە دەخولانەوە هەنگوینەکە تەنها تا نیوەی شانەکە هاتبوو.

"ئێمەش لەوەرزی پایزدا غەڵێفەکان دەبڕینەوە".
پزیشکی ئاژەڵان هەستا. دوو، سێ غەڵێفەی لەلای سەرەوەش کردنەوە، ئەم غەڵێفانەش وەکو غەڵێفەکانی خوارەوە بوون. زارکی گرتنەوە.
"ئەم غەڵێفانە هی یەك کەس بوون. هەموو شانەکانیان لەیەك ڕۆژدا بڕیونەتەوە".
"بیانکڕین؟"
پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "بیانکڕین، شانەکان سپی سپین. بچووکترین پەڵەیان بەسەرەوە نیە. هەنگەکانیان زۆر ساغو گورجو گۆڵن".
"دەیانکڕینو دەشیاندەینە دانیشتوانی دوورگە".
پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "دەیاندەینێ، هەنگی ساغو چالاکن".
"چەند ڕۆژێکی دیکە دەچینە شارۆچکەو گشت هەنگەڵانەکان دەکڕین. غەڵێفەکان بژمێرە بزانە چەند دانەن".
پزیشکی ئاژەڵان خولێکی بەدەوری غەڵێفەکان لێداو هەموو غەڵێفەکانی ژمارد کە لەسەر یەکدی هەڵچندرابوون، گوتی: "ژماردم، دروست سەدو بیستو یەك دانەن".
"تۆ مەگەر پزیشکی ئاژەڵان نیت؟ هەنگەکان مەگەر ئاژەڵ نین؟"
"هەنگ زیندوەرە، ئاژەڵ نیە".
"سەرت لەنەخۆشیی هەنگەکان دەردەچێت؟"
"بەڵێ".
"فەرموو، ئەمەش کارێك بۆ تۆ. ئەم هەنگانە دەبنە هی تۆ، پێیانڕابگە".
ئەگەر هی تۆ، هی من، هی هەردووکمانو ئەو گفتوگۆیە کەمێك زیاتر بەردەوام بوا ڕەنگبوو ساردیەك بکەوێتە نێوانیان. پزیشکی ئاژەڵان ئەمەی دەرك کرد:
"دروستە، کارێکی باش بۆ من دەستەبەر بوو. بوون بەدکتۆری هەنگەکان".
پویراز گوتی: "تووڕە مەبە، مەگەر بوونە دکتۆری هەنگەکان کارێکی بچووکە؟ خۆزی دوورگەکەمان گەورە بوایەو بەئەندازەی هەزار غەڵێفەی هەنگانی...".
"لێواریش دوورە. ئەگەر چەند کیلۆمەتر نزیکتر بوایە.. هەنگەوانی لەدوورگەدا دەیتوانی نەك تەنها چەندماڵێك بەڵکو گوندێك بەخێو بکات".
"تاقیدەکەینەوە، ڕەنگبێت لەو هەلومەرجەشدا هەروا بکەوێتەوە کە تۆ دەیڵێیت. لێوار زۆریش دوور نیە".

"دووره، هەنگەکان ناتوانن ئەو هەموو ڕێگایە ببڕن‌و بگەڕێنەوە".

"ڕەنگبێت گوڵەکانی دوورگە بەشی دووسەد، سێسەد، چوارسەد غەڵێفە بکەن. ئێرە هەمووی گوڵ‌و گوڵستانە".

"دروستە. هەموو شوێنێك پڕ لەگوڵە. ڕەنگبێت ئەمساڵ هەنگەکان زیاد بکەن‌و ئەو کات پێویستمان بەغەڵێفەی زیاتریش دەبێت".

پویراز گوتی: "زیاد دەکەن. سەیر بکە بەهار لەمێژە تێپەڕیوە، کەچی دوورگە هێشتا پڕ لەگوڵە. لێرە تەنانەت لەدەریاشدا گوڵ سەردەر دێنن. وەرە بزانە دەمەوێت چیت نیشان بدەم". دەستی گرت. لەکاتێکدا هێشتا وزەوزی هەنگەکان لەگوێیاندا دەزرینگایەوە چوونە نێو دەوەنەکان.

پویراز لەبەردەم تۆپەڵێك لەدەوەنجاڕە چڕەکاندا چۆکی دادا. گەڵای دەوەنەکانی بەرزکردنەوەو سەیری ڕەگەکانی کردن. هاواریکرد: "وەرە، وەرە لای من. وەرە سەیری ژێر ئەم دەوەنانە بکە. چەند زۆرە، چەند زۆرە". بەخرۆشانەوە لەوێ هەستا، دەستی پزیشکی ئاژەڵانی گرت.

هەردووکیان پێکەوە دانەوینەوەو چۆکیان دادا. پزیشکی ئاژەڵان هەرگیز ئەوی بەم شێوەیە نەبینیبوو، جۆش‌و خرۆش‌و شادمانی لەهەموو جەستەی دەڕژا.

"نەوی بەو سەیرکە، وەنەوشەی شین، وەنەوشەی شینباوی گەردەنلاری ڕاستەقینە".

پزیشکی ئاژەڵان سەری بردە ژێر ئەو دەوەنانەی کە ئەو بەرزی کردبوونەوە، ژێر دەوەنەکان بەڕۆشناییەکی شینی تەڕو تازە ڕاخرابوو.

بۆنی وەنەوشە کە وەکو هەڵم دەوری سەری گرتبوو، بۆ ماوەیەك دووچاری سەرگێژەی کرد. ماوەیەك دواتر سەری خۆی لەژێر دەوەنەکان هێنایە دەرو پرسی:

"کەوابوو ئەمەیە، وەنەوشەی شینباوی گەردەنلار کە لەسترانەکانیشدا هەیە، کەوابوو ئەمەیە!"

پویراز کە لەجێی خۆی هەستابووو لەخۆشحاڵیان خەریکبوو باڵ بگرێت گوتی:

"ئەمەیە"

"بەڵێ دوورگە بەمشێوەیە هاوڕێ. با نەهێن، باشتر کە ناهێن".

پزیشکی ئاژەڵان بێبایەخانە گوتی: "با نەهێن، کەسانی دوورگەکەمان زۆرن کەم نین. ئێمە خۆ نامانەوێت شانشین لەدوورگەی کارینجا دروست بکەین".

پویراز گوتی: "نیازێکی وامان نیە. سبەی، دووسبەی کە لەشارۆچکە گەڕاینەوە یەك بەیەکی ژێر ئەم دەوەنانە بۆن دەکەین. ڕێك کاتی نیوەڕۆ، کاتێك خۆر بەچەقی ئاسمانەوەیەو شنەیەکی گەرمۆکە هەڵدەکات. بۆنو بەرامەی چڕی وەنەوشە نزیکەی هەموو دوورگە دەگرێتە خۆی".

لەبەردەم چەند دەوەنێکی دیکە چۆکیان داداو وەنەوشەکانیان بۆن کرد، لەگەڵ ئەوەشدا بۆنی چڕی وەنەوشەکان کەمتر بووبووەوە. بتەوێت نەتەوێت سەریان دەخولایەوە.

هاتنە ئەسکەلە. هێشتا نەهاتبوونەوە سەر حاڵەتی ئاسایی خۆیان، مەست بووبوونو لەنێو بۆنو بەرامەو شادیو هەستی بەختەوەریدا نوقم بووبوون.

"سەیر بکە، پزیشکی برا ژمارەیەك خەڵك لەسەر ئەسکەلەن".

"ئەو پیاوەی نێو بەلەمەکە قەدریی بەلەموان نیە؟"

"باشت دیاریکرد، خۆیەتی، ئەوانەی لەسەر ئەسکەلەشن....".

بەلەموان هەر ئەوانی بینین لەبەلەم قەڵەمبازی داو تا نزیك ئەوان رایکرد، هەناسەبڕکێی پێکەوتبوو، گوتی:

"ئەمانە ئاوارەکانی دوورگەی — کرێت- ن. قەباڵەی خانووەکانیشیان پێیە. ڤاسیلی دەزانێت کامە خانوو هی کامەیانە".

هەرسێکیان بەرەو لای چنارەکان ڕۆیشتن.

"ئەمە سەرۆکی دوورگەی ئێمەیە. ئەمەیش تازە هاتووە، دۆستیەتی، کاك دکتۆر، دکتۆری ئاژەڵان. سەرۆك پویراز خانووێکی بۆ پزیشکی ئاژەڵان کڕی کە نەك لەم دوورگەیە، بەڵکو لەهەموو دوورگەو شارو شارۆچکەکان بگەڕێیت وێنەی نادۆزیەوە".

پیرەمێرد گوتی: "کامە خانووی ئێمەیە؟"و قەباڵەکەی بۆ لای پویراز درێژکرد.

"ئەمەیان ئێمە نازانین، ڤاسیلی دەزانێت".

پویراز گوتی: "ڤاسیلی دەزانێت، فەرموون فەرموون وەرنە سەر تەختەکان".

"بەخێربێن".

"سوپاستان دەکەین".

"فەرموون دابنیشن".

پزیشکی ئاژەڵانیش گوتی: "بەخێربێن".

ماندووو شەکەت، شەرمنو نیگەران لەژێر دارچنارەکان دانیشتن. لەبرسان بڕستیان لێبڕابوو. هێزی بەپێوە وەستانیان تێدا نەمابوو.

پیرەمێردە چاوشین‌و ریشبۆزە باڵابەرزەکە، کە لەنێوان پویرازو جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان دانیشتبوو سەیری چاوی ئامادەبووانی کردو ماوەیەك ئاوا تێیانەوە راما.

ئەوەی کە لەپێشەوەتر بووو پشتوێنێکی سووری بەستبووو شەلوارو هێلەگێکی ئاوریشمی پۆشیبوو گوتی: "ئێمە لەدوورگەی کرێتەوە هاتووین. ئەو دەمەی خەریکبووین دوورگەکەمانمان جێدەهێڵا هەموو دێهاتیەکان‌و دانیشتووانی شارۆچکەکەمان لەدوامانەوە دەگریان. نەیاندەویست لەوێ بڕۆین، بەڵام حکومەت گوێی پێنەدا".

کەشتیەکە بچووك، کۆن‌و رزیو بوو. لەگەڵ هەر شەپۆلێکی بچووکدا دەنگی تەق‌و تۆق‌و شکانی دەهات. لەکۆچبەران پڕکرابوو، لەرێگا زۆر منداڵ‌و بەساڵاچوو بەهۆی تاو سکچوونەوە مردن. ژمارەیەك لەکچان‌و کوڕانی گەنجیش مردن. مردووەکانیان بەوەڕێخستنی رێوڕەسمێك هاوێشتنە دەریاوە. پیاوە ئایینەکە گوتی دەریاو خاك هیچ جیاوازیان نیە. رۆحی مردووانی ژێر دەریا وەکو رۆحی مردووی ژێر خاك بۆ ئاسمانەکان هەڵدەفڕێت‌و لەوێ درێژە بەژیانی خۆی دەدات.

مردووەکانی سەر وشکانی بەخاك دەسپێرن‌و مردووەکانی نێو دەریا دەسپێرنە ئاو. مردووەکانی وشکانی دەبنە خۆراکی مارو مەگەزو زیندەوەرەکان‌و مردووەکانی دەریاش دەبنە خۆراکی ماسیان...

لەسێ رۆژی دواییدا ئازووقەیان تەواو بوو. لەئزمیر هەر کە گەیشتنە سەر وشکانی بۆ سەر کانیەکان رایانکرد. یەکەمجار ئاویان دایە نەخۆشەکان‌و پاشان دایانە منداڵان‌و بەساڵاچووەکان، ئینجا ئەوانی دیکەش.

ئەو کۆچبەرانەی لەماوەی چەند مانگدا لەدوورگەی کرێتەوە هاتبوونە لەنگەرگای ئزمیر، لەرێگادا تەلەفاتێکی زۆریان دابوو، ئەوانەی لەنێو کەشتیدا نەگریابوون هەر پێیاننایە سەر وشکانی هەموو پێکەوە دەستیانکرد بەشین‌و گریان.

دوای ئەوەی گریان‌و ناڵەو هاوار تەواو بوو، تازە ئەوکاتە بەواقوڕماویەوە سەیری دەوروبەریان کرد. ئیزمیریەکان هەوڵیان دەدا قسەیان لەگەڵدا بکەن، بەڵام کۆچبەرەکان توانای وەڵامدانەوەی ئەوانیان نەبوو. هەندێکیشیان زمانی تورکیان نەدەزانی. کۆچبەرەکان دوای ئەوەی ماوەیەکی درێژ لەئزمیردا دەمانەوە، بۆ ناوچە جیاجیاکانی ئەنەدۆڵ دەگوازرانەوە.

ئەو خەڵکەی دوورگەی کریێت درەنگ گەیشتبوون. خەڵکانێکی دیکە کە بەرلەوان لەیۆنانەوە هاتبوون، تا ئەو شوێنەی ڕێی تێدەچوو، بەپێی شارەزایی لەپیشەکاندا لەگوندەکانی یۆنانیو ئەرمەنیەکاندا نیشتەجێ کرابوون.

ژمارەیەك لەو کەسانەی لەدوورگەی کریێتەوە هاتبوون، لەدێهاتەکانی دەوروبەری ئزمیر، کە بەدەستی سەربازانی تووڕەی یۆنانی سووتێندرابوونو وێران کرابوون، ئاکنجی کرابوون. یەك یەكو دوو دوو چوون لەشارو شارۆچکەکان نیشتەجێ بوون. پێنج شارۆچکەو نۆ گوند گەڕاین. لەکێڵگەکانی تووتنو پەمۆ کارمان کرد. هەم ورگی خۆمان تێرکردو هەم کەمێك پارەمان کۆکردەوە لێفەو دۆشەكو قاپو هیربارو جلوبەرگو پێڵاومان کڕی، دواجاریش لەشوێنێك سەر پەنایەك، خانوویێکمان پەیداکرد. ئێرەیان باسکرد، ئێمەش هاتین. هەرکەسەو خانوویێکیان داینێ. ئێستاش وا لێرەین".

قەباڵەشیان بۆ لای پویراز موسا درێژکرد.

"ئەم خانووانە".

پویراز گوتی: "ڤاسیلی چۆتە راوەماسی، زوو دەگەڕێتەوە. بەخێربێن سەر سەرو سەرچاومان. ڤاسیلی خەڵکی ئەم دوورگەیە، خانووەکانتان نیشان دەدات".

ئەوەی لەپێشەوە دانیشتبووو پشتوێنێکی سوورو سمێڵێکی پڕو بەژنێکی بڵندی هەبوو، هەستا دەستی ڕاستی دانایە سەر سنگیو گوتی:

بەڕێزتانو هەموو ئێوە جێتان سەر سەرو سەرچاومانە".

"ڤاسیلی بێت، ئەو دەزانێت کامە خانووتان بۆ نووسراوە، ئەو خەڵکی ئەم دوورگەیە".

"باشە، باشە، باشە. سەرچاومان، سوپاس". پیرەمێردەکە دووبارە دەستی ڕاستی خستەوە سەر سنگیو گوتی: "سەرفرازبووین ئێمەتان شادمان کرد".

"قەدریی بەلەموان!"

"فەرموو سەرۆك پویراز".

"یارمەتی دۆستەکانمان بدە با شمەکەکانیان لەبەلەم دابگرنو دایبنێنە سەر ئەسکەلە".

"سەرچاو سەرۆك پویراز".

هەستا بەرەو لای ئەسکەلە رۆیشت، بەدوای ئەویشدا ئەوانی دی "لەوێ، لەسەر تەختەکان.. ئێستا ڤاسیلی دێتەوە".

ڤاسیلی دەمەدەمی عەسر گەڕایەوە. بەسەرسوڕمانەوە سەیری کۆچبەرەکانی کرد. یەکسەر بەلەمەکەی راکێشاو هێنایە سەر لی لێوارەکە، چووە لای پویراز.

پویراز گوتی: "ئەمانە کۆچبەرانی خەڵکی دوورگەی کریتن، قەباڵەکانیان پێیە، بڕۆ خانووەکانیان نیشان بدە".

ڤاسیلی بەرەو لای ئەو خەڵکە چوو کە خەریکبوون دۆشەك، لێفەو قاپو قاچاغەکانیان لەبەلەم دادەگرت. پێگوتن: "وەرنە ئێرە با خانووەکانتان نیشان بدەم بۆ ئەوەی یەکەمجار پاکیان بکەنەوە. ئەز ڤاسیلیم. "پاشان لەکاتێکدا بەزمانی یۆنانی لەگەڵ یەکدا دەپەیڤین، بەرەو لای خانووەکان رۆیشتن. ڤاسیلی قەباڵەکانیانی یەك بەیەك خوێندنەوەو خانووەکانی نیشان دان. خانووەکان لەیەك ریزدا بەتەنیشت یەکەوە بوون. خانووی نوێ، گەورەو جوان بوون.

ڤاسیلیش یارمەتیدان کەلوپەلەکانیان گواستەوە خانووەکان. هوسمەنو وەلی نیشانچیش هاتنو یارمەتیان دان. لەنێو ئەو کەلوپەلانەدا سێ سندوق کە لەداری سەروو چێکرابوونو نەخشو نیگاری زۆر جوانیان بەسەرەوەبوو لەیەکەم نیگادا سەرنجی بینەریان رادەکێشا. کچەکان خۆیان سەندوقەکانیان برد.

سەندوقەکان ئەگەرچی لەم هەموو گەشتە دوورو درێژەدا لەوێ بۆ ئەوێ راکێشرابوون، کەچی بچووکترین شوختیان پێوەنەبوو. ئەو جۆرە سەندوقانە تەنها لەکۆشکان دەتواندرا ببیندرێن.

ژنان، منداڵانو کچانی جوانیش کە لەسەر تەختەکان دانیشتبوون، بۆ دانانی شمەکەکانو بردنیان بۆ خانووەکان هەستان. ئەو پیرەمێردەی کە پشتوێنی سووری لەپشتی ئاڵاندبوو هاتە لای پویرازو ئەوانیدی. ئەوان بەنیشانەی رێزنان لەپیرەمێرد هەستانەوە. چاوانی پیرەمێرد پڕ بوون لەفرمێسك. هەر ئاوا کە خەریکبوو دادەنیشت گوتی: "چەندە مایەی خۆشحاڵیە کە دوای ئەو راونانو بەرگەگرتنی ئەو هەموو بەدرەفتاریانە، پیاو لەگەڵ کەسانێکی باشی وەك ئێوە رووبەڕوو دەبێتەوە".

"بینینی کەسێکی نوورانی وەك ئێوەش بۆمە مایەی بەختەوەریە".

"خوا دەست بەباڵتانەوە بگرێت کوڕینە. خوا هەمووتان بەمرازی خۆی بگەیەنێت".

پیرەمێرد دڵی زۆر پڕبووبووو زۆری نەمابوو دەست بەگریان بکات. پویراز موسا ویستی بابەتەکە بگۆڕێت بۆ ئەوەی پیرەمێرد لەوە زیاتر خەمبار نەبێت. گوتی: "سەندوقەکان، سەندوقی چەند جوانن. ئەو جۆرە سەندوقانە تەنها لەکۆشكو تەلارەکاندا هەن. لەدوورگەی کرێت ئێوە سەندوقی چەندە جوانتان دروستکردوون!"

"ئـەم سـەندوقانە زۆر كـۆنن، هـی كرێـت نـین، دروسـتكراوی ئەدیرنـەن. نـە لـەكرێت، نەهیچ جێیەكی دی، هیچ وەستایەك ناتوانێت سەندوقی ئاوا جوان دروست بكات".

"یانی هی ئەدیرنەن!"

پیرەمێرد بەشەرمەوە لەكاتێكدا تفی دەمی قـووت دەدایـەوە گـوتی: "بەگـەكانی كرێـت دەیاننـاردە لای وەسـتاكانی ئەدیرنــەو ئــەو سـندوقانەیان بـەرادان دەداو چـەند مـانگی پێدەچوو تا سـندوقەكانمان بەدەسـت دەگەیشـتن. ئـەم سـەندوقانە لـەداپیرە گەورەیانـەوە بەم كچانە گەیشتووە. كچەكان هەر لەگەڵ ئەوەی پێیاننایە ئێرە".

دەنگـی پیرەمێـرد لـەرزی، قـورگی گـیرا، سـەری دانەوانـد، لێوەكـانی خرِكردنــەوە.. ماوەیەك ئاوا مایەوە كاتێك سەری هـەڵبڕی، سـیما پـڕ لـۆچو پۆچـەكەی كرابـووەوەو وەك تاری جاڵجاڵۆكەی لێهاتبوو.

گوتی: "ئاااە خوا كەس لەنیشتمانی خۆی دانەبڕێت، ئێمـە ئـەو كەسـانە نـەبووین كـە بكەوینە ئەم رۆژەوە. خوا پشت لەكـەس نـەكات. كاتێـك دەیانویسـت ئێمـە رەوانـەی ئێـرە بكەن دراوسێكانمان پێیانگوتین مەترسن، بەزوویی دەگەڕێنەوە.

ئەمــە بێــدادییەكی زۆر گەورەیــە. شایســتەی مــرۆڤ نیــە. لەڕاسـتیدا بەمــە دەڵـێن دوورخستنەوە، ئەشـكەنجە، ستەم. ئێمـە زۆری پێناچێت دەگەڕێینـەوە كرێتـی خۆمـان. كچـەكان هێشـتا سـەندوقەكانیان نەكردوونەتـەوە. منـیش پێیاننـاڵێم بیانكەنـەوە. دوای ئــەوەی گەڕاینــەوە كرێــت لــەوێ دەیكەنــەوە. مــن چــۆن دەتــوانم پێیــانبڵێم ئێمــە ناگەڕێینـەوەو سـەندوقەكانتان بكەنـەوە. تەنانـەت ئەگـەر پێشیانبڵێم هـەر نایكەنـەوە. رەنگبێـت ئەگـەر هـیچ ئومێـدێكیان نـەما ئەوسـا بیكەنـەوە. كـێ دەڵێـت بـەڵكو تـا مـاون نەشـیانكەنەوە. خـوا كـەس ئـاوارەو دەربـەدەر نـەكات. ئـازاری دابڕانـدن لەنیشـتمان زۆر لەئازاری دڵ دەرهانین لەسنگ بەسوێترە".

پیرەمێرد وەكو پەیكەرێك بێت لەخەم هەستایە پێ، یەك دوو هەنگاو رۆیشتو گەڕایەوە.

"لــەمڕۆ بــەدواوە، ئیــدی ئــەو جــۆرە ســەندوقانە لــەداپیرەكان بــۆ نــەوەكانیان نامێنێتەوە. خوا لێتان رازی بێت. خوا ئێوەش بۆ ئـەو نیشـتمانەو نێـو ئـەو خـەڵكـە جوانەتان بگەڕێنێتەوە".

پـویرازو جـەمیل هەسـتابوونو خـەریكبوون پیرەمێردەكـەیان بەڕێـدەكرد، دەسـتی راستی لەسەر دڵی دانابوو. ئەو لاوە باڵابەرزەی كە پشتوێنی سووری بەسـتبوو هـاتو ژێـر

باڵی پیرەمێردەکەی گرتو بردیە خانووە تازەکەیان. پویرازو پزیشکی ئاژەڵان بێدەستی خۆیان بەدوایانداچوون. دوای ئەوەی چەند هەنگاوێك رۆیشتن، راوەستان. هێشتا دەستیان هەر لەسەر دڵیان بوو. گەڕانەوە ژێر دارچنارەکان.

ماوەیەك کپو بێدەنگ دانیشتن. کاتێك هاتنەوە سەرخۆیان کە ڤاسیلی هاتو گوتی: "ماسیەکانم پاك کردوونەتەوە. دونیایەك ماسیم گرتبوون، خەریکە پشتم دەشکێت هێندە پێوە بووم تا پاکمکردنەوە. ئاگرەکە کەی بکەینەوە، دارو چیلکەی زەیتوون ئامادەن. ئەوەش چیلکەو داری وشك".

پیرەمێردە ریش خۆڵەمێشیەکە زۆر کاری تێکردبوون. پیاوێکی دونیا دیدەو ساردو گەرم چەشتووبوو.

پویراز گوتی: "میوانەکان ماندووو برسین، لەرێگای دوورەوە هاتبوون". هێشتا دەستی هەر لەسەر سنگی بوو.

ڤاسیلی لەوەتەی پویراز دەناسێت هیچکات نەیدیبوو دەنگی ئاوا ماندوو، خەمگین، تۆراوو نائارام بێت. بیریکردەوە چی بەسەر ئەو پیاوەدا هاتووە، لێیان دوورکەوتەوە. دڵی ئەو پیاوەش سەیرە لەباڵی پەپوولە دەچێت، هەر بایەك هەڵبکات لەکار دەکەوێت.

ڤاسیلی دارو چیلکەکانی لەسەریەك دانانو ئاگردانەکەی ئامادەکرد. ئەوانیدی هێشتا لەسەر تەختەکان، لەڕۆخ یەك دانیشتبوونو چەناگەیان خستبووە سەر سنگیانو نەیاندەتوانی سەیری یەکدی بکەن.

ڤاسیلی بەتووڕەییەوە چووە لایانو بەسەریدا نەڕاندن: "چیتان لێهاتووە؟ ماسیەکانم پاککردوونەتەوەو خوێم لێداون. ئاگر بکەمەوە؟"

پویراز سەری هەڵبڕیو لەکاتێکدا بەتەڵخی پێکەنی، گوتی: "هەڵێبکە، هەڵێبکە" ئەمەو دیمەنی فەوجێك لەسەربازانی کارگەر بەزهنیدا تێپەڕینو بۆنی تەرمی هەزاران سەرباز کە لەدەشتی دوملوپنار درێژاو درێژ راکشابوون... فەوجێك لەو سەربازانەی لەتاو بۆنی گەنیوی لاشەکان گیانیان سپاردبوو. هەر خوا دەزانێت ڤاسیلی چەندە هێزو توانای هەبووە کە چەندین رۆژی بەردەوام تەرمی مردووان بەکۆڵ هەڵبگرێتو لەبەر بۆنەکەیان نەمرێت. لەو فەوجە سەربازە کارگەرە یۆنانیە، ئەوانەی کە بەهۆی بۆنی لاشەی سەرکۆڵیان شێت نەبووبوون، لەبەر بۆنەکە یەك دوای یەك لەنێو چوون.

لەماوەیەکی کورتدا چیلکەو دارەکانی زەیتوون گڕیان گرتو بڵێسەیەکی گەورە بەرەو ئاسمان بەرزبووەوەو پەنگری گەورە گەورە دروست بوون. ڤاسیلی بەدارێکی کەمێك درێژ پەنگرەکانی پانکردنەوە. لەو ماوەیەدا لێنا، مەلەك خانمو سەبیحەش هاتبوون.

سفرەیان لەسەر حەسیرێکی گەورە پانکردەوە. لەشوێنێکی نادیاریشدا نانی لەواشەیان پەیداکردبوو. نیوەی ماسیە برژاوەکانیان بۆ ژنانو منداڵەکان رەوانەی ماڵەوە کردو نیوەی دیکەشیان لەبەردەم ئەو کەسانە دانا کە بەدەوری سفرەکە دانیشتبوون، تازە هاتووەکان وەك گورگ دەیانخوارد.

پویراز لەبەرخۆیەوە گوتی چەندە برسیانە، پاروەکان بێجوین قووت دەدەن، چ باشە کە خواردنەکە زۆرە، ڤاسیلی تا پێویست بکات ماسی گرتوون. مێشکی زۆر سەرقاڵی بیرکردنەوە بوو. قاپە مسیەکەی بەردەمی خۆی هەڵگرتو هەستایە پێ. چەند ماسییێکی لەسەر پەنگرەکان هەڵگرت کە وەك دەنکی هەنار سووربووبوونەوەو خستیە نێو قاپەکەیو بەخێرایی بۆلای ماڵی کرێتیەکان رۆیشت. ڤاسیلی کە پویرازی ئاوا بینی، هەستاو ئەو قاپەی کە بەدەستیەوە بوو پڕیکرد لەماسیو لەسەر سفرەکە نانی هەڵگرتو بەدوای پویرازدا رۆیشت:

"ڤاسیلی پیرەمێردەکە لەکام خانووە؟"

ڤاسیلی خانووەکەی نیشان دا، پیرەمێردەکە لەگۆشەی هۆڵەکەدا، لەتەك ئاگردانەکە حەسیرێکی پان کردبووەوەو لەسەر سفرە دانیشتبوو.. لەگەڵ بینینی ئەوان یەکسەر هەستایە سەر پێ.

پویراز گوتی: "تکا دەکەم بەڕێز، تکادەکەم، فەرموون دانیشن". دەستی گرتو دایینیشاند. پیرەمێرد هەر لەوێ لەسەر چیچکان دانیشتو گوتی:

"زۆریان ماندوو کردین کوڕم".

"دەزانم، زۆر ماندووبوون، رەفتاری ئەوان نە لەگەڵ یاسای خوا یەکدەگرێتەوە نە هی مرۆڤایەتی. ئێمەیشیان ئاوارەو سەرگەردان کرد، مرۆڤبوونیان لێستاندین، رەگو رەچەڵەکیان تەفروتوونا کردین".

لێنا قاپێکی گەورەی پڕ ماسیی سپی، دۆلکەیەك ئاوو دوو سێ پەرداخی هێنانو لەنێوەڕاستی سفرەکەی دانان، گوتی: "ماسی زۆرە تا دڵتان بیەوێت بۆتانی دێنم، نانی تازەشتان بۆ دێنم"و رۆیشت.

پویراز گوتی: "سوپاست دەکەم دایکە لێنا".

دوای ڕۆیشتنی لێنا، پویراز باسی لێنای بۆ پیرەمێرد کرد، ڤاسیلی بەیۆنانی قسەی دەکرد.

پیرەمێرد کە لەکاتی نانخواردن هیچ قسەیەکی نەکردبوو، گوتی: "با دەستەکانم بشۆم دێمەوە". هەستا، ڤاسیلی هەستاو ژێر باڵی گرت. یەکەمجار پیرەمێرد بەسابوونێکی پەمەیی بۆندار لەسەر کانیەکە دەستەکانی شوشتن، ئینجا ڤاسیلی بەخێرایی ژێر باڵی گرتو بەرەو ماڵەوە گەڕانەوە. سیمای پیرەمێرد گەش بووو کرایەوە. پویراز کە ئەوانی بینی هەستاو بۆ ماڵی خۆی بانگهێشتی کردن، پیرەمێرد گوتی: "بابچین".

پویراز ئەوی لەسەر کورسییێکی ئاسوودە دانیشاند، ڤاسیلیو خۆیشی بەرامبەر ئەو لەسەر تەختەکە دانیشتن.

پیرەمێرد بەخۆشحاڵیەوە پێکەنی:

"لەدوورگەیەکەوە بۆ دوورگەیەکی دیکە".

پویرازو ڤاسیلیش پێکەنین:

"دوورگەی ئێمە هێندەی لەپی دەستێکە، دوورگەی ئێوە هێندەی وڵاتێکە".

پیرەمێرد گوتی: "ئاە،و یەکسەر بابەتەکەی گۆڕی". ناوی من نازانن، مەگەر نە؟ کەسیش پێتانی نەگوتووە، دەزانم پێمدەڵێن ئاغا. ناوم موسا کازمە. ناوی تۆ پویرازە، پویراز موسا. ئەمەش ڤاسیلیە، ئەویش لێنا".

هەموویان پێکەوە پێکەنین.

ئاغا دڵی پڕ بووو دوو لاوی عاقڵو خوێندەواری پەیداکردبوون بۆ دەردە دڵ کردن، یەکبێن دەستی بەگێڕانەوە کرد. باسی لەبەردو خاكو خۆڵو جوانیو باشی خەڵکی کرێتو هەروەها جەنگو ئاوارەیی کرد، بێئەوەی یەك وشە چیە باسی خۆی بکات، دایکی کچەکان لەرێگادا مردبوو. ئەمەی لەدەم دەرچوو. بۆیەش ماوەیەك بێدەنگ بوو.

"ئێمە زۆر زوو دەگەڕێینەوە. باش بوو هاتینە ئەم دوورگەیەو کەسانێکی هێندە باشی وەك ئێوەمان بینی. من لەکرێت برادەرێکم هەبوو کە لەگەڵ یەکدا وەك برابووین. لەهەموو یۆنانو ئەوروپادا زۆر ناسراو بوو. بیستبووی دەیانەوێت ئێمە بۆ ئەنەدۆڵ دووربخەنەوەو یۆنانیەکانی ئەنەدۆڵیش بۆ شوێنی ئێمە. بەیانیەکی زوو هاتەلامان زۆر تووڕە بوو، دەیگوت، نابێت ئەمە کارێکی دڕندانەیە. چۆن دەتوانن کەسانێك بەزۆرو زۆرداری لەسەرخاکی پێنجسەد ساڵ هەزار ساڵەیان دابڕنو دووریان بخەنەوە، هەر کەسێك دڵێکی لەسنگدا هەبێت ئەمە قبووڵ ناکات.

"ئەمە لەلۆزانیشدا هەموو ئەوروپا قبووڵی کردو هیچکەس نەهات بپرسێت تۆ دەتەوێت واز لەخاك‌و زێدی خۆت بێنیت، بچیتە ئەنەدۆڵ، یان یۆنان..و ئاوارەو سەرگەردان، برسی‌و تینوو، لەژێر باوباران.. ئەو خەڵکەیان سواری کەشتی شڕو شەپڕێو کردن‌و بردیانن بۆ قەدپاڵە رەقەن‌و وشك‌و برینگەکانی چیاکانی یۆنان‌و دەستە ئالوودە بەتاو لەرزەکانی ئەنەدۆڵ، ئەمە هەنگاوێکی شێتانەبوو. ئەگەر لەخەڵکەکەیان پرسیبا، بەڵکو هەموویان قبووڵیان کردبا خاکی خۆیان بەجێبێڵن، بەڵکو نیوەیان قبووڵیان نەکردبا، بەڵکو تەنها دەکەس...

"دوورگەیەکی ئاوا جوان‌و کەسانێکی وەك ئێوە لەبەخشندەیی خواوەندە کە بەنسیبمان بوو. زۆری پێناچێت کە ئەوروپا یاسایەکی تازە دەردەکات‌و ئێمە دەگەڕێینەوە، بەڵکو لەنێو ئێمەدا کەسانێکیش هەبن نەیانەوێت بگەڕێنەوە... ئەوانیش لێرە بمێننەوە. ئەگەر ئەو یۆنانیانەی کە لێرە دوورخرانەوە گەڕانەوە، بەڵکو زۆریان، بەڵکو هەموویان بگەڕێنەوەو بێنەوە. ئەو ئاوارانەی هێندرابوونە یۆنان خۆم بینیمن زۆربەیان "ئاخ ئەی نیشتمان"یان بووو فونگە فونگ‌و گریان‌و زاریان بوو".

ڤاسیلی گوتی: "راستە. ئەوان دەگرین. با جارێ جێگیربن، هەموویان دەگەڕێنەوە".

پویراز گوتی: "هەرکەسەو ئەسپێکی دەسکەوت، رێی ئوسکوداری گرت"و یەکسەر دوای ئەم قسەیە پەشیمان بووەوەو لێوی خۆی گەست.

موسا کازم ئاغا وەك ئەوەی قسەکەی ئەوی نەبیستبێت.

"من لەکرێت، باسکردنیشی باش نیە، چ یۆنانی چ موسڵمان خۆشیان دەویستم. هەمیشە جوانترین ئەسپی عەرەبی‌و ئەسپی رەسەنی یۆنانیم بەخێو دەکردن. من، نەك تەنها جوانترین ئەسپی کرێت، بەڵکو لەهەموو یۆناندا باشترین‌و جوانترین ئەسپم بەخێو دەکردن. هەموو ژەنەراڵەکان‌و خاوەن کێڵگەو لۆردەکانی ئینگلیز شێت‌و شەیدای ئەسپەکانی من بوون.

ڤاسیلی نەیتوانی پێش بەخۆی بگرێت. پرسیی: "ئەسپەکان چیانلێهات؟"

"من هیچشتێك لەماڵ‌و داراییەکانی خۆم نەفرۆشت. نە کێڵگە، نە باڵەخانەو نە ئەسپەکانم، هیچیان، نە گەورەکان‌و نە بچووکەکانیان. هەموویانم بەدۆست‌و برادەرەکانم سپاردوون. بگەڕێمەوە هەموو شتێك وەك چۆن بوو ئاوا بۆم دەگەڕێننەوە. دۆستە ژەنەراڵەکەم گوتی، زۆر درێژە ناکێشێت... ئەم دوورگەیەش شوێنێکی جوان دیارە".

پـویرازو بەوروژانـەوە گـوتی: "زۆر جوانـە، دوورگەکـەی ئێمـە بەهەشـتی سـەر رووی دونیایـە، تـا ئـەو کاتـەی بـۆ نیشـتمانی خـۆت بگەڕێیتـەوە، جـا چ دوورو چ نزیـك، تـاجی سەری ئەم دوورگەیەیت".

"بـژیت کوڕەکـەم، بەختـەوەر بیـت، هەڵبەتـە کـە دەڕۆمـەوە، هـەتا ئەگـەر نـەتوانم بشـگەڕێمەوە لەشـوێنیکی ئـەم لێوارانـە کێڵگەیـەك دەکـڕم. بـا بچـووکیش بێـت، لێـرەش دووبـارە مـاینی لەرەسـەنی بـاش بـەخێو دەکـەم، کـە وڵاتـی عوسمـانیو هـەموو دونیـا شەیدایان بێت".

پویراز بەئەدایەکی دڵنیاوە گـوتی: "باشـە، ئـەم بیرۆکەیـەتم بەدڵـە. دەبێـت جێبـەجێ ببێت. تەنها ئەوەندە بەسە تۆ بتەوێت".

رەنگی موسا کازم ئاغا زەرد هەڵگەڕا:

"بەراستیتە کاکە پویراز؟"

"بەڵێ ئاغا بەڵێ".

"کەوابوو بەمزووانە لەلێواری دەریا کێڵگەیەك دروست دەکەینو ئەسـپی تێـدا بـەخێو دەکەین، وایە؟"

پویراز دیسان بەهەمان دەربڕینی دڵنیاییانـەوە گـوتی: "وایـە، وایـە ئێمـەین ئەسـپمان خۆش دەوێـت. ئێمـە چەرکەسـین، کاروبـارو ژیانمـان لەگـەڵ ئەسـپە". کازماغـا بەشـەوقو زەوقـەوە پێکـەنیو گـوتی: "دەزانم، چەرکەسـەکان بەئەسـپە رەسـەنەکانیانەوە لەهـەموو دونیادا ناسراون".

"ئاغا، من لەم لێوارەی بەرامبەرمان گوندێك پێدەزانم کاتێك کە خەڵکەکـەی رۆیشـت، هیچکەس نەچـۆتە ئـەوێ، کـەس ئـەو گونـدەی بـەدڵ نـەبووە، ئـەوێ دۆڵێکـی زۆر قـووڵی لێیـەو بـەردەم دۆڵەکـەش زەوییێکـی تاڕادەیـەك گـەورە هـەموارە، خـوا بـۆ بـەخێوکردنی ئەسپ دایناوە. ڤاسیلی باپیرەشم ئەسپی بەخێو کردوون".

لەچەند وشەیەکدا رووداوی باپیری خۆی بۆ ئاغا باسکرد. موسا کـازم ئاغـا لـەپڕ دڵـی کرایـەوە. بەباشـی قسـەی بـۆ دەهـات. دەتـوانم بڵـێم هیچشـوێنەواری ئـەو ماندوویێتیـەی لانەمابوو کە کەمێك پێشتر باسی دەکرد. دەستیکرد بەباسکردنی ئەسـپو نـەژادو رەنگـی ئەسـپەکان. ئەسـپەکان بـەرەنگو شـێوەی جیاجیایانـەوە خوڵـقو خـووو تایبەتمەنـدیی خۆیان هەیە". بۆ نموونە ئەسپی کوێـت زوو هـۆگری مـرۆڤ دەبێـت، لەگـەڵ مـرۆڤ تێکـەڵ

دەبێت، ئەگەر خاوەنەکەی نیگەران بوو ئەویش نیگەران دەبێت، خۆشحاڵ بێت خۆشحاڵ دەبێت. ئەگەر بریندار بێتو لەزین بگلێت، بەسەر سەریەوە رادەوەستێتو پارێزگاری لێدەکاتو دەحیلێنێتو داوای یارمەتی لەدەوروبەر دەکات. ئەسپە سپیو کەمێك رەشەکان چەمووسو سەرسەختن. بەخۆ نازن، کینەدارن، بەئاسانی لێناگەڕێن کەس سواریان بێت. ئەسپە خەنەییەکان لەڕاستیدا لەهەر هەزار ئەسپ یەك دانەیان خەنەیی دەردەچێت، لەنێو رەوە ئەسپێکی هەزار دانەیی تەنێ یەك دوو دانە.. خوڵقو خوویان جیاوازە. ئەسپە سووورباوەکان شای هەموو ئەسپەکانن. ئەسپی ئەسکەندەری مەزنیش سوور بوو. دەڵێن شین بووە، بەڵام وانیە، سوور بووە".

کازمە فەندی هیچ ئاگای لەخۆی نەمابووو دەوروبەریو ئەوانەی گوێیان لێگرتبوو فەرامۆش کردبوو، جا چی لەبارەی ئەسپەکانەوە باس نەدەکرد؟ خەریکبوو تاریك دادەهات کە هاتەوە سەرخۆیو ئیدی بێدەنگ بوو.

کاتێك سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد بینی وا منداڵەکانو ئەوانیدی لەسەر تەختەکاندا دانیشتوونو گوێیان لەقسەکانی ئەو گرتووە. زۆر خۆشحاڵ بوو. دیسان وەك بڵێیت تروسکاییەك رژابێتە دڵیەوە، هەستا، پویرازیش هەستا، ژێر باڵی گرت. ئەوانیدیکەش هەستان. لەگەڵ ئەو لەپلیکانەکان چوونەخوارەوە. لەم کاتەدا لێنا پێشی پێگرتنو گوتی:

"مەڕۆ، خواردنی زۆر خۆشم بۆ لێناویت، خواردنەکەت بخۆ ئینجا بڕۆ. خوا منی بەم تەمەنەوە گەیاندەوە نیشتمانم، هیوادارم تۆیش بگەیەنێتەوە نیشتمانت، زوو یان درەنگ، لەو خواردنانەم بۆ ماڵەکەشتان بردووە. بەکچەکانم گوت بابچینە ماڵی ئێمە نەهاتن".

پویراز، موسا ئاغای گەڕاندەوە.

"ناکرێت قسەی دایکە لێنا رەت بکەینەوە. ئەو دایکی خۆشەویستی هەموو دوورگەیە".

مەلەك خانم ژێرباڵی دیکەی گرت". بەمن دەڵێن مەلەك، سەیربکە خەڵکی ئەو چیایەی بەرامبەرم، بەو چیایە دەڵێن چیای قازی هەزار کانی، یۆنانیەکانیش پێیدەڵێن ئیدا. بەخێر بێیت، سەفات هانی کازم ئاغا. ناوی پیری ئێمەش لەچیای هەزار کانی موسا کازم ئاغا بوو. سەید بوو".

لەپلیکانەکان سەرکەوتنەوە، کازم ئاغا، دووبارە دانیشتەوە سەر کورسیە نەرمەکە. ئاخاوتنەکە گەرمتر بوو، ئێستا خەریکبوون باسی ئیدای هەزار کانیان دەکرد.

ئەوان چوونەوە ماڵەکانیان. پێویستیان بەکەمە شتێك هەبوو. پویراز بۆ هەریەکەیان لەشارۆچکەکەوە سەتڵێکی رۆخ پاچراوەو گۆزەیـەکی ئاوخواردنـەوەی هێنـا. رۆژی سـێیەم موسا کازم ئاغا تا نیوەی شەو لەگەڵ خەڵکی دوورگـە گفتوگـۆی کـرد. مرۆڤێـك بـوو تـژی لەمیهرو خاکەڕایی، هەسـتی شـادیی جـارانی لـەنێو ئـەم خەڵکـەدا جارێکی دیکـە زینـدوو بووبووەوە، لەلایەك قسەی دەکردو لەلایەکی دیکە بێڕاوەستان پێدەکەنی. کەسـانی دڵشـاد لەهـــەر هەلومـــەرجێکی خـــراپو نالەباریشـــدا بـــن، وەك ئـــەوەی هـــیچ نەقـــەومابێت، بەگەرمیەوە قسەدەکەنو بەخۆشحاڵیەکی سەیر پێدەکەنن.

ئەو شەوە موسا کازم ئاغا یەکنەفەس خەوی لێکەوت، بەیانی کە هەسـتا لەژوورەکـەی چووەدەر. کچە گەورەکەی لەهۆڵەکـە رایـەخی رادەخسـتو کچـە بچووکەکەش خـاولییێکی بەسەر ملان دادابوو، سابوونێکی پەمەیی بۆنخۆشی بەدەستەوە بووو دەچووە سەرکانی.

"کچم، ناتەوێت یارمەتیت بدەم؟"

"نە باوکە، خۆم جێبەجێی دەکەم، تۆ ماندوو دەبیت".

"کەسانێکی فرە خاسن، وانیە کچم؟"

"باش نەبوو ئەو دوورگەیەمان بەنەسیب بوو. کەسانێکی زۆر خاسن باوکە".

"باش بوو کە هاتینە ئەم دوورگەیە".

کچەکە لەوە دەترسا رووداوێکی ناخۆش بۆ باوکی بێتەپێش. ئەمڕۆ بەیانی کە بـاوکی ئاوا خۆشحاڵ بینی، پێیخۆش بـوو بـاوکی لـەنێو ئـەو خەڵکـەدا بێئـەوەی ئـەو جموجـۆڵو شادمانیەی لەدەست بداتو بەحەسرەتی گەڕانەوە بۆ کرێت بمرێت، تەنانەت ئەگەر یـەك دوو سـاڵیش بمینێتـەوە دیسـان ئـەو توانایـەی هـەبوو کـە بەخۆشـحاڵیەوە بگەڕێتـەوە نیشـتمان. تـا ئـەودەم نـە خـۆی باولەکـەی دەکـردەوەو نـە خوشـکەکەی.. باوکیشـیان بـەو بڕیارەی ئەوان خۆشحاڵ دەبووو ئومێدی خۆی لەدەست نەدەدا.

"ماندوو نەبیت کچم".

"سوپاس باوکە".

چووە دەرەوە. دەبوا بچووبایەتە ژێر دارچـنارەکان. زۆر حـەزی لێبـوو ئـەمڕۆ بـەیانی پویراز ببینێت. خۆشەویستییێکی زۆری بەرانبەر بەو هەست پێـدەکرد، کەسـێکی بـەڕێزو بەشکۆیە، پێیخۆش بوو کوڕێکی وەکو ئـەوی هەبوایـە. زەهـراش کچـێکی جـوان بـوو، دڵـی ئەوەندە پڕبوو لەچاکەو سەخاوەتەوە کە.. زۆر جوان بوو.

قژێکی بۆر، چاوانی گەورەو شینی سەرنجڕاکێش. بەژنێکی زراڤو ناسك، گەردنێکی درێژ.. دایکیشی کە لەو تەمەنە بوو ئاوا جوان بوو. بەجوانترین کچی کرێت ناسرابوو.

لەژێر دارچنارەکە دانیشت، چاوی بڕیە دەریا. ڕۆشنایی، ژێر دەریای پاكو خاوێن کردەوە. سەیری لای خانووەکانی نەدەکرد، چونکە نەیدەویست پویراز لەوە بگات کە چاوەڕێی ئەو دەکات.

چاوەڕوانیەکەی درێژەی نەکێشا، هەستی کرد دەستێك داندرایە سەرشانی، ئاوڕی دایەوە پویرازی بینی. نەیتوانی خۆشحاڵیەکەی بشارێتەوە، پێکەنیو یەکسەر هەستا.

"تکات لێدەکەم ئاغا، دانیشە، هەواڵێکی خۆشم هەیە بۆتان".

دەستی گرت لەسەر تەختەکان دانیشتن.

"لێرە ئێمە پزیشکێکی ئاژەڵانمان هەیە کە ناوی جەمیلە، ئێمە پێیدەڵێن پزیشکی ئاژەڵان، لەساری قامیشدا لەگەڵ رووسەکان جەنگاوە. کاتێك سەبارەت بەتۆوە قسەم لەگەڵ کردو پێمگوت کە ئەسپت بەخێو کردوون، زۆر خۆشحاڵ بوو، ئێستا دێت". لەگەڵ ئەم قسانە پزیشکیش هات.

پزیشکی ئاژەڵان بەخێرایی بۆ لای ئەوان هات، داهاتەوە، دەستەکانی موسا کازم ئاغای ڕامووسین، ئاغا هەستی بەشانازی کرد.

کەمێك دواتریش مەلەك خانم لەنێو شیپانەی دەرگای ماڵەکەی دەرکەوت. بەخوانچەیەکەوە کە قاوەجۆشێکی مسینو سێ فنجانی لەسەر بوون. خانم کە خوانچەکەی دانایە سەر مێزی بەردەمیان. لەبەرامبەر موسا کازم ئاغا چۆکی داداو گوتی داخۆ هیچ پێویستییێکیان نیە. ئاغاش دەستی ئەوی ڕامووسی. پویرازو جەمیل سەریان لەو ڕەفتارەی مەلەك خانم دەرنەچوو.

مەلەك خانم هەستا، قاوەی بۆ تێکردنو لەوێ دەستەکانی تێکهەڵێناوەو بەڕێزەوە ڕاوەستا.

موسا کازم ئاغا گوتی: "وەرە، لای من دابنیشە".

مەلەك خانم هات لەلای ڕاستی ئەو دانیشت.

پزیشکی ئاژەڵان رووی لەموسا کازم ئاغا کردو گوتی: "دوورگەی ئێمەو ئێمەت شەرافەتم کرد".

"تکات لێدەکەم کوڕم. تۆش ئەفسەریت؟"

"ئەفسەرم ئاغا".

"چەندیش لاوی".

"ئەوەندەش نا ئاغا".

"لەکام بەرەی جەنگ بوویت؟"

"لەبەرەی رووسەکان".

رووی لەپویراز کرد:

"تۆش ئەفسەر بوویت، مەگەر نە؟"

"ئەفسەر بووم، لەبەرەی رووسەکانو ئورفا، لەجەنگەکانی سەربەخۆیی".

"زۆریش لاوی. مسۆگەر منداڵ بوویت کە بۆ سەربازیان بردوویت، وانیە؟"

"بەڵێ ئاغا، ناوی خولی سەربازیشم....".

"لەوڵاتی ئێوە خولی سەربازیش ناوی هەیە؟"

"تەنها خولی ئێمە ناوی هەیە، خولی وای دایکە".

"ئەمە واتای چیە؟"

"ئەوەنـدە بچـووك بـووین کاتێـك بـەگریانو هـاوارەوە لەماڵـەکانمان جیـا دەبووینـە دەمانگوت وای داایکە. ئەمە بوو بەناوی ئێمە. ژمارەیەکی زۆر کـەممان گەڕانـەوە. هێشـتا ئەنەدۆڵ بەو سترانانەی لەبارەی ئێمە گوتران دەگریتو دەناڵێنێت".

موسا کازم ئاغا گـوتی: "وای، وای، وای بەمپییێـە عوسمـانی هـەموو سـەربازەکانی خـۆی لەدەست داوە".

"ئەوانەی کە مانەوەش رەوانەی جەنگی دژی یۆنان کران".

"وای، وای".

کازم ئاغا زۆر نیگەران بوو.

مەلـەك خـانم لـەجیاتی گـوتنی منداڵـەکانی مـن لەچـاناك قـەڵا بوونـە دووکـەڵو بەهـەوادا بڵاوبوونـەوە گـوتی: "لەچـیای هـەزار کـانیش هـیچ گـەنجێك نـەما. هـەموو ئەسپەکانیش مردن".

کازم ئاغا هاتە جۆشو گوتی: "بۆچی مردن؟ چیان بەسەر هات؟"

"چونکە کەس نەمابوو پێیانڕابگات، لەبرسان. ئەسپ ئەگـەر پێیڕانەگـەیت دەمێنێـت؟ زۆربەیان بەهۆی نەخۆشیو برسیەتی مردن".

کازم ئاغا دووبارە گوتی: "وای، وای! ئەسپی باشو رەسەن بوون؟"

مەلەك خانم تێگەیشت كە كازم ئاغای بەم قسانەی نارەحەت كردووە، بێدەنگ بوو، تەنها سەری خۆی بەنیشانەی بەڵێ دانەواند.

"ئاغا، كاتێك زانیم بەڕێزتان ئەسپ بەخێو دەكەن زۆر خۆشحاڵ بووم. منیش لەمنداڵیدا دەمویست ئەسپ بەخێو بكەم. بۆیەش بوومە پزیشكی ئاژەڵان. كاتێك باسی تۆم بیست لەخۆشحاڵیان تا بەیانی نەمتوانی بنووم".

"منیش لەوەی كە هاتوومەتە ئەم دوورگەیەو ئێوەم بینی خۆشحاڵ بووم. قسەیان لەگەڵ پویرازی كورم كرد، بەڵكو كێڵگەیەكی بەخێوكردنی ئەسپان دروست بكەین دروستی دەكەین‌و ئەسپی رەسەن رەوانەی دونیا دەكەین. ئەسپی باڵدار، بیستوومە لەئەنەدۆڵ ئەسپی رەسەن بەخێو دەكرێت. لەرهاو كلیكیا، دەزانم لەو شوێنانەش ئەسپ هەن. دەزانم ئەسپ لەدەریای سپی دەهێندران‌و دەتگوت ئەسپی باڵدارن. گوایە شوێنێك هەیە نزیكی ئێرە لەلێوارێك دەشێت كێڵگەی لێدروست بكەین".

سەرگەرمی گفتوگۆ بوون كە ڤاسیلی هاتبووو لەسەر یەكێك لەتەختەكان دانیشتبوو.

"لەلێواری بەرانبەرمان نەك هەر جێگایەك بەڵكو سەد جێگا هەیە كە بۆ كێڵگەدانان دەشێن. ئەو جێگایەی كە من دەیڵێم، (بەدەست نیشانی دا) لەوێیە. بەو شوێنە دەڵێن دێی وەلی، هیچ دێ‌و مێیەك لەوێ نیە، بەڵام شوێنێكی زۆر جوانە".

"ئێمە بۆ دانانی كێڵگە هەندێك شتمان لەگەڵ خۆمان هێناوە. ئێمە زەویەكە یەكسەر دەكڕین، كێڵگەكە دروست دەكەین، ئەگەر من گەڕامەوە كرێت، ئەوكات ئێوە دەتوانن كێڵگەكە هەڵسوڕێنن‌و ئەسپەكان بەخێو بكەن؟"

پویراز گوتی: "ئێمە هیچ لەئەسپ نازانین. من لەئەسپسواری بترازێت ناتوانم هیچشتێكی دیكە بكەم. ئەسپە عارەبیە رەسەنەكەشم لەئوزون یایلا دایە ئاغایەكی توركمەن‌و هاتمە ئێرە. بڕیارم دابوو لەم دوورگەیەدا بژیم. سوپاس بۆ خوا كە توانیم لێرە نیشتەجێ ببم. سوپاس بۆ خوا كە مرۆڤگەلێكی باشی وەك ئێوەش هاتن. بوونە مایەی خۆشحاڵیمان". پویراز كاتێك ئەو قسانەی دەكرد چاوی بڕیبووە نێو چاوی موسا كازم ئاغا".

"پزیشكی ئاژەڵانیشتان لەگەڵدایە. لەو باشتر كێ هەیە بتوانێت سەری لەئەسپ‌و بەخێوكردنی ئەسپ دەربچێت".

كاتێك كچە گەورەكەی موسا كازم ئاغا لەولاتر لەلێواری دەریا دەركەوت، هەمووان ئاوڕیان بۆلای ئەو دایەوە. كچەكە هەر لەگەڵ ئەوەی بینی ئەوان بینیویانە بۆلایان

رۆیشت. کراسێکی سەوزی لەبەر کردبوو، کەمەربەندێکی زەردی لەپشتی ئاڵاندبووو گوارەی مرواری کردبوونە گوێیەکانی، هات لەژێر دارچنارەکان راوەستا. چاوی گێڕاو سەیری یەکە یەکەی هەمووانی کردو کاتێك گەیشتە سەر پویراز. نیگاکانیان تێکهەڵنگوت، زەهرا چاوی لێوەرنەگێڕا. چاوە گەش و شین و سەرنجڕاکێشەکانی درەوشانەوە، وەکو مەخمەڵێکی نەرم، سەیری یەکدیان دەکرد.

موسا کازم ئاغا گوتی: "دانیشە کچم، سەیر بکە هەواڵی چەند خۆشم هەیە بۆت، دەمانەوێت کێڵگەیەك دروست بکەین و وەکو نیشتمانی خۆمان ئەسپ بەخێو بکەین".

"چەند باشە باوکە، ئەمە بۆ هەموومان باشە، دیسان ئەسپەکان لەهەموو دونیا لەپێشبڕکێکان بەپلەی یەکەم دەردەچن. چەند باشە".

"دانیشە کچم".

"ناتوانم دابنیشم باوکە، هەرچی کردم نەمتوانی دارتەونێك دروست بکەم".

پویراز هەستا:

"لەگوندەکەی ئێمەش دارتەونیان هەڵدەبەست، رەنگبێت من بتوانم دروستی بکەم".

زەهرا دوودڵ ما، بتەوێت یان نا سوور هەڵگەڕا.

"زەهرا، زووبە لەگەڵ سەرۆك پویراز بڕۆ، ئینشاللا دارتەون دروست دەکات".

زەهرا پێشتر لەپویراز بەڕێکەوت، چوونە نهۆمی دووەم، دارتەون دروست کرابوو. پویراز بەئاسایی وەرگرت. نەشیپرسی، هەردوو گۆناکانی زەهرا چاڵایان هەبوو. کچەکە تا زیاتر پێبکەنیبا چاڵەکان گەورەتر دەبوون و روخساری جوانتر دەکردو سیمای حاڵەتێکی ئەفسووناوی بەخۆوە دەگرت. پویراز بێئەوەی ئاگای لێبێت، هەروا راوەستابوو سەیری ئەوی دەکردو هەرچەندە سەیری دەکرد تێر نەدەبوو. بەردەوام لەبەرخۆیەوە دەیگوت، خوا چ بوونەوەرێکی جوانی ئافراندووە.خوا چ بوونەوەرێکی جوانی....

"خوری، داو، شتێك پێویستە؟"

کاتێك قسەکردن سەری لەبەرخۆی نابووەوەو دڵی دەلەرزی.

"ئەگەر پێویست بوو پێتدەڵێم، سەرۆکی هێژا".

پویراز لەوە زیاتر نەیتوانی لەوێ بمێنێتەوە. بەحاڵەتێکی شپرزەوە لەپلیکانەکان چووەخوار.

"من بۆ وام لێدێت، خوایە بۆ وام لێدێت!". دڵی ئارام نەدەبووەوە. کەمێك دواتر کچەکەی دیکەش هات و لەتەك مەلەك خانم دانیشت. باوکی پێیگوتبوو مەلەك خانم

غەریبە نیەو دەتوانێت متمانەی پێبکات. ئەویش لەخۆشتیڤیانی عەلی‌و رێبواری رێگای بەختەوەریە. کچەکان لەهەموو شتێك گەیشتبوون. مەلەك خانم بەژنێکی بەتەمەن نەدەچوو. بەژن بڵند، جوان‌و رووخۆش‌و چاوانی گەش‌و رەش‌و پڕ لەمیهرەبانی‌و سەرنجڕاکێشی هەبوون.

ئاخاوتن لەبارەی ئەسپ، کرێت، چیاکانی تورۆس، رها، کلیکیاو کێڵگەی بەخێوکردنی ئەسپ زۆر بەگەرمی بەردەوام بوو.

پویراز گوتی: "موسا کازم ئاغا هیچ دڵ لەدڵ مەدە، سبەی دووسبەی کە قەدریی بەلەموان هاتەوەوە ئێرە، دەمانباتە گوندەکە. ئێمەش هەر کارێك پێویست بێت دەیکەین. ئەوەندەمان لەدەست دێت کە کێڵگەیەك دروست بکەین".

"سەرفراز بیت کوڕم. خوا مرازت حاسڵ بکات".

مەلەك خانم گوتی: "ئینشاللاّ، ئینشاللاّ پیری مـن. سەروەری مـن. مەگەر دەشێت تۆ دوعا بکەیت‌و گیرا نەبێت".

کچەکان سەیری یەکدیان کردو بتەوێت‌و نەتەوێت پێکەنین.

ڤاسیلی گوتی: "بەلەمێکی ماتۆڕدار هاتووەو خەریکە لەئەسکەلە لەنگەر دەگرێت. ئەگەر ئاوا بڕوا بەمزووانە دوورگەکەمان پڕ دەبێت لەخەڵك".

پویراز گوتی: "ئێستا با بچین ببینین". خەریکبوو هەڵدەستا کە هوسمەن پەیدابوو.

"وەرە هوسمەن، ئەوە تۆ لەکوێیت؟ سەیر کە کێ لەکرێت هاتووە، موسا کازم ئاغا، تۆ لای ئاغا دانیشە. من‌و ڤاسیلی دەڕۆین‌و زوو دەگەڕێینەوە".

هوسمەن خێرا چوو دەستەکانی ئاغای گرتن‌و توند گوشینی‌و گوتی:

"بەخێرهاتی، زۆر خۆشحاڵت کردم. خەڵکی کرێت کەسانێکی رەسەنن، هەم یۆنانیەکانی، هەم تورکەکانی. هەم کەسانێکی زۆر زۆر ئازاو دلێرن. بەخێرهاتی، من ناوم هوسمەنە".

موسا کازم ئاغا دەستی گرت‌و لای خۆی داینیشاند، ئاگایان لەوانی دی نەماو پێکەوە دەستیانکرد بەقسەکردن بەیۆنانی.

پویرازو ڤاسیلی یەکسەر چوونە ئەسکەلە. گەیشتنە سەر ئەسکەلەو لەوێ چاوەڕێیانکرد. بەلەموان کە بەلەمەکەی لەئەسکەلە لەنگەری گرتبوو، کندرەکەی بۆلای ڤاسیلی هەڵدا، ڤاسیلی کندرەکەی گرت‌و لەستوندەگی ئەسکەلەی بەستەوە.

لەنێو بەلەمەکەدا سێ ژن، یەکێکیان کچێکی تاڕادەیەك گەورە، سێ کوڕێژگە، کچێکی منـدالّ، پیرەمێردێکـی ریـش چـەرموو، سـێ پیـاوی گـەنج و یـەکێکی کامڵـەمرۆ هـەبوون. پویراز هەرکە چاوی بەیەکێك لەگەنجە رەشـتاڵە سمێڵبـابرِو باڵابـەرزەکان کـەوت هـەموو گیـانی لـەرزی. وەك ئـەوەی بروسـکە لێیـدابێت. ڤاسـیلی تێگەیشـت رووداوێکـی لێقـەوما. یەکسەر خۆی گەیاندە لای و سەیری ئەو شوێنەی کرد کە ئەو چاوی تێبڕیبوو. ئـەو پیـاوە هەمان پیاو بوو. ڤاسیلی دووبارە سەیری ئەو پیاوەی کرد کە لەنێو بەلەمەکەدا لەشـوێنی خۆی میخکوت بووبووو هیچ تەکانێکی نەدەخوارد. بێ سێ و دوو خۆی بـوو. ئـەو پیـاوەی کە شێخی عارەبان بۆ کوشتنی پویرازی ناردبوو.

پـویرازیش وەکـو ئـەو پیـاوە لـەجێی خـۆی رەقهـەڵاتبووو چـاو لـەماڵق سـەیری یەکدیان دەکرد.

ڤاسیلی گوتی: "خۆیەتی. هاتووە ئەمجارە کارەکە تەواو بکات".

پویراز متەقی نەدەکرد، لەشوێنی خۆی ئاوا راوەستابوو.

پیاوە گەنجەکە هاتووو لەسەرو سیمایدا دیاربوو کـە ئـەویش دوودڵ و راڕایـە. ڤاسـیلی گوتی: "وەرە سـەرخۆت پـویراز"و لەپێشـی راوەسـتا. بـاڵای لـەپویراز بـەرزتر بـوو، کەوتـە نێوان هەردووکیان، بەمشێوەیە نیگاکانیان لەیەك جیا بووەوە.

پویراز بەڤاسیلی گوت: "خۆیەتی"و بەدەنگێکی نـزم ئەمەی خستەسەر:

"دەمانچەکەی پڕ فیشەکە؟"

"ئەی ئەوەی تۆ چی؟"

"ئەوەی منیش پڕ فیشەکە".

یەکەمجار منداڵەکان هاتنە سەر ئەسکەلە. ئینجا ژنەکان، بەدوای ئەوانیشدا پیاوەکان. لاوەکە کـە لەشـوێنی خـۆی رەقهـەڵاتبوو. نیگـای لەسـەر پشتەسـەری ڤاسـیلی راوەسـتابوو. ژمارەیەك لەپیاوەکان گەڕابوونەوە نێـو بەلـەم، شـتومەکەکانی سـەر بەلەمەکـەیان دەدایـە دەست ئەوانەی لەسەر ئەسکەلە بوون.

"ئەمانە کێن؟"

"ئێستا تەنها خوا دەزانێت کێن".

"ئێمەش ئەگەر بزانین کێن زۆرباشە. سـەیری ئـەوەیان بکـە! تـۆ دەڵێـی بنیـادەم نیـە. دەڵێی گورگە. وەك شێتان سەیر دەکات".

"پێشم بەردە ڤاسیلی!"

ڤاسیلی بەنابەدڵی پێشی بەردا. دووبارە نیگای پویرازو ئەو پیاوە گەنجە کە مووی بۆری ئێستا بەلای سووریان دادەڕوانیو روخسارێکی زبرو سمێڵی شۆڕبووەوەی هەبوون، کەوتەوە سەریەك. چاوی گەنجەکە وەکو شووشە وابوون، هیچ قسەیەکی نەدەکرد، پویراز لەوەتەی هەیە لەچاوانی شووشەیی دەترسێت. هەموو گیانی کەوتبووە لەرزین. ئێستا ناکرێت ئەو پیاوە یەکسەر بگەڕێنێتەوە. بەسەیرکردنو شێوەی راوەستانی خەریکبوو ئازاری دەدا، بەڵام ئێستا لەم ئانو ساتەدا دەیتوانی چ بکات؟ نەدەکرا تەقەی لێبکات. کابراش دەتگوت خەریکبوو دەست هەڵبگرێت، حاڵەتی روخساری کەمێك نەرم بووبوو، بەڵام نەشدەکرا متمانەی پێبکات، هەرچیەك بێت بنیادەمە، بۆی هەیە لەپڕ بگۆڕێت. ڤاسیلیش چونکە ئەمەی دەزانی ئەوەندە نیگەران بوو. رێك لەسەر رۆخی تەختەکانی ئەسکەلە راوەستابووو دەستی لەسەر دەمانچەکەی بوو. ڤاسیلی دەیتوانی بەرلەوەی ئەو دەست بۆ چەکەکەی ببات نێو چاوانی دووبەدەر بکات. ئەو لەو کاتانەی کە مەسەلەی گیان لەنێوانانـدا بایە، گوللەی بەسەری بەرانبەرەکەی نا، بەڵکو لەگەڵ بچووکترین تەکانخواردنی... رێك تەقەی لەناوەڕاستی دڵی دەکرد.

وەلی نیشانچیش کە هەستی بەرووداوێکی ناخۆش کردبوو. دەهات لەپێش پویراز رادەوەستا، کەمێك دواتر بەنیگەرانیەوە بەدەوروبەری خۆیدا دەخولایەوە. بەدوای شتگەلێکدا دەگەڕا. دەچووە سەر ئەسکەلەو لەتەك ڤاسیلی رادەوەستاو لەوێ تەماشایەکی سەرتاپای ئەو کابرایەی دەکرد کە لەنێو بەلەمدا لەشوێنی خۆی رەقهەڵاتبووو هیچ جووڵەیەکی نەدەکرد. لەدڵی خۆیدا دەیگوت ئەو کابرایە شتێکی لەبن سەر دایەو بیری لەوە دەکردەوە داخۆ ئەو دەتوانێت چ بکات. شتگەلێکی شینباوی پوولەکەییو هەڵماوی بەبەرچاوی پویراز رەت دەبوون. لەپشت هەڵمەکەو پوولەکە شینباوەکانیشدا ئەو گەنجە راوەستابووو حازربەدەست.

بەلەمەکە بەتاڵ بوو، بەلەموانەکە هاتو بەپویرازی گوت: "خوا حافیز سەرۆك فەرمایشێکتان نیە؟"

گەنجە بێئۆقرەکە تاكو تەنیا هەر لەوێدا راوەستابوو. ماتۆڕی بەلەمەکە بەگڕەگڕ کەوتەکار. پەروانەکانی کەفێکیان دەردەدا، گەڕایەوە، گەنجەکە هێشتا لەهەمان شوێندا راوەستابوو. بەبڕوای پویراز موسا، گەنجە قژسوورەکە تەنانەت چاوی بەپشتە سەریشەوە بوونو سەیری ئەویان دەکرد.

تا ئەو دەمەی کە بەلەمەکە ڕۆیشتو وەڕێکەوتو لەبەرچاوان ون بوو. ئەو کەسانەی کە لەبەلەمەکە دابەزیبوون نەیانتوانیبوو لەپویراز نزیك ببنەوە. نە لەپویرازو نە لەڤاسیلیو نە لەنیشانچیش، کە هەروا لەو نێوە لەشوێنی خۆی رەق راوەستابوو. کاتێك بەلەمەکە لەچاوان ون بووو رەوشەکە کەمێك هێور بووەوە، ڤاسیلیو نیشانچیش هاتنە لای پویراز، پیرەمێردەکە هاتە لای پویرازو گوتی: "کوڕم، کاکی بەڕێز، ئێرە دوورگەی پویراز موسایە. ئێمە بەهۆی ئەوەوە هاتووینەتە ئێرە. لەکوێ دەتوانین پەیدای بکەین؟"

پویراز بزەیەکی بۆ کردو گوتی: "دەتوانیت لێرە بیدۆزیەوە، پویراز موسا منم".

"پویراز موسای برا ئێمە دەتوانین لەکوێ نیشتەجێ ببین؟ بگرە ئەمەش قەباڵەو بەلگەنامەکانی دیکە. عوزێر خان، خوا خێری بنووسێت. هەموو کارەکانی بۆ ئەنجام داین. سڵاوی بۆ تۆش هەبوو. ئێمەیشی بەتۆ سپارد".

"زۆر باشە، کاری تۆ ئاسانە باوکە. ئەو گەنجەی کە لەنێو بەلەمەکە بووو هیچی لەسەر نەنابوو، ئەوەی کە گەڕایەوە کێ بوو؟ بۆ لەبەلەم دانەبەزیو گەڕایەوە؟"

"رۆڵە، بەخوا من نازانم ئەو کێیەو چ کارەیەو چ کەسێکە. لەئەسکەلەی شارۆچکەکە لەخاوەنی بەلەمەکەم پرسی دەچیە کوێ، گوتی، دوورگەی کارینجا. گوتم، ئێمەش دەچینە ئەوێ. گوتی سواربن، سوار بووین. ئەو کابرایەی نێو بەلەمەکە رێك لەنێوەڕاستی بەلەم، هەر ئاوا رەق لەجێی خۆی راوەستابوو، سڵاومان کرد، هیچ بایەخی پێنەداین، رەنگبێت هێندە لەگەڵ خۆیەوە بووبێت هەر گوێی لێنەبووبین، یان وەڵامی سڵاوی نەداینەوە. حاڵەتی تووڕەی روخساری لەچاوە تیژەکانیدا دیاربوو. کاتێك بەلەم وەڕێکەوت، چووە گۆشەیەك پشتی لەئێمە کردو دانیشت. لەو هەموو ماوەیەدا ئاوڕێکی نەدایەوە، تەنانەت بەوشەیەکیش قسەمان لەگەڵ بکات. کە لەدوورگە نزیك بووینەوە هەستایە سەرپێ، دەمانچەکەی لەبەرپشتی هێنایە دەرو فیشەکی رەپێش کرد. کاتێك تیشکی خۆر بەر دەمانچەکەی کەوت بریسکایەوە، پاشان خستیە بەر پشتی. هەر ئاوا بەپێوە راوەستا. کە ئێوەی بینی روخساری یەکەمجار زەرد زەرد، پاشان سوور سوورو دواجاریش هەموو گیانی بووە ئارەقە، ئارەقە تنۆك تنۆك لەروخساریدا دەهاتەخوار. ئەو بەلەموانەش ئینشاڵڵا خێر لەو بەلەمو ئەو پارەیە نەبینێت کە لەئێمەی وەرگرت، هەرچی پارەیەکی هەمانبوو لێیوەرگرتین، ئینشاڵڵا ئەو بەلەموانە کافرە، لەگەڵ ئەو پیاوە ناکەسە بەزوویی نوقمی نێو دەریا بنو دڵمان ئارام ببێتەوە".

"سوپاس بەڕێزم، بەخێر بێن بۆ دوورگەکەمان".

پیرەمێردەکە بەتورکییێکی تێکەڵ بەزمانی کوردی قسەی دەکرد.

"ڤاسیلی لەگەڵ دۆستان بڕۆ خانووەکانیان نیشان بدە. نیشانچی تۆش یارمەتی ئەوانەی کە هاتوون بدە، تۆ حەز لەیارمەتیدانی خەڵکی دەکەیت. کوڕینە هوسمەن لەگەڵ خۆتان ببەن، ئەمانە زۆر ماندوون. مەلەك خانمیش نەهێڵێت ئەمانە برسی بمێننەوە، باش تێریان بکە".

پیرەمێردەکە نەیدەزانی چی بکات، لێکلێکە بەکوردیو عارەبیو تورکی دوعای دەکرد.

"ڤاسیلی، دوای ئەوەی خانووەکانت نیشان دا یەکسەر وەرە سەر گردەکە. نیشانچی، ئەگەر پێتخۆشبوو تۆش وەرە. دەبێت سەبارەت بەهەندێك شتی زۆر گرنگ قسە بکەین".

"لەگەڵ ڤاسیلی دێین. زوو دێین".

"سەعاتێك دوای ڤاسیلی وەرە. دوای ئەوەی کە ئەمانەت لەخانووەکانتان دانا ئینجا وەرە".

بەنێو دارزەیتوونەکاندا بەرەو لای سەرەوە بەڕێکەوت. بەترسو دڵەخورپە نێو دەوەنە دڕکاویەکانو پشت درەختە گەورەکانی زەیتوونی تەماشا دەکرد، بچووکترین دەنگێکی بیستبا دەترسا، بەئەسپاییو لەسەرخۆ بۆلای ئەو شوێنەی دەنگەکەی لێوە هاتبا دەچوو، یان مەلێك لەنێو دەوەنێك بوو هەڵدەفڕی یان کیسەڵێك کە هەوەسی جووتبوونی کردبووو بەلاکی توند دەیکێشایە لاکی کیسەڵێکی مێینە، لاکەکەی تەق تەق دەنگی لێوە دەهات. سەرکۆنەی خۆی دەکرد، بیری دەکردەوەو دەیگوت من بۆچی کەوتمە ئەم رۆژەو بەردەوام ئەو رستەیەی دووپات دەکردەوە. لەگەڵ ئەوەی کە لەتەنیشت خۆی ئەو شوێنەی گوڵە کێویلکەیەکی لێڕوابوو دەگێکی بیست ترساو بۆلای دەوەنەکان نەچوو. ترس دایگرتبوو. دڵیشی بەتوندی لێیدەدا، ئەو هەموو جەنگانەی بینیبوو، بەڵام قەت ئاوا دڵی دانەخورپابوو. تەنانەت کاتی زرمەو هۆڕی تۆپو خومپارەکانیش ئاوا نەشێوابوو. لەپڕ وێنەی زەهرای هاتە بەرچاوو راوەستا، بەقژی بۆری هۆندراویەوە، چاوانی شینی سەرنجڕاکێش، چاڵەکانی گۆنای، بەژنو باڵای زراڤو بڵندو بزەیەکی وەك بزەی منداڵانی بەرمەمکان. لەناخیدا هەستی بەچێژێك کرد کە تا ئەمکاتە قەت هەستی پێنەکردبوو، جەستەی مۆر هەڵگەڕا. لەدڵی خۆی گوتی من بۆ واملێهاتووە. رۆشناییەك خزایە دڵیەوە. شادیێك گرتیە خۆی، زیادی کرد زیادی کرد، پاشان کز بووەوەو وەك تاڵە مووێکی لێهات. خەونو خەیاڵ، رەنگە جیاجیاکان، سەردەمی منداڵیی، چیاکانی قەفقاز -

کە نەیبینیبوون- بین بوغا، کانیەکانی بین بوغا کە لەجیاتی ئاو ڕۆشناییان پەخش دەکردو لەژێر زنارە وەك مەڕمەڕە سپیەکان کە ڕەگی نارنجیان تێدابوو هەڵدەقوڵین و هەڵۆ سوورەکان کە بەبێئەوەی باڵ ببزێون و خۆیان تەکان بدەن سنگی خۆیان دەدایە بەر باو بەسەر زنارەکاندا دەخولانەوە. سووریەکەیان نەهێندە کاڵ و نەهێندە تۆخ بوو! خەستتر لەسوورایی پارچەیەك مسی مشتومالکراو، ڕەنگێك لەنێوان ڕەنگی سوورو وەنەوشەیی بوو. هەموو ئەو بەردەڵانە، تەمگرتوو، ئەوێ قەفقازو چیاکانی ئەللاهو ئەکبەر، گولله تۆپەکانی کە بێوچان گرم و هۆڕیان بووو هێڵێکی تیشکئاسای سپی، شین، نارنجی و سەوزباویان لەدوای خۆ جێدەهێلا و گولە زەردەکان کە لەقەدپاڵەکان، بەکیلۆمەتران ئەو ناوەیان بەرەنگی زەردیان داپۆشیبوو... خەیاڵەکانی بەدەوری گوڵە زەردەکان زیاتر دەخولانەوەو بوون بەلایەلایە. هەورێکی سپی نیشتە سەری، ڕۆشناییەك کەوتە سەر قەدپاڵی چیای بەرانبەر. مردن تۆقێنەر بوو. جەنگەڵەکان هەرجارێك گوللە تۆپێکیان بەناو دەکەوت دەسووتان. بایەکی بەهێز هەڵیکردبوو، لەپێش ئاگرەکەی کە بەربووبووە جەنگەڵەکە لوورەلوورو لرفەلرفی بوو، دەیزریکاند، بەشێوەیەك دەتگوت هەزاران زارۆکی بەرمەمکان پێکەوە دەزریکێنن. گوللە بەرەنگی نارنجیەوە لەئاسمانەوە دادەبارین... بەشێلکە. خوێن لەبرینەکەی فیچقەی دەکرد، دەوروبەر بۆنی بارووتی لێدێت. خوێن لەرەگەکانی دەچۆڕێت، زۆری پێناچێت هیچ خوێن لەرەگەکانی بەدەنیدا نامێنێت. دەڵێن ئەو جۆرە مردنە زۆر ئاسوودەترە، مرۆڤ دەکەوێتە خەونێکی درێژو هێواش هێواش لەهۆش دەچێت و مەست دەبێت و دەکەوێتە نێو بەهەشتێك.

بە ورشەو بریقەی باڵندەیەکی گەورە کە کەمێك لەپێشتر بوو، چاوەکانی کردنەوە، ڕاچڵەکی و ڕاوەستا. باڵندەکە بەزەحمەتێکەوە هەوڵیدا باڵ لێکبداو بۆ ئاسمان بەرز ببێتەوە، لەماوەیەکی کورتدا خۆی کۆکردەوەو بەرەو سەرەوە بۆلای تەپۆلکەکە لەشەقەی باڵی داو فڕی. پویراز بیریکردەوە، ئەم باڵندەیە لەم دوورگەیە چیدەکات؟ شاهینێکی زۆر گەورە ڕەنگبێت هێلانەی لەنێو ئەم زنارانە بێت. لەم ڕۆژانەدا جووجکەی باڵندەکان لەهێلکان دێنەدەر. ئەو کچە دەوڵەمەندە دەیەوێت بەدارتەونەکەی چی بچنێت؟ بۆچی تا ئێستا کلیم چنینی کردووە. نەکا قسەکانی موسا کازم ئاغا ڕاست نەبن؟ هەرگیز پێناچێت کەسێکی ئاوابێت. مەلەك خانم ئەوی ناسیوە، لەبەرانبەریدا ئەژنۆی داداوەو داوای لێکردووە دوعای بۆ بکات. کوردانی عەلەویی

ئوزون یایلا لەبەرانبەر شێخی خۆیاندا چۆکی راستیان دادەدەن. دەستی ماچ دەکەن‌و داوای لێدەکەن دوعایان بۆ بکات. شێخیش دەستی ئەوانەی نیازو مرازێکیان هەیە، جا چ ژن بێت، چ پیاو یا مندالْ بێت ماچ دەکات.

موسا کازم ئاغا دەبێت لەشێخەکانی عەلەویان بێت، عەلەویەکان کچی خۆیان نادەنە کەسێکی غەیرە عەلەوی. عەلەوی چدەکات لەکرێت؟ چدەکات؟ عەلەویەکان لەهەرچوار ئالی دونیا هەن. ئازەربایجان، ئێران، تەنانەت عارەبستان، تەنانەت لەم چیای قازداغیەش. سبەی دەبێت لەمەلەك خانم بپرسم. ئەوانیش نالێن کێ عەلەویەو کێ هەونیە.

ئەوەی کە لەنێو بەلەمەدا ڤیتاوڤیت راوەستابووو هیچ جوولەیەکی نەدەکرد، ئەوەی کە لەبەلەم دانەبەزی، بۆ هات‌و لەبەلەم دانەبەزی‌و گەڕایەوەو رۆیشت؟ ترسا؟ نەکا بۆ ئەوە هاتبێت رەوشەکە هەلْبسەنگێنێت؟ هیچ جێگایەکی روخساری جوولەیان نەدەکرد. تەنانەت لەهەموو ئەو ماوەیەدا تەنها حەوت جاران پێلْووی چاوەکانی خستنە سەریەك. ئاسەواری برینێکیشی بەگەردنەوە بوو. لەجێی خۆی نەجوولا. تەنها ئەنگوستی شادەی دەستی راستی بێڕاوەسان بەرزو نزم دەبووەوە. زەردەوالْەیەك نیشتە سەردەستی چەپی‌و ماوەیەکی درێژ ئاوا مایەوە. گەنجەکە ئاگای لێنەبوو. زەردەوالْەکە هەلْفڕی، سێ جاران بەدەوری خۆی سووڕایەوە، وزەوزێکی کرد، دەنگی وزەوزەکەی تا ئەسکەلە هات، بەلاّم ئەو ئاگای لێنەبووو بایەخی پێنەدا. ئەو دلْۆپە ئاوانەی کە لێرەو لەوێ بەسەر چەکمەکانیەوە بوون بریسکانەوە، پاشان یەکسەر نەمان. تەنها قاچەکانی جارێك لەرزین، گرنگی پێنەدا. چەندین جار نیگاکانیان لێکگیربوو، چاوە شینەکانی هیچ هەستی ترس‌و نیگەرانی‌و کونجکۆلْیان تێدانەبوو، دەتگوت پارچەیەك سەهۆلْە. تەنانەت بۆ جارێکیش سەیری ئەو رێبوارانەی کە شمەکەکانیان لەبەلەم دادەگرت، یان سەیری بەلەموانی نەکرد. لەگەلْ داگیرساندنی ماتۆڕی بەلەمەکە دەستی بۆلای دەمانچەکەی چوو، بەلاّم وەك ئەوەی دەستی بەر ئاسنێکی داغ کەوتبێت کشاندیەوە. بۆ رۆیشت، ئەو کە لەبەردەستیدابوو بۆچی هات، بۆچی رۆیشت؟ لەو ماوەیەی کە بەلەمەکە گەڕایەوەو رۆیشت‌و لەپشت دوورگە لەبەرچاوان ون بوو، تەنانەت جارێکیش ئاوڕی لەدوای خۆی نەدایەوە. سەری خستبووە نێو شانەکانی. ئەمە نیشانەی نیگەرانی‌و پەشیمانی‌و لەدەستدانی شکار بوو. هەموو شتێك بەتەواوی روون بوو، ئەو دووبارە دەگەڕایەوە. بۆچی رۆیشت؟ ئەو کەسانە فیداییین‌و بۆ کوشتنی ئەو کەسەی مەبەستیانە بیکوژن خۆی

بۆ لەبۆسە دانانێن. لەهەر جێگایەك رووبەڕووی بوونەوە یان گیریان هێنا لەهەمان جێگادا دەیکوژن. ئەگەر تەنگاو بکرێن خۆیشیان دەکوژن. ئایا ئەو دەمەی کە بەلەمەکە هێشتا نەگەیشتبووە ئەسکەلە نەیدەتوانی دەمانچەکەی راکێشێتو ئەو پیاوەی وەك لادەرگایەك بەرامبەری راوەستابوو بپێکێتو بەلەمەکە وەرسووڕێنێتەوە؟ ئەو کە دەیزانی کەسی بەرامبەری کێیەو ئەوەشی دەزانی کە شکار هی ئەو کەسەیە یەکەم دەست دەوەشێنێت، هی ئەو کەسەیە کە تەڕدەست بێت.

دیسان دەگەڕێتەوە.

چووە سەر تەپۆلکەکە، دانیشتو پشتی بەبەردەنووسەکەدا. لەدوورەوە کەشتییێکی زەبەلاحی نەفەرهەلگر رەت دەبوو. لەلایەکی دیکەش مەلانی دەریایی لەدەریای لای دەستەچەپی دوورگە لەدەوری یەکدی گردبووبوونەوە، لەسەر دەریا کێڵگەیەکی سپی زۆر گەورەیان دروست پێکهێنابوو.

لەلای خوارەوە لەپەنا دارزەیتوونەکان سەرو کەللەی ڤاسیلی بەدیار کەوت. تاوێك راوەستاو سەیری کێڵگەی مەلانی دەریای کرد. لەگەڵ رۆیشتندا بەردەوام قاچی لەشتێك هەڵدەنگوت. رادەوەستا، بیریدەکردەوە پاشان دەکەوتەوە رێ.

بەڵکو ئێستا لەبەرخۆیەوە بڵێت، بینیت چۆن ئەو پیاوەمان گەڕاندەوە، ئاااە، ئاااە، پویراز، براکەم، بەهۆی تۆوە بوو. تۆ ئەو بەڵایەت بەسەر هێناین. ئەو کە تا ئێرە هاتبوو، دەمانکوشتو لەکۆڵمان دەبووەوە، ئێستا دەبێت چی بکەین، دەبێت بچینە کوێ، ئەگەر ئێمە ئەو نەکوژین ئەو ئێمە دەکوژێت.

لەکوێ دەبێت بیدۆزینەوەو بیکوژین. ئەمانەی دەگوتو نیگەران دەبوو. پویراز پێکەنی، لەبەرخۆیەوە گوتی، بەخوا خەریکە بیر لەو شتانە دەکاتەوەو خۆی دەخواتەوە.

ڤاسیلی هات لەتەنیشتی دانیشتو پشتی بەبەردەنووسەکەوە دا.

تا هاتنی نیشانچی هەر بیریان لەفیداییەکەی شێخی عارەبان کردەوە، بەدوای چارەدا گەڕان، بەڵام هیچ رێگاچارەیەکیان نەدۆزیەوە. تەنها یەك رێگاچارەیان لەمێشك دابوو. بەجێهێشتنی دوورگەو چوونە شوێنێکی دوورو سەلامەت. دەبوا بچووبانە کوێ، ئایا ئەو کەسەی کە ئەوانی لەم دوورگە چۆڵو لاپەڕگەیە دۆزیبووەوە، تەنانەت ئەگەر بچووبانەتە شوێنێکی دیکەش نەیدەتوانی زوو یان درەنگ بیاندۆزێتەوە.

نیشانچیش هات، ئەویش بەکێشەکەی دەزانی. ئەویش بیرۆکەکانی خۆی باسکردن. دواجاریش قسەی خۆی کرد.

ناکرێت ئـەم دوورگەیـە بـەجێبێڵین‌و بچینە جێگایـەکی دیکـە. هـیچ جێگایـەك لێـرە ئەمنتر‌و سەلامەتتر پەیدا نابێت‌و ئەو کەسەی کـە دەهـات لـەکوێوە دەبـوا بهاتبایەتـە نێـو دوورگە. مەگەر نەدەبوو لەئەسکەلەوە بهاتبـا، دامانـنـا لەئەسکەلەوە دەهـات، ئـەو گەنجـە رەشـتاڵە تـوانی بهێـت؟ ئەگـەر بهاتبـا دەسـتی بـۆ چـەکەکەی بردبـا گوللـە نێـو چـاوانی نەدەسمی؟ جگە لەوە دامانـنابێت کە لەئەسکەلەوە نەدەهات‌و لەجێگایەکی دیکەوە دەهات، هیچکەس نایبینێت؟ شەو بێت یان رۆژ هیچ جێگایەك لێرە سەلامەتتر پەیدا نابێت. تازە مەگەر دەستی ئێمـەش بەسـتراون. ئـەو هـەموو سـاڵە سـەربازیمان کـردووە، لـەژێر بـارانی گولله ماوینەتەوە.

دەستی پویرازی کە لەبیرکردنەوەدابوو گرت‌و بەرزی کردەوە:

"تۆ دەمانچەیەکم بۆ پەیـدا بکـە. دوای ئـەوە ئیـدی بـیر لەهیچشـتێکی دیکـە مەکـەوە، ئەوسـا خـۆت دەیبینیـت کـە کێیـە چـاوی باڵنـدەی ئاسمـان‌و پاشـووی کەروێشـکی بـەزیو دەپێکێت! تۆ ناتوانیت تێبگـەیت، ناتوانیـت نیشانەشـکێنێکی زیـرەك لەچـاوەکانیرا دیـاری بکەیت. دەمانچەیەك..".

پێکەنی‌و بەدەنگی بەرزەوە گوتی: "ڤاسیلی، هەستە لێرە، بۆچی وەکو منداڵانی یـەتیم لەوێ وشکهەڵاتوویت".

ڤاسیلی یەکسەر وەك سپرینگ لەجێی خۆی راست بووەوە:

"چیە وەرە، هەستام".

"پویراز دەبێت لەماوەی سێ رۆژدا دەمانچەیەکم بۆ پەیدابکەیت، دەبێت لەدەمانچـەی بەگەکانی بولغاریا بێت. دەبێت سەد دانە فیشەکیش بکڕیت.

زۆرتریش بن باشترە. مەترسە، پارەی دەمانچەو فیشەکانت دەدەمـەوە. کەسـانی وەکـو ئێمە ئەو هەموو ساڵە جەنگاون، ئاوا بەئاسانی لەمەرگ ناترسن".

رەنگی شین داگەڕاو زیاتر لۆچاوی بوو.

"ئـەو کەسـانەی کـە شـەڕیان تاقیکردۆتـەوە ئەگـەر بـەمردن رازی بـن، مرۆڤایـەتیان لەدەسـت دەدەن. لەدەسـتەکەی ئێمـەدا کەسـێکی ئەدەنـەیی هـەبوو کـە هـەرکاتێك شـەڕو نەبـەرد دەسـتی پێـدەکرد یـان گوللـەی تـۆپ‌و خومپـارە وەکـو بـاران دادەبارینـە سـەرمان دەستیدەکرد بەگۆرانی گوتن: (لەمردن مەترسـەو ڤاچـەکانت مەکێشـە دواوە، هەرچیەك لەنێوچاوانی پیاوی دلاوەر نووسراوە هەر ئەوە دێتەدی). لەدوا دواییەکانـدا منـیش وەکـو

ئەو دەستمكرد بەگۆرانیگوتن. تەنانەت كاتێك شەڕی دەستەویەخە هەمیشە گۆرانیـەكمان دەگوت". قۆڵی پـویرازی گـرتو رایكێشا "تـۆ لـەماوەی سـێ رۆژدا دەمانچـەیەكم لەوانـەی بەگە بولغاریەكان لەگەڵ زیاتر لەسەد فیشـەك بـۆ پەیـدا دەكـەیت؟ دەزانـی بـۆ دەمـەوێت فیشەكەكان زۆربن؟"

"دەزانم".

"بزانە كە بۆ مـن فیشـەكێك بەسـە. دەسـتم لـەبیری چۆتەوە، چونكە چـەندین سـاڵە دەمانچـەم بەكارنــەهێناوە. تەقــەكردن كـارێكی جیایـە، تەنانــەت ئەگــەر تــەنها دە رۆژ نەیكەیت نیشانەشكێنیت لەدەست دەدەیـت. لەبەرئـەوە داوای فیشـەكی زیـاترت لێدەكـەم. تۆ ئەگەر دەمانچەو فیشەكم بۆ بێنیت، دواتر من بـۆ خـۆم فلینتایـەكی ئـەڵمانی دەكـڕمو ئینجا تەنانەت بەسەر باڵی باڵندەش ناتوانێت بهێنە دوورگە".

پویراز گوتی: "دەزانم، ناتوانێت بهێت".

"دەمانچە".

"بەڵێن بێت، لەماوەی سێ رۆژ....".

"ئەگـەر لەفەرەنگسـتان یـان كوردسـتان یـان بیابـانی عارەبسـتانیش بێـت هـەر پەیدای دەكەیت؟"

"لەماوەی سێ رۆژ...".

"منیش سـبەینی دەتبەمـە راوەماسـی. مەگـەر نابینیـت دانیشـتوانی دوورگـە خەریكـە زیاد دەكەن، خوا ژمارەیان زیاتر بكات".

"لێبگەڕێ با زیاتر بـن، تـۆ وەرە بیانبینـە. دوورگـە ئەوەنـدەی لـەپی دەسـتە. برسـیو رووتو رەجاڵ بمێننەوە، یەكدی دەخۆن، پاشان منو تۆش دەخۆن".

"مەترسە خوا رۆزی گورگی كوێریش دەدات. چ دەڵێیت، سبەینێ دێیتە راوە ماسی؟"

"ماسیگری لەتەك تۆدا بەنسیب هەموو كەسێك نابێت سەرۆك پویراز".

"هـەر بـژیت سـەرۆك نیشانچـی، بیسـتنی ئـەو جـۆرە قسـە جوانانـەش بەنسـیبی هـەموو كەسـێك نابێـت، كەوایـە سـبەینێ زوو ئـەو دەمـەی كـە ماسـیەكان هێشـتا لەخەوێكی قوولْ.....".

"ئەو دەمەی كە هێشتا هیچ ماسیێك چاوی نەكردۆتەوە".

ڤاسیلی گوتی: "بەرلەوەی چاو بكەنەوە".

"ئێستا کاتیەتی بەلەمێکی ماتۆڕدارم بۆ بکڕیت. ئەوەنده ماسی دەگرم کە لەماوەی سێ مانگدا قەرزەکانم دەدەمەوە. ئەوەندەی کە ماسیگرتن شارەزام، ماسی فرۆشتنیش شارەزام. تەنانەت دەتوانم ماسی بەو درەختەش بفرۆشم کە زمانو گوێو چاوو هەموو شوێنێکی بۆتە گوڵی سپی".

ڤاسیلی گوتی: "درەختێکی چەند جوانه، وەنیه؟"

پویراز گوتی: "چەند جوانه، ئەم درەخته تەنها درەختێك نیه، بەو هەموو گوڵە سپی سپیانە هەزار دانە درەختە. جاری یەکەم کە بینیم واقمورِما، لەدوور دوورەوە دەنگی وزەوز دەهات. وەکو زریکەی دارستان. کاتێك لەدرەختەکە نزیك بوومەوە بینیم لەسەر هەر گوڵێکدا زەردەواڵەیەك هەڵنیشتووەو دەبریسکێتەوە، رۆشناییەکانو گوڵەکان بووبوونە تۆپەڵێكو دەدرەوشانەوە"

"باڵی زەردەواڵەکانو گوڵەکان ئاوێتەی یەك دەبنو دەدرەوشێنەوە".

"نابێت لەم دوورگەیە بڕۆین، تێگەیشتن؟ زەردەواڵەکانیش بەبۆنی دەریا سەرەگێژەیان وێکەوتووە. تا ئێستا زەردەواڵەی مەستتان دیوە کە بەباشی نەتوانێت هەڵبفڕێت؟ ڕێگای ون دەکات، بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، لەهەوادا دەمێنێتەوە، پاشان گێژو وێژ دەڕوات گوڵێك دەدۆزێتەوەو لەوێدا بەباڵە بریقەدارەکانیەوە، لەرزان لەرزان ئاوا دەمێنێتەوە".

"زەردەواڵەکان کاتێك لەسەر پەڕەی گوڵاندا خەویان لێدەکەوێت، خوناویان لێدەنیشێت، ئەو دەمەی کە ئەستێرەی گەورە لەسەر ئەم کێوە دەردەکەوێت".

"ئەو دەمەی کە دەردەکەوێت".

"دەتەوێت بەر لەدەرکەوتنی ئەو ئەستێرەیە...".

"کەمێك دوای نیوەشەو دەردەکەوێت".

"دوای مانگ گەورەترین ئەستێرەیە. شینە، زەردە".

ڤاسیلی گوتی: "زەردە، شینە".

هەرسێکیان تا سەعاتێك بەر لەو کاتەی دیاریان کردبوو لەئەسکەلەمانەوە. نیشانچی دانەخۆرەی قولابی ماسیەکانی لەدوێنێوە ئامادە کردبوون. ڤاسیلی بەلەمی بەرەو دوورگەی کابا خستە جووڵە.

"بۆ کوێ ڤاسیلی؟"

"دوورگەی کابا، سەرۆك".

"سەرۆك نیشانچی دوورگەی کابای بینیوە؟"

"ناکرێت بڵێم بینومە".

"دەچمە ئەوێ، با نیشانچیش دوورگە ترسناکەکەمان ببینێت".

"بزنەکانی خدری زیندەش سڵاوی خوای لێبێت".

ڤاسیلی گوتی: "شین، شین، پیرۆز".

"خدر سڵاوی خوای لێبێت شوانە؟"

"شوان نیە، بەڵام مێگەلێکی هەیە. کەس ناتوانێت دەست بۆ بزنەکانی درێژ بکات. ئەو کەسانەی بزنەکانی ئەویان دزیوە ئێستا لەبنی دەریان. هەرکەسێك شیری ئەو بزنانە بخواتەوە تەمەندرێژ دەبێت، بەڵام دواتر لەسەر ئەم شاخە دەکەوێتە خوارێو پارچە پارچە دەبێت.

گەیشتنە دوورگەی کابا. ڕۆشنایی ئەستێرەکان لەدەریای دەداو دەریا لەنێو ڕۆشناییەکی زێڕیندا لەگەڵ ڕەنگی ئەرخەوانی بەرەبەیاندا شەپۆلی دەدا.

نیشانچی، بەجۆش‌و خرۆشەوە ئاماژەی بۆلای ڕۆژئاوای دەریاکردو گوتی: "سەیری ئەوێ بکەن! زوو ماتۆڕەکە داگیرسێنن، سەیربکەن. ماسی لەوێ چ حەشرێك دەکەن. ئااااە خۆزگە تۆڕێکمان پێبووایە. بەتۆڕهەڵدانێك بەلەممان پڕ دەکرد لەماسی. دەبێت قولابەکان ئامادە بکەین. ڤاسیلی من قولابەکەی تۆش ئامادەی دەکەم. قولابی سپیە ماسیەکان لەکوێیە؟"

"لەوێیە، لەپێش تۆیە، هەڵیبگرە".

"خێرا، بۆ پێشەوە، لەهەر جێگایەك گوتم بوەستە یەکسەر دەبێت بوەستیت".

بەلەم ئاوەکەی شەق کرد. دوورگەی کابا لەنێو هەوای نیوە تاریکدا مایەوەو لەچاوان ون بوو. ئاو لەنووکی بەلەمەکەوە دەبریسکایەوە.

"بوەستە!"

ڤاسیلی پێی لەبەنزین هەڵگرت، بەلەم ئارام سێ جار بەدەوری خۆیدا خولایەوەو ڕاوەستا. هەرسێکیان لەسێ جێگای جیادا قولابەکانیان هەڵدایە نێو ئاو. ماسیەکی گەورە کە بەقولابەکەوە شێتانە هەڵدەبەزیەوە، لەبەر ڕۆشنایی ماتی ئەستێراندا دەوروبەری خۆی ڕوون کردەوە.

"باشە، بۆ وەستاوی. قولابەکانتان رابکێشینو ماسی لێبکەنەوە ئینجا، دانەخۆرەی پێوە بکەنەوەو یەکسەر هەڵیدەنەوە نێو ئاو. لەو جۆرە کاتانە زۆر هەست بەدەم لێدانی ماسی ناکرێت. رەنگە دەم بوەشێننو ئێمە هەستی پێنەکەین. قولاب هەڵبدەنو یەکسەر رایبکێشنەوە".

خۆیشی هەر لەگەڵ ئەوەی ماسی لەقولاب کردەوە. لەچاو تروکانێکدا دانەخۆرەی پێوەکردەوەو هەڵیدایەوە نێو دەریا، هەڵدانی قولابو هێنانەوە دەری یەك بوو. تا ئەو دەمەی خۆر لەچیاکانی ئەو بەری دا بێڕاوەستان قولابیان هەڵدایە نێو ئاوو ماسیان هێنایەدەر.

پویراز گوتی: "ئیدی بەسە، چیدی ناتوانم دەستم بەرزکەمەوە. بەلەمیش پڕبووە خەریکە نوقمی نێو ئاو دەبێت".

ڤاسیلی ماندووو بڕست لێبڕاو گوتی: "دەستەکانی منیش هێز چیە تێیاندا نەماوە".

پویراز گوتی: "یاللا، کەوابوو بابڕۆین، نیوەڕۆ دانایەت دەگەینەوە دوورگە، لەوەتەی راوەماسی دەکەم قەتم وا بەسەر نەهاتووە. ئەم نیشانچیە دەبینین، ئەو کەسێکی وایە کە دەتوانێت لەتاریکترین شەودا مێرووله لەسەر بەردی رەشدا ببینێت. باوەڕم پێهێنا".

ڤاسیلی گوتی: "وایە، کێ دەڵێت نا، رەنگبێت لەبنی دەریاشدا لەشەوی تاریك ببینێت".

نیشانچی پێکەنی، گوتی: "لەبن دەریا نا، لەسەر دەریا".

"ئەفسوون لەدەریا دەکەیت، مەگەر نە نیشانچی؟"

"ئەمە دەریایە کە هەمیشە من ئەفسوونو مەفسوون دەکات برا. ئەو هەموو سەربازیەم لەبیابانەکان کرد. بیابانیش ئەفسوونی کردم. رۆژێك لەلێوار، لەشارۆچکەیەك، کابرایەکیش ئەفسوونی کردم. کەوتمە دوای ئەو کابرایە منی لەگەڵ خۆیدا بردە دێیەك کە کەوتبووە نێو زناران، زناری نووکتیژ، زناری رەنگ نارنجی، هەلۆی رەش، شاهینەکان، هەلۆی بچووکی باڵسوورو باڵمسیو دارگوێزی گەورە گەورە ئەفسوونیان کردم. ئێستاش ئەم دوورگەیە ئەم دارهەرمێیە بەگوڵ داپۆشراوە. ئەم دەریایە بەشەپۆل وردەکانیەوە ئەفسوونم دەکەن. برا، من ئەو کەسەم کە هەموو بوونم ئەفسوون کراوە. لەهەموو ئەفسوونەکان بەم تاکە ئەفسوونە، تەنها بەم دانەیان تێگەیشتم کە ئەفسوون لەخودی مرۆڤ خۆیەوەیە، ئەفسوون لەچاوی مرۆڤەوەیە. ئەفسوون لەگوێو دەماغو دڵی مرۆڤەوەیە.

رنــدترین ئەفســوونگەری دونیــا، لــەرەگی چــاوو دەمــاغو دڵــی پڕاوپــڕ لــەمیهرو خۆشەویستی مرۆڤەوەیە".

پـویراز چـووبووە بیرکردنـەوەو بـیری لـەوە دەکـردەوە کـە شـتگەلی دیکـە ئەفسـوونو جادوون، دەیگوت، خۆم خۆمم ئەفسوون کـردو ئاگـام لـەدڵی خـۆم نیـە. ئەگـەر ئەفسـوون لـەدڵی مرۆڤـەوە بێـت، کـەوابوو دڵـم ئەفسـوونی کـردووم؟ ئەفسـوونو جـادوو. ئایـا ئـەو ئەڤینەی لەنێو دڵی دایە، بەزەییە، جادوو، ڕۆشنایی سـپێدە دەمێکـە کـە دڵـی مـرۆڤ تـژی دەکـات، شـنەبای بەرەبەیانێکـە کـە مـرۆڤ شـێت دەکـات، شـەیدابوونی مرۆڤـە بەرانبـەر بەجیهان، ئەڤین شێتیە؟

بێئەوەی هیچ قسەیەك بکەن نزیـك بـەنیوەڕۆ گەیشـتنەوە دوورگـە. منداڵـەکان ژنو پیـاوو تازەهاتووەکـان کـە لـەوێ بـوون، لەسـەر ئەسـکەلە لەپێشـوازیان دابـوون. کاتێـك ماسیەکان لەنێو بەلەمدا ببنن لەخۆشیان هۆرایان کێشا.

مەلەك خانم بەهۆراکێشانەوە گوتی: "هـۆی منداڵینـە، منداڵینـە، لـەدەریادا لەرەلـەری ماسیان بوو، هەموویانتان گرتنو کۆتان کردنەوەو هێناتانن".

بەرلەهەموویان نیشانچی لەبەلەم دابەزی، دوای ئەویش پویرازو ڤاسیلی. ئەوانـەی بەپیریانـەوە چـووبوون بـەخێرایی بەسـەتڵو سـینیو گونیـەو لەگـەن ماسـیان بـردنو لەسـەر لـەکان دایاننـان. ژنـەکان لـەپێش هەموویانـەوە. مەلـەك خـانم، لێنـا، سـەبیحە، زەهراو نەسیبە بەو چەقۆیانەی دەستیانەوە ماسیەکانیان پاك دەکـردەوەو دەیانخسـتنە نێو تەشتەکان.

پویراز کاتێك زەهرای لەنێو ئەو ڕۆشناییە شینباوەی کە لەدەریاوە  لەدوورگـەی دەدا، بینـی هەسـتێکی چێژبەخش هـەموو گیـانی داگـرت. کـاتێکیش ترپـەی دڵـی زیـادی کـرد، تێگەیشت کە ئەفسوون کراوە. نیگایان تێکهەڵنگوت، کچەکە حاڵەتێکی بەروخساری خـۆی بەخشی، وەك ئەوەی بزەی کەوتبێتە سەرلێو.

بزەی کەوتە سەرلێو؟ ڕەنگبێت وا هاتبێتە بەرچاوی. هەستە چێژبەخشـەکە جـارێکی دیکـە گرتیـە خـۆی. شـیرینترین هەسـت بـوو کـە لەهـەموو تەمەنیـدا بینیبێتـی. لـەوێ ڕۆیشـتو چـووە نێـو قامیشـەڵانەکە. ئێـرە هـەمان ئـەو جێگایـە نـەبوو کـە ڤاسـیلی بـۆ کوشـتنی ئـەو چـەندین ڕۆژ لەسـەر یـەك چـاوەڕێی کردبـوو؟ ئایـا ئێسـتا، ئـەو عارەبـە، بەدەمانچەیەکی پڕ فیشەکەوە چاوەڕێی دەکرد؟ دەبوا چی بکردبـا؟ لـەدڵی خۆیـدا گـوتی،

ئەگەر کچەکە بخوازێت‌و بچێتە کرێت لەوێ چۆن دەتوانن بیدۆزنەوە، ئەمە بیرۆکەیەکی باشە. خۆشحاڵ بوو. کاتێك کەمێك هاتەوە سەرخۆی، بیری کردەوە، ئەو ئەگەرە نابێت هەر بەهزریشی دابێت. خۆزگە کچەکەی خوازبێنی کردباو بچووبایەتە لای میر سەڵاحەدین، بیری لەچەند شوێن‌و چەند پەناگا کردەوە، چووە قەفقازو گەڕایەوە. لەوێ خزم‌و کەس‌و کارەکانی خۆی دۆزینەوە. عارەبەکان دەیانتوانی لەوێ بیدۆزنەوە؟ کێ دەتوانێت خۆی لەهەڵۆ تیژڕەوەکانی قەفقاز نزیك بکاتەوە؟ نەك هۆزێکی کۆچەری، بەڵکو هەموو عارەبستان هیچیان پێنەدەکرا....

هیچ چارەیەکی دیکە نیە جگە لەمانەوە لەدوورگە، بەڵام نیشانچی پیاوێکی زۆر بەئەزموون‌و جادووگەرە. لەو جۆرە کەسانەی کە دۆستەکانی خۆیان تا پای مەرگ بەتەنێ جێناهێڵن. کەسێك کە هەڵناخەڵەتێت‌و ساردو گەرمی رۆژگاری چەشتووە. دەبوا تا زووە دەمانچەیەکی بولغاری پەیدا بکردبا. دەبوا بەلەمێکی ماتۆڕداری زۆر جوان‌و گەورەشی بۆ کڕیبا. ئێستا بەلەم زۆر هەرزانن، مفتن.

لەقامیشەڵانەکە هاتەدەر. تا گەیشتە تەپۆلکەکە سەیری هەموو چاڵە بەپووش‌و پەڵاش داپۆشراوو نێو دەوەنە چڕو پەنا بەردەکانی کرد. لەپڕ بیریکردەوە بەدوای چیدا دەگەڕێت. پێکەنینی هات، بەڵام کاتێك لەتەپۆلکەکە دەهاتەخوار، دیسان سەیری نێو دەوەنە دڕکاویەکانی دەکرد. دووبارە هاتەوە، بەهێمنی چووەوە نێو قامیشەڵانەکە، سەیری پشت دەوەنەکان، تووترکان، گیا دیوارپۆشەکان، دڕکەکان‌و هەروەها رەگ‌و ریشی ئەو دەوەنانەی کە ناوی نەدەزانین، کرد. مارێکی شینی بینی، گوێی نەدایێ، مارەکە خشی‌و رۆیشت. چەند هێلانەی مەلیشی بینین. لەوێوە بۆ ئەو دیوماڵەوە پێچی دایەوە، تا نزیك ماڵی ڤاسیلی رۆیشت، زنارە مسڕەنگەکانی نێو لمستانی دەریا گەڕا، وەك ئەوەی لەکەمین دابێت، دەمانچە لەنێو دەست خولێکی بەدەوروبەری دارهەنارەکان لێدا، بەکەمترین دەنگ کە لەلای باغەکەوە دەهات، دەترسا. سێ مار لەو مارە شینانەی کە خاڵی سپیان پێوەیە، لەبەرپێی خشین. مارەکان بەبینینی ئەو گیاو گۆڵیان سمی‌و رایانکرد. تەنانەت مارەکانی نەشبینین، بەپارێز، ترساوو لەسەرخۆ چووە نێو دارهەنارەکان. لەوێش ماوەیەك ئەملاو ئەولا گەڕا، بچووکترین شوێنپێ‌و ئاسەوارێك نەبوو. لەنێو دار قەیسەکانیشدا هیچ شوێنپێیەك نەبوو. باڵندەیەکی گەورە لەبەرانبەریدا هەڵفڕی، یەکسەر دەمانچەکەی راکێشاو ویستی پلی لێبدات. کە باڵندەکەی

بینی، دەمانچەی خستەوە نێو کیفیەوە. بەسەر ڕۆخی هەڵدێرگەکەوە بەرەو لای خواریێ، بۆ لێوار ڕۆیشت. سەیری قۆڵتو قەڵشی بەردەکانی نێو لێوارەکەی کرد. خۆی لەژێر دارهەرمێیەکە بینیەوە، سێ جار بەدەوری دارهەرمێیەکەدا سووڕایەوە. ئاشێکی هەوایی لەلای سەرەوە بوو، بەنێو کەندڕێکی باریکدا ڕەت بوو کە لێمشت دروستی کردبوو. تەنها لەدەرگاوە سەیرێکی نێو ئاشەکەی کرد. ئەمجارەش نەیتوانی بچێتە ژوورەوە. لەسەریەكو پەیتا پەیتا لەلای دارهەرمێیەکەوە بۆلای ئاشەکەو لەلای ئاشەکەوە بۆلای دارهەرمێیەکە چووو هات، لەدەرگاوە سەیری ناوەوەی کرد، ڕۆیشت، چووو گەڕایەوە.

کە هاتە ئەسکەلە بینی وا ماسیەکان پاککراونەتەوەو لەڕۆخ دارزەیتوونە وشکەکان داندرابوون. هەمووان ئاوڕیان لەو دایەوە. منداڵەکان بەچاوە گەشەکانیانەوە سەیریان دەکرد. پیاوو ژنەکانیش... چاوە شینە مەخمەڵیەکانی زەهراش بەسەرساميەوە زەق بووبوونەوەو بەنیگاکانیان ئەویان دەلاواندەوە.

پویراز شەمچەیەکی لەگیرفانی دەرهێنا. دانیشتە سەرچیچکان، بۆ ئاگرکردنەوە پووشو پەلاشی ژێر دارو چیلکە وشکەکانی داگیرساند. ئاگرەکە داینەگرت. ویستی جارێکی دیکە شەمچەکە لێبداتەوە، کە لەپڕ لەلای ڕاستیەوە بۆنو بەرامەیەکی مەستکەری هاتە بەر لووت، سەری وەرسووڕاند، زەهرا لەتەنیشتی بوو، شەمچەکەی داگیرساندبووو بەرەو لای دارو چیلکەکانی درێژکردبوو، دڕکە وشکە وردیلەکان ئاگریان گرت. ئەو هێشتا لەجێی خۆی هەڵنەستابوو، کە بڵێسەی ئاگر نیوەی دارو چیلکەکانی داگرتبوو. زەهرا کاتی هەستان بەڕووی ئەو پێکەنی. چاوەکانی بەبریسکەیەکی شینباوی تژی میهرو خۆشەویستی درەوشایەوەو خامۆش بووەوە. پویراز هەستی کرد سەری گێژ دەخوات، لەرزی. کاتێك هەڵدەستایە سەر پێ بەلادا هات. بەسەختی بەنێو قەرەباڵغیەکەدا ڕەت بووو خۆی گەیاندە تەختەکانی ژێر دارچنارەکان، بەڵام نیشانچی کە هەموو شتێکی بەچاوی خۆی دەبینی، خۆشحاڵ بوو، گوتی، حاڵی کوڕەکەمان خراپە، دەڵێی قولابی قووت داوە، حاڵی کچەکەش لەهی ئەو باشتر نیە، وڕو کاسە، نازانێت چ بکات، چ کاردانەوەیەکی هەبێت. خەڵك هێشتا ئاگایان لەهیچ نیە، زۆر نابات، زۆر نابات هەمووان تێدەگەن.

دەستپێکردنەکە گەرمو گوڕانەیە. سوپاس بۆ خوا، پێناچێت گرفتێك، شتێك لەگۆڕێ بێت. تەنها گرفتێك هەیە، ئەویش ترسی کوڕەکەمانە لەشێخی کۆچەران. باشە کە

متمانەی بەمن هەیە، دەنا ترس و سام لێرەی هەڵدەقەنانــد. کچەکە وا شێتانە کوڕەکەمانی هەنگاوتووە ئاگری تێبەرداوە. لەرەوشێك دانیە هەست بەلافاوەکە بکات. جاریٚ خەریکە بیر لەو کوڕە رەشتاڵە چاوتیژە دەکاتەوە. زوو لەبیرکردنەوە لەو ماندوو دەبێت و تەنها سەرقاڵی زەهرا دەبێت. خوا بکات کچەکە گرفتێك دروست نەکات، دەنا دەردی کوڕەکەمان دەرمان ناکرێت.

نیشانچی چوو لەتەنیشتی دانیشت، پویراز عارەقەی کردبوو، بتەوێت نەتەوێت دەشلەرزی، پێیگوت:

"عەرەقەت کردووە سەرۆك".

پویراز لەوەی کە ئەو هاتبوو لەتەنیشتی دانیشتبوو، بەخۆی دەنازی. زەردەخەنەیەکی کەوتە سەرلێوان و دەستی راستی درێژکردو بەگەرمی دەستی نیشانچی گوشی.

نیشانچی گوتی: "خۆش بەحاڵت. شتێکی وا لەهەزار کەس بۆ یەکیان دێتەپێش، دەزانیت کە بۆ من هاتە پێش".

"دەزانم".

"سوپاسی خوای خۆت بکە، ئەم بەهەشتەی پێبەخشیوی، مرۆڤ تەنها رۆژێك ئاوا بژی و هەزار ساڵ وەك کەندووێکی بەتاڵ بەسەر نەبات".

پویراز کە دەستی ئەوی لەنێو دەستابوو چەندجار بەگەرمی گوشی. دەست لەنێو دەست بێئەوەی قسەیەك بکەن و تەماشای یەکدی بکەن تا خانووی چێشتلێنەرەکان چوون.

"سەیر بکە نیشانچی، خاوەنی ئەم خانووانە زۆر دەوڵەمەند بوون، دوورگەکەی خۆیشیان زۆر خۆشدەویست. کۆشك و تەلارو کاری گەورەو کەشتیگەلێکی زۆریان لەئەمریکا، ئینگلستان و ئەسینا هەبوو، بەڵام نەیاندەتوانی دوورگەکەیان بەجێبێڵن و برۆن و نیشتمانی خۆیان لەبیر بکەن، کە جەنگ هەڵگیرساو دونیا بووە رۆژی حەشریٚ، لەدورگەکەیان هەڵهاتن. کێ دەڵێت، رەنگبێت ئیدی نەتوانن زێدی خۆیان هەر بشبیننەوەو بەحەسرەتی دیداریەوە بمرن. رەنگبێت چەند کەس لەهەرە بەتەمەنەکانیان بەهەر چەشنێك بێت، بۆ یەك دوو رۆژ بەترس و دڵەڕاوکێوە بگەڕێنەوە نیشتمانیان و نەتوانن ئەو دوورگەیەی رۆژانی منداڵی و گەنجێتی و جوانترین خەون و یادگاریەکانیان بدۆزنەوەو نائومێد ببن و بگەڕێنەوە ماڵەکانیان. دوای ئەوەش تاماون خەمبارو نائومێد بژین. مرۆڤ کاتێك خەون و یادگاریەکانی بمرن، دەمرێت".

"ئەگەر نەتوانێت نیشتمانێکی باشتر بۆ خۆی بدۆزێتەوە".

"هەتا ئەگەر بشیدۆزێتەوە".

"من دۆزیمەوە".

"تۆ نەتدۆزیەوە. تۆ لەنیشتمانی خۆت بوویت. لەو گوندە ئەگەر چووبایتە سەر لووتکەی چیا، دەریاکەتت دەبینی".

نیشانچی چاوەکانی بریسکانەوەو گوتی: "دەمبینی، ئەو نیشتمانەیشم لەبەرچاوم بوو. نیشتمانی من دەریایە. لەبەرئەوەیە کە من دەریاکەمم جێنەهێلا".

"بەڕاستی، تەواو لەبیرمان کردووە. تۆ کەی دەتەوێت بەدوای خانمەکەتدا بچیت؟ پێتوایە چۆتەوە دێ یان رۆیشتووە چاوەڕێی منداڵەکانی بکات؟"

"تا ئێستا تۆزقاڵێك لەعەشقو خولیای ئێمە کەمی نەکردووە، زیاتریش بووە. خانمی من بەبێ منو نەوەکانی دەتوانێت بۆ کوێ بچێت. سوڵتان تاكو تەنیا لەدێدا چاوەڕێی کوڕەکانیەتی".

"ئێستا، ئێستا تۆ کەی دەتەوێت بچیتەوە دێ؟"

"بەمزووانە".

پویراز بەدەربڕینێکی راشکاوو جیددیەوە پرسی: "بەمزووانە، واتەی کەی؟ مێشکت بۆیە وا ئاڵۆزە، چونکە شەوو رۆژ بیر لەخاتوون دەکەیتەوە".

نیشانچی سەری داخست. ماوەیەك کەوتە بیرکردنەوە، ئەگەر بڵێم، بێژە دەستێك جلم بۆ بدورنو دەستێکم پێدابێنن، یەکسەر ئەنجامی دەدەیت. ئەگەر بڵێم ئەسپێكو حەوسارو زینێك، ئەویش لەو زینە نەخشو نیگاردارانەم بۆ بکڕە، بۆم دەکڕیت. بڵێم فلینتایەکیش بکڕە دەکڕیت. تێدەگەیت کە من دەمەوێت ئەو منداڵە چەرکەسە بپارێزم. چاوی ئەو هەیولا سمێڵسوورە خۆ چاو نەبوو، بەڵکو ئەمڕۆو سبەی لێنەکاتو یەکسەر بێتەوە، بەڵکو سێ، چوار یان پێنج، شەش مانگ یان ساڵێکی دیکەشی پێبچێت، وەلێ دواجار مسۆگەر رۆژێك دێتەوە. ناتوانم بڕۆمو لێبگەڕێم ببێتە خۆراکی ئەو هەیولایەی مەرگ. ئەو گەنجە بەهێزە شەڕو جەنگی زۆری دیونو گیانی خۆی دەرباز کردووە، بەڵام ئەو منداڵە حەوت ساڵیە دڵسافو سادەیە، مێشكو دڵی ئالوودەی هیچ خراپیێك نەبووە، لەو هەموو شەڕانە بەشداری کردووەو هیچی لێنەهاتووە، ئێستا بەو خەیاڵەی کە لەکۆمەڵکوژی ئێزدیاندا بەشداربووە خەریکە خۆی بەکوشتن دەدات. باش بوو کە لەگەڵ

ئەم کچە ئاشنا بوو. ئەم منداڵە ئەم زارۆ بەستەزمانەی ئێمە بەدڵێك نا، بەسەد دڵ ئاشقی ئەو کچە بووەو لەپێکگەیشتن بەولاوە چارەیەکی دیکە نیە. ئەویش ئەمە دەزانێت. ئەوان خوڵقو خووی منداڵانیان هەیە، هەر جۆرێك بووە بەڵاو سەختیەکان جێدەهێڵن، بەئاسانیش بەدەست ئەو بەڵاو ناخۆشیانە ئازار دەچێژن، بەڵام خۆیان رادەگرن. لەوە دەترسێت کابرای سمێڵسوور بیکوژێت. دەربازکردنی لەدەست ئەو هزرە خراپەی کە رەنگبێت دوای هاوسەرگیری بکوژرێت، ئاسان نیە. لەلایەکی دیکەش گرفتاری عەشقێکی ئەوتۆ بووە، کە هیچ رێگایەکی دەربازبوونی بۆ نەماوەتەوە. ئێستا ئەوەی من، تاكو تەنیاو بەبێ من چیدەکات؟ بەڵکو تەنیاش نەبێت. لێناش لەیۆنانەوە رایکردووەو هاتووە، لێرە چاوەڕێی چوار کوڕەکانیەتی. هەندێك دەڵێن چوار کوڕ، هەندێکیش دەڵێن دوو کوڕ، کامەیان راستە؟ بەڵکو هەردوویان. ئەوەکەی من دەیەوێت چەند ساڵ لەنێو ئەو چیایە، بەکۆڵ خاك ببات، بیهێنێت، خوابکات ئەوە نەکاتو پشتی خۆی بەو کارە نەکاتە کامەی گۆچان. ئەگەر گوێز کۆبکاتەوەو بیانفرۆشێت بەزیادەوە بەشی ساڵێکی دەکەن. بەپارەی گوێزەکان سێ سەر بزن دەکڕێت، حەوت هەشت مامریش. ئەی دانی مامرەکان لەکوێ پەیدا بکات. کەسێك کە تەمەنێك بەکۆڵی خۆی گونیەی پڕ لەخاکی هێناو بردبێت، دەشتوانێت نیوە گوشێك دان بۆ مامرەکانی پەیدا بکاتو بەکۆڵ بۆ دێ بیگوازێتەوە. هێشتا عاشقێکی دڵسووتاوی ژنەکەی بوو، زۆر لەسەردەمی گەنجێتی زیاتر. بیرێکی نیگەرانکەر بەمێشکی داهات، بەتایبەت مردنی بەهۆی هەڵدێران لەسەر شاخەوە. ملوانکەیەکی سکەی زێڕی بەملەوە بوو، ئێستا ژمارەی سکەکانی بەبیر نەمابوو، بەڵام دەیزانی زۆر بوون. ئەو هەموو برسێتیو دەستکورتیو ئاوارەییەیان کێشاو وێڕای ئەو هەموو تکاو رجایەی ژنەکەشی، کەچی نەیتوانی تەنانەت یەك دانە سکەشیان لێبفرۆشێتو خەرجی بکات. ئایا رێی تێناچێت یەکێك بەرۆکی بگرێتو جلەکانی بپشکنێتو سکە زێڕەکان بدۆزێتەوە، کە سکەکانیشی دۆزینەوە بیکوژێتو فڕێی بداتە نێو دەوەنەکان؟ نەیدەویست بیر لەرووداوی ناخۆش بکاتەوە. لەبارەی ژنەکەیەوە رێگەی نەدەدا تەنانەت وشەیەکی نەخۆشیش چیە بەمێشکی دابێت. یەکسەر بیری لەشەڕو پێکدادانەکانی سەردەمی سەربازیو ململانێی نێوان مەرگو مان دەکردەوە، هەروەها یاری لەگەڵ نەوەکانی دەکردو کەیفی سازدەبوو. جگە لەوە بیری لەو منداڵەش دەکردەوە، لەلایەك خۆشحاڵ دەبوو، لەلایەکی دی دەترسا. دڵی پێدەسووتا، دونیای لەبەرچاو تاریك

دەبوو، خۆی دەخواردەوەو لەپڕ هەستی متمانەو شادی دڵی دادەگرتو بەخۆی دەگوت عیزرائیلی نۆ باڵیش ناتوانێت لەپویراز نزیك بێتەوەو تووڕەیی دایدەگرت. ناتوانێت لێینزیك بێتەوە. ئەو سمێڵسووره کە هیچ شێخی عارەبان بەهەموو سەربازە سمێڵسوورەکانیشیەوە لەعارەبستانەوە بێن، دیسان ناتوانن لەدوورگەمان نزیك ببنەوە. با ئەو شێخە عارەبە جارێ بچێت ورگی خۆی تێر بکات، ئینجا پیاو بنێرێت بۆ کوشتنی شێرێك. سمێڵسوور رەنگبێت ویستبێتی بهێت لەدوورگە بمێنێتەوە، بەڵام کاتێك بینیویە خەڵکی ئێمە بەشێوەیەك سەیریان کردووە، وەك ئەوەی بیانەوێت بیکوژن، لەترسان نەیتوانیوە بهێتە پێشەوە. نەیدەتوانی ئەم قسانە بەپویراز بڵێت. ئەو پیاوەی کە لەژێر دارهەنارەکە خەوتبوو، لەبەر خۆرەتاو عارەقەی دەکرد، مارێکی جینجر هاتو بەسەر ورگو گەردنیدا خولایەوەو ئەو هیچ جووڵەیەکی نەکرد، وەکو مردووان.

کەسێکی ئاوا دەتوانێت پیاو بکوژێت؟ لەدۆزەخەوە بهێتو لێرە پیاو بکوژێت؟ دەتوانێت پیاو بکوژێتو پاشان خۆشی بکوژێت؟ دونیا زۆر جوانە، رۆح شیرینە، ئەو پیاوە چۆن دەتوانێت رۆحی شیرینی خۆی بەکوشتن بدات؟

ناتوانێت، ئەوەی کە پویراز ئەوەندە دەترسێت دەبێت هۆیەکی هەبێت کە هیچکەس نازانێتو ئەوی تا ئەم دوورگە چۆڵو هۆڵە بەدوای خۆیدا هێناوە. چ بڵێم، ئەگەر نا پویراز، دەبێت بەو دڵە لەت لەت بووەیەوە... مەگەر هەموو ئازایەتیو بوێریی خۆی دوای جەنگ لەدەست دابێت!"

"لەماوەی سێ رۆژدا دەمانچەم بۆ بێنە، سبەی لەگەڵ ئێوەدا نایەمە نێو دەریا. چارەیەکی دیکە نیە، دەمەوێت لەپشت ئەم گردەی بەرانبەرمان مەشقی نیشانشکێنی بکەم. ئینجا ببینە، لەچاوتروکانێکدا چۆن نێوچاوانی کابرا دووبەدەر دەبێت".

"بژیت نیشانچی".

"تا من زیندووبم کەس ناتوانێت نزیکت بکەوێت. لەسەد فیشەك کەمتر نەبێت. بەلەمێکی ماتۆڕداریشم بۆ بکڕە، دەتوانین لەو دێهاتو شارو شارۆچکانەی نزیکمان ماسی بفرۆشین؟"

"زۆریش. دوای رۆیشتنی یۆنانیەکان، لەم دەوروبەرانە دەتوانین بڵێین هیچ ماسیگرێك نەماوە. بۆیە نرخی ماسی بەرزبۆتەوە. زۆریش بەرزبۆتەوە. لەم رۆژانە ئەگەر ماسیگرێکی باش بتوانێت ماسی بگرێتو بیانفرۆشێت، لەماوەی یەك ساڵدا دەوڵەمەند دەبێت..".

"منیش لەگەڵ ڤاسیلی دەچم. ئەو زمانی ماتۆڕان دەزانێت‌و من زمانی ماسیان".

"کارێکیش بۆ من پەیدا بکە... منیش... پێکەنی.

نیشانچیش پێکەنی:

"پشکێکیش بۆ تۆ دادەنێین".

"پشکێك بۆ من بەس نیە".

"بەسە. دەبێت کارەکەت ببینم، ئەگەر شارەزابوویت، قبووڵمە هەر یەکەو نیوەپشکی خۆمان هەڵدەگرین".

"باشە، قبووڵە. سبەی دەچینە راوەماسی.. دووسبەیش شارۆچکە. سەر لەبەیانی رۆژی سێیەم دەمانچەکەت لەنێو دەستە. تا من دەگەڕێمەوە ئێوە بەباشی دوورگە بخەنە ژێر چاودێریەوە. لەگەڵ پزیشکی ئاژەڵان. ئەرێ دەبێت یەك گونیە فیشەك لەگەڵ دەمانچەکە بێنم".

"دەیخەینە ژێر چاودێری، جا چۆن چاودێرییێك، ناهێڵین باڵندە باڵ ببزێوێت، تێگەیشتیت؟"

"تێگەیشتم. تۆ ناهێڵیت باڵندە باڵ ببزێوێت، منیش بەبەلەمێکی ماتۆڕداری نوێ نوێ دەگەڕێمەوە، کە ناوەوەی لەدار بێت‌و بۆنی بۆیاخی تازەی لێبێت".

"من ئەمشەو گەرەکمە بخۆمەوە، ئێوە خواردنەوەتان هەیە؟"

پویراز گوتی: "هەمە، بەڵام پێکەوە، بانگی پزیشکی ئاژەڵانیش دەکەین".

"موسا کازم ئاغاش".

"بانگی دەکەین".

"بەڵام ئەو لەو تەمەنەدا دەخواتەوە؟"

"دەمەوێت شتێکت پێبڵێم وەلێ کەس پێنەزانێت. موسا کازم ئاغا شێخی عەلەویانە. مەلەك خانمیش عەلەویە".

"خۆیان پێیانگوتی؟"

"نە، من خۆم تێیانگەیشتم".

"چۆن تێیانگەیشتی؟"

"کاتێك مەلەك خانم دەستی موسا کازم ئاغای ماچ کرد تێگەیشتم. عەلەویەکان، کاتێك مرازێکیان دەبێت لەبەردەم شێخێکدا چۆکی راستیان دادەدەن. دەستی ماچ دەکەن.

شێخیش دەستی کەسی خاوەن مراز ماچ دەکات. ئەو عەلەویە بیەوێت خواردنەوە بخواتەوە دەتوانێت بیخواتەوە، بەگوناه دانانڕێت. جا عەلەویەکە خەڵکی کرێتیش بێت! عەلەوییێك کە لەنێو کافراندا گەورە بووبێت.."

"کەوابوو هەموو پیاوەکان بانگهێشت دەکەین، چی زۆر خواردنەوە زۆرە".

مەلەك خانمیش بانگهێشت دەکەین".

نیشانچی گوتی: "بانگهێشتی دەکەین".

لەگەڵ هاتنی شەو ئاگریان کردەوەو مێزەکانیان ریزکردن. هەموو پیاوەکانی دوورگە، هەروەها مەلەكو لێناش بانگهێشت کران. شەڕابی سووری کۆنیان بۆ ئەوان هێنا.

موسا کازم ئاغاش شەڕابی سووری خواردەوە. پویراز موسا زۆر زوو مەست بوو، ڤاسیلی هەڵیگرتو بردی گەیاندیەوە ماڵێو خۆی گەڕایەوە. شنەبایەکی نەرمی تێکەڵ بەشادمانی دەهات. لەماوەیەکی کورتدا نیشانچیش مەست بوو، زمانی کەوتە تەتەڵە. ڤاسیلی ژێر باڵی ئەویشی گرتو گەیاندیەوە ماڵێ.

ئەو بەزمەی ئەوان تا نیوە شەو بەردەوام بوو. پاشان هەموویان چوونەوە ماڵەکانیان. موسا کازم ئاغاش هەر ڤاسیلی گەیاندیەوە ماڵێ. ئەو مرۆڤە شکۆمەندو ساردو گەرمچەشتووەی رۆژگار چووبووە نێو خەیاڵەوەو هیچ قسەی نەدەکرد.

پویراز موسا کاتێك بێدار بووەوە، کە دەریا هێشتا هەر سپی بوو. یەکەمجار چووە سەر کانی دەستو دەمو چاوی شوشت، قژی داهێنا، کڵاوە قووچەکەی خستە سەری. کڵاوەکەی لەپێستی بەرخ بوو. دەیزانی کە کڵاوە رەشەکەی باش لێدێت. ئەمڕۆ بەیانی جلە شینەکانو چەکمە بەئاوەزێنەو بریقەدارەکانی پۆشیبوون.

لەسەر کانیڕا چووە ئەسکەلەو لەوێشەوە بۆ لێوار. هەوا لەجیاتی رووناکبوون وردە وردە تاریك دادەهات. رووی دەریاش لەپڕدا تاریك داهات. بایەکی توند هەڵیکرد، دەریا هەڵکشا، شەپۆلە کەفاویەکانی زیادیان کردو خۆیان دەگەیاندە سەر لمی لێوارەکان. زەهراش بۆ بیینی پویراز لەخەو هەستابووو کە خەریك بوو دەهاتو دەچووو وردە بەردەکانی ژێر پێی چرپە چرپیان دەهات. لەسەریەك دەچووە سەرکانیو دەگەڕایەوە. یەکەمجار بایەکی گەرم هەڵیکردو پاشان بایەکی سارد. دوای ئەوە دڵۆپەی درشتی باران، یەك یەك دابارین. تاوێك دواتر، بەیەکجاری باران بەخوڕ دایکردو لەچەپو راستو پێشو پاشەوە دایهێنا. هەوا تاریك داهات، لەئاسمانی سەر دەریادا لێکلێکە شریخەی

بروسکەو هەورە تریشقە بوو. لەو دەمەدا چاو چاوی نەدەبینی. ئاسمان لێکترازا، دەریا خرۆشا، سێڵاوی باران بەسەر لمەکاندا ڕێچکەی بەستو تا ژێر چنارەکان چوو. پویراز تێبینی هیچ یەك لەو شتانەی نەکرد، بەنێو ئەو ئاوەی کە بەخوڕ خۆی بەقاپۆری دارچنارەکاندا دەداو بەنێو ئەو ئاوەی کە تا ئەژنۆی هاتبوو ڕێی تەی دەکرد. زەهرا نێوچاوانی بەشووشەی پەنجەرەوە دابووو هەڵدەلەرزی. خۆزگە بیتوانیبا قۆڵ لەقۆڵی هەڵکێشێتو بیباتەوە ماڵێ، ئەو کە وەکو مشکی لەئاو هەڵکێشراو، ئەو کە شانەکانی داکەوتوون، وێکهاتۆتەوە، ئەو کە لەژێر باراندا ئاگای لەخۆی نەماوە، خۆزگە بیتوانیبا ئەوی بهێنابا و لەڕۆخ شۆمینەدا دانیشاندبا، ئاگرێکی بکردبایەوەو چای دەم بکردبا... لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیزانی ناتوانێت ئەم کارانە بکات، خەیاڵچنی دەکرد. خۆزگە بیتوانیبا هەموو جلەکانی داکەندبانو بەخاولییێکی نەرم هەموو گیانی سڕیبایەوە.. دەنا ئەوها بڕوات نەخۆش دەکەوێت، نەخۆش دەکەوێت. تا پشت دەرگا دەچوو، دەرگای دەکردەوە، لەشیپانەی دەرگاوە سەیری پویرازی دەکرد، دەچووە پشت پەنجەرەو دەگەڕایەوە. لەلایەکی دی ڕێگابڕینی پویراز لەنێو ئەو بارانەدا تا دەهات خێراتر دەبوو. شەپۆلەکان، کە لەهەرچوار لاوە گەمارۆیان دابووو بواری چاو هەڵێنانیان بۆ نەهێشتبووەوەو تا دەهات زیادیان دەکردو بەرزتر دەبوونەوە، لەملی لێوارەکان تێپەڕیبوونو بەرەو لای هەڵدێرگەکانو ئەسکەلەو کانیەکە دەهاتن.

زەهرا تا بەیانی لەپشت پەنجەرە بۆ پشت دەرگاو لەپشت دەرگاوە بۆ پشت پەنجەرە هاتو چووو لەخۆی ڕانەدیت بچێتە دەرێ. کاتێکیش خۆر لەژێر هەوران هاتەدەر، گوتی شێتایەتیە. ئەمە شێتایەتییێکی گەورەیە. گەڕایەوە سەرەوەو لەبەردەم پەنجەرە ڕاوەستا. نەیدەتوانی جگە لەو بیر لەهیچشتێکی دیکە بکاتەوە.

ڤاسیلی، پویرازی بینی کە تادێت خێرایی زیاد دەکاتو ڕووەو ئەو دەریایە دەڕوات کە بەرەو لای ئەو دێت. جلەکانی بەتەواوی بەجەستەیەوە نووسابوون. ڤاسیلی یەکەمجار ئەو پیاوەی نەناسیەوە کە لەنێو خۆیدا گرمۆڵە بووبووو سەری خۆی خستبووە نێو شانەکانی، کاتێك بەوردی سەیری کرد واقی وڕما، ڕایکردە لایو قۆڵەکانی گرتنو بردیەوە ژوورەکەی. دایکە لێنا بەبینینی زمانی ڕاوەستاو لەشوێنی خۆی ڕەقهەلات.

"دایکە لێنا مەتاسێ. کەسێك لەبەرباران ماوەتەوە".

زمانی لێنا هاتەوە گۆ:

"چ دەڵێیت کەمێك لەبەرباران ماوەتەوە! سەیری بکە هەڵدەلەرزێت. سەیری بکە ئاو لەهەموو گیانی دەچۆڕێتەوە".

پویراز هەڵدەلەرزی‌و ئەو باراناوەی لەسەر چاوو وجلەکانی دەچۆڕایەوە ناو ژوورەکە، بەرپێی کردبووە گۆمیلکەیەك.

"ڤاسیلەکەم، جلەکانی لەبەر دابکەنە، جلەکانی لەبەر دابکەنە. نەخۆش دەکەوێت دەمرێت. ئاااه ئاااه! منداڵە بێعەقڵ‌و پاك‌و باشەکەم".

رایکردە ژووری‌و دوو دانە خاولی گەورەی هەلگرتن‌و هێنانی، گوتی:

"جلەکانی دابکەنە، بجووڵێ، سەیر بکە چۆن دەلەرزێت. دەمرێت. ئەو شێتە تا بەیانی لەبەر باران ماوەتەوە".

قسەی دەکردو لەنێو باولی جلەکان، جلی وشکی دەردەهێنان. "مەست بووە، رێگای ماڵێی لێون بووە، تا بەیانی لەبەرباران ماوەتەوە. ئێستاش ئاوا خەریکە هەڵدەلەرزێت، مردووە. خێرا جلەکانی دابکەنە. لەمن وابوو چۆتە جێگایەك..".

ڤاسیلی چەکمەو جل‌و بەرگەکانی پویرازی بەخێرایی لەبەرداکەندن، خاولیەکانی تێوەرپێچان، بردیە ژوورەکەی، بەدوو خاولیان سڕیەوەو وشکی کردەوە، جلی نوێی کردەبەرو پاشان بردی لەسەر تەختە خەوەکەی درێژ کرد.

"دایکە چای دەم بکەین. بەر لەچای باشتر نیە شەربەتی هەنگوینی گەرمی بدەینێ؟"

دایکە لێنا گوتی: "بیدەینێ". سێ کەوچك هەنگوینی لەنێو شووشەیەك دەرهێنان‌و لەگەڵ ئاو تێکیداو کردیە شەربەت. ڤاسیلی ئاگردانەکەی بەخێرایی گەرم کردبوو. هەنگوینەکەی کە خستبووە نێو قابلەمەیەکی بچووك داینایە سەر ئاگردانەکە. هەنگوینەکە هاتەجۆش. شەربەتی گەرمی هەنگوینیان دەرخواردی پویرازدا. هەر لەگەڵ خواردنەوەی شەربەتی هەنگوین‌و چای گەرم، لەرزینەکەی پویراز دامرکا.

لێنا فەرمانی دا: "لێمدەوێیت سبەینێ سێ بزن‌و نێریێکم بۆ بێنیت".

"باشە، دایکە بەسەرچاو".

"هەمیشە دەڵێیت باشە دایکە، بەسەرچاو دایکە، بەڵام هیچ بزنێك دیارنیە. ئەگەر شیرمان لەماڵێ هەبوایەو هەنگوینمان لەگەڵ شیر تێکەڵ بکردبایە، ئەو لەرزینەی تۆش یەکسەر نەدەما. تازە، تۆ منداڵی کوێستانەکانی، بۆ تۆ، بەیانیان، شیرو نڤیشك پێویستە. هەر چای، چای، چای مرۆڤ وشك دەکات، تەنانەت دەشیکوژێت. سێ بزن‌و یەك نێری. من کاریلەم زۆر خۆش دەوێن".

"ئەمنیش دایکە. سێ بزن و نێرییێك".

پویراز لەدەنگی پێیەك کە لەلای پلیکانەکانەوە دەهات، ئاوڕی دایەوەو نیشانچی بینی وا لەدەرگاکە دێتە ژوورەوە، لەو شوێنەی لێیڕاکشابوو خۆی جووڵاندو گوتی: "من باشم، لەمنداڵیەوە خووم بەوە گرتووە کە لەژێر باراندا بەڕێگادا بڕۆم. زستان و بەفرو باو بۆرانیش بێت دیسان من لەبەر باراندا دەڕۆم. دەرەوە چۆنە؟ هێشتا هەر دەبارێت؟"

نیشانچی گوتی: "لێیکردۆتەوە. خۆرەتاوە. دەریا دەڵێی پارچەیەك ڕۆشناییە. دەنگی شینی دەریا تا ئاسمان هەڵکشاوەو ئاسمان ڕەنگێکی شینی تۆخی مەخمەڵی بەخۆوە گرتووە".

"بڕۆنە دەرەوە، دەمەوێت جلەکانم بپۆشم".

ڤاسیلی گوتی: "وای، دەتەوێت چیبکەیت، تۆ نەخۆشیت".

پویراز گوتی: "وای و مای پێناوێت. تەنها کەمێك لەبەرباراندا پیاسەم کرد، وەکو سەردەمی منداڵیمان".

یەکسەر جلەکانی پۆشین. نیشانچی و ڤاسیلی لەدەرەوە، لەباخچەی خانووەکە چاوەڕێی بوون. بەرەو لای ئەسکەلە ڕۆیشتن. پویراز بەپێکەنینەوە دەستی بەباسکردنی باران بارینەکانی سەردەمی منداڵی خۆی کرد لەئوزون یایلا. گوتی: "بارانەکانی چوکور ئاڤا جۆرێکی دیکەن، وەك تووڕەیی ببارێت ئاوا دەبارن. یەکەمجار بایەك هەڵدەکات و تۆزو غوبار بەری ئاسمان دەگرێت. پاشان دڵۆپەی درشت درشت، تەپ تەپ بەعەرد دەکەون. بۆنی مەستکەری خاك هەموو جێگایەك پڕ دەکات. خاکی هیچ جێگایەك، لەکاتی بارانبارینی یەکەم، وەك خاکی ئەوێ بۆنخۆش نابێت".

پویراز، هەم دەڕۆیشت و هەم قسەشی دەکردن. لەلایەك سەیری ماڵی موسا کازم ئاغای دەکردو لەلایەکی دیکەش بست بەبستی دوورگەی بەنیگاکانی دەکێڵا. ئەوان کاتێك خەریکبوون دەهاتنە ژێر چنارەکان و ڕۆخ کانیەکە، لەنێو قامیشەڵانەکەدا دەنگی خشپەخشپێك کەوتە بەرگوێ و پاشان زەهرا لەوێوە بەدەرکەوت. کچەکە، هەر لەگەڵ بینینی ئەوان. لەشوێنی خۆی ڕەق ڕاوەستا.

قسەکانی پویرازیش نیوە ناچڵ مانەوە. لەو میانەدا، نیشانچی دەستپێشخەری کردو قسەکانی پویرازی درێژە پێدان، دەستی خۆی دانایە سەر شانی ئەو، بەشێوەیەك وەك بڵێیت هیچشتێك ڕوویندابێت. بەهێمنی ڕووی لەزەهرا کرد:

"کچەکەم، تۆ کامەیانی، گەورەکە یان بچووکەکە؟"

"من زەهرام ئاپۆ، گەورەکە".

نیشانچی بەجۆشێکەوە پێکەنی، گوتی: "ماشەڵڵا، خواوەند بۆ باوکتت....". بێدەنگ بوو، چاوەڕێ ما، خواوەند تۆ بۆ دوورگەکەمان، دەریاکەمان بهێڵێت. زۆر جوانیت، لەفریشتان دەچیت".

کچەکە خەندە کەوتە سەر لێوانیو چاڵی گۆناکانی دەرکەوت، روخساری پەمەیی داهات، دەبوا شتێکی گوتبا:

"ئێوەش زۆر باشن، گیانتان بەئێمەی دوور لەنیشتمان بەخشی. باوکمانو هەموومانتان زیندووکردنەوە، بەسلامەت بڕۆنو بەسلامەت بگەڕێنەوە. راوە ماسییێکی باشو بەبەرەکەت بێت".

بەتەکیاندا رۆیشتو تێپەڕی. پویراز تەنانەت لەدواوەش نەیتوانی سەیری بکات، دەنگو چاوەشینو سەرنجدارە پڕ لەمیهرو خۆشەویستەکانی دەتگوت مەخمەڵن. کاتێك بیری لەمانە دەکردەوە هەموو گیانی پڕ دەبوو لەعەشقو هەستی بەشادمانییێکی زۆر دەکرد. لەدواوە گوتی: "ئەمڕۆ زۆر ماسیان دەگرین، کچم". پویراز هەستی بەبەختەوەری دەکرد. یانی مرۆڤ دەیتوانێت ئەوەندە بەختەوەر بێت! دوای ئەو هەموو سەختیانە ئەم هەموو شادمانیە..".

نیشانچی گوتی: "ماسییێکی زۆر دەگرین. ئەمڕۆ دەریا بەرانبەر بەئێمە سەخاوەتی خۆی نیشان دەدات. رۆشناییەکی زۆری سەخاوەتمەندیش دەوروبەرمانی رۆشن کردووە".

پویراز ئەم قسانەی هەر نەشبیستن. دیسان چووبووە نێو هزرو خەیاڵان. بەڵام کەی ئامادەبوو، کەی سواری بوو، کەی گەیشتنە بەرانبەر دوورگەی کابا، کەی دانەخۆرەیان بەسەر قولابەکانەوە کردو هەڵیاندانە نێو دەریا، نەیاندەزانی. "لێیدا لێیدا، پویراز ماسی دەمی لەقولابەکەی تۆدا. ماسی یەکەمجار دەمی لەقولابەکەی تۆ دا".

هەم قسەی لەگەڵ پویرازدا دەکردو هەم هانیشی دەدا، زیاتر ماسی بگرێت. پویراز لەخەیاڵە قووڵە زێڕینەکەی هاتبووەدەر، هاتەوە سەرخۆی. ئەو ماسیەی کە لەنێو ئاودا هێنابوویەدەرو بەسەر قولابەوە هەڵبەزی بوو، دەبریسکایەوە. هەرجارێك کە دەکەوتە بەرتیشکی خۆر، رۆشناییەکی شینباوی پەخش دەکرد.

گوتی: "سەیری بکەن برادەرینە ئەم ماسیەتان دەوێت؟ ئێرە تەنها ماسیی لوفەری هەیە. سەیری بکەن لەبەر تیشکی خۆرو لەسەر ئەو هەموو ئاوەدا، لەسەر ئەم خاکەدا

چۆن ئارام تەکان دەدات‌و چەندە ماسییێکی ڕەنگاوڕەنگیشە، چەندیش ورشەدارە. قولابی ماسیەکانی لوفەر هەڵبگرن".

خاك تا ئەو رادەیە دەوڵەمەندو پڕ گوڵ‌و ڕۆشنایی‌و پڕ ماسیە... ماوەیەك ئاوا لەوێ مانەوەو ژمارەیەکی زۆر ماسی لۆفەریان گرت. پویراز گوتی: "بەس نەبێت نیشانچی، بابچینە جێگایەکی دیکە، وانیە؟"

"ها نیشانچی قوربانی ئەو زمانەت بین کە شەکری لێدەبارێت".

هەستا، دەستەکانی کردنە نوای چاوەکانی، سووڕاو لەدەوروبەری روانی. پویرازیش لەگەڵ ئەودا هەستابووو دەستەکانی کردبوونە نوای چاوانی‌و سەیری یەك بەیەك ئەو جێگایانەی دەکرد، کە ئەو سەیری دەکردن.

نیشانچی گوتی: "ئەوێ!" بەدەست شوێنێکی نیشان دا کە کەوتبووە لای رۆژئاوای دوورگەی کابا. "ئەوێ؟" کاتێك کە دەیویست دابنیشێت پویراز قۆڵی گرت:

"سەیر بکە نیشانچی، دامەنیشە! ڤاسیلی تۆش راوەستە!"

نیشانچی بەحەپەساویەوە سەیری کرد.

"نیشانچی، ئاوا سەیری من مەکە، ئەو جێگایەی نیشانمان دا جارێکی دیکەش نیشانمان بدەوە".

نیشانچی دەستی راداشت‌و بەپەنجەی شوێنەکەی نیشان دا.

"ئەوێ، بینیت؟ باش سەیر بکە".

"باش سەیر دەکەم. هیچ نابینم".

بەپەنجەی نیشانی دا: "هەمان ئەو شوێنەی کە وردە شەپۆلی هەیە، ڕەنگەکەی جیاوازە. شتێکی وەك سەوزایی، سەوزە یان نا، بتەوێت یان نا سەوزێکی ڕۆشنە، وەنەوشەییێکی کاڵ، نارنجییێکی کاڵ؟"

تۆ تا دڵت دەخوازێت بژمێرە نیشانچی. من جگە لەرەنگێکی شینباو، کە لەنێو هەڵمێکی بەجێماو لەرۆشنایی‌و تا ئەوپەڕی دونیا پان بۆتە شتێکی دیکە نابینم".

"رۆشناییەکە دەبینیت؟"

"دەیبینم".

"باشە.. ئەمە زۆر باشە. ئێستا ئیشەکەمان ئاسانە، ئێستا زانیمان گرفتەکە چیە، ئێستا سەیر بکە، سەیری نووکی پەنجەم بکە، رۆشنایی ئەوێ تەواو جیاوازە. باشە مێزە بکە، تەنها سەیری ئەوێ بکە".

"رێك سەیری ئەوێمکرد. هەموو رۆشناییەکان وەك یەکن".

"نابێت".

"هۆی ڤاسیلی، تۆش سەیر بکە".

"سەیرمکرد. رۆشناییەکانی دەریا دەجوولێن".

نیشانچی تووڕە بوو، رووی خۆی گرژ کرد، زیز بوو، لەشوێنی خۆی دانیشت، وێکهاتەوە".

"هۆی نیشانچی، بۆ تووڕە دەبیت ئاغەی من، پاشای من، گیانی من، نەمتوانی ببینم، لەوێ جگە لەو رۆشناییەی کە لەنێو دەریایە نەمتوانی هیچ رۆشناییەکی دیکە ببینم".

"خوا لەجیاتی دوو چاوتان بداتێ دوو کونی داونەتێ".

"هۆی وەلیی نیشانچی بەڕێز، ئەو رۆشناییەی لەوێیە چ جۆرە رۆشناییەکە، بڵێ ئێمەش بابزانین، تێبگەین".

"ناتوانن لەو رۆشناییە بگەن، دەبێت بەچاوی دڵ، جگەر، جەستە هەستی پێبکەن. باش سەیری بکەن دەبینن رۆشنایی ماسیانە، یەکسەر ئەمەتان بۆ ساغ دەبێتەوە".

پویرازو ڤاسیلی راوەستانو ماوەیەکی درێژ سەیری ئەو شوێنەیان کرد کە نیشانچی بەپەنجەی خۆی نیشانی دابوون.

پویراز کاتێك خەریك بوو دادەنیشت، گوتی: "بجوولێ ڤاسیلی، با بچین ببینین بزانین رۆشنایی دەیەوێت چیمان نیشان بدات؟"

نیشانچی بەدەربڕینێکی زبرو دڵنیاوە گوتی: "ماسی نیشان دەدات". دانەخۆرەکانیان بەسەر قولابەکانەوە کردو هەڵیاندانە نێو دەریاو بەکونجکۆڵیەوە چاوەڕێیانکرد، ماسیەکان لەیەککاتدا دەمیان لەهەر سێ قولابەکەدا.

لەهەمووان زووتر نیشانچی قولابەکەی خۆی راکێشایەدەر، مەرجانێکی گەورە بەسەر قولابەوە دەبریسکایەوە. نیشانچی ماسیەکەی کە گرتبووی لەقولاب نەدەکردەوەو ماسی بەهەڵبەزینەوە رەنگە پەمەییەکەی لەژێر رۆشنایی خۆردا بەسەر رەنگی سەوزباوی دەریادا پەخش دەکرد. کەمێك دواتر، پویرازو ڤایسیلیش قولابەکانیان لەدەریا هێنایەدەر. ئەوانیش ماوەیەك ئەو ماسیانەی گرتبوویان هەژاندیانەوەو بەحەپەساویەوە سەیری ماسیەکانیان کرد،

مەرجانەکانی ئەوانیش وەك مەرجانی نیشانچی گەورە بوون. بەجۆش هاتن. دووبارە هەڵیاندانەوە نێو ئاو. هەڵیانداو هێنایانەدەر، هەڵیانداو هێنایانەوەدەر، یەکێك لەلەگەنەکان لێوانلێو بوو لەمەرجانە وردو گەورەکان.

پویراز تا دەهات زیاتر دەحەپەسا. تا دەهات میهرو خۆشەویستی دەرهەق بەنیشانچی زیاتر دەبوو. ئەو پیاوە بەهەموو بوونیەوە دەریای خۆش دەویێتو دەریاش ئەوی خۆش دەویێت. بیریکردەوە مرۆڤێك کە ئەوەندە دەریای خۆش دەویێت، چۆن لەپێناو کچێك وازی لەدەریا هێناوەو چووە خۆی لەنێو چیاکاندا گۆشەگیر کردووە. گوتی، رەنگبێت کچەکەی لەدەریا خۆشەویستبێت. لەکونجکۆڵیان ئۆقرەی نەمابوو، بەڵام نەیدەتوانی لێیبپرسێت.

قولابەکەی لەئاو دەرهێنا. ماسیەکەی لێکردەوەو خستیە نێو لەگەنێکی دیکەوە "یاللاّ نیشانچی، جێگایەکی دیکە، کێڵگەیەکی دیکەی ماسیان بدۆزینەوە".

نیشانچیو ڤاسیلیش قولابەکانیان لەئاو دەرهێناو دایاننانە نێو لەگەنی ماسیان. نیشانچی هەستایە سەرپێ، هەتاو راستەوخۆ لێیدەدا، دەستی کردنە نوای چاوەکانی، پویرازو ڤاسیلیش وایانکرد.

نیشانچی بەوردی سەیری ئەمسەر تا ئەوسەری دەریای کرد. دەریا شین بوو. هەرکە چاوی بەجێگایەکی رەنگ وەنەوشەیی تۆخو بێشەپۆل کەوت، ماوەیەك لەو شوێنە رامـاو بیریکردەوە. سووکانی بەلەمەکەی گرتەدەست، لەنێوەڕاستی دەریا بەدەوری بازنەیەکی رۆشنایی وەنەوشەیی خولانەوە. پاشان رەنگە وەنەوشەییەکەیان تەی کردو چوونە ئەوبەری. لەنێوەڕاستی بازنە وەنەوشەییەکە هێڵێکی قووڵ لەرۆشنایی بەجێما.

نیشانچی گوتی: "ئەو ماسیانە لەپڕ بۆ کوێ چوون". درێژەی بەپشکنینی لای راستو چەپو پێشەوەو دواوەدا، سەرەنجام گوتی: "تێگەیشتم، تێگەیشتم. وەرە ڤاسیلی". سووکانەکەی دایە دەست ڤاسیلی. خاڵێکی لای باشووری دوورگەی کابای نیشان دا. ڤاسیلی هاژۆتنی بەلەمەکەی گرتە ئەستۆ. پویراز لەتەکی دانیشتو نیشانچی بەرامبەریان". من گوتم کێماسیەکە لەمنەوە نیە، گوتم پیربوویت نیشانچی، چاوەکانیشت ئیدی نابینن، پاشان تێگەیشتم چاوەکانم هیچ کەمو کوڕییێکیان نیە. ئەمە دەریایە، دەریایەکی رۆشنە، چاوی مرۆ تێکدەدات. لەعارەبستانیش دەریایەکی ئاوا رۆشنم بینی. ئەو دەریا دەریای سوور بوو، ئەو دەریاش دەستەمۆو هێورتر. لەرۆژانی زۆر رۆشندا. ماسیی رەنگاوڕەنگم لەبنی بنەوە بینین کە ئەمسەرو ئەوسەریان دەکرد. قووڵایی دەریای سوور لەرۆژانی بەهاردا پڕدەبوو لەباخچەی گوڵانی رەنگاوڕەنگ".

نیشانچی لەپڕ بێدەنگ بووو هەستایە سەرپێ: "ئێرەیە، بەڕای من ئێرە تژی ماسیە". راوەستان، قولابیان هەڵدایە نێو ئاوو رایانکێشایەدەر.

"ئەگەرچی دەریای ئێوەش بەئەندازەی دەریای سوور بەرهەمداره، بەڵام وەك ئەوێ هەزار جۆر ماسی تێدا نیه".

ڤاسیلی خاکەڕاییانه گوتی: "ڕەنگبێت هەزار جۆر ماسی تێدا نەبێت، بەڵام ماسیەکانی دەریای ئێمه بەتامترین ماسیی دونیان. وا دەڵێن، من چوزانم".

پویراز بەدەربڕینێکی واقوڕماوانه گوتی: "هەروایه، هەمووان دەڵێن ماسیەکانی دەریای ئێمه بەتامترین ماسی دونیان".

نیشانچی گوتی: "دروسته ئێستا دەبێت نیشانەکان لەنێو دەریادا بدۆزینەوەو بزانین چ جۆره ماسی تێدایه، بەڵکو ئێره ماسیی جۆراوجۆری تێدا هەبێت، بەڵکو لەژێر ئەم ئاوانەشدا باخچەی پڕ گوڵو ماسی هەبێت. لەوەرزی بەهاردا لەژێر دەریاکانیشدا گوڵ دەڕوێن".

ڤاسیلی گوتی: "دەبێت وابێت".

لێرەش زۆر ماسیان گرتن. لەگەنێکی دیکەش پڕبوو، ماسیەکانیان دانانه سەر تەختەی خوارەوەی بەلەمەکە، ماسیەکان لەسەر یەکدی هەڵبەزو دابەزیان دەکرد.

نیشانچی چەند جێگایەکی دیکەی ماسیانی نیشان دان. لەماسی گرتن ماندوو بوون.

ئەمڕۆکه دەریا حاڵو هەوایەکی جیاوازی هەبوو. لەتەك ڕەنگی سەوز، وەنەوشەیی دروەشاوە، لەتەك ئەویشدا هێڵێکی شینباو، کەمێك ئەولاتر هێڵێکی سپیو ڕوون هەبوو که پێچاوپێچ تا چاو بڕبکات درێژ دەبووەوە. هێڵە سپیه دروەشاوەکە، لەبەرزایی شەپۆله شینه ڕۆشنەکان، نارنجیئاسا، سەوزی تۆخو سپییێکی ڕەنگ کەفاوی دەینواند.

نیشانچی که هیچ یەك لەحاڵەتەکانی دەریای لەبەرچاوان ون نەدەبوو، گوتی: "من تا ئێستا دەریایەکی ئاوا ڕۆشنو ڕەنگاو ڕەنگم نەبینیوە. سەیر بکەن، تا ئێستا بینوتانه بەسەر ڕووی دەریایەکدا ئەو هەموو ڕەنگه بدرەوشێنەوە؟ سەیر بکەن، کەمێك دواتر ئەم ڕەنگانه بەخولانەوەی ڕۆشناییەك دەگۆڕێن".

دەریا نەك بەخولانەوەی ڕۆشناییەك، بەڵکو بەخولانەوەی هەزار ڕۆشنایی هەر ساتێك ناساتێك دەگۆڕا.

پویراز، گۆڕانەکانو کەمو زیادبوونو فڕینی ڕەنگەکانی لەدەریادا بینی، هەروەها تیشکه سووربۆوەکان، نارنجیەکان، ئەرخەوانیو سەوزه ڕۆشنەکان، که لەلایەکی دەریاوه بۆ لایەکی دیکەی هەڵدەفڕین. لەکاتێکدا چاوی بڕیبووه ڕوخساری نیشانچی بەزەینی داهات، ئایا دەریا لەزەوی دەوڵەمەندتره.

بەر لەخۆرئاوابوون گەڕانەوە دوورگە. لەو ڕۆژە جوانەدا هەموو دانیشتوانی دوورگە لەسەر ئەسکەلە کۆبووبوونەوە. باران هەم دەریاو هەم ئاسمانی شۆریبوو.

بەلەم هاتو لەسەر لەکان لەنگەری گرت. لەگەڵ هوسمەن دوو لەو پیاوانەی کە لەدوای هەمووان هاتبوونە دوورگە، هاتن. هەمووان پێکەوە بەلەمەکەیان ڕاکێشایە سەر لەکانی قەراغ دەریا.

پویراز، لەنێو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا بەدوای زەهرادا گەڕا. هەر لەگەڵ ئەوەی چاوی دایە لای ڕاست، لەوێ لەژێر دارهەنارەکان، کازم ئاغای بینی. لەلایەکیەوە کچێکی ڕاوەستابوو، لەلایەکەی دیکەشی کچێکی دیکەی‌و تەماشای ئەوانیان دەکرد. لەگەڵ ئەوەی سەیری زەهرای کرد دڵی کەوتە خورپە، شل بوو، چیی وای نەمابوو بکەوێت. سەری دانەواند. لەماوەیەکی کورتدا توانی بەسەرخۆیدا زاڵ بێت، هەوڵی دەدا تا دەکرێت‌و دەتوانێت سەیری زەهرا نەکات. لەپشت ئەوانەی لەسەر ئەسکەلە بوون ڕاوەستاو هەندێك شتی بەڤاسیلی گوت. ڤاسیلی بەهاوارکردنەوە گوتی: "هۆی خەڵکی دوورگە، خەڵکی دوورگە، ئەمڕۆ لەسایەی ئاپۆ نیشانچییەوە یەك بەلەم ماسیمان گرتووە، ئەوە بزانن کە لەهیچ جێگایەکی دیکەی دونیا ماسیگرێکی وەك وەلی نیشانچی پەیدا نابێت. تا ئەو کاتەی ئەو لەم دوورگەیە بێت، خەڵکی ئەم دوورگەیە دەستەوەستان‌و داماو نابن. ئێستا گوێ بگرن چی دەڵێم، ئەوەندەمان ماسی گرتوون، ئەوەندەمان ماسی گرتوون، کە لێرە لەژێر ئەم دارچنارانە ناتوانین سووریان بکەینەوە. بۆیە هەرکەسەو لەگەن‌و سەبەتەی خۆی هەڵبگرێت‌و بیهێنێت. بیهێنێت با لەگەنەکان پڕ ماسی بکەین. ئەوانەی کە لەگەن‌و سەبەتەشیان نیە با لەدراوسێکانیان وەریبگرن. کەسانێکیش کە نەیانتوانی لەگەن‌و سەبەتە پەیدا بکەن بابێن لەژێر دارچنارەکان ڕابوەستن. دیسان هەمووان پێکەوە".

پویراز بەشەرمنییەوە گوتی: "دایکە لێنا، ئەوانەی کە سوورکردنەوەی ماسی نازانن، فێریان دەکات، ئەو وەستای ئەو کارەیە".

لەم ساتەدا، زەهرا لەلای باوکی دوور کەوتبووەوەو بەخێرایی بەرەو ماڵەوەیان دەچوو، پویراز کە بەنیگەرانییەوە چاوێکی بەدەوروبەردا گێڕا، چاوی دایە زەهراو تا ئەو دەمەی زەهرا دەرگای ماڵەوەی کردەوەو چووە ژوورێ چاوی لەسەر هەڵنەگرت‌و تا ئەو دەمەش کە زەهرا بەقابلەمەیەکەوە لەماڵەوە هاتەدەر، هەر لەدەرگاکەوە ڕامابوو.

زەهرا بەو رەوتە پەریئاسایەوە، تا نزیك بەلەمەكە هات. ڤاسیلی ئەوی بینی، بەلام واینواند كە نایبینێت، بۆ ئەوەی كچەكە ماوەیەكی زیاتر لەوێدا بمێنێتەوە، لەدوای هەمووانـدا ماسی بۆ جیاكردەوەو پویراز تەنانەت بۆ ساتێكیش چیە چاوی لەسەر هەڵنەگرت. دوای ئەوە گەڕایەوەو بەرەو لای موسا كازم ئاغا چوو.

موسا كازم ئاغا بەناسكیو ئەوپەڕی دڵسۆزیەوە گوتی: "خوا خێرتان بنووسێت. تۆ دەبیتـە مەرهـەمێك بـۆ دەردی هـەژارو نـەداران. مرۆڤـەكان بەباشـترین، پوختـەترینو خۆشترین خواردنەكان تێر دەكەیت".

"لەگەورەیی خۆتانە گەورەم، ئێمە لەكوێو تێركردنی خەڵكی لەكوێ! بەمزووانە گەورەم لەهەموو ئەو باغچانە سەوزەو قەیسی پێدەگەن. ماوەیەكی زۆر كەمیشی ماوە تا هەنارو زەیتوونی باغەكان وەبەربێن. لەلای رۆژئاوای ئەم گردۆلكەیە (بەدەستی نیشانی دا) لەبانی هەنگەكان غەڵێفەی زۆرهەن. چەند مانگێكی دیكە هەموو غەڵێفەكان پڕدەبن لەهەنگوین. ئەو غەڵێفانەم لەفەرمانگەی داراییەوە كڕیون، گەورەم".

"خواتان لێرازی بێت كوڕم. ئێمەی كۆچبەر ئازارو سەختی زۆرمان كێشاوە. ئێوە زۆر لەئێمە باشتر دەزانـنو هـەركارێكتان لەدەست بێت بۆمـانی دەكـەن. نـازانین ئـەو كاتـەی لێرەنیـت ئێمـە هـەموومان لـەژێر دارچـنارەكاندا كۆدەبینـەوەو بـەردەوام بـاس لـەئێوە، لەمرۆڤدۆستیو چاكیەكانی ئێوە دەكەین".

"لوتفتان هەیە بەڕێزم".

كاتێك كە موسا كازم ئاغا ئەم قسانەی دەكرد، ئەو لەشەرمان دەستو پێی خۆی ون دەكردو لەتەریقبوونەوە ئەوە نەبوو زەوی قووتی بدات. كاتێك ئاوا بەشێواویەوە چاوی بەبەلەمەكە كەوت، زەهرای بینی كە ماسیەكانی وەرگرتبووو خەریك بوو دەڕۆیشتو ئەمجارە بەڕاستی سەیری ئەوی دەكرد. لەرز دایگرتو وەجووڵە كەوت.

باشـترین رەفتـارو پـاكترین جـوانی لـەدونیادا بریتیـە لەدڵسـۆزیو خۆشەویسـتیو سـەخاوەتی نێـوان مرۆڤـەكان. هـەموو چـاكەكاریەكان لـەدونیادا لـەبیر دەكـرێن، بـەلام جوانیەك هەیە كە هیچ مرۆڤێك هەرگیز لەبیری ناكات. ئـەویش عەشقی راستگۆیانەیە، كە مرۆڤێك لەمرۆڤێكی دیكەوە دەیبینێتو هەستی پێدەكات.

موسـا كـازم ئاغـا قـۆڵی پـویرازی گـرتو گـوتی: "ئێسـتا بابچـینە مـاڵی ئێمـەو قاوەیەك بخۆینەوە".

"سەرچاوان گەورەم".

خەریك بوو دەڕۆیشت كە راوەستا:

"ڤاسیلی!"

"فەرموو!"

"ماسیەكانی ئێمەشت جیاكردنەوە؟"

"جیامان كردنەوە".

"ماسیەكانی دیكە دابەش بكە".

"هیچی نەماوە، هەموویمان دابەشكرد".

"پێیانبڵێ هەموو ماسیەكان لێبنێن. ئەگەرنا تێكدەچن، ئەگەر سووریان بكەنەوە، دەتوانن سبەیو رۆژێكی دیكەش لێی بخۆن".

"خوا دەست بەباڵتەوە بگرێت كوڕم".

"خۆشبیت گەورەم".

چوونە سەرەوە. ژوورەوە زۆر دڵگرو جوان بوو. لەدیواری سەر شومینەكەدا تابلۆیەك هەڵواسرابوو كە هی چیایەكی شینو مامزێك لەبەرانبەر چیایەكە راوەستابوو. باولی نەخشێندراو، پەنجەرەی لادەركەدار، بنمیچی هەڵكەندراو، پلیكانەی لەدار دروستكراوی جەلادراو، تەختەی راخراوی نێو ژوورەكان...

پویراز گوتی: "ماڵەكەتان زۆر جوانە".

"خوا دەست بەباڵی وەهاب بەگەوە بگرێت. ئێمەی شیاوی ئەو خانووە زانی، لەڕاستیدا ئێمە زۆر خۆشحاڵ بووین".

نەسیبە، ئەو دەمەی كە ئەوان لەپلیكانەكان بەسەردەكەوتن حەسیرێكی راخستو دۆشەكێكی لەسەر حەسیرەكە پانكردەوەو دوو بالیفی لەسەر دۆشەكەكە دانان كە حاشیەكانیان بەپارچەی تۆڕدارەوە چندرابوونو هەر گۆشەیەك لەبالیفەكان گولێكی وەنەوشەیی بەسامتین لەسەر چندرابوو. پێڵاوەكانیان لەبەر دەرگا داكەندنو هاتن لەسەر دۆشەكەكان دانیشتن.

كەمێك دواتر زەهرا هاتە ژوور. سیمای عەرەقگرتوو بووو رەنگی دەمو چاوی بەلای پەمەییدا دەیڕوانی، بێئەوەی وا دەربخات سەرتاپای پویرازی لەماوەی چاوتروكانێكدا بینیو لەپشت سەریەوە گوتی: "بەخێرهاتی بەڕێز!"

پویراز لەشوێنی خۆی هەستاو گوتی: "سوپاست دەکەم".

زەهرا چووە ژوورەکەی دیکە. پویراز بتەوێت یان نا لەدوای ئەودا وڕبوو. زۆر هەوڵی دا ئەو تاسانەی دەرنەخات، بەڵام هەموو شتێك لەرەفتاری زەهرادا ئاشکرا بوو. ماوەیەك نەیتوانی سەیری روخساری موسا کازم ئاغا بکات.

موسا کازم ئاغاش نەیدەتوانی سەیری روخساری ئەو بکات. ئاشکرا بوو هەستێکی ئاسوودەی نیە.

پویراز کە بەسەر خۆیدا زاڵ بووبوو، گوتی: "ئاپۆ، من سبەینێ دەچمە شارۆچکەکە، ئێوە ئەمرێکتان نیە؟"

"لەڕاستیدا کوڕم دەمەوێت شتێك بێژم، بەڵام شەرم دەکەم، نازانم چۆن پێتی بڵێم".

خۆی لەسەر ئەو بالیفەی پاڵی پێوە دابوو جیاکردەوەو خۆی راست کردەوە، پویرازیش وایکرد.

"وای بەڕێزم تکات لێدەکەم گەورەم. فەرموو بەڕێزم خزمەتکردنی ئێوە بەئەرکی خۆم دەزانم گەورەم".

نەسیبە بەسینییێکی بچووك قاوەی بۆ هێنان، یەکەمجار دایناپە بەردەم پویراز، پویراز بۆلای موسا کازم ئاغای برد، دەمێك ئەم بۆلای ئەوو ئەو بۆلای ئەمی دەبرد، دواجار موسا کازم ئاغا سەرکەوت.

بۆنی قاوەی گەرم ژوورەکەی پڕکرد.

"ئەو شتەی کە لەم دونیایە لەهەمووی زیاتر خۆشحاڵم دەکات قاوەی گەرمە، بۆنێکی خۆشی هەیە".

"زۆر راستە سوڵتانی من. فنجانەکانیش زۆر جوانن".

وشەی سوڵتان، موسا کازم ئاغای خستە نێو رامانەوە. ئەم وشەیە زیاتر عەلەویەکان بەکاری دێنن.

لەناکاودا پرسی: "خەڵکی کوێیت؟"

پویراز لەماوەی چەند خولەکێك تا ئەو رادەیەی دەیتوانی باسی خۆی‌و زێدی خۆی کرد، لەکوێوە هاتوونەتە ئوزون یایلا، لەکام بەرەکانی جەنگدا بووە، چۆن هاتۆتە دوورگەو هەروەها باسی پەیوەندیی خۆی‌و ڤاسیلی بۆ کردو ئەوەی روونکردەوە کە ڤاسیلی چۆن لەمردن قوتاری کردووە. لەهەمووی زیاتر باسی کوشتاری چیای ئەڵلاهو ئەکبەری کرد.

موسـا كـازم ئاغـا زۆر ناڕەحـەت بـووو گـوتی: "وای کوڕەکـەم وای". کچـەکانیش لەژوورەکەی ئـەودیو قسەی ئـەوانیان دەبیست. پـویراز کاتێـك باسـی نەبـەردو کوشـتاری چیای ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد، گریان قوڕگی زەهرای گرت، زۆری نەمابوو بداتـە پڕمـەی گریان. باش بوو پـویراز ئـەو کارەساتە جـەرگبڕەی کۆتـایی پێهێنـا. نەسـیبە هـەر لەگـەڵ ئەوەی پەی بەحاڵو ڕەوشی ئەو بردبوو گرتبوویە باوەش.

"بەڕێزم توانیت لیستێك ئامادە بکەیت؟"

"ئامادەم کردووە کوڕم".

"بیدە بەمن گەورە".

موسا کازم ئاغا بەشەرمەوە: "زەحمەتمان دایەبەرتان، زۆر زەحمەتمان..، بەڵام مـن کـە هیچ شارەزای ئەم دەوروبەرانە نیم، هەمیشە دەبمە مایەی زەحمەتی بۆتان".

"چ زەحمەتییێك، چ زەحمەتییێك گەورەم ئێوە ئەمر بفەرموون".

موسـا کـازم ئاغـا لەکاتێکـدا دەسـتی دەلـەرزی، لـەگیرفانی چـاکەتە شـیکەکەی کـە پارچەکەی هی ئینگلیـز بـوو، لیسـتێکی دوورودرێـژی دەرهێنـا. لیسـتەکە بەدەسـتخەتێکی زۆر جـوان نووسـرابوو. پـویراز بـیری کـردەوە، هیچـکەس لـەم تەمەنـەدا ناتوانێـت دەستخەتێکی وا جوانی هەبێت. ڕێزو حورمەتی موسا کـازم ئاغـای لـەلا زیـاتر بـوو، دوای ئەوەی کە لیستەکەی خوێندەوە هەستا.

"گەورەم، دەتوانم خانووەکەتان ببینم؟"

موسا کازم ئاغاش لەگەڵ ئەو هەستایە سەرپێ.

"فەرموو بەڕێز".

کەوتـە پـێش. دوای ئـەوەی کـە ژوورەکـانی ئـەو نهۆمـەی بینـی، چـوونەخوارەوەو ئەوێشیان بینی. پاشان دیسان سەرکەوتنەوەو لەجێگای خۆیان دانیشتنەوە.

"گەورەم بۆ ئەوەی بتوانی لەم خانووەدا بەئاسوودەیی بژیت، کەلوپەلێکی زۆر پێویستە".

"پێویستە، بەڵام کوڕم ئەگەر سبەی لەئەسیناوە هەواڵ هات کە دەتوانین بگەڕێینـەوە، ئەو هەموو کەلوپەلانە چی لێبکەین؟"

"ئـەم زەمانـە هـەموو شـت هەرزانـە، مفتـە، هەرشـتێك کـە ئـەمڕۆ بیکـڕین سـبەی دەتوانین بەنرخێکی گرانتر بیفرۆشین".

"بەڕاست وایە؟"

"بەڵێ وایە گەورەم".

"خانووەکە زۆر گەورەیە. لەخانوویێکی ئاوا بێکەلوپەل ناتواندرێت دابنیشین، مەگەر نا؟"

"ناکرێت دابنیشین".

"ئەی...".

پشتوێنەکەی کردەوە، پاشان راوەستاو قەدی کردو دایناپە لایەك. لەژێر پشتوێنەکەیدا باروتدانە چەرمیە بەجەواهێر نەخشێندراوەکەی دەرکەوت، کە لەچەرمێکی قاوەیی بەنەخش‌و نیگارێکی جوان چێکرابوو. زارکی باروتدانەکەی بەکلیلێکی بچووك کردەوە. لەنێو باروتدانەکە کیسەیەکی ئاوریشمی، کە رەنگەکەی وەنەوشەیی بوو، دەرهێنا. قەیتانی زارکی کیسەکەی راکێشا. دەستی بردە نێو کیسەکە، دەنگی جرینگ جرینگی ئاڵتوونەکانی بیسترا. کەمێك دواتر دەستی کێشایە دواوە. پێنج سکەی ئاڵتوون لەسەر لەپی دەستی بریسکانەوە.

"فەرموو کاکە پویراز کورم. ئەمە بەش دەکات؟"

سکە زێرەکانی بۆلای ئەو درێژ کرد.

"وای گەورەم ئەمە پێنج ناپلیۆنن. پێنج ناپلیۆن پارەیەکی یەکجار زۆرە. بەم پێنج سکە زێرە ناپلیۆنە نەك هەر دەتوانی ئەم خانووە پڕ بکەیت لەشتومەك، بەڵکو دەتوانی کێڵگەیەکیشی پێبکریت، وەك ئەوەی باست دەکرد. تەنانەت دەشتوانین لەبری کێڵگەکە پارەش نەدەین. بەم پارە ئێستا تەنانەت دەتوانین چەندین ئەسپی عارەبی بکرین. زێری ناپلیۆنی ئێستا پارەیەکی زۆر زۆرە. هوسمەن پارەیەکی زۆری داوەتە من؟"

"قاسەی پارەت هەیە کورم؟"

پویراز پێکەنی.

"سەندوقێکم هەیە کە وەك قاسە وایە".

"زێرەکانی منیش لەقاسەکەی تۆ....".

"نە گەورەم. سەندوقەکەی ئێوە دڵنیاترە. من کە لەماڵێ چوومەدەر، دایکە لێناش دەردەچێت، ماڵ چۆڵ دەمێنێتەوەو هەموو کەس دەتوانێت بچێتە ژووریو سەندوقەکە هەڵگرێت‌و بیبات".

"منیش بەم تەمەنەمەوە ناتوانم خۆم‌و کیسەکەم تاك‌و تەنیا بچمە هیچ جێیەك".

"بەتەنیا ناڕۆیت گەورەم، بۆ هەرجێیەك بچیت منت لەگەڵدا دەبم".

"بژیت کوڕەکەم، بەڵام ئەو کیسە پڕە لەگیرفانمدا قوڕسە".

پـویراز بەقسـەکانی ئـەو، کۆمـەڵکوژیی ئێزدیـەکانی هـاتبووەوە بـیرو هـەر چـەندی دەیکرد زەینی هەر لەسـەر ئـەو کۆمەڵکوژیـە بـوو. لەهـەموو دیمەنـە تراژیدیـەکان زیـاتر جووڵەجووڵی مەمکە بڕاوو خوێناویەکانی کچانی ئێـزدی، کـە لێدەکرانـەوەو فڕێدەدرانـە سەر لی دەم چەمەکان.... دەکرێت متمانە بەو پیاوە بکات؟ لەبەرئـەوەی ئـەو کارەساتەی کەوتبووەوە بیر بێـزی لـەخۆی دەکـردەوە. پـویراز کاتێـك کۆمـەڵکوژیی ئێزدیـەکانی بـاس دەکـرد، ئـەو ئەوەنـدە خـەمگینو نیگـەران بووبـوو کـە دەنگـی لـەدەنگی گریـان دەچـوو، ئەمەش نیشانەی ئەوە بوو کە ئەو پیاوە زۆر سـەختیو ئـازاری چەشـتووە. بەسـەرخۆیدا شـکابووەوەو ویسـتبووی باسـەکەی رابگرێـتو چیدی قسـە نـەکات، بـەڵام نـەیتوانیبوو وا لەخۆی بکاتو ناچار مابوو قسەکانی تا ئاخیر درێـژە  پێبـدات. کـاتێکیش باسـکردنی ئـەو کارەساتە لـەمردن ناخۆشـترەی کۆتـایی پێهێنـابوو، بەهەسـتکردن بەمانـدوێتی، لەکاتێکـدا رەنگـی زەرد هەڵگـەڕابووو پشـتی دابـووە دیوارەکـەو لەشـوێنی خـۆی وشـك هـەڵاتبوو. بێگومان دەکرێت بەکەسێك کە ئەو هەموو بەڵاو ئازارەی دیـوە متمانـە بکـات، ئەگەرچـی گیرۆدەی تاوانێکی زۆر گەورەو لەبەخشیننەهاتوو بووبوو.

مەگـەر جـەنگ گـەورەترین تـاوان نیـە. مەگـەر رەوانـەکردنی ئـەو هـەموو لاوە ناکامانـەو ناچارکردنیان کە یەکدی بکوژن، کـە پەسـترینو قێـزەونترین بنەمایەکـە، لەلایـەن مرۆڤـەوە داهێندراوەو مرۆڤبـوونی کەسـەکان پێشـێل دەکـات، گـەورەترین گونـاهو تـاوان نیـە؟ پـویرازی بەدبەخت کاتێك باسی ئەو سەربازانەی دەکرد کە لەچیای ئەللاهو ئەکبەر بووبوونـە سـەهۆڵ، یان ئەسپی لێیدابوون، نەیدەتوانی سەری هەڵبڕێتو سەیری روخساری ئەو بکـات. وەك ئـەوەی ئەوخۆی سەبەبکارو هەڵایسێنەری جەنگ بووبێت. دەنگی پڕاوپـڕ بـوو لەشـەرمو تاڵاوێـك کـە تەخمین ناکرێت. دەبێت گاڵتەیـەك لەگـەڵ ئـەو منداڵە بکـات، دەنـا خـۆی دەخواتـەوەو لـەنێو دەچێت. هەڵبەتە دەکرێت متمانە بەکەسێکی ئـاوا بکرێـت. دەتوانێـت گیـانو مـاڵو نامووسـی خـۆی پێبسـپێرێت. ئـەو جـۆرە کەسـانە، نـەك هـەر بـەهۆی کۆمـەڵکوژییێکی وەك ئـەوەی ئێزدیەکان، کە مرۆڤ لەشەرمو تەریقبوونەوە بەزەویدا دەچێتەخوار، بـەڵکو هـەر لەبەرئـەوەی کە لەشەڕێکی بچووکیش بەشداری کردوە، خۆی دەکوژێت، خوانەکات.

باروتدانەکەی خۆی لەپشتوێنی کردەوەو بۆلای پویرازی درێژکرد، پـویراز بەدەسـتی بۆلای ئەوی گێڕایەوە.

"ناکرێت گەورەم، بەڕاستی ناکرێت، سەندوقەکەی من هێندەی پشتوێنەکەی تۆ دڵنیاکەرانە نیە. هەرکاتێك ویستمان بچینە جێگایەك بەزەهرا خانمی دەسپێرین، کەس ناتوانێت لەزەهرا خانمی بستێنێت".

موسا کازم ئاغا سەری دانەواند، غەمگین بوو. باروتدانەکەی بەدەستی لەرزۆکەوە خستەوە نێو پشتوێنەکەیەوە. باروتدانەکە وەك ئاوریشم نەرم بوو. تەنها پاشاکانی عوسمانیو ئاغاکانی قەفقاز لەو جۆرە باروتدانانەیان هەبوو.

"لەمن ببورە گەورەم".

"تکات لێدەکەم، بەهەرحاڵ تۆ وات پێباشە".

"هیچکەس ناتوانێت لەزەهرا خانمی بستێنێت".

موسا کازم ئاغا بزەی هاتێ.

"کەس ناتوانێت لێیبستێنێت".

پویرازیش بزەی هاتێ.

"سبەی دەچنە شارۆچکەکە، مەگەر نا گەورەم؟"

"دەچین. کاکە دەچین".

بەیانی رۆژی دواتر، قەدریی بەلەموان هاواری کرد:

"سەرۆك پویراز ئامادەیت؟"

پویراز بەخێرایی لەپلیکانەکان دابەزیو سەیری دەوروبەری کرد.

"با زوو بڕۆین، موسا کازم ئاغا لەکوێیە؟"

"لەئەسکەلەیە".

"بۆ زووتر خەبەرت نەدامێ؟"

"هەر ئێستا هات".

بەخێرایی چوونە ئەسکەلە. یەکەمجار زەهرای بینی کە لەژێر چنارەکان، لەڕۆخ کانیەکە بوو، پاشان موسا کازم ئاغا کە لەنێو بەلەمدا ڤیتاوقیت راوەستابووو مەلەك خانمیشی لەتەك بوو. پویراز بیری کردەوە رەوشەکە گەیشتۆتە شوێنی هەستیار. مەلەك خانم شەیدای پیری خۆی بووە، زوو یان درەنگ لەگەڵ خۆیدا هەڵیدەگرێتو دەیباتە سەرچیای هەزار کانیی ئیدا.

کەمێك دواتر، ڤاسیلیش هات.

"ئۆهووو، ئێوە لێرەن؟ منیش واهاتم".

لەم قسانە بوون کە سەرو کەللەی هوسمەنیش دەرکەوت.

"ئێ بەم بەیانیە زووە خەریکن دەچنە کوێ؟"

ڤاسیلی گوتی: "شارۆچکە".

سەیری پویرازی کرد: "منیش دێم".

پویراز گوتی: "وەرە هوسمەن".

هوسمەن سواری بەلەم بوو. لەم کاتەدا مەلەك خانم دەستی پیری خۆی گرتو ماچی کرد. موسا کازم ئاغاش دەستی ئەوی ماچ کرد. ئەو دەمەی کە پویراز لەئەسکەلەوە دەیویست بێتە نێو بەلەم، دەستی گرتو بۆ سەرەوە رایکێشا.

بەلەموان هەندری ماتۆڕەکەی سێ جاران راکێشا، ماتۆڕ کەوتەکار، بەلەم بەسەروسەداوە کەوتە جووڵە.

نیوەڕۆ لایدابوو کە گەیشتنە شارۆچکەکە. ڤاسیلی لەپێشەوەو ئەوانیدی بەدوایدا لەئەسکەلەوە بەرەو لای دووکانی خەیری ئەفەندی کەوتنە دوای یەك. خەیری ئەفەندی لەجادەکە چووە پێشوازیان.

"بەخێرهاتی بەڕێز، سەفات هانی".

پویراز، موسا کازم ئاغاو خەیری ئەفەندی پێکناساندن.

"خەیری ئەفەندی خاوەن ئەم دووکانەیە".

"ماشەللا، ماشەللا".

"موسا کازم ئاغا یەکێکە لەئەشرافەکانی کرێت، لەکرێت هەم کێڵگەیان هەیەو هەم ئەسپیش بەخێو دەکەن. هاتوونەتە دوورگەکەی ئێمە، ئێستا وا لای ئێمە نیشتەجێن".

خەیری ئەفەندی کورسیەکەی خۆی بۆلای موسا کازم ئاغا بردو فەرمووی لێکرد، خۆیشی لەتەنیشت ئەو دانیشت، ئەوانی دیش لەملاو ئەولا دانیشتن. شاگردی دووکانەکە بەڕاکردن چووە قاوەخانەکەی ئەوبەرو قاوەی بانگ کردو هاتەوە.

پویراز ئەوەی پێویستیان پێهەبوو بەخەیری ئەفەندی گوت. خەیری ئەفەندی گوتی: "باشە، ئێوە جارێ پشوو بدەن، پاشان دەچینە لای جەعفەر لەوێ هەرچی بتانەوێت پەیدا دەبێت، هەر شتێك لەئەستەنبولو ئەسیناو پاریس هەبێت لای جەعفەریش دەست دەکەوێت".

قاوەکانیان خواردەوە.

جەعفەر لەبەردەم دووکانە گەورەکەی خۆیدا پێشوازی لێکردن "فەرموون بەڕێز، فەرموون گەورەم". بەدەوری مێزێکدا کە لەنێوەڕاستی دووکانەکە بوو چەندین کورسیی جۆراوجۆر داندرابوون.

"فەرموون دانیشن بەڕێزان. چی دەخۆنەوە؟"

"قاوە".

"چۆن بێت؟"

"کەم شەکر".

کاتێك دەچووە دواوەی دووکانەکەی گوتی: "گەورەم، دەبێت بەدەستی خۆم قاوەکان ئامادە بکەم، قاوەی لەئاون کوتراوە، کەمێك پێشتر خۆم قاوەکانم خۆش کردووە، لەئاونیش هاڕیومە. تازە بۆ ئەوەی بۆنەکەیشی لەنێو نەچێت زارکی جزوەکەم بەشەمێی هەنگوین گرتووە.

"ئێستا دێمەوە". لەدەرگاکە چووە ژوورو دیار نەما. پویرازو ئەوانیدی لەسەر کورسیەکان دانیشتبوون، بەسەرسامیەوە سەیری دووکانەکەیان دەکرد، کە دەتگوت مەیدانێکی گەورەیە. جا بڵێ چی لەدووکانەکە نەبوو، دووکانێکی ئاوا کە ئەو هەموو کاڵا جۆراوجۆرەی تێدابێت. لەڕاستیدا تەنانەت لەئینگلستانو ئەمریکاش بەزەحمەت پەیدا دەبوو.

خەیری ئەفەندی بەچاوانی زەقبووەوەو بەسەرسامی گۆشەو کونو کەلەبەرەکانی دووکانەکەی تەماشا دەکرد. بەچەشنێك وەك ئەوەی جاری یەکەم بێت ئەم شوێنە ببینێت. لوستەری گەورەو بچووك کە لەکریستاڵو شووشە تاشرابوون، لەبنمیچی دووکانەکە ئاوێزان کرابوون کە کاری وەستاکارانی شارەزا بوون، پێستەی پانو دەباغی کراوی بزن، مۆبلی ڕەنگاو ڕەنگی مەخمەڵی، کاناپە، کورسی لەداری حەیزەران دروستکراو، کورسی دیکەی ئاسایی، تەختی نووستنی لەئاسن دروستکراوی ئاوەزێڕکراو، پەردە، پارچەی تایبەتی پەردە... لەلایەك تۆپە قوماشی جۆراوجۆرو لەلایەکی دی پێڵاوی ژنانەو پیاوانە.. جلوبەرگی منداڵان، ترومبێلۆکەی یاریو لانکەی بەکارهاتوو..و ماتۆڕی بەلەمان لەنێوەڕاستی دووکان لەڕۆخ یەك هەڵچندرابوون.

موسا کازم ئاغا چاوی بەزین، حەوسار، پاشزینی ئەسپو پارچەی زیوچن کەوت، کە لەگۆشەیەکی دووکانەکە داندرابوون. هەستاو بۆلای ئەو شتانە چوو. یەکەمجار بەنەوازشەوە دەستی بەسیمکاریەکانی زینێك داهێنا. پاشان بەرزی کردەوەو سەیرێکی

ناوەوەی کرد. ناوەوەی زینەکە لبادێکی ڕەنگاوڕەنگی نارنجی هەبوو. ئەو زینە زینی تورکمەنی بوو.

بەوپەڕی سەرسامیەوە سەیری یەك بەیەکی زینە چەرکەسیو عەرەبیەکانی دەکرد، کە دەنگێکی بیست، "قاوەکانتان". ئەو زینەی کە بەدەستیەوە بوو بەبێمەیلیەوە دایناو بەخێرایی گەڕایەوە دەوری مێزەکە. جەعفەر قاوەی ئەوی دانا. بۆنی قاوەی تازە ئەو ناوەی پڕکردبوو. قاوە بەدەست لەسەر کورسیەکەی دانیشت. یەکەم فڕی لێدا، چاوەکانی داخست. خۆی لەکرێتو لەنێو کێڵگەکەی خۆیدا وێناکرد، بۆنی قاوەکە سەری هێنابووە خولانەوە. ماوەیەکی زۆر بوو قاوەی بۆنداری نەخواردبووەوە. بۆ جاری یەکەم بوو سەبارەت بەم وڵاتە هەستی بێگانەبوون نەکات، وەك ئەوەی تێکنەشێندرابێتو وەك سەگ لێینەڕواندرابێتو دوای دەرکردنی لەکرێت تووشی ئەو هەموو دەردو ئازاردانە نەکرابێت.

بەخواردنەوەی یەك فڕە قاوە هەستی دەکرد تازە هاتبێتە دونیاوە. موسا کازم ئاغا، مەست، چاوەکانی دانانە سەریەك، قاوەکەی تەواوکرد، پاشان ماوەیەك لەخرتی قاوەی نێو فنجانەکە راما. سەیریکرد، پێکەنی. هەستا فنجانەکەی کە هێڵی سووری هەبوونو لێوارەکانی پان بوون، دانایە سەر مێزەکە. رووی کردە جەعفەر کە لەڕۆخی دانیشتبوو، بەقەدو گەردنێکی درێژ، سیمایەکی وشکهەڵاتووی شێوەی مۆمیاییەکانو چاوانی تیژو تروسکەدار، کە هیچ بینەرێکی بەئاسانی قوتار نەدەکردو بتەوێت یان نەتەوێت بۆ شوێنی ئارامو دونیایەکی سەیرو جێگای زۆر دوور دەبرد. دەستی جەعفەری گرتو گوتی: "ئاونێکم بۆ بێنە، ئاونێك کە نەخشو نیگاری هەبێت، کۆنو بەکارهاتوو بێت".

جەعفەر خۆشحاڵ بوو، بەیەك دوو گەنجی گوت کە لەپێشتر راوەستابوون:

"یاللا زووبن، راکەن بڕۆن بۆ ماڵێ ئەو ئاونە نەخشدارو دەسکئاسنە کۆنەکە بێننو وەرنەوە".

کوڕە لاوێك لەچاوتروکانێکدا ون بوو، کەمێك دواتر هاتەوەو ئاونو دەسکە ئاسنەکەی هێنابوو، کە ڕەنگە سوورەکەی بەلای تۆخی دادەیڕوانی، بۆلای جەعفەری درێژکرد، جەعفەریش بەڕێزەوە دایە دەست موسا کازم ئاغا.

"چەند جوانە، چەند جوانە، سوپاس، سوپاس".

بێئەوەی چاو لەئاونەکە هەڵبگرێت، بێپسانەوە دەیگوت: "چەند جوانە، چەند جوانە". پاشانیش چەند جار "سوپاس، سوپاس"ی گوت. نەیدەتوانی چاو لەسەر ئاونەکە

هەڵبگرێت، بۆ ئەملاو ئەولای وەردەچەرخاند، دەیخستە بەر رووناکی چراو سەیری دەکرد، لەکاتێکدا پێیهەڵدەگوت، نیشانی هەمووانی دەدا.

"گەورەم، ئەمە دیاری منە بۆ بەڕێزتان".

"هەر بژیت، هەر بژیت".

بێئەوەی چاو لەسەر ئاونەکە هەڵبگرێت بێدەنگ بوو، سەری هەڵبڕی، سەیری چاوەکانی جەعفەری کرد، کە وەك چرا دەبریسکانەوە:

"ئەم ئاونە لەچ درەختێك دروست کراوە؟"

"لەزۆر کەسم پرسیوە، کەس نەیدەزانی لەچ درەختێك چێکراوە".

موسا کازم ئاغا گوتی: "ئەمە لەدارهەرمێ دروستکراوە. ئەم رەنگە سوورە جوانەی ئاونەکە تەنها لەداری هەرمێ بەدی دەکرێت. لەکرێتی ئێمەدا گرانبەهاترین ئاون ئەوانەن کە لەدارهەرمێ دروست دەکرێن".

هیچکەس سەری لەقسەکانی ئەوان دەرنەدەچوو داخۆ قسەکانیان بەڕاستە یان هەر گاڵتە دەکەن.

موسا کازم ئاغا لەگەڵ ئەوەی قسەکانی تەواوکرد، هەستا. پویرازو جەعفەریش هەستان، بەرەو بنەبانی دووکانەکە چوون، ئەو جێیەی کە تەختی خەوتنی لەئاسن دروستکراوی ئاوە زێڕدراوی لێبوون. پاشان هەموو بەنێو هەموو دووکانەکەدا گەڕان. موسا کازم ئاغا تەختەکانو کورسیە نەرمو نۆڵەکانی یەك یەك سەیرکردنو ماوەیەکی درێژ سەیری بەرو پشتی کردن، لەدەوروبەریان ورد بووەوە، بەڵام هیچ قسەیەکی نەکرد، گەڕانەوەو هاتن لەجێگاکانیان دانیشتنەوە. موسا کازم ئاغا کە دانیشت کەوتە بیرکردنەوەو سەری لەبەرخۆی نایەوە. ئەوانی دیکەش تاکو موسا کازم ئاغا سەری هەڵنەبڕی، شتاقیان متەقی نەکرد، هەمووان سەیری ئەویان دەکرد.

"کاکە جەعفەر کوڕم، قەڵەمو کاغەزێك وەرگرە". هەستا "تۆ لەگەڵ مندا وەرە". ئەوانیدیکەش بەڕێزەوە هەستانە سەرپێ.

موسا کازم ئاغا بەدەست ئاماژەی بۆ کردن دانیشنەوە، دانیشتن. دووبارە لەتەك یەکدی بەنێو دووکانەکە رۆیشتن. موسا کازم ئاغا دەیگوتو جەعفەر دەینووسی. زۆریان پێنەچوو کاری نووسینیان تەواو کرد. موسا کازم ئاغا گەڕایەوە لای مێزەکە، ئەوانەی کە دانیشتبوون جارێکی دیکە بەڕێزەوە هەستانە سەرپێ. موسا کازم ئاغا تکای لێکردن دابنیشنو خۆیان سەغڵەت نەکەن.

جەعفەر بانگی هەردوو شاگردەکانی خۆی کرد، گەنجەکان هاتن‌و کورسی، کەناپە، مافوور، لێفە، دۆشەك، مەلافەکان‌و هەموو ئەو شتانەی کە موسا کازم ئاغا دەستنیشانی کردبوون هەڵیانگرتن‌و هێنایانن، لەنێو دووکانەکە، لەجێگایەکی چۆڵدا کەڵەکەیان کردن.

هەمووان پێکەوە هەستان‌و بۆلای شمەکەکان چوون.

موسا کازم ئاغا پرسی: "باشن؟ راتان لێن؟"

بەر لەهەموویان خەیری ئەفەندی گوتی: "زۆر جوانن، زۆر. پیرۆزتان بێت، خێری لێببینن، بەسلامەتی بیبەن‌و سوودی لێوەربگرن".

پویراز گوتی: "زۆر جوانن، هەموویان جوانن".

ئەوانیدیش ئەو قسانەیان دووپات کردەوە.

پویراز چوو لەبەرامبەر جەعفەر دانیشت، کە لەسەر مێزەکە خەریکی حسابکردن بوو. دوای ئەوەی ماوەیەکی باش لەگەڵ جەعفەر خەریکی سەوداو داشکاندنی نرخەکان بوو، هەستا پارەی لەکیسەیەك، کە لەگیرفانی دەریهێنابوو دەرکردو دایە جەعفەر. جەعفەر کەمێك منگەمنگی کردو پویراز دیسان دەستی بردە نێو گیرفانی‌و کیسەکەی دەرهانی‌و دەستی بۆلای جەعفەر درێژ کردەوە، ئەمجارە جەعفەر رازی بوو، پویرازیش بەڕوخسارێکی شاد گەڕایەوە لای موسا کازم ئاغاو ئەوانیدی.

"جەعفەر، شتەکان زوو بگەیەننە ئەسکەلە، بۆ نێو بەلەمەکەی کاك قەدریی، هەر ئێستا ئەو لیستەیش کە بەدەستتەوەیە بدە بەمن". جەعفەر یەکسەر لیستەکەی دایە دەست.

خەیری ئەفەندی‌و موسا کازم ئاغا لەپێشەوەو ئەوانیدی بەدوایانەوە سەریان لەچوار دووکانی دیکەش داو تا ئەوەندەی پێویستیان بوو شتیان کڕی‌و گەڕانەوە لای بەلەمەکەیان. قەدریی بەلەموان هەموو ئەو شتانەی کە ئەوان کڕیبوویان بردبوونیە نێو بەلەم. بێڕاوەستان سواری بەلەم بوون.

هەموو خەڵکی دوورگە بەیانی زوو لەخەو هەستان‌و هاتنە سەر ئەسکەلە، بارەکانیان لەبەلەم داگرت‌و بردیاننە نێو ماڵەکان. بەر لەهەموویان مەلەك خانم، لێنا، سەبیحەو پاشان ژنەکانی دیکەو زەهراو نەسیبە تا عەسر ئەو شتانەیان لەماڵەکاندا رێکخست. ئاوێنەی مایەی پەسندی موسا کازم ئاغاشیان بەیارمەتی یەکدی لەڕۆخ دەرگاکە جێکردەوە.

موسا کازم ئاغا دەوروبەری عەسر هاتەوە ماڵ، چەندین جار ئەمسەر تا ئەوسەری ماڵەکەی گەڕا. جێگای مێزو چەند کورسیەك‌و موبلەکانی گۆڕی، مافوورە بچووکە ئەسپارتیەکەی دانێ کە بیبەن لەژوورەکەی ئەودا رایبخەن.

هـەمووان لـەنێو ماڵـدا دەهـاتن‌و دەچـوون، مـاڵ دەتگـوت غەڵێفـەی مێشـەهەنگە. نیشانچیش لەو کەسانە بوو بەنێو ماڵدا دەهات‌و دەچوو، بێماندووبوون دەهات‌و دەچووو بەحەپەساویەوە سـەیری ژوورەوەو دەرەوەی مـاڵێی دەکـرد. دیمـتری چۆرباچـی پیـاوێکی زۆر دەوڵەمەند بوو، یەکەمین دووکانی ئەو بازاڕەی کە لەخوار کلێساوە دەسـتی پێـدەکرد هـی دیمـتری بـوو. دووکانەکـە پـڕ بـوو لەپارچـە، پـێڵاوو کـاڵای دیکـە کـە لەئـەوڕوپاوە دەهێندران. هـەموو شـتێك لـەو دووکانـە دەسـت دەکـەوت، لەشـیری مـامر بگـرە تـا گیـانی ئـادەمیزاد. لەغەڵێفـەی مێشـەهەنگەوە بگـرە تـا قـولابی ماسـیان، مـاتۆڕی بەلـەم، تـۆڕو کندری تۆڕو قارچکی سپی. دیمـتری چۆرباچـی جگـە لـەم دووکانانـە لەئەسـیناو ڤێنیـزو مارسیاش دووکانی دیکەی هەبوون. جگە لەم شارۆچکە مامەڵەو سـەودای لەگـەڵ عێلاتـی دەوروبەریشدا هەبوو. جگە لەم شتانەش کەشتیگەلێکیشی هەبوون کە لەئاوەکانی دەریای سپی لەهاتوچۆ دابوون‌و تا ئـەمریکا دەچوون‌و دەگەڕانـەوە. دوو بـراو سێ کـوڕو خـزم‌و کەس‌و کارێکی زۆری لەئەمریکا بوون.

سـێیەمین کۆشـکی تەنگـە، هـی دیمـتری چۆرباچـی بـوو. خـەڵکی دوورگـە ئـەوێیان بەکۆشکەکانی دیمتری چۆرباچی ناو دەبرد. کەسانێك هـەبوون ناویـان لـەوێ نـابوو گـەڕەکی چۆرباچی. هەموو چۆرباچیەکان لەگەورە تا بچووك خـاوەنی کەشـتی بـوون، کەشـتیەکانیان لەدەریای سپی کاریان دەکردو دەچوونە ئینگلستان، ئەسکەندەناڤی‌و ئەمریکا.

لەگـەڵ دەسـتپێکردنی جـەنگی یەکـەمی جیهـانی، چۆرباچـیەکان هـەموویان لـەماوەی چەند مانگدا ڕۆیشتن‌و ئەو کۆشك‌و باخچە پڕ گوڵ‌و گوڵزارانەیان جێهێڵا، لەهەموو ئـەو کەسـانەی کـە هاتنــە دوورگـە هیچـکامیان، جگـە لەهوسمــەن، تەنانــەت ئامادەنــەبوون کۆشکەکان ببینن، نەك بیانەوێت تێیاندا نیشتەجێ ببن. ڕەنگبێت لەبەرئـەوەش بووبێـت کە کۆشکەکان کەوتبوونە نێو گوڵ‌و گوڵزاران‌و ئەوە بیترساندبن.

جەعفەر لەمنداڵیەوە لـەژێر دەسـتی دیمـتری چۆرباچـی کـاری دەکـرد. دوایـین کەسـی چۆرباچیەکان کە دوورگەی بەجێهێشت دیمـتری چۆرباچـی بـوو. دیمـتری ڕۆژێـك بـەیانی زوو، وەك هەمیشـە هاتـە دووکـان. جەعفـەرو کاتبـەکان‌و فرۆشـیارەکانی دیکـەش بـەیانی زوو هــاتبوون‌و چــاوەڕێی چۆرباچــیان دەکــرد. چۆرباچــی کــە کەســێکی گاڵتەچــی‌و ڕووخـۆش‌و دەم بەپێکـەنین بـوو، بـەیانی ئـەو ڕۆژە، ڕوخسـاری وەك ژەهـر تـاڵ بـوو. بێئـەوەی سـەیری کـەس بکـات دەرگـای دووکانەکـەی کـردەوەو کلیلـەکانی بـۆلای ئەوانـەی

چاوەڕێی بوون درێژ کرد. دەڕابەکان لەو بەیانیە گورگەمێشە خەڵوەتەدا بەسەرو سەداوە بۆ سەرەوە بردران، هەنیشکەکانی دانەوە سەر مێز، لەپی دەستەکانی خستنە هەردوولای روومەتەکانیو کەوتە بیرکردنەوە، تا رۆژئاوابوو لێوی لێکنەکردنەوە. روخساری وەك بەرد لێهاتبوو.

سەری هەڵبڕیو بەدەنگێکی وەك دەنگی مردووان گوتی: "وەرن منداڵینە جەنگ هەڵگیرسا، ئەم جەنگە جەنگێك دەبێت کە تا ئێستا کەس هاوشێوەی نەبینیوە، من خەریکم رادەکەم. گەرەکمە لانیکەم رۆژەکانی ئاخیری تەمەنم بەئاسوودەیی ببەمە سەر. لانیکەم کە مردم گۆڕێك هەبێت تێیدا پاڵکەوم. ئێمەی عوسمانی شەڕو شۆڕو جەنگەلێکی زۆرمان بینیوە. خوا جەنگ نەکاتە نسیبی هیچ گیاندارێك، مرۆڤ بکوژرێت، باشترە.

چاوی بڕیە ئەوانەی لەبەرامبەری بوون بەڕوخسارێك کە حاڵەتی گریانی هەبوو، گوتی:

"ئێی ی ی، کە ئاوا". بێدەنگ بوو. نیگای کەوتە سەر جەعفەر، بێدەنگ بوو.

"وەرە جەعفەر!"

جەعفەر هەنگاوێك چووە پێش.

"فەرموو".

ئەو دەستە کلیلەی کە لەمێزەکە لەبەردەمی بوو، بۆلای جەعفەری رادا. "ئەمانە هەڵبگرە جەعفەر، تا من دەگەڕێمەوە تۆ دووکان بەڕێوە دەبەیت، مووچەی خۆت وەردەگریت، پارەکان دەبێت باش هەڵبگریت، بەشێوەیەك کە جنۆکەش نەتوانێت بیاندۆزێتەوە. تەنانەت ئەگەر بشتکوژن نابێت شوێنەکەیان بەکەس بڵێیت. کاتێکیش هەموو کاڵاکانی نێو دووکان تەواو بوون، دەڕۆیت لەماڵێ دادەنیشیتو چاوەڕێ دەکەیت تا من دەگەڕێمەوە".

کاتب، یارمەتیدەری کاتبو فرۆشیارەکان هەموویان یۆنانی بوون. رووی لەوان کرد: "ئێوەش گەردنم ئازا بکەن. تا ئەو کاتەی کاڵاکان تەواو دەبن یارمەتی جەعفەر بدەن، رۆژانەی خۆتان وەردەگرن، پاشان دەڕۆن لەماڵەکانتان دادەنیشنو چاوەڕێی گەڕانەوەی من دەکەن. هەر لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگ دەگەڕێمەوە. نامەوێت تەرمم لەولاتی غەریبان بمێنێتەوە".

کلیلەکانی لەسەر مێزەکە هەڵگرتنو بۆلای جەعفەری راگرتن. کاتێك دیمتری کلیلەکانی دانە جەعفەر، یەکەمجار کاتبەکە، پاشان هەموو کرێکارەکانی دیکە بەبێدەنگی ئەوێیان بەجێهێشت.

"بۆ کوێ کوڕینە، بۆ کوێ؟"

کاتبەکە گوتی: "ئێمە هەر لەئێستاوە دەچینەوە ماڵێ".

"هەقدەستی خۆتان لەکاکە جەعفەر وەربگرن".

"ئێمە هەقی خۆمان وەرگرت، دەڕۆین".

دیمتری لەو رەفتارەی ئەوان سەری سوڕما، بەدەنگێکی لەرزانەوە گوتی:

"ئیدی ناتانەوێت لەگەڵ مندا کاربکەن؟"

"نە. نامانەوێت".

"بەخێرو سلامەت".

دوای ئەوەی کە دیمتریماڵەکەی خۆی جێهێڵا و رۆیشت، جەعفەر چەند هەفتەیەکی دیکە لەدوورگە مایەوە.. وەکو جاران، بەرلەوەی خۆر هەڵبێت دووکانی دەکردەوە، دەرابەکانی هەڵدەدانەوەو دەستە کلیلەکەی جرینگ جرینگ وەکو دیمتری هەڵدەدایە سەر مێزە گەورەکە. لەبەیانیەوە تا ئێوارە بەهیوای ئەوەی کڕیارێك بێت، بەملێکی راکشاوو روو لەدەرکی دووکان، چاوەڕێی دەکرد. سێ مانگان ئاوا تێیپەڕاند، هیچ کڕیارێك رووی نەکردە دووکان. دووکانەکانی دیکەی بازاڕیش هەموو داخرابوونو بێدەنگیەك باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشابوو.

جەعفەر، رۆژێك تێبینی کرد لەدووکانی ئاسنگرەکە دەنگی چەکوش نایەت. لەکاتێکدا دەنگی چەکوشی وەستای ئاسنگەر لەبەیانیانەوە تا شەو نەدەپسایەوەو لەهەموو دوورگەدا دەنگی چەکوش دەزرنگایەوە. چ بەڵایەك بەسەر دوورگە هاتبوو؟ هێشتا ماسیگرەکان دەچوونە نێو دەریا. هێشتا ژنانو پیاوان دەچوونە شار. هەمووان بەشێوەیەکی ئاسایی خەریکی کاروباری خۆیان بوون، بەڵام تەنانەت یەك کەسیشیان سەری بەدووکانەکەی جەعفەردا نەدەگرتو شتێکیان لێنەدەکڕی. ئەمە لەکاتێکدا هەر ئەم دووکانە، تا چەند مانگێك بەر لەئێستا بەردەوام جمەی دەهات لەکڕیارو دووکان پڕاوپڕی هەموو جۆرە کاڵایەك بوو، جەعفەر لەبەیانیەوە تا شەو رانەوەستاو مێشو مەگەزی دەردەکردنو دەهاتو دەچوو.

چووە گوند، هەر کەسێکی دەیدی لەبارەی ئەو ڕووداوانەی کە ڕوویاندەدا قسەی لەگەڵدا کردن، لەوشەی جەنگ بترازێت وشەیەکی دی لەهیچکەس نەبیست. دووکانەکەی داخستو لەدوورگەوە چووە شارۆچکە. لەشارۆچکەش قسەی لەگەڵ هەمووان کرد. ئەمجارەش خەڵکەکە تەنها باسی جەنگیان دەکرد، نەیدەزانی چیبکات. ئاوا بێئامانج بەڕێدا دەڕۆیشتو دەهاتو دەچوو، کە تووشی بوو بەخەیری ئەفەندی. خەیری ئەفەندی بەگەرمیەوە ڕووبەڕووی بووەوە.

"وەك بیستوومە دیمتری دووکانەکەی بەتۆ سپاردووە؟"

"متمانەی بەمن کرد".

"تۆی خۆشدەویست. پیرۆزباییت لێدەکەم، خۆشەویستیو هەموو داراییەکانی خۆی داوەتە دەست تۆ. ئەوەی بەتۆی سپاردووە سامانێکی گەورەیە، قەدری بزانە".

"هیچی بەمن نەسپاردووە".

"ئەدی چیکرد؟"

"ئەو کاتەی کە کلیلەکانی دانە دەستی من گوتی کەلوپەلەکان دەفرۆشیت، هەمووی لەدەفتەردا دەنووسیت. پارەکانیشم لەجێگایەکی باش بۆ هەڵدەگریت. جێگایەك کە هیچکەس نەتوانێت زەفەریان پێبات. گوتی هەقی خۆشت مانگانە هەر لەو پارانە دەگێڕیەوە. گوتی هەر کە گەڕامەوە حسابت لەگەڵدا دەکەم. لەو کاتەوەی ئەو ڕۆیشتووە نە هەقدەستی خۆم هەلگرتووەو نە هیچشتێك".

"بۆچی هەڵتنەگرتووە؟"

"هیچشتێکم نەفرۆشتوە. لەو کاتەوەی ئەو ڕۆیشتووە هەموو بازاڕ راوەستاوە. تەنانەت نەمتوانیوە دەرزییێکیش بفرۆشم".

خەیری ئەفەندی هەنیشکەکانی دانانە سەرمێزو دەستەکانی خستنە بناگوێی، دوای ئەوەی ماوەیەکی درێژ بیریکردەوە، چاوی بڕیە نێو چاوەکانی جەعفەرو گوتی: "نە، ئەو پیاوە زۆر تۆی کەوتە بەردڵ، تۆی لەجێی کوڕی خۆی دانا. باش گوێ لەقسەکانم بگرە، ئەو دووکانەو کۆشکەکەی دوورگەو ئەم عەمبارە پڕ شمەکەی ئێرە هەمووی هی تۆن، هۆشی خۆت کۆبکەوە. ئەم هەموو کەلوپەلانە هی تۆن".

"هی من نین. کاتی ڕۆیشتن پێیگوتم دەگەڕێمەوە. تەرمم، بەڵێ خۆی گوتی نابێت تەرمم لەغەریبایەتی بمێنێتەوە، دەگەڕێمەوە، لەدوورگەی خۆم دەمرمو لەخاکی خۆم لەتەك گۆڕی باوكو باپیرو گۆڕی دایکم دەبێت بنێژرێم".

"ئـەم شـتومەكو داراييانـە هـی تـۆن. گـوێ بگـرە چـیت پێـدەڵێم، بـاش گـوێ بگـرە. دووكانەكەی دوورگە بگوازەوە بۆ ئێرەو ئەم عەمبارە بكە بەدووكان. ماڵەكەشت دێنیت. لەمڕۆ بەدواوە لـەوێ كـار ناكرێت. كڕیـاری كاڵاكـانی دووكانەكـەی دوورگـە لـەم شـارانەی لێـوار دەریـان. ئەوانـەی كـە بـۆ كـڕینو فرۆشـتن لەئەسـتەنبولو ئـزمیر بورسـاوە دێـن. تەنانەت منیش، دەزانیت، بۆ كڕینو مامەڵەی گەورە دەچوومە دوورگەكـەی ئێـوە. ئـەوان بەكەشیتەكانیان دەگمەنترینو تایبـەتترین كاڵایـان لەئـەمریكاو ئـەوروپاوە دەهێنـا، تـۆش دەزانیـت كۆشـكی وەك كۆشـكەكانی ئـەوان، كـە لـەنێو ئـەو بـاغو گـوڵو گوڵزارانـەی وەك بەهەشـت دان، لەئەسـتەنبولو ئـزمیرو بۆرسـاش نـین. تـۆ كاڵاكانـت تـا زووە بگـوازەوەو بیانهێنە بۆ ئێرە، عەمبارەكەش وەك پێمگوتی بكە بەدووكان. كـەمیش بێـت، بەهـەرحاڵ كەسانێك هەردەبن بیانكڕن، وردە وردە فرۆشتنو بازاڕت زیاد دەكات. پیرۆزت بێـت. خـوا بەختەوەرت بكات، نانی رەنجی خۆت بخۆیت".

چـاوەكانی جەعفـەر لەخۆشـیان بریسـكەیان دەدا. خـەیری ئەفەنـدی دەیویسـت چـی بڵێـت، چۆرباچـی ناگەڕێتـەوە. ئـەو بـۆ دوور دوور، بـۆ ئـەمریكا رۆیشـتووە. ئـەمریكا لەوبەری دونیایە.

لەپڕ روخساری جەعفەر شـین هەڵگـەڕا، ملـی لار بـووەوە. ئەمـە لەبەرچـاوی خـەیری ئەفەندی شاراوە نەبوو.

"چیبووە، جەعفەر، شتێك بووە؟"

جەعفەر گوتی: "هیچ نەبووە". هەستایە پێ.

"راوەستە جەعفەر مەڕۆ، جارێ دانیشە".

چەكمەچەی بەردەمی راكێشا.

"تۆ پارەت نیە، دیمتری لەو رەوشەی خۆیـدا نەیـدەتوانی پـارەت بـۆ بـەجێبێڵێت. ئـەم پارانە بگرە!"

پارەكانی دانانە بەردەم جەعفەر.

جەعفەر هەستا دەستی خەیری ئەفەندی گرتو ماچیكردو داینایە سـەر نێوچـاوانی. هەموو گیانی دەلەرزی، بەدەستی لەرزۆكەوە پارەكانی وەرگرتو خستیە گیرفانیەوە.

"دانیشە كوڕم، دانیشە جەعفەر، لێرە مامەڵەی خۆت دەكەیت. منیش یارمەتیت دەدەم".

"جەنگە".

"باشه. با قیامەت بێت. ئەم دونیایە قەت پیاوی بێپارەی لێنابڕێت".

جەعفەر لەماوەی دوو رۆژدا هەموو کاڵاکانی بۆ شارۆچکە گواستەوە. دوای چەندین مانگ هەوڵو تەقەللا، عەمبارەکەی گۆڕیو کردیە دووکانێکی جوانو فرۆشو بازاڕەکە ئەگەرچی هێواشو لەسەرخۆ دەستی پێکرد. رۆژ بەرۆژ رەونەقی زیاتری بەخۆوە گرتو گەشەی کرد. جەعفەر کەوتبووە جموجوڵو جۆشوخرۆشەوە، بەڵام داخوازیەکانی دیمتریی وەك چۆن ئەو گوتبووی جێبەجێ دەکرد. ئەو پارانەی کە دەهاتنە دەستی لەجێگایەك کە عەقڵی جنو پەریش پەی پێنەبەن، قایمی دەکرد. پێشتریش هەقی خۆی لێدەگێڕایەوە. چەندین مانگ تێدەپەڕین. وردە وردە کارو بازاڕ زیاتر برەوی دەسەند، بەڵام جەعفەر عەقڵی پێدانەدەشکا هەقدەستی خۆی زیاد بکات.

لەرۆژانی مامەڵەکردندا، یۆنانیەکانی گوندو شارۆچکەکانی دەوروبەر، کاڵاو شمەکەکانی خۆیانیان بۆ جەعفەر دەهێناو بەنرخێکی هەرزان پێیاندەفرۆشت.

کاتێك ئەوان لەشارۆچکە گەڕانەوە، نیشانچی هاتە ژێر چنارەکانو لەولاتر قیتو قۆز راوەستاو بێئەوەی قسەیەك بکات سەیری پویرازی کرد.

کەمێك دواتر پویراز گوتی: "فەرموو نیشانچی، بۆ لەوێ وەستاوی؟"

نیشانچی بێئەوەی هیچ وەڵامێك بداتەوە گەڕایەوەو بەرەو لای قامیشەڵانەکە رۆیشت.

"ڤاسیلی، نیشانچیت بینی؟"

"بینیم".

"سبەی، زوو کاتێك دەریا هێشتا سپیە دەبێت وەڕێبکەوین، قەدریی بەلەموان..".

"ئامادەم سەرۆك. سبەی لەکاتی دەریا سپیە... لەپاش یۆنانیەکان بەلەمی ماتۆڕدار، بەلەمو ماتۆڕێکی زۆر بۆ دێهاتەکانی لێوار بەجێماون.

زۆربەی ماتۆڕەکانیش هی ئەوانەن کە ماسیگر نەبوونە، زۆربەشیان دەیانزانی کە ناگەڕێنەوە".

قەدریی بەلەموان، کاتێك دەریا هێشتا سپی بوو ماتۆڕەکەی خستەکار، هەوا خەریکبوو رووناك دەبوو کە ئاوڕیان لەدوورگە دایەوە، دوورگە ئیدی بەچاو نەدەبیندرا. بەلەم بەرەو لای رۆژئاوا بەخێرایی کەوتە جووڵە.

"چیبووە بەلەموان، ناچینە شارۆچکە؟"

"سەرۆك، لەو خوارە، گوندێکی گەورەی یۆنانیەکان هەیە کە هەمووشیان ماسیگرن، زۆر لەیۆنانیەکان بەلەمە ماتۆڕدارەکانیان بەو دێهاتیانەی کە جێی متمانەیانن، سپاردووە. لەگوندەکانی لێوار تا بتەوێت بەلەم هەیە".

دەوروبەری عەسر هاتنو لەئەسکەلەی گوندەکە لەنگەریان گرت. نزیکەی هەموو خەڵکی گوندەکە لەئەسکەلەی گوند پێشوازیان لێکردن. یەکەم، عەلی چاوەشی قاچ تەختە گوتی: "بەخێر بێن!"و پاشان ئەوانیدیش. عەلی چاوەش ئەوانی لەگەڵ خۆ بردە مەیدانی گوند. لەنێوەڕاستی مەیدانەکە درەختێکی گەورە هەبوو، کە ئەگەر سێ کەس دەستی یەکدیان گرتبا بەدەوری درەختەکە دەستیان نەدەگەیشتەوە یەك. لەکانییی ژێر چنارەکە، ئاوێکی بەخوڕ دەردەبووو بەنێو پوونگە گوڵ وەنەوشەییەکاندا رەت دەبوو بەرەو دەریا شۆڕ دەبووەوە.

گوندەکە تا بڵێیت جوان بوو، نزیکەی هەموو خانووە لەتەختە دروستکراوەکانی گوند رەنگ کرابوونو لەبەردەم هەر خانووێکدا باخچەیەکی پڕ لەگوڵ هەبوو.

لەفنجانی زارکگەورەی کە هێڵی سووریان بەنێو قەددا کشابوو، قاوەیان هێنا.

عەلی چاوەش گوتی: "سێ بەشی خەڵکی ئەم گوندەی ئێمە یۆنانی بوون. بەڕۆیشتنی ئەوان ئێرە چۆڵ بوو. لەجێی ئەوان ئەو تورکانەیان هێنا کە لەیۆنانەوە هاتبوون. ئەوانیش کە هاتن خۆیان لەکونجی ژوورەکاندا زیندانی کردووەو بەهیچشێوەیەك نایەنە دەرێ. تورکەکان دەمێکە هاتوون، هێشتا روخساری هیچیانمان نەبینیوە. گوند وەك چۆن بەر لەهاتنی ئەوان چۆڵ بوو، ئێستاش هەر چۆڵە. تەنانەت منداڵەکانیش پێ ناخەنە نێو گوند. تەنانەت یەك کەسیشیان نەهات لەسەر تەختەی ژێر دارچنارەکان دابنیشێت. لەهەموو دونیا تۆراون، کەس نازانێت چی دەخۆن، چی دەخۆنەوە. بارودۆخی دوورگەی ئێوە چۆنە؟"

"هیچ کۆچبەرێك دوورگەی ئێمەی پەسند نەکرد، هەرکەسێك دێت ئاوا سەیرێکی دەکات، پاشانیش یەکسەر سواری بەلەم دەبێتەوەو وەك ئەوەی لەنێو ئاگر رابکات، دەڕواتو ئاوڕیش لەدوای خۆی ناداتەوە".

"ئەو کەسانەی لەوشکانیدا دەژین، لەدوورگەکان دەترسن".

پویراز گوتی: "دەترسن".

باسێك سەبارەت ئەوانەی لەوشکانیو لەنێو دوورگەدا دەژین هاتە گۆڕێ. گەنجێك لەبەرانبەر عەلی چاوەش راوەستا، داهاتەوەو هەندێك شتی چرپاندە گوێی ئەوەوە.

عەلی چاوەش گوتی: "خواردن ئامادەیە، فەرموون بابچینەماڵەوە".

"وای عـەلی چـاوەش، ئێسـتا کـەی وەختـی نانخواردنـە، ئێمـە کارمـان پێتـە، تـا شەو دانەهاتووە".

"من لەخزمەتم هاوسایە".

پـویراز موسـا، مەسـەلەی بەلەمـەکانی زۆر بـەکورتی لەگەڵـدا باسـکرد. بەلـەم زۆرە، بەلەم زۆرە، ئەوەندە زۆر کە نازانین چییان لێبکەین.

بەلەمـەکانیش ئـاخر دواجـار وەکـو کچـان قـەیرە دەبـن. زۆربـەی ئـەو دراوسـێیانەی دەڕۆیشتن ماسیگر بوون، بەڵام ئێمە کشتکارین. ئەوان ماسی، هێلکە ماسی، دوودەماسی، شۆراوو وردەماسی خوێ لێدراویان دەدایە ئێمەو ئێمەش کەرە، ماست، شیر، لۆبیا، نـۆك، نیسك، گەنم، کاڵەك‌و شووتیمان دەدایە ئەوان. ئێستا هەستن بابچین بەلەمەکان ببینین".

هـەموو پێکـەوە بەخۆشـحاڵیەوە هەسـتان، عـەلی چـاوەش لەخۆشـحاڵیان دەستەپاچـە بووبوو، کاتێك خـەریکبوون بـەنێو مـاڵی کۆچـبەرە تـازە هاتووەکانـدا رەت دەبـوون، عـەلی چاوەش گوتی: "سـەیر بکـەن، هـیچ بنیادەمێـك‌و هـیچ دەرگایـەکی کـراوە دەبیـنن؟ سـەیر بکەن سەیری ئەم درەختانە بکەن، بزانن باڵندەیەك دەبینن کە ئاوازێك بخوێنێت؟"

"ئەمانە چوونەتە کوێ؟"

"لەماڵەکانیانن".

"سەیرە".

"تۆراون. ئەمانە لەدونیا تۆراون".

"چی دەخۆن، چی دەخۆنەوە؟"

"دیار نیـە. ئـەو رۆژەی کـە هـاتن ئێمـە خێـرا خواردنمـان بـۆ لێنـان، لەهـەر ماڵێکمـان چـەند جـۆرە خواردنمـان بـۆ ئامـادەکردن‌و بۆمـان بـردن. هـەر هـیچ، هـەر هـیچ روویـان نەداینێ، تەنانەت وشەیەکیان لەگەڵ باس نەکردین. چووین خوانچەو قاپ‌و مەنجەڵـەکان وەربگرینەوە، بینیمان هیچ دەستیان لەخواردنەکان نـەدابوو. حەپەساین. ئیـدی چـاومان پێیانەکەوتۆتەوە. سەرمان لێیانسوڕماوە".

"منیش سەرم سوڕماوە".

دوورخستنەوەی خەڵك لەزێدو نیشـتمانی خـۆی سـتەمە. بەهـەرحاڵ وەك ئـەوە وایـە دڵی مرۆڤ لەسنگی هەڵکەنیت، ئەمانەش تۆراون.

چیبلێم، بەڵکو جنۆکەیان هەبن و شەوان لەیۆنانەوە خواردن و خواردنەوەیان بۆ بێنن! ئینشاللاّ تا زووە لەو رەوشە ماندوو دەبن و وەکو ئێمە دێنە نێو خەڵك. ستەمکاریە".

پویراز گوتی: "ستەمکاریە، ستەمێکی گەورەیە".

"ئەگەر دەتەوێت سەبارەت بەقاچە دارینەکەم شتێك بزانیت، ئەوە لەچاناك قەلاّ بڕایەوە. لەپڕ هەموو دونیام لەبەرچاوان تاریك بوو. سەیرمکرد، لاقم لەسەرووی ئەژنۆمەوە پەڕیوە. تۆرام و خەفەتم خواردو ئاوا مامەوە. پاشان سەیرمکرد، کەمێك بیرمکردەوە. گوتم چۆن بەڕێگادا بڕۆم؟ سەیرمکرد، تۆرام، سەیرمکرد، شەو تەواو بوون، خۆرهەلاّت، سەیرمکرد، رووی دەریای چاناك قەلاّ ساف ساف و کشوماتە. کەشتیە زرێدارەکانی ئینگلیز چووبوونە ژێر دەریاوە. گەڕامەوە بۆ گوند. لەبەیانیەوە تا شەو تاریك داهات لەدەرەوەی گوند چاوەڕێ مامەوە.

پاشان، بەبێدەنگی چوومەوە ماڵێ. بەماڵەوەم گوت دەنگ مەکەن، من نەهاتوومەتەوە ماڵ. دەبێت خۆم قایم بکەم. تا ئەو رۆژەی دەمرم نامەوێت روخساری ئەو مرۆڤە پیسانە ببینم. سەیرمکرد، لەهەموو شتێکی ئەم دونیایە تۆرام، هەتا لەگەڵ زیندەوەرەکانیش، لەگەڵ سەگ و گورگەکانیش، ئەمانەش رۆژێك....".

عەلی چاوەش ئاخێکی هەڵکێشا.

هاتنە نێو دەربەندە بچووکەکە، بەلەم و بەلەمی ماتۆڕداری گەورەو بچووك لەسەر لێ لێوارەکانی گوند ریز کرابوون. عەلی چاوەش بۆلای بەلەمێکی ماتۆڕدار چوو، کە نوێ نوێ بووو خەتی شینی تێدابوون، گوتی ئەمەیە، سەیری بکەن، بڕۆنە سەرەوەو ناوەوەشی ببینن. قاچی راستی هێندەی قاپۆری درەختێك دەبوو. بەو سەنگینیەوە دلّتەنگ بوو. خۆ دەنا دونیا پڕی کەسانی شەل و گۆجە. ئەم دونیایە بووبووە دونیای شەل و کوێران. خریستۆ زۆر قسەی لەگەڵدا کرد. مەگەر شەلبوون و کوێربوون چیە، ئەم قاپۆرە لەجیاتی قاچ ئەگەر سەنگین نەبێت، ئەگەر خریستۆ نەبوایە، عەلی چاوەش ئێستاش لەماڵێ کەوتبوو. ئێستاش چاوی بەخۆر نەدەکەوت. زۆر خراپ تۆرابوو. بەجۆرێك کە رەگی سۆزداریی دڵی پچڕابوون. هیچ بەبیری نیە کە خریستۆ چۆن و بەچ زمانێك ئەوی هێناوەتەوە نێو خەڵك. ئەگەر ئێستا کەسێکی وەك خریستۆ لەگوند هەبوایەو شارەزایی خولّق و خووی ئەو ئاوارانە بووایە، لەچاوترووکانێکدا، لەکونجی ژوورەکانی دەردێنان.

رۆیشتن لەرۆخ بەلەمەکە راوەستان، ماوەیەکی درێژ بەدەوریدا سووڕانەوە، پاشان سواربوون، بەلەم بەلەمێکی نوێ نوێ بوو، دەستنەخوردە. زۆریان کەوتە بەردڵ.

عەلی چاوەش گوتی: "نە، ئەو بەلامانەی دیکەش یەك یەك سەیر بکەن، بەڵکو بتوانن دانەیەکی باشتر بۆ نیشانچی بدۆزنەوە".

دەستیانکرد بەگەڕان، یەك بەیەك بەلەمەکانیان پشکنی. کە هەوا تاریك داهات گەڕانەوە لای عەلی چاوەش.

"هەموویان بۆ فرۆشتنن؟"

"بۆ فرۆشتنن".

"بۆچی هەموویان دەفرۆشن؟"

"چونکە هیچکامیان خاوەنەکەیان ماسیگر نیە".

گەڕانەوە گوندو لەژێر چنارەکە دانیشتن. مێزێکی گەورەو چەند کورسیەکیان هێنا دایاننایە ئەو نێوەڕاستە. قاپ قاپ خواردن هات. فانۆسێکی پلیتەدار بەلکێکی گەورەی دارچنارەکە ئاوێزان کرابووو ئەم نێوەی بەتەواوی رووناك کردبووەوە.

لەکاتی نانخواردندا شتاقیان متەقی لەبەر نەهاتەدەر.

عەلی چاوەش‌و خریستۆ پێکەوە لەچاناك قەڵا گەڕابوونەوە. ژمارەی ئەو سەربازانەی کە لەچاناك قەڵا گەڕابوونەوە زۆر کەم بوو. خریستۆ لەشەڕی چاناك قەڵا دەستی چەپی خۆی لەدەست دابوو. ئەویش وەکو نیشانچی ماسیگرێکی شارەزابوو. بەتاکە دەستێکیشی لەقولابو تۆڕهەڵدان‌و لێخوڕینی بەلەمدا لەهەمووان باشتر بوو. بەر لەجەنگ تاکە کەسێك کە لەهەمووان باشترو زیاتر مشارماسی بەنێزە راو دەکرد خریستۆ بوو. خریستۆ هەم دراوسێی عەلی چاوەش بووو هەم برادەرێکی گیانی بەگیانی ئەو بوو.

"بەلەمە نارنجیەکەش دەکڕین".

"باشە، با بۆ ئێوە بێت".

"نرخی چەندە؟"

"نرخ‌و مرخی نیە، هی خۆتانە".

"هیچ پارەی لەجیاتی وەرناگریت؟"

"هی خۆتانە".

"کەسێکی چەند سەیری عەلی چاوەش".

"هی خۆتانە".

"ئاشکرایە لەدونیا تۆران‌و بەساڵان خۆ لەکونجی ماڵەوە نانت بێهوودە نەبووە".

"بەسالأن کە نا، هی خۆتانە".

"سەیریت، چۆن پارە وەرناگریت؟"

"خریستۆ هیچ کات بەم بەلەمە نەچووە دەریاو راوەماسی. ئەگەر ببیستێت بەلەمەکەیمان داوەتە ماسیگرێکی وەك نیشانچی، زۆر خۆشحاڵ دەبێت".

"بۆچی خریستۆ هیچ نەچووە دەریا؟"

"چونکە نەیتوانی".

ئەو کاتی خریستۆ چوو بووە سەربازی، ژنەکەی کە بێپارەو بێیارو یاوەر مابووەوە، بۆ ئەوەی کە منداڵەکانی برسی نەمێننەوە ئەو بەلەمە ماتۆڕدارە جوانەی بەنرخێکی زۆر هەرزان بەچێشتلێنەرێکی ئزمیری فرۆشتبوو. خریستۆ کاتێك لەچاناك قەڵا گەڕایەوە، دوای ئەوەی کە بەبەلەمی برادەرەکانی لەم دەوروبەرانە ماسیگری کردو هەندێك پارەی کەوتە دەست، رێگای دەریای رەشی گرتەبەر، دوای چەند مانگ بەم بەلەمە نارنجیەوە گەڕایەوە. هەموو رۆژێ بەر لەوەی خۆر هەڵبێت، دەچووە دەربەندی بچووك، لەلێوارەکە دادەنیشتو تا شەو دادەهات سەیری بەلەمەکەی دەکرد. خریستۆ بووبووە عاشقی بەلەم. ئەگەرچی خۆی بەلەمی هەبوو، کەچی بەبەلەمی برادەرەکانی دەچووە راوەماسی. هەم خۆی پارەی دەست دەکەوتو هەم ئەو خاوەن بەلەمانەشی دەکردنە خاوەن پارە. لەو سەروبەندەدا دەنگۆی گۆڕینەوە هاتە گۆڕێ. دێهاتیەکان گوتیان وای ئەم گۆڕینەوەیە ئیدی چیە!. عەریفی پاسگاکە رەوشەکەی بەوردی بۆ روون کردنەوە. بۆ ئەوانەی لەقسەکانی دەگەیشتن دووجار سێ جاری بۆ باس دەکردنو روونکردنەوەی زیاتری دەدانێ.

عەلی چاوەش، کاتێك ئەمە تێگەیشت بەپەلە خۆی گەیاندە ناحیە. دەنگی قاچە دارینەکەی عەلی چاوەش لەنێو فەرمانگەی ناحیە ئەو ناوەی پڕکردبوو. بەڕێوەبەری ناحیەش بەبیستنی دەنگی قاچە دارینەکەی عەلی چاوەش لەژوورەکەی هاتەدەر، کە عەلی چاوەشی بینی تووڕەییەکەی نیشتەوەو گوتی:

"فەرمووو عەلی چاوەش". عەلی چاوەش بەتووڕەییەوە چووە ژوورێ، لەسەر کورسی بەرانبەر مێزی بەڕێوەبەری ناحیە دانیشت، قاچی درێژکردو داینایە سەر رووکەفە دارینەکەی ژووری بەڕێوەبەر، بەشێوەیەك کە ئەو ناوە لەرزی.

"قاوەیەك، عەلی چاوەش".

"پێویست نیە بەڕێز".

"چتە عەلی چاوەش، شەلالی عەرەقەی، چیبووە؟"

"ئیدی دەتەوێت چ ببێت بەڕێز، دەیانەوێت خریستۆش دووربخەنـەوە، ئەمـە نـاتوانن بەڕێز. هیچکەس ناتوانێت خریستۆ لەنیشتمانەکەی دوور بخاتەوە.

دەستی چەپی لەچاناك قەلا بەجێما. لێنەگەڕێیت دڵیشی لێرە بەجێ بمێنێت".

"بۆچی عەلی چاوەش؟"

"چونکە ئەو باشترین ماسیگری ئەم ئاوانەیە. دونیا تـا ئێسـتا ماسـیگرێکی وەك ئـەوی بەخۆیەوە نەبینیوە".

"چیبکەم، یاسا".

عەلی چاوەش هەستا، بەتووڕەییـەوە قاچـەدارینەکەی بەرووکەفـە دارینەکـەی ژووری بەڕێوبەرەی ناحیە کێشا، بەچەشنێك کە لەدەرەوەش دەنگی هات.

"یاسا، یاسا! دەستێکی لەچاناك قەلا بەجێما، لەگەڵ ئەم قاچەی من، لـەئانافار تالاهـا.. ئەمە یاسایە؟"

ڕۆیشتن. لەکاتێکدا قاچی بەتوندی بەرووکەفە دارینەکـەدا دەکێشـاو تـووڕەیی هـەموو گیانی داگرتبوو، لەژوورەکە چووەدەر.

بەڕێوەبەری ناحیـە ددانـی لەسـەر یـەك گیرسـاندن‌و دەمـی کـردەوە: "ئـای ی ی، عـەلی چاوەش، ئەگـەر تـۆ، لـەئانافار تالاهـا لـەژێر فـەرمانی فەرمانـدەی گـەورە نەجـەنگابوایت، بەرازی شەل، پشتم دەشکاندیت. ئا ی ی عەلی چاوەش ئا ی ی. "ددانی جیڕ دەکردنەوە.

عـەلی بەهـەمان تووڕەییـەوە هاتـەوە گونـدو چـووە مـاڵی خریسـتۆ "بۆچـی ئەوەنـدە تووڕەیت؟ ئاوا شەلالی عەرەقی، لەکوێوە رادێیت؟"

"لەناحیە دێمەوە. خەریکە دەڕۆن. خەریکن دوورتاندەخەنەوە بۆ یۆنـان، بەهـەمووان بڵێ هەرچی ماڵو موڵك‌و شتومەکی هەیانە بیفرۆشن. تۆش بیانفرۆشە".

"مشتومڕێکی گەرمیان کەوتە نێوان".

خریستو هیچ قسەیەکی نەدەکرد جگە لە"من ناچمە هیچ جێگایەك".

ئەم مشتومڕەی عەلی چاوەش‌و خریستۆ چەندین مانگ درێژەی کێشا. خریسـتۆ نـەك هەر بەلەمەکەی، تەنانەت دەرزییێکیشی نەفرۆشـت. کـە وادەی دوورخسـتنەوەکە گەیشـت، هەرچـۆنێك بـوو عـەلی چـاوەش کـامیۆنێکی پەیـداکرد، خریسـتۆی بەکەلوپەلەکانیـەوە سواری کامیۆنەکـە کـرد، بەخۆشـی سـواربوو، چوونە ئـزمیر. خریسـتۆ کاتێـك منداڵـەکان بەکەشـتی وەرێدەکـەوتن گـوتی "چـاوەش، چـاوەش، عـەلی چـاوەش، نیگـەران مەبـە. زوو دەگەڕێینەوە. هەرچی لـەوێ هەمـە هـی تۆیـە. بەلەمەکـەش بـدە بەماسـیگرێکی شـارەزا،

هـیچ پـارەی لێوەرمـەگرە، هـیچ. ماسـیگرێکی بـاش... زوو دەگەڕێمـەوە زۆر زوو. کـەس ناتوانێت من لەگوندەکەم دەربکات، هیچکەس، هیچکەس".

بەڕۆیشتنی ئەوان گوند چۆڵ بوو. کاتێکیش کە ئەم ئاوارانە هاتن... دیسان چۆڵتر".

"نیشانچی بنێـرە بابێتـەوە، هـەر کـامێکی پێبـاش بـوو بابیهێنێتـەوە. هـەموو بەلـەمو ماڵو دارو نەداریان بەدراوسێکانیان سپاردو رۆیشتن.

تـا دوایـین سـاتەکان باوەڕیـان نـەدەکرد دووریـان بخەنـەوە. چـەند باوەڕیـان نـەدەکرد دوور بخرێنەوە، ئەوەندەش پێیانوابوو دەگەڕێنەوە. قبوڵمە، سبەی، دووسـبەی بەلـەمێکی نارنجیو بەلەمێکی شین. پـارەو مـارە وەرنـاگرم. نـە، نیشانچی ئەگـەر بەلـەمێکی دیکـەی بەدڵ بوو ئەوسا بیرێکی بۆ دەکەینەوە".

سواری بەلەمەکانیان بوون. خۆشحاڵ بوون.

بەلەموان هەندری ماتۆڕەکەی راکێشا. ماتۆڕ بەسێ سووڕانەوەی دندانەکانی، کەوتەکار.

"راتان چیە کوڕینە؟"

"عەلی چاوەش لەسەر هەقە".

"تۆ دەتوانیت لەگەڵ نیشانچی بێیتە گوندو کەمو کوڕیەکانی بەلەمەکە چاك بکەینەوە؟"

"دێم سەرۆك پویراز".

پـویراز لـەکونجێکی بەلەمـدا دانیشـت، دەسـتەکانی خسـتنەژێر چـەناگەیو چـووە بیرکردنـەوە، بەچەشـنێك کـە وەك بڵێیـت لـەوێ، لـەنێو بەلـەمیش نـەبێت. بـەر لەخۆرئاوابوون گەیشتنەوە دوورگە. نیشانچی لەئەسکەلە چاوەڕێیان بوو.

پویراز لەبەلەم دابەزیو گوتی: "مژدە، باشترین بەلەمی ئـەم دەریایـەمان پەیـدا کـرد، هـیچ کـاری نـەکردووە. ئەگـەر ئـەم بەلەمەشـت بـەدڵ نـەبوو، دەریـا پڕیـەتی لەبەلـەم. هەموویان ببینەو کامەیانت کەوتە بەردڵ ئەویان بێنە".

"سوپاست دەکەم پویراز. سوپاس سەرۆك".

"چیبووە نیشانچی، شتێك روویداوە؟"

نیشانچی لەبەرئـەوەی ئـەوان لەبـەرخاتری ئـەو، ئـەو هـەموو زەحمەتـەیان کێشاوەو چوونەتە ئەو گوندە، باش نەبوو بەهەواڵێکی ناخۆش پێشوازیان لێبکات، دوو دڵ ما".

"نیشانچی دوای رۆیشتنی ئێمە رووداوێکی خراپ لەدوورگە روویداوە؟"

نیشانچی ورتـەورتێکی لـەژێر لێـوەوە کـرد، کـە پـویراز هیچی تێنەگەیشت. "شـتێکی خراپ بەسەر موسا کازم ئاغـا هـاتووە یـان دایکـە لێنـا؟ نـەکا رووداوێکـی نـاخۆش بەسـەر نەوەکانی تۆ هاتبێت؟"

"نـه، نـه، ئـەو شـتانە نیـە، ئـەوان هـەموویان باشـن. هەمووشـیان چـاوەڕوانن. ئـەوان گشتیان باشن، بەڵام...".

"بەڵام چی؟"

"ئەو گەنجە کە دار شەقەی بەبن هەنگڵەوە بووو گەنجەکانی دیکـەو چـوزانم. هـەموو ئەوانەی خـەیری ئەفەندی پارەی بۆ لەحکومەت وەرگرتن، تـۆش بـەو پارەیـە جلوبـەرگ‌و پێڵاوت بۆ کڕین، هەر ئەوانە".

"چیانلێهاتووە؟ مەیشارەوە".

"نایشارمەوە، هـەر ئەوانـەی کـە نـوێ نوێت کردبوونـەوە. تەنانـەت پـێڵاوت کردبـووە قاچە شەلەکانیشیان، چەند خواردو خۆراکیش. چەندین ماسیمان بـۆ گرتبـوون، زۆربـەی ماسیەکانیش ئەوانە خواردبوویان".

"بەڵام تۆ خەریکی هەواڵەکە دەپێچیتەوە ها، چیانبەسەرهاتووە؟"

"بەلەمێك هات، یەکەمجار شەلەکان، پاشانیش هەر کەسێکی کە هاتبووە دوورگە...".

"ماشەللا هەر درێژەی نادەیتێ!"

"سـواری بەلـەم بـوون‌و قوونیـان کـردە دوورگـەو ڕۆیشـتن‌و ئاوڕیـان لـەدوای خۆیشیان نەدایەوە".

ڕەنـگ بەڕوخسـاری پـویرازەوە نـەما، بتـەوێت یـان نـا لێوەکـانی کەوتنـە لـەرزین. نیشانچی تێبینی ڕەوشی پویرازی کردو بەپەلە گوتی:

"لەو کەسانەی کە هاتبوونە دوورگە تەنها موسا کازم ئاغا مایەوە".

پویراز بەبزەوە گوتی: "ڕۆیشتن بەسڵامەت. جا ئەوان بەکەڵکی چیدەهاتن؟"

"دەیانتوانی ماسی بگرن. ڕاوەماسی کارێك بـوو تایبـەت بـەوان. یـانی ئـەو شـەلانە کـە بەدانیشتنەوە بـەقولاب ماسـی دەگـرن، وەسـتای ڕاوەماسـین. کوێرەکـانیش وەهـان، کـوێرو شـەلەکان کەسـانێکی لەشسـاغن، تـازە کوێرەکـان نـەك هـەر دەم لێـدانی ماسـی هەسـت پێدەکەن، بەڵکو تەنانەت ئەگەر ماسی بەتەنیشت قولابیش ڕەت بێت هەستی پێدەکەن".

پویراز دیسان بزەیەکی هاتێ:

"ئەمجارە هەرچەندەی کوێرو شەل بهێنە دوورگـە لێناگـەڕێین بێکـار بـن. سـەیر بکـە نیشانچی، دەزانیت بەلەمە نوێ نوێ‌و تەڕوتازەکەت چ ڕەنگێکە؟"

"چ ڕەنگە؟"

"نارنجی".

# بەشی شەشەم

نیشانچی لەو رۆژەوەی کە ئەوان رۆیشتن، بەیانیان، دەچووە ژێر چنارەکان، لەسەر تەختەکان دادەنیشت، چاوی دەبڕیە دوور دوورو چاوەڕێی دەکرد.

دەیویست لەگەڵ هێنانی ئەو بەلەمە کە بڕیار بوو بۆی بێنن، ئەوەیان نیشان بدات کە چیان لەگەڵ دەکات. چ راوەماسییێك دەکاتو چۆن پێیان نیشان دەدات ماسیگرتن چ جۆرە کارێکە. کێ دەزانێت ئەم ژێر دەریایانە چەندە ماسیان تێدایە، چەند زۆر! هەر یەکێکیان پارچەیەکە لەهەتاوو رۆشنایی، هەزارو یەك تۆپەڵی رۆشنایی خۆر کەوتۆتە سەر قەوزەکانو ژێر دەریاکان نوقمی نێو نوورو رۆشناییە.

ماڵەکەی وەك ماڵی موسا کازم ئاغا بەشێوازێکی جوان دروست دەکات، لەنێو ماڵدا نەخشو نیگارگەلێکی زۆر هەن. دەچێتە شارۆچکەو بەدوای باشترین بەرگدرووی شارۆچکەدا دەگەڕێت. داوای لێدەکات جوانترین جلوبەرگی بۆ بدورێت. جوانترین پێڵاوی قەیتانـدارو گۆرەوی سەوزو ئێلەگی خەتخەت دەکڕێت، خۆی دەڕازێنێتەوەو دەچێتە گوند. سوڵتان لەژێر دارگوێزەکە دانیشتووە، روخساری گرتۆتە نێو هەردوو لەپی دەستیو بیردەکاتەوە. هەم بیر دەکاتەوەو هەم چاوەڕێ دەکات. کاتێك سەیری لای خوارەوە دەکات دەبینێت وا کوڕەکانی یەك بەدوای یەك بۆلای ئەو دێن. بەهاوارکردنەوە هاوار دەکات: "هەستە سوڵتان، هەستە!" کوڕەکانی بەڕاکردن بۆلای دێن، سوڵتان هێدمەی گرتووە، یەکدی دەگرنە باوەش.

دەچێتە ئەسکەلە چاو دەبڕێتە دەریا. چاوەڕێ دەکات. دەریا لەبەرچاوانی تادێت گەورەتر دەبێت. لەنێو رۆشناییەکاندا، لەنێو نوورو رۆشناییدا هەزارو یەك رەنگ دەدرەوشێتەوە. ئۆقرەو ئارامی نیە. چاوەڕوانە، ماوەیەکی زۆر بەسەر رۆیشتنیان تێپەڕیوە، زۆر زۆر. ئەوانە نایەنەوە. بۆ چما کوڕەکان چوونەتە پشت دەریای سوور، یان ئەو دیوی حەوت دەریایان، کوڕە، پویرازە گنە، مەگەر لەودیو حەوت دەریاکاندا ئەژدیها قووتی داون؟

لەژێر چنارەکان، لەلێوار دەریاوە سەیری دوور دوور دەکات، دەچێتەوە ماڵ، ئەگەر منداڵەکان لەماڵ بن قسەیان لەگەڵ دەکات. باسی دەریاکان، رۆشنایی ژێر دەریاکان، حەوت دەریا، هەزار خۆری بێکۆتایی پشت حەوت دەریایان بۆ دەکات. منداڵەکان نان دەخۆن، پاشان کاتێك سەر بەسەر هەر یەکێکیان دادەگرێت‌و خەوتووە، هەڵیدەگرێت‌و دەیباتە نێو جێوەو درێژی دەکات، ئاخێك هەڵدەکێشێتەوەو بیر دەکاتەوە منداڵەکان هیچ سەبارەت بەباوك‌و نەنکیان پرسیاری لێناکەن. نەکا سوڵتان ئەو دەمەی دەرۆیشت شتێکی پێگوتبن؟ ئایا نەنکیان ئەوکاتی دەچووەوە گوند شتێکی پێگوتوون، ناتوانێت ئەمە بپرسێت. ئەگەر بشپرسێت وەڵام نادەنەوە.

تا بەیانی ناتوانێت بخەوێت، نیوەی شەو لەنێوجێ دێتە دەرو دەچێتە ئەسکەلە، لەو دیو دەریای تاریك دادەمێنێت. دەریا رووت‌و کشتوماتە، هیچ هاتوچۆکەرێکی تێدا بەدی ناکرێت.

خەوزڕاو، پەرێشانحاڵ، بەردەوام بیر لەدەریاکان، زنارەکان، جەنگەکان، مرۆڤەکان‌و مەرگ دەکاتەوە، ئەوەندە کە لەهەموو تەمەنیدا هێندە بیری لەو شتانە نەکردۆتەوە. هەرجارێك کە بیر لەجەنگ دەکاتەوە نەوەکانیشی دەکەونە بیر. بەبیرکردنەوە لەنەوەکانی دەستێك دێت‌و وەك مەنگەنە دڵی دەگوشێت، جێگایەك بۆ دەربازکردنی نەوەکانی نادۆزێتەوە. ئەگەر بیانباتە بیابانەکان، نێوەڕاستی بیابانەکان‌و ئەودیوی حەوت دەریاوە، دیسان لەوێشدا جەنگ هەیە. سەری لێدەشێوێت، شێت دەبێت، لەهەموو جێگایەك، لەهەموو جێگایەك جەنگە. خوا نەیانبەخشێت کە بوونەتە بەڵا بۆ دونیاو دەریاو دارو درەخت‌و گوڵ‌و گیاو ئەم منداڵە لێو بەخەندەو ئەم مێشەهەنگانە. ئینشاللا بەرلەوەی جەنگ هەڵیبگرسێت هەردوو چاوتان دەربێت‌و بەردەمتان‌و ئەو شوێنەی گوللەی پێوەدەنێن، نەبینن.

لەئێستاوە بەچاوی مردووان سەیری هەموو منداڵەکانی دوورگەی دەکردو هیچ جیاوازی لەنێوان کوڕو کچەکان دانەدەنا. کێ هۆکارو سەبەبکاری هەڵگیرسانی ئەو هەموو جەنگانە بوو. بۆی لێکنەدەدرایەوەو عەقڵی بڕی ئەوەی نەدەکرد. کێ بوو بناغەی جەنگەکانی داڕشتبوو، بەچ مەبەستێك ئەمە کراوە، ئەوەش بۆ هیچکەس دیارنەبوو. لەجەنگدا زۆربەی ئەوانەی رووبەڕووی یەکدی دەبوونەوە تێدەچوون.

ئەو کەسانەی بەزیندوویش دەمانەوە، یان شێت دەبوون، یان پەککەوتەو لەجێداکەوتووو لەئازارێکی هەمیشەییدا دەمانەوە.

دەستی بۆ ئاسمان هەڵدەبڕی‌و دەیگوت، هیوادارم ئەم دونیایەی کە ئاوا وێرانیان کردووە، ڕەشتان بکاتەوەو لەنێوتان ببات، بەلەز رایدەکردو نەوەکانی بەوپەڕی میهرو سۆزەوە دەگرتنە باوەش.

بەبۆڵە بۆڵەوە هاتەلای چنارەکان‌و لەوێوە بۆلای ئەسکەلە، چاوی بەو دەوروبەرەدا گێڕا، کەسی نەبینی. گوتی رۆڵە، پویراز رۆڵە، چۆن، دەتوانیت ئەو کارە لەتوانا بەدەرانە ئەنجام بدەیت، دەتەوێت بەلەم یان گەمی، یاخود کەشتی بکڕیت، بەڵکو بتەوێت ژێردەریایی بکڕیت، تۆ پیاوێکی ئازاو چاونەترسیت، هاتوویت‌و بوویتە پاشاو شای دوورگەیەك کە هێندەی دونیایەکە! ئاشی وای لێن کە پەروانەکانیان شەوو رۆژ دەخولێنەوە. بەو خەیاڵەوە کە بۆ نیشانچی، کەشتی‌و ژێردەریایی بکڕیت، خۆت دەخەیتە دەردەسەری‌و پاشانیش دەڕۆیت‌و ون دەبیت.

پشتی خۆی کردە دەریا، تۆرا، بەرەو باغەکانی دوورگە کەوتەڕێ، جێگایەك کە تا ئەودەم بۆی نەچووبوو، تا گەیشتە سەرگردەکە هەموو گیانی بووە عەرەقە. لای باشووری گردەکە لەخوارەوە تا سەرەوە هەموو یەکپارچە باغ بوو. دەوەنەکان گەلای سەوزو چووزەرەی شلك‌و باریك باریکیان دەرکردبوو. نیشانچی ئیدی پندەو پۆرەی نەدەکرد. دەریای سافی بەر رۆشنایی خۆر دەروونی پاك دەکردەوە. گوتی، ئاەە، پویراز کوڕم، بۆچی خۆت گیرۆدەی ئەو کارانە دەکەیت!

بۆ دەچیە دوای کارێك کە توانای ئەنجامدانیت نیە؟ بۆچی ئەوەندە خۆت نیگەران‌و هەراسان دەکەیت، لەپێناو بەلەمێك، بەلەمێکی ماتۆڕدار، چی؟ من نە بەلەمم لێتدەوێت‌و نەهیچشتێکی دیکە، بەلەمەکانیان سەریان بخۆن.

بۆچی ئەوەندە زەحمەت دەدەیتە بەرخۆت کە نەتوانیت بێیتەوە دوورگە؟ یانی چی دەبێت، خۆخەکان خەریکە پێدەگەن. سەوزیەکان هەنارەکان، تری‌و زەیتوونەکانی نێو باغانیش واپێدەگەن، ئەمانە کۆدەکەینەوەو دەیانفرۆشین. نەوەکانی منیش، ماشەڵڵا گەورەبوونە، ئەوان کۆیان دەکەنەوە. تۆ نیگەران مەبە، من هەرچۆنێك بێت تا پایز دادێت بەلەمێك بۆ خۆم دەکڕم. بۆ پویرازە دڵساف‌و خاسەکەی خۆم. بەپەرێشانیەوە هاتە ئەسکەلە. بەلەمەکەی قەدریی بەلەموان خەریك بوو لەدوورگە نزیك دەبووەوە. نە بەلەمێك‌و نە بەلەمێکی ماتۆڕداری بەدواوە دیاربوو، تەنهاو تەنها بەلەمە ماتۆڕدارەکەی قەدریی بووو بەس. نیشانچی نەیتوانی لەوە زیاتر سەیری بەلەمەکەی قەدریی بەلەموان

بکات، که ئاوی شەق دەکردو تا دەهات نزیك دەبووەوە، گەڕایەوە ژێر دارچنارەکان. قاچی دەلەرزی، خۆی بەردایەوە سەرتەخت، سەری لار بووەوەو ئاوا مایەوە.

بەلەم هاتو لەئەسکەلە لەنگەری گرت. قەدریی بەلەموان بازێکی هەڵداو کندرەکەی لەشیشە ئاسنەکەی سەر ئەسکەلە بەست. ئەوانی دیش بەدوای ئەودا دابەزین. پویراز کە نوقمی نێو شادی بوو، بەڵام نیشانچی لەژێر چنارەکان بینی کە خۆی گرمۆڵە کردبوو، راست بۆ لای ئەو رۆیشتو لەتەکی راوەستا. نیشانچی نەجووڵا، پویراز سێ جار لەسەریەك کۆکی، ئەمجارەش نیشانچی واینواند کە کۆکەکەی نەبیستووە.

"نیشانچی!"

نیشانچی خۆی لەگوورە نەبرد.

"نیشانچی، نیشانچی!"

نیشانچی بایەخێکی پێنەدا. پویراز شانەکانی گرتنو توند رایهەژاند. نیشانچی سەیری نەکرد.

"نیشانچی چیتلێهاتووە؟ بەلەمێکی ماتۆڕدارم بۆ کڕیوی کە هاوتای نە لەم دەریایەو نە لەدەریای سپیو نە دەریای سوور پەیدا نابێت.

بەلەمێکی دەستلێنەدراو".

نیشانچی کەمێك خۆی جووڵاند.

"بەلەمێکی ماتۆڕداری دەستلێنەدراو نیشانچی، دەستلێنەدراو!"

نیشانچی لەپڕ یەکپێ وەك فەنەر رابوو:

"چی؟"

چاوەکانی وەك ژێر پیاڵە کرانەوە.

"دەستلێنەدراو".

"چی؟"

"بەلەمێکی ماتۆڕدارم بۆ کڕیوی، دەستلێنەدراو".

"چی؟"

نیشانچی لەشوێنی خۆی وشکهەڵاتبوو.

"چووینە ئەوێ، عەلی چاوەش تۆپاڵمان دۆزیەوە. لەو گوندە بەلەمو گەمی تا دڵت حەزبکات هەیە. منیش باشترین بەلەمی ماتۆڕداری دەستلێنەدراوم بۆت کڕی. ئێستا دەبێت لەگەڵ ڤاسیلی بچیتە ئەوێ".

پویراز دەستی ئەوی گرتو داینیشاندەوە.

پـویراز قسـەی دەکـردو باسـی عـەلی چاوەش و خریسـتۆو ئـەو ئاوارانـەی دەکـرد، کـە هاتبوونە گوندەکە، بەڵام نیشانچی تەنانەت دەنگیشی نەدەبیست.

خێرا لەجێی خۆی هەستا.

"چی؟ ئێستا من بەلەمێکی ماتۆڕدارم هەیە؟"

پویراز گوتی: "بەڵێ، جا چ بەلەمێك!"

"هی خۆمە؟"

"هی تۆیە".

"لەکوێیە؟"

ڤاسیلی لەسەر ئەسکەلە راوەستابووو خەریکی شتەکان بوو.

"ڤاسیلی وەرە باسی بەلەمەکە بۆ ئەم پیاوە بکە، تا بزانێتو تێبگات".

نیشانچی هاتەوە سەرخۆی، پشتی راستکردەوە تووڕە بوو:

"ئاهای، پویراز رۆڵە، ئاگات لەقسەکانت بێت، ئەو پیاوەی کە گوتت لەجێی باوکتە".

پویراز گوتی: "بەڵێ". چووە لێـوارو لـەوێڕا بـەرەو لای مـاڵی زەهـرا چـووو گەڕایـەوە. نەیتوانی زەهرا ببینێـت. چـەند جـارێکی دیکـە رۆیشـتو گەڕایـەوە، هیچکەسـی نـەبینی، ناڕحەت بوو. نیشانچی ئـەم کـەینو بەینـەی لـێ شـاراوە نـەبوو. ڤاسـیلی لەلایـەك قسـەی لەگەڵ نیشانچیدا دەکردو لەلایەکی دی سەیری پویرازی دەکرد.

"پویراز وەرە ئێرە".

دەنگەکەی لەخۆشیان دەلەرزی.

"ئەمڕۆ هەمووان رۆیشتنە سەر کانیی سەرەوە. دەڵێن کانیەکە ئەو زیندەوەرە چکۆلە ئاویانەی تێدان، کـە بەسـەر ئـاودا دەخشـن. ئـەو زیندەوەرانـە بەسـەر ئاوەکـەدا دەخشنو سێبەریان بەسەر وردە بەردەکانی ژێر ئاوەکە. تۆ ئەوێت بینیوە؟"

"نەمبینیوە".

"ئاوەکەی وەك تیشکی خۆر وایە".

"ئەو کانیانەی کە وردەبەردیان هەیە وەهان. رۆشنایی لەوردەبەردەکان دەدات".

ڤاسیلی گوتی: "وەهان".

"ڤاسیلی قسەتان لەگەڵ یەك کرد؟ بـەو پیـاوەت گـوت بەلەمەکـە چ جـۆرە بەلەمێکـە. توانیت پێی بڵێیت؟"

"پویراز بزانە چ دەڵێیت، بەمە دەڵێیت ئەم پیاوە (ئەم پیاوە) خۆی، ئەم پیاوە خۆتی".

نیشانچی وەك منداڵ هاتبووە جۆش‌و خرۆش. هەستا، بەلاکەلاك‌و بەپشت کوورِەوە بەرەو لای پویراز چوو، هەر کە لێینزیك بوو، بازێکی داو دەستی خستنە سەر هەردوو شانی پویراز، قاچەکانی لەدواوە جووتکردن‌و تاوێك ئاوا مایەوە. پاشان دەستی لەملی پویراز بەردان‌و دوو سێ هەنگاو کشایەوە دواوە. سێ جاران بەدەوری دارچنارەکە سوورِایەوە، چووە نێو قامیشەڵان‌و لەکاتێکدا لکە دەوەنێکی گەزی بەدەستەوە بوو هاتەدەر. دوای ئەوەی کە کەمێك لەبەرخۆیەوە قسەیکردو لەپویراز نزیك بووەوە گوتی:

"کاکە گیان، گوتت بەلەمێکی ماتۆرِداری زۆر جوان؟ گوتت دەستلێنەدراو؟ پێمبڵێ، گیانی شیرینم فیدات بێت".

"دەستلێنەدراو!... بەلەمێکی ماتۆرِدار کە...".

نیشانچی ئارام‌و ئۆقرەی نەبوو، نەیدەزانی چی بڵێت، چیبکات، چۆن شادی خۆی دەربرِێت. چۆن لەخۆشیان باڵ بگرێت‌و بفرِێتە ئاسمان، ئاوا لەشوێنی خۆی دەخولایەوەو ورتەورتی بوو: "دەستلێنەدراو، نارنجی، نارنجی" پویراز کەمێك ترسا. بۆی هەبوو بەلایەك بەسەر منداڵێکی حەوت ساڵە بێت، کە نەیدەزانی لەخۆشیان چیبکات.

کەمێك دواتر بۆڵەبۆڵی نەما.. دەستیکرد بەقسەکردن لەبەر خۆیەوە:

"دەریاکان، هۆی دەریاکان، دەریا دەست پێرِانەگەیشتووەکان، هۆی دەستلێنەدراو، هۆی هۆی ی ی کێوە پرِ لەدارگوێزەکان هۆی".

"بەسە، نیشانچی بەسە! سەیر بکەن چ دەڵێت! پیرێکی وردیلەی فانی، ریش چەرموو، بەپشتێکی کوورِەوە بوو، بەچاوانی کت‌و کوێر".

"تۆ بێدەنگ بە، خۆت پیریت، فانیش هەرخۆتی، خەیاڵم مەبرِە. ئەویش دەستنەخوردەیە. گشت دەریاکان، زنارە شینە نووکتیژەکان‌و گوێزە کاکڵە سپیەکانی دارگوێزە گەورەکان، هەم نارنجیش‌و هەم دەستنەخوردە. ماسیەکانیش دەستنەخوردەن. خۆزگە راوچیەك پەیدا دەبووو ئێمەی لەبرسێتی رزگار دەکرد. هەموو ماسیەکان دەستلێنەدراون".

دوای ئەم قسانە جۆش‌و خرۆشی نیشانچی دامرکایەوەو ئەم خۆشیە جێی خۆی دایە شەرم‌و دەستپاچەپی‌و هێدمەگرتنێك. ئەم نیشانچیە نیشانچی تاوێك پێش ئێستا نەبوو. چاوە وردیلە شینەکانی لەقوڵتی چاوەکانیدا دەسوورِان‌و هەستی بەختەوەریان پەخش دەکرد.

گوتی: "بچم ماسیتان بۆ بێنم". بۆ لای ئەسکەلە چوو.

ڤاسیلی گوتی: "منیش دێم".

پویراز لەژێر دارچنارەکان بەتەنێ مایەوە. بیریکردەوە ئەو پیاوە چەند چوستو چالاکە. لەتەمەنیدا ئەو چوستو چالاکیەی نەبینیبوو. شادیو بەختەوەری لەهەموو گیانی دەباری. لەوەی کە قەت لەوە زیاتر خۆشحاڵ نەبووە، زۆر نیگەران دەبوو. نازانێت چیبکات، وەك لەبەر دەرگای بەهەشت بێتو هەرگیز تێربوونی نەبێت. لەچوونە نێو ئەو بەهەشتە دەترسێت.

سبەی، دووسبەی هەر لەگەڵ ئەوەی خووی بەو خۆشحاڵیەوە گرت، دەڵێت بوومە خاوەنی بەلەمێکی ماتۆڕدارو دەریاو دارگوێزی گەورە گەورەی دەستلێنەدراو، گوێزەکە لەنێو دووپەنجەت دەگریتو بەئاسانی دەیکەیتە دوولەت، دەستنەخوردە گوێزی کاکڵەسپی، دەستنەخوردە، بەڵام کاتی مردن هیچ کارێك ناکرێت".

دەبوا چ بکرێت ئەمەی هەرگیز بۆ روون نابێتەوە، بۆچی بۆ کوێ دەچێت، هەرگیز بەوە ناگات کە باسی دەکرد. ئەگەر پێشی بگات، بەپێچەوانەی بۆچوونی خۆی بەو شێوەی کە پێویستە خۆشحاڵ نابێت. دەیگوت هیچشتێك بەدی نایەت، بەڵام بەهەشتە شادیبەخشەکانی هەرگیز لەبیرناچێت.

پویراز ئەو شەوە تا بەیانی خەو نەچووە چاوی. بێپسانەوە بیری لەمەرگو ژیانو چاوەڕوانی مرۆڤ کردەوە.

بەڵام نیشانچی لەنێو دەریا بەتەواوی ئارام بووبووەوە. دوای نانخواردن چووە نێو جێگاو هەر سەری نایە سەر بالیف خەوی لێکەوت.

بەیانی زوو ڤاسیلی لەخەوی هەستاند. ئەگەر بێداری نەکردبایەوە هەروا دەخەوت. وەك ڤاپۆرەدارێکی کەوتوو رادەکشاو دەخەوت.

قەدریی بەلەموان، لەگەڵ پویراز لەئەسکەلە چاوەڕێی ئەوان بوون. "بەسەد حاڵ لەخەو هەستاوم پویراز، پیریش بەڵایەکی گەورەیە".

"سەیری ئەو نێریە پیرە بکەن!"

نیشانچی گوتی: "سەیری بکەن!"

پویراز ژێر باڵی گرتو ئەوی تا ڤامیشەڵان برد. بەپێکەنینەوە گوتی: "لەپی دەستت بکەرەوە".

نیشانچی یەکسەر لەپی دەستی کردەوە، پویراز بەئەندازەیەکی باش پارەی خستە نێو لەپی دەستیەوە".

نیشانچی گوتی: "پارەیەکی زۆرە. من ئەو هەموو پارەیەم بۆچیە؟"

"ئەم کارانە دەکەیت، یەکەمجار بۆیاخ دەکڕیت، پاشان هەموو ئەو شتانەی کە بۆ بەلەمێك پێویستن".

"پارەکە زۆرە".

"زۆرە با زۆر بێت. بیخەرە گیرفانت، دیار نیە، بەڵکو پێویستت پێیهەبێت. پارەی زۆر خۆ چاوی مرۆ دەرناکات".

"تووڕە مەبە برا، باشە وا خستمە گیرفانم، قسەیەکی دیکەت ماوە؟"

"ماومە".

"باشە، چیە؟"

"تۆڕو کندرەکان. دەبێت هەرشتێك کە پێویست بکات بکڕیت. تۆ ئەم دەریایانە لەهەموو کەس باشتر شارەزایت. پێویستت بەکەس نیە پرسیارێکی لێبکەیت".

"هەیە، کەس نیە پێویستی بەهیچکەس نەبێت".

"یاللا برۆن، با درەنگتان لێدانەیەت".

هاتنەوە ئەسکەلە. قەدریی بەلەموان ماتۆڕەکەی خستەکار. یەکەم، نیشانچی سوار بوو ئینجا ڤاسیلی.

"دەچینە گوندەکە، یەکەمجار دەمەوێت بەلەمە ماتۆڕدارەکە ببینم، پاشان دەچینە شارۆچکەو ئەو شتانەی کە پێویستن دەیانکڕین، مەگەر نە پویراز؟"

"سلاوم بەعەلی چاوەش رابگەیەنە".

"سەرچاو".

لەئەسکەلەی گوند، عەلی چاوەشیان بینی کە چاوەڕێی ئەوانی دەکرد. بەلەمەکەی لەدوورەوە ناسیبوو.

"زووبن، دابەزن، وەلی نیشانچی وەستای خۆم، بەخێرهاتیت، سەفات هانی. دەستی خۆی درێژکردو نیشانچی لەبەلەمەکە دابەزاند، قەدریی بەلەموان ماتۆڕەکەی کوژاندەوە، کندرەکەی لەئەسکەلە گرێ دا، عەلی چاوەش بەلێزانیەوە کندرەکەی لەشیشە ئاسنەکەی ئەسکەلە گرێ دا.

"زووبن. یەکسەر دەچینەوە ماڵەوە، دڵنیام زۆرتان برسیە".

نیشانچی پشتی خۆی راستکردەوە گوتی: "نابێت، نابێت".

"نابێت چیە؟"

"تاکو نەبینم، ناچمە هیچ جێگایەك".

عەلی چاوەش گوتی: "بژیت سەرۆك، منیش لەجێی تۆ بام، وامدەکرد".

"زووبن با ئێمەش لەگەڵ ئەودا بچین".

بەرەو لای ئاوڕێژگە بچووکەکە رۆیشتن. نیشانچی هێند بەخێرایی هەنگاوی دەنا بەشێوەیەك کە زوو گەیشتنە ئاوڕێژگەکە.

نیشانچی گوتی: "ئەمە".

عەلی چاوەش بەهەناسە بڕکێوە گوتی: "ناسیتەوە".

نیشانچی بەتریقانەوە گوتی: "ناسیمەوە". یەکسەر سواری ئەو بەلەمە بچووکە بوو کە لەبەرانبەری بوو، بێئەوەی چاوەڕێی ئەوانیدی بکات سەوڵەکانی خستنەکار، لەچاو ترووکانێکدا خۆی گەیاندە بەلەمە ماتۆڕدارەکە، چووە سەرەوەو بەنێویدا گەڕا. پاشان هاتەخوارو گەڕایەوە لێوار. لەسەر بەردێك رووەو بەلەمە ماتۆڕدارەکە دانیشت. گوتی:

"ئێوە بڕۆن، من دواتر دێم".

"نیشانچی!"

عەلی چاوەش بەچرپە لەبن گوێی ڤاسیلی گوتی: "هیچ مەڵێ، ئێستا ناتوانین ئەو لەگەڵ خۆماندا ببەین".

نیشانچی وەك ئەوەی جادووی لێکرابێت سەیری بەلەمە نارنجیەکەی دەکردو لەسەیرکردنیدا تێر نەدەبوو، وەك ئەوەی عاشقی بووبێت. خۆرئاوا بوو، هەوا تاریك داهات، نیشانچی تەنانەت لەنێو تاریکیشدا دەیتوانێت هەژانەوەی بەلەمەکە بەسەر ئاو ببینێت. بەلەمە نارنجیەکە لەولاتر دەهەژاو بەسەر ئاودا دەجووڵایەوەو ئەو نوقمی نێو شادی بوو. لەو بیرکردنەوانەدا بوو کە ژنەکەی خۆی دەبینی دارگوێزەکان دەبڕێتو دەیانفرۆشێت، کوڕەکانی دوای گەڕانەوەیان لەسەربازی دێنێتە دوورگە، نەوەکانی وەك نەوەی پاشاکان گەورە دەکات.

هەستا، لەگەڵ هەستاندا دەنگی غلۆربوونەوەی بەردێکی لەدواوەی خۆی بیستو ئاوڕی دایەوە، تارماییەکی بینی:

"چاوەڕێی من بوویت؟"

"عەلی چاوەش گوتی ئەو سەرۆکە لەتاریکیدا ڕێگای ماڵێ وێناکەوێتەوە. منی نارد".

"وەپێشمکەوە، بابچینەوە ماڵو شتێك بخۆین".

ئەوان لەمێژبوو نانیان خواردبووو خەریکی قسان بوون.

"پێدەچێت خەسووت خۆشی بووێیت".

"بۆ مەگەر چیبووە عەلی چاوەش؟"

"کفتەمان هەیە".

"کەوایە ڕاستە. خەسووم خۆشیدەوێم. ئیدی چیت هەیە عەلی چاوەش؟"

"هەریسەی ترخێنە".

"چیدی؟"

"هەنگوینی شانەسپی".

"بەسە عەلی چاوەش، ئەمانە بۆ من بەسن".

سفرەیەك لەبەردەمی پانکرایەوە. نانی تەنووریان دانایە سەر سفرە، لەکاسەیەکی قووڵی مسیندا هەریسەی ترخێنەیان هێنا، کە هەڵمێکی چڕی لێهەڵدەستا. نیشانچی ڕوخساری گەشایەوە. لەچاو تروکانێکدا هەریسەکەی خواردو تەواوی کرد. پاشان کفتەیان هێنا، کە ئەویش هەڵمی لێهەڵدەستا.

"وای ئەگەر لەگەڵ ئەم کفتەیە نانی لەواشەش هەبوا..".

"منداڵینە نانی لەواشە بێنن. بەرلەوەی هەڵمی کفتەکان بنیشێتەوە. ئەو پیاوە شارەزای خواردنی کفتەیە".

نیشانچی هەناسەیەکی هەڵکێشا:

"ئاااە، چەند لەمێژە هەریسەی ترخێنەو کفتەم نەخواردووە، ناوی هەنگوینم هەر بەبیر نەمابوو. خوا خێرت بنووسێت".

"هەروا تۆش".

تا خواردن تەواو بوو کەس دەنگی نەکرد. نیشانچی کە خواردنەکەی خوارد خەوی لێکەوت، هەڵیانگرتو بردیانە سەرجێو لەوێ خەواندیان.

نیشانچی بەیانی زوو لەخەو هەستا، چووە سەرئاوو زووش گەڕایەوە. بۆنی پوونگەی هەریسەی ترخێنە ئەم ناوەی داگرتبوو. خوانچەیەکی گەورەیان لەنێوەڕاستی سفرە دانا، نانی لەواشە، نانی تەنوورو شیرینەمەنی تایبەتیان هێنا. کپو بێدەنگ دەستیانکرد بەخواردنی هەریسەکە. لەماوەی نانخواردن کەس قسەی نەدەکرد.

هەستان. نیشانچی گوتی: "سوپاس عەلی چاوەش، چاکەکانی تۆ لەبیر ناکرێن. سوپاس".

"ئەم ماڵە کاولاشی خۆتانە. هەر کاتێك هاتن جێتان لەبان سەرمانە".

"ئێمە ئەمڕۆ دەچینە شارۆچکە. بۆ وەڕێخستنی بەلەم دەبێت هەندێك پێداویستی بکڕین، پاشانیش ڕەنگبێت بۆ عەسر بگەڕێینەوە".

"لەبیر نەکەیت دەبێت تۆڕی جۆراوجۆر بکڕیت!"

نیشانچی بەپێکەنینەوە گوتی: "دەیانکڕم".

"دەتەوێت تۆڕی چ جۆرە ماسیەك بکڕیت؟"

"کەمێك دەریای ئێرەم ناسیوە، ماسیەکانیشی، پێتوایە بەلەم دەبێت درزگیری بکرێت؟"

"لەمێژە ئاوا ماوەتەوە دەبێت قیرماڵ بکرێت".

"وەستایەك دەستدەکەوێت یارمەتیم بدات؟"

"دەستدەکەوێت، چیە نیشانچی، ئێرە سەردەمانێك گوندی ماسیگران بوو، ئێستا تۆ بڕۆو بگەڕێوە وەستایەك نا چەندین وەستات بۆ دێنین. وەستای قیرماڵکردنو درزگیری، وەستای ڕەنگکاری، وەستای تۆڕ.. ئەم گوندە تەنها هەر گوندێك نەبوو، وەکو ماڵێك وابوو. هەمووان یارمەتیو هاوکاری یەکدیان دەکرد. گوندی ئێمە ئاوابوو".

قەدریی بەلەموان گوتی: "عەلی چاوەش ئەگەر ئەمڕۆ نەمانتوانی بگەڕێینەوە. سبەی دەگەڕێینەوە، ماسیش دەگرینو لەگەڵ خۆماندا دەیانهێنین. تا نیوەڕۆ خۆمان دەگەیەنین".

"ئەگەر نەتانتوانی ماسی بگرن؟"

ڤاسیلی، نیشانچی نیشان دا:

"ئەو قسەیە مەکە چاوەشی ئازیز، دلگران دەبێت ها!"

نیشانچی گوتی: "دلگران دەبمو پێکەنی".

سواری بەلەم بوون. بەلەمی قەدریی بەلەموان لەنێو دەریای سافو ئارامدا لەخۆشحاڵیان خەریکبوو باڵ بگرێت. شەوقو زەوقو شادمانی بێئەندازەی نیشانچی گوازرابووەوە بۆ ڤاسیلیو قەدرییو بەلەمو دەریاو هەموو شتێك. یەکەمین جار بوو کە دەبووە خاوەنی بەلەمێکی ئاوا. بەلەمەکەی قەدریی بەلەموان بەخێراییەکی زۆر دەریای کەفاوی شەق دەکرد. لەپڕ دەنگێك هەموو ئەو ناوەی داگرت.

"هێی ی ی!"و دەنگی پڕ لەشادیی نیشانچی ڕۆشناییەکەی دوولەت کرد، بەلەمی کەفئالوودی هەژاندە سەریەكو بەرزبووەوە. نیشانچی کە سەری لەدەنگی خۆی

سوورمابوو، هەستاو پشتی کردە بەلەموانو ڤاسیلیو دانیشتو قاچەکانی شۆڕکردنەوە نێو دەریا. تا گەیشتنە شارۆچکە نە یەك جار سەری هەڵبڕیو نە قسەیەکی کرد.

زووتر لەوەی دایاننابوو گەیشتنە شارۆچکەو لەئەسکەلەدا راوەستان. برادەرە گەنجەکانی قەدریی پێشوازیان لێکردن. لەنێو خۆیاندا بەچرپەوە گوتیان: "ئەوە سەرۆك وەلی نیشانچییە". سەرۆك نیشانچی قسەی گەنجەکانی بیستو فیزێکی دایەخۆی. لەبەرخۆیەوە گوتی: "بەلەمە نارنجیەکەمتان نەبینیوە". دەمی تا بناگوێی بەشبووەوەو پێکەنی.

جەعفەر وەك دۆستانێکی زۆر کۆنی خۆی پێشوازی لێکردن. قاوەیەکی سەر بەکەفی بۆنداری بەهاوەنەکەی خۆی بۆ دروستکردنو بۆنی قاوەکە هەموو دووکانەکەی پڕ کردبوو. نیشانچی قاوەکەی وەك پاشایان بەچەشنێك فڕکرد، کە هەمووان واقیان وڕما. هەستی رێزگرتنیان بەرامبەری زۆر لەپێشان زیاتر بوو. جەعفەر گوتی: "سەرۆك نیشانچی هەرچی بتەوێت هەیە".

نیشانچی یەکەمجار قوتووە بۆیاخەکانی هەڵبژارد، ئەوانیان هەڵگرتنو بردنیان لەبەردەم دەرگاکەیان دانان. پاشان نۆرەی تۆڕەکان، کندرە سپیەکانو خولخولەکان داهات. هەموو ئەو شتانەی هەڵیانبژاردبوون خستیانە نێو گونیەیەكو هەڵیانگرتنو بردیان لەبەردەم دەرگا دایاننان، پاشان قولابەکانیان هەڵبژارد. ڤاسیلیو قەدریی بەلەموان ماوەیەك خۆیان خەریك کرد، بەڵام لەهەڵبژاردنی قولابدا تووشی گرفت بوون. نیشانچی بەئاسانی هەر قولابێکی پەسند نەکردبا وەلای دەناو هەرجۆرێکی بەدڵ با دە پازدەیەکی لێهەڵدەگرتن.

تا ژمارەی قولابەکان زیاتر دەبوو، کەیفو جۆشو خرۆشی ئەویش زیاتر دەبوو. جۆرەها داوو هەروەها کندریشیان کڕین. کڕینی سەبەتەی حەسیریشیان لەبیرنەکردن.

جەعفەر گوتی: "سەرۆك نیشانچی، ئەگەر پارەت نەبێت ئەمانە هیچ نرخێکیان نیە، هەرکاتێك پارەت هەبوو، ئەمانە دەهێنێت".

نیشانچی ئەبرۆکانی تێکنان، چاوە لەچاوی هەڵۆچووەکانی سووڕان، بەدەربڕینێکی راشکاوو لێبڕاوانە گوتی: "ئەگەر پارەمان نەبوایە لەم دووکانە چیماندەکرد؟"

"ها گوتم خۆ، بۆ سەرۆكو گورگێکی دەریایی وەکو تۆ ئەمانە هیچ بەهایەکیان نیە".

"سوپاس جەعفەر ئەفەندی. تۆ پارەکەی خۆت حساب بکە!"

جەعفەر چوو لەپشت مێزەکە دانیشت، دەفتەرەکەی راکێشایە پێش خۆی، ماوەیەك سەری بەسەر دەفتەردا گرتو لێکیدایەوەو حسابی کرد، پاشان بەدەمی بەپێکەنینەوە سەری هەڵبڕی، رێك وەك وەستاکەی خۆی گوتی: "پازدە لەسەدم بۆ داشکاندوویت"و نرخەکانی پێگوت.

نیشانچی بەهێمنیەوە پارەکانی ژماردو دایاننە سەرمێزەکە، گوتی: "سوپاس کاکە جەعفەر، خوا رزقت زیاد بکات، لەم نێوە کەست نیە؟"

جەعفەر گوتی: "هەمە. چەندی بتەوێت هەن".

"دوو کەس بەسە".

"ن....ە، من بارەکانتان دەنێرمە ئەسکەلە. ئەمە ئەرکی ئێمەیە".

"هەر بژیت".

"کڕیار گەورەی ئێمەیە".

جەعفەر فیکەیەکی لێدا، چەند کەس پێکەوە هاتن، گونیەو قوتووی بۆیاخەکانیان هەلگرتنو بردیانن بۆ ئەسکەلە.

"بەخێرو سلامەتی سەرۆك نیشانچی، بیستوومە بەلەمی سەرۆك دیمتریت کڕیوە، بەلەمێکی دەستلێنەدراوو نوێیە، پیرۆزە، لەچاوی بەد بەدووربێت".

"هەر بژیت کاکە جەعفەر، دەستلێنەدراوە".

گونیەکان، تەنەکان، پەمۆکانی درزگیری، قیڕو پێداویستیەکانی دیکەیان لەبەلەم بارکردنو رێی گوندیان گرتەبەر، بەلام نیوەشەو بوو کە گەیشتنە گوند، شۆڕو شەوقو شادمانی، نیشانچیان هێند ماندوو کردبوو کە هەموو گیانی دەئێشا. هێشتا نەگەیشتبوونە ئەسکەلە، کە دەنگی قاچ دارینەکەی عەلی چاوەش دەهات.

نیشانچی هەر کە بەلەم لەئەسکەلە لەنگەری گرت. قەڵەمبازێکی هەڵداو دابەزی:

"یاللا عەلی چاوەش بابڕۆین زووبە، زۆر ماندووم، خێرا، خێرا".

دەنگی قاچە دارینەکەی عەلی چاوەش بەسەر وردە بەردەکاندا دەنگی دەدایەوە. خەڵکی دیکەی گوندیش هاتبووە پێشوازیان، بەتایبەت بۆ بینینی نیشانچی.

کاتێك خەریکبوون لەماڵ نزیك دەبوونەوە، بۆنی ترخێنەی پوونگەداری ترشو پڕ سیر کەوتە بەر لووتی نیشانچی. لەو دەمەدا قۆڕەی زگی هەست پێکرد. بەدرێژایی رێگا بەردەوام بیری لەنێو جێگا کردبووەوە، بەلام ئێستا لەبیریکرد. قۆڵی عەلی چاوەشی گوشی:

"عەلی چاوەش، بۆنی ترخێنەیە".

بەهەموو سیەکانیەوە بۆنەکەی هەڵمشت.

"بەڵێ بۆنی ترخێنەیە".

قۆڵ لەنێو قۆڵ چوونە ژوورەوە. لەگەڵ چوونە ژوورەوەدا خۆیان لەسەر سفرەیەکی پانکرایەوە بینی. بۆنی هەریسەی ترخێنە لەنێو کاسە مسینە مشتومالدراوەکان، مرۆیان شەیدا دەکرد.

نیشانچی هەر کە هەریسەکەی تەواو کرد، سەری لاربووەوەو خەوی لێکەوت. هەڵیانگرتو بردیانە نێو جێوەو نخاوتیان.

نیشانچی کە بەیانی زوو لەخەو هەستابوو. بێئەوەی سەیری دەوروبەری خۆی بکات، یەکسەر بۆلای بەلەمەکەی رۆیشت. بەلەمە نارنجیەکەی کە لەنێو تەمو هەوای گورگەمێشی بەرەبەیاندا دەهەژایە سەریەك، لەپێشان جوانتر کەوتە بەرچاو، واقی وڕما، گەڕایەوە، سفرەی نانی بەیانی دەمێك بوو راخرابووو ئەوانیدی دەمێك بوو دەستیان بەخواردنی هەریسەی پوونگەداری بۆنخۆش کردبوو، چیوای نەمابوو دەست بکێشنەوە. جێیەکیان بۆ ئەو لەڕۆخ عەلی چاوەش هێشتبووەوە. عەلی چاوەش بۆ ئەوەی ئەو ئاسوودەتر دابنیشێت، کەمێك زیاتر خۆی بۆلای چەپ کشاندبوو. قاچە سەنگینەکەی لێکردبووەو لەپشت سەریەوە لەسەر جاجمێك دانابوو، قاچ بەهەموو شکۆو هەیبەتی خۆیەوە لەوێ لەسەر جاجمەکە راکشابوو، شکۆو ویقاری خۆی بەهەمووان نیشان دەدا.

عەلی چاوەش گشت ئامادەبووانی بەنیشانچی ناساند:

"سەیر بکە سەرۆك، ئەو کوڕە لاوەی دەستەچەپم وەستای درزگیریو قیڕمالکردنە. زۆر لەمێژە بەلەمەکە لەوێ راگیراوە. رەنگبێت پێویست بکات درزگیری بکرێت. ئەمەش، ئەم سمێڵ ماشو برنجەش، رەنگکارێکی زۆر شارەزایە. ئەم کوڕە گەنجەش شاگردیەتی. ئەمەشیان کە لەپێش ئەو دانیشتووە"، یەکێکی کە خێرا خێرا بەکەوچك هەریسەی دەخوارد، نیشان دا "ئەمەش ئەحمەدە، برازای منە، منداڵێکی عاقڵو وریایە، وەستای کاری ماتۆڕە. سەری لەماسیگرتن دەرناچێت. ئەگەر حەزبکەیت با ئەحمەد ببێتە بەردەستت، کە هەم یارمەتیت بداتو هەمیش فێرە راوەماسی ببێت. کوڕێکی باشو بێغەلو غەشە". عەلی چاوەش بێدەنگ بوو، کەوچك لەنێو دەستیدا جووڵەی نەما. کەمێك بیریکردەوە، لەروخساری نیشانچی وردبووەوە، دوو دڵو نیگەران بوو، ئایا دەکرێت لەکەسێکی وەستاو پیاوێکی نێو دەریاکان پرسیارێکی وا بکات؟

نیشانچی تێبینی ئەو گومانو دڵەڕاوکێیەی ئەوی کرد، گوتی: "بێژە چیتدەوێت، چیتدەوێت عەلی چاوەش؟"

عەلی چاوەش هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵکێشایەوەو گوتی: "دەپرسم، سەرۆك نیشانچی، تۆ تا ئێستا سوودت لەماتۆڕ وەرگرتووە؟ چونکە سەرۆکە گەورەکانی ئێمە، تەنانەت ماسیگرەکانیش شارەزای بەکارهێنانی ماتۆڕ نەبوون".

نیشانچی خاکەڕایانە گوتی: "بەکارم هێناوە"و ئەو کەمە هەریسەیەی لەژێر کاسەکەیدا مابوو، خێرا خێرا خواردیو تەواوی کرد. هەمووان پێکەوە هەستان. عەلی لەسەر تەختەکە دانیشتو خێرا قاچە دارینەکەی بەستو چوونە دەرەوە.

گوندیەکان کە ئاگادار بووبوونەوە، هاتبوونە ژێر چنارەکانو چاوەڕێی ئەوانیان دەکرد. یەك دوای یەك بەنیشانچیان گوت: "سەرۆك نیشانچی بەخێرهاتی، بەخێرهاتی". نیشانچی هاتبووە جۆشو هەستی بەخۆشحاڵی دەکرد.

هەمووان بۆ لای بەلەمەکە کەوتنەڕێ. بەلەمەکەیان هێنایە ئەسکەلەو دایاننایە سەر لەکانی قەراخ ئەسکەلە.

"ئەحمەد تۆ لێرە لای وەستاکان دەمێنیەوەو هەرشتێکیان ویست ئاگاداری من دەکەیتەوە".

ڤاسیلیو قەدریی لەنێو خەڵکدا مابوونەوەو دیار نەبوون. وەلی نیشانچی وەك هەمیشە جێی سەرنجی هەمووان بوو. کاتێك ئەو خەڵکەی کە لەژێر دارچنارەکان کۆبووبوونەوە، لەسەر تەختەکان دانیشتن. نیشانچی بۆلای ڤاسیلی چوو:

"تۆ کەمێك دواتر وەڕێ بکەوەو بڕۆرەوە دوورگە، ئەزیش دوای ئەوەی کەمێك لەگەڵ ئەمانە قسەمکرد، وەڕێ دەکەوم. هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئێمەدا باشە، ئێستا جوان نیە بەجێیان بێڵم".

کەمێك دواتر ڤاسیلی هەستاو گوتی: "ئێمە دەڕۆین، خوا حافیز".

قەدریی بەلەموانیش هەستاو بۆلای ئەسکەلە رۆیشتن. گوندیەکانیش کە لەگەڵ ئەواندا هەستابوون، لەگەڵ ئەواندا چوونە ئەسکەلە. قەدریی بەلەموان بەدوو هەندربادان ماتۆڕەکەی خستەکار.

هەموو خەڵکی گوند چیرۆکەکەی ڤاسیلیو پویرازیان دەزانی. رووداوی موسڵمانبوونی ڤاسیلیش زار بەزار گەڕابوو. گوندیەکان زۆر رێزیان لێدەنا. رەفتاریان دەربڕی رێزگرتنیان بوو، ڤاسیلی لەبینینی ئەو هەڵسوکەوتەیان هەموو گیانی دەبووە شادی.

ڤاسیلی لەتەرزی ڕەفتارو قسەکردنی چەند کەسێکیان لەوە گەیشت کە ئاگاداری چیرۆکی ژیانی ئەون، بەڵام بۆی ڕوون نەبووەوە ئەم چیرۆکەو ڕووداوی ژیانی ئەو چۆن گەیشتۆتە ئەم گوندە؟ هەموو خەڵکی شارۆچکەش ئاگایان لەهەموو شتێك هەیەو ئەگەر بەئەندازەی پویرازیش نەبێت. بەهەرحاڵ ئەویشیان دەناسیو ڕێزیان لێدەگرت.

ئەوەی لەنێوان ئەو دووانە ڕوویدابوو، ئەویش لەدوورگەیەك کە تەنها چەند کەسێك پێی ئاگاداربوونو دەتوانن بڵێین ئەوانیش هیچ پەیوەندییێکیان بەدەرەوە نەبوو.. خەڵکە نوێیەکەی دوورگەش لەدوورگە دوورنەکەوتبوونەوە. سەیرە ئەم ڕووداوە چۆن ئاوا بڵاوبۆتەوە، ئەمە نهێنیەکی تێدایە.

نیشانچی بەیانی شلەساواری خوارد، کە بەپونگەو لەپەنۆك لێندرابووو کەرەی بەسەر داکرابوو، نیوەڕۆ ساوارو ماست، شەویش دۆڵمەی خوارد. هەموو ڕۆژێك بەیانیان زوو دەچوو لەبەرانبەر بەلەم دادەنیشتو چاوی دەبڕیە بەلەمە شکۆدارەکەی.

کابرای درزگیر وەستایەکی شارەزابوو، کارەکەی خۆی زوو تەواو کرد. ڕەنگکارەکەش قۆڵی لێهەڵماڵی. یەکەمجار ئەو بەشەی دەکەوێتە نێو ئاوەوە بەڕەنگی دژە ژەنگی شینباو ڕەنگ کرد. پاشان بڕیاری دا ڕەنگێکی نارنجی لەبەلەمەکە بداتو دوای تەواوکردنی ڕەنگی نارنجی، خەتێکی پان بەئەندازەی دە سانتیمەتر بەهەرچواردەوری بەلەمدا شین بکات. ئینجا نەخشی مانگو ئەستێرەش لەبەشی دواوەی بەلەمەکە بکێشێت. جوانترین ڕەنگ ڕەنگی شینە لەسەر ڕەنگی نارنجی.

نیشانچی لەهەموو تەمەنیدا ئەوەندە هەستی بەئاسوودەییو لەهەمانکاتدا بەختەوەری نەکردبوو. تەنها هەندێکجار، ئەو دەمەی دەچووە ژێر چنارەکانو گوێی لەهەندێك قسەی سەیری گوندیەکان دەبوو سەبارەت بەئاوارە یۆنانیەکان، نیگەران دەبوو.

لەڕاستیدا ڕەوشێکی سەیر لەگۆڕێ بوو. ئاوارەکان هاتبوونو چووبوونە نێو خانووەکانو چەندین مانگ بوو پێیان لەکونجی ماڵەوە نەهێنابووەدەر. ئەوان چیان خواردبوو، چیان خواردبووەوەو بۆچی ئاوا خۆیان لەکونجی ژوورەکاندا شاردبووەوە؟ کەس نەیدەزانی.

نیشانچی لەبەرزاییەکەی بەرامبەر بەلەمەکەی هەستاو بەرەو لای گەڕەکی ئاوارەکان کەوتەڕێ. لەوەی کە نەیدەزانی چۆن ڕووبەڕووی ئەو ڕەوشە دەبێتەوە، خەریکبوو لەنیگەرانیان دەمرد. باڵندەو چۆلەکەی ڕەنگاوڕەنگ پۆل پۆل لەسەر درەختو بانی خانووەکان هەڵدەنیشتنو هەڵدەفڕینەوە. پۆلە باڵندەیەکی بچکۆلەی سینگ خەنەیی

لەنیوەی ڕێگا شۆڕبوونەوە. نیشانچی نەیتوانی چاو لەباڵندە دابەزیوەکان هەڵبگرێت. لەجێی خۆی راوەستاو تا ئەو دەمەی هەڵنەفڕین لەشوێنی خۆی نەبزووت.

باڵندەکان سەریان رەش‌و دەنووکیان درێژو نارنجی بوو. پشتیان شین‌و سنگیان خەنەیی بوو. قەبارەیان هێندەی قومری دەبوو. رەنگی شینباوی پشتیان شەپۆلی دەداو بێهیچ خۆتەکانداندنێك لەناوەڕاستی رێگاکە هەڵنیشتبوون. تا ئەو دەمەی سێبەری هەورێك بەسەریاندا خشی، لەوێ مانەوە.

نیشانچی کە چووبووە نێو بیرکردنەوەوە، لەدەنگی هەڵفڕینی باڵی باڵندەکان بەخۆی هاتەوەو بەرەو چنارەکان کەوتەوەڕێ. دەنگە جیکەو چریکەی رەشۆڵەکان ئەو نێوەیان پڕ کردبوو.

ئەو رەشۆڵانە کە خاڵی سپیان تێدابووو لەسەر چلی دارچنارەکان هەڵنیشتبوون، کاتێك دەکەوتنە بەر تیشکی خۆر، دەبریسکانەوە. دڵی نیشانچی کە ئارەزوویێکی تێدا سەری هەڵدابووەوە، کەوتە ترپە. لەژێر چنارەکە دانیشت‌و چاوی بڕیە لك‌و پۆپی دارچنارەکە.

لەم ساتەدا ئەو باڵندانەی کە پشتیان شین بوو هاتنەوەو لەناوەندی رێگاکە هەڵنیشتن‌و رانەوەستان، دووبارە هەڵفڕین‌و لەئاسماندا بازنەیەکیان بەست‌و جارێکی دیکە گەڕانەوەو لەسەر رێگاکە هەڵنیشتنەوەو دووبارە لەشەقەی باڵیان داو بۆ ئاسمان بەرزبوونەوە.

نیشانچیش رۆیشت‌و تا دەرەوەی گوند چوو. دوایین خانووی ئەو گەڕەکە لەلێواری دەریابوو. دەوەنە دیوارگرەکان دیواری حەوشەی خانووەکەیان داپۆشیبوو. وای کەوتە بەرچاو کە لەنهۆمی دووەمی خانووەکە سەرێك هاتەدەرو یەکسەریش ون بوو. پۆلێك لەو باڵندە سنگ خەنەییانە هەڵنیشتنە سەر درەختی نێو حەوشەکە "هێی ی ی باڵندەکان. باڵندە سنگ خەنەییەکان، هێی ی ی باڵندەکان!" بێئەوەی چاو لەسەر دەرگای ماڵەکە هەڵبگرێت، بەدەم دووپاتکردنەوەی ئەو دێڕانە لەلای خانووەکان بۆ لێوارو لەلێوار بۆلای خانووەکان دەهات‌و دەچوو، "هێی ی ی باڵندە سنگ خەنەییەکان، هێی ی ی، باڵندە خەنەییەکان، شینەکان!". قاچەکانی هەڵیانگرت‌و بۆ لای دەرگای خانووەکەیان برد. "هێی ی ی باڵندە سینگ خەنەییەکان". کاتێك چووە نێو باخچەکە، باڵندەکان لەکاتێکدا لەئاسماندا بەزیگزاگ دەڕۆیشتن، لەشەقەی باڵیان داو بۆ سەردەریا رۆیشتن، کەمێك دواتر گەڕانەوەو لەسەر ناوەڕاستی رێگاکە هەڵنیشتنەوە. "هێی ی ی، باڵندە

وردیله خەنەییەکان، شینەکان، هێ ی ی!" بەهێی هێی گوتن، پلیکانەکانی بڕین‌و چووە سەرەوە، بەوپەڕی شادمانییەوە پێی نایە ژوورەوە، کەسەکانی نێو خانووەکەش بەخۆشحاڵییەوە پێشوازیان لێکرد.

نیشانچی ماوەیەك دواتر بەدەمی بەپێکەنینەوە لەخانووەکە هاتەدەر، هێی ی ی باڵندە وردیلە سنگ خەنەییەکان، هێی ی ی!" لەگەڵ چوونەدەری ئەودا، باڵندە هەڵنیشتووەکانی سەر ڕێگاکە هەڵفڕین‌و بەپەرش‌و بڵاوییەوە بەسەر کچەکەدا ڕۆیشتن‌و لەبەرچاوان ون بوون. دەرگای دووەمین خانووو دەرگای نهۆمی دووەم کراوەبوون. وای کەوتە بەرچاو سەرێك لەشیپانەی دەرگاکە هاتەدەرو یەکسەریش چووەوە ژوور. دیسان قاچەکانی هەڵیانگرت، لەسەر لکی درەختی نێو حەوشەکە پۆلێك باڵندە هەڵفڕین، کە هەریەکێکیان بەقەد ڕەشۆڵەیەك دەبووو ڕەنگیان شینی تۆخ بوو. بەپلیکانەکان ژووری میوانانی بڕی‌و وەسەرکەوت. ماڵەکە بەگوتنی "بەخێرهاتی!" بەگەرمییەوە پێشوازیان لێکرد.

لەماڵی دووەمیشدا بەهەمان شێوە بەخۆشحاڵی‌و لەکاتێکدا زاری تا بناگوێی لێککرابووەوە، هاتەدەر.

چوونە ژوور بۆ ماڵی سێیەم ئەوەندە ئاسان نەبوو. ماوەیەك ئاوا لەبەر دەرگای خانووەکە بۆ لێوار لەهاتن‌و چوون دابوو. دوودڵ بوو، نە هەورێك بەئاسمانەوە بوو نە باڵندەیەك.

هەنگاوەکانی خێراتر کردن. لەدەرگای خانووی سێیەم هیچ سەرو کەللەیەك بەدی نەکرا. دوودڵی‌و نیگەرانی قاچەکانی دەبەستو بەهیچشێوەیەك نەیدەتوانی ئەوێ جێبێڵێت. کەمێك دواتر پۆلە باڵندەیەك لەلای دەشتەوە هاتن‌و بەبان سەریدا ڕەت بوون‌و چوون لەسەر درەختی باخچەی خانووی سێیەم هەڵنیشتن. ڕێك لەو کاتەدا بۆ چرکەیەك، تارمایی سەرێك لەشیپانەی دەرگای ماڵەکە دەرکەوت.

قاچەکانی نیشانچی ڕایانکێشا بۆ ژوورەوە. "هێی ی، باڵندە زەردەکان، زەردۆڵەکان، هێی ی ی!" نە زەردی ئاڵتوون‌و نەهی تیشکی خۆرو نە زەردی گەنمەکان بەزەردیی ئەو زەردۆڵانە نەدەگەیشت. ڕەنگێك کە نەرم نەرم بوو، بەچەشنێك دەتگوت ناخی مرۆڤ نەوازش دەکات. شاگەشکەی دەکردو کاری لەقووڵایی دەروون دەکرد.

نیشانچی هەموو ڕۆژێك لەبەیانییەوە تا شەو دادەهات سەری لەو ماڵانە دەدا، دەوروبەری عەسری ڕۆژی سێیەم چووە ژێر دارچنارەکەی نیوەڕاستی گەڕەك. لەوێ لەسەر چیمەنەکان دانیشت‌و پشتی بەدارچنارەکەوە داو سەری دانایە سەر ئەژنۆکانی.

کەمێك دواتر دەنگی پێیەکی بیست. سەری لەسەر ئەژنۆکانی کردەوە، ئاوڕی دایەوەو سەیریکرد، ئەو کەسەی کە دەهات پیرەمێردێکی ریش سپی بوو، چاوشین، کە گەردنو روخسارێکی لۆچاوی هەبوو، هاتو بەبێدەنگی دانیشتو پشتی بەدارچنارەکەوەدا. چەند کەسێکی دیش بەدوای ئەودا هاتنو لەنێو چیمەنەکان دانیشتن. پاشان وەك بلێی گوند کەسی تێدا نەمابێت، نێو چیمەنەکان پڕبوو لەپیرو گەنجو منداڵو کچو کوڕ. دەنگیان لەبەر نەدەهاتەدەر. ماوەیەك ئاوا کڕو بێدەنگ راوەستانو سەیری یەکدیان کرد. نیشانچیش بەچاوانی زەقبووەوە سەیری ئەوانی دەکردو نیگای لەگەڵ زۆربەیان تێکهەڵدەنگوت. نیشانچی لەپڕ پشتی خۆی راستکردەوەو هەستا. ئەو پیرانەی کە دانیشتبوون، هاوکات لەگەڵ ئەودا هەستانە سەرپێ.

هەموو پێکەوە وەڕێکەوتنو چوونە سەر ئەسکەلە. ئەوانەی لەژێر چنار دانیشتبوون، لەگەڵ هاتنی ئەوان لەبەریان هەستانو فەرمووی دانیشتنیان لێکردن. کەمێك دواتر، لەماڵەکان شووشەی پڕ لەلیموناد هاتن. کچە گەنجەکانی گوند بەکاسەی مسی جەلاکراوو پەرداغی شووشەیی لیمونادیان لەنێوان میوانەکان دابەش کرد. هەموو دانیشتووانی گوند لەمنداڵەوە بگرە تا گەنجو پیر، هەموویان لەژێر چنارو لەسەر ئەسکەلە خڕبوونەوە. تا ئەو کاتەی لیموناد بەسەر هەمووان‌دا دابەش کرا، دەنگ لەبەر هیچکەس نەهاتەدەر. لەگەڵ تەواوکردنی لیموناد لەپڕ بێدەنگیەکە شکا. هەمووان دەستیانکرد بەقسەکردنو پێکەنین. ئەو گفتوگۆو هەراو پێکەنینە تا بانگی شیوان درێژەی کێشا. پیرە ئاوارەکانو خۆجێیەکان بەرەو مزگەوتی گوندو ئەوانیدیکەش بەرەو ماڵەکانیان رۆیشتن. نیشانچی چوو لەشوێنی پێشتر لەرۆخ بەلەمەکەی دانیشت. عەلی چاوەش هات لەتەنیشتی دانیشت. نیشانچی دەکردو پێدەکەنی، پاشان نیشانچیش وەپێکەنین هاتو هەردووکیان دەستیانکرد بەپێکەنین.

"کاری ئەم بەلەمەی ئێمە کەی تەواو دەبێت؟"

"زوو، سبەی، دووسبەی، سبەینێ ماتۆڕەکەی دەپشکندرێت".

"کێ ئەم کارە دەکات؟"

"وەستا خالس، هی ئەو گوندەی خوارەوە..".

"وەستا خالس کێیە؟"

"باشترین وەستای ئەم ناوچانەیە. باشترین نۆژەنکاری ماتۆڕی یۆنانیەکانو تورکەکان وەستا خالسە. ئەو ئەگەر بیەوێت ماتۆڕ لەنوێوە دروست دەکات، ئەو وەستایەکی وەهایە".

"بابوەستین ببینین".

خۆر خەریکی ئاوابوون بوو. کە چوونە ماڵی عەلی چاوەش، سفرە داندرابووو هەمووان چاوەڕێی ئەوان بوون. دۆڵمەی گوڵە کولەکەشیان هێناو دایاننایە سەر سفرە. نیشانچی گوتی: "ئەمە چیە؟"

"دۆڵمەی گوڵە کولەکە".

"دۆڵمەی گوڵە کولەکە چیە؟"

عەلی چاوەش بەوردی باسی دۆڵمەی گوڵە کولەکەی کردو بۆی روونکردەوە نیشانچی دونیادیتەو سەرماو گەرمای رۆژگارچەشتوو، بەتەواوی واقیوڕمابوو.

"هەر بگەڕێمەوە دوورگە، بەرلەوەی دەستو دەمو چاوم بشۆم، لەباخچەی ماڵەکەمدا کولەکە دەچێنم. پاشان بەدەستی خۆم دۆڵمەی گوڵە کولەکە دەپێچمەوەو لێیدەنێمو ورگم ئاوا لێدەکەم". دەستی لەورگی خۆی دا، "ئاوا ورگی خۆم هەڵدەمسێنم".

ژنەکەی عەلی چاوەش لەژوورەکەی دیکە هاتو گوتی: "سەرۆك نیشانچی، سەرۆك نیشانچی، تا لێرەبیت منیش هەموو رۆژێك دۆڵمەی گوڵە کولەکەت بۆ لێدەنێم".

"بۆنیشی بۆنێکی جیاوازە. لوفەری دەریاش لەوەرزی بەهار بۆنی دەریا پەخش دەکات، دۆڵمەی گوڵە کولەکەش بۆنی بەهاری لێدێت".

عەلی چاوەش گوتی: "ئەریٚ وایە".

"لەکویٚ دەتوانم تۆو کولەکە پەیدا بکەم؟"

ژنی عەلی چاوەش گوتی: "کاتێك ویستت بڕۆیت یەك گونیە تۆوی کولەکەت دەدەمیٚ، پێتخۆش بێت دەتوانیت هەموو دوورگە بکەیتە کولەکە".

نیشانچی زۆر خۆشحاڵ بوو:

"هێی ی ی، دەبیستی لەهەموو دوورگە کولەکە دەڕوێنم، بیستت عەلی چاوەش؟ ئەوەندە گوڵە کولەکە دەخۆم کە بۆنی گوڵە کولەکەم لێبێت".

"ئێمە کە گەنج بووین بۆنی لوفەرمان لێدەهات".

دیسان سەری نیشانچی لاربووەوە. سیٚ رۆژی رێك ئەوەندە لەماڵدا هاتبووو چووبوو قاچەکانی زۆر دەئێشان. ئەحمەد بەهێمنی ژێر باڵی نیشانچی گرتو بێئەوەی لەخەوی هەستێنێت جلەکانی داکەندنو خستیە نێو جێگاوەو خەواندی.

"خاتوون، تۆ ئەم شارۆچکەیەت چۆن بینی؟ ئێمە نزیکەی چەندین مانگە کە ئەم ئاوارانەمان نەبینیبوون، هەتا یەك کەسیشیان. بەهۆی ئەو بەڵایانەی بەسەریان هاتبوو

لەئێمە دەترسان. لەرێگاو لەلێواری دەریاو لەهەر جێگایەك تووشیان بووبایت پەنایان دەدۆزیەوەو خۆیانیان تێدا دەشاردەوە. نیشانچی چیکرد کە سەدان کەسی لەمنداڵو پیرو لاوو ژنو پیاو هێنایە ئەسکەلە؟ تۆ ئەمە چۆن لێکدەدەیتەوە".

"عەقڵ نایبڕێت".

"ئەوان ئەوەندە بەترسەوە سەیریان دەکردین دەمانگوت تا قیامەت لێمان نزیك نابنەوە. هەرچی کردمان سوودی نەبوو، گوتمان هاوڵاتیانی ئێمەن، بەڵام دیسان نەمانتوانی لێیان نزیك ببینەوە. ئەو چیکرد؟ نەکا ئەو پیاوە خدر بێت درودی خوای لەسەر؟"

"نیشانچی شتێکی هەیە کە من سەری لێدەرناکەم. پویرازیش نازانێت".

"رازو حیکمەتێك هەیە! تۆ پێتوایە چی پێگوتوون؟"

"بەڵکو هەر قسەشی لەگەڵدا نەکردبن. دەتەوێت نهێنیێکت پێبڵێم؟"

"ئەگەر قسەی لەگەڵدا نەکردبن چۆن ئەو هەموو خەڵکە کەوتە دوایو هاتنە سەر ئەسکەلە. کەسانێك کە چەندین مانگ بوو، تەنانەت تا روخساریشمان نەبینیبوون".

هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو. وەستا خالسو کوڕە گەنجێك کە جانتایەکی گەورەی بەدەستەوە بوو، هاتنە ماڵی عەلی چاوەش.

"عەلی چاوەش، عەلی چاوەش، دەرگا بکەرەوە من هاتم، دوێنی پێیانڕاگەیاندم بورغیو مورغیت شل بوونەتەوە. هاتووم توندیان بکەمەوە".

دەنگی قاچە دارینەکەی عەلی چاوەش لەژوورەوە هات. لەبەر دەنگی قاچە دارینەکەی عەلی، شووشەی پەنجەرەکان لەرزین.

دەرگاکە کرایەوە، عەلی چاوەش بەقاچی لەدەرگاکەی دا:

"تۆ بورغیەکانی خۆت توند کەرەوە خالس گیان. تۆ دەستێك بەبورغیەکانی خۆت دابێنە". رووی لەگەنجەکە کرد: "کوڕم جانتای کەلوپەلەکان بکەرەوە، ئەو سپانەیە بدە بەمن. سەیری ئەو کابرایەی لەبەرامبەرم راوەستاوە بکە. بورغیەکانی ئەو تەنها بەو سپانەیە دەتوانین توند بکەینەوە. سەیر بکە ناتوانێت لەسەر پێیان رابوەستێت، چۆن دەتوانێت ماتۆڕەکەی سەرۆك نیشانچی ئێمە نۆژەن بکاتەوە".

یەکدیان لەباوەش گرت. عەلی چاوەش دەستی ئەوی گرتو بۆ ژوورەوەی راکێشا. نیشانچیو ڤاسیلی هەستابوونە سەر پێیانو چاوەڕێی وەستابوون. وەستاو کوڕە گەنجەکە یەکسەر دانیشتنە سەر سفرەو هەردانیشتن هەریسەی ترخێنە لەنێو کاسەی میسی

جەلادراو کە بۆنی پوونگەی لێدەهاتو هەڵمی گەرمی لێهەڵدەستا داندرایە سەر سفرە. وەستا خالس چێشتی خوارد، دوای ئەوەی بەوردی لەو پیاوە وردیلەیە وردبووەوە، لەبەرامبەری بوو، پێیگوت: "تۆ ئەو پیاوەیت کە ئەو ئاوارانەی لەکونجی ژوورە تاریکەکاندا خۆیان شاردبووەوە، هێناونەتە بەر رووناکی خۆرەتاو، وانیە؟"

نیشانچی خاکەڕایانە گوتی: "هەوم".

"ئەی، ئێمە واماندەزانی ئەوان گشتیان دەمرن، بۆنی لاشەکانیان وەکو دوملوپنار دونیا دادەگرێتو جەرگی مرۆڤ لەتلەت دەکات. بۆیە ئێمە بیرمان لەناشتنیان دەکردەوە. گۆڕیشمان بۆ ئامادە کردبوون".

عەلی چاوەش گوتی: "راستە".

"تۆ ئەمکارەت چۆن کرد؟ چیت پێگوتن کە توانیت رایانکێشیتو بیانهێنیتە بەر رووناکی؟"

نیشانچی خاکەڕایانە گوتی: "نازانم".

"چیتکرد؟"

"چووم پاڵم بەدارچنارەکەوەدا. ئەوانیش یەك دوای یەك لەماڵەکانیان هاتنەدەرو هاتن لەتەنیشتمەوە دانیشتن. من بایەخم پێنەدان، هەموو ماڵەکان چۆڵ بوون، لەمندالّی حەوت ساڵە تا پیری حەفتا ساڵە هاتن لەژێر دارچنارەکە خڕبوونەوە. دەنگێکت لەشتاقیان گوێ لێنەدەبوو، تەنانەت نەتدەتوانی دەنگی هەناسەشیان ببیستی. سەبرمگرت. سەیرمکرد هەموویان وەك بەرد دانیشتوون، منیش هەستام. کە هەستام لەپڕ ئەوانیش هەموویان هەستان، من بۆ لای ئەسکەلە گەڕامەوەو کەوتمەڕێ، ئەوانیش بەدوای مندا هاتن".

"سەیرە، تۆ مەگەر کەرامەتت هەن؟"

"نازانم".

"کەوابوو وەرە با بڕۆین بۆ ناو بەلەمەکە، بەلەمەکەی تۆ شکۆم پێدەبەخشێت".

"نازانم".

"زوو با بچینە نێو بەلەمەکە".

"نازانم".

بەلەم دەبریسکایەوە. رەنگە نارنجیو شینەکەی دەدرەوشایەوە. وەستا خالس ماوەیەك لەبەلەم راما. پاشان سواری بەلەم بوو. وەستا خالس زارکی ماتۆڕەکەی کردەوە، ئەو شوێنانەی کە پێویست بوو بیانکاتەوە کردنیەوە".

"ماتۆڕ دەتگوت تازە لەکارخانە هاتۆتەدەر. من ماتۆڕی ئاوام زۆر بەکەمی بینیوە. ئەم ماتۆڕە بەیەك هەندر دەكەوێتە كار".

نیشانچی بەخۆشحاڵیەوە گوتی: "پێدەبێت".

"سەرت لەماتۆڕ دەردەچێت سەرۆك نیشانچی؟"

نیشانچی بەخەجاڵەتێکەوە سەری دانەواند:

"کەمێك..".

وەستا خالس لەگەڵ ئەو شاگردەی كە خەریك بوو بەباشی ماتۆڕەكەی چەور دەكرد، ئەو پارچانەی كە كردبوونیەوە دووبارە بەستنیەوە.

"پیرۆزت بێت سەرۆك وەلی".

"بژیت وەستای خۆم".

ئەوان هاتن لەقادرمەكان بێنەخوار، كە عەلی چاوەش گەیشتە لایان:

"بوەستن دامەبەزن".

لەوێ مانەوە.

كۆمەڵێك لەلاوەكان لەدەوری عەلی چاوەش بوون. لاوەكان، ئەو كندرەی كە لەشیشە ئاسنەكەیان گرێ دابوو، كردیانەوە. بەلەمیان بەرەو دەریا رادا. بەلەمەكە دەتوانین بڵێین هەر لەخۆی خولایەوەو تا نزیك تەنكاوەكە رۆیشت.

"هەندرەكە رابكێشە نیشانچی!"

بەسێ جار راكێشانی هەندر، ماتۆڕ كەوتەكار. وەكو سەعات كاری دەكرد.

"ڤاسیلی برۆ پشت سووكان!"

"ئۆووی، وەستا خالس، خۆ هەر من نیم. دەبێت یەكەمجار نیشانچی بەلەمەكەی خۆی لێبخوڕێت".

"داوای بوردن دەكەم ڤاسیلی، پێموابوو دەبێت لێیبخوڕیت"

"سەرۆك وەلی نیشانچی، وەستای هەمووومانە".

نیشانچی گازی دایێ. بەلەم یەكەمجار زۆر هێواش كەوتە جووڵە، پاشان نیشانچی كەم كەم گازی بۆ زیاد كرد.

"ئێرە گوندەكەی ئێمەیە".

سەر بانی هەموو خانووەكانی لێوار دەریا سوفالكاری سوور بوون. گوند باخ‌و باخچەی زۆری هەبوون. گشت خانووەكان لەتەختە دروستكرابوون‌و رەنگاوڕەنگ بوون.

نیشانچی گوتی: "گوندێکی چەند جوانە!".

ئاوازی دەربڕینەکەی تژی لەسەرسوڕمان بوو.

"جوان چیە، بەهەشتە".

"جا چ بەهەشتێك!".

"ئەحمەد، سووکانەکە بۆ لای عەلی چاوەش بادە".

"سەرچاوان سەرۆك".

نیشانچی سکلێتەری گازی بەلەمی قەپات کرد. بەلەم نەڕاندی. عەلی چاوەش لەبەردەم ئەسکەلە چاوەڕێیان بوو. یەکەمجار وەستا خالس لەبەلەم دابەزیو ئینجا نیشانچیو ئەحمەد.

نیشانچی کیسەکەی لەگیرفانی دەرهێنا کە رەنگی نارنجیو ژەنگیانەچن کرابوو. قەیتانەکەی راکێشا، بۆلای وەستای درێژ کرد:

"فەرموو وەستا".

"وەستا خالس بەپشتی دەستی کیسەکەی بۆلای نیشانچی گەڕاندەوە:

"بیخەرەوە گیرفانت. پێویست ناکات. هیچمان نەکردووە".

عەلی چاوەش گوتی: "کیسەکەت بخەرەوە گیرفانت". سەرۆك وەلی نیشانچی شەرمنانە کیسەکەی خستەوە گیرفانی.

ڤاسیلی خوا حافیزی لەوانەی لەوێ بوون کردو سواری بەلەم بوو.

ئەحمەد گەڕابووەوەو خەریکبوو بۆلای بەلەمەکە دەچوو، نیشانچی گوتی:

"ئەحمەد بوەستە، تۆ بوەستە. بڕۆ لەو خاتوونەی کە لەماڵەوەیە توورەگە تۆو کولەکەکەی من وەربگرەو بیهێنە. هەروەها جلوبەرگو هەموو پێداویستیەکانی خۆشت".

عەلی چاوەش گوتی: "لەماڵی ئێمە بڕیار بوو تۆو کولەکە بدەنە نیشانچی، بڕۆ بیهێنە".

یەکدیان گرتە باوەش.

"هەمیشە چاوەڕوانتین وەلی نیشانچی هێژا".

ئەحمەد بەڕاکردنەوە هاتەوەو سواری بەلەم بوو.

"خوا حافیز!"

"بەخێرچن!"

نیشانچی توورەگـە بچووکەکەی لەئەحمـەد وەرگـرتو قـەیتانی زارکـی توورەگەکـەی کـردەوەو چـنگێك تـۆو کولەکـەی هێنـادەرو سـەیری کـرد. قـەیتانی زارکـی توورەگەکـەی راکێشـاو چـووە پشـت ماتۆڕەکـەو گـازی دایـێ. ئەحمـەد لەپشـت سـووکان بـووو نیشـانچی لەسەر ماتۆڕەکە. گوێیان هەڵخست ماتۆڕ هێواش هێواش گەرم داهات.

ماوەیــەك دواتــر جووڵانەکــەی بەتــەواوی حاڵــەتی ئاســایی وەرگــرت، لــەماوەی سەفەرەکەیاندا بێـدەنگ رێگاکـەیان بـڕی. ڤاسـیلی چـەند جارێـك چـەند قسـەیەکی کـرد، بەڵام ئەوان نەیانبیست.

کاتێـك لەدوورگـە نزیـك دەبوونـەوە چـاویان بەتارماییـەك کـەوت کـە لەسـەر ئەسکەلە بوو.

نیشانچی بەدەنگێکی بەرز گوتی ئەم تارماییە، پویرازە".

کـە لەئەسـکەلە نزیـك بوونـەوە پـویراز تۆزقاڵێـك تـەکانی نەدایـە خـۆی. نیشـانچی لەبەلەم دابەزی، بۆلای پویراز رایکرد، یەکدیان گرتە باوەش. دروست لـەم کاتـەدا هـەموو خەڵکی دوورگە هاتنە ئەسـکەلە، موسـا کـازم ئاغـا لـەپێش هەموویانـەوە بـوو. گردۆلکـەی چیلکەو داری وشکی زەیتوونیان لەبەر چاوان شاراوە نەبوون. نیشانچی نیگای کەوتەسـەر زەهراو پویراز کە خەریك بوون سـەیری یەکـدیان دەکـرد. لەبەرخۆیـەوە گـوتی، کارەکـان باش دەچنە پێش. خۆشحاڵ بوو.

هەموویان پێکەوە چوونە ژێر چنارەکان.

ڤاسیلی گوتی: "دارەکان دابگیرسێنم؟"

پویراز گوتی: "چیە ڤاسیلی؟ زۆرت برسیە برۆ دایبگرسێنە".

# بەشی حەوتەم

هوسمەن دەمانچەیەکی بولغاری بەسەد فیشەکەوە هێناو بەرێزەوە داینایە تەنیشت پویراز.

"نیشانچی لەکوێیە؟"

ڤاسیلی گوتی: "لەماڵی خۆیەتی، چاوەڕێی دەمانچەکەیەتی".

"برۆ بیهێنە".

نیشانچی بەڕاکردنو خێرا خێرا هات. چاوی برپیە نێو چاوی پویراز. پویراز، تووڕەگەکەی دایە دەستو گوتی: "بگرە، پیرۆزت بێت، تووڕەگەکە بکەرەوە!"

نیشانچی لەکاتێکدا دەستەکانی دەلەرزین، زارکی تووڕەگەکەی کردەوە. یەکەمین شت کە کەوتە نێو دەستی فیشەکدانێکی نەخشێندراوی زیوکاریکراو بوو کە پڕ لەفیشەك بوو. جارێکی دیکە دەستی لەتوورەگەکە رۆکرد، فیشەکدانێکی نەخشێندراوی دیکەشی هێنایەدەر. دوایین شت کە لەتوورەگەکەی دەرهێنا دەمانچەکە بوو، لەکیفکەکەی هێنایەدەر. دەمانچەی نوێ هەر کە کەوتە بەر رووناکی بریسکایەوە. نیشانچی دەمانچەی، کە بۆنی رۆنی لێدەهات لەبەر خۆر رادەگرت، ماوەیەکی درێژ سەیری دەکردو پاشان لەنزیکەوە لێیورد بووەوە. بۆ ماوەیەك ئاگای لەدەوروبەری خۆی نەما، لەگەڵ دەمانچەکەی بەتەنیا مایەوە، باقەنەزمەی دەمانچەکەی دەسووڕاند، فیشەکەکانی نێو باقەنەزمەکە دەرژانە سەر عەردو دووبارە ئەوەندە بەخێرایی دەیخستنەوە نێو باقەنەزمەکە، کە دەستەکانی نەدەبیندران.

بینیان کە نیشانچی هەستا، چوو پەلەبەردێکی سپی، کە هەر هێندەی نینۆکی پەنجە دەبوو نەدەبوو داینایە سەر بەردێکی بەرامبەریان. ئینجا یەکسەر گوللەیەکی تێگرت. کاتێك سەیری بەردەکەی کرد دەمو چاوی وێکهاتنەوە، پەلوکە بەردەکە هەر لەجێی خۆی بوو.

گوتی: "تف، نەمتوانی بیپێکم".

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشایەوە.

هەموو گوللەکانی نێو مەخزەنی دەمانچەی خاڵی کردن، بەڵام پەلوکە بەردەکە هەر لەجێی خۆی مابووەوە.

"تف، هیچ نەمتوانی بپێکم".

توورگەی فیشەکەکانی سەر تەختەکەی هەڵگرتو قەیتانی زارکی راکێشا، فیشەکەکانی نێو توورەگەکەی یەك یەك هەڵگرتنو لەکاتێکدا دەستەکانی دەلەرزینو جنێوی دەدان، لەچاوتروکانێکدا مەخزەنی دەمانچەکەی پڕکردەوەو یەکسەر دەستیکرد بەنیشانەگرتنەوەو یەکسەر دەستیدەکرد بەتەقەکردن، بەڵام نەیدەتوانی پەلوکە بەردەکە بپێکێت، سەرتاپای لەبەر ئارەقە هەڵاتبوو.

بێدەنگ بوو، هەناسەیەکی هەڵکێشایەوە "ئاااه!، پیربوویت وەلی نیشانچی پیربوویت".

لەگەڵ ئەم قسانەشی پەلاپیتکەی دەمانچەی داگرت. ئەمجارە پەلوکە بەردەکە فڕی.

"ئەحمەد کوڕم، بڕۆ ئەوێ، پەلوکە بەردی وەك ئەوەی من دامنا کۆبکەوەو هەر جارێك پێکام تۆ لەشوێنیدا پەلوکەیەکی دیکە دابنێ".

ئەحمەد چوو دوو چەنگ پەلوکە بەردی کۆکردنەوەو یەکێك لەپەلوکەکانی دانایە سەر بەردەکەو خۆی چووە لاوە. نیشانچی پلی لێدا. پەلوکەکە لەبەرچاوان ون بوو. دووبارەو سێ بارە، نیشانچی ئیدی هیچ گوللەیەکی بەخەسار نەدەدا، سەرەنجام ئەو پەلوکە بەردانەی لەنێو دەستی ئەحمەد بوون تەواو بوون.

"پەلوکە بەردەکان تەواو بوون سەرۆك وەلی، دەتەوێت دیسان پەلوکەی دیکە کۆبکەمەوە؟"

"سێ دانەی بچووك. هەر سێکیشیان لەتەك یەك دابنێ".

ئەحمەد پەلوکە بەردەکانی لەتەك یەك دانان، وەلی نیشانچی گوتی، یەك، دوو، سێ، هەر سێ پەلوکە بەردەکان یەك دوای یەك پێکرانو بەهەوادا فڕین.

نیشانچی، دوای نیشانەشکێنیەکەی دەمانچە بەدەستەوە بەهەمان شێوە لەو نێوەدا مایەوە، نەیدەزانی چیبکات. بۆلای پویراز چوو، پویراز هەستابووە سەر پێو چاوەڕێی ئەوی دەکرد.

"واش نەبوو کە تا دەستت لێڕادێتەوە پێویستت بەسەد دانە فیشەك هەبێت".

نیشانچی شەرمنانە گوتی: "پێویست نەبوو".

ئەو پیرەمێردەی کە دوای هەمووان هاتبووە دوورگەو بەتورکیەکی تێکەڵ بەکوردی قسەی دەکرد. دەنگێکی سەرسوڕمانی لەرادەبەدەر تایبەت بەزمانی کوردی لەقوڕگی

دەرداو گوتی: "ئاریّ یّ، وای کەکۆ، وای ئاغا، بەخودیّ تەنانەت لەشاریّ مەژی نیشانشکێنەکی وەهانیە".

نیشانچی گوتی: "بژی برا. ناوت چیە؟"

"پێمدەڵێن شێخ مووس. خەڵکی لێواری بیابانم، ناوی کوڕێکم حەکۆیەو ئەوەی دیکە محۆ. هەردووکیشیان لەجەنگدا کوژران. جەستەی هەردووکیان وەکو بێژنگ هەنجندرابوون. جەستەی منیش وەکو بێژنگی لێهاتووە. خوا کاتێك نەیەوێت کەسێك بمرێت نامرێت. ژنەکانیشمان هیچ بریندار نەبوون".

"ژنەکانی ئێمەش هەروا... تۆ، تۆ لەباژێریّ خۆ چیتدەکرد؟"

"من سەرباز بووم".

"ئەدی چۆن بوویە خاوەن منداڵ؟"

"هەندێکجار لەسەربازی رامدەکردو دەهاتمەوە شارۆچکەو پاشان دەیانگرتمەوەو دەیانگەڕاندمەوە. هەرجارێك کە لەسەربازی رامدەکرد، دەبوومە باوکی منداڵێك. هەموو جارێکیش کە دەیانگرتمەوە، ئەو ماوە سەربازیەی پێشتریان رەش دەکردەوەو بۆیان حساب نەدەکردم. منیش دووبارە دەستم بەسەربازی دەکردەوەو دیسان رامدەکرد".

"ئەم دوورگەیەت چۆن دۆزیەوە؟"

"من ئێستاش هەر سەربازی راکردووم. هەرجارێك کە رامکرد، گرتمیانەوە. سیّ کوڕمیان بردە سەربازی. ئامۆژگاریم کردنو پێمگوتن سەربازی ئاخیرو ئاقیبەتی نیە. ترسنۆك دەرچوونو گوێیان لێنەگرتم. هەرسێکیان لەبەرەی شەڕی رووسەکان کوژران.

تەنها یەك کەس لەخەڵکی شارۆچکە لەو بەرەیە گەڕایەوە، ئەویش چاوێكو دەستێكو قاچێکی لەدەست دابوو. ئەو بۆی باسکردم کە کوڕەکانی من لەنێو بەفرو سەرمادا رەق بوونەوە. منیش بەپەلە هاتمو ئێرەم دۆزیەوە. وەلی ئاغا تۆ پێمبڵیّ کە فیشەکی زۆرت هەن، من لێرە نادۆزنەوە مەگەر نە؟ حکومەت بەئێرە دەزانێت؟"

"پێشیبزانێت من رادەستی حکومەتت ناکەم".

"جەنگ تەواو بووە یان لەواندەران هەر بەردەوامە؟"

نیشانچی گوتی: "زۆر دەمێکە تەواو بووە. مستەفا کەمال پاشا لەئەنقەرەیە".

کاك شێخ مووس گوتی: "من دەمێکە ناوی ئەو پیاوەم بیستووە. ئایا ئەو پیاوێکی باشە؟ بیستوومە خۆی بەلایەنگری هەژاران دادەنێت".

دەمێك بێدەنگ ماو چاوەڕێی کرد.

"وایە".

"ئەو پیاوێکی باشە..".

"باشە، ئەو ئیدی لێناگەڕێت هیچ جەنگێك هەڵبگیرسێت؟"

نیشانچی گوتی: "لێناگەڕێت".

شێخ مووس خۆشحاڵ بووو لەناخی دڵەوە پێکەنی:

"منیش کوڕەکانم دەنێرمە سەربازی، رایاندەسپێرم کە لەسەربازی رانەکەن تا ناچار نەبن بیست ساڵ سەربازی بکەن. ئەگەر جەنگ هەڵگیرسا باربکەن‌و بێنە ئێرە. ئەگەر رابکەن‌و بێنە ئێرە، کەس ناتوانێت بیاندۆزێتەوە، وانیە؟"

"جەنگ نابێتەوە".

"چۆن، شێت بوویت، مەگەر رێی تێدەچێت ئیدی شەڕ نەبێتەوە؟"

نیشانچی گوتی: "مستەفا کەمال حەزی لەشەڕ نیە. لەمڕۆ بەدواوە شەڕ قەدەغەیە".

"وای، ئەگەر وایە ئەو گیانی منە. ئەو شێرە. وای، ئەو رۆشنایی چاوی منە. یانی پاشاکانی دی گوێی لێدەگرن؟"

"گوێی لێدەگرن. ئەو پاشای یەکەمینە".

"وەی، سەرباز شێخ مووس قوربانی ئەو دەم‌و زارەت بێت کە هەنگوینی لێدەبارێت. لەشارەکەی خۆمان هەمووان پێمدەڵێن سەرباز شێخ مووس. بەبیست ساڵ سەربازی لەگەڵ راکردنەکانم، ناوی سەربازم بەسەر دابڕاوە".

"من تەنها جارێك لەسەربازی رامکردو ئیدی نەگیرامەوە".

شێخ مووس بەسەرسامی‌و رێزەوە لێیورد بووەوە:

"هەر هیچ نەگیرایتەوە؟"

"هیچ".

"چۆن؟"

"گوندەکەمان لەناو چیاکانە. لەپەنا زنارە سەختەکان. جێگایەکە وەکو هێلانەی هەلۆ وایە".

"تێگەیشتم". سەری دانەواند، پێستی دەم‌و چاوی لۆچی تێکەوت، گرژبوو. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو گوتی: "لەشاری ئێمەدا هیچ چیایەك نیە. زەوی‌و ئاسمان تەنها هەر بیابانە. ئاااااە، ئاااااە".

قۆڵی نیشانچی گرتو بەئارامی رایکێشا، وەك ئەوەی بیەوێت نهێنیەکی لەگەڵدا باس بکات:

"سەیر بکە دۆستی عەزیزم، ئاغا وەلی نیشانچی، من چی بەتۆ بڵێم، ژنەکەم لەشارۆچکە مایەوە".

"بۆچی؟"

"بۆچی پێناوێت، ترسا. گوتی چۆن دەکرێت لەناوەڕاستی دەریا لەسەر پارچە بەردێك بژین، هەرچی کردم نەهات".

"رانەکاتو بچێتەوە دەریا؟"

"بۆ دەبێت رابکات، تا توانیمان ئێرە بدۆزینەوە شیری دایکمان هێنایەوە.. دووبارە رابکاتو بچێتەوە نێو ئەو بیابانە؟"

"کەواتە ناهێتە ئێرەو ناشگەڕێتەوە، وانیە؟"

"هەر کە دەریای بینی گوتی دەریاش بیابانی ئەمانەیەو هەنگاوێکی دیکە نەهاتە پێش".

"ئێستا لای کێیە؟"

"لای ئەو دراوسێیانەیە کە پێکەوە هاتین".

زووبە با ئێستا بچینە شارۆچکەو بیانهێنین. بیابانی دەریا چ قسەیە، بابێن ببینن دوورگەی ئێمە چ بەهەشتێکە، لەخۆشیان دەمیان بەش دەبێتەوە".

نیشانچی چووە لای پویراز.

"پویراز، من دەچمە شارۆچکە".

"لەسەر خێر نیشانچی، ئەمڕۆ ماسیمان نابێت؟"

نیشانچی گوتی: "نە، هیچت ناوێت لەشارۆچکە بۆت بێنم؟"

پویراز گوتی: "نامەوێت". چاوی بڕیە ناو چاوانی ئەو. "تێتدەگەم برا، بڕۆ بۆ شارۆچکە، بڕۆ و..".

شێخ مووس گوتی: "ژنەکەم گەورەترین وەستای کلیمچنی هەموو ئەمارەتی گەلی بۆتانە. لەبری هەر کلیمێك کە بۆ میرەکانی بۆتانو شێخەکانی عارەبو ئاغاکانی کورد دەیچنی، یان کیسەیەکی پڕ زێڕیان دەدایێ، یان مایننێك. کلیمەکانی شەریفە خاتوون نەدەچوونە هەموو ماڵێك". سەری دانەواند، گریان سیمای داگرت". خوا ئەو بەڵایانەی لەرێگا تووشمان بوون بەنسیبی دوژمنیش نەکات".

"یاللا زوو برۆن، شەریفە خاتوون، ئەو وەستایەی کلیمچن کە لەدوورگە دەترسێت هەڵبگرنو خێرا بیهێنن. ئەحمەدی بینی کە بۆ ئەسکەلە دەچوو "تۆش دەچیت ئەحمەد؟"

"سەرۆك وەلی داوای لێکردم".

سەرۆك نیشانچی چوو گەڕایەوە.

"یاللا بابرۆین دۆستی من. سەیر بکە، قەدریی بەلەموانیش وادێت".

"وەرە بەلەموان، ئامادەیت؟ دەچم بەلەمێك بۆ پزیشکی ئاژەڵان بکرم. یەکەمجار دەچینە لای عەلی چاوەش. پاشانیش لەگوندەکانی لێواردا دەگەڕێین، تاکو بەلەمێکی باش بۆ کاك جەمیل دەدۆزینەوە".

"سەرچاو سەرۆك پویراز".

سواری بەلەم بوون، قەدریی بەلەموان بەڕاکێشانی یەك جار هەندرەکە، "سەرۆك وەلی داوای لێکردم".

سەرۆك نیشانچی چوو گەڕایەوە.

"یاللا با برۆین دۆستی من، سەیرکە، قەدریی بەلەموانیش وادێت".

"وەرە بەلەموان، ئامادەی؟ دەچم بەلەمێك بۆ پزیشکی ئاژەڵان بکرم. یەکەمجار دەچینە لای عەلی چاوەش. پاشانیش لەگوندەکانی لێواردا دەگەڕێین، تاکو بەلەمێکی باش بۆ کاك جەمیل دەدۆزینەوە".

"سەرچاو سەرۆك پویراز".

سواری بەلەم بوون، قەدریی بەلەموان بەراکێشانی یەك جار هەندرەکە ماتۆڕی خستەکار.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "دەبێت ماتۆڕێکی ئاوامان هەبێت کە ئاوا بەیەك هندر بکەوێتە کار". دەستی دانایە سەر شانی پویراز. "بوونی پزیشکێکی ئاژەڵان بەماسیگر! پزیشکی ماسیەکان، باڵندەکان، فیلەکان!"

عەلی چاوەش هەر لەدوور دوورەوە بەلەمەکەی ناسیبوو، بەو نیازەی کە قەدریی بەلەموانو پویراز خەریکن دێن لەسەر رۆخی ئەسکەلە راوەستابووو چاوەڕێیانی دەکرد.

هەر کە بەلەمەکە لەئەسکەلە لەنگەری گرت، سەرنشینەکان پیادەبوونو لەگەڵ عەلی چاوەش سڵاوو هەواڵپرسیان کرد. پاشان تەوقەیان لەگەڵ یەك کردو پێکەوە چوون لەسەر تەختەکانی ژێر دارچنارەکە دانیشتن.

"ئەمە جەمیلی پزیشکی ئاژەڵانە. لەبەرەی رۆژهەڵاتدا لەدژی رووسەکان جەنگاوە، نیوەی سەربازەکانی ئێمە ئەسپێ خواردنیان‌و نیوەشیان بەئەسپێکانەوە رەق بوونەوە. ئەسپێکان باش بووە دەستیان لەلەت‌و پارکردنی ئەم پزیشکەی ئاژەڵان هەڵگرتووە. خەڵکی شارێکی کوێستانیە. واتە بەهۆی ئەوەی خەڵکی "وان"ە لەسەرمان رەق نەبۆتەوە. جەستەی ئەویش وەکو جەستەی ئێمەمانان وەك بێژنگی لێهاتووە. هەر کە رەوشی تەندروستی کەمێك باش بووە لەنەخۆشخانە رایکردووە. بەمە دەڵێن قەدرنەناس. رایکردووەو چۆتەوە شاری چۆڵ‌و هۆڵی وان. پاشانیش دەربەدەری چۆڵ‌و هەردان بووەو هاتووەو گەیشتۆتە دوورگەی ئێمە. چونکە لەنەخۆشخانە زۆر خەونی بەماسیەوە بینیوە، بۆتە ماسیگرێکی شارەزا. ئێستاش جوانترین بەلەمی حەوت دەریای لێتدەوێت".

"سەرچاوم، بابچینە لای ساڵحەکوێر".

"ئەو ساڵحە کێیە؟

"لەخۆمانە، لەوانەی لەچاناك قەڵا بەزیندوویی گەڕاوەتەوە. گوللە چاوی راستی بردووەو داویەتی بەفەرماندەیەکی ئینگلیز. فەرماندە ئینگلیزیەکەش ماوەیەك ئاوا سەیری کردووە، گوتوویەتی لەو ئینگلستانەدا بەو گەورەیی خۆیەوە ناتواندرێت چاوێکی ئاوا جوان پەیدا بکەیت‌و پەیدا نابێت، کاتێك قاچی منیان بڕی‌و بردیانە لای پاشا، پاشا گوتوویە سەیرە. سەیرە، سەیرە، لەسەرسوڕماندا چاوی لێزەق بوونەتەوە. هیچ قاچێکی براوی وەك ئەم قاچە، لەهیچ جێگایەك دەست ناکەوێت. ئەم قاچە شکۆدارە ببەن بەحاڵەتی ستوونیەوە لەسەر تەپۆلکەیەکی دەوروبەری بەکۆشك دایبنێن‌و هەر چواردەوریشی بەهەزارو یەك مۆم‌و شەمدان رووناك بکەنەوە، تاکو زەوی‌و ئاسمان‌و هەموو بوونەوەرانی دونیا مات‌و سەرسام بن. ئینگلیزەکانیش وەك بڵێیت دڵشکاو بوون، چەندین شەوو رۆژ هەر سەیری قاچی منیان کردووە".

قەدریی بەلەموان ئەوانی بردە گوندەکەی ساڵحەکوێر. ساڵحەکوێر بەباوەشی کراوەوە پێشوازی لێکردن. ساڵحەکوێر زۆر دەمێك بوو دابوویە تەمبەڵی‌و تەنانەت بزەیەکیشی نەدەهاتە سەر لێوان، لەگەڵ ئەوەشدا بەڕوویەکی خۆش‌و بەڕێزەوە پێشوازی لێکردن. لەگەڵ عەلی چاوەش باوەشیان پێکدا کرد. برادەری سەردەمی منداڵی‌و سەربازی بوون. لەژێر چنار، لەڕۆخ کانیەکە دانیشتن. قاوەیان لەماڵی ساڵحەکوێر هێنا‌و خواردیانەوە.

"باشە، عەلی چاوەش چ خەبەر؟"

"سلامەتی، سالّح، داوایەکم لێتهەیە، ئەم دۆستە دەبینیت، ئەفسەرە، ئەفسەری پزیشکی ئاژەڵان. لەبەرەی دژ بەڕووسەکان جەنگاوە، کاتێکیش وەکو بێژنگ کون کون کراوە، پەنای هێناوەتەبەر دوورگەی کارینجا. ئەویش وەکو پویراز موسایە. ئەویش ئەفسەرە. لەپاشماوەکانی نەوەد هەزار شەهیدی جەنگی ئەسپێیان. منیش دەمەوێت...".

قاچە دارینەکەی بەزەویدا کێشا.

"وس، دەزانیت چیتدەوێت، قاچەکانت دەوێت کە ئالای ئینگلستانیان تێوەپێچاو بردیان بۆ پادشای ئینگلستان، مەگەر نە؟"

"تۆش هیچشتێك نیە کە نەزانیت. من دەمەوێت شتێکی دیکە بلێم. ئەم کاك جەمیلەی پزیشکی ئاژەڵان دەریاچەی وانی بینیوە. لەوێ گەورە بووە، بۆتە بەلەموانی دەریاکانو ماسیگری حەوت دەریایان، لەو بەلەمانەی تۆ هەتە دانەیەکی دەوێت".

"ناتوانم بیاندەم، ئەمانەتن".

"ئەمانەتی چی، ئەمانەتی کێ؟"

"دەتەوێت هی کێ بن. دراوسێکان، هی ئالکۆیە".

"سالّح واز لەو بێنە. ئالکۆ ئیدی نایەتەوە".

ئالکۆ گوتی دێمەوە. ئەو ئالکۆیە، ئالکۆ درۆ ناکات، مادام گوتی دێمەوە، دێتەوە".

"نایەتەوە".

"ئەو ئالکۆیە، دێتەوە".

ماوەیەك لەگەڵ سالّحەکوێر بەبەریەك هەڵچوون، باسی گۆڕانکاریو گۆڕینەوەکانیان کرد. هێندەیان باسکرد زاریان شل بوو. سالّح قبوولّی نەکردو نەکرد. عەلی چاوەش هەزارو یەك هۆکارو نموونەی بۆ هێنانەوە. پارەی دوو بەلەمیان دایێ، بەلام نەکراو نەکرا، سالّح رازی نەبوو.

سالّحەکوێر گوتی: "ئەم لێوارە پڕ لەبەلەمە. من بەلەمێکتان بۆ پەیدا دەکەم کە لەهی ئالکۆ جوانترو خێراترو تازەتربێت. منیش ماسیگرم، شارەزای بەلەمانم".

پزیشکی ئاژەڵان تووڕە بووو گوتی: "پێویست ناکات. وازمان لێهێنا. من ماسیگر نیم. لەدوورگە دەمێنینەوە، خراپ نیە ئێمەش بەلەمێکمان هەبێت. پێویست ناکات".

"کوڕە سالّح، کوڕە کوێرە ئەم بەلەمە ئەوەندە لێرە دەمینێتەوە تا لەشوێنی خۆی دەڕزێت. با ئەمەت پێبلێم. دیسان ئەو کاتەی ئەم بەلەمە داڕزا سەرت لێدەدەمەوە. ئەودەم چەند قسەیەکت لەگەڵدا دەکەم".

"تا ئێستا خۆم قسە کورت نەکردووە عەلی برا، دیسان دەڵێم نامەوێت دڵت بشکێنم. بەلەمەکەی من لەوێیە ئەگەر پێیڕازی دەبیت بیبەو هیچ پارەش مەدە".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "پێویست ناکات".

بەتووڕەیییەوە سواری بەلەم بوونەوەو شەرمنانە گەڕانەوە دوورگەکەیان. هێند تووڕەبووبوون خەنجەرت لێدابان خوێنیان لێنەدەهات.

وەلی نیشانچی، خێزانەکەی شێخ مووسی هێنابووو چاوەڕێی ئەوان بوو، کاتێک بینی هەموویان نائومێدو دڵشکاون، نیگەران بوو. گوتی: "بەخێربێنەوە چیتانکرد؟"

پویراز گوتی: "نەمانتوانی بیکڕین".

"چیتانە، ئەم خەمو خۆخواردنەوەتان لەچیە؟"

"هیچ"

چوون لەژێر دارچنارەکان دانیشتن. قوڵاتیان نەدەکرد. کەمێك دواتر، لێنا قاوەی بۆ هێنان. بۆنی قاوەی کوتراو ئەو ناوەی پڕکرد. دوای ئەوەی کە قاوەکانیان خواردەوە، روخساریان کەمێك گەڕایەوە حاڵەتی ئاسایی.

نیشانچی لەبەر کونجکۆڵی خەریکبوو دەمردو لەخۆی رانەدەدیت هیچ پرسیارێکیان لێبکات کە لەنیگەرانیان دەمو چاویان گرژ داهاتبوو. سەرەنجام جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "بوەستە نیشانچی، سەبرت هەبێت، من هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم".

هەموو شتێکی لەسیرەوە تا پیاز بۆ گێڕایەوە. نیشانچی لەقسەکانی ئەو نەگەیشتو چووە بیرکردنەوەوە. پاشان سەری خستە نێو شانەکانیو هەستاو رۆیشت. لەبیری ئەوەدابوو کە خانووێك بۆ شێخ مووس بکڕێت، بەلاّم ئێستا کاتی ئەم قسانە نەبوو. پویراز زۆر نیگەران بووبوو. نیشانچی ئێستا نەیدەتوانی بەرگەی ئەمە بگرێت.

وەلی نیشانچی، سەروبەندی عەسر، نوقمی نێو شادیو خۆشحاڵی گەڕایەوە ژێر چنارەکان. ئەوانیدی نانیان خوارد بووو کەمێك هاتبوونەوە سەرخۆیان.

نیشانچی، بەتریقەی پێکەنینەوە گوتی: "سەیری من بکەن، پویراز لەگەڵ تۆمە، سبەی دەچیتە شارۆچکەو خانووێکی نزیك ماڵی من بۆ شێخ مووس دەکڕیتو پێشیاندەڵێیت کە ناوی لەگەڵ ناوی ئێمەمانان تۆمار بکەن، تێگەیشتیت؟"

خۆشحاڵیی نیشانچی ئەوانیشی گرتەوە.

"تێگەیشتم، سبەی دەبێت بچمە شارۆچکە، خانووێك بۆ کاك شێخ مووس بکڕم، ناویشی بدەمە فەرمانگی نفوس تۆماری بکەن. چیدی؟"

"ئەوەی دی خۆت لەمن باشتر دەزانیت. ئیدی ئێستا، هەر ئێستا بەلەمێك دەكرِیتو پارەم پێدەدیت، هەر ئێستا. ئێوە خواردتانو خواردتانەوە. منیش لەبەر خاتری ئێوە لەبرسان مردم. من دەچمە لای لێنا. ئەو خواردنمان دەداتێ تا دەگەرێمەوە پارە ئامادەبێت".

"سەرچاو".

"ناوی ئەو پیاوە چیبوو؟"

"دەتەوێت چی بێت، ساڵحەكوێر، خوا ئەو چاوەی دیكەشی دەربێنێت".

نیشانچی گوتی: "دەریبێنێت".و دووركەوتەوە.

پویرازیش بەدوای ئەودا رۆیشت لەجانتاكەی پارەی هێنایەدەرو بۆلای نیشانچی راگرت. نیشانچی بەسەرسوڕمانەوە سەیری كرد.

"بۆ ئاوا سەیرم دەكەیت نیشانچی؟"

"پارەكە زۆرە".

"دكتۆری ئاژەڵان پارەی زۆرە".

جەمیلی پزیشك گوتی: "هەمە".

"كەوابوو خوا حافیز".

ئەم جارە پویراز سەری سوڕما.

"بۆ كوێ بەم پەلە پەلەیە، نیشانچی؟"

"دەڕۆم كەشتیی حەزرەتی نوح بكڕم".

"باشە، كەشتیی نوحت پیرۆز بێت. هەم ئەسپت لێدێت، هەم زرێو هەم كەشتیی نوح".

نیشانچی زۆر جیددی بووو ئەحمەدیش لەتەكی بوو. سواری بەلەم بوون. یەكسەر لەدوورگە دووركەوتنەوە. دەوروبەری عەسر گەیشتنە ماڵی عەلی چاوەش. عەلی چاوەش بەشەوقو زەوقەوە پێشوازی لێكردن.

"عەلی چاوەش، كاتێك كە خەریكبووم دەهاتم. سەیرمكرد ئاوی دەریای ئێوە دەتگوت ئاوی كانیە. دەتگوت هەموو رۆشنایی دونیا كەوتۆتە بنی دەریا. دەریای ئاوا روونم نەبینیوە. هەموو شتێك لەبنی دەریا بەدی دەكرا. قەوزە، بەرد، مەرجان، ماسی، وردە چەو، گوڵ. بنی دەریای ئێوە، هەندێك جێگای دەڵێی باخچەی گوڵانە، جگە لەوە، دەریای ئێوە لەرە لەریەتی لەماسی".

عەلی چاوەش بەجورئەتەوە گوتی: "وایە. ماسی هیچ دەریایەك وەك ماسی دەریای ئێمە بەتام نین، هەموو دونیا ئەمە دەزانێت".

چاوەکانی نیشانچی بریسکانەوە:

"کەوایە، ئێوەش ئەمەتان دەزانی؟"

"ئێمە نەزانین کێ بزانێت؟"

عەلی چاوەش گوتی: "دروستە کێ دەبێت بزانێت. ماسی مەڕمەرەی ئێمە لەدونیادا هێند بەناوبانگن کە تا دوێنی لێرەوە بەسندوقو بەتەنەکان ماسیی شوورو وشککراوەمان بۆ ئەمریکا هەناردە دەکرد".

"ئەمشەویش ماسیم ناوێت".

عەلی چاوەش گوتی: "دۆڵمەی بەقیمە".

"هەروەها ترخێنەشی لەگەڵ".

"دروستە، ترخێنە".

"ئێستا ترخێنەی هاتەسەر".

"بۆنی ترشی ترخێنە، ساوارو ماست، نیوشکی داغ، بۆنی تیژی پوونگەو بۆنی سیر، هەموو ئەو بۆنانە تێکەڵی یەك بوونە".

کەمێك دواتر، بۆنی ترخێنەی تازە ئەو ناوەی داگرت، نیشانچی وەکو منداڵێکی بزۆز نازی کرد:

"بۆنی ترخێنە، بۆنی ترخێنە منی لەبرسان کوشت، زووکەن بیهێنن. سفرە بێنن، نانی خڕ، ترخێنە، دۆڵمە... بۆنی ئەم ترخێنەیە منی کوشت".

زۆری نەبرد سفرەیەکی پڕ نەخشو نیگار پانکرایەوەو پاشان ترخێنەیان هێنا، کە هەڵمی لێهەڵدەستاو داندرایە سەر سفرە. هەر کە ترخێنە داندرایە سەر سفرە بۆنی سیر بەسەر هەموو بۆنەکانی دی زاڵ بوو.

نیشانچی دوای نانخواردن یەکسەر چووە سەر جێگاو لێیخەوتو بەیانی بەرلەوەی خۆر هەڵبێت لەخەو هەستا.

"ئەحمەد زووبە هەستە، سەیر بکە زۆر دەمێکە ترخێنە ئامادەیە، بۆنە خۆشەکەی هەموو لایەکی گرتۆتەوە، رابە ئەحمەد رابە".

سفرە پانکرابووەوەو کاسەی مسی جەلادراوی زارکبەرینو قووڵ داندرابوونە سەر سفرەو هەڵمیان لێهەڵدەستا.

"عەلی چاوەش هەستە من ببە لای ئەو کابرایە".

"سەرۆك نیشانچی من ناتوانم تۆ ببەمە لای ئەو. من لێی تووڕەمو تا ئەو ڕۆژەی دەمرم قسەی لەگەڵ ناكەم. ئەو برادەری سەردەمی سەربازیم بوو. ئەو بۆ من لەباوكو دایكو منداڵەكانم لەپێشتر بوو. دەتوانیت دایكو باوك بدۆزیەوە، بەڵام برادەری سەردەمی جەنگو سەربازی نا. ئەو لەپێناو بەلەمێك دڵی منی لەخۆی ڕەنجاند، لەبەردەم سەرۆك پویراز لەشەرمان بووم بەئاو. ئەو بۆ من لەگیانیشم بەهادارتر بوو. تۆ بڕۆ بزانم دەتوانیت ئەو ساڵحە بەدبەختە، كە ئومێدەوارم چاوەكەی دیكەشی دەربچێت، تێبگەیەنیت؟ تۆ زمانی ئەژدیهاكان دەزانیت، ئەو ئەژدیها حەوت سەرانەی كە ئاگر لەزاریان دێتەدەر؟ زمانی فریشتەكان، ئەولیاكان، زمانی حەزرتی خدر دەزانیت؟ ئەو هیچ زمانێك نازانێت. ئێمە پێكەوە لەچاناك قەڵا بەسەر مەرگدا ڕەت بووین، تۆ مەرگت دیوە، دەیناسیت؟"

"نایناسم".

"ئەگەر ناناسیت بۆچی دەچیتە لای ئەو نامەردەی كە بۆ بەلەمێك مرۆڤبوونی خۆی لەدەست دا؟"

"تاقیدەكەمەوە".

"تاقیبكەوە بزانم، تۆش تاقیبكەوە".

"بزانین چۆن دەبێت".

سەروبەندی خۆر هەڵاتن گەیشتنە گوندەكەی ساڵحەكوێر، دۆزیانەوە. لەگەڵ ساڵحەكوێر بۆلای كیسیر كایا ڕۆیشتنو گەڕانەوە، لێویان لەلێو جیا نەدەكردەوە، هەندێجار رادەوەستان، نیگاكانیان لێكگیر دەبووو چاویان دەبڕیە چاوی یەك. كە نیوەڕۆ داهات هاتنەوە ماڵ. نانی نیوەڕۆیان خوارد. دووبارە بۆلای كیسیر كایا كەوتنەڕێ، تا ڕۆژئاوابوو ڕۆیشتنو گەڕانەوە، لەئەسكەلە لەیەكدی جیابوونەوەو گەڕانەوە ماڵی عەلی چاوەش "چیبوو نیشانچی، چتان لەگەڵ ئەو بەرازە كوێرە باسكرد؟"

"هیچ عەلی چاوەش".

"قسەتان لەگەڵ نەكرد، ئەی چیتانكرد؟"

"لەبەیانیەوە تا شەو لەگوندی ساڵحەكوێر بۆ كیسیر كایا ڕۆیشتینو گەڕاینەوە".

"ئێستا دەتەوێت چیبكەیت؟"

"دیسان دەچمەوە".

"یانی ئەندازەی بەژنو باڵات نەگرتووە؟"

"نەمتوانی".

رۆژی دواتر کاتێك دەریا هێشتا سپی بوو وەڕێکەوتنەوە. تا دەریا کەوتە سەر شەپۆلان ئەوان گەیشتنە گوندەکەی ساڵحەکوێر. ساڵح لەئەسکەلە چاوەڕێی ئەوان بوو. هەر لەگەڵ بینینی ئەوان چاوانی بریسکانەوە، سێبەری شادمانیەك نیشتە سەر روخساری. بەرەو لای کیسیر کایا وەڕێکەوتن. دیسان وەکو دوێنێ راوەستانو سەیری یەکدیان کرد. لەگەڵ هەوا تاریك داهات، گەڕانەوە. ئەوشەوە عەلی چاوەش هیچ پرسیارێکی لەنیشانچی نەکرد. ئەویش هیچ قسەیەکی نەکرد.

ئەو رۆژە نیشانچی نەگەڕایەوە لای عەلی چاوەش. لەماڵی ساڵحەکوێر مایەوە، ئەحمەدیشی ناردەوە لای عەلی چاوەش، پێیگوت: "ئەحمەد مەگەڕێرەوە ئێرە. لەماڵی عەلی چاوەش دەتبینمەوە".

زۆری نەبرد. چەند رۆژێك دواتر، نیشانچی، دەمەدەمی بەیانی بەلەمەکەی ئالکۆی لەئەسکەلە راگرت. عەلی چاوەش کە لەکونجکۆلیان خەریکبوو شێت دەبوو لەئەسکەلە ئەوی بینی.

"وای دایکت، وای ژنت، وای لەحەوت جدو ئابادت ساڵحەکوێر، دەتویست ئەم کارە لەگەڵ مندا بکەیت. لەگەڵ برادەرێکت کە تا دەمی مەرگ لەگەڵیدا رۆیشتیت!"

نیشانچی واینواند کە قسەکانی ئەو نابیستێت.

"بەنزینت لەکوێ دەستکەوت، ماتۆڕێك ئەو هەموو ماوەیە کاری نەکردبێت کێ خستیەوە کار، ژەنگی هەڵنەهێنابوو؟"

نیشانچی گوتی: "ژەنگی هەڵنەهێنابوو".

دەستی خۆی درێژکرد، دەستی گوشیو پاشان باوەشی لێداو گوتی:

"سوپاست دەکەم عەلی چاوەش، ئێمە تا رۆژی دەمرین دۆستو برادەری یەکدی دەبین".

نەیتوانی بڵێت هەر ساڵحەکوێریش بەنزینەکەی داینێ.

ئەحمەد لەدواوەی عەلی چاوەشەوە بوو.

"یاللا ئەحمەد، سواربە، دەمەوێت خۆم بەلەمەکەی پزیشکی ئاژەڵان ببەمەوە بۆی".

# بەشی هەشتەم

حاجی رەمزی کاولاکزادە لەبەلەمەکەی خۆی، کە لەئەسکەلە لەنگەری گرت، پیادە بوو. راستو راست بەسنگی دەرپەڕیویەوە بەرەو لای چنارەکان هاتو لەڕۆخ کانیەکە راوەستا، پویراز موسا کە ئەوی بینیبوو لەماڵەوە هاتبووەدەر، بەدوودڵیەوە کە لەشیپانەی دەرگای ماڵێدا راوەستا، حاجی رەمزی سەیریکردو وەك بڵێی ئەوی ناسی، هاتە لێواری کانیەکە، دەستی یەکدیان گوشی. "بەخێرهاتی. فەرموو دانیشە".

"زۆر سوپاس".

یەك لەدوای یەك کەسانێکی گەنج بەجلوبەرگی شڕو دڕاوەوە لەبەلەم دادەبەزینو دەهاتنە سەر ئەسکەلە کە کوڵنگو بێڵو مشارو ئامێری دیکەیان پێبوو. پویراز بۆی لێکنەدرایەوە.

"من حاجی رەمزی کاولاکزادەم، هاتوومەتە خزمەت جەنابی پویراز موسا، وایە جەنابت ئەویت؟"

"خۆمم بەڕێز. تکا دەکەم فەرموو".

"شەرەفمەندم بەڕێز. بەڕێزان عوزێر خانو بەڕێوەبەری ناحیەو برامان عەبدولوەهابو هەروەها تاڵبی بەرپرسی تاپۆ، سلاویان بۆ بەڕێزتان هەبوو. هەموو خەڵکی شارۆچکە تۆ دەناسنو خۆشیاندەوێیت. هەمووان دەزانن تۆ قارەمانو خاوەنی مەدالیای زێڕینی جەنگی سەربەخۆییتو دەزانن کە ئێوە بەهەستکردن بەئەرکی گەورەیی نیشتمانپەروەریەوە هاتوونەتە ئەم دوورگەیە، هەروەها سەرانسەری ئەنەدۆڵی رۆژئاوا دەزانێت چ شکۆو رێزو شەرافەتمەندییێکی مەزنو بێهاوتاتان بەوان بەخشیوە".

"تکا دەکەم رێزدار تکادەکەم".

"ئێوە، ئێوە درەوشاوەترین خۆری ئێمەن، کە لەئاسیای ناوەڕاستەوە دەرکەوتوونو لەپێناو میللەتی ئێمەدا هاتوونەتە ئێرە".

"ئەم قسانە چین بەڕێز، ئێمە لەکوێو خۆری درەوشاوە لەکوێ". حاجی رەمزی پشتی راستکردەوەو گوتی: "ئەوەندە خاکەڕاو شکستەنەفس مەبە".

"بەڵێ بەڕێز، حاشا بەڕێز، ئێمە شتێك نین".

"ئێوە قارەمانێکی بێهاوتان. ئێمە باش دەتانناسین، دەزانین ئێوە کێن، ئێوە بیلبیلەی چاوی حەزرەتی عالی جەنابی مستەفا کەمال پاشان".

ئەبرۆکانی بۆ یەك هێنانەوەو حاڵەتێکی جیددی بەخۆ وەگرت:

"بەڵێ ئێوە...".

حاجی رەمزی هاتبووە جۆش‌و ئاگای لەخۆی نەمابووو یەکڕیز قسەی دەکرد. پویراز لەشەرمان تا دەهات زیاتر بچووك دەبووەوەو نەیدەتوانی سەیری چاوەکانی ئەو بکات، کە دەم دەمە بۆ هەر چوار لا وەردەچەرخان. قسە ستایشئامێزەکانی بەدوای یەکدا ریز دەبوون.

"بەڵێ ئێوە، دەزانم ئێوە، قارەمانی مەزنی نەتەوەیی، لێرە نامێنیەوەو هەر کە ئەرکی پیرۆزی خۆتان تەواوکرد، دەگەڕێنەوە بۆ ئەنقەرە. لەشارو دوورگەی دیکەش دەمێننەوە؟"

"من لەم دوورگەیە بۆ هیچ جێگایەکی دیکە ناڕۆم".

"تۆشیان وەك کاك عەبدولوەهاب زۆر رەنجاندووە؟ رەنگبێت دۆستەکەتان، حەزرەتی پاشا ئاگای لەوە نەبێت".

پویراز کە روخساری وردە وردە دادەکەوت، سەیری سەری نیوەکراوە، لێوانی باریك، ددانە لێکجیابووەکانی، کراسە سپی‌و کراواتە سوورەکەی دەکرد. دەتگوت هەر ئەمڕۆ ئەو قاتە شینەی کە دەستکردی بەرگدرووێکی شارەزا بوو، کردۆتە بەر. بەشی هەڵئاوساوی لای سەرەوەی شەلوارەکەی لەشمشێر دەچوو. چەکمەی ئاوەزێنەداری کردبوونە پێ‌و قامچییێکی دەسکزیوینی پێوە کردبوون. سمێڵە بابڕەکانی شۆڕ بووبوونەوە. بێپسانەوە قسەی دەکردو پویراز سەیری جلوبەرگەکانی دەکرد.

کڵاوی بەتەواوی نەخستبووە سەری، کڵاوێکی نوێ‌و گوڵێنگەداری وەنەوشەیی پێبوو. بۆچی کڵاوی لەسەر نەنابووو تا ئێرە بەسەری کۆتەوە هاتبوو؟ بۆچی کڵاوی چەرمینەی لەسەر نەنابوو؟ دەیزانی کە ئەمانە ناتوانن بەسەری کۆتەوە بێنە نێو خەڵك. بۆ دیدار لەگەڵ خەبانگێڕێکی جەنگی سەربەخۆیی وای بەباش زانیبوو لەجیاتی کڵاوی پێستی‌و کڵاوی ئاسایی بەسەری کۆتەوە بێت.

"تۆ لەجەنگی سەربەخۆیی بەشداریت نەکردووە؟"

حاجی رەمزی تاسا، دەستپاچە بوو.

"چۆنت زانی؟"

"چونکه کڵاوی پێستتان بەسەرەوە نیە".

"بەداخەوە نیە. کڵاویش، چونکە دەهاتمە لای قارەمانێکی وەك ئێوە نەمدەتوانی بینێمە سەرم، چونکە ئێوە ئەندامانی هێزە نیشتمانیەکان، حەزتان لەکڵاوی ئاسایی نیە".

"ئێوە بەشداریتان لەجەنگی نیشتمانیدا نەکرد؟"

"من خەباتگێڕێکی کەمئەندامم سوڵتانی خۆم. لەبەرەی رۆژهەڵات لەچیای ئەللاهو ئەکبەر جەنگاوم. من یەکێك لەپاشماوەی ئەو چەند سەربازانەی بەرەی رۆژهەڵاتم.

هەموو گیانم وەك بێژنگ هەنجندراوە. ئەگەر خوا خۆی نەیەوێت مرۆڤ نامرێت، ئێوەش لەبەرەی ئێمەدا جەنگاون. وانیە دۆستی من؟"

"وایە".

"خوا ئەگەر نەیەوێت مرۆڤ نامرێت، ئەفسەری‌و لەتەمەنی شازدە ساڵیەوە بەزۆرەملێ بردوویانیەتی بۆ بەرەی شەڕ، مەگەر نە؟ لەنەوەد هەزار کەس نیوەیان لەسەرمان رەق بوونەوەو نیوەشیان ئەسپێ لێیدان. وای، واای! پاشان لەئورفا، رێکخستنەکانی هێزە نیشتمانیەکانت خستەکار. فەرەنسیەکانت لەزێدی نیشتمان دەرکردو گەورەترین مەدالیای قارەمانی، واتە مەدالیای زێڕینی سەربەخۆییت وەرگرت".

"بەرێکەوت".

حاجی رەمزی زۆر تووڕە بوو، هەستا، دانیشتەوە. رەگی ملی هەڵمسابوون. بەنەڕاندنەوە گوتی: "تۆ چۆن دەتوانیت بڵێیت مەدالیای زێڕینی تایبەتی سەرکەوتن کە بەجەنگ‌و خوێنرێژی‌و کونکونبوونی جەستەی مرۆڤەوە وەدەست دێت‌و بەمافێکی رەواشەوە وەدەست دێت، بەرێکەوت بووە. ئەگەر بڵێیت من وەك کەمئەندامێکی جەنگ رێگەت پێنادەم. رێگە بەو خاکەڕایی‌و سادەبوونەش نادەم. کەسێکی مەزن ئەو مافەی نیە ئەوەندە خاکەڕاو شکستەنەفسی بنوێنێت. من وەك یەکێك لەپاشماوەکانی بەرەی رۆژهەڵات هەرگیز ئەو قسەیەتانم بەدڵ نیەو لێیڕازی نیم. تازە بۆ قارەمانێکی وەك ئێوە، کە لەچیای ئەللاهو ئەکبەر لەبەرانبەر رووسەکان، سنگی خۆت کردۆتە قەڵغان‌و ئازایانە جەنگاوی، نەك مەدالیایەك، بەڵکو هەزار مەدالیای سەربەخۆییش کەمە، کەمە".

خەڵکی دوورگە، بەهیچ شێوەیەك نەیاندەتوانی لەکەسێك نزیك ببنەوە کە لەبەرانبەر پویراز دادو فریادی بووو هەڵدەستاو دادەنیشت‌و پویرازی ناچار دەکرد بێدەنگ بێت، لەدوورەوە تەماشایان دەکرد. لێناش بەردەوام قاوەی بۆنخۆشی لەئاون هاڕدراوی بۆ پویرازو میوانەکەی دەبرد.

"دەزانم، حەزرەتی پاشا زۆرت لێدەپرسێت. چونکە ئێستا زۆر پێویستی بەتۆ هەیە. ئەگەر نەتدۆزێتەوە زۆر تووڕە دەبێتو دونیایان بەسەردا وێران دەکات. چونکە ئەو پێویستی بەقارەمانانی وەك ئێوە هەیە. بۆچی؟" چاوە زیتەکانی کە دەتگوت پارچەیەك پۆلان برِیە ناو چاوەکانی پویراز "لەم رۆژانەدا زۆر پێویستی بەپیاوانی گەورەی وەك ئێوە هەیە. ئێمە ئاگاداری ئەوەین. بۆچی؟"

پویراز بەبزەیەکەوە پرسی: "بۆچی؟"

"لەبەرئەوەی هێزێکی جەماوەری رێکخستووە. سەرۆکایەتیی تەواوی شارۆچکەکەشمانی بەمن سپاردووە. منیش قبولّم کردووە. حەزرەتی پاشا مەگەر بەئاسانی واز لەدۆستێکی وەکو ئێوە دێنێت؟ یەکەمجار دەتانکاتە نوێنەری ئەنجومەن. پاشان بۆ وەزارەت. لەتەشکیلاتی جەماوەریدا زۆر پێویستی بەتۆ هەیە".

"ئاوا. کەوابوو زۆر پێویستی هەیە؟"

"بەڵێ، چونکە پاشا سەرۆکی تەشکیلاتی جەماوەریە. لەدوای کەسانێك دەگەڕێت کە لەنێو خەڵکدا خۆشەویست بن. بەدوای کەسانێکدا دەگەڕێت کە وەکو ئێوە بەمافی خۆتان پلەی قارەمانیتان وەرگرتووە. ئێمە لەسەرمانە کەسانی وەك ئێوە، کە دڵیان شکاوەو تووڕەو گۆشەگیرنو پەنایان بردۆتە بەر دوورگەیەك بدۆزینەوە. بیانکەینە تاجی سەرمانو داوای لێبوردنیان لێبکەین".

"تکات لێدەم، گەورەیی دەکەیت".

"هەرگیز، نەخێر، هەموو تورکیا بەقارەمانیەتی ئێوە دەزانێت. شارۆچکەی ئێمە لەباسو خواسی قارەمانیەتی ئێوە شەپۆل دەدات".

"یانی دەبیتە سەرۆکی تەشکیلاتی پاشا".

"لەپێناو بەرژەوەندیی وڵات، پاشا فەرمانی کرد، ئێمەیان بەشایستەی ئەو پۆستە دیاریکرد. ئێمەش ناچاربووین قبوڵی بکەین. ئەگەر رزگارکەری ئەم وڵاتە ئەرکێکی گەورە بەئێوە، قارەمانی مەزنی وڵات بسپێرێت، بەسەرچاو قبوڵی ناکەیت؟"

"قبوڵی دەکەمو دەڵێم فەرمانتان سەرچاو".

"هەڵبەت ئەمە دەڵێیت. تۆ قارەمانیت. دەزانم، ئێستا دیسان حاشا دەکەیت. چونکە قارەمانێکی خاکەڕاو ئازایت، کە جەستەتان لەشەڕو نەبەردەکاندا هەموو هەنجن هەنجن کراوە، وەك بێژنگ".

دیسان چاوی بڕیە نێو چاوەکانی پویراز:

"بەڕێز، ئێمەش لەساری قامیش‌و ئاڵتین بولاق جەنگاوین، دە جاران مـردین‌و زینـدوو بووینەوە، گوللەی تۆپەکانی رووس هەموو گیانمانیان بێـژاوە، وەك بێـژنگ. لەبەرئەوەیـە شانازی گەورەی سەرۆکایەتیان بەئێمە بەخشیوە. مرۆڤ ئەگەر خوا نەیەوێت نامرێت".

"نامرێت".

تروسکاییەکی گەشی لەچاوەکانی پویرازدا بـەدیکرد. حاڵـەتی دەم‌و چـاوی نـەرم‌و نیان بووبوو.

ئێستا کاتی ئەوەبوو کە قەباڵەکانی نیشان بـدات. "بـەڕێز، ئێسـتا داوایـەکی بچووکم هەیـە، بەڕێز بەڕێوەبەری ناحیە، هەروەها عەبدولوەهابی برامـان‌و عـوزێر خـان داوایـەکی بچووکیان هـەبوو، گوتیـان لێـرە بـەدواوە کـەس ناهێتـە ئـەم دوورگەیـە، ئـەو کلێسـاو خوێندنگـەو ئـەو کۆشکانەی چێشتلێنەرەکان دەفرۆشینە تۆ، دەوڵەت زۆر پێویستی بەپارە هەیە".

بەوپـەڕی وردیـەوە لەسـیمای پـویراز رامـابووو بچـووکترین حاڵـەتی روخسـاری ئـەوی لەژێر نەزەر بوو. پویراز ئامادەبوو، پەی بەمەبەست‌و نیەتی حاجی رەمزی بردبوو.

"دەتەوێت چی لەکلێساو خوێندنگەو خانووی چێشتلێنەرەکان بکەیت؟"

"منـــیش پێمگـــوتن، ئـــەو کلێســـاو خوێندنگـــەو خـــانووی مامۆســـتاو خـــانووی چێشـتلێنەرەکانم بۆچـیە، پێیـانگوتم ئـەو خانووانـە هەڵدەوەشـێنیەوە، پاشـان کەلوپـەل‌و دەرگاو پەنجەرەو سوفال‌و کاریتەو تەختەکانیان دەفرۆشیت. منیش لـەدڵی خۆمـدا گـوتم چـی تێدایـە دەبێـت چـەند قرۆشـێك بـەو دەوڵەتـە بـبڕێن، کـە گیانمـان لەپێناویـدا داوەو هاوکاریەکی بکەین، هەموویانم کڕی".

"کلێسات بۆ کڕیوە بەچ کەڵکتان دێت. جارێـك کـە لەگـەڵ ڤاسـیلیدا بەبەردەمیـدا رەت دەبووین، پێکەوە چووینە ژووری. ئـەوێ هیچشـتێکی تێدانیـە. بـەتاڵ‌و حەتاڵـە. لەچـوار دیوار بترازێت شتێکی دیکە نیە".

"لەبەرئەوەی کاتێك کە ئەوان هاتنەوە نەتوانن بڵێن ئێرە کلێسای ئێمەیـە، نیشـتمانی ئێمەیە. لەڕاستیدا لەنێو کلێسادا هیچشتێك نیە. چەند دانە پەیکەرێك، چەند تـەختێکی لەسەر دانیشتن، پەیکەری مەریەمی پاکیزەو سوفالەکانی سەربان".

"ئەگــەر منارەیــەك دروســت بکــەین دەبێتــە مزگــەوت. تــازە، ئــەم کلێســایە، وەك بیستومانە، کرابووە نەخۆشخانەی بریندارەکانی چاناك قەلا".

حاجی رەمزی بەتووڕەییو روخسارێکی گرژ هەستا، دەستەکانی تەکان دانو دووبارە دانیشتەوە.

"نابێت، نابێت کلێسا بکرێتە مزگەوت. گوناحە، کفرە. ناڕەزایەتیتان لەبەر ئەوەیە پێتانوایە ڤاسیلی برادەرتان دڵی بڕەنجێت. ڤاسیلی ناتوانێت ناڕازی بێت. جگە لەوە ئەو کەسێکی ئیستەنبولی نیە. رەنگبێت ئەویش وەك تۆ مەئموور بێت. ئەگەر ئاوایە قسەیەکم نیە، نایڕەنجێنین. هەرچی ئێوە بڵێن باوابێت. تەنها پاشامان با نەڕەنجێت".

پویراز لەگەڵ ئەم قسانە هاتەوە سەرخۆی، ئەم پیاوە دەیەویست ڤاسیلی بەشوێنانەوە ببەستێتەوە. لەسەرخۆو خاکەڕاییانە گوتی:

"نە من، نە ڤاسیلی بەرفەرمانی هیچکەس نین، برادەری سەردەمی سەربازین".

"درۆیە، درۆیە، درۆیە. ڤاسیلی نەچووە شەڕی رووسان. ئەوان چوونە نێو فەوجی کرێکارەکان. ئەوان لەتەك یۆنانیەکان دژی ئێمە کەوتنە جەنگەوە".

"لەجەنگی دژی رووسەکان، یۆنانیەکان، یەهودیەکان، عارەبو کوردان، ئەگەر بەژمارەی کەمیش بووبێت لەگەڵ ئێمە بوونە".

"ئەوانیش ئەسپێ لێیدان، لەسەرمان رەق بوونەوە؟"

"هەم ئەسپێ خواردنیانو هەم لەسەرمانیش رەق بوونەوە".

حاجی رەمزی سەیریکرد کاتێك ناوی ڤاسیلی هێنا، نێو چاوانی پویراز گرژ بووو وێکهاتەوەو ددانی لەسەریەك گرساندن".

"ئەگەر وایە بۆچی ئەسپێ ڤاسیلیان نەخواردووە؟"

"کاك حاجی رەمزی بەڕێز، ئەسپێ بۆچی منیان نەخوارد؟"

"چونکە تۆ کەسێکی قارەمانی. ئەسپێ منیشیان نەخوارد. ئەم کلێسایە بەتایبەتی بۆیە تێکدەدەم تا ناونیشانێك لەو یۆنانیانە نەمێنێتەوە کە خیانەتیان لەگەڵ ئێمەدا کرد. ئەگەر ئەم کلێسایە بمێنێت، ئەوان دەگەڕێنەوەو دەڵێن ئێرە کلێسای ئێمەیەو منو تۆ لەم دوورگەیە دەردەکەنو بۆ ئاسیای ناوەڕاستو ئەو شوێنانەی لێیانەوە هاتووین دوورمان دەخەنەوە. هەم ئەم کلێسایەو هەم هەر کلێسایەکی دیکە ببینم وێرانی دەکەم".

پویارز کە لە هەموو شتێك گەیشتبوو، بە پارێز و کەمێکیش ترسابوو:

"بەڵێ، من گوتم کلێسا کردنە مزگەوت خێرە. حەزرەتی سوڵتان فاتح محەمەد ئەو رۆژەی کە ئەستەنبۆلی گرت، فەرمانی دا دەست لەکلێساکان نەدەن. هەروەها بۆ

یەکەمینجار، بەو مەبەستە (ئەیاسوفیا)ی کردە مزگەوت کە خێرەو یەکەمین نوێژیشی هەر لەوێدا کرد. بەگوێرەی نووسینی دیرۆکنووسان ئەو شوێنە بووە گۆشەیەك لەبەهەشت و ئەویش بووە یەکێك لەئەهلی بەهەشت".

حاجی رەمزی کە لەنەرمکردنی پویرازو بچووککردنی، جورئەتی هاتبووە بەر جارێکی دیکە بەتوورەیی هەستاو دانیشتەوەو لەکاتێکدا دەمارەکانی ملی رەپ راوەستابوون نەڕاندیو گوتی:

"دەزانی، دەزانی، دەزانی پویراز موسا، ئەو سولتان محەمەد فاتحە کێ بوو، دەزانی دایکی یۆنانی بوو".

چاوی بڕیە نێو چاویو بەجەختکردنەوە گوتی: "دەزانی، دایکی سولتان محەمەد فاتح کچە یۆنانیەك بوو، لەو بترازێت کێ دەیتوانی ئەیاسۆفیا بکاتە مزگەوت".

پویراز سەیریکرد حاجی رەمزی بڕیاری خۆی داوەو بەرگریکردن بێهوودەیەو کلێسا هەر تێکدەدات. رەنگبێت بەدوای ئەو زێڕانەشدا بگەڕێت کە یۆنانیەکان لەکلێسادا شاردوویانەتەوە.

"وازم لەکلێسا هێنا، بەڵکو لەم دونیایەدا تەنێ یەك ئەرکم هەبووبێت. ئەرکی مرۆڤ لەناو بوونی مرۆڤ خۆی دایە. تێگەیشتیت؟"

ئایا حاجی رەمزی کاولاکزادە خەریکبوو دان بەئەرکی خۆیدا بنێت کە کەوتە دوودڵیەوە.

"هیچکەس ناتوانێت ئەوە تێبگات کە ڤاسیلی لەم دونیایەدا چ ئەرکێکی هەیە. گەورەترین ئەرکی مرۆڤ لەناخی مرۆڤ خۆی دایە. تێگەیشتیت حاجی رەمزی کاولاکزادە؟ کلێسا تێك بدە".

"تکا دەکەم کاك پویراز، ڤارەمانی خۆمان. مەبەستی تۆ بەتەواوی تێگەیشتم".

"سولتان محەمەد فاتح، زاتێکی پیرۆزو گەورە بوو کە ئەستەنبولی بەنسیبی ئێمەکرد".

رەنگ بەروخساری حاجی رەمزیەوە، نەما.

"زاتێکی پیرۆز بووو ئەولیا..".

"دایکی یۆنانی بوو، با یۆنانی بێت. چما بەیۆنانیبوونی دایکیەوە سولتانی بەهەشتیی ئێمە دەبێتە مەسیحی؟"

"هەرگیز، بەڕێز".

"کلێسا وێران بکە".

"ئەگەر جەنابتان فەرمان نەدەن ناتوانم تێکیبدەم".

"تەنها..".

"فەرموو، گەورەی خۆم فەرمان بدە".

"خوێندنگـەو هـەردوو خـانووی مامۆسـتاکان دەفرۆشـیە مـن، بەهـەمان ئـەو نرخەی کڕیوتە".

"بـەڕێز تـەواو. ئەوانـە وەك دیـاری لـەمن وەربگـرە، ئەگـەر هەڵەیـەکمان کردبێـت بمـانبوورە. هـەروەك باووباپیرانمـان گوتوویانـە، بنیـادەم قـابلی هەڵەکردنـە. یادگاریـەك لەمنەوە بۆ ئێوە".

"پێویست ناکات، بڵێ بەچەندت کڕیون".

"باشە گەورەم، فرۆشتمنەتە تۆ".

"کەوابوو دەبێت بچینە لای عەبدولوەهاب بەگو قەباڵەکان بەناوی منەوە بکەیت".

"سەرچاو، بەڕێز، ئەمە خۆ شتێك نیە، هەر کاتێك ویستت".

"ڤاسـیلی زۆر چـاکەی لەگەڵـدا کـردووم، ئـەو بـرای ئێمەیـە. کـێ دەزانێـت کـێ چ جۆرە مرۆڤێکە".

حاجی رەمزی گوتی: "کێ دەزانێت". نەرم بووبوو. خۆفشکردنەوەکان نەمابوون.

لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد. پـویراز یـان مـەئموورە یـان دوورخراوەیـە، یـان کەسـێکی تۆراوو گۆشەگیر. ئێستا روون بووەوە کە ئەو پیاوە مەئمووریەتێکی هەیـە. بـاش بـوو کـە خوێندنگەو خانووەکانی مامۆستام یەکسەر دانە ئەو.

گەڕایــەوە لای ســەرکارگەرەکە، کــە وەك بــت لەدوایانــەوە راوەســتابوو. بەدەســت کلێسای نیشان دا:

"بڕۆ، یەکسەر دەست بەکاربە".

لـەم کاتـەدا لێنـا، جـارێکی دیکـە بەسـینیەك قـاوەوە دەرکەوتـەوە. روخسـاری گـەش‌و خەنـدانی هـەردووکیانی بینـی، خۆشـحاڵ بـوو. گـوتی: "نۆشـی گیـان، نۆشی گیـان". خێـرا لێیـان دوورکەوتـەوە. ڤاسـیلی لەماڵـەوە چـاوەڕوان بـوو، چـوو گرتیـە بـاوەش، پێیگـوت: "هەردووکیان خۆشحاڵن، خەیاڵم ئاسوودە بوو. کاریان بەئێمە دانیە".

لەخۆشحاڵیان نەیاندەزانی چیبکەن.

"کاریان بەئێمە نیە لێنا. مسۆگەرە لەپویراز دەترسن".

"مەدالیایەکی ئەوەندە گەورەی هەیە، مەدالیاش لەچی، لەزێڕ. چاوەزارەکەشی هێندەی لەپی دەستێك دەبێت و بەگەردنیەوەیە، لەسەر چاوەزارەکەشی نەخشی رۆژێك هەیە. ئەویش هەر لەزێڕی خالس. دەتەوێت نەترسن؟"

"ئاسوودە بووین لێنا".

"گوێم لێیانبوو قسەیان دەکرد. دەیانەوێت کلێسا تێکبدەن..".

"دەبێت هەر تێکیبدەن، من خۆ هەر نەچوومەتە کلێسا. دوای ئەوەی کە باوکم لەدەریادا نوقم بووو خنکا، بەبەردەرگاشیدا رەت نەبوومە".

وەستا کارەکە رۆیشت و ئەو کرێکارانەی هەڵگرتن کە لەئەسکەلە چاوەڕوان بوون و بردنی بۆ کلێسا. کەمێك دواتر، حاجی رەمزیش هەستاو گوتی: "با بچم سەرێك لەکرێکارەکان بدەم". پویرازیش لەگەڵ ئەو هەستاو بۆلای ماڵەوە رۆیشت. لێناو ڤاسیلی لەبەردەم پلیکانەکان رووبەڕووی بوونەوە:

"ئەم پیاوە کارێکی بەئێمە دانیە، وانیە؟"

"نە، لەکوێتان بیستووە دەیەوێت زیانتان پێبگەیەنێت؟"

"تورکەکانی ئێوە چیدەڵێن پویرازەکەم؟"

"چیدەڵێن دایکە لێنا؟"

"ئێژن دیوار گوێی هەیە"

پێکەوە چوونە خوارەوە، موسا کازم ئاغا، کچەکانی، مەلەك خانم و ئەوانیدی خەریکبوون بۆلای ئەوان دەهاتن.

"ئەو پیاوە رۆیشت، زووبن، بابچین لەسەر تەختەکان دابنیشین".

پویراز بەدوودڵیەوە سەیری دەوروبەری خۆی کردو پرسی: "بچین دانیشین، وەلی نیشانچی لەکوێیە؟"

لەسەر تەختەکان دانیشتن، پویراز هەموو قسەکانی نێوان خۆی و حاجی رەمزی بەوردی بۆ گێڕانەوە. حاجی رەمزیش باش خۆی ناساندبوو.

پویراز قسەی دەکرد، بەڵام ئەوان چاویان بڕیبووە کلێسا. لەم ساتانەدا نیشانچی لەپڕ سەرو کەللەی بەدەرکەوت.

"خەریکن کلێسا تێکدەدەن".

پویراز گوتی: "دەتوانن تێکیبدەن".

نیشانچی سەری سوڕما.

"چۆن؟"

"حاجی رەمزی کلێسای کڕیوە، قەباڵەکەشی لەنێو دەستە".

هەموویان پێکەوە دەستیان بەپێکەنین کرد.

نیشانچی دەستەکانی بەلاتەرۆکی شۆڕبووبوونەوەو هێشتا واقی وڕمابوو. پاشان وەك ئەوەی پێکەنینی لێتۆرابێت، بەسەرزەنشتکردنەوە گوتی:

"بۆچی پێدەکەنن، مەگەر کلێساش وەکو مزگەوت ماڵی خوا نیە، منارەیەکمان دروست دەکردو بێدەنگیان لێدەکرد".

"بێدەنگیان لێدەکرد، بەڵام کابرا ئەوێی کڕیوە، دەیەوێت تێکیبدات. قەباڵەی دروستی نیشان دام".

نیشانچی نەیزانی چیبکات، بۆ دواوە گەڕایەوە، چەند هەنگاوێك بۆلای کلێسا رۆیشت، راوەستا. بەردەوام دەستەکانی لێکدەدان و دەیکردنەوە. بێئەوەی بگەڕێنەوە وەکو کەوان کرایەوە: "مەگەر مزگەوتەکان قەباڵەیان هەیە؟ پێمبڵێن هەیانە؟"

پویراز گوتی: "هەیانە. ئێستا وەرە لای من دابنیشە. با بۆ تۆشی باس بکەم، بۆ هەمووانم باسکردووە، تۆ درەنگ هاتیت".

پویراز کێشەکەی خێرا خێرا بۆ باسکرد:

"ببینە نیشانچی. باش گوێ لەقسەکانم بگرەو ورتە ورت مەکە. گوێت لێمە؟"

"گوێم لێتە پویراز پاشا".

"کەوابوو گوێ بگرە وەلی ئاغا. ئەم حاجی رەمزیە جگە لەکلێسا کۆشکی چێشتلێنەرەکانیشی کڕیوە. دەیەوێت هەموویان تێکبدات و بیانفرۆشێت.

دەبێت سوپاسی خوا بکەین کە دوورگەکەمانی سەر لەبەر نەکڕیوە. لەو رووەوە خەیاڵم ئاسوودەیە. ئەگەر دەیکڕی، دەتانبینی خانووە چۆڵەکان و خانووەکانی ئێمەشی دەدایە بەر کوتکان و تێکیدەدان".

"قسەکانتم بیست کاکە پویراز. چما حکومەت و تۆ نەماون، تا ئەو بەکەیفی خۆی چی بیەوێت بیکات؟"

"حکومەتیش حاجی رەمزیە، منیش حاجی رەمزیم. حکومەت و دەوڵەتی هەموو ئەم ناوچانە حاجی رەمزیە. زۆر نابات دەبینیت، حاجی رەمزی وەکو ئاسمان بەسەر ئەم دەریاو چیاو شارۆچکەو دێهاتانەدا دەنەڕێنێت"

نیشانچی گوتی: "سەیرە، سەیر!" هیچی دیکەی نەگوت.

"ئەرێ سەیرە! ئێستا وەرە ئێرە لای من دابنیشە، ببینە بزانە چیدەڵێم".

"هاتم".

لەتەنیشت پویراز جێگایەکیان کردەوە، نیشانچی هات دانیشت، چاوی بڕینە نێو چاوی ئەوەوە.

"حاجی رەمزی دەبێتە سەرۆکی هێزێك کە مستەفا کەمال پاشا دایمەزراندووە، ئەوسا پلەو پایەی لەبەڕێوەبەری ناحیەو والی بەرزتر دەبێتو لەم ناوچەیە قسەی لەهەمووان زیاتر دەڕوات".

پویراز بەدرێژی باسی ئەو هێزە نوێیەی کرد، کە خەریکە دادەمەزرێت.

نیشانچی گوتی: "بیستم. تێگەیشتم مەبەست لەتەشکیلات چیە. ئەو تەشکیلاتە هی ئەنوەر پاشا نەبوو کە بووە هۆی ئەوەی سەربازەکانی سەرچیا لەسەرمان رەق ببنەوەو نەوەد هەزاریان لەسەر دوندی چیا ببنە خۆراکی ئەسپێیان؟"

"بەڵێ باشت پێکا. ئەوبوو".

"تۆ لەسەربازەکانی مستەفا کەمال نیت؟"

"لەئورفا لەژێر فەرمانی ئەودا خزمەتم کردووە".

"مەدالیای زێڕیش ئەو پێتی داوە، وانیە؟"

"بەفەرمانی ئەو دایان".

"کاولاکزادە جارێ ناتوانێت هیچمان لەگەڵدا بکات، وانیە؟"

"جارێ نا".

نیشانچی زۆر تووڕە بووبوو، هەستایەوەو یەکسەر دەستی دانایە سەر دەمانچەکەی:

"ئەگەر ئەو گەندە پیاوە دوورگەکەمان بکڕێتو خانووەکانمان تێکبدات، منیش دەیکوژم، کەلاکەکەشی وەك کەلاکی سەگ رادەکێشمو هەڵیدەدەمە نێو چاڵێك".

پویراز یەکسەر راپەڕیو دەمی نیشانچی بەدەست گرت.

"وس، دەبیستن، هاوار مەکە".

سەری خستبووە نێو باخەڵی خۆیو بەدەست دەمی گرتبوو. نیشانچی دەستو پێی دەکوتان، دەنگی دەرنەدەهاتو نەیدەتوانی خۆی لەدەستی پویراز قوتار بکات.

"بێدەنگ بە، وەرەوە سەرخۆت، بیکە بەخاتری خوا بێدەنگ بە".

ڤاسیلیو موسا کازم ئاغاو مەلەك خانم هەستانو هاتنە لای ئەوان گوتیان:

"بێدەنگ بە کاك وەلی، بێدەنگ بە".

"ئەنوەر پاشامان لەبەردەمە".

"وس".

"پویراز تۆش دەستت لەسەر دەمی هەڵبگرە، خەریکە دەیخنکێنیت".

پویراز یەکسەر نیشانچی بەڕەڵلاّ کرد. مەلەك خانم قۆڵی گرتو داینیشاندە سەر تەختەکان. نیشانچی لەبەر ئارەقە هەڵاّتبووو هەناسەبڕکێی پێکەوەتبوو.

یەکەمجار دایکە قسەی کرد، پاشان موسا کازم ئاغا، دوای ئەوانیش مەلەك خانمو ڤاسیلیو دوای هەمووانیش پویراز.

"وازم لێبێنن، بەڵێنتان پێدەدەم کارم پێی نەبێت".

هەناسەی ئاسایی بووبووەوە، هەستاو بۆلای کلێسا وەڕێکەوت. دەمانچەکەی کەمێك بۆلای پێشەوە هاتبووو دەستی خستبووە سەری. ئاوا بەبەردەم کلێساو ئەو کرێکارانەی کە لەناوەوە کورسی، مێز، تابلۆو تەختی دانیشتنیان دەهێنایەدەر، تێپەڕیو لەڕۆخ قامیشەڵانەکە گەڕایەوە. قیتاو قیت، سنگی دابووە پێش خۆی، دەستی دانابووە سەر دەمانچە. تا شەو داهات بێپسانەوە لەیەك ڕێڕەودا هاتوچوو.

کرێکارەکان، ئەو پیاوە وردیلە دەمانچە بەقەدەیان بینی، بەئاساییان وەرگرت. حاجی ڕەمزی بەبینینی ئەو نیگەران بوو، وا تێگەیشت ئەمە یارییێکە لەلایەن پویراز موساوە ڕێکخراوە. چووە ناو کلێسا. لەسەر کورسییێك دانیشت تا بتوانێت کە تێدەپەڕێت ببینێت، کاتێك کرێکارەکان دەستیان بەڕماندنی سەربانی کلێسا کردبووو کاشیە سوفالیەکانیان دەهێنایەخوار، چووە دەرەوە. نیشانچی خۆی لێمووڕ کردەوەو چاوی بڕیە نێو چاویو لەنزیکیەوە تێپەڕی. حاجی ڕەمزی لەو ڕەفتارەی ئەو ترساو یەکسەرو بەپەلە چووەوە ژێر دارچنارەکان، هەمووان هەستانو جێگایان بۆ کردەوە. لەگەڵ ئەو کەسانەی لەوێ بوون چاكو چۆنی کردو خۆی پێناساندن. لێنا، قاوەی سەر بەکەفی هاڕدراوی هێنا، کە بۆنەکەی هەموو ئەو ناوەی داگرتبوو. باسو وتووێژ گەرم داهاتبوو. حاجی ڕەمزی کە نیگەران بووبووو هیچ باسی نیشانچی نەکرد، بەلاّم هەر دەم نادەمێك نەیدەتوانی سەرێك هەڵنەکێشێتو چاوەدێری نەکات.

حاجی ڕەمزی کاولاکزادە هەرجارێك دەڕۆیشتو دەهاتەوە، هەمووان بەڕێزەوە لەبەری هەڵدەستانو تا دادەنیشتەوە بەپێوە دەمانەوە.

حاجی ڕەمزی ئەمجارە بەئەبرۆی تێکنراوەوە هاتو لەتەك پویراز دانیشت:

"ئەم کرێکارانە هیچ کارناکەن، هەردەبێت مرۆ بەسەریانەوە بێت، فێری ئیشکردن نین، ئەو شتانەی لەکلێسا دەیهێننەدەر بەکەڵکی هیچ نایەن. چەند دانە درەختێك و هەندێك وردەواڵەی سوفالی، هەر ئەوەندە زەحمەتەکە ناهێنن. وەستاکارەکە هیچی پێ لەگەڵ ناکرێن. من ئومێدم بەکۆشکی چێشتلێنەرەکانە. ئەگەر ئەوێش وەکو کلێسا بێت ئیشمان فشەیە".

دەنگێکی شێواوی هەبووو لێوەکانی دەلەرزین.

"نیگەران مەبە حاجی ڕەمزی بەگ. کۆشکی چێشتلێنەرەکان پڕن لەتەختەو هەموو کۆشکەکان لەباشترین دار دروست کراون. کاتێك یۆنانیەکان شکستیان خواردو رایاندەکرد، هەموو شارۆچکەو دێهاتەکانی ئزمیری گەورەیان سووتاند. زۆرمان پێویست بەدار هەیە. دارو تەختە ڕۆژ بەرۆژ گرانتر دەبێت. پارەیەکی زۆر زۆر باش بەدەست دێنێت".

"ئینشاڵڵا بەڕێز، خوا بەدەمتان دابنۆڕێت. دەنا نابوود دەبین. ئەو پارەیەی کە بۆ کۆشکەکانم تەرخان کردووە، کەم نیە. نەمدەویست بچمە نێو ئەم کارەوە. بەڕێز بەڕێوەبەری ناحیەو عەبدولوەهابی برامان و هەموو ئەندامانی دەوڵەت گوتیان ئیللاو بیللا دەبێت کلێساو کۆشکەکان بکڕیت. گوتیان دەبێت کلێساو خوێندنگەو کۆشکەکان بکڕیت. ئەگەرنا هەموو ئەو سامانە لەشوێنی خۆی دەڕزێت و لەنێو دەچێت. گوتیان تۆش پیاوێکی تێکۆشەری، لەپێناو ئەم وڵاتەو لەخۆشەویستی نیشتماندا گیانفیداییت کردووە. بۆیە ئێمەش کڕیمان. لەبری خوێندنگەو خانووەکان پارەتان لێوەرناگرین. قەباڵەکان سبەی یان دووسبەی دێنم و دەیاندەم بەکاکە پویرازی بەڕێز".

تێبینی خۆشحاڵبوونی پویرازو ئەوانیدی کرد:

"کەسێکی تێکۆشەر دەبێت فیداکارییێکی وەهاش بکات. کەسێکی نیشتمانپەروەر لەپێناو ئەم نیشتمانەدا دەبێت خۆ بەخت بکات، منیش لەبەرامبەر ئەو هەموو داواکاری و سووربوونەوەدا نەمتوانی پێش بەخۆم بگرم. بەخۆمم گوت، کەسێك کە لەپێناوی ئەم نیشتمانەدا گیانی خۆی، خوێنی خۆی دەبەخشێت، پارەکەی نابەخشێت؟! ئەوەبوو کە هەرچی پارەی هەمبوو هێنام و لەمانەم خەرج کرد".

"خوا دەست بەباڵتەوە بگرێت".

"لەگەڵ ئێوەش".

حاجی ڕەمزی بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوو. بەردەوام سەری هەڵدەبڕیو لەروخساری پویراز ورد دەبووەوە. روخساری حاڵەتی ترس‌و شادمانی بەخۆوە گرتبوو. دەمی لەگوێی پویراز نزیك کردەوەو بەدەستی نیشانچی کە لەبەردەم دەرگای کلێسا بەخێرایی دەچووە سەرەوەو دەهاتەوەخوار نیشان داو بەچرپە لێپرسی: "ئەو پیاوە وردیلەیە کێیە؟"

"کاك وەلی نیشانچی".

بە هێواشی گوتی:

"دەمانچەیەکیشی بەکەلەکەوەیە. نوێ نوێشە. کونجکۆڵی کردم. سەیر بکە لێکلێکە دێت‌و دەچێت، تووڕەشە".

"پێیدەڵێن کاك وەلی نیشانچی. یەکێك لەماسیگرەکانی دەریای ڕەشە".

هەستا، قۆڵی ڕەمزی گرت:

"زووبە، هەستە بابچین پیاسەیەك بکەین".

بەرەو لای ئاشی لای سەرەوە ڕۆیشتن.

"وەلی نیشانچی لەهەموو شەڕەکاندا بەشداری کردووە. باڵکان، جەنگی یەکەمی جیهانی‌و جەنگی سەربەخۆیی. ماوەیەکی زۆر لەکاناڵدا ماوەتەوەو لای پاشا لەهەواڵگری سوپا خزمەتی کردووە. پاشا زۆر کەوتۆتە بەردڵی، کردوویەتی بەعەریف‌و ناردوویەتیە ئێرە".

"بۆچی؟"

"بۆچی ناردوویەتی، ئەمەیان نازانم".

روخساری حاجی ڕەمزی بتەوێت یان نا زەرد هەڵگەڕا، دەستی خستە نێو دەستی پویراز. بیریکردەوە، ئەو شتەی کە لێیدەترسام هاتە ڕێم. بۆچی ئەم پیاوەیان ناردۆتە ئێرە کە دەڵێی جنۆکەیە، چ جۆرە کارێکی هەواڵگری لەم دوورگەیە ئەنجام دەدرێت؟ ئەگەر بڵێم چاودێریی کەشتیەکانی رووس دەکەن، رووسەکان دۆستی دەوڵەتی خۆمانن، یۆنانیەکان بڵێم، لەڤاسیلی بترازێت هیچ یۆنانیەکی دیکە لێرە نەماوە، بەڵکو خەریك بێت کاری هەواڵگری لەسەر خۆمان بکات، بەڵام هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ ئێمەشدا نیە. لەدڵی خۆیدا گوتی، ئەم کارە پەیوەستە بەدەوڵەت، ئێمە سەرمان لێیدەرناچێت. لەگەڵ ئەوەشدا دیسان من، ئێمە وەك ئەوەی پێویستە ناچارین ڕەفتار لەگەڵ کاك وەلی نیشانچی بکەین".

"ئەم کاك وەلی نیشانچیە بەڕێزە، واتە عەریفی خۆشەویستمان، برادەری سەردەمی سەربازیتە؟"

"نەخێر، لێرە، لەم دوورگەیە ناسیم. کەسێکی رازدارە، لەو جۆرە کەسانەی کە سەر دەدەن، سڕ نادەن".

"شێوەو قەدو قیافەی خۆی گۆڕیوە".

"ئێمە خۆ نازانین کێ چ کارەیە، بەڵام بەچاوی خۆم بینیم کە لەماسیگریدا شارەزاییەکەی بێهاوتایە".

ئەمە رێك کاری ئەرکدارانی هەوالگریە، کە شارەزای هەموو کارێکن. هەر کارێکیش بکەن شێوەو قەدو قیافەیان بەپێی ئەو کارە دەگونجێنن.

ویستی بڵێت، ئەرکدارانی هەوالگری، کەسانێکی پڕوپاگەندەسازن، بەڵام نەیگوتو پەشیمان بووەوە.

"سەرۆك وەلی ماسیگرێکی زۆر شارەزایە، لەدوور دوورەوە تەماشای دەریاکان دەکاتو دەزانێت لەژێر ئاودا چی هەیە، چی نیە، چەند زۆر ماسی هەن، من لەهەموو تەمەنمدا هیچکەسی وەك ئەو پیاوەم نەبینیوە".

پویراز بەجۆشەوە باسی جەنگەکانی کەناڵو ماسیگرتنەکانی وەلی نیشانچی بۆ فەرماندەی خۆی لەدەریای سوور کرد.

"ئەو لەژێر دەریاو بەنێو ماسیەکاندا وەك ئەوەی لەسەر وشکانی بڕوات بەهەمان شێوە رۆیشتووە".

حاجی رەمزی لەبەرخۆیەوە گوتی: "راستە، راستە، ئەو پیاوە ئەرکداری هەوالگری دەریاشە".

"رەنگبێت کاك وەلی نیشانچی هەمان ئەو کەسە بێت کە لەچاناك قەڵا بەبۆمبا کەشتیەکانی ئینگلیزی نوقم کردبێت".

"من ئەمەیان نازانم. بەڕێز".

"بەڵکو ئەم کاك وەلیە سەرهەنگی خانەنشین بێت. ئەگەر وانەبێت بۆ دەبێت بینێرنە ئەم دوورگەیە؟"

"نازانم بەڕێز".

"من بەو دەناسێنیتو ئاشنام دەکەیت؟"

"سەرچاو، بەڕێز حاجی رەمزی ئەمە چ قسەیەکە، هەڵبەتەکە ئەمە دەکەم. تەنها تکایە پێی نەڵێیت بەتەمایت کۆشکی چێشتلێنەرەکان تێکبدەیت. تکات لێدەکەم بەڕێز ئەمشەو من قسەی لەگەڵدا دەکەم، رازی دەکەم. ئاشکرایە، پیاو نازانێت کێ چ کارەیە".

"سوپاست دەکەم کاك پویراز، منەتبارم دەکەیت. کاك وەلی کە زیانێك بەئێمە ناگەیەنێت، رێگر نابێت کە من ببمە سەرۆکی تەشکیلاتی هێزە تازەکە؟"

"پێموانیە".

بەدەم قسەکردنەوە هاتنە ژێر چنارەکان دانیشتن.

پویراز بەئاماژەی دەست بانگی نیشانچی کرد، کە بەرامبەر کلێسا بەخێرایی دەچووە سەریّو دەهاتەخوار. ئەویش هەر لەگەڵ بینینی ئاماژەکردنەکەی پویراز بەڕاکردن هاتە لای ئەوان. لەگەڵ گەیشتنی یەکسەر حاجی رەمزی لەبەری هەستا، پویرازو ئەوانی دیکەش هەستان.

"فەرموو بەڕێز، نووری چاومان کاك وەلی هێژاو خۆشەویست فەرموون دابنیشن". نیشانچی چاوێکی بەدەوروبەردا دەخشاندو سەیرێکی پویرازی دەکردو بەسەرسوڕمانەوە چاوێکی بەحاجی رەمزی دادەگێڕا.

"فەرموون کاکە، تکا دەکەم فەرموون".

نیشانچی هەروا بەواقوڕماویەوە سەیری دەوروبەری دەکرد.

پویراز موسا گوتی: "فەرموو دابنیشە سەرۆك وەلی".

دەستی وەلی نیشانچی گرتو لەتەنیشت خۆیەوە داینیشاند.

"سەرۆك وەلی خۆشەویست، ئاشنابوون لەگەڵ تۆ بۆ هەموو کەسێك بەبەختەوەرییێکی گەورە دادەندرێت. دوورگەو شارۆچکەی ئێمەت سەرفراز کردوون، پێبڕانی شانازیی بینینی خەباتکەرێکی قارەمانی نیشتمانی وەك ئێوە رێکەوتێکی جوانو دەگمەنە".

لەدەمانچەکەی قەدی سەرۆك وەلی ورد بووبووەوەو ساتێك چیە چاوی لەسەر هەڵنەدەگرت.

"سەبارەت بەئێوە هێندەم قسەو باسی جوان بیستوون، کە هەم سەرسام بوومو هەم لەناخی دڵمەوە شەیدای ئێوەم".

سەرۆك وەلی بەسەرسوڕمانەوە چاوەکانی کردبوونەوەو گوێی راگرتبوو داخۆ ئەو پیاوە چیدەڵێت.

"ئەو کاتەی ئێوەی قارەمانی خۆشەویستمان، لەژێر دەریاکاندا کاری هەوالگریت ئەنجام دەدا، کەشتیەکانی ئینگلیزت دەتەقاندنەوە، هەموو کەشتیەکانت نوقمی ژێر ئاوەکان دەکردو بۆ رزگارکردنی ئەستەنبولو نیشتمانمان تێدەکۆشایت، ئێمەش لەبەرەی قەفقاسەوە لەگەڵ رووسەکان دەجەنگاینو خوێنی سوورمان دەڕژایە سەر بەفری سپی کەژو کێوەکان.

زۆرمان کوشتن‌و زۆرمان لێکوژران. نەوەد هەزار کەسمان هەر ئاوا بەپێوە لەسەرمان رەق بوونەوە. ژمارەیەکیشمان ئەسپێ خواردنی. تەنها هێندەی بەپەنجەی دەست بژمێریت بەزیندوویی ماینەوە. یەکێك کوێر، یەکێك شەل، یەکێك بەدەستو قاچی پەڕیو، یەکێك بەجەستەی کونکونکراو. شکستی بەرەی رووسەکان، کاك وەلی هێژا، شکست نەك دۆزەخ. لەو دۆزەخە چۆن دەربازمان بووو نەمردین، موعجیزەی خوا بوو. گەورەم، موعجیزەیەکی گەورە، موعجیزەیەکی گەورە. خوا بەرەی رووسەکان بەنسیبی هیچکەس نەکات".

"ئامین".

ئێوە کاتێك لەچاناك قەڵا خەریکبوون کەشتیەکانی ئینگلیزتان رەوانەی ژێر دەریا، ژێر تاریکایی دەکردن... ئەشك لەچاوانی قەتیس مابوون، ئەگەر پێشی بەخۆی نەگرتبا، هۆڕ هۆڕ دەستی دەکرد بەگریان. "ئەگەر ئێوە نەبان هیچکەس نەیدەتوانی ئەم نیشتمانە بێچارەیە رزگار بکات".

"ئامین. من نە لەچاناك قەڵا بووم، نە لەژێر دەریای تاریك".

"مەگەر لەژێر فەرماندەیی مستەفا کەمال پاشا نەبوویت؟"

"چۆن دەمتوانی لەژێر فەرمانی ئەودابم من چەندین ساڵ ئاوارەو دەربەدەری بیابانەکان بووم. دواجاریش لەسەربازی رامکردو خۆم لەدەست لەکوڵنانی ئێسكو پێستی مردووان دەرباز کرد. ئەگەر نا لەمێژ بوو لەنێو چووبووم".

"پەنا بەخوا سەرۆك وەلی هێژا. چەندین ساڵ ها؟ وای، وای راکردووە، ها؟ وای وای تاریکایی ها؟ وای وای".

بەڵێ نکوڵی دەکات، ئەو پیاوە دەبێت کەسێکی زۆر گرنگ بێت کە ناردوویانەتە ئەم دوورگە چۆڵە. ئەگەرنا کێ دەتوانێت بڵێت من سەربازی راکردووم؟

سەربازێکی راکردوو کەی جورئەتو زاتی ئەوەی هەیە کە باس لەراکردنی خۆی لەخزمەتی سەربازی بکات؟

تا دەهات زیاتر نیگەران دەبووو بەو ئەندازەیەش ترسو دڵەڕاوکێی زیاد دەبوو.

"ئەستەغفیرولڵا گەورەم. چەند خاکەڕای. هەڵبەتە لەگەڵ مستەفا کەمال پاشادا بێنەو بەردەت هەبووە، مەگەر ئەمە جێی پرسیارە؟"

"من کاتێك لەبیابان رامکرد، ساڵو نیوێکی درێژە کێشا تا گەیشتمە شارۆچکە. یەکەمجار بەبەلەمێك رامکردو چوومە نێو دەریا، چوومە نێو گوندەکان ماسیم فرۆشتنە دێهاتیەکانو لەجیاتی ماسی، نانو ساوارو رۆنو کەلەمی رەشم لێوەرگرتن. ئاخر

دەزانیت بەڕێز، خۆم لەدەستی ئەرکدارانی دەوڵەت دەشاردەوە. تا بڵێیت سەربازی راکردوو لەم لێوارو چیاو بەندەنانە زۆرن. سەیرمکرد لەدەریادا ناتوانم خۆم بشارمەوە، چوومە نێو چیاکان، بەزەحمەت توانیم گیانی خۆم قوتار بکەم".

"سەیرە!"

"بەڵێ سەیرە! من تازە بەتازە ناوی مستەفا کەمال پاشا دەبیستم".

"هەرگیز نەچوویتە ئەنقەرە؟"

"من هیچ کارێکم لەئەنقەرە نیە. ماڵی باوکم لەوێیە یا دەریایەکی پڕ لەماسی؟ چ ئیشم بەوێندەرە، ناوەڕاستی بیابانی ئەنقەرە. تۆ چ جۆرە کەسێکی یەکڕیز خەریکی پرسیاری بێسەروبەر دەکەیت. تۆ دەڵێی لەبەرەی رووسەکاندا قولابت قووت داوە! لەوێ هۆش‌و هەستت لەدەست داوەو گەڕایتەوە، ئەگینا هیچکەسی عاقڵ کلێسایەکی ئاوا جوان تێکدەدات. کوڕە تۆ سەربازی راکردوویت". تووڕەیی سەرۆك وەلی زەندەقی حاجی رەمزی برد.

"تکا دەکەم بەڕێز سەرۆك وەلی، تووڕە مەبە، هەر ئەمرێکت هەبێت، سەرچاو. ئەگەر پێتخۆشە دەڵێم با دەرحاڵ کلێسا دووبارە دروست بکەنەوەو منارەیەکی گەورەشی لەبەردەمدا دروست بکەن، بەخێری باوك‌و دایکی خوالێخۆشبوومەوە".

"کوڕە ماستاو مەگرەوە، کەسێکی وەکو تۆ، لەدەستی بێت دوورگەو ئێمەش پێکەوە دەسووتێنێت‌و بەدیاریشمانەوە رادەوەستێت‌و سەیرمان دەکات‌و کەیفێ دەکات. ئەمن خەڵکی وەکو تۆم زۆر بینیوە. تێگەیشتیت؟"

نیشانچی هەستایە پێ‌و دەستی دانایە سەر دەسکی دەمانچەکەی. لەم نێوەدا حاجی رەمزی سەرتاپا لەبەرعارەقە هەڵاتبوو.

"تکات لێدەکەم، تکات لێدەکەم، بەڕێز سەرۆك وەلی، تێڕوانینتان لەسەر من دروست نیە، بەڕاستی تۆ پێتوایە من بتوانم رەفتارێکی نادروستم بەرامبەر قارەمانێکی وەك تۆ هەبێت؟"

"وازبێنە کوڕە، درۆزن، ماستاوچی، من نە قارەمانم‌و نەهیچ، منیش وەکو تۆ سەربازی راکردووم. ئەگەر رامنەکردبا ئێستا ئێسقانەکانم لەبیابان رزیبوون".

"حاشا، گەورەم!"

"حاشاو ماشا سەرت بخوات، بینیادەمی دووڕوو، هەزارڕوو! تۆ چکارەیت! منیش وازدێنم، ئەم دوورگەیە بەجێدێڵم‌و دەڕۆم. ئەم حاجی پویرازەیش پێیوابووە تۆ مرۆڤیت بۆیە بۆتە برادەرت. تف لەبیچمی، تف لەمەدالیاکەشی، تف لەنەزرە

قوربانیەکەی، تف لەبەلەمەکەی، تف لەدەمانچەکەی. دوورگە بەسەری دا بڕووخێت. منیش وامدەزانی حاجی پویراز مرۆڤە. خۆی‌و دوورگەکەی... ئەو مرۆڤ نیە. بۆتە حاجی رەمزی. وەکو حاجی رەمزی بۆتە توخمە بەراز. کرمی نێو زبڵدان. من سەیر بکەن چەندم خۆشدەویست".

تا تەمەنم گەیشتە ئەمڕۆ لەدەست کەس ئەوەندەی پویراز فریوم نەخواردووە. من دەبێت ئێرە بەجێبێڵم، ئەم دوورگەیەو ئەم دۆزەخە پیرۆزی خۆتان بێت. زۆری پێناچێت حاجی رەمزی خانووەکانتان بەسەرتان دادەڕووخێنێت‌و جێگاکانیان دەکاتە جۆ. ئێوەش رووت‌و قووت‌و بێسەرپەنا دەمێننەوە. پویرازی نەفرەتی، نەدەبوو ئەو بەڵایانە بەسەر من بێنیت. نەدەبوو دەستباری ئەو پیاوە ناپیاوە بکەیت‌و من ئاوا شەرمەندە بکەیت. منیش لێرە دەڕۆم‌و دەچمە لای پاشای خۆم".

دەستی خستە سەر دەمانچەکەی‌و بەخێرایی وەرسووڕا. کاتێك دەیویست بڕوا، دەمانچەکەی لەقەدی کردەوەو هەڵیدایە بەردەم پویرازو بەراکردن‌و لەچاوتروکانێکدا لەپشت خانووەکان بزربوو.

حاجی رەمزی زەرد هەڵگەڕابووو وەك بی دەلەرزی.

"پەنا وەبەرخوا، پەنام وەبەرخوا، من چیمکرد، ئێو خۆتان شایەدن، هیچ رەفتارێکی نەشیاوم کرد؟ هۆی ئەو هەموو تووڕەبوونە چیبوو؟ من پێتانم گوتبوو، ئەمە کەسێکی ترسناکە. ئێستا خۆتان شایەد بوون، گوتی دەچمە لای مستەفا کەمال پاشا. کارێك بکەن. رێگەی لێبگرن".

پویراز دەستی گرت‌و هەڵیستاند.

"نیگەران مەبە، ئەو پیاوێکی تووڕەو تووشە".

"زۆری نەمابوو بمکوژێت، بمبوورە بەهۆی منەوە ئێوەش...".

"ئەو ناتوانێت هیچکەس بکوژێت، مێرووڵەیەکیش ئازار نادات".

"بەڵام دەمانچەیەکی بەقەدیەوە بوو؟ من دەڕۆم. هیوادارم هیچ بەڵایەکتان بەسەر نەهێنێت. ئەو ئەرکدارانەی هەواڵگری هەرکەسێکی بیانەوێت لەنێوی دەبەن‌و کەسیش ناتوانێت بپرسێت".

"کاتێك دەمانچەکەی فڕێ دەدات‌و دەڕوات مانای وایە دەیەوێت بڵێ رەحمەت پێناکەم. دەیەوێت بڵێ دەتەوێت دەمانچەکە هەڵبگرەوەو من بکوژە".

حاجی ڕەمزی لەکاتێکدا قاچی ڕاستی لەپێشەوە بوو، لەشوێنی خۆی ڕەق هەڵات، نیگەران بوو، دەستو پێی دەلەرزینو گوتی: "پاشاکەی، پاشاکەی، خەریکە دەچێتە لای پاشاکەی. پشتی قایمە. ئەگەرنا کێ لەرۆژێکی وەك ئەمڕۆ دەتوانێت بڵێ من سەربازی ڕاکردووم؟ مستەفا کەمال پاشا..".

"بەڕێز ئەو ئەگەر کارێکی دیکەشی لەم دەوروبەرانە هەبێت، ناتوانێت هیچ زەرەرێکمان لێبدات. سەبارەت بەئێوەشەوە بەهەمانشێوە. ئەگەر ئەرکێکی نهێنیشی هەبێت، پەیوەندی بەئێمەوە نیە. کەسێکی زۆر زۆر هوشیارە. ماسیگرێکی بێهاوتایە".

"ئەمانە هەموو کارێك دەکەن کاك پویراز، لەجەنگی سەربەخۆییدا، لەئوشاق پیاوێکی شێت ڕۆژانە دەچووە بڕیارگەی سوپای یۆنانیەکانو لەوێ لەبەردەم تەنوورەکە ڕادەوەستاو نانەکانی دەژمارد کە لەتەنوور دەهاتنەدەرو بەقسەو گاڵتەو گەپەکانی ئەفسەرانی یۆنانی پێدەکەنان. خەڵکی ئوشاق گومانیان لێهەبوو، کاتێك یۆنانیەکان شکانو ئوشاقیان بەجێهێشت، کابرای ناوبراو بەشکڵو شێوەی ملازمێکی لێهاتووی سوپا، بەسواری ئەسپەوە، دێتە نێو شارۆچکەکەو یەکڕاست بەرەو ماڵی دەستگیرانەکەی دەڕوات. خەڵکی شارۆچکەکە تێدەگەن کە ئەو ملازمە هەمان پیاوە شێتەکەیە. چووبوون لەبەردەم کۆشکی ماڵی دەستگیرانەکەی کۆببووبوونەوە".

"هەمووان ئەو ملازمە دەناسن".

"بەڵێ قارەمانێکە، کە وێردی سەرزاری هەمووانە".

"قارەمانە..".

"کاك وەلی نیشانچیش ناتوانێت قارەمانێکی ئاوا بێت؟"

"نازانم کاکە. زۆر دەمێکە لێرەم، بەڵام ئەوە تێنەگەیشتووم. نەمتوانیوە ئەمە ساغ بکەمەوە. بووینە برادەرو دۆستی زۆر دڵسۆز لەگەڵ یەك. ئەو کەسێکی زۆر باشە".

"بەڵام زۆر لەئێوە تووڕە بوو، دەمانچەکەی فڕێدایە بەردەمتان. کاتێك دەمانچەی دەرهێنا وامزانی دەیەوێت بتانکوژێت. ترسام".

"تووڕەبوونی ئەو وەکو بڵێسەی کا وایە، لەپڕ بەرز دەبێتەوەو یەکسەریش دەکوژێتەوە. کەسێکی نەرمە، وەکو ئاوریشم. دەردەکەی گەورەیە، سێ دانە کوڕی چوونە بەرەی رووسەکانو نەگەڕانەوە. ئەو، من لەبەر ئەوەی رووسەکان بەساغی گەڕاومەتەوە بەسەربازی ڕاکردوو دەزانێت".

"سوپاس. خەیاڵت ئاسوودە کردم".

کاتێک ئاوڕیان لەلای ڕاست دایەوە، مەلەک خانم، موسا کازم ئاغا، ڤاسیلیو هوسمەنیان بینی، کە لەژێر دارهەرمێ گەورەکە دانیشتبوون. نیشانچی لەناو ئەواندا خۆی گرمۆڵە کردبووو پاڵی بەڤاپۆری درەختەکەوە دابوو.

پویراز موسا گوتی: "کاک حاجی ڕەمزی، دەبێت بچمە لای ئەوانو دڵی کاک نیشانچی بدەمەوە".

"بڕۆ، بڕۆ، یەکسەر بڕۆ، مرۆڤەکان ناتوانن سەر لەیەکدی دەربکەن. مرۆڤ خۆ کاڵەک نیە بۆنی بکەیتو لەبۆنەکەی تێبگەیت. تۆ کەسێکی ڤارەمانی بۆ پاشای ڤارەمانمان. من بچم سەرێك لەکلێسا بدەم ببینم کاری تێکدانەکە تەواو بووە یان نا؟ ئارەزووی ئاسوودەییو ئارامیت بۆ دەخوازم. ئەم کرێکارانەی ئێمە ئەوەندە تەمبەڵن، کە ئەگەر بەسەر سەریانەوە نەبیت لێیدەخەون. هیچ حەزیان لەئیشکردن نیە".

بێدەنگ بوو، ئەدای دەربڕینی جیددیبوونی بەخۆوە گرت:

"بەیارمەتی خوا، کۆمار هاوڵاتیانی نموونەییو چالاکیان لێدروست دەکات". حاجی ڕەمزی بەڕاکردن بۆلای کلێسا ڕۆیشتو پویرازیش بۆلای دارهەرمێیەکە. موسا کازم ئاغاو مەلەك خانمو ئەوانیدی کاتێك بینیان وا پویراز بەرەو لایان دێت، ئەوانیش بۆلای ئەو ڕۆیشتن. موسا کازم ئاغاو مەلەك خانم لەپێشەوەو ئەوانیدیکەش بەدوایانەوە، هەموویان پێکەوە گەڕانەوە ژێر دارچنارەکان. کەس دەستی نەدابووە دەمانچەکە، کە نیشانچی فڕێیدابووە ئەوێ. نیشانچی بەگۆشەی چاویەوە سەیری دەکردو هەوڵی دەدا کەس تێبینی سەیرکردنەکەی نەکات. دواجار نەیتوانی پێش بەخۆی بگرێت، دەستیکرد بەخولانەوە بەدەوری دەمانچەکە. بەشێوەیەك کە وای نیشان دەدا کە نایبینێت، تا ئەو شوێنەی کە دەیتوانی بەئاسانی دەمانچەکە هەڵبگرێتەوە. دەچووە پێش، بەڵام دەستی بۆ نەدەبردو دەگەڕایەوە. ئەوانەی کە لەسەر تەختەکان دانیشتبوون چاویان لەسەر هەڵنەدەبڕیو بەکونجکۆڵیەوە چاودێری هەڵسوکەوتیان دەکرد، کە بەدەستی لەپیشتەوە تێکئاڵێندراویەوەو سەری بەرەو ژوور ڕاگرتوویەوە، لەکاتێکدا کە هەر سات ناساتێك دزانە چاوێکی بەدەمانچەکەدا دەگێڕێت، بێپسانەوە دەهاتو دەچووو سەیری ئەوانەی نەدەکرد کە لەسەر تەختەکان دانیشتبوون، دەتگوت هیچکەس لەوێ نیە.

پویراز بەپێکەنینەوە هەستا بۆلای نیشانچی چوو. نیشانچی بایەخی پێنەداو لەسەر هاتوچوونی خۆی بەردەوام بوو. پویراز دانەوی و دەمانچەکەی هەلگرتەوە، چوو لەبەردەم نیشانچی راوەستا، نیشانچی زۆری نەمابوو پێیدا هەڵشاخێت، بەلام لەپڕ راوەستا. پویراز دەمانچەکەی بۆ درێژکرد. نیشانچی وەك ئەوەی هیچشتێك رووینەدابێت، دەمانچەکەی وەرگرت و خستیەوە بەر کەمەری و یەکڕاست بەرەو لای کلێسا رۆیشت و لەوێ سنگی دایە پێش خۆی و وەك پێشتر دەستی کرد بەهاتن و چوون. تا شەو داهات ئاوا درێژەی بەرۆیشتن دا، هیچ تەماشای کلێسای تێکدراوی نەدەکرد.

هەوا کاتێك تاریك داهات، تەنها چوار دیوارەکانی کلێسا بەپێوە مابوون. تەنانەت ئەو کەلوپەلانەی کە لەکلێسا بەجێمابوون گواستڕابوونە نێو بەلەم. سوفالەکانی سەربان، تەختەو شیشە ئاسن و پێداویستیەکانی دیکەی ناو کلێسا. پەیکەری مەریەمی پیرۆز، کە عیسای بچکۆلەی بەباوەشەوە بوو، دەرگاکان، پەنجەرەکان، سێ دانە ڤیتڕای تا رادەیەك گەورە، تەختەکانی کەفماڵی کلێساو هەرچی کە هەبوو.

بەلەم بەتەقو هۆڕەوە، بەبارەکانەوە وەڕێکەوت. نیشانچی لەنێو تاریکیدا وەك تارمایی هەروا خەریکی هاتن و چوون بوو. درەنگ وەختێك بوو کە هاتەوە ژێر چنارەکان و لەسەر لێوی تەختێك دانیشت، سفرە ئامادەبوو، هەموو پێکەوە دانیشتن و بێدەنگ و خوست نانی ئێوارەیان خوارد.

نیشانچی دەستێکی لەشانی پویرازداو گوتی: "پویراز، با پیاسەیەك بکەین".

هەستان و چوون لەلێوار، لەسەر بەردێك دانیشتن.

ئەوانیدی هەر لەوێ، لەژێر چنارەکان مانەوە تا ئەو دووانە دەگەڕێنەوە. بای دەهات و دەنگی ئارامی دەریا دەهات. بۆن و بەرامەی جیاجیا ئەو ناوەی پڕ کردبوو.

ماوەیەك دواتر پویرازو نیشانچی شان بەشانی یەك، دەم بەپێکەنین گەڕانەوە. بەرلەوەی خۆر هەڵبێت، لەدەنگی بەلەمەکان بەئاگاهاتن. کۆمەڵێك کرێکار بەجلە دڕاوو شڕو شەپڕێوەکانیان لەتەك پیاوێك کە کلاوێکی پێستی لەسەر نابوو، قەدو بالایەکی بەرز، لووتێکی هەلۆیی، شەلواری تایبەتی سوارکاری، چەکمەو چاکەتێکی شینی لەبەر بوو، بێئەوەی سەیری ئەوانە بکەن کە لەژێر دارچنارەکان سەیری ئەوانیان دەکرد، بەرەو لای کۆشکی چێشتلێنەرەکان رۆیشتن. دەمێکی کەمی پێنەچوو کە تەقو تروقی تێکدانی کۆشکەکان، ئەو ناوەی پڕکرد. دەنگ و هەراو تەقو تروقێکی

وا لەلای کۆشکەکان دەهات، دەتگوت بۆمەلەرزەیەو دوورگە دەهەژێنێت. دەوروبەری نیوەڕۆ، دەنگی ماتۆڕەکان زیادیان کرد، دەڕۆیشتن تا بارەکانیان بگەیەننە شارۆچکەکە، بەوردی سەیری ئەوانەیان کردبوو کە بەنێویاندا ڕەت بووبوون، بەڵام حاجی ڕەمزی کاولاکزادەیان لەگەڵدا نەبینی بوون.

نیشانچی گوتی: "بچین سەیرێکیان بکەین، بزانین حاجی ڕەمزی هاتووە".

گوتیان: "خۆت بڕۆ سەیرێك بکە".

نیشانچی ڕۆیشتو بەرێگای لێواردا گەیشتە بەردەم کۆشکەکان، زۆربەی خانووەکان لەگەڵ خاکدا تەخت کرابوون. لەلایەك مەڕمەڕەکانیان لەسەریەك هەڵچنیبوونو لەلایەکی دیکە تەختەو لەلای دیش کاسە، قابلەمەی مسی، مەنجەڵ، قاپ، لەگەڵ قاپو هیرباری چینی، پیاڵەی شووشەیی، پەرداخی لێو ئاوەزێڕکراو، پارچەی نەخشێندراوو دەرگاو شتگەلی دیکە، کە لەژێر زەمینو چێشتخانەو عەمبارو ژوورە قوفڵدراوەکان هێندرابوونەدەر.

نیشانچی لەهەمان جێگا، لەکاتێکدا کە دەستی لەسەر دەمانچەکەی دانابوو مایەوە. کرێکارەکان لەسەر عەرد دانیشتبوونو خەریکی خواردنی نانو پەنیرو زەیتوون بوون. ئەو پیاوەی کە کڵاوێکی پێستی لەسەر بوو، قەمچیە کورتە زیوینەکەی بەچەکمەکانیدا دەکێشاو بۆ ئەملاو ئەولا دەچوو. بەخەمو خەفەتەوە سەیری ئەو خانووانەی دەکرد کە بڕیار بوو سبەی تێکبدرێنو بەخێرایی دەچووە سەرێو دەهاتەوەخوار. ئەو دەمانچەیەی کە بەقەدیەوە بەستبووی لەژێر لچکی ئاوەڵابووی چاکەتەکەی بەدی دەکرا، لەرەفتارەکانیدا ئاشکرابوو کە لچکی چاکەتەکەی بەئەنقەست کردۆتەوە. لەگەڵ بینینی نیشانچی دەمانچەی هەڵگرتو خستیە نێو کیفێك کە بەپشتیەوە بوو. لەدیدی نیشانچی ئەم ڕەفتارە نیشانەی ڕێزگرتن بوو. گەڕایەوەو چووە لێوار.

نیشانچی کاتێك گەڕایەوە ژێر دارچنارەکان سەیریکرد ئەوانەی کە لەسەر تەختەکان دانیشتوون بەچاوانی پڕ لەپرسیار سەیری دەکەن.

"حاجی ڕەمزی نەهاتووە، نیوەی خانووەکانیشیان تێکداوە".

لەو ماوەیەی کە کرێکارەکان لەدوورگەدا کاریان دەکرد، حاجی ڕەمزی تەنانەت بۆ جارێکیش نەهاتە دوورگە، بەڵام ئەو پیاوەی کە کڵاوە پێستەکەی لەسەر بوو، هەموو ڕۆژێ بەبەلەم دەهاتە دوورگەو بێئەوەی سەیری ئەو خەڵکە بکات کە لەژێر دارچنارەکان دادەنیشتن، قیتو قۆز لەپێش کرێکارەکانەوە، لەکاتێکدا هەردەم نا دەمێك قەمچیە کورتەکەی لەچەکمەکانی دەدا، بەرەو لای کۆشکەکان دەچوو.

ئـەو شـەوە خـەو نەچـووە چـاوەكانی نیشانچـی. بـەیانی زوو لـەنێو جێگـا هاتـەدەرو یەکڕاست بۆلای دووکانـەکان ڕۆیشـت، دەرگـای دووکـانی یـەك بەیـەك کردنـەوە، سـەرێکی بەنێو دووکانەکانـدا گـرت، بـەتاڵ بـوون. کـە خۆرهـەڵات چـووە سـەر کـانی دەسـتو دەمو چـاوی شوشـت. کاتێـك پـویراز ئـەوی بینـی بـەرەو لای خـوارەوە چـوو، نیشانچـی بـەدەم پێکەنینەوە بـەرەو لای چـوو. ئـەویش دەسـتو دەمو چاوی لەسـەر کـانی شوشـت، پاشـان لەڕۆخ یەکدی دانیشتن.

"حاجی ڕەمزی دووکانەکانی لەبیرکردووە".

"چی، گوتی لەبیری کردوون؟"

"ئەگەر لەبیری نەکردوون ئەی بۆ تێکیان نەداون؟"

"چونکە دەیەوێت بەنرخی کەری تۆپیو بیانکڕێـت. چـەند ڕۆژێـك تێبپـەڕێتو کـەس نەیانکڕێت، دەچێت بەنرخێکی هەرزان لەعەبدولوەهابی برادەری دەیانکڕێت".

"هەی زۆڵ، نەفرەت لەڕەگو ڕەچەڵەکت، هەی جاشەکەر. سەیری مـن بکـە وامـدەزانی لەبیری کردوون".

"ئەو ئێستا چاوەڕێی ئەوەیە کە بتۆپێت. دەزانیت دەبێت چیبکەین؟"

قسەی پێبڕیو گوتی: "چیبکەین؟"

"چیبکەین؟ یەکەمجار نانی بەیانیمان دەخـۆین، پاشـانیش بەبەلەمەکـەی تـۆ دەچـینە شارۆچکە".

"باشە، سەرچاو، بەڵام بۆچی بچینە شارۆچکە؟"

"بۆچـی بچـین؟ دەچـین ئـەو دووکانانـە لەعەبـدولوەهاب، قارەمـانی جـەنگی سەربەخۆیی دەکڕین، ئەگەر نەمانتوانی بـەنرخی کـەری تۆپیـو بیـانکڕین، بـەنرخی کەری زیندوو دەیانکڕین".

"ئەگەر ڕەمزی کڕیبێتنی؟"

"ئەگەر بیکڕیبن تێکیاندەدات".

"دەمانەوێت دووکانەکان چی لێبکەین؟"

"دووکانەکان چەند دانەن، ژماردووتن؟"

"ژماردوومن، نۆ دانە".

"سێ دانەی بۆ تۆ، چواریشیان بۆ من شتێك لەوانەی دیکەش دەکەین".

"دووكانەكان بۆچی بەكاربێنین؟"

"جاری با بیانكڕینو پێش لەتێكدانیان بگرین، پاشان بیرێكی لێدەكەینەوە". دوای نانخواردن یەكسەر سواری بەلەم بوون. بەلەم بەڤڕەڤڕ دەتگوت دەفڕێت، تا گەیشتنە شارۆچكە لەبارەی دووكانەكان قسەیان كرد. یەكسەر چوونە لای عەبدولوەهاب بەگ. عەبدولوەهاب بەگ بەگەرمیەوە پێشوازی لێكردن، هەردووكیانی گرتە باوەش. باسەكەیان لەگەڵدا كردەوە. عەبدولوەهاب بەپێكەنینەوە گوتی: "ئێستا قاوەكانتان بخۆنەوە، ئەوەی دی ئاسانە". بەشێوەیەكی سەیر تەماشای دەكردن.

لەپشت مێز هەستاو هات لەبەردەمیان دانیشت. گوتی: "ماشەڵڵا، ماشەڵڵا، دوورگە خەریكە پڕ دەبێت، ئەمڕۆ خێزانێكی دیكەم بۆ ناردن".

حاڵەتی روخساری گرژ بوو.

"خوا بەنسیبی كەس نەكات. لەرەوشێكی زۆر خراپ دابوون.

پویراز گوتی: "نەمانبینین".

ئەمڕۆ بەیانی رەوانەم كردن. لەرەوشێكی نالەبار دابوون. ناتوانم بۆت روون بكەمەوە، ناتوانم روونی بكەمەوە، چ نەهامەتییێك، چ رەوشێكی نالەباریان هەبوو! هەریەكەیان تەرمێك بوو، هەر ئەوەتا گیانیان لەبەردابوو. بێئەوەی تەنانەت فلسێكیان لێوەربگرین خانوومان دانێ، بەقەباڵەوە. نازانم ئاوارەی كام مەملەكەتن. بەزەحمەت توانیمان تێكبەگەین. دەتگوت زمانی قسەكردنیان نیە، بەلام منداڵی چەند جوانیان هەبوون! پارەی تایبەتی ئاوارەكانمان دانێو كاكە پویراز، براكەم، یەكسەر رەوانەی لای تۆمان كردن. ئەوانە لەو دوورگەیە چ دەخۆن؟ تۆ چۆن دەتوانیت بەو هەموو خەڵكە هەژارو ئەو هەموو گرفتاریانە رابگەیت؟ دەتەوێت چ كارێكی دیكە بكەیت؟ من ئەوانم ناردنە لای تۆ. من وای بۆ دەچم. دوورگەكەتان ئەوەندە خەڵك رووی تێدەكات، كە ناچاربین چادرتان بۆ بنێرین. ئێستا با بڵێین ناردنی چادر كارێكی ئەوەندە گران نەبێت. ئەی خواردنو خۆراكیان چی؟ سەرم گێژ دەخوا. مرۆڤ دڵی پڕ دەبێت لەخوێن كە ئەم شتانە دەبینێت. ئەو هەموو هەوڵو تەقەللایەمان دا، لەجەنگو نەبەردی جیاجیا بەشداریمان كرد، ملیۆنان لەلاوەكانمان تێداچوون، وڵات بووە مەیدانی جەنگ، چیمان بەدەست هێنا؟ دواجار هەموو شتێك كەوتە دەستی كەسانی وەك حاجی رەمزی. بیستتان سەرۆكایەتیی تەشكیلاتی جەماوەریان بەحاجی رەمزی سپاردووە. لەمڕۆ بەدواوە حاجی رەمزی حوكمڕانی ئەم دەڤەرەیە. خانووی چێشتلێنەرەكانی تێكدان؟"

"هەم کلێسای تێکداو هەم کۆشکەکان. ئێستاش هەر خەریکە شتومەکەکانی ئەوێ بەبەلەم دەگوازێتەوە. کاری گواستنەوەی شتومەکەکان هەر کۆتایی نایەت".

"وای چاوچنۆکی چەپەڵ. وای! ئێمە مردین، بریندار بووین، وڵات بوو بەمەیدانی جەنگ خێروبێرەکانیش ئەوان خەریکن کۆی دەکەنەوە. وەك یوسف ئەمرە دەڵێت (رێزداران مروەتیان نیە)، سواری ئەسپی عارەبی دەبن، خواردنیان گۆشتی مرۆڤو خواردنەوەیان خوێن. لەو رۆژگارە بەدواوە مرۆڤەکان خوێنو عارەقەی هاورەگەزەکانیان دەخۆن".

"تۆ کە دەڵێیت دوورگە خەریکە پڕ دەبێت لەخەڵك، بۆچی کۆشکەکانت فرۆشتن، ئەویش بەکەسێکی وەك حاجی رەمزی".

عەبدولوەهاب بەگ هەموو گیانی کەوتە بن ئارەقە. دەماری ملی هەڵمسانو چاکەتەکەی داکەند، فرێیدایە سەرمێز، یاخەی کراسەکەی کردەوە:

"سەیر بکە، سەیر بکە برا، سەیری گیانی من بکە، لەمەیدانی شەڕدا، لەناو تەرمی سەربازەکاندا، تەرمی لەسەریەك کەڵەکەکراودا، دەکەومە نێو دەریای خوێنو لەهۆش دەچم".

لەپڕ کراسەکەی داکەندو هەڵیدایە ئەو لایە، لێوو دەستەکانی دەلەرزین "ئێستا، ئێستا ئەوان خەریکن خوێنی من دەمژن، خوێنم، خوێنم. من بەدەستی خۆم خوێنی خۆمیان بۆ دەکەمە نێو کاسەو دەیاندەمە دەست. ئەوە خوێنمە کە دەڕژێت، خوێنم. تۆ پێتوایە من خوێنی خۆم، ئەو کۆشكو تەلارانەم کە بڕیاربوو هەژارو خەڵکی دەستکورتو بەشمەینەت تێیدا بسترێن، بەرەزامەندیو بەکەیفی خۆم فرۆشتوومنەتە حاجی رەمزی؟ فەرمانم بۆ هات، فەرمان، فەرمانێکی توندو لێبڕاوانە، کاتێك کە بەڕێوەبەری ناحیە خوێندیەوە هەموو گیانی هەڵلەرزی".

عەبدولوەهاب قسەی کرد، جنێوی دا، دادو هاواری کردو دواجاریش بێدەنگ بوو، پاشان گوتی:

"ببوورە بەڕێزم، دڵگرانو هەراسانم کردی، ئاخر برینەکانت کولاندمەوە".

کراسەکەی هەڵگرتەوە، ماوەیەك بێدەنگ بووو چاوی بڕیە نێو چاوەکانی پویراز:

"ببینە کاکە پویراز، براکەم، ئەم جەستەیەی من لەجەستەی بنیادەم ناچێت، مەگەر نا؟"

بەڕاستی وابوو، سنگو قۆڵو سگو پشتی هەموو زیوار زیوارو لەتو پار بووو شوێنی برینەکانی خوێنی پەمەیان لێکۆبووبووەوە.

وەهاب بەهێمنی کراسەکەی کردەوە بەر، لەجێی خۆی دانیشتو ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا.

"ئاااه، ئاااااه! تازە ئیدی ناومان بەبەرتیلخۆر دەڕوات، ئاااااه، ئاااااه! ددانەکانی لەسەر یەك گرساندن: "ئاااه، ئاااه!"

قاوەیان هێنا، وەهاب دەردەدڵی خۆی کردو ئارام بووەوە.

پویراز موسا هێشتا نەیدەتوانی سەری هەڵبڕێتو سەیری روخساری وەهاب بەگ بکات. بەهەمانشێوەو سەر لەبەرخۆنانەوە قاوەکەی، کە لەپێشی داندرابوو هەڵگرتو بێئەوەی سەیری وەهاب بەگ بکات، خواردیەوە.

وەهاب بەدەمپێکەنینەوە پرسی: "نازانم ئێوە لەدوورگە لەگەڵ ئەو دەییوسە چیتانکرد؟ دوێنی شەو لەماڵی عوزێر خان لەگەڵ جەنابی بەڕێوەبەری ناحیە خەریك بووین دەمانخواردەوە، کە حاجی دەییوس وەژوور کەوت، خراپ پەشۆکا بوو، دەستو پێی دەلەرزین. بەرلەوەی دابنیشێت، بەڕێوەبەری ناحیەی لەسەر مێزەکە هەستاندو بردیە ژوورەوە، زۆریان پێچوو. کاتێکیش کە هاتنەدەر، روخساری حاجی دەییوس بەتەواوی شین هەڵگەڕابوو. ئێوە چیتان لەگەڵ ئەو حاجی دەییوسە...".

پویرازو نیشانچی دەمێك بوو دەستیانکردبوو بەپێکەنین.

"ئێمە هیچمان لەگەڵدا نەکرد، تەنها..".

گوتیان کە کرێکارەکان خەریکی تێکدانی کلێسا بوون، نیشانچی لەبەیانیەوە تا شەو بێڕاوەستان دەمانچە بەقەدەوە لەبەردەم کلێسا دەهاتو دەچوو. حاجی رەمزی لەو رۆژە بەدواوە ئیدی نەهاتەوە دوورگەو لەجیاتی ئەو پیاوێکی باڵابەرز، کە کڵاوێکی پێستیو چەکمەی لەپێیە، دێت.

"زەندەقی چووە، ئەو چەپەڵە سەربازی راکردووە، حاجی دەییوس. ئەو پیاوەی کڵاوی لەسەرە نۆکەریەتی. ئەو نۆکەرە لەسەردەمی داگیرکاریی یۆنانیەکاندا هاوکاری یۆنانیەکانی کردووەو سیخوڕی بۆ کردوون، دواساتەکان هاتۆتە ریزی لەشکری ئێمە.

زۆر لەخەباتگێڕانی هێزەکانی ئێمەی بۆ یۆنانیەکان کوشتووە. هەموو خەڵکی شارۆچکە ئەمە دەزانێت، حاجی رەمزیش لەبەرەی رووسەکان رایکردووەو خۆی لەچیاکان شاردۆتەوەو دوای ئەوەی شەڕی سەربەخۆیی تەواو بووە، جلی سەربازی کردۆتەوەبەرو ئاڵا بەدەست، لەگەڵ دە کەس هاتۆتە شارۆچکە. خەڵکی شارۆچکەش وەکو قارەمانێکی نەتەوەیی پێشوازیان لەحاجی رەمزی دەییوس کردووە. هەموو خەڵکی شارۆچکە دەیانزانی کە حاجی رەمزی خائینێکی راکردووە".

"باشتر كه زەندەقی چووە. چەپەڵی دەییوس".

"زەنــدەقی چــووە، بــەڵام بــەم زووانــە كاتێــك بــوو بەســەرۆكی تەشــكیلاتی هێــزە جەماوەرییەكان، حاڵمان شپرزە دەبێت".

نیشانچی گوتی: "بابزانین چۆن دەبێت".

پویراز گوتی: "بەڵێ بابزانین چۆن دەبێت".

عەبــدولوەهاب گــوتی: "بــابزانین چــۆن دەبێــت". وەك خەســڵەتی ســادەو دڵســافی پێشووتری خۆی لێهاتبووەوەو خەریكبوو پێدەكەنی.

"مەســەلەی دووكانــەكانی ئێــوە چارەســەر بــووە. چــەندتان پێبــاش بــوو بیــدەن. كــێ دەیەوێت بیانكاتەوە. با جارێ بچینە لای بەڕێوەبەری ناحیە، ماوەیـەك بـەر لەئێستا لای مـن پرسـیاری ئێـوەی دەكـرد، دەیگوت كـاك پـویراز لەكوێیـە بـۆ دیارنیـە. پاشـان دەچـین قەباڵەی دووكانەكان وەردەگرین. چی لەدووكانەكان دەكەن؟"

نیشانچی گوتی: "نازانین. سێ لەدووكانەكان هـی مـنو چواریشـیان هـی كـاك پـویراز، دوو دانەكەی دیكەشیان دەدەینە كاك جەمیلی پزیشكی ئاژەڵان".

پویراز گوتی: "باشە".

ئەو رۆژە هەموو كارەكانیان تـەواو كـردو بەرلـەوەی بچـنە لای بەلەمەكـەیان، چـوونە خواردنگەیــەكو نانیــان خــوارد. كاتێــك گەڕانــەوە لای بەلەمەكــە. دەمێــك بــوو خــۆر ئاوابووبووو هەوا تاریك داهاتبوو، لـەنێو بەلەمیشـدا هـەر قسـەیان دەكـرد. هـەردووكیان زۆریان قسە هەبوون بیكەن، لەقسەكردن تێر نەدەبوون.

لــەبارەی هەمووشــتێكەوە دەدوان، بــەڵام نیشانچــی هــیچ قســەیەكی لــەبارەی ژنو منداڵەكانی خۆی نەدەهێنایە سەر زمان.

كاتێك گەیشتنە دوورگە، هێشـتا ئاسـۆ روونـاك نـەبووبووەوە، هـەوا گورگـەمێش بـوو. لەبەلــەم دابــەزین، لەســەركانی ئاوێكیــان بەسەروچــاویان داكــرد. فێنكــایی بەرەبــەیان نیشـتبووە سـەر دوورگــە، شــنەبایەكی دەبــزاوت، بــۆنی دڵگــیری دەریــا دەهــاتو ئــەوان لەخۆشیان خـەریكبوو بـاڵ بگـرن. دەنگێـك لەنزیكـەوە هـات، گوێیـان رادێـراو چاوەڕێیان كـرد، دەنگەكـە دیسـان جـارێكی دیكـەش هاتـەوەو یەكسـەر نـەما. چـەند جـارێكی دیكـە، پەیاپـەی دەنگەكـە بیسـتراو دیسان ماوەیـەكی درێـژ نـەما. نیشانچـی هەسـتایە سـەر پـێ، بۆلای كانیەكە چووو چۆڕێك ئاوی خواردەوە. گوتی: "پویراز گیان تۆ لێرە بمێنەوە بچم

بــزانم ئــەو دەنگــە لــەکوێوە دێــت، ئەمــە چ دەنگێکــە کــە بــەم بەیانیــە زووە لــەنێو دەوەنەکانەوە دێت؟"

پویراز گوتی: "منیش کونجکۆڵم، دەبێت ئەمە دەنگی چی بێت، با ئێمەش بزانین". لەگەڵ بیستنی دەنگەکە، فکری بۆ پیاوەکانی شێخە کۆچەرەکە چوو. هەموو گیانی کەوتە لەرزین. قۆڵی چەپی بێدەستی خۆی هەڵدەپەڕی. زەهراش هاتە بەرچاوانی راوەستاو قژی گۆڕا بۆ تۆپەڵێك رۆشنایی. دڵی پویراز کەوتە ترپە، نەیتوانی دابنیشێت، بەخێرایی خۆی کۆکردەوەو هەستا، بەسەر وردە بەردەکاندا تا نزیك ماڵی زەهرا رۆیشت. ئەو تۆپەڵە رۆشناییە لەناوەڕاستی هەیوانەکە راوەستابوو. ئەژنۆکانی شل بوون. لەپڕ لەرزێك هەموو گیانی داگرت، کە لەهەموو تەمەنیدا نەبینیبوو. لەم کاتەدا کە دەنگی نیشانچی هات: "پویراز وەرە!" پویراز وەك ئەوەی دەربازی بووبێت بەرەو لای دەنگەکە رایکردو تا نزیك نیشانچی رانەوەستا.

"چیە؟"

"ئەمانەن". بەدەست ئەو خەڵکەی نیشان دا کە لەپەنای دەوەنە گەزەکان دانیشتبوون. لەو هەوا نیوە تاریکەدا توانی منداڵانی کە لەسەر چەمەنەکان راکشابوون و هەروەها ئەو ژن و پیاوانەی کە لەتەك یەکدی دانیشتبوون بەدی بکات و لێکیان جیابکاتەوە. هەوا خەریکبوو رووناك دەبوو. نیشانچی و پویراز ماوەیەك ئاوا هەر بەپێوە راوەستان.

نیشانچی داهاتەوەو بەچرپە بەپویرازی گوت: "ئەمانە خەوتوون".

"خەوتوون، بەڵام ئەم دەنگانە لەکوێوە دەهاتن؟"

"مرۆڤ لەخەویشدا قسان دەکات. مەگەر لەخەوگەی سەربازیدا نەخەوتوویت؟ خوا دەزانێت چەند ماندوون".

بەئەسپایی لەوێ دوورکەوتنەوەو دووبارە هاتن لەرۆخ کانیەکە دانیشتن و تا خۆر هەڵات دەمیان نەکردەوە.

"بابچین بەدایکە لێنا بڵێین ئاشێکی باش و بەتاموبۆیان بۆ دروست بکات". چوونە لای دایکە لێنا. لێنا لەخەو هەستابووو ئاگردانەکەی داگیرساندبووو خەریکبوو پیازی ورد دەکرد.

"پویرازەکەم بەخێر بێیت".

گوتیان: "سوپاس دایە".

"دەمویست چایتان بۆ لێبنێم".

"خەریکبووم پیازم ورد دەکرد".

"پیاز بۆ هەموو خواردنێك پێویستە".

"لێنا خاتوون ئاش، ئەویش بەم پیازانە کە زەحمەتت بەهەدەر ناچێت، چونکە شەش کەسمان لەو خوارە لەناو دەوەنەکان بینین".

"لەکوێن؟"

"لەپەنا دەوەنە گەزەکان".

"شەو، هەر کەمێك دوای نوێژی شێوان گوێم لەدەنگی ماتۆڕێك بوو، چوومە ئەسکەلە هیچکەسم نەبینی. دەنگی ماتۆڕەکەش لەدوور دوورەوە دەهات، نەمتوانی رووناکیەکەشی ببینم".

"وا دیارە، ماتۆڕەکە ئەمانەی داناوەو رۆیشتووە".

لێنا گوتی: "وای مخابنە".

پویراز گوتی: "ئەمە ئەوانەن کە عەبدولوەهاب ناردوونی".

نیشانچی گوتی: "خۆیانن".

لێنا دەستێکی لەشانی نیشانچی دا.

"زووبن بمبەنە لای ئەوان".

"خەوتوون".

"هەڵیاننەستێنین، سەیر بکەن هەتاویش خەریکە هەڵدێت".

بەخێرایی لەپلیکانەکان هاتنەخوار. نیشانچی لەپێش و لێناش بەدوایدا، هێواش هێواش بەنێو دەوەنە گەزەکاندا تێپەڕین و لەپشت دەوەنە دڕوویێك سەیری ئەوانیان کرد. لێنا بەچرپەیەکەوە گوتی: "خەوتوون، خوا دەزانێت چەند برسی و ماندوون".

"چما مرۆڤی برسیش دەتوانێت بخەوێت؟"

"بۆ ناتوانێت نیشانچیەکەم. وەکو مردووان دەخەوێت. با زوو بچین ئاشیان بۆ دروست بکەین. چواریشیان منداڵن، وای بەستەزمانینە. وای هەمووشیان رووت و قووتن. وای".

بەخێرایی چووەوە ماڵێ، ئاگردان پێبوو، قابلەمەی دانایە سەر ئاگردانەکە، ئاگری ژێر قابلەمەی زیاد کرد. برنج، نیسك، کەرە.

بە نیشانچی گوت: "تۆ ئاگات لەم ئاشە هەبێت، بەردەوام تێکیوەردە، هەڵنەچێت".

بەڕاکردن خۆی گەیاندە لای دەوەنە گەزەکان. منداڵەکان هێشتا لەخەو دابوون، ئەوانیدی بەتەواوی چاویان کردبووەوەو بەهێدمەگرتنەوە لەدەوروبەری خۆیان دەڕوانی.

لێنا بزەیەکی کەوتە سەرلێوان‌و بەرامبەریان راوەستا:

"یاللاّ هەستن، منداڵەکانیش هەستێنن، با بچینە رۆخ کانیەکەی ژێر چنارەکان".

هیچ لەشوێنی خۆیان نەجووڵان، ئاوا بەچاوانی زەقەوە سەیریان دەکرد. لێنا چەند جارێك قسەی خۆی دووبارە کردەوە، بەڵام بێهودە بوو.

ئاشەکە لەسەر ئاگردان بوو، ئەی ئەگەر نیشانچی خەو بردبێتیەوەو ئاشەکە هەڵچووبێت‌و ئاگردانەکەی مراندبێتەوە؟

کە هاتەوە ماڵێ‌و بینی وانیشانچی ئاشەکە تێکوەردەدا، خۆشحاڵ بوو. بۆنی خۆشی ئیشتیهاهێنی ئاشەکە ژوورەکەی پڕ کردبوو.

"تۆ ئاوا ئاشەکە تێکوەردە، من ئێستا دەگەڕێمەوە".

کاتێك لەپلیکانەکان دەچووەخوار رووبەڕووی پزیشکی ئاژەڵان بووەوە:

"چیە کاك جەمیل، دەتەوێت بچیتە لایەك؟"

"خەریکبووم دەهاتمە لای تۆ، پویراز لەکوێیە؟"

"لەسەرەوە نزیکەی بەرەبەیان بوو، کە گەڕانەوە لەگەڵ مندا وەرە، لەنێو دەوەنە گەزەکاندا شەش بنیادەمی بێچارە هەن. دوێنێ هاتوون، منداڵەکانیان خەوتوون. خۆزگە دەتبینی گەورەکانیان چۆن سەیریان دەکردین".

"چۆن سەیریان دەکردن، چۆن چۆنی؟"

لێنا تەواو چاوەکانی کردنەوە:

"تەواو ئاوا، بەمجۆرە".

بەرەو لای دارگەزەکان رۆیشتن‌و چوون لەبەرانبەر ئەوانە راوەستان کە چاوەکانیان زەق کردبووەوە.

"بەخێربێن براینە".

نە تەکانێکیان دایە بەرخۆو نە دەنگێکیان لەبەر هاتەدەر.

"کەی هاتن؟"

هەروا سەیریان دەکرد.

پزیشکی ئاژەڵان پرسیاری لێکردن، قسەی بۆ کردن، بەڵام ئەوان هەروا سەیریان دەکرد. ئەمجارە زمانی خۆی گۆڕی، بەئەرمەنی‌و ئاشووری‌و عارەبی قسەی کرد.

کەچی ئەوان هەروا بێدەنگ بوون.

"دایکە لێنا، بەهەموو زمانێك قسەم لەگەڵدا کردن، کەچی ئەوان زەق زەق سەیریان دەکردم، تەنانەت پێڵووی چاویشیان نەدەکوتان، منداڵەکانیش وەکو مردووان خەوتوون".

لێنا، دەنگی وەکو زریکەیەك بەرزکردەوەو بەیۆنانی قسەی کرد. ژنێك کە لەوێ بوو چەند جارێك چاوەکانی داخستو دیسان کردنیەوە.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "هون خوەش هاتن، هون کورمانجن، هون ترکی نزانن؟"

-وەرگێڕی فارسی ئەم دێڕانەی هەر ئاوا بەکوردی نووسیبوون-

حاڵەتی روخسارو چاوەکانی ئەو پیاوەی بەرامبەری لەپڕ گۆڕا. زەردەخەنەیەك کەوتە سەر لێوانی:

"وەلا باڤۆ ئەز ترکی ژی دزانم، ئەز کوردی ژی دزانم، ئەز زازاکی، ئەز کەلامێ قەوانێ سوریانی ژی دزانم". و. فارسی ئەم دێڕەشی هەر ئاوا بەکوردی نووسیوە "حازربن، خوەش کە دجێ رابە".

پزیشك پێیگوتبوون: "بەخێربێن، ئێوە کوردن؟" پیاوەکە گوتبووی: "وەڵڵا باوکەکەم من تورکیش دەزانم، کوردیش دەزانم، من زازاکیو گۆرانی سریانیش دەزانم".

"کەوایە هەستن بابچینە ژێر دارچنارەکان، سەرکانیەکە، منداڵەکانیش لەخەو هەستێنن، دایکە لێنا ئاشی بۆ لێناون، ناوێ تە چیە؟"

"ناوم ئوسوی دەنگبێژە".

"تۆ ئوسوی دەنگبێژیت؟"

"هەرێ، خۆمم. ئەمن حکومەت ناردیم لای پویراز کاك موسا. ئاغای ئێرە موسا ئاغایە، وانیە؟"

-ئەم دێڕەشی بەشێواوی بۆ نیشاندانی ئەوەی کە کابرا تورکی باش نازانێت، نووسیوە-

"دروستە".

"تۆ کێیت؟"

"من پزیشکی ئاژەڵانم".

"ناڤێ من جەمیلی ڤێرتەرنەرە، پزیشکی ئاژەڵان".

-ئەمەشی هەر بەکوردی نووسیوە-

"ئەز دزانم، شۆلێ تە چیە".

-ئەمەشی بەکوردی نووسیوە-

ژنەکە منداڵەکانی هەستاند، دەستی بچووکەکانی گرتو گەورەترەکانی دانە پێش خۆی، هەموویان پێکەوە چوونە ژێر دارچنارەکان. ژنەکە یەکەمجار دەمو چاوی منداڵەکانی شوشت، ئینجا دەمو چاوی خۆیشی. لێنا خاولی دایە ژنەکەو دەمو چاوی وشك کردنەوە. ئوسوش ماوەیەکی باش خەریکی شوشتنی دەستو دەمو چاوی بووو ئیدی هاتەوە سەرخۆی. منداڵەکان بەچاوانی واقوڕماوەوە سەیری دەوروبەریان دەکرد.

لێنا گوتی: "من دەچم ئاشەکە هەڵدەگرمو دەیهێنم".

ڤاسیلی، لەنێو خانووەکاندا سەرو کەللەی دەرکەوت، گوتی: "دایکە لێنا، منیش دێم، دەمەوێت یارمەتیت بدەم".

ڤاسیلی قابلەمەی ئاشەکەی هەڵگرتبوو، لێناو پویرازیش بەقاپو کەوچكو کاسەو نانەوە بەدوای دا هاتن. یەکسەر سفرەکە راخرا. پزیشکی ئاژەڵان، ئوسوو ئەوانی دیکەی پێکناساند.

پویراز پرسی: "نیشانچی لەکوێیە؟"

"من لێرەم، "نیشانچی لەنێو قامیشەکاندا دەنگی بەرزبووەوە "هەر ئێستا". لەکاتێکدا بەنەخوێنی شەلوارەکەی بەدەستەوەبوو، لەرێی لای قامیشەکان بەدەرکەوت.

دەستیانکرد بەنانخواردنی بەیانی، وەکو کەسانی کە دەکەونە نێو قاتو قڕی نانیان دەخوارد، کەوچکی منداڵەکان بێڕاوەستان بەرزو نزم دەبوونەوە.

ئوسو کاتی نانخواردن، تەواوی ئەو ماوەیە هەر سەیری پویرازی دەکرد. پویرازیش لەو نیگایانەی ئەو نیگەران بوو.

لەگەڵ تەواوبوونی نانخواردن، ئوسو بەخێرایی هەستاو هاتە بەردەم پویراز.

"کاك پویراز دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم".

بە رۆخ قامیشەلانەکەدا رۆیشت، پویرازیش سەیری کرد. لەقامیشەلانو نێو دەوەنە گەزەکان رەتیان دا. ئوسو راوەستا. بەچاوانی تاساوەوە، سەیری دەوروبەرەکەی کرد:

"هیچکەس لەم دەوروبەرانە نیە کاکە، کەس نامانبینێت؟"

"نامانبینن".

"کەوابوو با لەبن ئەم دارانە دابنیشین".

"با دابنیشین، دوێنێ شەو هاتن؟"

"ڕۆژ ئاوا بووبوو".

"لەکوێوە؟"

"پاشان پێتدەڵێم، من دەنگبێژم".

"یانی چی؟"

"چیرۆکیش دەڵێم".

"چۆن، لەو ستران‌و مقامە زۆر درێژانە... کە چەند شەوو چەند ڕۆژ درێژە دەکێشن‌و تەواو نابن، ئەو جۆرانە؟ بەچ زمانێك؟"

"لەو جۆرانەش دەخوێنم، بەکوردی... پێویست بکات بەحەفتاو دوو زمانیش دەخوێنم".

"ئاخر خۆ من لەکوردی تێناگەم".

"من بخوێنم، تێدەگەیت. پێویست بەوە ناکات کوردی بزانیت".

ئەگەرچی تورکیەکەی شڕو شەپڕێو بوو، دەیویست مەبەستی خۆی بگەیەنێت.

"کەی فێری تورکی بوویت؟"

"لەسەربازی".

"دەتویست چیم پێبڵێیت؟"

ئوسو، دەیهێناو دەیبرد، چەند جار سەری هەڵبڕی، تاوێکی باش لەروخساری پویراز ورد بووەوە.

"یەکێك لەئەرکدارەکانی حکومەت منی سواری کەشتی کرد". ئوسو بەبەلەمی دەگوت کەشتی". ئێمە چووین لەنێو کەشتی دانیشتین. بەرپرسی ئەرکدارەکان کاتێك خەریکبوو کاغەزەکەی پێدەدام گوتی، ئەوێ دوورگەیەکە. پێمگوت دوورگە چیە، گوتی دەیبینی. گوتی هیچ مەترسە، لەوێ ئاغایەکی باش هەیە کە ملازمە، بڕۆ بیدۆزەرەوە، ئەو دەتبات‌و خانووەکەتت نیشان دەدات‌و هەم چاوی لەتۆ دەبێت‌و هەم لەمنداڵەکانت".

پویراز بێدەنگ بووو چاوەڕێی کرد. ئوسو ماوەیەك بێدەنگ بوو. پاشان سەری هەڵبڕی‌و سەیری پویرازی کرد:

"ئەو دوورگەیە چیە، لەکوێیە؟"

"کەمێك دواتر کە هەستاین دوورگەت نیشان دەدەم. دەڵێی لەکوێیە، لەناوەڕاستی دەریایە. تۆ دەتەوێت شتێك بڵێیت، وانیە؟"

دیسان چاوی بڕیە پویرازو ماوەیەکی درێژ ئاوا سەیری کرد. پویراز تەماشایکرد دوودڵەو ناتوانێت هیچ بڵێت، بۆیە پێیگوت: "بڵێ، هەر شتێکی دەتەوێت بیڵێ، شەرم مەکە".

ئوسو هەروا بەدوودڵیو نیگەرانیەوە سەیری پویرازی دەکرد. پاشان گوتی: "دەیڵێم". لەسەر چەمەنەکە بەرامبەر پویراز لەسەر چیچکان دانیشت. "ئەرکدارێکی حکومەت ئێمەی سواری کەشتی کرد. چووینە بەشی سەرەوەی کەشتی دانیشتین، کابرای ئەرکدار کرێی دایە بەلەموانو پێیگوت، سەلام لەکاك پویراز بکەو رۆیشت. بەلەموان هەرکە کرێی خۆی وەرگرت، هاتە لای من گوتی: "دەبێت سەبر بگرین، چونکە دوو کەسی دیکەش دەیانەوێت بچنە دوورگە".

زۆر چاوەڕێمان کرد، بەڵام ئەو دوو کەسە هەر نەهاتن، بەلەموان پەیتا پەیتا دەیگوت سەد لەسەد دێن، دەبێت چاوەڕێیان بکەین، ئەمانە گەشتیارانێکی زۆر پوولدارن. ئەو پارەیەی کە ئەوان داویانەتە من پێنج هێندەی ئەو پارەیەیە کە حکومەت بۆ گەیاندنی ئێوەی پێداوم. منیش هەموو جارێك پێمدەگوت، هیچشتێك ناکرێت، دەبێت سەبر بکەین تا دێن، ببورە برا. منداڵەکان ماندوو بوون، خەوتن، بەلەم بەئارامی دەهەژاو تەکانی دەخوارد. سەرەنجام رێبوارەکان هاتن، یەکێکیان باڵابەرزێکی ئەسمەری چاوشینو برژانگدرێژ بوو، شەلواری سوارکاری لەبەر بووو چەکمەی ئاوزێنەدارو قەمچیەکی بچووکی دەسکزیوی چەرکەسیشی بەدەستەوە بوو. کڵاوێکی نوێشی لەسەرنابوو. دەسماڵێکی سووری خستبووە گیرفانی سەر سنگی. دوو دەمانچەی دەسك عاجی نەخشێندراوی لەبن لچکی چاکەتە کراوەکەیدا بەدی دەکران. من نوقمی سەیرکردنی ئەو پیاوە هەڵکەوتووە بووبووم.

ئەو پیاوەی کە لەتەکیەوە بوو کورتەباڵایەکی جلوبەرگ دڕاوو پڕلۆچو نارێکوپێك بوو. ئەویش دوو دەمانچەی بەقەدەوە بوون. خورجینێکی رەنگاوڕەنگی بەسەر شاندا دابوو، کە دەبریقایەوە. ئەو دوو کەسە رۆیشتن، ماوەیەك لەکونجێکی بەلەمدا دانیشتنو لەگەڵ یەکدا قسەیان کرد. ماوەیەك دەنگیان بەبەرزو نزمی دەبیسترا. بەعارەبی قسەیان لەگەڵ یەکدی دەکرد. لەبەرئەوەی ماوەیەکی درێژ لەبیابانەکانی عێراقم مابوومەوە. کەم تا زۆرێك لەقسەکانیان دەگەیشتم. لەنێو قسەکانیاندا بەردەوام باسیان لەپویرازو عەباس دەکرد. کاتێك گوێم لەناوی پویراز بوو بەوردی گوێم لێڕاگرتن، سەرەنجام بەتەواوی بۆم دەرکەوت، کە ئەو دووانە بەتەمای پیلانێکی خراپن دژی پویرازو عەباس، بۆ ئەوەش دێنە دوورگە. دوای ئەوەی کە ماوەیەك بێدەنگ بوون، پیاوە باڵابەرزەکە هەستاو هات لەناوەڕاستی بەلەمەکە قیتاو قیت راوەستاو چاوی بڕیە رێڕەوی بەلەمو تا گەیشتنی بەدوورگە لەشوێنی خۆی نەبزووت، بەلەموان ئەوانی بردە ئەسکەلەو گوتی:

"ئێره دوورگەیە". ئێمە لەسەر ئەسکەلە دانیشتین، منداڵەکان هەر لەوێ خەویان لێکەوت، لەو ماوەیەی کە لەوێ دانیشتبووین، کابرا باڵابەرزەکە هەروا ڤیتاو ڤیت، بێهیچ جووڵەیەك لەشوێنی خۆی راوەستابوو، بەڵام کابرا کورتە باڵاکە دیارنەبوو. من هەستام یەکێك لەمنداڵەکانم بەم دەستو ئەوەی دیکەشم بەدەستی دیکەم گرتن. ژنەکەشم هەروای کرد. هەر لەگەڵ ئەوەی بۆنی قامیشەڵانمان هەست پێکرد، بەرەو لای قامیشەڵانەکە چووین.

کە بۆنی دەوەنە گەزەکان هات ئینجا رێگامان بۆلای دەوەنە گەزەکان گۆڕی. منداڵەکانمان لەسەر چەمەنەکانی ئەوسەری دەوەنەکان خەواندن.

تا بەیانی خەو نەیبردینەوە.

"کەشیتەکە کەی رۆیشت؟"

"نازانم".

"گوێت لەدەنگی پرتە پرتی ماتۆڕەکە نەبوو؟"

"ئاگام لێنەبوو، تا بەیانی پرتەپرتی ماتۆڕ لەدەریاوە هات یان نا".

"ئەو دوو کەسە لەکەشتی هاتنەدەر یان نا؟"

"نازانم، لەو ماوەیەی کە ئێمە لەسەر ئەسکەلە دانیشتبووین ئەو پیاوە هەروا لەناوەڕاستی کەشتیەکە بەپێوە راوەستابوو".

"زووبە با بچینە سەر ئەم تەپۆلکەیە با دوورگەت نیشان بدەم. بەخێر بێن".

"سوپاست دەکەم. سوپاست دەکەم".

"نیگەران مەبە، دایکە لێنا لەتۆ باشتر چاوی لەمنداڵەکانت دەبێت".

ئوسو گوتی: "چاوی لێدەبن".

چوونە سەر تەپۆلکەکەو بەپێوە سەیری چەپو راستو پێشەوەو دواوەیان کردو لەنێو رووناکیی بەرەبەیاندا تەماشای دوورگەو دەریایان کرد.

ئوسو گوتی: "دوورگە زۆر بچووکە، کەچی دەریا زۆر گەورەیە، بەڵام ئەم دوورگەیە دەڵێی بەهەشتە. خواوەند پارچەیەکی لەبەهەشت هەڵگرتووەو هێناویە لەناوەڕاستی ئەم دەریایە دایناوە، بەڵام لێرە خەڵکی چی دەخوا، چی دەخواتەوە؟"

"زۆر شت دەخۆنو دەخۆنەوە".

لەپێش بەردەنووسەکە دانیشتنو پاڵیان پێیەوەدا.

ئوسو قسەی کردو پویراز گوێی لێگرت، پویراز قسەی کردو ئوسو گوێی لێگرت، هەردووکیان باسیان لەو شەڕو نەبەردانە کرد، کە بەشدارییان تێدا کردبوو. پویراز، وەکو هەمیشە بەچاوانی فرمێسکاوی باسی شەڕەکانی لەگەڵ رووسو چیاکانی ئەللاهو ئەکبەرو ساری قامیشو باسی ئەو نەوەد هەزار سەربازەی کرد، کە نیوەیان بوونە خۆراکیی ئەسپێیانو نیوەی دیکە لەسەرمانو لەنێو بەفرو سەهۆڵدا رەق بوونەوەو چاوەکانیان دەرپەڕی.

ئوسو باسی بیابانو مندالانی کوێستانەکانی ئەنەدۆڵی کرد، کە بەر لەهەڵگیرسانی جەنگ، بەرگەی گەرمای تاقەت پڕوکێنی بیابانی مەزۆپۆتامیایان نەگرتو وەکو گەڵای درەختان هەڵوەرینو لەنێو چوون.

پویراز گوتی: "هەستە با بچین کونو کەلەبەرەکانی دوورگەکەمانت نیشان بدەم".

نزیک بەنیوەڕۆ هەستانو رووەو خوارەوە رۆیشتنو گەیشتنە لای غەلێفەی مێشە هەنگەکانو دەنگی وزە وزی هەنگەکانیان بۆ هات. ئوسو بەخۆشحاڵییەوە گوتی: "وااای لەم دوورگەیەدا هەنگەلانیش هەن".

پویراز بەفیزێکەوە گوتی: "هەن".

ئوسو هەر کە غەلێفە لەسەریەك کەڵەکەکراوەکانی بینی، لەسەرسامیدا خەریکبوو زمانی بگیرێت.

"چەند زۆرن هەنگەکانتان!"

پویراز گوتی: "زۆرن".

"کێ چاودێریان دەکات؟"

"هیچکەس".

"ئاوا!"

پویراز تا بۆی کرا باسی ئەو یۆنانیانەی ئەوێی بۆ کردو سەبارەت بەدوورخستنەوەیانو ئەوەی کە ئەم هەنگو خانووو باغچەو باغانە لەوانەوە بەجێماون، قسەی بۆ کرد. هەروەها دەربارەی ئەو تورکانەی کە لەیۆنانەوە هاتبوونە دوورگەو هەوارگەیان بەدڵ نەبووو رۆیشتبوون قسەی بۆ کردو باسی ئەوەی بۆ کرد کە دوای رۆیشتنی ئەو تورکانەی لەیۆنانەوە هاتبوون، ئەو ئاوارانەیان هێناو لەدوورگەیان نیشتەجێ کردن، کە لەئەنەدۆڵەوە هاتبوون.

"ئەوەم دەزانی، دەمزانی، بەڵام تۆ زۆر باشت بۆ روونکردمەوە. تێگەیشتم، هەنگەکان".

"من هەنگەکانم کڕیون".

"لەکێت کڕیون؟"

"لەحکومەت".

"پارەی زۆرت پێداون؟"

"نە زۆرنا".

"تۆ کەسێکی پارەداریت؟ هەنگەڵانەکان زۆرن، بەڵام ئایا تۆ زمانی هەنگەکان دەزانیت؟"

"نایزانم، من خانووەکەشم..". ئاشەکەی نیشان دا، کە لەو خوارەوە پەروانەکانی دەخولانەوە". ئەو ئاشەشم بەسکەی زێڕ کڕیوە".

"چ ئاشێکە؟"

"ئاشی هەواییە".

ئوسو سەری داخست.

"تا ئێستا نەبینیومە، نەهیچشتم لەبارەوە بیستووە، چ کارێك دەکات؟"

"ئارد دروست دەکات. ئەو پەروانانە بەبا دەسوورێنەوە، پەروانەکانیش بەرداشەکان دەخولێننەوە".

"وای باوکە، وای! با لەجیاتی ئاو! بەڕاستی دیارە ئەو یۆنانیانە کەسانێکی زۆر زیرەك بوونە. یانی لەجێگایەك کە ئاو نەبوو، لەجیاتی ئاو دەکرێت سوود لەبا وەربگیرێت".

"چارە نیە".

"ببوورە، دەمەوێت شتێکت لێبپرسم، ئایا شەکراو دەدەنە ئەم هەنگانە؟" بۆچی شەکراویان بدەینێ، لەڕاستیدا ئەو هەنگانەن کە هەنگوین دەدەنە ئێمە، هەربۆیەش ئەو هەموو غەلێفانەم کڕیون".

"گوتم گوڵەکانی ئەم دوورگەیە بەشی ئەو هەموو هەنگانە دەکەن؟"

"دیارە کە بەش دەکەن. راستە هەنگەکان زۆرن".

لێرە بۆ لێوارەکانی دەریا رێگاکە چەندە، یانی هەنگەکان دەتوانن لێرەوە بچنە لێوارو بگەڕێنەوە؟"

"نازانم، هەنگەکان دەتوانن چەند بفڕن؟"

"دەتوانن زۆر بفڕن. دەتوانن لەدەشتەکانەوە تا قەدپاڵەکانی چیای جودی بڕۆنو شیلەی گوڵان هەڵمژنو بگەڕێنەوە".

"تۆ هیچ لەکاری هەنگەوانی دەزانیت؟"

"ئێمە هەنگمان زۆر هەبوون، هاوینان کە دەشتەکانمان وشك دەبوونو گوڵو گیای دەشت دەبوونە پووش. غەڵێفەکانمان لەهێستران بار دەکردنو مەڕو بزنەکانمان دەدانە پێش خۆمانو دەچووینە چیای جوودی. لەچیای جوودی بەهاوینان جۆرەها گوڵ سەر لەخاك دەردێنن، ئەوەندە زۆر کە هەموو لایەك پڕ دەبێت لەگوڵ".

"تۆ ئاشنایەتیت لەگەڵ هەنگان هەیە؟"

"ماڵی ئێمە زۆر هەنگی هەبوو، باوکم لە هەموو گیانداریکی دی زیاتر هەنگی خۆشدەویستن".

منیش چوومەتەوە سەر باوکم. لەمنداڵیەوە سەرقاڵی هەنگانم، دەتوانم دەستنیشان بکەم کە کام هەنگ نەخۆشە. کامە ماندووەو کامەیان عاقڵە، یان شێتە. من هەنگی زۆر لەئاغەکانم بینیون".

"سەیر بکەین، ئەم غەڵێفانە گەلێك زۆرن؟"

"بەڵێ، ئەمانە هی ماڵێكو دوو ماڵ نین، غەڵێفەی گوندێکی گەورەن. سەیر بکە، غەڵێفەکان نیشانەی جیاجیایان لەسەرە".

"کەوابوو تۆ چاوت لێدەبن، ئەمانە هی من، جەمیلی پزیشکی ئاژەڵانن، ئێمە هاوپشکین. ئەگەر تۆ بەغەڵێفەکان رابگەیتو چاوت لێیان بێت، هەنگوینەکەیان دەکەینە سێ بەش".

"من کاری خۆم هەیە".

"چ کارێك؟"

"پێمگوتیت کە من دەنگبێژم".

"بە دەنگبێژی پارە پەیدا دەبێت؟"

"من هەمیشە لەو رێیەوە پارەم پەیدا کردووە".

"مەگەر تۆ بەکوردی گۆرانی ناڵێیت؟"

"بە کوردی دەیڵێم".

"ئەو هەموو گوێگرە کوردە لەم دەروبەرانە چۆن پەیدا دەکەیت کە گوێت لێبگرنو پارەت بدەنێ؟"

"حەفتاو دوو میللەت گوێ لەگۆرانیەکانی ئێمە دەگرنو پێیانخۆشن".

"چۆن، ئەوانە خۆ کوردی تێناگەن".

"لەگەڵ ئەوەشدا کە تێناگەن، بەچەشنێك تا تەواو دەبێت گوێ لەگۆرانیەکانم دەگرن، وەك ئەوەی تێبگەن. هەندێکجار بەتورکیش بۆیان دەخوێنم. کە گۆرانیە تورکیەکانم دەبیسن باشتر تێیاندەگەن. تەنانەت ژنەکان دەست دەکەن بەگریان. من لەشارەکەی خۆم دێ بەدێ هاتمو گۆرانیم چڕین. لەهەندێك لەگوندەکانیشدا نەیم ژەند. ژنانو پیاوانو هەموو ئەو کەسانەی گوێبیستی نەی من دەبوون، دەستیان دەکرد بەگریان".

"ئێستا تۆ بەهەنگەکان رابگەو چاودێریان بکە، کاتی مێشەهەنگ بڕینەوە هەقدەستی خۆت وەردەگریت، ئینجا ئەو پارەیە دەدەیتە ژنەکەتو بۆ خۆت هەر شوێنێکت حەز لێبوو بۆ گۆرانی گوتن دەڕۆیت".

"تۆ بۆ ئەوەی پارەم پێبدەیت ئەم کارە دەکەیت".

"نە، من هیچ سەرم لەهەنگەوانی دەرناچێت، جەمیلیش وەکو من هیچی لێنازانێت، جارێك زارکی غەلێفەیەکی کردەوە، ئەگەر سەروچاوی خۆی پێشتر دانەپۆشیبا، هەنگەکان خواردبوویان".

"هێڵنگی پۆشیبوو؟"

"بەڵێ".

"ئەو هەنگەوانێکی شارەزایە".

"کاتێك زارکی غەلێفەکەی کردەوە، یەکسەر گرتیەوەو گوتی هێشتا شانەکان پڕنەبوونە، پاشانیش یەکسەر گەڕاینەوە".

"بابزانین چۆن دەبێت، من هەنگم لەهەموو شتێکی دیکە خۆشتر دەوێن، لەرێگادا دێهاتیەکان پێشوازیان لێکردین، رێزیان لێگرتین، ئەگەر نانێکیان هەبا، لەگەڵیاندا بەش دەکردین. نوێنو تەختە خەوەکانی خۆیان داینێو خۆیان لەسەر عەرد خەوتن. چ لەکوردی تێبگەنو چ تێنەگەن، گوێیان لێدەگرتین. کاتێکیش نەیم لێدەدا دەگریان. پیشەی من دەنگبێژیە. کارێکی دیکە ناکەم، ئەگەر کارێکی دیکەش بکەم زۆر درێژە ناکێشێت دەمرم".

ئەو خەڵکە باشە ئەگەر دەنگبێژی نەمێنێت چدەکەن، خوایە هیچ میللەتێك بێدەنگبێژ نەبێت. ئەوانەی کە لەجەنگەکان، لەنێو هەژاریو دەستکورتیو نەخۆشیەکاندا گوێیان لەئاوازەکانی من دەگرت، گیانێکی تازەیان دەهاتەوەبەر".

"خوایە هیچ گەلێك بێدەنگبێژ نەبێت. ئێستا کە تۆ هاتوویت، خەڵکی دوورگەی ئێمەش خۆشحاڵ دەبن".

چاوەکانی ئوسو بریسکانەوە.

"ئەمنیش تا بتانەوێت لەهەموو جۆرە ئاوازێك بۆتان دەچڕم. نـەییش هەرچـەندی پێتانخۆش بێت لێـدەدەم. مـن لەبـەردەم ئاغاکـان، پادشـاکان‌و لەبەرامبـەر هـەزار کـەس نەیم ژەنیوە".

"نەییەکەت لەکوێیە، هێناوتە؟"

گـوتی: "هێناومـە". گۆچـانێکی درێـژی بەدەسـتەوە بـوو نیشـانی دا، "خسـتوومەتە نێـو ئەمـەوە". لای خـوارەوەی گۆچانەکەی کـردەوە، ئەمسـەرو ئەوسـەری گـرتن، کـەمێك شـۆڕی کردەوە، نەییێکی پڕ لەنەخش‌و نیگاری سووورباو، کـە سـەرەکەی ئـاوەزێڕ کرابـوو، هاتـەدەر. ئوسـو بـەبینینی سەرسـامبوونی پـویراز خۆشـحاڵ بـوو. پێیگـوت: "خـوا لێـی رازیبێـت، ئـەو وەستایەی کە ئـەم نەیـەی دروسـتکردووە، زۆر دەمێکـە مـردووە. لەهـەموو تەمەنیـدا تـەنها چـەند دانەیـەکی دروسـت کـرد. لەدروسـتکردنی هـەر نەیەکدا ئەوەنـدە کـاری دەکـرد، کـە لەبیری دەچوو کەی دەستی بەکارکردن کردووە. کە نەیەکەیشی تەواو دەکـرد، لەبەرامبـەری خۆی دایدەناو بەسەرسامیەوە لێیدەڕوانی. ئینجا یەکەمجار خۆی ئاوازێکی دەژەنـی‌و ئەگـەر رای لەدەنگەکەی با، لەخۆشیان خەنی دەبوو. ئەگەریش رای لێنـەبا، دەیشـکاندو هـەمان رۆژ دەستیدەکرد بەدروستکردنی نەیەکی دیکە. نەیەکانی ئـەو وەسـتایە تەنانـەت لـەماڵی ئاغـاو پاشاو لەدەستی زۆربەی نەیژەکانیشدا نیە. نەیژەنێك هەبووە کە کوڕە مـیر بـووە. لەوانـەوە چـۆتە بەغـداو لەبەغـداوە چـۆتە تفلـیس‌و لەتفلیسـەوە بـۆ شـیرازو لەشـیرازەوە چـۆتە کرماشـان‌و تـەنها لەگونـدێکی نێـو چـیاکاندا توانیویـە دانەیـەك لـەو نەیـە پەیـدا بکـات. نەیژەنەکە زۆر پیربووە. میرزادەی نەیژەن بەپیرەکەی گوتـووە، تـۆ زۆر پـیر بوویـت، ددانـت لەدەمدا نەماون، بەبێ ددانـیش نـەی لێنادرێـت، نەیەکـەت بـدە بـەمن لـەگیانم بترازێـت زار هەڵبڕە هەرچی دەتەوێت داوا بکـە. مـن کـوڕی مـیری بۆتـانم، نەیـژەنی پـیر، هـیچ وەڵامێکـی نەداوەتەوە، دەستی داوەتە نەیەکەی‌و لێوی پێوەناوەو تێیهـەڵکردووە. بەچەشـنێك ژەنیویـە کە کوڕە میرەکـە لەهـەموو تەمەنیـدا دەنـگ‌و ئـاوازێکی ئـاوای نەبیسـتووە. پێیگوتـووە بـاوە پیرە، باوە پیرە، تـۆو ئـەم نەیـە بـاش لەگـەڵ یـەك راهـاتوون. مـیرزادەی بۆتـان، دیسـان ملـی رێگای گرتووەو کەوتۆتە دوای پەیداکردنی هەمان جۆرە نەی".

"پەیدای کردووە؟"

"پەیدای کردووە".

"هـەموو شـتێك تێگەیشـتم. تـۆ بـەم نەیـەت نـەیمان بـۆ دەژەنیـتو ئاوازمـان بـۆ دەخوێنیتو بەهەنگەكانیش رادەگەیت".

ئوسو تكاكارانە چاوی بڕیە نێو چاوەكانی ئەوەوە.

پویراز گوتی:

"ئوسـوی بـرام، لەدوورگـەدا هـەر تـەنێ تـۆ دەتوانیـت ئـەم كـارە بكـەیت، ئەگـەر تـۆ چاودێریان نەكەیتو پێیانڕانەگەیت، هەموویان لەنێو دەچن".

ئوسو قسەی پویرازی بڕی: "پزیشكی ئاژەڵان چی؟ خۆ ئەو هەیە".

"پزیشكی ئاژەڵان سەری لەئەسپو مەڕو بزنان دەردەچێت. دوورگـە بـەزووترین كـات پڕ دەبێت لەخەڵك. پزیشكی ئاژەڵانیش تا ئەودەم هەنگەوانی لەتۆوە فێر دەبێت، ئەوسـا تۆش دەست دەدەیتە نەیەكەتو دەچیە گوندو شارۆچكەكانو ئاوازو گۆرانیان دەخوێنیو ئێمەش چاومان لەمنداڵەكانت دەبێت. باشە، ئێستا چ دەڵێیت؟"

ئوسو ئەبرۆی تێكنـان، نێـو چاوانی لۆچـی تێكـەوت، دوودڵ مـا. پـویراز دەیزانـی بـیر لەچی دەكاتەوە.

"ئەگەر تۆ پێیانڕانەگەیت، ئەم هەنگانە گشتیان دەمرن. خوا ئەمە قبووڵ دەكات؟"

ئوسو سەری هەڵبڕیو گوتی: "باشە ئاغا، مـن پێیانڕادەگـەم". دڕدۆنگـیو دوودڵیەكـەی گۆڕا بەشادمانی.

"بەڵام ئەی ئەو دوو پیاوە كورتە باڵاو باڵابەرزەكەی كە لەگەڵ ئێمە هاتن چیانلێهات؟ چاویان پڕ خوێنو دڵیان رەشو تاریك بوو. دەنگیان وەك زریكەی ماران وابوو. بـەردەوام باسیان هەر باسی پویرازو عەباس بوو. ئاغا عەباس ناوی باوكتە؟"

"باوكم نیە".

"ئەوان، عەباس هەر كێ بێتو لەهەر كوێیەك بێت، دەیدۆزنەوەو دەیكوژن. دەبێت تا زووترە عەباس بدۆزینەوەو ئەمەی پێبلێین".

"باش قسەكانیانت بیست؟"

"لەپێش منەوە دانیشتبوون، بەعارەبی قسەیان دەكرد. لـەلای ئێمـە هـەمووان عـارەبی دەزانن. لەهەموو قسەكانیان گەیشتم. هەر باسـی عەباسـیان دەكـرد. یـەكێكیان دەیناسـی، بڕیاریان وابوو ئەو نیشانی بداتو ئەوەكەی دی بیكوژێت".

"كەسێكی وا لەم دوورگەیە نیە".

قورگی وشك بووبوو. ئوسو تاسا".

"ئەی ئەگەر وایە ئەمانە چوونە کوێ؟ دەیانگوت عەباس لەم دوورگەیە. جار نا جارێکیش ناوی پویرازیان دەهێنا، بەڵکو برادەرەکانی سەردەمی سەربازیت بووبن، بەڵکو ویستبێتیان سۆراغی عەباس لەتۆوە وەربگرن. دەبێت بۆ کوێ چووبن؟"

پویراز زەرد هەڵگەڕابووو دەستو پێی دەلەرزین، بەڵام زۆر هەوڵی دەدا ئوسو ئەوە تێبینی نەکات. ئوسو هەر زۆر زوو تێبینی کردبوو. ئیدی باسی ئەو دوو کەسەی نەکرد.

پویراز بیری لەزەهرا، موسا کازم ئاغا، کرێتو ئەسپە تیژڕەوەکان دەکردەوەو بیری دەکردەوە کە ئەگەر لەگەڵ زەهرا دا هاوسەرگیری بکاتو منداڵیان ببێت، پیاوەکانی شێخی کۆچەران دەکردەوە کە ئەگەر ئاوا بڕوا دەیدۆزنەوەو دەیکوژن. ئەوسا زەهرا لەمەملەکەتی غەریبان، بەمنداڵەوە، لەم دوورگە چۆڵو هۆڵە دەبێت چی بکاتو پەنا بباتە بەر کێ. چیاکانی قەفقاز، کە هەرگیز نەیبینیبون، دایكو باوکی سوارانی داغستان خۆیانو ئەسپە رەسەنو قەمچیە سپیەکانیان، کچانی باڵابەرز بەکەزیە زەردو ئاوریشمیو چاوە گەشو شینەکانیانو چیاکانی ئەللاهو ئەکبەر، ساری قامیش، ئاڵتین بۆلاق، مەزۆپۆتامیا، شاو ژنو کچە چەرکەسیە فریشتە ئاساکەی شا، تەرمە سەر ئاوکەوتووەکان، مەمکی بڕدراوو خوێناوی کچان لەسەر لی دەم رووباران، خستنی رەشماڵان لەنێو تاریکیو هاوارو زریکەو نووزانەوە. دەنگی گریانی زارۆکان. زرمەو قرمژنی ئەو گوللانەی کە تاریکیان شەق دەکرد، هەروەها فڕکەو ناڵە ناڵو تێکقژقژانی خەڵکی لەبەرچاوان دەهاتو دەچوو.

لەخۆوە گوتی، زەهراو هەموو گیانی کەوتە لەرزین، سەیری چەپو راستی خۆی کرد. شەلاڵی ئارەقە بووبوو، تەنانەت شێوەی رۆیشتنی گۆڕابوو، ئەمە لەبەرچاوی ئوسو شاراوە نەبوو.

ئەو پیاوەی کە لەناوەڕاستی بەلەمە لەنگەر گرتووەکەی ئەسکەلە قیتاو قیت راوەستابوو، ئەوەی کە چاوەکانیشی نەدەکوتانو دوو دەمانچەی بەقەدەوە بوون، ئەو پیاوەی کە مووەکانی بۆر بوو، ئەوەی کە لەباخی هەناران لەژێر بەردێکدا خەوتبووو مارێك بەسەریدا دەخولایەوە، ئەو پیاوەی کە موو زەردێك بوو، سمێڵەکانی سووربوونو لەگەڵ ئوسوودا هاتبووو دوو دەمانچەی بەکەلەکەوە بەستبوون، پیاوێك کە لەنێوەڕاستی بەلەمدا دانیشتبووو چەندینو چەندین پیاوی سمێڵسووری دیکەی بەزەیندا گوزەران.

هاتن لەژێر دارچنارەکان دانیشتن. دایکە لێنا کاسەیەکی پڕی ئاو کردو دایە پویراز، کاسە ئاوێکیشی دایە ئوسو، لەپشت قامیشەڵانەکە سەرو کەللەی نیشانچی دەرکەوتو بەدوایشیدا ڤاسیلی.

نیشانچی گوتی: "بەدوای ئێوەدا دەگەڕاین".

پویراز هاتبووەوە سەرخۆیو گوتی: "باشت دۆزینەوە".

هاتن دانیشتن.

"لەماڵی خۆمان لێفەو دۆشەکم بردنو دامنانە ماڵی ئوسو".

"بالیف، گۆزە، کەوچكو قاپ، جەلیکان؟"

"هەرچی توانیم هەڵمگرتنو بردم، کەمو کەسریەکان لەشارۆچکە دەکڕین".

ئوسو گوتی: "من پارەم هەیە".

نیشانچی گوتی: "خوا بەزیادی بکات".

رێك لەم کاتەدا زەهرا، کە پەقرەجێکی بەدەستەوە بوو هاتە سەرکانی، لەژێرەوە سەیرێکی پویرازی کرد، دڵی پویراز خەریکبوو لەجێی خۆی هەڵقەنێت. نەیدەزانی چیبکات کاتێك سەتڵەکە خەریك بوو پڕ ئاو دەبوو، لەسەریەك سەری هەڵدەبڕیو سەیرێکی زەهرای دەکردو سەیرێکی ئەو مەلە سنگ خەنەییەی دەکرد، کە لەسەر لکە قامیشێك هەڵنیشتبوو.

"کاك موسا کازم ئاغا چۆنە؟"

"سوپاس لەماڵەوەن، خەوتوون".

"سەلامیان لێبکە".

"سەرچاو".

دوای ئەوەی سەتڵەکە پڕبوو، تاوێکی باش زەهرا هەر لەوێ راوەستاو بەچاوانی تەواوکراوەوە لەپویراز راماو بەنیگاکانی سەراپای ئەوی تەماشاکرد. هەموو ئەوانەی لەوێ بوون پەیان بەشێوەی نیگاکردنەکە برد. لەدڵی خۆیدا گوتی: "کچەش ئاشقە، زەهرا کچێکی زۆرجوانە، شایستەی ئەوەیە ببێتە هاوسەری پویراز. ئەو پیاوێکی رێکوپێكو لێهاتووە.

پویراز بەئوسوی گوت: "ئێستا بڕۆرەوە ماڵیو یارمەتی ژنەکەت بدە. بڕیاروایە شەو هەمووتان بۆ نانخواردن بێنە ئێرە. نیشانچی ئێستا دەڕوا لەگەڵ ئەحمەد ماسیمان بۆ بێنێت. ئەمشەو ماسیی سوورکرایەوە دەخۆین. ئەوەندە بەتامە ئەنگوستەکانتانی لەگەڵدا دەخۆن".

"ماسیی واتان بۆ دەگرم دونیا بڵێت ماشەڵڵا. هوسمەنیش لەگەڵ خۆمدا دەبەم".

"تۆ لەو جۆرە ماسیانەمان بۆ بێنە، هەر کێت ویست بیبە".

لەگەڵ ڤاسیلیدا هەستانو بەنێو دەوەنە گەزەکاندا ڕۆیشتنو شوێنێکی بەرزیان دۆزیەوەو لەسەر چەمەنەکان دانیشتن.

پویراز، بێئەوەی بشڵەژێت، ڕەوشەکەی وەك خۆی بۆ ڤاسیلی باسکرد.

ڤاسیلی گوتی: "خۆیەتی، کابرایە؟"

"بە گوێرەی قسەکانی ئوسو ئەوانە هەموویان لێکدەچن".

"ئەگەر ئوسو بیبینێت؟"

"چ دەڵێیت، لەشارۆچکەڕا تا ئێرە لەنێو بەلەمدا پێکەوە بوونە، ئوسو چەند ساڵی دیکەش بیبینێت دەیناسێتەوە. بەژنبڵند. چاوشین. بەهەمان شێوەی کە ئێمە بینیمان".

ڤاسیلی گوتی: "قژسوور، بەسمیڵی سووری درێژ".

"بەڵێ، ڕێك ئاوایە".

"دەمانچەکەت هەڵبگرە، ئەوەی منیش. فیشەکانیش زۆر بێنە".

"بەئوسوت گوتوە؟"

"پێمنەگوتووە؟"

"پیاوێکی ڕەسەن و ئازایە".

"ئاشقی ڕاستیە، لەتورۆسیەکانی ئێمە ئەم جۆرە کەسانە لەڕیزی ئەولیاکانن، ڕێزو شکۆمەندیی کەسێکی ئاشقی هەقو ڕاستی زۆر لەهی ئاغاو پاشاکان زیاترە. وەك من تێگەیشتبم ئوسو لەئاشقانی هەقو ڕاستیە. ئاشقانی ڕاستی درۆ ناکەنو ریاییو خراپەکاری نازانن. کەسانی ئازاو چاونەترسیشن. هیچشتێکیان لێشاراوە نیە. دەتوانین متمانە بەو جۆرە کەسانە بکەین. پیاوێکی زۆر ئابڕوومەندە. نابێت کەسێکی ئاوا لەدەست بدەین".

وەڕێکەوتن:

"پێتباشە پێکەوە دەڕۆین. پێتباشە هەریەکەو لەلایەکی دوورگەوە دەڕۆین".

"نابێت، پێکەوە دەڕۆین دەیگرین، پزیشکی ئاژەڵانو قەدریی بەلەموانو مەلەك خانم لەکوێن، نایانبینم".

"چوون بزن بکڕن، پێیان نەگوتی؟"

"پێیان نەگوتوم".

"پێنج دانە لەبزنە شینەکان. بزنەکانی پیرخدری دوورگەی کابا چاوی لێنا خاتوونیان بەستووە".

"خدر بزنەکانی ناداتە کەس. بزنی دیکە لەدونیا دەست ناکەون؟ چیشمان بەبزنە پڕ دەرەسەریەکانی پیر خدر دایە!"

تا شەو داهات نیوەی دوورگە گەڕان، دەوەنەکان، دۆڵەکە، ئەشکەوت، ژێر درەختەکان، ناو باخچەکان، کونەکان، چاڵەکان، بەستەری رووبارەکان، بەڵام هیچکەس دیار نەبوو.

ڤاسیلی گریانی لەقوڕگی مابوو، گوتی: "ئەمشەو من ئێشك دەگرم، تۆ بۆ شەوێك فلینتاکەت دەدەیتە من؟"

"فلینتا هەڵبگرە، ئەمنیش ئێشك دەگرم".

ڤاسیلی هەموو شتێك تێگەیشت. ئەو شەوەی کە تا بەیانی لەبەر باراندا لەئەسکەلە را بەسەر وردەبەردەکاندا تا ماڵی زەهرا رۆیشتبووو گەڕابووەوە لەبیری نەکردبوو. ئەمشەویش دەیویست ئەوە بکات.

ڤاسیلی چوو بەرۆژی رووناك لەنێو ڤامیشەلانەکە دانیشت، دەمانچە بەدەست. خۆر کە ئاوابووو تاریکی داهات، لەڤامیشەلان هاتەدەر. دەریا دەینەڕاند. یەکراست بەرەو باخی هەناران رۆیشت، لەم رۆژانەدا باخ پڕ بوو لەمار. ئەگەر پێی لەمارێك نابێت ئەوا مار پێیەوە دەداو دەیکوشت. ئەو کەسانە ئەگەر عەقڵیان لەسەر دابێت ناچنە ناو باخی هەناران. دوای ئەوەی کە چەند هەنگاوێك چووە پێش، گەڕایەوە، بەوریایی بەردێکی دۆزیەوەو چووە سەر بەردەکە دانیشت.

گوێ قولاغ بوو. لەبچووکترین دەنگ غافڵ نەبوو. تا نیوەی شەو لەسەر بەردەکە مایەوە. لەدەنگی باو دەنگی دەریا بترازێت هیچ دەنگێکی دی نەبیست. لەبەردەکە هاتەخوار، ئەو کاتەی کە بەلای سەرەوەی ئەسکەلەدا تێدەپەڕی، گوێی لەچرپەی پێی پویراز بوو کە بەسەر وردە بەردەکانی لێوار دەریادا دەڕۆیشت. چەند مست ئاوی لەکانیەکە خواردەوە. دەنگی پێی پویراز دوورو نزیك دەبووەوە. تاریکیەکە ئەنگوستەچاو بوو. دەنگی پێیەکە هەندێجار دەبڕاو دیسان دەهاتەوە. بیری دەکردەوە ئەمانە دەبێت خۆیان لەکوێ شاردبێتەوە. لەدوورگەیەکی ئاوا گەورە، لەو تاریکیە ئەنگوستەچاوە چۆن دەتوانێت ئەوانە بدۆزێتەوە، کە خوا نەبێت کەس نازانێت لەکوێ خۆیان شاردۆتەوە. زۆر لەژێر دارهەنارەکان نەمایەوە، بۆلای گردەکە چوو، دەیویست تا خۆر هەڵدێت لەوێ بمێنێتەوە.

پـویراز بـۆ ئـەوەی دەنگـی وردە بـەردەکانی بـەرپێی نەیـەت، زۆر بەئەسـپایی‌و وەك ئـەوەی پـێ لـەمێرووڵان بنێـت، دەڕۆیشـت. کـە دەگەیشـتە بـەردەم مـاڵی زەهـراو رووەو ماڵەکـە رادەوەسـتا، ماوەیـەك ئـاوا سـەیری ماڵەکـەی دەکـردو پاشـان درێـژەی بـەهاتن‌و چوونەکەی دەدایەوە.

بیری لەو پیاوە ئەسمەرە دەکردەوە، کە ڤیتاو ڤیت لەناوەڕاستی بەلەم راوەستابووو دوو دەمانچـەی بەکەمـەرەوە بەسـتبوون‌و چـاوانی شـینی لێکزەقبـووەوەی هـەبوون، زۆربـەیان پاسەوان‌و جەنگاوەرانی شێخەکانی عارەب‌و میرو پادشاکان‌و چەرکەسەکان بوون.

ئەوانەی بۆ کوشتنی ئـەویش هـاتبوون، چـەرکەس بـوون. بـیری دەکـردەوە ئەگـەر زەهـراو موسا کازم ئاغاو ڤاسیلی هەڵبگرێت‌و لەگەڵ خۆیاندا ببات بۆ شوێنێکی دیکە، چ دەبێت!.

"ئەگەر من بکوژێت، زەهرا چیدەکات. ئەو بۆ بینینی من هاتبووە سـەرکانی، ئەوەنـدە نەرم‌و نیانانە سەیری کردم، کـە تـەنها عاشـقە دڵسووتاوەکان دەتـوانن ئـاوا سـەیر بکـەن. ئەوانە لـەکوێن؟ ڤاسـیلی بـۆ کـوێ چـوو؟ ئیـدی بەتـەواوی روون بۆتـەوە کـە کۆچـەرەکان بەتەمای کوشتنی منن، ئەگەر ئەو هەر سێ کەسەشمان کوشتبان کـە هـاتوون مـن بکـوژن، شێخی عارەبان پێنج کەسی دیکەی دەنارد".

پـویراز لـەژێر گوشـار دابـوو، نەیـدەتوانی هـیچ رێگاچـارەیەك بدۆزێتـەوە. کـە بـیری لەمردن دەکـردەوە، کۆنـە برینـەکانی شـەڕی تـەن بەتـەنی دەزوورانـەوە. چـووە قـەفقاز.. بەڵام زەهرا بۆ هەر شوێنێك بڕوا باوك‌و خوشکەشی لەگەڵی دەچـن. ئەگەرچـی قـەفقازی نەبینیبوو بەتەواوی شارەزایی بوو. بـەردو خـاك‌و خـۆڵی، گـوڵ‌و گیـاو گـۆڵی، زنارەکـانی، بارانەکانی، هەورو کارمامزو گۆرانیەکانی، چیرۆك‌و داستان‌و بەتایبەتیش ئەسپەکانی.

باسـی قـەفقازی، شـەوان‌و رۆژان لـەباپیری‌و بـاوکی‌و لەسـترانبێژانی چـەرکەس‌و هەڤایەتخوێنەکانەوە بیستبوو. بەردەوام باسیان هەر باسی قەفقازو داغستان بـوو. ئـەوان تەنانـەت بـۆ سـاتێکیش لەتورۆسـی پـڕ گـوڵ‌و گوڵسـتان‌و خـاکی پـڕ پیـت‌و بەرەکەتـدا نەدەژیان. خوا دەزانێت قەفقاز مەملەکەتێکی چەند جوانە.

تا شەبەقی بەیانی بێڕاوەستان هات‌و چووو لەبەردەم مـاڵی زەهـرا راوەسـتا، کـە خـۆر هەڵات‌و بای بەیانی بزاوتی، لەلای کانیەکە دەنگی باڵندەکـە هـات. دەنگـی ئـەو باڵندەیـەی کە تەنها هەر مرۆڤە باش‌و زاهیـدەکان دەتـوانن ببیسـتن. پـویراز نەیـدەتوانی باوەڕبکـات لەو کاتەی بەیانیدا دەنگی ئەو باڵندەیەی بیستووە. دەنگەکە سێ جار لەسـەر یـەك هـات.

پویراز ئیدی ئاگای لەخۆ نەمابوو، لەنێو مەستیو نوقمی نێو رۆشناییەکی شینباودا باڵەفڕەی بوو. دەوروبەری پڕبووبوو لەگوڵ. لەسەر وردە بەردەکاندا کەوتە سەرچۆك. ئەو ئیدی لەم ناوە نەبوو، خوا دەیزانی لەکوێیە، هیچکەس نەیدەتوانی بیکوژێت.

لەلایەك هەستی بەو دەستەکرد کە لەسەرەوە هاتبووو بەهێمنی سەری نەوازش کردو لەلایەکی دی بۆنێکی ژنانە کە ئەو ناوەی داگرتبوو، هەستاو سەیریکرد زەهرا لەهەوای گورگەمێشدا ساڵدانە ساڵدانە دەڕواو لەبەرچاوان ون بوو. تا ئەو دەمەی کە زەهرا دەرگای خانووەکانی پێوەدا، لەکاتێکدا دڵی بەتوندی لێیدەدا بێئەوەی لەشوێنی خۆی بجووڵێت، لەهەمان شوێندا مایەوە. دووبارە گرفتاری شڵەژان هاتبوو. چووە سەرکانی، ئاوی خواردەوەو دەمو چاوی شوشت. دەبوا چیکردبا، بۆ کوێ چووبا. لەنێو شەپۆلێکی شادیبەخشدا بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە. چووە نێو قامیشەڵان، بەنێو دەوەنە گەزەکاندا رۆیشت، قاچەکانی رایاندەکرد، لەپێش باخی هەناران راوەستا، لەو جێگایەی کە لێیڕاوەستابوو، لەپەنا لکی دارو دەوەنەکاندا دەریا بەدی دەکرا، سپی سپی بوو. چووە نێو ئاشە هەواییەکە، جاڵجۆڵۆکەیەك تەونێکی چێکردبووو لەگۆشەیەکی تەونەکەیدا خۆی موچراندبوو..

سێ دەنکە گەنم لەسەر بەرداشەکەدا شێوەیەکی سێگۆشەیان دروستکردبوو. قاچەکانی بەدوای خۆیاندا بردیان بەرەو لای دارزەیتوونەکان. لەرێگادا چاوی بەچەند دانە خاڵخاڵۆکەیەك کەوت، کە لەسەر گەڵا سەوزەکان هەڵنیشتبوون، گوتی، ناتوانن من بکوژن. لەدرێژایی رێگادا مێرووڵەو خاڵخاڵۆکەی باڵدرێژی لەحاڵەتی هەڵفڕینو گولیلکەی وردیلەو شینی بینین، کە تا ئەو دەم لەدوورگەدا ئەمانەی نەبینیبوون. دەنگی ئەو باڵندەیەو خاڵخۆڵۆکەو گوڵە میناکان.. کەس ناتوانێت من بکوژێت. لەگەڵ هەر هەنگاو هەڵێنانێکدا کە بۆ پێشەوە دەینا، لەنێو گیاو گۆڵەکاندا پەپوولەی رەنگ شین، زەرد، سووری تۆخ، رەشو سپی هەڵدەفڕین. پەپوولە، زیندەوەرو زەردەواڵەی وای بینین کە لەوەتەی هاتۆتە دوورگە نەیبینیبوون، ئەو زەردەواڵانەی لێرەی دەبینین، لەهیچ شوێنێکی دیکەی نەبینیبوون.

ئەگەر سەیری سەربالی شینباوو درەوشاوەی زەردەواڵەیەکی دەکرد دەیتوانی روخساری خۆی تێدا ببینێتەوە. جاڵجاڵۆکەکان دیسان تەونە رایەڵکراوە هەڵماویەکانی خۆیان لەژێر تیشکی خۆردا پانکردبووەوەو خۆیان لەگۆشەیەکی تەونەکە مات دابووو

چـاوەڕێی نێچـیر بـوون. لـەڕۆژەکانی هـەوەڵی هاتنیشـی بـۆ دوورگـە، ئـەم تەونـە جاڵجاڵۆکەییانـە هـەروا هـەڵماویو تـەڕ بـوون. لـەکاتی نیـوەڕۆدا بـۆلای ئەسـکەلە چـوو. شـادمانیەکەی زیـادی کردبـوو نـەك کـەم. چـووە سـەرکانیو چـەند قـوم ئـاوی خـواردەوە، ئینجا چوو لەسەر تەختەکان دانیشت. تەنانەت هەستیشی بەماندووبوونەکـەی نـەدەکرد. نەزرە قوربانیەکەی کە هەرگیز لەملی نـەکردبووەوە، لـەملی کـردەوە. هەنـدێك شـتی کـە لەنێو قوتووەکە بوو هێنایەدەر، مەلەکەی دانایە سـەرلەپی دەسـتی، رووەو خـۆر رایگـرت، مەلە سەرو کلك زەردە سنگ دەرپەڕیوەکـە لەبـەر تیشـکی خـۆر درەوشـایەوە، واپێدەچـوو هەر ئێستا خەریك بێت بفڕێت. پـویراز بەدەسـتی چـەپی مەلەکـەی داپۆشـی. لەکاتێکـدا دەسـتەکانی دەلـەرزی، هەنـدێك لەدیاریـەکانی دیکـەی خسـتەوە نێـو قوتووەکـەو نـەزرە قوربانیەکەی کردەوە ملی. دەنگی پێیەکی بیست، کاتێك سەری هەڵبڕی ڤاسـیلی بینـی کـە خەریك بوو لەلای قامیشەڵانەکەوە دەهات. ڤاسیلی رایکردو گرتیە باوەش:

"زۆرباشـە، ڤاسـیلی زۆرباشـە". شـادی لـەدەنگو دەربڕینـی دەبـاری. ڤاسـیلی لەوەتـەی بەبیری بێت دەنگێکی وەها شادو پڕ جۆشو خرۆشی نەبیستبوو.

"زۆر باشە، تەواو بوو".

ڤاسیلی هەر تەنها توانی ئەوەندە بڵێت: "چیبوو؟"

"دەنگی باڵندەکـەم بیسـت، دەنگـی ئـەو باڵندەیـە. سـێ جـارانیش. باڵنـدە هـات لەسـەر دەسـتم هەڵنیشـت. دەیویسـت هـەڵبفڕێت. نـەیتوانی قسـەکانی تـەواوبکات. ڤاسـیلی مـات بووبوو: "چیبوو؟"

"دەتویست چی ببێت، لەمەو دوا هیچکەس ناتوانێت من بکوژێت".

وروژانەکەی تا دەهات زیاتر دەبوو.

"نـاتوانن بکـوژن. نـاتوانن بکـوژن. باڵندەکـە لەسـەر لـەپی دەسـتم هەڵنیشـتو زۆری نەمابوو لەشەقەی باڵ بداتو هەڵبفڕێت".

نیشانچـی کـە دەنگـی نـوقمی نێـو شـادیی پـویرازی بیسـتبوو، بەسـاتمەبردنەوە هـات. پویراز بەجۆشو خرۆشێکی زۆر گەرمتر هاتە پێشی:

"دەنگـی باڵندەکـەم بیسـت، دەنگەکـەی، هیچـکەس ناتوانێـت مـن بکوژێـت، ناتوانێـت بمکوژێت! هیچکەس، هیچکەس ناتوانێت من بکوژێت... ئـەویش سـێ جـاران، سـێ جـاران، سێ جاران بیستم".

نیشانچی لەدڵی خۆیدا گوتی، خۆشحاڵی خەریکە دەیخنکێنێت، خەریکە دەیخنکێنێت، خەریکە دەیکوژێت. پویراز پێچی دەخوارد، ئاە، خۆزگە دەیتوانی بڵێت قژی زەهرای نەوازش کردووە. دەنگی خۆی، بۆ ئەوەی زەهرا گوێی لێبێت بەرزکردەوە:

"ڤاسیلی، نیشانچی، یاللا بەلەم ئامادە بکەن، بابچینە دوورگەی کابا".

زەهرا کە دەنگی ئەوی بیستبوو دەرگای کردەوەو لەشیپانەی دەرگاکە راوەستا. پویرازیش رووەو ئەو راوەستاو تا ئەو دەمەی کچەکە نەچووەوە ژووریَو دەرگای دانەخست، لەویَ نەبزووت. ئەو شادیەی کە لەدەنگیدا دروست بووبوو بۆ ئەویش گوازرایەوە. لەپێستی خۆیدا جێی نەدەبووەوە. ئەمڕۆ چی بەسەر هاتبوو، روخساری هەمیشە گیراوو خەمگین بوو.

وەك ئەوەی بەباڵ بفڕن گەیشتنە دوورگەی کابا. نیشانچی بەدرێژایی رێگا هەر بیری لەوە دەکردەوە کە داخۆ پویراز دەنگی کامە باڵندەی بیستووە.

کام باڵندە ئەوی خستۆتە سەرباڵەکانیو بەرەو ئاسمانو ئەستێرەکانی بردووە.

"نیشانچی بەلەمەکە ببە سەر چەوی لێوار ئاوەکە. من تا شەو لێرە دەبم. ئێوە بڕۆن ماسی بگرن. ئەمڕۆ تا دەتوانن ماسیان بگرن. کە رۆژئاوابوو وەرنو من هەڵبگرن".

لەسەر بەلەمەکە خۆی هەڵدایە سەر چەوەکە.

نیشانچی بەدەم دەنگی بەرزەوە گوتی: "هێی، کە خۆت فڕیَ دا وامزانی باڵندەیت".

پویراز گوتی: "سەیر بکە، تەنانەت پێیەکانیشم تەڕ نەبوون".

نیشانچی گوتی: "بۆ تەڕببن، سواری سەرباڵی باڵندەیەك بووبوویتو دەفڕیت".

پویراز سەیرێکی مانادراری لێکردو نیشانچی خۆی لەنیگاکەی شاردەوە.

"ئەو باڵندەیە دەنگەکەی هەیە، لیَ بەخۆی نیە. مرۆڤ لەوەتەی ئافرێندراوە دەنگی ئەو باڵندەیە دەشنەفێت، لیَ هیچکات خودی باڵندەکەی نەبینیوە. هەموو کەسێکیش ناتوانێت دەنگەکەی ببیستێت".

"کەواتە تۆ بیستت".

"بیستم".

"مرۆڤ کە دەنگەکەی دەبیستێت چ روودەدات؟"

"بیستم ئیدی".

پویراز سەری هەڵبڕی، سەیرێکی زنارەکانی کرد، بزنە شینەکانی پیر خدر بەڕیز لەتەنیشت یەك راوەستابوونو سەیری ئەوانیان دەکرد.

"وا خەریکە شەو دادێت".

نیشانچی گوتی: "وا خەریکە شەو دادێت". بەلەم وەرسووڕاو لەدوورگەکە دوورکەوتەوە. شادیو خۆشحاڵی هێشتا لەدڵی پویرازدا شەپۆلی دەدا.

لەسەر زنارەکانی سەرەوەتری بزنە شینەکاندا، نێرییێکی زۆر گەورە راوەستا بوو، کە بەلای شینی دەینۆڕیو شاخو ریشو مووی درێژبوونو دەتگوت پارچەیەکە لەخودی زنارەکە.

پویراز بەزنارەکاندا هەڵگەڕاو بەئاسانی خۆی گەیاندە بزنەکان. بیریکردەوە، خۆزگە زەهرا منی بەو شێوەیە دەبینی. بزنەکان نەك هەر نەڕەوینەوە، بەڵکو هاتن لەهەر چوار دەوریدا راوەستان، بەزیتیو کونجکۆڵیەوە سەیری ئەویان دەکرد. دوای ئەوەی سەیری بزنەکانی کرد زیاتر چووە سەرێو خۆی گەیاندە نێریەکە. ئەو شوێنەی نێریەکەی لێڕاوەستابوو زنارێکی تیژو سەرەو ژوور بوو. پویراز زۆر پێوەبوو تا توانی خۆی بگەیەنێتە ئەوێ. نێریەکە لەجێی خۆی نەجووڵا. لەبەرپێی ئەودا پاڵی دایەوەو خۆی لێککێشایەوە. بزنەکانی لای خوارەوە رووی خۆیان بۆ ئەوان وەرسووڕاندو سەریان هەڵبڕیو چاوی لەسەر نێریەکە هەڵنەدەگرت. پویراز دەیویست نێریەکە بلاوێنێتەوەو ردێنە درێژەکەی بگرێت، بەلام نەیدەتوانی. بەئارامی دەستی بۆلای نێریەکە درێژدەکردو رێك لەو دەمەی کە دەستی لەنێریەکە نزیك دەبووەوە، وەك ئەوەی دەستی بەئاگر بکەوێت، دەیکێشایە دواوە.

هەستایە پێ. گوتی پیاو تەنانەت ناتوانێت دەستیش بداتە نێریەکەی پیر خدر، حەزی لێیە بیلاوێنێتەوە، بەلام بۆی ناکرێت. ئەگەر دەستم لێیدابا، باوە خدر چی لێدەکردم؟ بەڵکو هیچیشی نەکردبا، بەڵکو بەهۆی لاواندنەوەو خۆشویستنی بزنەکانی پاداشتێکیشی کردبام. لەگەڵ خدر یەك دوو هەنگاو لەزنارەکان چووەخوار. لەپڕ سەیریکرد وا نێریەکەش لەگەڵ ئەودا دێتەخوار. بۆنێکی خۆشی وەك بۆنی گوڵ لەنێریەکە دەهات. پویراز باش شارەزای نێریەکان بووو ئەمەی پێسەیر بوو. باوکی مێگەلە بزنێکی هەبوو. لەدڵی خۆیدا گوتی، نێریی پیر خدر! دیسان ویستی دەست لەنێریەکە بدات، هەر دەستی درێژکرد یەکسەر کێشایە دواوە.

نێریەکە هەروا پێ بەپێی ئەو دەهاتەخوار. لەسەر تاتەبەردێکی لووس راوەستا. لەناوەندی تاتەبەردەکە هەرکەوێکی قووڵی پڕاوپڕی باراناو هەبوو. لەزنارەکانی تورۆس ئەو دیمەنانەی زۆر دیبوون. بزنەکانی پیر خدر ئاویان لەو هەرکەوانە دەخواردەوە.

سێ لاچکە گیا لەهەرکەوەکە هاتبوونەدەر، کە سێ دانە گوڵی نارنجی گەورەیان دابـوو. دوو لەلاچـکەکان چـووزەرەیان دابـوو. نێریەکـەش لەگـەڵ ئـەودا سـەری درێـژکردبووو سەیری گوڵە نارنجیەکەی دەکرد، چیوای نەمابوو ردێنەکەی بگاتە گوڵەکە.

تـا ئـەو سـەری گۆڕاییەکـە رۆیشـت، نێریەکەشـی لەگـەڵ رۆیشـت. هەرکـە سـەیری لای خوارەوەی کرد واقی ورما. نەیدەتوانی باوەڕ بکات. دەشتاییەك لـەو خـوارەوە هـەبوو، کـە زۆر لەدەشتایی لای کانیەکە پانو فراوانتربـوو. چـۆن ئێـرەی نـەدیبوو، رەنگبێـت ڤاسـیلی ببینێـت، دەسـتیکرد بەدابـەزین بـۆ خـوارێ. نێریەکـەش لەگەڵیـدا دەهاتـەخوار. زۆر بەزەحمـەت بـۆی دەکـرا بچێتەخوار. تـا گەیشـتە خـوارێ دەسـتو پەنجـەکانی هـەموو رووشانو خوێناوی بوون. ئەژنۆی شەلوارەکەشی هەڵزڕان. بـەنێو دارزەیتوونـە پیرەکانـدا، کە لکەکانیان تێکئالأبوونو قاپۆرەکانیان پڕ کونو کەلێنو خـوارو خـێچ بـوون، تێپـەڕیو خۆی گەیاندە نێو بەردەلأنێك کە بەرامبەری بـوو. نێریەکـەش لەتەنیشـتیەوە بـوو. دوای دەشـتاییەکە کەنـدرێکی گـەورە دەسـتی پێـدەکرد. دەوەنـەجاڕی وردیلـەی بـەگوڵی وەنەوشەیی بەردەکانیان سمی بوو، لەهەردوولای کەندرەکـە سـەریان دەرهێنـابوو. لەگـەڵ گەیشـتنی بـەلێواری دەریـا پـەی بەهـەموو شـتێك بـرد. ئێـرە لمسـتان نـەبوو، بـەڵکو هەڵدێرگەیەکی قووڵ بوو.

خۆر کە لەبنی دەریایی دەدا، لەشێوەی بازنـەی پـانو بەلەرینـەوە لەسـەر بەردەکانـدا دەبەستراو دەکرایەوە. ماوەیەك نەیدەتوانی چاو لەسـەر بنـی دەریاکـە هـەڵبگرێت. پاشـان نیگای کەوتە سەر نێریەکە، کە لەلای راستیەوە راوەستابووو لەبنی ئاوەکە رامابوو، گوتی "تۆ چ جۆرە نێرییێکیت؟ جنۆکەیت، ئەهریمـەنیت، بنیادەمـت؟ "دەسـتی بـۆلای نێریەکـەی درێژکرد، بەلأم بێئەوەی دەستی بگاتە ریشی نێریەکە، کێشایە دواوە.

ماوەیەکی باش لەگەڵ نێریەکە بەزەویـە تەختانیەکـەدا گـەڕا. پـویراز لێـرە هەنـدێك گـوڵو باڵنـدەی بیـنین کـە لەهـەموو تەمەنیـدا نـەیبینیبوون. تەنانـەت دارزەیتوونـە پیرەکـانیش، بــەلكو گــەڵای گــەش گــەش داپۆشــرابوون. بــەبینینی دانــە زەیتــوونی وشکهەڵاتوو لەنێو لكو پەلکی درەختەکاندا خۆشحاڵ بوو. ئاشکرا بوو ئەم دارزەیتوونانـە خۆڕسك نینو دەستچینن. بـەم زەیتوونانـەی ئێـرە نـەك خێزانێـك، بـەڵکو پێـنج خێـزان بەخێو دەکرێن. چەندین دارزەیتوونی موتربـەکراوو کەندەوێکراویشی بیـنین. مسۆگەرە لەسەردەمێکدا خاوەنیان هەبووە.

لەو شوێنە تەختانیو هەموارەدا. سەری بەگشت لایەکدا کردو هەموو جێگایەکی پشکنی، بەڵام ڕێگایەکی بۆ چوونە نێو زەوییێکی دیکەی تەختایی نەدۆزیەوە. هەردوو لای ئەو زەویە تەختاییانەی بەزناری شینو نووکتیژ دەورە درابوون. لەنێو زنارەکاندا گوڵی زەردی دڕکاوی سەریان دەرهێنابوو. لەشوێنێکی نزیک لێواریش جۆرە گوڵێکی سووری پڕ ڕەنگی لاچکدرێژی بێپەلك ڕوابوو، لەهەموو سوورێك سوورتر، بەو شنەبایەی کە دەهات دەهەژایەوە. چارەیەکی دیکەی نەبوو، جگە لەوەی لەم شوێنە بچێتەدەر. نێریەکە لەپێشیەوە ئەو بەدوایدا، لەکاتێکدا کە خۆی بەزنارەکانەوە دەچەسپاندو هەموو دەستو پلی دەڕووشان بۆ سەرەوە ڕۆیشتن. چوونەخوارەوە لێرە بۆ پویراز ئاسانتر بوو. کاتێك چوونەخوارەوە. دەتگوت هەستو هۆشی لەشوێنێکی دیکە بوو. بۆیە نێریەکەی ون کرد. سەیری لای ڕاستو چەپی خۆی کرد، نێریەکەی نەبینی، چووە سەرکانیەکە هەستی بەماندووبوونێکی دلگیرانە دەکرد، دەستو ئەژنۆکانی دەزوورانەوە. بۆلای دەریا بای دایەوە. کاتێکی زۆر خۆی بەشوشتنی دەستو ئەژنۆ خوێناویەکانی خۆی خەریك کرد. ئاوی سوێر، خوێنەکەی ڕاگرت. تینووی بوو، لەسەر لێوی کانیەکە ڕووەو زەویەکە لێڕاکشاو دەمی بەئاوی ساردی کانیەکەوە نا، تا تێراو بوو خواردیەوە، پاشان هەستاو بۆلای دەریا چووو ئینجا لەژێر دارزەیتوونێك دانیشتو پشتی بەقاپۆری درەختەکەوەدا. بەلەمێکی بینی کە ڕووبەڕووی دەهات.

بەلەم هاتو لووتی دانایە سەر چەوەکەو لەنگەری گرت. ئەمەش یەکێکی دیکە لەشارەزاییو لێزانیەکانی نیشانچی بوو.

نیشانچی لەبەلەمەکە دابەزیو بەڕاکردن هاتەلای پویراز:

"چاو، چاو، وەرە چاوێك لەبەلەم بکە، ماسیمان لەدەریا نەهێشتن، گشتمان گرتوون، وەرە، سەیر بکە!"

دەستی پویرازی گرتو بەرزی کردەوە، کاتێکیش بەرزی کردەوە، گوتی:

"تۆ چیت لێهاتووە؟"و دەستی بەرداو ئەمجارە بەحاڵەتێکی نیگەرانەوە دووبارە لێیپرسی: "تۆ چیت لێهاتووە؟"

پویراز بەهێمنیو خوێنساردیەوە، بەشێوەیەك کە هیچشتێك ڕووی نەدابێت، دەستی ڕاوەشاندو گوتی: "هیچ نیە، کەمێك بەنێو ئەم زنارانەدا گەڕام".

ڤاسیلیشیان هاتەلا:

"سەیر بکەن، بەلەمم بەدارزەیتوونەکەوە بەستووە، دەریای ئێرە وەکو دەریاکانی دیکە نیە، ئەگەر ئاو هەڵبکشێتو بەلەمەکەمان راماڵێتو لەگەڵ خۆیدا بیبات، هیچکەس ناتوانێت بماندۆزێتەوەو لێرە دەمێنینەوەو لەبرسان دەمرین". هەر کە دەستو قاچو قوڵەکانی پویرازی ئاوا بینین، بەهاوارکردنێکەوە گوتی: "چیبووە پویراز، چیت بەسەر هاتووە؟ لەشوێنێك هەڵدێرایت؟"

"ن....ە، هیچم لێنەهاتووە، لەگەڵ نێریەکە..".

"ئەگەر هەڵنەدێراویت ئەدی ئەم برینانە چین؟"

"ئەو زنارانە". بەدەست نیشانی دان. لەگەڵ سەرهەڵبڕینیدا چاوی بەنێریەکە کەوتەوە کە لەسەر تیوەڕە بەردێکی نووکتیژ راوەستابوو. "ئەو نێریە بەپێشم کەوتو هەموو زنارو گوڵو دەشتو دەریاکانی نیشان دام".

ڤاسیلی گوتی: نیشانی دەدا، ئەمە نێریی پیر خدرە".

"ئەو زەویە هەموارەی نێوەڕاست لێرەش گەورەترە. دارزەیتوونەکانیشی خۆڕسك نین، لەنێو لکەکانیاندا دانە زەیتوونی وشکەوە بووم بینین، هەموو درەختەکان شکۆفەیان دابوو. تەنانەت دارهەناریشم بینین، ئەوەندە شکۆفەو گوڵ هەناریان دابوون کە لکەکانیان لەبەر قورسایی داهاتبوونەوە".

وەلی نیشانچی گوتی: "ئەوێش باخی تایبەتی پیر خدرە".

"هەموو خەڵکی ناوبانگی ئەوێی بیستووە، بەڵام کەس نەیبینیوە".

"ئەوێ جگە لەخدر دەبێت خاوەنێکی دیکەشی هەبێت".

ڤاسیلی گوتی: "نازانم".

بەهەمانشێوە کە خەریکی قسەکردن بوون لەگەڵ یەك، بزنەکانی پیر خدر لەگەڵ چەندین کاریلەی شین لەزنارەکان هاتنەخوارو دەوریان لێدان.

پویراز سەیری لای سەرەوەی کرد، نێریەکە هەروا لەسەر زنارە نووکتیژەکە راوەستابوو. بزنەکانی دەوروبەریان، چاویان دابووە پویرازو زۆر هێمنو لەسەرەخۆ سەیریان دەکرد.

ڤاسیلی گوتی: "بەس ئاگاداربن نابێت دەست لەبزنەکانی پیر خدر بدەین. دەنا دەکەوینە دەردەسەری".

چوون لەتەك بەلەم راوەستان، ڤاسیلی، بەوریاییەوە بەسەر بەلەم کەوتو دەستی بۆلای پویراز درێژکردو گوتی: "وەرە کاکە، وەرە ماسیان ببینە".

پویراز هەر کە سواری بەلەم بوو، واقی وڕما ئەو حەمکە ماسیە، ئەویش لەم ماوە کەمەدا!.

نیشانچی لەسەر کانیەکە خەریکبوو ئاوی دەخواردەوەو لەپڕ هاواری کرد:

"بینیت، ماسیەکانت بینین هاوڕێ؟"

پویراز گوتی: "بینیم. ئێستا با بڕۆین".

"هێشتا زوو نیە بۆ ڕۆیشتن؟"

"ماسیت لەدەریادا نەهێشتن. یاللا زووبە با بڕۆین زیافەتێکی گۆشت ماسی بۆ هەموو خەڵکی دوورگەکەمان ڕێکبخەین".

نیشانچی بزنەکانی نیشان دا:

"چی لەمانە بکەین؟"

"ئەمانە لەسەر زنارەکان هاتوونەتەخوار تا ئێمە بەڕێ بکەن".

"ئەگەر وایە بۆ بەڕێکردنمان هاتوون، با بڕۆین".

نیشانچی کندرەکەی لەدارەکە کردەوە، وەك پشیلە فیتکێکی داو بەسەر بەلەم کەوت، لەپشت سەریەوە ڕاوەستا، دەستەکانی خستنە بەرپشتێنیو ئاوڕی لەبزنە شینەکان دایەوە کە بەڕیز لەتەك یەکدی ڕاوەستابوونو هەندێك شتی پێگوتن. ڤاسیلی سووکانی بەلەمە ماتۆڕدارەکەی گرت. بەلەم بەخێرایی وەڕێکەوت.

"زۆری پێناچێت کە دوورگە ئیدی جێی بزنەکانی پیر خدری لێنابێتەوە. بەخێرایی ژمارەیان زۆر دەبێت".

"با زۆربن، خدریش ئەودەم ژمارەیەکیان لێهەڵدەگرێتو دەیانباتە دوورگە چۆڵەکانی دیکە. ئەوەندە بەسە پیاوێکی وەك خدرت هەبێت. پارووت دەکەوێتە ڕۆنی".

تا گەیشتنەوە دوورگە پێکەوە هەر باسی بزنەکانی خدریان کرد.

هێشتا مەودایەکی باش لەلێوارەوە دووربوون، کە تێبینی قەرەباڵغیێکیان کرد لەسەر ئەسکەلە. خەڵکی دوورگە بەتێکڕایی بەپیریانەوە هاتبوون. موسا کازم ئاغا لەگەڵ کچەکانی لەریزی پێشەوەی خەڵکەکە بوو.

بەلەم وەك ماسی خشیو هات بەتەنیشت بەلەمەکەی قەدریدا تێپەڕیو لەئەسکەلەدا لەنگەری گرت. ڤاسیلی کندرەکەی هەڵداو هوسمەن گرتیەوە. یەکەمجار پویراز لەبەشی پێشەوەی بەلەمەکە دابەزیو بەدوای ئەویشدا ڤاسیلیو ئینجا نیشانچی. خەڵکی دوورگە

ئەمڕۆ نـوقمی نێـو خۆشـیو شـادی بـوون. حـاڵو هەوایـەكی جیـاواز لەدوورگـەدا هـەبوو. پشیله - عەباس- لەباوەشـی مەلـەك خـانم بـوو. نـۆ دانـە بـزنیش لـەنێو خەڵكەكـە بـوون. پشیله سپیەكەی نێو باوەشـی جـەمیلی پزیشـكی ئـاژەڵانیش هـەم نیگـەران دیـاربوو، هـەم واقوڕماو. بەگومانو دوودڵیەوە سەیری دەوروبەری دەكرد.

جەمیل گوتی: "بزنەكان نۆ كاریلەشیان هەن".

پویراز چاوێكی بەدەوروبەری خۆیدا گێڕا:

"كوا؟ لەكوێن كاریلەكان؟"

پزیشك بەپێكەنینەوە گوتی: "لەشوێنێك شاردومانەتەوە".

"بۆچی شاردوتانەوە، دایكیان لێرەن".

"ناتوانین بیانگرین".

"دەمەوێت ئەو كاریلانە ببینم".

مەلـەك خـانم لەكاتێكـدا عەباسـی بەباوەشـەوە بـوو، كەوتـەڕێ. نیشانچـی پـویرازو ڤاسـیلیش بەدوایـدا كەوتنـەڕێ تـاكو كاریكـەكان ببیـنن. پزیشـكی ئـاژەڵان، قـەدریی بەلـەموانو هوسمـەن خـەریكبوون كاریلـەكانیان دەهێنـا. ئوسـوو كـازم ئاغـا لـەژێر دارچنارەكان دانیشتبوونو قسەیان لەگـەڵ یەكـدی دەكـردو هـیچ گوێیـان بـەوە نـەدەدا چ لەدەوروبەریان روودەدا، ژنەكان چوونە نێو بەلەمەكە.

"ئۆووی ماسی، چەند زۆرن!"

ماسیەكانیان بردنو لەسەر لی لێوارەكە لەسـەریەك هـەڵیانگرتن. منداڵـەكان كـەمێك لەولاتر، لەكاتێكدا قاچە رووتەكانیان لەنێو ئاوەكە بوو، چاویان بڕیبووە تۆپەڵی ماسـیان، كە لەسەر یەك كەڵەكە بووبوون.

ئاگرەكە گڕی لێهەستا، پەنگرەكان سووربوون. بۆنی ماسیی برژاو ئـەو نـاوەی داگـرت. شـنەبایەك هـەڵیكرد، منـداڵو گـەنجو پـیر لـەدەوری سفرەكە دانیشـتن. شـەڕابی سـوورو ماسیی سووركراوە هاتنو لەنێو قـاپو هیربـاری مسی جـەلادراو داندرانـە سـەر سـفرەكە. پـویراز پەرداخەكـەی بـەرزكردەوە گـوتی: "بەخۆشـی!" موسـا كـازم ئاغـاش پەرداخەكـەی خۆی هەڵداو گوتی: "بەخۆشیو بەختـەوەریی هـەمووتان!" زەهـرا سـەیری پـویرازی كـرد، بزەیەكی بۆ كرد. شادومانییێكی لەرادەبەدەر كە لەدڵی پویراز دەجۆشـا، هـەموو ئەوانیـدی گرتەخۆی. هەمووان پێكەوە قسەیان دەكردو هەراو بەزمێك بوو لەوناوە نەبێتەوە.

نانخواردن زۆر درێژەی کێشا. منداڵەکان بێعاریـان دەکـردو دانەدەسـەکنان، هیچکەس ڕێگەی لێنـەدەگرتن. موسا کـازم ئاغـا لەهـەموو مـاوەی نانخواردنـدا هـەر باسـی ئەسـپو جۆرەکـانی بـەخێوکردنیانی کـرد، پـویراز بێئـەوەی قسـەیەك بکـات، بـەدڵێکی تـژی لەخۆشیو شادمانی گوێی لەقسەکانی گرتبوو، گۆناکانی زەهرا سوور سـوور هەڵگەڕابوون. لەماوەی نانخواردندا بۆ ساتێکیش چاوی لەسەر پویراز هەڵنەگرت.

پزیشـکی ئـاژەڵان کـە سـەری گـەرم داهـاتبوو، بـەزمانی کـورد بەئوسـوی گـوت کـە لەتەنیشتی دانیشتبوو: نەیەکەت هەڵبگرەو بیهێنە".

ئوسو یەکسەر هەستا، ڕۆیشتو لەچاوتروکانێکدا گەڕایەوەو لەناوەڕاسـتی چـەمەنەکە لەسـەر چیچکان دانیشـت. (خـەجێ) ی هاوسەریشـی هـات لەتەنیشـتیەوە دانیشـت. ئوسـو بـەڕێزەوە نەیەکـەی لـەنێو کیفەکـەی دەرهێنـا، چـەند جـار لەمسـەر تـا ئەوسـەر دەسـتی پێـداهێنا، پاشـان لێوەکـانی خستنەسـەری، چـەند جارێـك فـووی لێکـردو ئینجـا دەسـتی بەژەنین کرد. دەنگی نەی جۆشێنەر بوو. تا زیاتر لێیدەدا، جۆشو خرۆشو شـادی زیـاتر دەبوو. ماوەیەك دواتر هەمووان نوقمی نێو شادمانی بوون.. منداڵەکان ئـۆقرەو ئارامیـان لێهەڵگیرابوو، هەموویان پێکـەوە بـەرەو لای دەریـا پێیانپێوەنـا، گەڕانـەوە بەدرەختەکانـدا هەڵگەڕان. متەقیان نەدەکرد. پاشان هاتنو لەشوێنی خۆیان دانیشتنو گوێیان دایـە نـەی. هـیچ دەنگێـك لـەدەنگی نـەی بترازێـت، نەدەبیسـترا. تەنانـەت دەریـاش دەنگـی لـەخۆی بڕیبـووو گـەڵاکان نـەدەجووڵان. دەنگـی نـەی رۆچـووبووە نـاخی کـەڤر، خـاكو ئـاوو درەختەکانەوەو هەرچی لەدوورگە بوو لەزیندەوەرەکانەوە بگرە تا باڵنـدەکان، هـەموویان نوقمی نێو شادمانی بوون.

نیوەشەو بۆ ماوەیەك دەنگی نەی کپ بوو، خەجێ کاسەیەك ئاوی لەکانی هێنـاو دایـە ئوسو. ئوسـو دوای ئـەوەی ئاوەکـەی خـواردەوە، هەسـتاو چـووە کـەناری دەریـاو ماوەیـەك لەوێ راوەستا، پاشان گەڕایەوە نەیەکەی لەکیف دەرهێنـاو ماوەیـەکی درێـژ نەوازشـکارانە دەستی پێداهێنا. خەجێ هات لەتەنیشتیەوە دانیشت، ئوسو دەستی بەنەیـژەنین کـردەوە. ئەمجارە نەوایەك لەنەی دەردەچووو رۆدەچووە نێو گیانو جەستەی ئامادەبووان.

ئومێدێك دەخزایـە دڵیـانو هەڵیـدەگرتنو لەگـەڵ خۆیـدا دەیبردنـە دونیـای نـەمریو هەتا هەتایی.

بەر لەڕووناکبوونی ئاسۆ، ئەسـتێرەکان، بـەدوای یەکدا بێڕاوەسـتان لەئاسمانـەوە سـەراو ژێر بوونەوەو کاتێك بوونە کۆمەڵە ئەستێرەیەك، دیسان نەی کپ بووەوە. خـەجێ دووبـارە

هەستاو لەکانیەکە ئاوی هێناو دایە ئوسو، ئوسو ئاوەکەی خواردەوەو چووەوە کەنار دەریـای تاریـكو ماوەیــەك لــەوێ راوەســتا. دەنگــی شــەپۆلەکان هیچـیان لــەوەی دی نەدەچــوون.. ســەیرێکی ئاسمـانی کـرد، ئاسمـان رۆشـن بـوو، ئەسـتێرەکان بێپسانەوە بـەدوای یەکـدا شـۆڕ دەبوونەوە. گەڕایـەوەو چـوو لەشـوێنی خـۆی دانیشـتەوە. نەیەکـەی هەڵگرتـەوە، ماوەیـەکی درێژ نەوازشی کرد، پاشان بۆلای لێوەکـانی بـرد. بتـەوێت نەتـەوێت دەنگـی ئـەمجارەی نـەی جیاوازو نزمترو یەکنەواخت بوو. ئەو نەوایەی نەی ئاوا بەردەوام بوو ئەمجارە دەنگی نـەی لەگەڵ جارەکانی پێشـتر جیـاواز بـوو. تـرسو دەردو ئـازارو سامی دەخزانـدە دڵـەوە. پاشـان دەنگەکە لەپڕ پەڕو باڵی دەرکـرد، راسـاو تـووڕە بـوو، دڵ بەخـەمو هەراسـان بـوو. بیسـەران خەمگین بوون. پاشانیش بێـدەنگ بـوو. بـاران دەسـتی پێکردبـوو، نم نمـە دەبـاریو بایـەکی گەرمی دەهات، ئاسمان لەدوورە دەستەکان سەری دانەواندبووو خەریکبوو دەڕۆیشت. بیابـان سـەروبنی نـەبوو، تـا چـاو بـڕی دەکـرد هـەر بیابـان بـوو. لەچـیاکانی ئەلـەزیزدا مێگـەلی کارمامزان وەك لێمشتێکی سووریان لێهاتبووو بەرەو لای بیابان شۆڕبووبوونەوە.

هاوکـات لەگـەڵ رووناکبوونـەوەی ئاسـۆ، دەنگەکـە نـزم بـووەوەو لەگـەڵ رەنگـی دەریـا تێکەڵ بووو بـوو بەیـەك دەنـگ. ئەمـە سترانێکی خەمگینانـەبوو، کـە دڵو هـەناوی کـون کون دەکرد. دوو دڵۆپ فرمێسـك لـەقوڵتی چـاوەکانی جـەمیلی پزیشـکی ئـاژەڵان قـەتیس مابوون. پویراز موسا کوڵەگریی لەقوڕگی مابوون، نیگای لەنیگاکانی زەهرا هەڵدەنگووتن. چـاوەکانی زەهـراش فرمێسـك تـەڕی کردبـوون. هـەمووان سـەریان لەبـەرخۆ نـابووەوە، نەیانـدەتوانی سـەیری روخسـاری یەکـدی بکـەن. دەتگـوت لەمەیـدانی جـەنگنو شـەرم لەتەرمە خوێناویەکان دەکەنو ترس دایگرتوون.

ئوسو نەی لـەلێوەکانی کـردەوەو دایـە دەسـت خـەجێ، چـوو لـەلێواری دەریـا راوەسـتا، پاشـان هاتـەوە لەشـوێنی خـۆی لەسـەر چیچکان دانیشـت. نـەی لەخـەجێ وەرگرتـەوەو بەرێزەوە نەوازشی کردو لێوەکانی پێوەنان. ئاوازێکی شـادیی کـۆن، لەگـەڵ گڤـەو ورشـەی شەماڵی بەرەبەیانـدا بـەرەو دەریـا، دوورگـە، ئاسـۆو نـاخی دڵان بـاڵی گـرت. بیسـەران کـە لەبەر ئەوپەڕی خۆشحاڵیەوە نەیاندەتوانی ئـارام بگـرن، چـیوای نـەمابوو لەگـەڵ شـنەبای بەیاندا دەستی یەك بگرنو هەڵپەڕن. وەکو باڵندەکانیان لێهاتبوو.

شوانی کۆكو ئازا بووبووە عاشقێکی دڵسووتاوی کچی ئاغـا. کچـی ئاغـاش بـەدڵێك نـا، بەسەد دڵ عاشقی شوانە بووبوو. هەموو خەڵکی ئاگایان لەو عیشقە بێپەرواو ئـەو دەردە

بێدەرمانە هەبووو دڵیان بۆ بەدبەختی شوانە دەسووتا. ئەم عەشقە عەشقێکی ناکام بوو. ژنان، پیاوان، پیران، ئاوازخوێنان، گشتیان کۆبوونەوەو چوونە کۆشکی ئاغاو باسەکەیان لەگەڵدا هێنایە گۆڕێ. ئاغا گوتی شوانەکەم بۆ بێنن. کەمێك دواتر شوانەکەیان دۆزیەوەو بردیانە لای ئاغا.

شوان هات لەبەرامبەر ئاغا راوەستا. گەنج بوو، بەژنی دەتگوت بلوورە. مرۆڤ لەبینینی تێر نەدەبوو.

ئاغا ماوەیەکی درێژ، بەتاسەوە سەیری لاوەکەی کرد، پاشان لێیپرسی:

"جگە لەشوانەتی هونەرێکی دیکەش دەزانیت؟"

لاوەکە بەدەربڕینێکی دڵنیاوە گوتی: "دەزانم، نەی دەژەنم".

ئاغا پرسی: "ئەمە هونەرە؟"

لاوەکە نەیتوانی وەڵامی پرسیارەکەی ئاغا بداتەوە، هەموو گیانی کەوتە بن ئارەقە.

ئامادەبووان گوتیان، ئاغا، ئەم شوانە بەچەشنێك نەی لێدەدات، کە بولبول دێن لەسەر نەیەکەی هەڵدەنیشن.

"چما ئەمە چیە؟"

"ئەو نەیژەنێکی ئەوتۆیە کە بەرد دێنێتە جۆش".

"مەگەر ئەمە چیە؟"

"ئەو بەچەشنێك نەی دەژەنێت، کە ماری پەپکەخواردوو لەکونەکەیدا دێنێتەدەر، مار دێت لەبەردەم ئەژنۆکانی پەپکە دەکاتو لەوێ دەمێنێتەوەو گوێ لەئاوازەکانی دەگرێت".

"ئەمە، مەگەر چیە؟"

هەموو ئامادەبووان، یەك یەك، بۆ ناساندنی زیاترو باشترین شێوەی نەیژەنی شوانەکە باسو نموونەیان هێنانەوە، بەڵام ئاغا هەمان قسەی پێشووتری خۆی دووپاتە کردەوەو هیچشتێکی دیکەی نەگوت.

ئەوانەی چووبوونە لای ئاغا هەمووان بەتووڕەییەوە هەستانو بەخێرایی بەرەو دەرگا رۆیشتن. شوانەکە بەسەری لارەوە لەهەمان شوێنی خۆی مایەوە.

ئاغا لەتووڕەیی ئەوان ترسا:

"بوەستن، بەڕێزان، خانمەکان، دەمەوێت پێشنیازێکتان بخەمە بەردەم".

ئاوازخوێن گوتی: "چ پێشنیازێك؟"

شێخ پرسی: "چ پێشنیازێك؟"

ئاسنگەر پرسی: "چ پێشنیازێك؟"

هەموو ئەوانەی لەوێ بوون پرسیان: "چ پێشنیازێك؟"

"کەوایە ئەم شوانە نەیژەنێکی ئاوایە!"

"ئەرێ، ئاوایە".

"ئێستا گوێ لەقسەکانم بگرن، ئەو مێگەلەی کە ئەو دەبێتە شوانی، مێگەلە مەڕێکی زۆر گەورەیە".

گوتیان: "گەورەیە".

"پێشنیازەکەم ئەوەیە کە سێ رۆژان خوێ بدەینە ئەو مێگەلەو لێنەگەڕێین ئاو بخواتەوە، پاشان مەڕەکان ببەینە لێوی رووبار، شوانە لەوێ نەی بژەنێتو تەنانەت قەترەیەك ئاو نەگاتە دەمی مەڕەکان".

ئاوازخوێن هاواری لێهەستا: "چۆن سێ رۆژ خوێ دەرخواردی مەڕەکان بدەین؟ ئەمە بێڕەحمیە".

ئاغا گوتی: "سێ رۆژان خوێ، سێ شەوو سێ رۆژ دەبێت خوێ بدەینە مەڕەکان. تەنانەت دلۆپێك ئاو چیە بگاتە دەمی مەڕەکان، هونەری شوانی نەیژەنی ئێوە هونەر نیە".

"تا ئێستا هەر کەسێك عەشقو ئارەزووی عاشقو ئەڤیندارانی کوشتبێت، ئەگەر شاو پادشاش بووبێت، ئاقیبەتی بەخێر نەبووە، کۆشكو تەلارەکانیان بەسەر سەریاندا وێران بووە".

هەمووان بەتووڕەییەوە یەکسەر گوتیان: "بەسەر سەریاندا وێران بووە".

دەنگی نەیەکەی ئوسو لەو بەشەیدا باسی لەبێقەراریو نائومێدیو تووڕەییەوە دەکرد. بەرەو لای دەرگا رۆیشتن.

شوان بەپێوە لەوێ مایەوەو روو لەو کەسانە کە خەریکبوو دەڕۆیشتن، گوتی:

"قبوولێ دەکەم، سێ رۆژ هیچ نیە، ئەگەر بیەوێت دە رۆژانیش خوێ دەدەمە مەڕەکان".

گوتیان، عەشقی ئاگرین، عەقڵی لەدەست داوەو ئەوێیان بەجێهێشت. دەنگی نەی بەتووڕەییەکی تێکەڵ بەئومێدو شادمانی تا دەهات زیاتر بەرز دەبووەوە، بیسەرانیش هاتنە جۆشو خرۆش.

سێ رۆژان خوێیان دەرخواردی مەڕەکان داو چۆڕە ئاوێکیان نەدانێ. دوای سێ رۆژان، لەنیوەڕۆیەکی گەرمدا، مەڕە زۆر تینووەکانیان بردنە سەر رووبار. شوان لەکەنار

**رووبارەکە دانیشتو نەیەکەی هەلگرتو دەستی بەلێدان کرد. مێگەل کە بەخێرایی بۆلای ئاوەکە دەچوو، لەپڕ خێراییەکەی کەم بووەوە، پاشان هات لەسەر لێوی رووبارەکە وەستا. هیچ یەك لەمەڕەکان تەنانەت دەمیشی بۆ ئاو نەبرد.**

**ئوسو لەو بەشەدا دەتگوت بەوشەو ئاوازەکانی لەمەڕەکان دەپاڕێتەوە، بۆ ئەوانی لێدەدا، کاتێك کەمێك دەمیان لەئاوەکە نزیك دەکردەوە، خۆی لێزیز دەکردنو ئاوازێکی لەبارەی پیرۆزی عەشقو دۆستیو هاوڕێیەتی تێهەڵدەکرد. مەڕەکان تا ئەژنۆیان لەنێو ئاو دەبوونو سەریشیان رووەو ئاسمان، لەجێی خۆیان نەدەجوولان، لەپڕ رووداوێکی سەیر روویدا، تاکە مەڕە رەشێکی نێو مێگەلەکە، کە ئەڤینداریی شوانو کچی ئاغای لەنێو لەوەڕگادا بینیبوو، ئارام سەری بۆ ئاوەکە شۆڕکردەوە، لەم ساتەدا دەنگی کەوتە شلەژان، هەولّی دا، تاریك داهات، لەرزی، پاشانیش بۆ مەڕە رەش لەبارەی ئەڤینی ئاگرینو ئەفسوونی دونیاو زیندەوەرو باڵندەو خودی شوانەکەوە ئاوازی ژەند. دەنگی نەی لەناکاو گۆڕا بوو بەئەفسوون. دەنگی ئەفسوونگەری نەی، تەنانەت هەموو بیسەران، مێروولەی سەر زەویو باڵندەی ئاسمانانی ئەفسووناوی کرد. بوونەوەرەکان لەمشكو مارەوە بگرە تا زەردەواڵەو پەپوولەکان، ئەفسوونی دەنگەکە بوونو کپو بێدەنگ لەشوێنی خۆیان راوەستان.**

**دەمی مەڕە رەش کە بۆلای ئاوەکە داهاتبووەوەو هەر تەنها بەئەندازەی سێ پەنجە لەئاوەکەوە دووربوو، ئاوا مایەوە، نەدەیتوانی سەری نە بۆ خوارەوە بباتو نە بۆ سەرەوە. شوان زەندەقی چووبوو، ئەگەر دەمی مەڕەکە بگاتە ئاو؟ دەنگی نەی گۆڕا بۆ ترسو ئێشو ئازارو پاڕانەوەو ئومێد. مەڕە رەش هیچ تەکانێکی نەدایە خۆی. دەنگی نەی، دەنگی لافاوی دەردو نائومێدیو شێتبوون بوو. مەڕە رەش بۆ ساتێك تەکانێکی دایە خۆیو سەیری شوانەکەی کرد. لەم ساتەدا دەنگی نەی گۆڕا بۆ دەنگێکی شادمانو پڕ لەجۆشو خرۆش، کە بۆی هەبوو مرۆڤ لەخۆشیان بخاتە باڵەفڕێ. مەڕە رەش سەری خۆی ئارام بەرزکردەوەو بۆ دواوە گەڕایەوەو لەئاوەکە هاتەدەر. مێگەلەکەش کەوتە دوایەوە. دەنگی نەی خێراترو بەرزتر بووەوەو دڵی هەمووانی نوقمی نێو شادی کرد. هەتاو لەژێر هەوران هاتەدەر، دونیا لەشەپۆلی رووناکیو شادمانیدا هاتە لەرزە.**

**ئوسو نەیەکەی دایەوە خەجێو هەستاو چووە لێوار. تیشکی خۆر لەدوندی چیاکەی ئەوبەری دا. چیا وەکو دەریا نوقمی نێو رۆشنایی شەپۆلاوی بوو. ماسیەکان**

بەسێبەرەکانیانەوە، کە بەسەر وردە بەردەکاندا دەخشی وەك ئەوەی بفڕن بەرەو چاوگی ڕۆشناییەکە دەخزین.

ئوسو، کەمێك دواتر، هاتەوە لای خەجێو داهاتەوەو نەیەکەی لێوەرگرتەوەو سێ جار لەمسەر تا ئەوسەر دەستی پێداهێناو بەعیشقەوە نەوازشی کردو لەتەك پویراز دانیشت. هەمووان کپو بێدەنگ سەریان دانەواندبوو، بەچەشنێك دەتگوت هەناسەش نادەن.

ئەو ڕەوشە تا ئەودەمەی تیشکی خۆرەکە لێیدا، هەر بەردەوام بوو. ئینجا یەکەمجار نیشانچی هەستاو لەکاتێکدا سەری نابووەوە نێو شانەکانیو سیمای ڕوونو گەشاوەو هەستێکی بەختەوەرانەی هەبوو، بەرەو ماڵەوەی کەوتەڕێ. بەدوای ئەودا موسا کازم ئاغا، مەلەك خانم، هوسمەنو ئینجا هەمووان یەك دوای یەك بڵاوەیان لێکرد. لەژێر چنارەکاندا تەنها لێنا، زەهرا، شێخ مووسو ژنەکەی، ئوسوو خەجێو پزیشکی ئاژەڵانو پویراز مانەوە. زەهرا سەری بەرزکردەوەو چاوی بڕیە نێو چاوی پویرازەوە، هەموو گیانی پویراز وەك ئەوەی بروسکە لێیبدات، کەوتە لەرزین. دەستەپاچە بوو، نەیتوانی جگە لەزەهرا تەماشای هیچ لایەکی دیکە بکات. کاتێك شێخ مووسی لەبەرامبەر خۆیدا بینی گوتی: "هۆی منداڵینە، خۆ لەبیرمان چوو دارتەون بۆ شەریفە خانم دابەستین، وانیە؟ ئەگەر دار تەونەکەی بۆ هەڵنەبەستین، حاڵمان بێحاڵ دەبێت".

"شەریفەش چاوەڕێی ئێوەیە".

هەموویان پێکەوە هەستان.

پویراز گوتی: "ڤاسیلی، چەکوشو تەمشووو مشارو بزمارو ئەو شتانە لەکوێ دەست دەکەوێت؟"

"ئێمە لەماڵەوە هەموو ئەو شتانەمان هەن، لەنێو سەندوق".

"بیانهێنە".

زەهرا، کە ئەوان ڕۆیشتن، بەدوودڵیەوە لەهەمان ئەو شوێنە مایەوە کە لێیبوو، پویراز بەدەنگێك کە دەلەرزی گوتی: "زەهرا خانم تۆش وەرە. تۆش دارتەونت هەیە، بەڵکو بتوانن پێکەوە لەگەڵ شەریفە خانم کاربکەن".

زەهرا بەشەرمێکەوە، لێوبەبزە ڕەگەڵ ئەوان کەوت.

گەیشتنە ماڵی شێخ مووس. ڤاسیلیو شێخ مووس دارەبەستی تەونیان هێناو دایاننایە بەردەم پویراز.

"لەکوێی دابمەزرێنین شەریفە خانم؟"

شەریفە خانم دار بناوەکەی نێو باخچەی نیشان دان:

"ئەوێ، لەژێر ئەو درەختە، تا زستان دادێت لەوێ کاردەکەین کە گەڵای درەختەکە هەڵوەران، دەگوازینە ژوورێ".

دارتەونەکەیان هێناو دایاننا ژێر درەختەکەو کەلوپەلەکەیان دانایە ئەو ناوە، لەنێو کەلوپەلەکان دوو تیرەکی پڕ نەخش‌و نیگارو بەشەکانی دیکەی کلیم دەرکەوتن.

"لەئوزون یایلای ئێمەدا هەموو ماڵێك لەو دارتەونە نەخشدارانەی هەیە".

دەنگی خەمگینانە بوو.

"ئـااااه، کاکـە پـویراز، بـرا ئێمـە تـا توانیمـان ئـەم دارتەونـە بگەیەنینـە ئێـرە، زۆر سەختیمان کێشا. لەسەر ئەم دارتەونە شێخ مووس خەریکبوو گیانی لەدەست بدات. کە ئەسپەکەمان لەڕێگا تەلەف بوو، شێخ مووس دارتەونەکەی خستە سەر کۆڵی. خەریکبوو لەبن ئەم هەموو بارە گرانە بمرێت. پاشان وڵاغێکمان کڕی‌و شێخ مووس دەربازی بوو".

پـویراز سـەیری زەهـرای کـرد، چـاوەکانی زەهـرا فرمێسکیان تێزابوو. پـویراز گـوتی: "زەهرا خانمیش، ئەویش دارتەنەکەی، وەکو تۆ..".

"وای کچەکەم وای، وای کچە جوانەکەم! تۆش بەکۆڵت..؟"

"نە، شەریفە خانم نە، زەهرا لـەدوور دوورەوە، لەدوورگـەی کرێتـی یۆنانـەوە هـاتووە، ئەوان دوورخراونەتەوە".

"ئەمانەش لەدەست رووسەکان هەڵاتوون؟ وای کچەکەم وای، وای کچـە جوانەکـەم وای! باشـتکرد دارتەونەکـەت هێنـا. کلیمچـنێك تەنانـەت ئەگـەر بشچـێتە بەهەشـت دەبێـت دارتەونی خۆی لەگەڵ خۆی ببات".

گۆناکانی زەهرا سوور سوور هەڵگەڕان، شـەریفە چـوو گرتیـە باوەشـیەوە. "چـەندەش جـوانی کچـە دوورخراوەکـەی خـۆم. وای کچـەکەم وای! لـەو رێگـا درێـژە چۆن توانیـت دارتەونەکەت هەڵبگریت‌و بەکۆڵت بیگەیەنیە ئێرە؟"

کاتێك زەهرا ویستی قسە بکات. شەریفەخانم دەسـتی گـرت‌و بـۆلای دەرگـای بـرد، کـە سێ پلیکانەی هەبوو، پێیگوت: "بالێرە دابنیشین کچەکەم".

دانیشتن.

روویکـردە پیاوەکـان‌و گـوتی: "ئێـوە دارتەونەکـە هەڵبەسـتن. لەشاری ئێمـە هەمیشـە گەنجەکان دارتەونیان هەڵدەبەست، تێگەیشتن؟"

"تێگەیشتین خانم، تێگەیشتین".

ڤاسیلی دەستی بەهەڵکەندنی قۆڵتی ستووندەکان کردبوو.

زەهرا بەهێمنی بۆ شەریفە خانمی باس دەکرد، کە چۆن هاتوونەتە ئێرە. چۆن سواری کەشتییێکی بچووك بوونو ئەو کەشتیە بچووکە شتێکی چۆنە. شەریفەخانم گوێی لەهەر شتێکی تازە دەبوو هەزار پرسیاری لەبارەوە دەکرد، زەهراش بێئەوەی هەست بەماندووبوون بکات، وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دەدایەوە.

دار تەونەکە دامەزرێندرا، ئەوانیدی تەنانەت نەشیاندی. شێخ مووس بانگی ژنەکەی کرد، پویراز داهاتەوەو شتێکی چرپاندە گوێی: "وس! ئەوانە چوونەتە نێو دەریای باسو خواسەکانیان، با ئێمە بەبێدەنگی هەستینو ئێرە جێبێڵین".

شەریفە خانم نە دامەزراندنی دارتەونەکەی بینیو نەڕۆیشتنی ئەوان. شەریفە خانم دەیپرسیو زەهرا رووداوەکەی موو بەموو بۆ باس دەکرد. کاتێك باسی مەرگی دایکی زەهرا هاتەگۆڕێ، شەریفە خانم دەستی بەگریان کرد، زەهراش گریا. کە زەهرا ماندوو بوو ئەمجارە شەریفەخانم دەستی پێکرد. کە ئەو ماندوو بوو زەهرا دەستی پێکردەوە. خواردنو خواردنەوەیان لەبیر کردبوو.

شەریفە خانم بێپسانەوە دەیگوت: "وای، کچە جوانکیلەکەم وای!" زەهراش قسەی دەکرد: "خوا هەرچی خراپە هەیە بەنیسبی دوژمنانت بکات".

"من لەوەتەی بەبیرمە ئەم پیاوانە هەر خەریکن دەجەنگنو دەکوژنو دەکوژرێن، گوندو شارو شارۆچکەو کێوو دۆڵەکان دەسووتێنن. زارۆی بەرمەمکانو منداڵان دەسووتێنن، خەڵکی لەسەر خاكو ئاوو زێدی خۆی هەڵدەقەننو دەربەدەرو ئاوارەی دەکەن".

زەهرا گوتی: "ئێمە بەزوویی دەگەڕێینەوە شارەکەمان، باولەکانمان نەکردوونەتەوە. ئەسپەکانی باوکیشمان لەکێڵگەو لەوەرگادا چاوەڕێی ئێمەن. کێڵگەدارەکانی دراوسێمان ئاگایان لەئەسپەکانمان دەبێت".

"بەڵام گوندەکەی ئێمەیان سووتاند، سووتاندیان، کچە جوانەکەی خۆم. داریان بەسەر بەردیەوە نەهێشت، کچە شۆخەکەم، بەڵام ئێمە دەگەڕێینەوە گوندەکەمان. من کلیمو گۆرەوی دەچنم، پارەی رێگا خڕ دەکەمەوەو ساڵی داهاتوو دەگەڕێمەوە گوندەکەمان".

لەلای خوارەوە مەلەك خانم خەریکبوو بۆلای ئەوان دەهات، هەستان. شەریفە خانم گوتی: "فەرموو مەلەك خانم".

مەلەك خانم یەکسەر بۆلای دارتەونەکە چوو. گوتی: "چەند جوانە ئەم دارتەونەی خوشکم شەریفە. لەقازداغی هەزار کانیی ئێمەشدا دارتەونیان دروست دەکرد، بەلاّم ئەوەی تۆ شتێکی جیاوازە، مرۆڤ لەبینینی تێر نابێت، ستووندەکەکانیشی نەخش‌و نیگارێکی جوانیان هەیە. گوڵیان لەسەر چێکراوە".

لەسەندوقێکی کراوەدا هەپکێکیان دەست دایێ‌و تاقیانکردەوە. لەسەر هەردوو لای هەپکە ئاسنینەکەدا گوڵ‌و باڵندەیان نەخشاندبوون.

مەلەك خانم گوتی: "چەندە جوانە، کێشەکەیشی گونجاوە، دەستی مرۆڤ ماندوو ناکات. بەم هەپکە مرۆڤ دەتوانێت تا حەزی لێبێت کلیم سفتتر‌و کشتتر دروست بکات".

"خۆم بەسەر سەری کابرای ئاسنگەر راوەستام‌و پێمگوت بەمچەشنە دروستی بکات".

چەند جار بەدەوری دارتەونەکەدا سووڕانەوە، یەك بەیەك سەیری نەخش‌و نیگارەکانی سەر ستووندەکەکانیان کرد.

"ڕووناس بەکاردێنن؟"

شەریفە خانم گوتی: "ڕووناس!".

"لەم دوورگەیە لەکوێ ڕووناس دەست دەکەوێت؟"

"هەرچەندی پەیدا بکرێت باشە".

"من هەرچەندی بتەوێت بۆتی پەیدا دەکەم. هەر خۆم زۆربەی ڕەنگەکانیشت بۆ دروست دەکەم".

"مەمنوونم مەلەك خانم".

هەر ئاوا بەدەم ئاخاوتنەوە هاتنە ژێر دارچنارەکان. سیمای شەریفە خانم وەکو یەکەم ڕۆژی هاتنی بۆ دوورگە تەڵخ‌و گیراو نەبوو، شادو خۆشحاڵ بوو. هەمووان لەوێ بوون. لەبارەی جەنگ‌و ئاوارەییەوە قسەیان دەکرد. موسا کازم ئاغا سەبارەت بەکرێت، ئەسپەکانی، ڕۆژە خۆشەکانی، کۆچ پێکردنیان‌و هاتنیان بۆ ئێرە بەکەشتییێکی بچووك‌و داڕزاوەوە قسەی بۆ دەکردن. دەیگوت: "لەگەڕانەوە دەمەوێت بەکەشتییێکی نوێ، گەورە، ڕاحەت‌و کابینەدار بڕۆمەوە. ئەگەر یەکسەر کەشتییێکی ئاوا دەست نەکەوت مانگێك، دوو مانگ سەبر دەگرین. ڕادەوەستین تا کەشتییێکی باشمان دەست دەکەوێت".

موسا کازم ئاغا بێدەنگ دەبوو، نیشانچی دەستی پێدەکردو باسی لەماسیەکانی دەریای سوورو نەبەردەکانی یەمەن دەکرد، کە ئەو بێدەنگ دەبوو شێخ مووس

لێیوەردەگرتـەوەو ئـەو تـەواو دەبـوو پـویراز دەسـتی پێـدەکرد، ئینجـا هوسمـەن‌و لەگـەڵ بێدەنگبوونی ئەوان ئەمجارە جەمیلی پزیشکی ئـاژەڵان سـەرەداوی قسـەکانی وەردەگـرت‌و دوای ئەویش ئوسوو مەلەك خانم باسەکەیان تا دەهات گەرمتر دەکرد.

لەپڕ ئوسو نەیەکەی دەرهێناو دەستیکرد بـەژەنینی ئـاوازێکی زۆر پڕسـۆزی ئاشـقانە، دوای ئـەم ئـاوازە، ئـاوازێکی دیکەشـی تێهـەڵکرد. هـەمووان هەناسـەیان لەبـەرخۆ بـڕی‌و گوێیان بۆ ئاوازی نەی شل کرد.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "لەشـاری وان کەسـانێکی زۆری نەیـژەنی شـارەزا هـەبوون. هەم لەئێمە، هەم لەئەرمەنیـەکان‌و هـەم سـریانیەکان، بـەڵام مـن نەیـژەنی وەك تـۆم نەبینیوەو نەبیستوومە".

پـویراز کـە فرمێسـك لەچـاوانیدا قـەتیس مـابوون، گـوتی: "منـیش لـەلای خۆمـان، لەچیاکانی بین بوغا نەیژەنی وەك تۆ شارەزاو وەستام نەبینیوە".

مەلەك خانم گوتی: "منیش نەمبینیوە ئوسو، منیش لەقازداغی هەزار کانیی خۆماندا نەمبینیوە نەیژەنێك وەك تۆ نەی بژەنێت".

ئوسو تەریق بووەوەو لەشەرمان خڕبووەوە ناوخۆی. بێـدەنگییێکی قـووڵ بـاڵی بەسـەر ئەو ناوەدا کێشا. هیچکەس دەنگی لەبەر نەدەهاتەدەر. دەنگی نەی هـەمووانی بـۆ دونیـای جیاجیا بردبوو.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی:

"ئوسو قوربان سترانەکی کورمانجی بێژە".

"کەرەم کە، چ بێژم، بەگێ من؟"

"سترانێ مێران".

پزیشکی ئاژەڵان رووی کردە ئەوان:

"بەزمانی کوردی بەئوسوم گوت، گۆرانی کوردیمان بۆ بڵێ، گۆرانی قارەمانان".

پویراز گوتی: "با بڵێت، هەروەك چۆن گوێمان لەنەیەکەی گرت".

مەلەك خانم گوتی: "هەروەك چۆن گوێمان لەنەیەکەی گرت".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "پێویست ناکات".

ئوسو، بێئەوەی خۆی بگنخێنێت‌و نازبکات، دەستی بردە بناگوێی‌و بەدەنگێکی هێمن‌و لەسەرخۆ دەستی پێکرد. دەنگی لەدەنگی نەیەکەی خۆشتر بوو.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "باسی بیابان دەکات".

هەمووان سەریان هەڵبڕی‌و سەیری پزیشکی ئاژەڵانیان کرد.

ماوەیەکی باشی پێچوو. دەنگ، دەشڵەژا، شاد دەبوو، تووڕە دەبوو، دەتۆرا، نەرم دەبوو، توند دەبوو، درێژ دەبووەوە، کورت دەبووەوە، بۆ ئاسمانان هەڵدەکشا، پاشان ئارام دادەبەزیەوە. پاشان لەپڕدا بەرز دەبووە. جەستەی ئوسوش لەگەڵ دەنگەکەیدا دەجووڵا، حاڵەتی سیمای لەدەنگێك بۆ دەنگێکی دیکە دەگۆڕا.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "بیابان تەواو بوو. ئێستا لەمەیدانی جەنگدا تەرمێکی زۆر کەوتوون. تەرمەکان لەو گۆڕە بەسەر لمی بیابانەکەدا درێژاو درێژ راکشاون. ژمارەیەکی زۆریش مامزی مردوو لەو ناوە کەوتوون. لاشەی مامزەکانیش لەسەر لمەکاندا راکشاون".

ئوسو دادەنیشتە سەر ئەژنۆکانی، لەسەر ئەژنۆدا دەڕۆیشت، دەگەڕایەوە، بەدەست راوەشاندن بۆ چەپ‌و راست دەڕۆیشت، رادەوەستا، لەسەر چیچکان دادەنیشت، ئارەقەی دەکرد، پێستی نێو چاوانی وێکدەهاتەوە، رەگی ملی رەپ رادەوەستان، پاشان دەنگەکەی وەك سێلاوێکی راساو کە هێدی هێدی دابمرکێتەوە، وردە وردە دادەبەزی‌و نزم دەبووەوە. رێك لەم کاتەدا دەستی دەدایە نەیەکەی‌و دەنگی نەی لەو ناوەدا دەزرنگایەوە.

پزیشکی ئاژەڵان، لەو دەمەیدا کە ئوسو سەرگەرمی ژەنینی نەی بوو، لەهەر جێگایەکدا دەرفەتی هێنابوا ئەو گۆرانیانەی بۆ روونەدەکردنەوە کە دەیچڕین. شەو بەترێکی گوزەراند بوو، کەس ئەوێی جێنەدەهێلا، ئوسوش بێوچان، لەکاتێکدا کە وروژانەکەی تا دەهات زیادی دەکرد، ئاوازی دەژەنی‌و سترانی دەچڕی، تەنانەت هەموو منداڵانی دوورگەش لەوێ بوون. هیچکامیان نەدەخەوتن، نە لەشوێنی خۆیان دەجووڵان. چاوەکانیان زەق کردبووەوەو لەئوسو رامابوون.

لەو شەوە بەدواوە، دانیشتوانی دوورگە هەموو رۆژێ دوای نانخواردن، یەکسەر لەگەڵ منداڵەکانیان دەهاتنە ژێر دارچنارەکان، ئوسو چۆکی دادەنا، یەکەمجار نەیەکەی لەکیفی دەردەهێناو سترانێکی تێهەڵدەکردو ئاوازێکی دەژەنی، کە تا ئەودەم کەس نەبیستبوو. دوای ئەوەش لاوك‌و داستانی وای دەگوتن کە چەند شەوو چەند هەفتە درێژەیان دەکێشا. پزیشکی ئاژەڵانیش بەشە گرنگەکانی ئەو لاوك‌و داستانانەی شیدەکردنەوەو باشتر روونی دەکردنەوە.

شێخ مووس‌و ڤاسیلی بۆ کڕینی خوری‌و رەنگ چوونە شارۆچکە. مەلەك خانم کاری رەنگرێژی لەڕەگ‌و ریشاڵ‌و تفرو پەلکی درەخت‌و گیاو گوڵەکان گرتە ئەستۆی

خۆی. ئوسو بۆ هەریەك لەژنەكانی دوورگە تەشییێکی دروست کرد. ئوسو وێرای شارەزایی کە لەنەیژەنیدا هەیبوو، تەشیسازێکی زۆر باشیش بوو. لەسەر هەر تەشییێکی ژنەکاندا نەخش‌و نیگارێکی جیای هەڵدەکەند. خوریەکان شۆران، لەسەر چیمەن‌و دەوەنەکاندا پان کرانەوەو وشك کرانەوە. ژنەکان خوریەکانیان لەنێو خۆدا دابەش کردن‌و بەتەشیەکانیان رستیان. لەماوەی چەند هەفتەیەکدا ماڵی شەریفە خانم پڕبوو لەکلافەی رستراو.

شەریفە خانم بەیانی زوو چووە لای مەلەك خانم، مەلەك خانم دەستەپاچە بووبووو گوتی: "نەمتوانی دروستی بکەم، لەبیرم چۆتەوە، لێرە بۆ رەنگسازی نە توانیم رەگ‌و ریشاڵ پەیدا بکەم، نە گەڵاو گوڵ".

"خۆت نیگەران مەکە مەلەك خانم، من لەگەڵ خۆمدا گوڵی رەنگسازیشم پەیدا کردووە".

"چیە؟"

"گوڵی رەنگکردن، گیایەکی زەردە، قەدی بڵندە، ریشاڵ ریشاڵە وەکو کلکی ئەسپ. ئێمە یەکەمجار داوەکە بەو گوڵە رەنگ دەکەین. بەنەکان زەرد زەرد دەبن. دوای ئەوەی داوەبەنەکانمان بەگوڵی رەنگسازی رەنگ کردن، داوە بەنەکان بەرەنگی سەوز، سوور، شین‌و رەنگی دیکە رەنگ دەکەین.

رەنگی داوی ئەو کلیمانەی کە بەگوڵی رەنگسازی رەنگ دەکەین هەرگیز رەنگەکەیان سپی نابێتەوە، ئەگەر هەموو رۆژێکیش هەتاویان لێبدات نەك هەر رەنگەکەیان کاڵ نابێتەوە، بەڵکو رۆژ بەرۆژ گەشترو بریقەدارتر دەبن".

"بەڵکو بتوانین ئەو گیایە لێرەش پەیدا بکەین، دەبێت بۆی بگەڕێین".

"گوڵی رەنگسازی لەوڵاتی ئێمە بترازێت لەهیچ جێگایەکی دی پەیدا نابێت".

"دەبێت سەیرێکی بکەم".

شەریفە خانم چووە ژووریێو گونییێکی پڕی هێنا، زارکی گونیەکەی کردەوە، چەنگێك لەو گیایەی دەرهێناو دایە دەستی مەلەك خانم. گوڵی رەنگسازی لەنێو دەستی مەلەك خانم وەکو ریشاڵی ئاڵتوونی دەبریسکانەوە. مەلەك خانم سەیری گیایەکەی کردو سەیری کرد، پاشان گوتی:

"خۆزگە ئێمەش لەو جۆرە گیایانەمان هەبوایە. رەنگسازی کارێکی زۆر سەختە، چەندین مانگی دەوێت تا بتوانیت دروستی بکەیت".

"زۆر گوڵی ڕەنگسازیم هێناوە. ئەم گونیە بەشی سێ ساڵانم دەکات".

مەلەك خانم بەهاوارکردنێکەوە گوتی:

"قەدریی بەلەموان زووبە وەرە ئێرە!".

مەلەك خانمیش پێیخۆش بوو وەکو هەموو ئەوانیدی بەقەدریی بەلەموان ناوی بێنێت. قەدریی بەلەموان یەکسەر هات:

"فەرموو دایکە!"

"بڕۆ هەندێکی دیکە لەمانە لەپوپیراز وەربگرەو بیانهێنە!"

قەدریی بەلەموان لەچاوترووکانێکدا چووو گەڕایەوەو مەنجەڵێکی لەبەردەم مەلەك خانم دانا، کە هێشتا نەخرابووە سەر ئاگر.

داوە بەنەکانیش دەبێت وەك ڕەنگەکان بجۆشێنین؟"

شەریفە خانم گوتی: "بەڵێ، تەواو وەك ڕەنگڕێژی".

ئاگرێکیان خێرا بەدارە وشکەکانی زەیتوون کردەوە، سێ پایەیان دانایە سەر ئاگرەکە، ئاوەکە وەجۆش هات، داوە بەنەکانیان لەگەڵ چەنگێك گوڵی ڕەنگسازی ڕۆکردە ناو مەنجەڵەکە.

مەلەك خانم گوتی: "دواتریش دەبێت داوە بەنەکان بخەینە ناو ڕەنگەوە، وانیە؟"

"بێگومان دواتریش داوەبەنە زەردەکان لەزەرداوەکە دەردێنینو دەیانخەینە نێو ڕەنگەوە".

دەوروبەری ڕۆژئاوا ئوسو وەکو ڕۆژانی ڕابردوو دەستی کردەوە بەئاواز ژەنین، موسا کازم ئاغاو زەهرا چەند ڕۆژێك بوو بەردەوام لەتەك ئوسو بوون.

هەندێکجار زەهرا کاتێك کە ئوسو نەی دەژەنی، نەیدەتوانی بەر لەئەشکەکانی بگرێت. موسا کازم ئاغاش دادەهاتەوەو لەسەرەخۆ بەگوێیدا دەچرپاندو دەیگوت: "مەگری کچەکەم، زۆر نابات دەگەڕێینەوە وڵاتی خۆمان، ئیدی زۆری نەماوە، مەگری کچەکەم، پێویست بکات دەچینە لای حەزرەتی مستەفا کەمال پاشا، ئەو من دەگەڕێنێتەوە کرێت. دەزانی حەزرەتی پاشا خەڵکی سلانیکە، لەخۆمانە".

هەندێکجار خودی ئەویش نەیدەتوانی بەر بەئەشکەکانی بگرێتو بۆ ئەوەی کەس نەیبینێت سەری دەنایەوە بەرخۆی.

نیشانچی کە لەلای قامیشەڵانەکەوە دەهات، گوتی: "بەلەمێکی ماتۆڕدار بەلایتی ڕۆشنەوە خەریکە دێت"و ڕێگای ئەسکەلەی گرتەبەر.

پـویراز هەسـتاو گـوتی: "ئێـوە لێـرە بـن، مـن دەچـم ئـەو بەلەمـە ببیـنم". چووە لای نیشانچی.

ڤاسیلیش بەدوای ئەودا رۆیشت. مانگ بەئاسمانەوە تەواو خەرمانەی کردبوو.

لەتەنیشت یەکدیەوە راوەسـتانو چاویان بڕیـە بەلەمەکـە، بەلەمەکـە هـاتو دروسـت ئەو دەمەی کە خەریکبوو لەئەسکەلە لەنگەر بگرێـت، کـەمێك لـەولاتر راوەسـتا. لەسـەر سەکۆی بەلەمدا سێ چرای مەلەوانی پێکرابوونو لەبەر رووناکیەکانیاندا بتەوێت یـان نـا سێ کەس بـەدی دەکـران، کـە رەقو راسـت راوەسـتابوون. نیشانچـی گـوتی: "یەکەمەکـەیان ئەوە"و دەمانچەکەی لەبەرپشت هێنایەدەر. پویراز گوتی: "سەبر بگرە نیشانچی!". دەستی دانایە سەر دەمانچەکە "سەبر بگرە!".

نیشانچی کاتێك دەمانچەکەی دەخستەوە بەرپشتی، دەستەکانی دەلەرزین. "ئەوەی کـە لەپێش هـەموویان راوەسـتاوە خۆیـەتی. ئـەوەی کـە لەدەسـتمان دا. قـەدو بـاڵاو چـەکمەو دەسـتەکانی سـەر دەمانچـەو شـێوەی راوەسـتانی بێجووڵـەو ئـەو پیـاوە کورتـە باڵایـەی تەنیشتی نیشان دەدا کە خۆیەتی".

پویراز گوتی: "جارێ سەبرتان هەبێت. سەبرتان هەبێت".

ئـەو دەمـەی کـە دەسـتی نیشانچـی بـۆلای دەمانچـەکەی دەچـوون هـەر سـێ چـرای بەلەمەکە پێکەوە کوژانەوە. بەرلەوەی کـە چـراکان خـامۆش بـبن تەنانـەت سێبەری دوو لەسـێ کەسـەکان دیارنـەمان. سێبەری ئـەو پیـاوەی کـە لـەوانی دی لەپێشـتر راوەسـتابوو، بەهەمان شێوە بەپێوە راستو راست دیاربوو.

پویراز بەهاوڕێکانی گوت: "ئێوەش خۆ بدەنە لاوە".

ڤاسیلیو نیشانچی بەرێگای لێوارەوە بایاندایەوە نێو قامیشەڵانەکە.

پویرازو ئەو پیاوە کەوتنە بەرامبەر یەکدی.

لەپڕ دەنگی ئاوازو سترانەکانی ئوسو لـەژێر دارچـنارەکان بـەرزبووەوە. دەنگەکـە ئـەو نـاوەی گرتبـووە خـۆیو دەگەیشـتە ئاسمـانو ئـەودیوی دەریاکـانیش. زەهـرا چاوە شـینە خـەمبارەکانی بڕیبوونـە پـویراز، کـە رێـك لەبەرامبەریـەوە راوەسـتابوو. پـویراز دەسـتی خۆی دانابووە سەر دەمانچەکەیو تا هێزی تێدابوو دەسکی دەمانچـەکەی فشار دەدا. ئـەو هەر لەگەڵ ئەوەی دەستی لەسەر دەمانچە هەڵدەگرت زەهرا دوور دەکەوتەوە، کە دووبارە دەستی دادەنایەوە سەر دەمانچە، زەهرا یەکسەر دەگەڕایەوە شوێنی خۆی.

دەنگی ئوسو وازی لێنەدەهێناو لەگەڵ شنەبای بەیانیدا بۆ ئەملاو ئەولای رادەهەژاند. سێبەری کابرای بەرامبەری هەندێکجار دەردەکەوت و هەندێکجاریش بزر دەبووو لەهەردوو حاڵەتیشدا دەستە بەتەرۆکدا شۆڕبووەکانی تەکانیان نەدەخوارد.

زەهرا لەنێو تاریکیدا تەواو شین دەینواند، بەردەوام دەدرەوشایەوەو خامۆش دەبووو هەموو جارێکیش پویراز دەلەرزی. دەنگی ئاوازی ئوسوو خشەخشی گەڵای درەختەکان دەیانهێنایە لەرزین.

لەقەد پاڵی چیای ئاگری پشتی بەقاپۆری درەختێکەوە دابوو. ئەو دەرختە سێ جاران هاتە سەر بەلەمەکە، رووبەڕووی ئەو پیاوە راوەستاو پاشان وەکو تۆپێکی رەش بەهاشەو خرمژنەوە  دوورکەوتەوە. تاو نا تاوێك رەنگی ئوسوش دەگۆڕا بۆ ئەو هاشەو خرمژنە. برادەرەکانی کابرای ناو بەلەمەکە هاتن‌و دیسان رۆیشتن. تارماییەکان ماوەیەك ئاوا هاتن‌و رۆیشتن. دواییـنجار کە هاتن هەموو چراکان بەیەکجاری داگیرسان. سێ پیاو بەرامبەر بەو راوەستابوون. لەگەڵ داگیرسانی چراکان، ڤاسیلی‌و نیشانچیش هاتن لەڕۆخ ئەوەوە راوەستان. نیشانچی جارێکی دیکە دەستی بۆ دەمانچەکەی برد. ڤاسیلی ئەمجارەش دەستی خۆی دانایە سەر دەستی ئەو.

لەمساتەدا ئەو پیاوەی کە رەق‌و راست راوەستابوو، جووڵا. پشتی لەئەوان کردو دیار نەما. ماتۆڕەکە کەوتەکارو بەلەم دوورکەوتەوەو سێبەری دیار نەما. ئەوانیش کەمێك دواتر گەڕانەوە ژێر دارچنارەکان‌و لەشوێنی خۆیان دانیشتنەوە. ئوسو هەر لەگەڵ هاتنی ئەوان دەستی کردەوە بەنەیژەنی. کە نەیژەنی تەواو بوو، دەنگی مەقامەکانی بەرزو هێمنانە لەو شەوەدا زرنگانەوە. نیشانچی چەند جارێك هەستاو چووە ئەسکەلە. هیچ شوێنەوارێك لەرۆشنایی‌و تارماییەکە لەسەر رووی دەریا نەمابوو.

کاتێك خۆرهەڵات دەنگی ئوسو لەئاسمانەکان دەزرنگایەوە. کە خۆر بەتەواوی هەڵات، نەیە پڕ نەخش‌و نیگارەکەی ناو دەستی ئوسو بریقایەوە. دەنگی نەیش بریقایەوەو گۆڕا بۆ شادی‌و پاشان بەشادیش کۆتایی هات.

پزیشکی ئاژەڵان، هەر ستران‌و لاوکێك کە ئوسو دەیچڕی، بەپچڕپچڕی تا ئەو رادەیەی دەیتوانی بۆ بیسەرانی شیدەکردەوەو وەریدەگێڕا.

جەنگ لەبیابانەکە لەنێوان دوو رووباردا چەندین رۆژ لەسەریەك درێژەی هەبوو. دەنگو زرمەی تۆپ‌و رەشاش‌و حیلەی ئەسپ‌و هات‌و هاواری سەربازەکان ئاسمانی بیابانەکەی پڕ کردبووو شەو رۆژی لێکگرێدابوو، سەربازانی لەشکری شکاو خەریکبوون

بەرەو لای باشوور، بۆ ئەوسەری بیابانەکە یەکڕاست بەرەو لای دەریای سپی هەڵدەهاتن. گوللەی تۆپ بەسەر سەری سەربازەکانداو زیاتر بەسەر سەرو لەنێو دەستەی سەربازەکاندا دەتەقینەوەو هاوکات پارچەو تیکەی دەستو جەستەی سەربازەکان، لەگەڵ لمو چەوی بیابانەکە بۆ ئاسمان بەرز دەبوونەوەو بەملاو ئەولادا دەکەوتنەوە، بەهۆی ئەو لمەی کە لەبیابانەکە بەرز دەبووەوەو بۆ ئەملاو ئەولا پەرش دەبوو، چاو چاوی نەدەبینی. لەلایەك دەنگی تێکهەڵچوونو پێککەوتنی سەرەنێزە تێکئالاوەکانی فەوجو دەستەو گرووپی سەربازانو دەنگی ئەللاهو ئەکبەر، کە لەسەرتاسەری بیابان دەزرنگایەوە لەلایەکی دیکە، زرمەو قرمژنی ئەو گوللانەی کە تاریکایی شەویان شەق دەکرد، ئەو ناوەیان گرتبووە خۆی.

دەیان هەزار سەربازی ماندووو شەکەت، لەلێواری رووبارەکان مابوونەوەو سوارانی شمشێر بەدەستی دوژمن، کە بەدوایانەوە بوون، کە دەگەیشتینە سەریان سەربازە بریندارو شەکەتەکانو تەرمەکانیان فڕێ دەدانە نێو ئاوەکەو تەرمەکان نوقم دەبوونو دیسان دەکەوتنەوە سەر ئاو. سەرئاوەکە لەو سەربازانەی کە هاواریان دەکردو داوای یارمەتیان دەکرد، رەش دەچووەوەو ئەوانەی لەهەوزینگداندا بوون یەکسەر دەمردنو سەربازە نیوەگیانەکان بەپەلەقاژەو هەوڵی خۆ دەربازکردن لەگەڵ تەرمی مردووەکاندا بەسەر ئاوەکەدا سەرەو ژێر دەبوون، دەیانکێشا بەزنارەکانداو لەلێواری رووباردا گیانیان دەسپارد. لەماوەی چەند رۆژێکیشدا بەشێوەیەك کە بەرگەی نەدەگیرا، بۆنیان دەگرت. هیچ تینووێك تەنانەت ئەگەر لەتینووان بشمردبا، لەبەر بۆنی تەرمە لەسەریەك کەڵەکەبووەکانی لێواری رووباری گەورەی دیجلە، لەئاوەکە نزیك نەدەکەوتەوە.

ئەو سوارانەی کە بەدوای سەربازە سوار ئەسپە لغاجە کەفاویو ماندووەکان دەکەوتن، کە دەگەیشتنە لێواری هەڵدێرگەو ئاوبڕی رووبارەکە نەیانـدەتوانی جڵەوی ئەسپەکانی خۆیان رابکێشنو رایانبگرن، لەگەڵ سەربازەکان دەوکەوتنە نێو ئاوەکە.

زرمەی تۆپانیش راوەستانی نەبوو، گوللە تۆپەکان لەناو رووبارەکە دەتەقینەوەو قاچو جەستەو ئەسپە لەتو پەت بووەکانیان لەگەڵ ئاودا بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوەو پەرشو بڵاو دەبوونو سەربازەکان کە بێبەزەییانە جەنگابوون، لەنێو ئاوەکە لەترسی گیانیان ئاوقای یەکدی دەبوون.

لەگۆشەیەکی مەیدانی شەڕدا، لەنێوەڕاستی دەشتەکە، ژمارەیەك لەسەربازانی هەردوولای دوژمن، لەباوەشی یەکدیدا مردبوون، هەندێکیان لەگیانداندا بوون، بەشێکیان

برینــدارو دەیانناڵانــدو هەندێکیشــیان لــەنێو لەکــە درێــژاو درێــژ راکشــابوونو چــاویان بڕیبووە ئاسمانو دواهەنسکیان دەداو یەك دوای یەك گیانیان دەسپارد...

هــەروەها ســەربازانی خێــراو شمشــێرەتیژ بەدەســتەکانو ســەربازانی برینــدارو لەســەرەمەرگداو زرمــە زرمــی گوللــە تــۆپو لاشــەی ئەســپ، تــەرمی ســەربازەکانو لاشــەی هێسترو وشترەکان ئەو دەشتەیان داپۆشیبوو، لەلایەکی دیکــەش هــەڵۆو داڵو سیسارکەکان لەچیا دوورەکانەوە هاتبوونو لەئاسمانی ئەو ناوەدا دەخولانەوە.

داڵەکان، لەئاسماندا باڵەکانیان لێکدەخشا، لەگەڵ ڕێڕەوی ئاوو تەرمی ئەو مردووانــەی بەســەر ئــاوەوە بــوون، بــەرەو لای خــوارەوە ســەرەوژێر دەبوونــەوەو جارجــاریش لەســەر تەرمەکانی لێواری رووبارەکە دەنیشتنەوە.

جەنگ لەبیابان هەر درێــژەی هــەبوو، هــەوای گــەرمی بیابــان هــەمووانی دەسووتاندو مەیــدانی جــەنگ پــڕ بووبــوو لــەبۆنی گــەنیوی تــەرمی مــردووان، بیابــان لەبــەر قرمــژنی شــێلکەی تفــەنگو زرمــەی تــۆپو هــاتو هــاوارو ژاوەژاوی ســەربازان بووبــووە مەیــدانی مەحشەر. رووناکیەك لەخیزو لمی کەنارەکاندا بەرزدەبووەوە، کــە ئــاوی لەچاوان دەهێنــا، رووناکیەکی چڕ دونیای دادەپۆشی.

ئاسمان تا چاو بڕبکات هەر سپی بوو.

دەنگو هەراو زەنای جەنگ وەك گــەردەلوولێك، کــە لەگــەڵ تۆفــانی بیابــان هــەڵبکات، لەهــەموو لایەکــەوە دەهاتــەپێش. رەوە مامزێــك بــەخێرایی وەك ســێڵاوێکی پــانو پــۆڕی ســووربۆو لەســەر دونــدی چیاکانەوە یەکڕاســت بــەرەو بیابــان ســەرەوژێر بوونــەوە. هــەر لەگەڵ ئەوەی گەیشتنە بیابان، لەدەنگەکان رەوینــەوە، تێکئــاڵان، پــەرتو پەڕاگەنــدەبوون، ســواری ســەر ملــی یەکــدی بــوون، پاشــان هاتنــەوە ســەر حاڵــەتی ئاســاییو ڕێگــای خۆیــان گرتەوەبەر. کاتێك گەیشتنە ناو سەنگەری ئــەو ســەربازانەی کــە بێڕەحمانــە لەگــەڵ یــەك دەجــەنگان، دیســان بڵاوبوونــەوەو دوای ئــەوەی لەســەنگەرەکان رەت بــوون، دووبــارە خڕبوونــەوە، بــەڵام پاشــان کەوتنــەوە نــاو مەیــدانی جەنگــەوە. گوللــە تــۆپو فیشــەکی تفەنگەکان وەکو بارانی بەهار بەسەریاندا بارین. مامزەکان کە ڕێگایــان ون کردبــوو، وردە وردە لەترسی گیانیان خێراییان زیاد کرد. هەڵدەبەزینەوە، بەشێوەیەك وەك بڵێیت هێڵی کەوانەیی لەهەودا دروست بکەن، بەقاچی وێکهاتووەوەیان لەسەرەوە خۆیــان فــڕێ دەدایــە ســەر عــەردو هــەر دەگەیشــتنە ســەر عــەرد دووبــارە هەڵدەبەزینــەوەو هێڵــی کەوانــەییان

لەهەوادا دروست دەکرد. ئەوانەی پێکرابوون، بەچاوانی درشتی رەشو خەمباریانەوە، وەکو منداڵانی مردوو، کپو بێجووڵە لەسەر لمو خیزی بیاباندا راکشابوون.

رەوەی مامزان کە لەترسان هەترەشیان چووبوو، بەرەو لای راست پێچیان دەخوارد، ژمارەیەکیان هەر لەوێدا دەکەوتنو سەرانگریّ دەبوونو دەمردن. ئەوانیدی، یەکەمجار پەرشو بڵاو دەبوون، خڕدەبوونەوەو بەرەو لای چەپ پێچیان دەخواردەوە، لەویّ دووبارە بۆلای راست وەردەسووڕان، ژمارەیەکیان هەر لەویّ دەکەوتنو پاشان بۆلای چەپ پێچیان دەخوارد.

تادەهات ژمارەیان کەم دەبووەوە، تەواو دەبوون، وەکو چیا سوورەکان هەڵدەکشانو دادەبەزین، دەگەڕانەوە مەیدانی جەنگ، تا دەهات ژمارەیەکی زۆرتریان سەرانگریّ دەبوونو دەکەوتن، سەر خیزو لمەکان سوور هەڵدەگەڕا. مامزە زیندووەکان نەیاندەتوانی رێگایەك، تەنانەت کونێك بۆ خۆدەربازکردن لەمەیدانی جەنگ پەیدا بکەن، ماندووو شەکەتو نیوە گیان، لەکاتێکدا هێڵی کەوانەیی بچووکیان لەهەوادا چێدەکرد، بەردەوام لەڕێڕەوێکی بازنەییدا دەخولانەوەو سەراسیمە بۆ ئەملاو ئەولا دەهاتنو دەچوون.

شەڕیش تا دەهات گەرمتر دەبوو، مامزەکان کە نیوەیان لەنێو چووبوون، ئیدی توانای دروستکردنی هێڵی کەوانەییان نەمابوو، زگی سپیان بەدی نەدەکرا، لەلەز کەوتبوونو نەیاندتوانی بەخێراییو تەڕدەستی هەڵبەزنەوە و بۆلای چەپو راست پێچ بخۆنو شەپۆل بدەن. لەسەنگەرەکان هەڵدەنگوتن، نیوەیان دەکەوتنو ئەوانەی دەمان دەکشانەوە. هیچی نەمابوو ئەو حەمکە مامزە تەسلیمی مەرگ ببن.

مامزەکان کە لەویّ، لەنێو مەیدانی شەڕدا وەستابوون، لەپڕ گوردێکیان دایەخۆ و گیانیان هاتەوە بەر، وەکو شەپۆلی سووربا و بەرەو لای راستو چەپ پێچیان خوارد، چوونە پێشو گەڕانەوە دواوە، هەڵبەزینەوە، سپێتی ژێر سکیان دەرکەوت، دەستیان بەوێنەکێشانی هێڵی کەوانەیی کرد، بڕەبڕە لە ژمارەیان کەم دەبووەوە، کەوتبوونە ژێر بارانی گوللان، گوللەی تۆپان لەملاو ئەولایاندا دەتەقینەوە، پەراگەندە دەبوون، خڕ دەبوونەوە سەریەك، دەڕەوینەوە، هەڵدەبەزینەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ماندووێتیەیاندا رایاندەکردو رادەقەنانو دەکەوتنە ئەو گۆڕە.

مامزەکان وردە وردە دەڕەوینەوە، دەشڵەژان، بۆ هەرلایەك دەچوونو لەهەر جێگایەك رادەوەستان بارانی گوللەیان بەسەر دادەباری، قاچە بریندارو خوێناویەکانی مامزە

برینـدارەکان لەسـەر خیـزو لـی بیابانـدا ماوەیـەکی درێـژ دەلـەرزینو پاشـان وەك ئـەوەی لێکبکێشـینەوەو وێکبێنـەوە، هـەر چوارپەلیان لێکبلاو دەبـووو لەهـەمان جێـدا مـردار دەبوونەوە. مەیدانی جەنگ لەماوەیەکی کەمـدا پڕبـوو لـەمامزی پێکراو. بیابـان سـەراپا خوێناوی بووبوو.

پێدەچوو، مامزەکان ئیـدی لەپـەلوپۆ کـەوتبن، کـە گەڕانـەوە ناوەڕاسـتی مەیدانەکـەو لەجێگایەکدا خڕبوونەوە سەریەكو ماوەیەك ئاوا ماندووو هەناسەبڕاو راوەسـتان، پاشـان سەریان هەڵبڕیو گوێیان مووت کردو بەترسو نیگەرانیەوە سەیری چەپو راستو چیای رۆچووی نێـو تۆپـەڵی رۆشـناییان کـرد. رێـك لـەم سـاتەدا پێکدادانەکـە لـەپڕ راوەسـتاو بێدەنگیەکی قووڵ باڵی بەسەر ئەو ناوەدا کێشا. مامزەکان کە هێشتا وەك خۆیان راوەسـتا بـوون، بەماندووێتیـەوە جـارێکی دیکـە گوێکانیـان مـووت کـرد، سـەیری یەکـدیان کـرد، کـەمێك لێکنـزیکتر بوونـەوە، دواجـار هـەموویان پێکـەوەو بەیـەك جووڵـە دەرپـەڕین، لەکاتێکدا کە هێڵی کەوانەیی سووریان لەهەوادا دەکێشا، بەسـەر سـەربازەکاندا بازیـان داو سەنگەرەکانیان جێهێڵاو لەمەیدانی شەڕەکە دوورکەوتنەوە.

دوایین مامزیش مەیدانی جەنگی بەجێهێشتو لەگەڵ ئەوەی مەیدان لـەمامزان چۆڵ بـوو، دووبـارە بـارانی گـوللان لەهـەموو لایەکـەوە دەسـتی پێکـردەوەو تۆپـەکان زرمـەیان لێهەستایەوە. دوای ماوەیـەکی کـەمیش شـەڕی تێهـەڵنگوتنو تـەن بەتـەن دەسـتی پێکـرد. بیابان لەدەنگی هەزاران سەرباز، کە لەئاسماندا دەزرنگایەوە، دەینالاند.

تـەرمی سـەربازو مامزەکـان لەتـەك یـەكو لـەئامێزی یەکـدی کـەوتبوون. بـازو سیسارکەکان کە لەچیاکانی دوورەوە هـاتبوون، ئاسمـانی مەیـدانی جـەنگیان داپۆشـیبووو چەرخیان دەدا.

تۆپەڵێك نوور لەچاوتروکانێکدا هاتو بەسـەر ئاسمـانی دوورگـەدا تێپـەڕی. هـەمووان لـەژێر دارچـنارەکاندا کۆبووبوونـەوەو چـاوەڕوانی ئوسـو بـوون. ئوسـو زیـاتر ئـەوانی لەچاوەڕوانیدا نەهێشتەوەو نەی لەنێودەست، لەگەڵ خەجێ لەپشت قامیشـەڵانەکە خـۆی گەیانـدە ئـەویو هـات لەسـەر رۆخـی تـەختێکی دەم کانیەکـە دانیشـت. نـەی لەکیفەکـەی دەرهێنا، بەنەوازشەوە لەمسەر تا ئەوسەری دەست پێداهێنا. خەجێ بەشەوقو شـەرمەوە سەیری ئەوی کرد. لەپڕ دەنگێکی تێکـەڵ بەشـادیو خۆشـحاڵی بـەرزبووەوە، دەنگـی نـەی چەند جـار لەگـەڵ شـنەی بـادا بەسـەر دەریـا خولایـەوەو هـاتو رۆچـووە دڵـی بیسـەرانو

ئەوانی بردە دونیای خەیاڵەکانیان، ئەو تۆپەڵە نوورانیە جارێکی دیکەش هاتو بەسەر سەریاندا تێپەڕی. دەنگی نەی بەردەوام بووو ئەوان بەمەستبوونی سەرچاوەگرتوو لەو بەهەشتەی کە لەخەیاڵیاندا هەبوو باڵیان گرتبوو.

هەر لەگەڵ پچڕانی دەنگی نەی، هەریەك لەوان لەو مەستبوونەیان هوشیار بوونەوەو چاوەکانیان کردنەوە. جەمیلی پزیشکی ئاژەڵانیش، کە لەمنداڵیەوە لەگەڵ ئەو دەنگەدا ئاشنابوو، هاتەوە سەرخۆی.

ئوسو دەنگەکەی گۆڕی بۆ شیعر، نەیەکەی دانایە سەر ئەژنۆکانی جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "ئوسو ئێستا دەیەوێت شیعر بخوێنێت. ئەو ئێستا بەئاواز چیڕۆکی فەقێ تەیرانی ژەنی. کەمێك دواتر بەشیعر بۆمان دەخوێنێت. ئوسو داوای لێکردووم بەشە گرنگەکانی چیڕۆکەکەتان بۆ وەربگێڕمە تورکی".

ئوسو دەستی پێکرد، ئوسو لەخۆی گۆڕاو بیسەران خۆیان دایەدەست ئەو خەیاڵەی کە لەئاوازە سیحراویەکەی ئوسو سەرچاوەی گرتبوو، جەمیلی پزیشکی ئاژەڵان کۆنتڕۆڵی خۆی لەدەست دابوو.

ئوسو ئەو شەوە تا بەیانی دا ئاوازی گۆڕی بۆ شیعرو شیعری گۆڕی بۆ ئاوازو چیڕۆکی فەقێ تەیرانی خوێندەوە. ئوسو رۆژی سێیەم و چوارەمیش لەکاتێکدا وروژانەکەی وەك سێڵاو راسا بوو، چیڕۆکەکەی گێڕایەوەو کاتێك کە ئاسۆ رۆشن بووەوە چیڕۆکەکەی تەواوکردو هەمووان لەکاتێکدا لەخۆشیان خەریکبوون باڵ بگرن، سەرمەستانە بەرەو ماڵەکانیان چوونەوەو هەر سەریان چووە سەر بالیف خەویان لێکەوت، بەڵام پویرازو زەهرا خەویان لێنەکەوت.

لەمەزۆپۆتامیای خواریێ، دەنگبێژێك هاتە شاری جزیرەی بۆتانو چووە کۆشکی بورجا بەلەك، کۆشکی میری بۆتان. هاتو لەبەرامبەر میری بۆتان چۆکی داداو تێیهەڵکردە لاوكو داستانی کۆن. میری بۆتان ئەو دەنگبێژەی وایەسند کرد کە چەندین مانگ لای خۆی هێشتیەوە. هەموو میرزادەو بەگو گەورە پیاوانی ناوچەی جزیری بۆتان دەستیان لەکارو کەسابەت هەلگرت، هەموو شەوان لەتەلارەکانی کۆشکی بورجا بەلەك کۆدەبوونەوەو گوێیان لەدەنگو ئاوازەکانی کابرای دەنگبێژ دەگرت. کورتترین داستانی ئەو دەنگبێژە هەفتەیەك درێژەی دەکێشا.

پاشان ئاوازخوێن مۆڵەتی لەمیر خواست کە بڕوات. میر رێگەی پێدا، دەنگبێژ دوای ئەوەی بەخەڵاتی زۆرەوە لەکۆشك دەرچوو، خەڵکی شاری جزیرێ لەگەڵ خۆیان بردیانو

چوونە مەیدانی شارو لەلێواری دیجلە، لەقاوەخانەیەك دانیشتن، تا ڕۆژئـاوابوو قاوەخانـە تژی بوو لەخـەڵك. ئـاوازخوێن یەكـەمجار نـەی ژەنـی. پاشـانیش دەسـتی بـردە بنـاگوێیو داستانێكی كۆنی بۆ تێهەڵكردن. لەداسـتانەكەدا باڵنـدەكان دەفـڕینو هـەزاران مـامز وەكـو سێڵاوێكی سوور لەم سەری بیابان بۆ ئەوسەر دەچوون.

جزیرەییـەكان، ئـەو دەنگبێـژەیان كـە هـەرگیز گوێیـان لـەو لاوكو داسـتانانەی ئـەو دەیگوتن نەبووبوو، تەواوی ئەو زستانە لای خۆ هێشتەوە.

سەرتاسـەری بیابـان، چـیاكانی دەورانـدەوری بیابـان، كوێسـتانەكان، دۆڵو گەلیـە بەهەزارو یەك جۆرە گوڵ داپۆشراوەكان، كێڵگەو لەوەڕگە بەپیتو بەرەكەتەكانی لێـواری دیجلە هەمووی بەدەنگو ئاوازی كابرای دەنگبێژ گەشانەوە. كێڵگەو باتلاخـەكان، هـەزارو یەك جۆر باڵندە بەهەزارو یـەك ڕەنـگ لەباتلاخـەكان، جوانترین مـەلی دونیـا، پادشـاكان، وەزیرەكان، مامزەكان، شوورەكان، ئەسپە هەزارو یەك جۆر ڕەنگـەكان، هـەموویان دەمیـان لێبەش بووبووەوە.

ئاوازخوێن، هەردوو دونیای هێنابووە شـاری جزیـرە، خـەڵكی جزیـرە دوای ئاشـناییان لەگـەڵ ئـەو ئاوازخوێنـە مەزنـە، گۆڕابـوون بـۆ مرۆڤـی جیـاواز، لانیكـەم هەسـتیان بەبەختەوەری دەكرد.

بەردەوام ناوی باڵندەیەكی جادوویيان دووبارە دەكردەوە كـە دەنگـی دەبیسـتراو خـۆی نەدەبیندرا. تەنها ئەو كەسانە دەیـانتوانی دەنگـی باڵندەكـە ببیسـتن، كـە وەكـو وەلیـەكان دڵیان پاكو بێگەرد بوایەو دەگوترا هەركەسێك خـودی باڵندەكـە ببینێـت دەچـێتە ریـزی نەمرانو تەمەنی هەتا هەتایی دەستەبەر دەكات.

لەئەزەلەوە هەركەسێك گـوێی لـەدەنگی ئـەو باڵندەیـە بـووە كەوتۆتـە دوایو تـا ڕۆژی مردنی لەبەدواداگەڕانی بەردەوام بووەو نەدۆزیوەتەوە.

ئەوەی كە داستانی باڵندەكەی بیست، ڕووناكیـەك خزایـە دڵیـەوە، لەمنـداڵانی حـەوت ساڵە بگرە تا ژنو پیاوی حـەفتا سـاڵە ئارەزوویـان دەكـرد دەنگـی ئـەو باڵندەیـە ببیسـتنو پاشانیش بەدوایدا بگەڕێن. ژمارەیەكی زۆر لەگەنجـەكان وەڕێكـەوتن، هەنـدێكیان چـوونە كەنارەكانی دەریـای سـپی، چیای ئامـانۆس، چیاكانی تـورۆس، چوكوراڤا، ژمارەیەكیشـیان چوونە دەریاچەی وان، هەنـدێكی دیكە بۆ زاگرۆسو چیاكانی شنگالو ژمارەیەكی دیكەش بۆ گەلی لالش ڕۆیشتن.

فەقێ گەنجێکی ڕێکوپێك و بەوەج بوو، کە بەچاوانی وەك چاوی مامز، ریشێکی تازە هاتووی قەترانیو گوریزەیی، بزەیەکی بەردەوام بەسەر لێوان، جلوبەرگێکی تایبەتو لیانی پڕ نەخشو نیگاری پێستی نەرمی گوێرەکە، هەرکەسێك بیدیبا سەرسامی دەبوو.

فەقێش یەکێك لەو کەسانە بوو کە بۆ بیستنی دەنگی ئەو باڵندەیە جزیرەی بەجێهیشتبوو، یەکەمجار بەرەو ئامانوسلار کەوتبووە ڕێ.

چیاکانی ئامانوس شوێنو واری کوردانی عەلەوی بوو، دۆزینیەوە. کوردانی عەلەوی بەجوانی پێشوازیان لێکرد. لەسەر دوندی چیا، سپێدان بەر لەدەرکەوتنی خۆر لەخەو رادەبووو دەچووە نێو جەنگەڵ. بەگوێی وشتو قولاغیەوە بۆ ئەملاو ئەولا دەچووو چاوەڕێی بیستنی دەنگی باڵندەکەی دەکرد. دەنگی زۆر لەباڵندەکانی دەهاتە بەر گوێ، بەڵام هیچ باسێك لەدەنگی باڵندەی گۆرین نەبوو. دەنگی ئەو باڵندەیەی چۆن دەناسیەوە، کابرای ئاوازخوێن پێیگوتبوو. پێیگوتبوو دەتوانێت دەنگی ئەو باڵندە گەورەیە لەدەنگی گشت باڵندەکانی دیکە جیابکاتەوە. پێیگوتبوو هەر کەسێك ئەو دەنگەی بیست هۆشی لەخۆی نامێنێت، لەخۆشیان شێت دەبێت، دەکەوێتە حاڵو هەوایەك وەك ئەوەی تازە لەدایکی خۆی بووبێت.

لەهەموو ئامانوسلاردا هیچ چیاو گردو لێڕو ڕووبارو کانیاوێك نەما کە سەری پێدانەگرتبێت، هەموو گۆشەو کەناری چیا گەڕاو بەوردی چاوی پێداگێڕا، بەڵام تەنانەت دەنگێکی وەك دەنگی ئەو باڵندەیەشی نەبیست، بەتایبەت کاتێك کە فلامینگۆکان کەوتنە هەڵفڕین، بەریان بەخۆر دەگرتو ئاسمان وەردەگەڕایە سەر ڕەنگی پەمەیی.

سەرتاسەری چوکوراڤاو زەویە باتلاخیەکانی ئەو ناوە گەڕا. زۆر باڵندەی جیاجیای بینینو گوێی لەدەنگی زۆر باڵندان بوو. چووە سەر ترۆپکی چیا، شەوانێکی زۆری لەرەشماڵی رەوەندان بردە سەر، پرسیاری لەزۆر کەس کرد داخۆ دەنگی ئەو باڵندەیەی بیستووە، یان هیچکەس ئەو جۆرە باڵندەیەی نەبینیبووو گوێی لەدەنگی نەبووبوو، بەڵام لەسەردەمانی کۆندا کەسانێك هەبوونە کە دەنگی باڵندەکەیان بیستبووە. حەکیمی لوقمانیش گوێی لەدەنگی ئەو باڵندەیە بووە. حەکیمی لوقمان بەبیستنی دەنگی باڵندەکە بەپلەی ئەولیایان گەیشتبوو. دوای ئەوە لەچیاو دەشتو ساراو لەهەر جێیەکدا بگەڕابا، هەموو گوڵو گژوگیاو دەوەنو دارو درەختەکان بەزمان دەهاتنو دەیانگوت کە دەرمانی کامە نەخۆشین. حەکیمی لوقمانیش ئەو گژوگیاو گوڵو گەڵایانەی کۆدەکردنەوەو لەم

دێ بۆ ئەو دێو لەم ڕەشماڵ بۆ ئەو ڕەشماڵو لەم شارۆچکە بۆ ئەو شارۆچکەو لەم شار بۆ ئەو شار دەڕۆیشتو نەخۆشو تادارەکانی چاك دەکردنەوە.

حەکیمی لوقمان بەو شێوەیە نەخۆشەکانی چاك دەکردەوەو تەمەنی لەهەشتا ساڵی تێپەڕی، ڕۆژێك کاتێك لەنێو دارستانی ناوچەی پوسی تورۆسدا دەگەڕا، لەپڕ گوێی لەدەنگی باڵندەی گۆرین دەبێتو واقی وڕدەمێنێت، دەڵێت دوای ئەو هەموو ساڵە جارێکی دیکە گوێم لەو دەنگە دەبێتەوە، مسۆگەر دیارە ڕازێکی دیکەم بۆ ئاشکرا دەبێت. ئاوا لەکاتێکدا بەنێو دارستانی پوسدا دەگەڕێتو چەندین ڕۆژان لەسەریەك هەر بیر دەکاتەوە، دواجار پەی بەو ڕازە دەبات، دارستانی پوس دارستانێك بووە لەدرەختانی سیدر، درەختانی باریك وەك قەڵەم، بڵند، سەر بەفەلەك کشاو. قاپۆری درەختە پیرەکان ئەوەندە ئەستوور بووە، کە تەنانەت ئەگەر سێ کەس دەستیان تێکهەڵبێننەوە، دیسان دەستیان ناگاتەوە یەك، تەمەنی درەختەکان نازاندرا. لوقمان گوتویە، من دەرمانی ژیانی هەتاهەتاییو جاویدانی لەم دارستانەدا پەیدا دەکەم. دەستی بەدواداگەڕانو پەیگیری کردووە. نیوەشەوێك بایەکی سەحەری هەڵدەکاتو کاتی ڕووناك بوونی ئاسۆگە لەدوور دوورەوە بتەوێت یان نا گوێی لەدەنگێك دەبێت. دەنگەکە لەدەنگی باڵندەی گۆرین دەچێت، گوێ ڕادەێرێت، دەنگەکە دەڵێت: "من دەرمانی نەمریو جاویدانیم، نەمریو جاویدانی، دەرمانی نەمریو جاویدانیم!" دەنگەکە گوتوویە: "من لەلێوی کانیی هەڵقوڵاوی ژێر درەختە گەورە هەزار ساڵیەکەم، من بەرلەوەی خۆر هەڵبێت لەوێ هەڵبگرە! دەنگەکە نامێنێت، لوقمان بەرەو لای درەختەکە ڕادەکات. گیایەکی سەوز، قەدبڵند، ڕووناکیەکی زۆر گەش بەو ناوەدا پەخش دەکات، کە سەرکانیو هەموو ئەو دەوروبەری نوقمی ڕۆشنایی کردووە.

لوقمان هاتووەو لەسەر ڕۆخی کانیەکە ڕاوەستاوە، نەیتوانیوە دەست لەگیایەکە بدات. ماوەیەك ئاوا بێئەوەی دەست بداتە گیایەکە، لەشوێنی خۆی وەستاوە. لەخۆشحاڵیان نەیزانیوە چیبکات. ئێستا لەبەرامبەر نەمریو جاویدانیدا ڕاوەستاوەو هیچیوای نەماوە خۆر هەڵبێتو دەرمانی نەمریو جاویدانی تێکەڵی تیشکی خۆر ببێتەوەو ببێتەوە بەباڵندەو لەشەقەی باڵ بداتو بڕوات. لوقمان بەشادیو گومانو نیگەرانیەوە، سەروبەندی خۆر هەڵاتن، هەموو هێزی خۆی کۆدەکاتەوە، خۆی درێژ دەکاتو گیایەکە یەکسەر بەرەو لای ئەو لار دەبێتەوەو خۆی دەخاتە نێو دەستیەوە. ئەویش گیا قەد بڵندەکە هەڵدەگرێتو

لەنێو سنگی خۆیدا دەیشارێتەوە. هەموو گیانی یەکپارچە نوورانی دەبێت. دەگۆڕێت بۆ تۆپەڵێك نوورو دەست دەکات بەراکردن، بەهەر جێیەکدا رەت دەبێت ئەوێ نوقمی نوورو رۆشنایی دەکات. هەوڵ دەدات خۆی بگەیەنێتە مرۆڤەکان. تا دەگاتە دەشت رادەکات، ئەوەندە ماندوو دەبێت خۆی دەگەیەنێتە ژێر درەختێك کە بەگوڵ داپۆشراوەو لەدوورەوە بینیویە، لەخۆشیان ماندوو بووبوو. هەر لەگەڵ دانیشتن سەری دەخاتە سەر بەرزاییەك‌و یەکسەریش خەو دەیباتەوە. چاڵێکی قووڵ‌و تاریك لەبن درەختەکە هەبووە، مارێکی رەشی درێژ لەناو چاڵە زۆر قووڵەکە دێتەدەر، پێستی مارەکە لەژێر تیشکی رۆشنایی گیایەکە دەدرەوشێتەوە، مار خشیوەو هاتووەو سێ جاران بەدەوری لوقماندا سووڕاوەتەوە. سەری هەڵبڕیوەو پاشان دوای ئەوەی ماوەیەکی درێژ سەیری لوقمانی کردووە، چووە گیای نەمری‌و جاویدانی لەباوەشی لوقمان هەڵگرتووەو گەڕاوەتەوە.

گیای سەوزی نێو دەمی مارەکە، ئەو دەوروبەرەی نوقمی نێو رۆشنایی کردووە. مارە رەشەکە بەگومان‌و دوو دڵیەوە لەلوقمان راماوەو لێیورد بۆتەوە. روخساری خەواڵووی حاڵەتێکی ئارام‌و هێمنی هەبووەو بتەوێت نەتەوێت بزەیەکی بەسەر لێوانەوە بووە. مارەکە بەگیای نێو دەمیەوە گەڕاوەتەوەو لەکاتێکدا کە پشتی رەشی بریقەداری دەبریسکێتەوە، دێتە سەر رۆخی چاڵە تاریکەکە. رێك لەو ساتەدا لوقمان لەخەو رادەپەڕێت‌و دەچێتە سەر چاڵەکە رادەوەستێت. رەشمارەکە گیایەکەی بەدەمەوە بووە، بەخێراییەکی سەیر بۆ بنی چاڵەکە شۆڕ دەبێتەوە، لوقمان تا ئەو دەمەی مار لەبەرچاوان ون دەبێت‌و رۆشناییەکە نامێنێت‌و تاریکیەکی ئەنگوستەچاو چاڵەکە دادەگرێت، سەری بەسەر چاڵەکەدا شۆڕ دەکاتەوەو لەشوێنی خۆی رادەوەستێت.

لەو رۆژە بەدواوە ئەو کەسانەی کە بەوێدا تێپەڕ دەبن، لەگەڵ رووناکبوونەوەی ئاسۆگە، بتەوێت یان نا، تارمایی حەکیمی لوقمان بەدی دەکەن، کە هەروا لەسەر رۆخی چاڵەکەو لەژێر درەختە گەورەکە راوەستاوە.

فەقێ تەیران، گەڕاو سووڕاو ئەو درەختە گەورەیەی دۆزیەوە کە لەقەدپاڵی چیایەکەوە بوو. لەژێر درەختەکەشدا چاڵێك هەبووە، بەسەر زارکی چاڵەکەشدا شۆڕبۆتەوە، ناوچاڵەکە زۆر تاریك بووە، ئەو شەوەی هەر لەوێدا خەوتووە، کاتێك هەستاوە دەنگی هیچ باڵندەیەکی نەبیستووە.

زۆر جێیان گەڕا، زۆر درەختی بەگوڵ داپۆشراوی بینی، بەڵام هیچ دەنگێکی هاوشێوەی دەنگی باڵندەکەی نەبیست، دوای ئەوەی کە دیسان چەندین‌و چەندین

جێگاو کێوو دەشتو دەریایان گەڕا، دڵی بۆ خێزانو کەسو کارەکانی تەنگ بوو. باوکی لەگوندێکی نێو چیاکانی وان دەژیاو میری ئەو ناوە بوو. کۆشکو تەلارو میواننەوازیەکەی وێردی سەر زاری هەموو خەڵك بوو. کاتێك کە خەریکبوو بچێتەوە نێو گوند، لەرێگادا گەیشتە باوکی. باوکی هەر لەگەڵ ئەوەدا ئەوی بینی لەئەسپ دابەزی، یەکدیان گرتە باوەش، باوکی دەستی لەقۆڵی هەڵکێشاو پێکەوە بەرەو کۆشك بوونەوە. کە گەیشتنەوە کۆشك رووبەڕووی خەڵکێك بوونەوە کە لەباخی کۆشکدا چاوەڕوانیان دەکردن.

میر لەسەر شەرەفی کوڕەکەی میوانداریێکی رێکخست، کە سێ شەوو سێ رۆژ درێژەی کێشا. گوندیو کۆچەرەکان داڕژانە ماڵی میر.

دەنگبێژو حەکایەتخوێنەکانیش هاتنە کۆشكو میوانداریێکی شکۆدارانە ئەنجام درا. سێ رۆژ دواتر، باوكو کوڕ بەرانبەر یەکدی دانیشتن، فەقێ خوێندیو باوکی گوێی لێگرت، کاتێك گەیشتنە داستانی حەکیمی لوقمان، چاوەکانی باوك بریقانەوە:

"حەکیمی لوقمان هیچ لەو گیایەی پەیدا نەکردووە کە مارەکە بردبووی؟ خۆ ئەگەر گیای دۆزیبێتەوە، گیاکەش قسەی لەگەڵدا کردووە".

فەقێ گوتی: "هەموو ئەمانەم لەهەموو خەڵك پرسیوە، هەزار کانیی وەکو ئەو کانیەی گیایەکە لەباوەشیدا بانگی لوقمانی کردبوو، لەهەموو لایەکی جەنگەڵدا هەڵقوڵیون. چاڵەکەش زۆر تاریكو قووڵە".

باوکی دوای هەموو قسەکان، پرسیاری لەبارەی باڵندەکە کرد، کە دەنگی دەبیسترێتو خۆی نابیندرێت.

فەقێ گوتی: "نەمتوانی بیبینم. نەمتوانی دەنگیشی ببیستم".

"تۆ بەدوای دادەگەڕایت وانیە؟"

"بەدوایدا دەگەڕام".

"دەنگبێژو ئاوازخوێنەکانی بەرێ هەمیشە باسی ئەو جۆرە باڵندەیان کردووە، کەسانێك دەنگیان بیستووە، بەلام خۆیان نەبینیوە، گوایە ئاوازخوێنەکان بەدوای باڵندەکەدا گەڕاون، بەلام کەس نەیتوانیوە بیبینێت".

"بۆچی بەدوایدا گەڕاون؟"

باوك تاوێك تێیەوە راما:

"تۆ بۆچی بەدوایدا دەگەڕایت؟"

فەقێ سەری نایەوە بەرخۆی‌و کەوتە بیرکردنەوە. هەموو گیانی بووە عارەقە. سەری هەڵبڕی‌و لەباوکیەوە راما، پاشان دووبارە سەری دانەواندەوە، باوك‌و کوڕ ماوەیەکی درێژ ئاوا مانەوە. دواجار فەقێ گوتی: "من دەبێت ئەو باڵندەیە ببینم باوکە. ئەگەر بتوانم بیبینم شتێك روودەدات".

باوك نەیپرسی چ شتێك روودەدات.

فەقێ تەیران مانگێك لەماڵەوە مایەوە. باوکی ئەسپێکی رەسەن‌و باشی بۆ ئامادەکرد، برێکی زۆر ئاڵتوونی خستە نێو کەمەربەندی‌و خورجینی ئەسپی پڕکرد لەکەوش‌و جلوبەرگی باش. پاشان دایك‌و باوك، براو خوشك‌و خزم‌و کەس‌و کارو خەڵکی گوند، هەمووان پێکەوە فەقێ تەیرانیان تا دەرەوەی گوند بەڕێ کرد.

فەقێ لەگوندەوە رێی جزیرەی گرتەبەرو چووە قەسری بورجا بەلەك، قەسری میری بۆتان. میر پێشوازییێکی باشی لێکرد، سێ رۆژ پێشوازیکردنەکە بەردەوام بوو، بەیانی تا شەوو شەو تا بەیانی پێکەوە دانیشتن‌و ئاخاوتن.

ئەوەی کە لەهەمووی زیاتر سەرنجی میری راکێشا حەکیمی لوقمان‌و مارە رەشەکە بوو، کە گیای نەمری لەئامێزی فەقێ رفاندبووو بردبووی. میر گوتی: "ئێمەش لێرە زۆر حەکایەتمان لەبارەی ماری رەش هەن، زۆر کەس دەنگی ئەو باڵندەیان بیستووە، بەڵام خودی باڵندەکەیان نەبینیوە، کێ دەزانێت، بەڵکو تۆ بتوانیت دەنگەکەی ببیستیت‌و خۆیشی ببینیت. ئەگەر دەنگ دەنگی باڵندەیەك بێت خۆ دەبێت خۆیشی هەبێت. خوا دەزانێت ئەو باڵندەیەی کە دەنگەکەی مرۆڤ دەباتە بەهەشت، لەکوێیە".

"ئەو باڵندەیە دەبینم".

میر گوتی: "ئینشاللا دەیبینیت"و مۆری لەدەستی داو پێشیگوت: "هەرکاتێك تووشی گرفتێك بوویت، ئەم مۆرە نیشانی هەرکەسێك بدەیت لەنێوان دوو زێ یارمەتیت دەدات، برۆ لای ئێزدیەکانی گەلی لالش، سڵاوی منیان پێڕابگەیەنە، ئەوان باڵندەکان بەپیرۆز دەزانن، سیمبۆلەکەشیان تاووسە. رەنگبێت سەبارەت بەباڵندەکەی تۆ شتێك بزانن".

فەقێ چەند مانگێك لەنێو رەشماڵی کۆچەرەکانی نێوان هەردوو زێ مایەوەو سەرتاسەری بیابان گەڕا. گوێی لەدەنگی زۆر باڵندان بوو. زۆر باخی دارخورمایانی بینین. بەنێو زۆر رەوەی مامزان تێپەڕی، مامزەکان سڵیان لێنەکردەوەو نەڕەوینەوە. گرفتاری رەشەباو گەردەلوولی لم بووەوە. کاتێك گەیشتبووە گەلی لالش پێستی ئەسمەری رەش هەڵگەڕابوو، گۆناکانی وەکو مەنجەڵی قووپاویان لێهاتبوو.

لەگـەڵی لالـش خەڵکەکـە پێشـوازیێکی گـەرمیان لێکـرد، ناوبـانگی باوکیـان بیسـتبووو خودی ئەویشیان دەناسی. ئەوان ئەو کەسانەشیان دەناسی کـە گوێیـان لـەدەنگی باڵندەکـە بووبوو، رێبوارانێکی زۆریشیان بینیبـوو کـە بـەدوای ئـەو باڵندەیـەدا گـەڕابوونو بەوێـدا تێپەڕیبوون، بەڵام نەیانیبووو نەیانبیستبوو کە هیچکەس ئەو باڵندەیەی بینیبێت.

"من ئەو باڵندەیە دەدۆزمەوە".

"دەستی هەق پشتو پەنات بێت".

فەقێ هەرجارێکی کە دەچووە پەرستگەی لالشو دەهاتـەدەر، سـەیرێکی وێنـەی ئـەو مـارە رەشـە درێژانـەی دەکـرد کـە درێـژاییان لەبـەژنی مرۆڤێـك زیـاتر بـووو سـێ جـار بـەدەوری خۆیانـدا سووڕابوونەوەو لەسـەر دیـواری لای راسـتی پەرسـتگەکە چـێکرابوون. نیگاری بەرچاوی باڵندەی سەر دەرگاکە ئەوی زۆر سەرقاڵی خۆی کردبوو. نەکا ئـەو مـارە هەمان ئەو مارە بێت کە گیایەکەی لەحەکیمی لوقمان رفاندبووو ئەم نیگاری باڵندەیـەش هەمان باڵندەکە بێت؟

بـەهیچ چەشـنێك نـەیتوانی ئەمـە لەئێزدیـەکان بپرسـێت، هەنـدێك نووسـین لەسـەر دیواری لای راستی دەرگای گـەورەی پەرسـتگاش هـەبوون. کـەس تـا ئـەو دەم نـەیتوانیبوو ئـەو نووسـینانە بخوێنێتـەوە. ئەگـەر هەوڵیشـیان دابێـت سـەرەدەریان لێدەرنـەکردووە، رەنگبوو ئەگـەر حـەکیمی لوقمـان هاتبایـە ئێـرە بیتوانیبـا بیانخوێنێتـەوە. کـێ دەزانێـت، بەڵکو رازی مەرگیش لەو نووسینانە دابێت.

ئەگـەر رازو نهێنیـەکی گـەورە لـەو نووسـینانەدا نەبووایـە، بۆچـی شـێخانی ئێـزدی واتاکانیان نەدەزانین؟ شێخەکان تەنانەت ناشتوانن بیانخوێننەوە؟

دەبوا واتای ئەو نووسـینانە لـەزار بـۆ زار بهاتبـاو بگەیشـتبایەتە ئـەوان. یـان کەسـێك پەیــدا ببــا بیانخوێنێتــەوە. هیچــکەس لــەبارەی مــارو باڵندەکــە قســەیەکی نــەدەکرد. لەپەرستگەدا وێنەو نـەخشو نیگـاری تـاووس لەسـەر فـەرشو مـافووری ماڵانـدا دروسـت کرابوو. لەپەرستگەو ماڵاندا پەیکـەری لـەبرۆنز دروسـتکراو بـەدی دەکـران، کـە شـێوەیان لەشێوەی کەڵەشێر دەچوو.

ئەو ئێزدیانە رازو نهێنی زۆریان هەبوون، ئەوان تۆمەتی پەرستنی شەیتانو تاووسو خۆریـان دەدرایـە پـاڵو بـەو تۆمەتـە سـتەمێکی زۆریـان دەرهـەق دەکـردن. دەیانکوشـتنو پێیانوابوو هەموویان لەنێو بردوون، بەڵام دوای چەند ساڵێك، دەیـانبینی ئێزدیـەکان کـە پەنایان بردبووە بەر چیاکان، دەهاتنەوەخوارو گەلی لالشیان پڕ دەکردەوە.

ئاغاکـان دیسـان بـەبیانوی ئایینیـەوە ئێزدیـەکانیان کۆمـەڵکوژ دەکـردنو دیسـان ژمارەیەکیان پەنایان دەبردەوە بەرچیاکان. رێك لەو کاتەی کە دوژمنەکانیان وایانـدەزانی ئیدی رەگو ریشەی ئێزدیان وشك کـردووە، ژمارەیـەکی زۆری ئێـزدی تازەنەفـەس لـەلای شـنگالەوە دەهاتنـە گـەلی لالشو خۆیـان دەگەیانـدە مـەزاری شـێخ ئـادی کـوڕی مسـافیر.

ئەمیرانی عـارەب، بەگـەکانی تـورك، مـیرە کوردە موسـڵمانەکان، کـە دایاننـابوو هـەموویان لەنێوچوون، سەریان سـوورِدەماو بـەر لـەوەی ئـەو سەرسـوڕمانەیان بڕەوێتـەوە، دەسـتیان بەکوشـتنی پیـاوو ژنو زارۆکـی ئێزدیـان دەکـردەوە. فـەقێ تـەیران شـارەزاییەکی تـەواوی لەمێژووی ئێزدیان هەبوو.

ئێزدیەکان کورد بوون. بەکوردییێکی زۆر دەوڵەمەندو پاراو دەدوان، لاوكو داسـتانی زۆر لەمـەزۆپۆتامیا سـەبارەت بەکۆمەڵکوژیـەکانی ئێزدیـان دەگـوتران‌و دەبیسـتران، کەسانێك کە ئەو لاوكو داستان‌و بەسەرهاتانەیان دەبیست، نەیاندەتوانی باوەڕ بکـەن‌و خەم‌و ئازارێکی زۆر دایدەگرتن. سەیر لەوەدا بـوو مـیرو بـەگو ئاغاکـانی کـورد خۆیـان لـەزۆر لـەو کوشـتارانەدا بەشـداربوون. جگـە لەوانـە فـەقێ تـەیران لـەلالش پـەی بەراستیەك برد، ئێزدیەکان کە سـەدان ساڵ بـوو بـەهۆ یـان بـەبێهۆ دەکـوژران‌و لـەنێو دەبردران، دژی کوشتنی مرۆڤ بوون. فەقێ شتێکی دیکەش لەشێخەکانی لالش فێر بوو، کە سەرسامی کرد:

لەسـەردەمانی کۆنـدا، مرۆڤـەکانی نیشـتەجێی مـەزۆپۆتامیا مانـای جـەنگیان نـەدەزانی، پاشـان حـوکمڕانی شـارەکان‌و دەوڵـەت‌و خـەڵکانی وڵاتـانی دیکـە گوێیـان لەژیانی بەختەوەرانەی دانیشـتوانی ئـەو دەڤـەرە بـوو، کـە لەهـەموو ژیـانی خۆیانـدا جـەنگیان نـەبینیبوو، پـەلاماری مـەزۆپۆتامیایان داو داریـان بەسـەر بـەردو سـەریان بەسەر تەنەوە نەهێشت.

فەقێ هەر کە گوێی لەباسی ئەو دونیا ئاشتیئامێزو دوور لەکوشتن‌و خوێنڕێژیە بوو، هەستی بەشادی‌و خۆشحاڵیەکی منداڵانە کرد.

ئەوانەی کە ئێزدیەکانیان دەکوشت، لەدڵی خۆیاندا زۆر سەرسام دەبـوون بـەو هـەموو خـۆڕاگری‌و رێزگرتنـەیان لـەمرۆڤو لەدەسـتنەدانی مرۆڤایەتیەکـەیان، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا، دەستیان لەکۆمەڵکوژیی ئەوان هەڵنەدەگرت.

فەقێ گوتی: "من ئەو باڵندەیە دەدۆزمەوە".

پێیانگوت: "خوا پشتو پەنات بێت". ریشسپیێك كە لەگەڵ خەڵكەكە تا بەردەم دەروازەی پەرستگە بەڕێیانكرد، بەدەربڕینێكی دڵنیایانەوە گوتی:

"بەختەوەری بینینیت، ئەو باڵندەیە بەنسیبی تۆ دەبێت، "ئەوانەی لەدوای شێخ راوەستابوون، بەیەكدەنگ گوتیان: "ئامین".

فەقێ گوتی: "دەچمە سەر ترۆپكی چیاكان، ئەسپەكەم دەكەمە دیاری بۆ پەرستگە".

فەقێ كە دڵی پاك پاك بووبووەوە، رێی چیاكانی گرتەبەرو هیچ یەك لەوان تەنانەت لەخۆشیان نەپرسی، كە ئەو گەنجە رێكوپێكە دوای دۆزینەوەی ئەو باڵندەیە چیدەكات. لەدێرزەمانەوە كەسانێكی زۆر بەدوای دۆزینەوەی ئەو باڵندەیەدا گەڕاون. ئێستاشی لەگەڵدابێت هەر بەدوایدا دەگەڕێن. گەڕیدەكان لەبەر ئەوەی بەردەوام هەر پرسیبوویانو هیچ وەڵامێكیان دەست نەكەوتبوو، ئیدی لەبەدواداگەڕان ماندوو بووبوونو وازیان هێنابوو. ئەوانەی كە گوێیان لەدەنگی باڵندەكە بووبوو، مۆری سەرداخراوی نهێنیەكە بوون. تەنانەت ئەوانەی كە نەشیانبیستبوو، هیچیان نەدەگوت. بەرەو رۆژئاوا رۆیشت، چووە شوێنی دارخورماكان، كە بەئەندازەی دارستانێك دەبووو ئەو كاتەی دەچووە لالش بینیبووی. دارخورماكان وەكو پیرەدارەكانی لێوار جەنگەڵی پووس بەرزبوون. بۆی هەبوو باڵندەكە لەشوێنێكی ئەوپەڕی لای دارخورماكان بێت. كێ دەیتوانی ئەو باڵندەیە ببینێت كە لەشوێنكی زۆر دووری ئەو شوێنە بێت. ئەگەر بشیبینێت چۆن دەتوانێت بەبێبیستنی دەنگەكەی دەستنیشانی بكات؟ هیچكەس نەیتوانیبوو تا ئەودەم ئەو باڵندەیە ببینێت، بەڵكو بشانبینیبێت، بەڵام نەیانناسیبێت. لەو دەمەی لەكۆشكی بورجا بەلەك باسی ئەو باڵندەیەی لەكابرای ئاوازخوێن بیستبوو، بەردەوام بیری هەر لای باڵندەكە بوو. ئەو باڵندەیە چ جۆرە باڵندەیەكە؟ رەنگی، قەبارەی، باڵەكانی، قاچەكانی، كلكی، دەنووكی چۆنە؟ ئایا نیشانەیەكی پێوەیە؟ بەزەینی دانەهاتبوو ئەمە لەئاوازخوێنەكە بپرسێت. لەوەتەی شارەكەیانی بەجێهێشتبوو بەردەوام هەر بیری لەباڵندەكە دەكردەوەو لەزەینی خۆیدا ئەو باڵندەیەی لەرەنگو ئەندازەی جیاجیا وێنا دەكرد، بەڵام هەستی دەكرد ئەو باڵندەیە لەهیچكام لەو باڵندانە ناچێت كە ئەو لەهزری خۆیدا وێنای كردبوون. بەردەوام باڵندەی بەبەرچاو رەت دەبوون. دەبێت لەبارەیانەوە پرسیار لەخەڵكی بكات. هیچكەس ناوەكەی نەدەزانی. هەندێك دەیانگوت سیمورغە، ئایا تا ئێستا كەس سیمورغی بینیوە؟ لەو بارەیەوە زۆر بیریكردەوە. كەس

بەدوای سیمورغدا ناگەڕێت. وەك ئەوەی کە ئاوازخوێنەکە دەیگوت. هەرکەسێك دەنگی ئەو باڵندەیەی بیستبێت تا ئاخری عومری سەرمەستانە لەبەهەشتێکدا دەژی، دەگاتە ژیانی جاویدانی.

"بۆچی بەدوای ئەو باڵندەیەدا دەگەڕێیت؟"

"دەمەوێت بیبینم".

ڕۆژانێکی زۆر بەدوای یەکدا گوێ قوڵاغانە، لەنێو دارستانی دارخورماکان بەدوای باڵندەکەدا گەڕا. هەموو ڕۆژێك بەیانیان زوو بۆ بیستنی دەنگی باڵندەکە لەخەو هەڵدەستا. لەکاتی خۆر هەڵدەهات لەنێو ئەو دارستانەدا بێژمار دەنگی باڵندان دەهات. نەیدەزانی کامە دەنگ دەبێت دەنگی باڵندەی گۆرین بێت. کابرای ئاوازخوێن چی گوتبوو، هەرکەسێك دەنگی ئەو باڵندەیە ببیستێت ئەفسوون دەبێت، بەڵام ئەو دەنگێکی وا ئەفسوونگەرانەی لەو دارستانەدا نەبیستبوو.

لەبەیانییێکی گورگەمێشدا لەجەنگەڵەکە هاتەدەرو یەکسەر کەوتە سەر چەمەنزارێکی باریك. چەمەنەکان بەسەوزاییەکی تازە تا ئەوبەری دیکەی بیابان درێژ بووبوونەوەو ڕەنگە سەوزەکەیان لەگەڵ ڕووناکی ئاسماندا ئاوێە بووبوو. لەمسەری چەمەنزارەکە ڕاوەستاو تا خۆرهەڵات هەر سەیری سەوزاییەکەی کرد، کە تا خوارەوە درێژ بووبووەوە.

لەلای تەپۆلکە لمیەکەی بەرانبەری، دوای ئەوەی کە بۆ ساتێك لەگەڵ ڕۆشناییەکی زێڕیندا بریقایەوەو پاشان ڕۆشناییەکەی نەما، شنە بایەك هەڵیکرد. لەگەڵ شنەبایەکەدا، دەنگی باڵندەیەك کەوتە بەرگوێ کە ڕەنگە شینباوەکەی لەهەوادا پەرش‌و بڵاو دەکردو بەرەو ئاسمان هەڵدەکشا. فەقێ تەیران ڕووی خۆی بەرەو چیاکان وەرسووڕاند، لەدوور دوورەوە زنجیرە چیای ڕەنگ مسین بەدی دەکران. سێبەری شینباوی باڵندەیەك کە لەلای تەپۆلکەکەوە هەڵفڕیبوو لەبەرامبەریدا لەسەر زەوی ڕەنگی دایەوە. سەری هەڵبڕی، باڵندەکە بەسەر سەریەوە بووو لەکاتێکدا کە هەروا ڕەنگە شینباوە مەخمەڵیەکەی بەدەوروبەردا پەخش دەکرد، بەباڵەکانی کە نوقمی نێو ڕەنگی شین بوون لەسەر تەپۆلکە لمیەکە بەرەو لای چیاکان دەڕۆیشت. باڵندەکە دوای ئەوەی کە بۆ ساتێك لەبەرچاوان ون دەبوو دووبارە دەگەڕایەوەو لەسەر سەری فەقێ تەیرانداو لەمەودای بەرزی منارەیەکدا باڵەکانی درێژ دەکردنەوەو ڕەنگە شینباوەکەی بەسەر بەردو خاك‌و دارو درەخت‌و گیاو گوڵ‌و هەموو شتێکدا پەخش دەکردو درێژەی بەهەڵفڕینەکەی دەدا.

فەقێ ڕێك بەرەو لای چیاکان دەڕۆیشتو سێبەری باڵندەکەش بەسەر سەریەوە بوو. باڵەکانی سێبەر درێژ دەبوونەوە، گەورە دەبوون، کورت دەبوونەوەو سێبەرەکە خڕ دەبووەوەو دەبووە تۆپێکی شینباو، پاشان باڵەکانی لێکدەبوونەوەو رووەو لایەکی دیکە دەڕۆیشت.

نزیکەی نیوەڕۆ فەقێ ماندوو بوو. گەیشتبووە قەدپاڵی چیاکان، لەنێو بۆنو بەرامەیەکی مەستکەرانەدا کانییەك هەڵدەقوڵا کە لەژێریدا وردەچەوو دەوروبەریشی بەچیمەن داپۆشرابوو. فەقێ خورجینەکەی سەر پشتی لەسەر چیمەنەکاندا دانا، چۆکی داداو داهاتەوە، دەمو چاوی شوشت، بوخچەکەی دەرهێناو کەمێك نانی تیریو پەنیرو سەوزەی خوارد. ئێزدیەکان تایەکی خورجینەکەیان بۆ پڕکردبوو لەنانو پەنیرو سەوزە. باڵندەکە بەباڵە لێکبلاوەکانی ڕێك بەسەر سەریدا دەفڕیو سێبەرەکەی وردە بەردو ئاوی کانیەکەی شین هەڵدەگەڕاند.

ئەو رۆژە فەقێ بەرەو چیاکان رۆیشتو لەوێ لەکووخێکی دارینـدا بووە میوانی شوانێك. شوانی پیر بەباشی پێشوازی لێکرد. کابرا شوانی مێگەلێکی کارمامزان بوو. شوان بەخواردنێکی خۆشی داندۆکو ساواری بەگۆشتی مامز میوانداریی لێکردو تا نیوەشەو پێکەوە قسەیان کرد. شوانەکە پیاوێکی زۆر بەئەزموون بوو. دەربارەی ئەو چیایانەو خەڵکی ئەو ناوە زۆر شتی دەزانی. چاوی بڕیە چاوی فەقێو ماوەیەك ئاوا سەیری کرد.

"تۆش هاتوویت ئەو باڵندەیە ببینیت؟"

"وایە، بۆ ئەوە هاتووم".

"تۆ کوڕی کام ئاغایت؟"

فەقێ تەیران خۆی پێناساند. درەنگ نووستنو زوو لەخەو هەستانو شوان تێشووی گەورەی پڕ لەخواردنی لەپێش فەقێ دانا. لەنێو خواردنەکاندا گۆشت مامزی وشککراوەی بەرهەتاویش هەبوو.

شوان دوای نانخواردنی بەیانی، فەقێی لەگەڵ خۆیدا بردە هەوێزی مامزەکان. هەزاران مامز لەیەك شوێندا خڕبووبوونەوە. هەموو لایەك بەرەنگی سوور دەدرەوشایەوە. سێبەری شینی باڵندەکە بەسەر رەنگی سووردا دەکەوت.

هەموو لایەك لەرەنگی شین هەڵکێشرابوو.

فەقێ رووی لەئاسمان کرد:

"ئەمە باڵندەکەیە؟"

شوانی مامزەکان گوتی:

"نازانم".

فەقێ تەیران ڕێگای دارستانی گرتەبەر. دارستان دارستانێکی زۆر گەورەبوو. تاریکایی چنگی لەزەوی گیرکردبووو لەدوورەوە تۆ دەتگوت ئەمە دارستان نیە، شەو و تاریکستانە. لە کاتێکدا دەترسا و لە دڵی خۆیدا دەیگوت باڵندەیەکی وەها ئەفسووناوی هەر لەو جۆرە دارستانانەدا دەژی، بە لەرزە لەرزە چووە نێو دارستانەکە. سەری هەڵبڕی، باڵندە شینەکە بەسەر بەرزترین چڵی درەختەکاندا دەفڕیو جار جار سەری شۆڕدەکردەوە سەیری خوارەوەی دەکرد. لەگەڵ ئەو باڵندەیەدا لەکاتێکدا دەوەنەکانی بەملاو ئەولادا رادەدان بۆ پێشەوە دەڕۆیشت، هاتو گەیشتە رۆخی هەڵدێرگەیەك، لەلای خوارەوە لەجێگایەکی زۆر دوور چاوی بەهەندێك ڕەشایی کەوت کە دەجووڵانەوە. دیار نەبوو ئەمانە مرۆڤن، ئەسپن، دێوو درنجن یان مانگان. ئەو ئاوەی کە لەلای دواوەی هەڵدێرگەکە دەڕۆیشت، هەر هێندەی ئەستوورایی ئەنگوستێك دەبووو نەدەبوو.

فەقێ گەڕایەوە نێو دارستانەکە، بەدوای کانیاوێکدا گەڕا، کانیاوی دۆزیەوە، ئەگەری بەهێز هەبوو ئەو باڵندەیەی بەدوایدا دەگەڕا لەنێو ئەم دارستانەدا بێت. پشتی بەقاپۆری درەختێکەوەدا. بنی کانیاوەکە بەوردە بەردو چەوی سپی، سوور، سەوزو ڕەش داپۆشرابوو. ئاوێکی زوڵاڵی وەك تیریێژی خۆر هەڵدەقولا.

خۆر ئاوا بوو، هەموو جێگایەك تاریك داهات، دارستان کەوتە ژاوەژاو، دەنگی ئاژەڵانی کێوی لەهەموو دارستانەکەدا دەزرنگایەوە. فەقێ تا بەیانی دا خەوی لێنەکەوت، پاڵی بەدرەختی رۆخ کانیاوەکە دابوو، پشتی کۆمو ئاوا شەوی بردە سەر.

هەر لەگەڵ خۆر گزنگی دا، بێئەوەی بەرچایی بخوات، بێئەوەی لەکانیەکە قومێك ئاو بخواتەوە، ڕووەو خۆر کەوتەڕێ. چل پەنجا هەنگاو نەڕۆیشت لەدەوەنو دارو دڕکەکان هەڵنگوتو کەوتەخوار، پاشان هەستایەوە، بەدەست ڕێگای خۆی کردەوەو توانی بەهێمنی بچێتە پێشەوە. کە گەیشتە لێواری ڕووبارەکە، شەلوارو قۆڵو کراسەکەی ونجڕ ونجڕ بووبوونو دەستو قۆڵەکانی رووشابوونو کفتو شەکەت بووبوو، هەموو گیانی دەئێشا. لەسەر ئەژنۆ کەوتە سەر چیمەنەکانی لێواری ڕووبارەکە، کاتێك کەمێك هاتەوە سەر حاڵەتی ئاسایی، دەنگێکی شنەفت کە لەلای سەرەوە دەهات. ئەگەرچی زۆر ماندوو بوو،

هەستاو بەرەو لای دەنگەکە رۆیشت. بەرلەوەی بگاتە رەشماڵەکان، سەگی زەبەلاح زەبەلاحی شوانەکان رێگەیان پێگرت، پیرەمێرد بەبەردتێگرتن سەگەکانی لێدوور خستەوە، ژێر باڵی رێبواری گرتو بردی بۆ رەشماڵێکی حەوت ستوونی، فەقێ بەو هەموو ماندوێتیو کفتیو هیلاکیەی، هەر کە پێی نایە نێو رەشماڵەکە، لەبەر زۆر سەرسوڕمانی زمانی لەگۆ کەوت. پاشان کە کەمێك سەرسوڕمانیەکەی کەم بووەوە، دەستی خۆی لەنێو دەستی پیرەمێردەکە دەرهێناو لەرەشماڵەکە چووە دەرو یەکسەر چاوی بڕیە ئاسمان. باڵندەکە بێئەوەی باڵ لێکبدات لەبن ئەستێرەکاندا دەخولایەوە. پیرەمێردیش کە لەڕەشماڵەکە هاتبووەدەر، باڵندەکەی بینیو یەکسەر چووەوە ناو رەشماڵ، فەقێش کەوتە دوای... کۆچەرەکان هەواڵی هاتنی میوانەکەیان بیستبووو لەنێو رەشماڵەکە لەدەوری یەکدی کۆبووبوونەوە. کوێخاو ئاغاکانو فەقێ دوای نانخواردن، چوونە رەشماڵێکی دیکە. ئاسمان سافو ساهیو پڕ لەئەستێرە بوو. باڵندەکە وەکو سێبەرێك وەك خۆی لەبن ئەستێران چەرخی دەدان.

بالیفێکی گەورە لەناو رەشماڵە بۆ ئاغاکە داندرابوو. ئەوانەی پێشتر لەوێ بوون پێکەوە یەکپێ هەستانەوەو تا ئەودەمەی ئاغاو فەقێ دانەنیشتن ئەوان هەر بەپێوە مانەوەو هیچکامیان دەمی لێکنەکردەوە. هەریەکەو بەگوێرەی ئاستو پلەو پایەی کە لەناو هۆزو کۆچەکەیاندا هەبوو بەڕیز لەتەك یەکدی دانیشتن. لەکلاوڕۆژنەی رەشماڵەکەدا چەند ئەستێرەیەك دەبیندران. ئاغا هەر کە پاڵی بەبالیفەکەوەدا، فەقێ تەیرانی بەوانی دی ناساند.

"میوانەکەمان، ئەمڕۆ لەگەڵ باڵندەیەکی شینباو کە باڵی درێژی هەنو بەسەر ئاسمانی رەشماڵەکەماندا دەفڕێت، هاتە بەردەم رەشماڵی ئێمەوە. باڵندەکە هەموو شوێنێکی نوقمی نێو رەنگی شین کرد. دارستان، خاك، ئاوی رەوان، چیمەنەکان، تەپۆلکەکان، چیاکان، تەنانەت رەشماڵەکانی ئێمەش رەنگی شینیان گرتەخۆ. باڵندەکە هێشتا بەئاسمانەوەیەو شەویش شین هەڵگەڕاوە. ئەگەر دەتانەوێت خۆتان بڕۆن بیبینن".

ئاغا تیەچاوێکی دایە ئاوازخوێنەکەیان کە شمشاڵێکی بەدەستەوە بووو لەناوەڕاستی رەشماڵەکەدا لەسەر چیچکان دانیشتبوو، ئاواز خوێن دەستی پێکرد. فەقێ تەیران بەهەموو تەمەنی خۆی شمشاڵژەنی وای نەدیبوو. هەتا زیاتر گوێی لێدەگرت زیاتر سەرسامو مەست دەبوو.

ئاوازخوێن دوای ماوەیەك دەستی بەگێڕانەوەی داستانەکە کرد. دەنگی کاریگەرتر بوو لەدەنگی شمشاڵەکەی.

بەیانی داهات، خۆر هەڵات، لەرەشماڵەکە هاتنەدەر، باڵندە شینەکە بەبەرزایی دارسپیندارێك بەسەر رەشماڵەکە باڵی لێکدەدان‌و پەڕەکانی لەنێو تیشکی خۆری دەمەو بەیانی دەدرەوشانەوە.

ئاغا سەری هەڵبڕی‌و ماوەیەك سەیری باڵندەکەی کردو گوتی: "من پێشتر ئەم باڵندەیەم لەم دەڤەرانەدا نەبینیوە".

کۆچەرەکانی دیکەش گوتیان: "ئەم باڵندەیە هی ئەم ناوچانە نیە"و هەموویان پێکەوە سەیرێکی فەقێ تەیرانیان کرد.

فەقێ تەیران خاکەڕاییانە گوتی: "ئێمە پێکەوە هاتینە ئێرە".

خەڵکەکە بڵاوەی لێکرد، ئاغاو فەقێش پێکەوە چوونە نێو رەشماڵی ماڵی ئاغا، لەنێو رەشماڵدا بۆنی خۆشی شیرو نانی تازە لەتەنوور دەرهاتووو هەنگوینی شانە دەهات، لەدەوری سفرە دانیشتن. نقیشکیش داندرابووە سەر سفرەکە. خاتوونیش هاتە سەر سفرەو لەگەڵ هاتنی هەردووکیان پێکەوە لەبەری هەستان.

خاتوون گوتی: "باڵندەیەکی شین لەدوێنێوە خەریکە لەبان سەرمان چەرخان دەدات، لەوەتەی هاتووە هەموو لایەك شین هەڵگەڕاوە، تەنانەت تیشکی خۆریش شینە".

ئاغا قسەی خاتوونی پشتڕاست کردەوەو گوتی: "فەقێ تەیران بەدوای ئەو باڵندەوەیە".

خاتوون گوتی: "ئەو باڵندەیە بوونی نیە".

ئاغا بەگرژیەوە سەیری کرد:

"ئەگەر ئەو باڵندەیە بوونی نیە، ئەی ئەو نیشانەیەی کە بەسەر سەرمانەوە چەرخ دەدات چیە؟ ئەوەی کە ئاسمان‌و زەوی شین هەڵگەڕاندووە؟"

"ئەگەر ئەو باڵندەیە هەمان باڵندە بوایە لەمێژبوو خوێندبووی. دەیخوێندو ئێمەش خۆمان لەناو بەهەشت دەبینیەوە. هیچکەس ئەو باڵندەیەی نەبینیوە، تەنها لەنێو ستران‌و ئاوازی دەنگبێژو ئاوازخوێنەکاندا دەشێت ببیندرێت. نازانم چما لەوەتەی دونیا هەیە مرۆڤەکان بەدوای ئەو باڵندەیەدا وێڵ‌و سەرگەردانن، رۆژێك هەر دادێت بیدۆزنەوە. دەیبینن. دەنگەکەی دەبیستن". رووی کردە فەقێ‌و پرسی:

"تۆ بۆچی بەدوای دادەگەڕێیت؟"

"هەر تەنها دەمەوێت بیبینم".

"چۆن دەزانیت ئەو باڵندەیەی دەیبینیت هەمان باڵندەکەیە؟"

فەقێ سەری لەبەرخۆی نایەوە:

"نازانم، من بەردەوام بیر لەمە دەکەمەوە".

ئاغا وەڵامی فەقێی دایەوە:

"لەدەنگەکەیەوە دەزانێت، هەرکەسەی دەنگی ئەو باڵندەیە ببیستێت هۆشی لەخۆی نامێنێت. خۆی لەبەهەشتدا دەبینێت".

"من رۆژێك ئەو باڵندەیە دەبینم".

نانی بەیانیان خوارد، سفرەکەیان کۆکردەوە، هەردوو تای خورجینەکەی فەقێ پڕکرابوو لەخواردەمەنی، خورجینەکەیان هێناو لەتەنیشت فەقێیان دانا.

ماوەیەکی باش لەبارەی باڵندەکە دوان. پاشان هەرسێکیان پێکەوە هەستان. فەقێ خورجینەکەی دانایە سەر شانیو چووەدەر، کۆچنشینەکان ماوەیەك پێشتر لەوێ کۆبووبوونەوەو چاوەڕێی ئەوانیان دەکرد.

"وەکو باران نوورو رۆشنایی پەڕو باڵی باڵندەکە بەسەر سەرمان دادەبارێت"و هەمووان پێکەوە سەیری ئاوازخوێنیان کرد.

ئەوانەی لەوێ بوون بەخۆیان گوت، ئاواز خوێنەکان هەموو شتێك دەزانن‌و دەبینن.

فەقێ وەڕێکەوت. خاتوون لەدوایەوە گوتی: "ئینشاللا بەئارەزووت دەگەیت کوڕم، ئینشاللا بەرلەوەی پیر ببیت بتوانیت دەنگی ئەو باڵندەیە ببیستیت‌و خۆیشی ببینیت. بەخێرچیت، خوا پشت‌و پەنات بێت. "لەکاتێکدا فەقێ‌و ئاغا لەپێشەوەو کۆچەرەکان بەدوایاندا دەڕۆیشتن، باڵندە شینەکە بەسەر سەریانەوەو سێبەری باڵندەکەش لەبەر پێیان دەڕۆیشت. هاتن‌و گەیشتنە پردی حەوت تاق‌و لەوێ خواحافیزیان لەفەقێ کردو گەڕانەوە.

باڵندە شینەکە کە با کاکۆڵەکەی دەهەژاندەوە، رێك بەسەر سەری فەقێدا دەفڕی. لەپردەکە رەت بوون. لەلای راستەوە رێگایەکی بەردەڵانی پڕ هەورازو نشێوو درەوشاوە کە رۆشنایی شەپۆلی دەدا هەبوو، سێبەری باڵندەکە لەسەر زەوی لەبەرپێیدا دەڕۆیشت، ماوەیەك دواتر سێبەرەکە نەما. فەقێ سەیری ئاسمانی کرد، باڵندەکە ون بووبوو، هەستی بەشکست کرد. سەیری لای چەپ‌و راستی خۆی کرد، هەموو لایەکی هەر بەردەڵان بوو، هەر لەگەڵ ئەوەی لەپێچی زنارێکدا وەرسووڕا، باڵندەکەی بینی‌و

هەستیکرد لەنێو هەورێکی شینباودا مەلە دەکات. کاتێک چەند هەنگاوێك بۆلای باڵندەکە چووە پێش، هەوری شینو باڵندەکە لەبەرچاوان ون بوونو دیارنەمان. گوڵی سوورو وەنەوشەیی لەسەر زنارەکانی دەوروبەری روابوون.

نیوەڕۆ داهاتو هەوا گەرم بوو. بۆنێکی سەرمەستکەر لەدۆڵەکان دەهات. لەچیاکان هەمیشە بۆنی خۆش دێت. فەقێ لەهیچ چیایەك تا ئەو رادەیە هەستی بەمەستبوونو بارسووکی نەکردبوو. دروست لەم کاتەشدا لەسەر بەرزایی زنارەکاندا، پۆل پۆل باڵندەی بچووك، کە قەبارەی جەستەیان هەر هێندەی یەك پەنجە دەبوو، دابەزینە خوارەوە. لەنێو شەپۆلی رەنگەکاندا هاتنەخوار، باڵندەکان بەجیکەجیكو زریکاندنەوە لەدەوروبەریدا چەرخیان دەدا، هەندێکجار بێدەنگ دەبوونو لەهەمانکات پێ بەپێی ئەو دەڕۆیشتن، ون دەبوون، بەڵام یەکسەر دەگەڕانەوەو دیسان لەکاتێکدا دەیانچریکاند لەدەوروبەری ئەودا دەفڕین. باڵندەیەکی سپی ورشەدار بەجەستەو قەبارەیەکی هاوشێوەی فەتێ لەپێش هەموو باڵندەکان دەڕۆیشتو باڵندەکان بەخێرایی لەدەوروبەری ئەو باڵندە سپیە دەخولانەوەو چەرخیان دەدا. باڵندە سپیەکە لەمەودای چەند مەترێك لەنزیك ئەو، دەفڕی. فەقێ بیریکردەوە، ئەمە هەمان باڵندەکە بێت، خۆزگە دەیتوانی دەنگیشی بشنەوێت، لەنێو ئەو هەموو جیکەو چریکەیە چۆن دەتوانێت دەنگی ئەو باڵندەیە لەدەنگی ئەوانی دیکە جیابکاتەوە.

فەقێ لەبەر ئەو هەموو پۆلە باڵندەیە نەیدەتوانی رێگا بدۆزێتەوە، لەپڕ خۆی لەنێو ئاودا بینیەوە. ئاوەکە رووبارێکی باریك بوو. هەر لەگەڵ لەڕووبارەکە پەڕیەوە، باڵندەکانیش نەمانو رۆیشتن، تەنها هەر ئەو باڵندە سپیە مایەوە، باڵندەکانی دی نەگەڕانەوە.

فەقێ ماندوو بوو، چووە سەر کانیاوێك کە لەژێر گابەردێکی ئەولاترەوە هەڵدەقوڵاو لەنێو گوڵان دەنیشت. باڵندە سپیەکەش هات لەسەر لکی دەوەنێك کە گوڵی زەردی هەبوون هەڵنیشت. فەقێ دوای ئەوەی کەمێك حەسایەوەو چەند مست ئاوی خواردەوە، خورجینەکەی کردەوە، بوخچەکەی دەرهێنا، لەسەر چیمەنەکە رایخستو نانەبرنجو پەنیرو سەوزیو هەنگوینی دەرهێنا کە کۆچەرەکان بۆیان خستبووە ناو خورجینەوە، دەستی بەنانخواردن کرد. نیگای کەوتە سەر باڵندەکە کە لەسەر دەوەنێکی بەرانبەری هەڵنیشتبووو سەیری ئەوی دەکرد. یەکسەر هەستا لەتێك نانی هەڵگرت، بانگی کردو چوو لەپێش دەوەنەکە راوەستاو لەکاتێکدا هەروا سەیری دەکرد، وردە نانی بۆ خستە

سەر زەویەکەو چاوەڕێی کرد. باڵندەکە هەڵنەفڕی. بەبێهیچ جووڵەیەك لەشوێنی خۆی مایەوە، بەڵام کە فەقێ گەڕایەوەو لەجێگای خۆی دانیشتەوە، لەسەر لکی دەوەنەکە هاتەخوار، سەیری فەقێی کرد، پاشان بەدوودڵیەوە نووکی لەوردەنانەکان دا، لەماوەیەکی کورتدا هەموو وردە نانەکانی خوارد، ئینجا هەڵفڕی‌و چووە سەر لێوی کانیەکەو ئاوی خواردەوەو دووبارە هاتەوە لەسەر لکی دەوەنەکە هەڵنیشتەوە.

خۆر ئاوابوو، تاریکی هەموو لایەکی گرتەخۆی، باڵندەکە لەسەر لکی دەوەنەکە هەڵفڕی‌و هات‌و سێ جاران بەدەوری فەقێدا سووڕایەوەو دووبارە گەڕایەوەو چوو لەسەر هەمان لکی دەوەنەکە هەڵنیشتەوە.

فەقێ دوای ئەوەی ماوەیەك سەیری باڵندەی کرد لەسەر لکی دەوەنەکە هەڵنیشتبوو، خورجینی خستە ژێر سەری‌و خەوی لێکەوت.

خۆر خەریکبوو هەڵدەهات کە لەخەو هەستا. چووە پشت بەردەکان دەستی بەئاو گەیاند، گەڕایەوەو لەسەر کانی دەست‌و دەم‌و چاوی شوشت. باڵندەکە هێشتا هەر خەوتبوو، سەری خستبووە ژێر باڵەکانی. فەقێ بوخچەی لەنێو خورجینەکە دەرهێناو نانی تەنووری هەڵگرت، کەمێکی لێورد کردو داینایە لای دەوەنەکە. لەم ساتەدا باڵندەکە سەری لەژێر باڵەکانی دەرهێنا، باڵەکانی لێککردنەوەو خۆی لێککێشایەوە، تەکانێکی دایە خۆی، پاشان بۆلای ئاوەکە هەڵفڕی‌و لەبەردەم فەقێ نیشتەوە. لەکاتێکدا کە سەری بەرز دەکردەوەو دایدەهێنایەوە ئاوی خواردەوە، لەوێش فڕیەوەو چوو لەڕۆخ دەوەنەکە هەڵنیشتەوە، خێرا خێرا وردە نانەکانی خواردن.

یەکەمجار باڵندەکە خواردنی خۆی تەواو کرد ئینجا فەقێ. فەقێ چەند مست ئاوی کانیاوەکەشی بەسەر داکرد. کەمێك دواتر باڵندەکەش چووە سەر کانیاوەکە ئاوی خواردەوە، فەقێ هەستاو کەوتە رێ، باڵندەکە ئەمجارەش پێشاوپێشی رۆیشت. ریشە رەش‌و قەترانیەکەی فەقێ هەرکە تیشکی خۆری پێکەوت، لەڕەشیان سەوز هەڵگەڕا. فەقێ دەڕۆیشت‌و باڵندەکەش لەپێشیەوە بەئاسماندا دەفڕی. باڵندەکە سپیەکی هێند سیس بوو، کە فەقێ پێیوابوو تێکەڵی رووناکی دەبێت‌و لەبەرچاوان ون دەبێت، لەلایەك بیری دەکردەوە نەکا ئەو باڵندە سپیە هەمان باڵندەکەبێت، ئاە خۆزگە تەنها جارێك بخوێنێت، دەکرێت بەدەنگەکەیەوە بیناسین، خەمگین بوو، چاوەڕێی چریکەی باڵندەکە بوو.

ئەو رۆژە تا شەو داهات رۆیشتن. هەر لەگەڵ ئەوەی خۆر ئاوابوو، باڵندەکە هاتو سێ جاران بەدەوری فەقێ چەرخی داو سێ بازنەی نوورانی لەدوای خۆی جێهێشتو رۆیشت. زنارە شینەکانی دەوروبەری، کە رەگی سوورو نارنجیان تێدابوو، لەپڕ نوقمی نێو تاریکی بوون.

فەقێ لەبن بەردێك دانیشت، نانی خوارد، ئاوی خواردەوە، سەیری دەوروبەری خۆی کرد، نەیتوانی سێبەری باڵندەکە ببینێت، لەقووڵایی دڵیەوە هەستی بەتەنیایی کرد. ماندوو بووبوو، قاچەکانی لەبەر ئازار دەترینگانەوە، بنی پێی دەتگوت ئاگریان گرتووە، دەزوورانەوە. ئەستێرەکان لەنێو بیلبیلەی چاوەکانیدا خەویان لێکەوت. گزنگی نەدابوو، لەگەڵ دەنگی شرپەی شرپێك بەئاگاهات، بەترس‌و دڵەڕاوکێوە هەستاو هەرچی بەچواردەوری خۆیدا خولایەوەو سەیریکرد هەموو لای باڵندە بوون. ناچار بوو بڕوا، بەڵام لەبەر دیواری باڵندان نەیتوانی بچێتە پێش، بۆ دواوە گەڕایەوە، بەزەحمەت بەنێو باڵندەکان تێپەڕی‌و تەنها توانی خۆی بگەیەنێتە بن بەردی بەردەمی. نەیتوانی بەپێوە بوەستێت، لەبەر شرپە شرپی باڵ‌و دەنگی باڵندان خەریکبوو کەڕ دەبوو، تا ئەو دەوروبەرە رووناك بووەوە لەهەمان جێ لەنێو خۆیدا گرمۆڵە بووبوو، لەگەڵ رووناکبوونەوەدا هەستا. لەبەر خولانەوەو تێکقژقژانی باڵندان هیچ جێگایەك دیارنەبوو. لەگەڵ یەکەمین تیشکی خۆر، باڵی باڵندەکان درەوشانەوە. لەلایەك باڵندەی نارنجی‌و لەلای دی باڵندەی شین، سەوز، زەرد، سپی، مۆرو مسی رەنگەکان ئاوێتەی یەك نەدەبوون‌و هەر باڵندیەك لەنێو پۆلی خۆیدا باڵی لێکدەداو دەنگی پۆلەکانیش هیچ لەیەك نەدەچوون.

تا نیوەڕۆ ئاوا سەیری باڵندەکانی کرد، هەوڵیدا لەنێو دەنگی باڵندەکاندا دەنگی باڵندەی گۆرین ببیستێت، هیچ باڵندەو دەنگی هیچ باڵندەیەك لەباڵندەکەی نەدەکرد.

فەقێ مەست بووبوو، لەنێو بەهەشتێك لەرەنگەکاندا مەلەی دەکرد. لەناکاو بەهۆکارێکی نادیار، باڵندەکان بەسەر دوو پۆلدا دابەش بوون، لەو رێگایەی کە کردیانەوە باڵندە سپیەکە هات‌و لەکاتێکدا باڵەکانی لێکدەدا لەپێش ئەودا راوەستا. دواتر سێ جاران بەدەوری سەری فەقێدا چەرخی لێداو سێ بازنەی نوورانی لەئاسمانی سەر سەری فەقێ جێهێڵاو گەڕایەوەو رۆیشت. باڵندەکانی دی بەدوای باڵندە سپیەکە لەشەقەی باڵیان داو رۆیشتن.

فـەقێ بەهەسـتێکی پـڕ لەشـادیو بـەجۆشو خـرۆشو لەگـەڵ ئـەو باڵندانـەی کـە بەئاسمانی بان سەریەوە دەفڕینو هـەروەها بـەو بـاوەڕەی کـە ڕۆژێـك ئـەو باڵندەیـە هـەر دەدۆزێتەوە، کەوتەڕێ. ڕێگاکـە گرتیـە خـۆیو بـۆ گونـدێکی بـرد. گوندەکـە لەناوەڕاسـتی دەشتێکی سەوزو تەختیایی بووو هەر چواردەوریشی دارستان بوو.

گوندنشینەکان وەکو دۆستێكو وەکو میرێـك پێشوازیان لێکـرد. فـەقێ سـێ ڕۆژ لـەوێ مایـەوە. ئاغـای گونـد کـڵاشو جلوبـەرگی تـازەی دایـێ، وەکـو شـای ئێـران ڕێزیـان لێنـاو پێیانگوت: "بەخێرچیتو ئینشاللا بتوانیت ئەو باڵندەیە ببینیت"و بەڕێیان کرد.

فەقێ بەکڵاشو جلوبەرگی تازە بەناوەڕاستی دەشتدا ڕێـی گرتەبـەر، لەهـەمان ئـەو کاتــەدا ســێ چــین قــورینگ لەچــیای بەرامبەریــەوە بــۆلای هــاتن، کــەمێك دواتــر، قورینگـەکان هـاتنو لەبـەردەم فـەقێ لەسـەر زەوی نیشـتنەوە. فـەقێ ڕاوەسـتا. هـەموو قورینگـەکان کاکۆڵیـان هـەبوو. فـەقێ زۆر قـورینگی دیبـوون، دەنگیـان لـەهیچ یـەك لەباڵندەکانی دیکە نەدەچوو. سەیر بوو، قاچدرێژو گەردندرێژ بوون. ساڵدانە ساڵدانە بەنازەوە دەڕۆیشتن. لەژێر نووکی باڵەکانیاندا ڕشتەی سەوزو سوورو زەردبـاو ئـاوێزان بـوو، لەبـەر تیشـکی خـۆردا دەبریسـکانەوە. فـەقێ بەحەپەسـاویەوە سـەیری ڕشـتە باریکـەکانیانی دەکـرد، لـەپڕ باڵنـدە سپیەکە کـە دیـار نـەبوو لـەکوێ هـاتبووو کـەی پەیـدابوو. سـێ بازنـەی نـوورانی لـەدوای خـۆی بەجێهێشـت. پاشـان ڕۆیشـتو بەسـەر قورینگەکانــدا دەســتی بــەفڕین کــرد. هەنــدێکجار بــۆ ئاســمــان بــەرز دەبــووەوە، هەنــدێکجاریش شــۆڕیدەکردەوەو دەهاتــە نێــو پــۆلی باڵنــدەکانو لەنێوەڕاســتیان هەڵدەنیشت. بەرز بووەوە، هاتەوەخوار، دیسان بەرز بووەوەو هاتەوەخوار. دوای ئەوەی سێ جاران بەسەر سەری قورینگێکی قەبارە گەورەی کاکۆڵدرێژو بریقەدار چـەرخی دا، وەکـو تـیری سـەرەوژوور بـۆ ئاسمـان تێیهـەڵکردەوە. لـەدەوری قورینگەکـە سـێ بازنـەی زەردباوی بەجێهێلا. لەگەڵ فڕینی ئەو باڵندەیە باڵندەکانی دیکەش هەموویان پێکـەوە دایانە شەقەی باڵو لەئاسماندا بوونە سێ ڕیز. فەقێش وەڕێکەوت، لەزەویە هەموارەکە ڕەت بووو گەیشتە شوێنێك کە پڕ بوو لەدەوەنەجاڕی گەز. دەوەنە گەزەکان تا قەدپاڵی چیایەك کە لەدوورەوە دیاربوو، درێژبووبوونەوە. لەنێو دەوەنە گەزەکاندا تا چاو بـڕی دەکرد گوڵی ڕەنگـاو ڕەنگی پفـدراو ڕوابـوون. فـەقێ لـەنێو ڕەنگەکانـدا سەرمەسـتانەو وەك ئەوەی مەلە بکات بۆ پێشەوە دەڕۆیشتو بیری دەکردەوە کە ئەو باڵندەیـە دەبێـت لەجێگایەکی ئاوابێت. بەردەوام چاوەڕێی بیستنی دەنگی باڵندەکە بوو. هەروا کە بـیری

دەکـرردەوە، باڵندەیـەك لەبەرامبەریـدا باڵـەکانی لێکـدانو هـەڵفڕیو پاشـان دووبـارە گەڕایەوەو ماوەیەك لەبەرامبەریـدا راوەسـتا. باڵـەکانی سـەوز سـەوزو جەسـتەی شـینو سنگی تەواو زەرد بوو. رەنگەکانی تۆخو گەشو بریقـەدار بـوون. ئەگـەر فـەقێ دەسـتی درێژکردبایە دەیتوانی باڵندەکە بگرێت. بتەوێت یان نا دەستی بۆ درێژ کرد، باڵندەکـە لەسـەر لکـی دەوەنـە گـەزێکی نزیـك خـۆی هەڵنیشـت. فـەقێ دوو هـەنگاوی لێنزیـك کەوتەوە. باڵندەکە بەسەر لکەکەوە بوو. هەر لەگەڵ ئـەوەی دەسـتی بـۆ بـرد، باڵندەکـە فڕیو چوو لەسەر لکی دەوەنێکـی بەرانبـەریـدا نیشـتەوە. فـەقێ بـەهێمنی لەدەوەنەکـە نزیـك بـووەوە، دەسـتی درێـژ کـردو زۆری نـەمابوو باڵندەکـە بگرێـت، باڵنـدە لـەناکاو هەڵفڕیو چوو لەسەر لکێکی دیکە نیشتەوە. فەقێ لەباڵندەکە نزیك کەوتـەوە، دەسـتی درێژ کرد، باڵندەکە لەنێو دەستەکانی بوو کە دیسان باڵەکانی لێکدانو رۆیشت لەسـەر لکێکی دیکە نیشتەوە. فەقێ دەستی درێژ کرد، باڵنـدە لـەنێو دەسـتی خلیسکا. باڵنـدەو فەقێ ئاوا تا بناری چیایەکە رۆیشتن. فەقێ لەدڵی خۆیدا دەیگوت ئیدی لکێك نـەما تـا لەسەری بنیشێتەوە. لەسەر دوایین لکدا دەیگرم، باڵندە دایـە شـەقەی بـاڵو لەئاسمانـدا وەکو کۆتری تەقڵەباز تەقڵەیەکی لێداو دووبارە گەڕایەوەو هات لەسـەر لکـە دەوەنێکـی دواوەتـر نیشـتەوە. فـەقێ پێیوابـوو ئـەمجارە بـێ سـێو دوو دەیگرێـت، بـەڵام دیسـان باڵندەکەی لەنێو دەستی دەرچوو. فەقێ لەجێی خۆی مایـەوە. باڵنـدە بەسـەر لکەکـەوە رووەو فـەقێ هەڵنیشـتبووو چـاوەڕێ بـوو، نیگاکانیـان لێکگیربـوو، ئەفسـوون بووبـوون، نەیانـدەتوانی چـاو لەسـەر یەکـدی هـەڵبگرن، شـەو داهـات، فـەقێو باڵندەکـە هـەروا بەرامبـەر یەکـدی راوەسـتابوون. فـەقێ مانـدوو بووبـوو، بنـی پێـی دەترینگایـەوە، قاچـەکانی دەلـەرزین، فـەقێ بیریکـردەوە، باڵنـدەش مانـدوو بـووە هـەنگاوێك بـۆلای باڵندەکە چووە پێشو راوەستا. باڵندەکە تەنانەت نەشجووڵا. هـەنگاوێکی دیکـە، یـەکی دیکە، باڵنـدە نـەفڕی. فـەقێ دەسـتی درێـژ کـردو رێـك لـەو دەمـەی پێیوابـوو خەریکـە باڵندەکە دەگرێت، باڵندە لەنێو دەستی خلیسکاو چوو لەسەر لکێکی ئـەولاتر نیشـتەوە. لەبەرخۆیـەوە گـوتی، نـەکا ئەمـە هـەمان باڵندەکـە بێـت، ئـاە، خۆزگـە دەیخوێنـدو دەنگەکەیم دەبیست. دروست لەم کاتەدا لەسـەرەوەڕا، لـەلای ئاسمـانی نیـوە رووناکـەوە، باڵندە سپیەکە شۆڕ بووەوە خوارێ، سێ جاران بەدەوری فەقێدا خولایەوە، سێ بازنـەی نووری لەدوای خۆی جێهێڵانو چوو لەتەك باڵندەکە نیشتەوە. ماوەیـەکی بـاش لەسـەر لکی دەوەنەکە مانەوەو تەکانیان نەخوارد. سێبەرەکانیان هـەروا لەتەنیشت یەکدیـەوە

بوو. فەقێش نەیدەتوانی تەکان بخوات‌و چاو لەسەر سێبەرەکانیان وەلا بدات. لەبرسان سگی قوڕەقۆڕی بوو، ئەژنۆکانی دەلەرزین‌و سەری دەسووڕا. ئەوکاتەی کە خەریکبوو بیری لەوە دەکردەوە، ئەو باڵندانە بەجێبێڵێت‌و بڕوات، هەردوو باڵندەکە دەستیانکرد بەخوێندن. پاشان لەشەقەی باڵیان داو ڕۆیشتن. باڵندەی سپی ئەمجارە بەدەوری فەقێدا چەرخی لێنەدان.

فەقێ دوای هەڵفڕینی باڵندەکان لەهەمان شوێنی کە لێبوو لەسەر ئەژنۆکانی دانیشت. بەزەحمەت زارکی خورجینەکەی کردەوە، پارووێك نانی لەبوخچەکە دەرهێنا، هێشتا لەنانخواردن نەبووبووەوە، کە خورجینی خستە ژێر سەری‌و یەکسەریش خەوت.

بەیانی بەر لەهەڵاتنی خۆر لەخەو هەستا. هەر لەگەڵ ئەوەی لەخەو هەستا باڵندەی شین‌و باڵندەی سپی بینین، کە بەئاسمانی بان سەریەوە دەخولانەوە. رووناکیەکی ئومێد زایە دڵیەوە. لەبناری چیاکە دارچنارێکی گەورەو بڵند بەدی دەکرا. لەگەڵ باڵندەکانی بان سەری بەرەو لای دارچنارەکە وەڕێکەوت، کانیەك لەژێر دارچنارەکە بوو، دانیشت بوخچەی خواردنەکانی کردەوەو خۆی تێرکرد. باڵندەکان هێشتا لەسەرەوە باڵەکانیان هێواش هێواش دەهەژاندن.

باڵندەکان دابەزین، ئەوەندە نەوی بوونەوە ڕێك کەوتنە بەرامبەری. رەنگی شین‌و سپی باڵندەکان ڕۆچووە ناو ئێسقانەکانی.

فەقێ وەڕێکەوت. سەری هەڵبڕی‌و سەیرێکی ئاسمانی کرد، باڵندە شینە گەورەکەو باڵندە سپیە بچووکەکە، هەردووکیان دیار نەمابوون. نیگەران بوو. لەژێر درەختێکی پان‌و پۆڕی داپۆشراو بەگوڵی وەنەوشەیی چاوەڕێی کردن، باڵندەکان نەهاتن. خەریکبوو نائومێد دەبوو. نەیتوانی ئەو باڵندەیە ببینێت‌و دەنگەکەی ببیستێت، بەڵام سەرەنجام هەر بەئاوات دەگات. بڕیاری خۆی دابوو. یان باڵندەکە دەبینێت، یان لەم ڕێگایەو لەم کێوو دەشتانەدا دەمرێت.

تورۆس‌و ئامانۆس‌و چوکوراڤا گەڕاو فورات‌و دیجلەی لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر بینیبوون.

لەگەڵ رەوەی کارمامزان جێگایەك نەمابوو نەگەڕابێت، جوودی، زاگرۆس، شنگال. لەچیاکانی ئەلەزیز هەموو دۆڵ‌و دەشت‌و لوتکەی چیاکان‌و هەروەها دارو درەخت‌و جەنگەڵەکانیش گەڕابووو بینیبوونی.

لەپێدەشتەکاندا بێژمار پەپوولەی رەنگاو رەنگ، لەدۆڵەکاندا تا تۆ بتەوێت گوڵی گەش‌و جۆراوجۆرو تا زار هەڵبگرێت باڵندەی بەئاسمانەوەو بەسەر چڵی دارو

درەختەکانــەوە بینیبــوون، ڕێکــەوتی کەســانێکی زۆر میواننــەوازو میهرەبــانو ڕووخــۆش بووبــووەوە. لەدرێــژەی ڕێگــادا، لــەزۆر شــوێنی جیاجیــادا شــیری ئاســكو بــزنو مــاینو هەنگوینی گوڵبۆی خواردبوو.

لــەنێو ڕەشمــاڵی ڕەوەنــدان، لەدێهاتــەکان، شارۆچــکەکانو شــارە گــەورەکانو کێــوو دەشــتەکاندا بەئەنــدازەی مــاڵی خــۆی هەســتی بەئاســوودەیی کردبــوو. خــەڵکانێکی زۆری بینیبووو لەگەڵ مرۆڤگەلێکی بێژمار بووبــووە دۆســت، گــوێی لەســترانی زۆر لەدەنگبێــژان گرتبووو لەسێ دەنگبێــژ داســتانی ئــەو باڵندەیــەی بیســتبووو هــەموو جارێکیش بــەخۆی گوتبوو، من دەنگــی ئــەو باڵندەیــە دەبیســتمو ئــەو باڵندەیــە دەبیــنم، ئیبنــو عــەرەبی یــان عــارفێکی دیکــە گوتبــووی: "ڕوخساری هــەموو مرۆڤــەکان لەحــەزرەتی ئادەمــەوە تــا ڕۆژی قیامەت دەبینم".

من هەموو باڵندەکانی دونیام بینین، ئەو باڵندەیەش دەبینم.

فەقێ لاوازتــر بووبووو بەژنی درێژتــر دەهاتە بەرچــاو، ڕیشە قەترانیەکــەی تــا ســنگی هــاتبووو بەچــاوانی گەشــی ئاوێتــەی شــادی، خــەم، ئــازار، نائومێــدی، گومــانو دوو دڵــی، بەکڵاشو عەبای سورمەدۆزی سەرشانیو شەلوار، کڵاوی ئاوریشــمیو بەقــەدو قیافــەتێکی ڕێكو سەرنجڕاکێشەوە، لەدوندی چیاوە یەکڕاست بۆ خوارەوە دەڕۆیشت. قەدپاڵی چیاکە بەگوێنی پانو پۆڕ داپۆشرابوون. هەر گوێنیــەك ئەنــدازەی ئوجــاغێکی گرتبــوو، هــەزاران گــوڵو گــولیلکی وردیلــەی پەمــەییو شــینی بریقــەدار لــەو نــاوە بەدیــدەکرانو ئــەو بنــارە بەتەواوی پەمەیی دەچووەوە. تەمێکی تێکەڵ بەرەنگی پەمەییو شین بەئاسمانــەوە بــووو لەگەڵ ڕەنگەکان دەهاتو دەچوو. فەقێ کەوتبووە نێو خەیاڵەوە، لەنێو ئەو تەمە تــەنكو مەخمەڵیە شینباوەدا تەنها بەرپێی خۆی دەبینــی. لەســەر ئــەو تەمــە شــینباوەدا بارانێــك لەڕۆشنایی بەدیدەکرا.

فەقێ کاتێك گوێی لەدەنگی زەنگوڵەیەك بوو کە لەخوارەوە دەهات، هاتەوە سەرخۆی. شــوانێکی لەبەرانبەرخۆیــدا بینــی کــە بەکەپــەنکێکی ســپیو بزنەکانیــەوە لەتەنیشــت زنارەکان ڕاوەستابوو. سڵاویان لێککردو کەوتنە ئاخــاوتن. شــوانەکە کاتێــك ئەنگوســتیلەی پەنجەی فەقێی بینی تێگەیشت کە کوڕە میرە. ئەو هەواڵەی بیستبوو کە کوڕە میرێك لەم ناوچــەیەدا بــەدوای باڵندەیەکــدا دەگــەڕێت. بەسەرســامیو کونجکــۆڵیو لەهــەمان کاتــدا بەڕێزەوە سەیری دەکرد، گوتی: "ئاغا، لەپشت ئەم زنارانە کانیــەك هەیــە، بــڕۆ لــەوێ ئــاو بخۆرەوە، منیش خواردنت بۆ دێنم".

فـەقێ چـووە پشـت زنارەکـان، زۆر تینـوو بـوو، ئـاوی خـواردەوەو گەڕایـەوە. کـەمێك دواتـر، شـوانەکە بـەجامێکی گـەورەوە هاتـەوە. لەتوورەگەکـەی نـانی تـەنووری دەرهێنـا. جامی شیرو نانەکـەی دانایـە سـەر تاتەبـەردێکی سافو گـوتی: "فـەرموو ئاغـا، شیرم بـۆ لەبزنە مەرەز دۆشیوی، شیفابەخشە".

"سوپاس".

فەقێ نانو شیرەکەی خـوارد، پشـتی بەبەردێکـەوە دا، چـاوەکانی لێکنـان، زۆر مانـدوو بووبوو، خەوت. کە لەخەو هەستا، نزیکی نیـوەڕۆ بـوو، شـوانەکە دووبـارە شـیری دۆشـیو هێنای. شوان لەناو جانتاکەیدا قاورمەو نانی دەرهێنا. پەنیری دانایـە سـەر تاتەبەردەکـە. بەو ئـاگرەی کـە کردبوویـەوە خواردنەکـەی گـەرمکردەوە. قاورمـەی زۆر زوو لێدەنـدرێت. بێئەوەی قسەیەك بکەن. بەبێـدەنگی نانەکـەیان خـوارد. دەسـتیان لەسـەر کـانی شوشـتو هـاتن لەشـوێنی خۆیـان دانیشـتنەوە. رێـك لـەو سـاتەدا فـەقێ چـاوی هـەڵبڕیو سـەیری ئاسمـانی کـرد، ماوەیـەك ئـاوا مایـەوە. شـادی لەسـەراپایدا دەبـاری. شـادیەکەی شوانیشـی گرتەوە. شوانەکەش سەری هەڵبڕیو سەیری ئاسمانی کرد.

"ئەمانە زۆر لەمێژە رۆیشتوون، وا گەڕانەوە".

فەقێ ئەوەندە خۆشحاڵ بووبوو، لەشوانی نەپرسی کێ رۆیشتوونو گەڕاونەتەوە.

فەقێ هەستا، خورجینی خستە سەرشانی، بەشوانەکەی گوت: "خواحـافیز". لەکاتێکـدا کــە لەگــەڵ ئــەو باڵندانــەی لەئاسمانــدا بووبــوون بەتۆپــەڵێك لەشــادی، وەڕێکــەوت. لەچـاوترووکانێکدا خـۆی گەیانـدە نـاو دارسـتانو هاتـەوەدەر. دەشـتێکی کـاکی بـەکاکی لەبەرانبەری بووو بەچیمەنو جۆرەها گوڵ داپۆشرابوو.

فــەقێ لەســەرەتای دەشــتەکە راوەســتا. بیریکــردەوە بــەکام لادا بــڕوات. دوودڵ بــوو، بیرکردنەوەکـەی درێـژەی کێشـا. سـەیری ئاسمـانی کـرد. باڵنـدەکان شـۆڕ بوونـەوەو هـەر هێندەی دارسپیندارێك لەبان سەری ئەودا دەفڕین.

فەقێ راوەستاو سەیری کردن. هاتە نێوەڕاسـتی دەشـتەکە. لەسـێ هـەنگاوی بـەردێکی سـپی بـەڕەگی سـوورتر لەبـەردە چـەخماخیەکان راوەسـتان. ئـەو باڵندانـەی کـە لەسـەر بەردەکـە نیشـتبوونەوە، کـەمێك دواتـر هـەڵفڕین. فـەقێش بـەدوای ئەوانـدا کەوتـە رێ. هەلۆیـەکی سـووری بچـووك لەئاسمانـدا باڵـەکانی لێکبلاوکردبـوونو هـێمنو لەسـەرخۆ دەفـڕی. باڵنـدەکانی بەرانبەریشـی باڵـەکانیان کردنـەوەو لەئاسمانـەوە شـۆڕبوونەوە. دەم

بەدەم باڵەکانیان لێکدەداو دووبارە بۆ ئەملاو ئەولا شۆڕ دەبوونەوە. لەپڕ باڵەکانیان لێکداو فڕین و ئیدی لەبەرچاوان ون بوون, دوای ماوەیەك دیسان گەڕانەوە. فەقێ هەر کە سەیری لای چەپی کرد هالاوێکی شێوە تۆپەڵی ڕۆشنایی بینی. بەرەو لای تۆپەڵە هالاوەکە چوو، هالاوە ڕۆشناییەکە تا دەهات زیاتر ڕۆشن دەبوو، باڵندەکان زووتر لەو گەیشتنە هالاوە ڕۆشناییەکە، لەکاتێکدا کە بۆ سەرێ و خوارێ دەچوون، دەستیانکرد بەخولانەوە بەدەوریدا. فەقێ تا لەهالاوەکە نزیکتر دەبووەوە هالاوەکە تەنکتر دەبووو ئەو ڕۆشناییەی لەهالاوەکە بەجێدەما بریقەدارتر دەبوو. فەقێ نزیك بووەوە. ئارام ئارام هات و لەتۆپەڵە ڕۆشناییەکە نزیك بووەوە، بیریکردەوە ئەگەر چاوەکانی نەقوچێنێت کوێر دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا، نەیتوانی چاوەکانی بنوقێنێت و سەیری هالاوەکە نەکات، چاوەکانی داخست و کردنیەوە. ماوەیەك چاوەڕێ ما، چاوەکانی کردنەوە، بیریکردەوە ئەگەر کوێریش ببێت دەبێت سەر لەو تۆپەڵە ڕۆشناییە دەربکات. نەیتوانی بەرگە بگرێت، چاوەکانی نوقاند، بەڵام ئەوەی بۆ روون بووەوە کە ئەو تۆپەڵە ڕۆشناییەی رووبەڕووی، پەڕی باڵندەیەکە. لەکاتێکدا دەستی کردبووە نوای چاوەکانی، خۆی درێژ کردو پەڕەمووچەکەی لەسەر چیمەنەکان هەلگرتەوەو خستیە نێو گیرفانی لای چەپی عەباکەی. باڵندەکان گەڕانەوە سەر بەردە چەخماخیەکەو دوای ماوەیەکی کورت لەوێشەوە ڕۆیشتن بۆ جێگایەکی دیکە.

هالاوێکی ڕۆشنایی دیکەی لەدوور دوورەوە بینی. بەڕاکردن رایکردو خۆی خستە نێو هالاوەکە، پەڕەمووچەکەی هەلگرتەوەو خستیە گیرفانی سەر دڵی. لەولای دەشتەکە هالاوێکی دیکەی بینی. بۆ ئەولا رایکرد، چووە نێو هالاوەکە، پەڕەمووچەکەی ئەوێ درەوشاوەتر بوو، ئەویشی هەلگرتەوەو خستیە گیرفانی سەر سنگی. گەڕایەوە لای بەردە چەخماخیەکە. گۆڕا بوو بۆ مرۆڤێکی نوورانی و یەکپارچە لەڕۆشنایی.

خۆرئاوا بوو، تاریکی داهات، بەڵام هەموو لایەك نوقمی نێو ڕۆشنایی بوو. لەشەوق و شادیدا مەست بووبوو، پشتی بەبەردەکەوەدا، سەیری ئاسمانی کرد، هەردوو باڵندە سپی و شینەکە لەنێو ڕۆشناییدا بەملاو ئەولادا سەرەوژێر دەبوونەوە. بێئەوەی پارووێك نان، یان چۆڕە ئاوێك بخواتەوە، چاوەکانی لێکنان و خەوی لێکەوت.

تاریکیەکە هێند خەست بوو گوللە نەیدەبڕی. هیچ ئەستێرەیەك بەئاسمانەوە نەبوو. نە شنەبایەك دەبزواو نە دەنگی زیندەوەرێك دەهات، نە گەڵاو گوڵ و گیاو گوڵێك

خشەخشی دەهات، فەقێ وەکو بەردێکی لێهاتبووو کەوتبووە خەوێکی قووڵەوە. نیوەشەو لەپڕ لەخەو هەستا. کاتێك کەمێك هاتەوە سەرخۆی دەنگی شرپە شرپی باڵی باڵندە سپیو شینەکانی بیست، کە بەئاسمانی سەر سەریەوە باڵەفڕەیان بوو. سەری بەرزکردەوەو بینیانی. باڵی باڵندەکان بەرزو نزم دەبوونەوە. لەدوورەوە تروسکاییەك شەوەزەنگەکەی رۆشن کردبووەوە. فەقێ رێك بەرەو لای تروسکاییەکە رایکرد. لەنزیکی رۆشناییەکە راوەستا، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ترساو چاوەکانی نوقاند، رۆشناییەکەی بەرانبەری رۆچووە مۆخی ئێسقانەکانی. ماوەیەك ئاوا چاوەکانی داخستنو پاش ئەوەی کە رووی کردە ئەو باڵندانەی بەرامبەری باڵەکانیان لێکدەدا، چاوەکانی کردنەوە. باڵندەکان نوقمی نێو رۆشنایی بوون. لەگەڵ ئەوەش فەقێ دەیتوانی سەیریان بکات. لەتۆپەڵە رۆشناییەکە نزیك بووبووەوە. دەستی بەئارامی بەرەو پەڕەمووچەکە درێژ کردو هەڵیگرتەوەو خستیە نێو خورجینەکەو هاوکات لەتەنیشت خۆیەوە تۆپەڵە رۆشناییەکی دیکەشی بینی. رۆشناییەکە لەنێو دڵی تاریکیدا بەبەرزایی دارسپینداریێك بەرز بووەوەو ئینجا لەگۆڕەپانێکی فراوان پان بووەوە. بەڕاکردن خۆی گەیاندە ئەوێو ئەو پەڕەمووچەی لەوێ کەوتبوو هەڵیگرتەوەو گەڕایەوەو پشتی بەبەردەکە دایەوە. بیریکردەوە، نهێنیەك لەم بەزمەدا هەیە. لەبەر جۆشو خرۆشو وروژاندا نەیدەتوانی بخەوێت، رۆشنایی ئەو پەڕەمووچانەی کە خستبوونیە نێو خورجینەکەی، شەویان رۆشن کردبووەوەو بەردە چەخماخیەکەی کردبووە پارچە ئەڵماسێکی تراشکراو. لەو حاڵەتەی خەوو بێداریدا دەنگی باڵندەیەکی کەوتە بەرگوێ، بێدار بووەوە. هەر لەگەڵ بیستنی دەنگی باڵندەکە هەستی بەخۆشحاڵی کرد. خۆی سپاردە هەستی شادیێکی مەستکەرانە. باڵندەکە جارێکی دیکە تێیچریکاند. نوقمی نێو هەستی بەختەوەری بوو. باڵندەکە دوای ئەوەی سێ جاران خوێندی بەرەو ئاسمان هەڵفڕی. ئەو باڵندانەی لەژوور سەریشەوە بوون دەستیان بەنەغمەخوانی کرد. پێی خستە نێو بەهەشتی بەختەوەریەوە، گەیشتە جاویدانی. هەموو گیانی مەست بوو. تا ئێستا ئاوا چێژی بەختەوەریو مەستی تام نەکردبوو. ئاگای لەخۆی نەمابووو لەدونیایەکی دیکەدا بوو. ئەم دەنگە دەنگی باڵندەکە بوو.

باڵندەکە پەیاپەی چەند جارێکی دیکەش تێهەڵکردە نەغمەخوانی. ئەو ئیدی کۆنترۆڵی خۆی لەدەست دابوو. دەستیکرد بەسەماو خولانەوە بەدەوری خۆیدا. بەچەشنێك کە هیچکەس سەمای ئاوای نەبینیبووو نەبیستبووی. وەها مەستو

سەرخۆش بووبووو خۆی لەبەهەشتێکی وەها دەبینی کە دەیتوانی تا دوا تەمەنی ئاوا سەما بکاتو هەڵبپەڕێت.

بای بەیانی هەڵیکرد، خۆر کەم کەم خەریکبوو دەردەکەوت، فەقێ هەروا خەریکبوو بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە، کەمێك دواتر باڵندەیەك لەڕۆشنایی لەبەرانبەریدا نیشتەوە. فەقێ لەگەڵ ئەوەی چاوی بەباڵندەکە کەوت چاوەکانی نووقاند، سێبەری رۆشناییەکە وەکو بەردێك بەسەریدا کەوت. کە بەخۆی هاتەوە خۆر هەڵاتبوو، نزیکەی نیوەڕۆ بووو باڵندەکەش لەشەقەی باڵانی دابووو رۆیشتبوو.

فەقێ رێی گرتەبەر. هەر بەدەم رێگا بڕینەوە تێیهەڵکردە گۆرانیان، گۆرانییێکی بۆ ئەو باڵندەیە دانا کە دەنگی دەبیستراو خۆی نەدەبیندرا. بەهەر گوندو شارو شارۆچکەیەکەدا تێپەڕی گۆرانیەکەی دووبارە کردەوە. هیچ نەیو سازێکی پێنەبوو، بەڵام بەدەنگی خۆی بیسەرانی مەستو شەیدا دەکرد. دەچووە هەر جێگایەکیش لەخەڵکەکەی دەپرسی لەکوێ باشترین نەیو ساز دروست دەکرێت. پیرێکی فانی ناونیشانی هەندێك وەستای پێگوت کە لەشاری بەغدا بوون. پیادەو بەسواری ئەسپ خۆی گەیاندە بەغدا. چەند بەپێیان رۆیشت، چەند بەسواری ئەسپ، نازانێت. رۆژێك خۆی لەبەغدا بینیەوە. لەمیوانخانەیەکی خۆشدا دابەزی. لەوێ لەگەڵ میوانەکانو بەغداییەکاندا ئاشنابوو. زۆر بەر لەوەی خۆی بگاتە ئەوێ ناوو ناوبانگی گەیشتبووو ئەویان بەتەیرانی دەنگبێژو فەقێ تەیران ناو نابوو.

تەیرانی دەنگبێژ، بەر لەهەموو شتێك چووە سۆراغی باشترین بەرگدرووی بەغداو بۆخۆی دەستێك جلوبەرگی بەڕادان دا. پاشان پێڵاو ئێلەگ، جلەکانی ژێرەوە... چووە گەرماو، ئینجا جلوبەرگە تازەکانی کردنەبەر. فەقێ پیاوێکی قۆزو هەڵکەوتوو بوو. کاتێك خۆی شیکپۆش دەکردو لەکۆچەو کۆڵانەکاندا دەردەکەوت.، خەڵکی نەیاندەتوانی چاوی لەسەر هەڵبگرن.

یەکەمجار ماڵی وەستای نەیسازی دۆزیەوە. وەستا بەرووخۆشیەوە پێشوازی لێکردو بەڕێزەوە بردیە ژوورێك کە شتەکان بەشێوەیەکی جوان داندرابوون.

"ناوم فەقێ تەیرانە".

"تەمەن درێژ بیت فەقێ تەیران".

کابرای نەیساز پیاوێکی ریشسپی، روخسار نوورانیو رووخۆش بوو.

"ناوێکی دیکەشم هەیە، پێمدەڵێن تەیرانی دەنگبێژ، هەندێکیش پێمدەڵێن فەقێ تەیران".

"ئینشاللاّ هەزار ساڵ تەمەن بکەیت. ناوەکەت بەر لەخۆت هاتۆتە بەغدا، مەگەر تۆ هەمان ئەو کەسە نیت کە دوای بینینی باڵندەکە بوویتە ئەم دەنگبێژە؟"

فەقێ سوور هەلگەڕا. نەیتوانی قسەیەك بکات.

ماوەیەکی باش پێکەوە قسەیان کرد. فەقێ باسی هەموو ئەو ڕووداوو بەسەرهاتانەی بۆ کرد کە بەسەری هاتبوون.

"نەیەك‌و سازێکت دەوێت؟"

"بەڵێ پیری من".

"ئێرە مەڵبەندی نەیسازانە، لێرە زۆر نەیان دروست ناکەن، ساڵی تەنها حەوت دانە دروست دەکەن. ئێرە لەوەتەی بۆتە مەڵبەندی نەیسازی، ئەم نەریت‌و بنەمایە هەیە".

هەروا بوو، هەموو ئاوازخوێن‌و دەنگبێژە گەورەکانی مەزۆپۆتامیا، بۆ ئەوەی کە نەیی خۆیان لەپیر وەربگرن، چەندین ساڵ سەبریان دەگرت. ئەمە، نەریتێك بوو کە بۆ سەدان ساڵ دەگەڕایەوە. لەباوو باپیرانەوە پشت بەپشت هاتبوو.

"من ئێستا هیچ نەیەکم نیە فەقێ تەیران. دەبێت سەبر بگریت".

"چەند دەبێت سەبر بگرم پیری من؟"

"سێ ساڵ".

"من چۆن دەتوانم سێ ساڵ سەبر بگرم؟ چۆن دەتوانم بەبێنەی‌و بێداستان ئەو هەموو ماوەیە بەرگە بگرم؟ چۆن دەتوانم بژیم؟"

پیر دەستی بەریشی داهێنا، سەری دانەواندو چووە بیرکردنەوەوە. ماوەیەکی زۆر بەبێدەنگی تێپەڕی. پاشان بەدەم پێکەنینەوە سەری هەڵبڕی:

"ئێستا دەمەوێت تاقیت بکەمەوە. ئێمە لێرە دانەیەك نەیمان هەیە. دیار نیە لەکەیەوە لێرەیە. دووسەد ساڵ، سێسەد ساڵ، پێنجسەد ساڵ، دیار نیە. قامیشەکەی یان لەو جۆرانەیە کە هەرگیز نارزن‌و تێکناچن، یان جادووییە. تا ئێستا زۆر کەم لەئاوازخوێن‌و دەنگبێژەکان توانیویانە بیژەنن، ئەوانەی کە دەیانتوانی بیژەنن نەیەکەیان وەردەگرت‌و وەسیەتیان دەکرد دوای مردنیان بیگەڕێننەوە بۆ شوێنی خۆی. تا ئێستا هەموو وەسیەتەکان جێبەجێکراون‌و نەیەکە لێرەیە لەمەڵبەند".

پیر هەستا، گوتی: "تۆ هەر لێرە دابنیشە، من زوو دەگەڕێمەوە".

دوای ماوەیەکی درێژ پیر بەدانەیەك نەیەوە گەڕایەوە. فەقێ سەیرێکی کیفکی نەیەکەی کرد، نە نەخش‌و نیگارێکی پێوەبووو نە دەشبریقایەوە. پیر نەی لەکیفکەکەی دەرهێنا. نەیەکی ئاسایی بووو هیچ تایبەتمەندییێکی پێوە دیارنەبوو، بۆلای فەقێی درێژ کرد و پێیگوت: "بیگرە تۆش تاقیکردنەوەیەك بکە. خوا یارمەتیدەرت بێت. ئەو باڵندەیە هەروەك چۆن توانای ئاوازخوێندنی پێتبەخشیوە. ئەو توانایەشت پێدەبەخشێت کە بتوانیت نەی بژەنیت".

فەقێ نەیەکەی گرتە دەستیەوە، سەیری ئەملا و ئەولاو سەرو خوارو کونەکانی کرد، بەڵام هیچشتێکی سەیری تێدا بەدینەکرد. نەیی شوانەکان رواڵەتێکی جوانتریان هەبوو. دەبوا ئەم نەیەی چۆن بژەنیبا. دەستەکانی دەلەرزین. پیر کاتێك بینی فەقێ دوودڵە پێیگوت: "بیژەنە فەقێ، بیژەنە کوڕم!"

ئەدای دەربڕینی پیر فەرماندەرانە بوو.

فەقێ سەری نەیەکەی خستە سەر لێوە لەرزانەکانی‌و دەستی بەژەنین کرد. دەنگ‌و نەوای وا لەنەیەکە دەردەچوون کە فەقێ هەست‌و هۆشی لەخۆی نەما.

نەیدەزانی شێوەی ژەنینی ئەم نەیەی پێشتر زانیوە یان نەیەکە خۆی ئاوا دەنگ‌و ئاوازان پەخش دەکات. تا زیاتری دەژەند، دەنگەکە دڵەنگیزتر دەبوو. سەرەنجام کەوتە حاڵ‌و هەوایەکی وا کە دەتگوت بەبینی باڵندەکە لەبەهەشت بێت‌و بەباڵ بفڕێت.

فەقێ نەیەکەی دانەنا، لەژەنینی بەردەوام بوو. ئێستا خۆی وەك ئەوەی ون بووبێت‌و تەنهاو تەنها دەنگی نەی لەوێ بەجێمابوو.

سەرەنجام پیر گوتی: "دەست هەڵبگرە فەقێ. لەوە زیاتر ناتوانم بەرگە بگرم. دڵت دەرهێنام‌و بردت. تا ئێستا هیچکەس نەیتوانیوە ئەم نەیە وەکو تۆ لێبدات. نەی بۆ تۆیە. ئێستا بابچین سازێکیشت بۆ پەیدا بکەین".

چوونە دووکانێکی سازفرۆشی، لەوێ سازێکیان هەڵبژارد، گەڕانەوە ماڵی پیر. پیر سێ رۆژان لەماڵەکەی خۆیدا میوانداری لێکرد، فەقێش سێ شەوو سێ رۆژ نەی بۆ ژەنی. لەکاتی خواحافیزیدا پیر پێیگوت: "فەقێ، کوڕم، ئەم رۆژانەی ئاخیری تەمەنمت کردنە رۆژانی ناو بەهەشت، خوا هەزارجار لێت رازی بێت".

"پیری من، تۆ بەرلەوەش هەر لەبەهەشتدا دەژیایت. خوا خێرت بنووسێت".

فەقێ تەیران چەند رۆژانێکی دیکەش لەشاردا مایەوە. ئەسپێکی خورتی پەیداکردو ئەسپەکەی کڕی‌و وەڕێکەوت، لەکاتێکدا گۆرانی دەگوتن‌و لاوکی تێهەڵدەدان‌و باڵندەکان

بەسەر سەریەوە دەفڕین بەسەرتاسەری مەزۆپۆتامیا، دێهاتەکان، شارۆچکەکان، شارو ناو کۆچەرو هۆزە کوردو تورکمەنەکان، ڕەشماڵی ڕەوەندو کۆشكو تەلاری میراندا تێپەڕیو گەیشتە کۆشکی میرانی بۆتان. میر بەگەرمو گوڕیەوە پێشوازی لێکردو لەتەك تەختی خۆی داینیشاندو گوتی: "ناوبانگی تۆم بیستووە. بیستوومە بوویت بەتەیرانی ئاوازخوێن. ناوو شۆرەتت لەحەوت مەملەکەتان تێپەڕیوە. دوای بیستنی ئاوازی ئەو باڵندەیە بەو پلەیەی ئاوازخوێنی گەیشتوویت، دەڵێن دونیا تا ئێستا نەیژەنی وەکو تۆی بەخۆوە نەدیوە. دەڵێن هەموو چیرۆكو لاوكو سترانەکانت لەبارەی باڵندەکانەوەیە".

فەقێ تەیران بەڕێزو خاکەڕاییەکی زۆرەوە گوتی: "بەڵێ میری من".

میر، فەرمانی بەیەکێك لەوانەی لەوێ ڕاوەستابوون، کرد:

"تەیرانی ئاوازخوێن ببەنە گەرماو، پاشان باشترین جلوبەرگی بۆ بێنن. ئینجا ژووری تایبەت بەمیوانانی بۆ ڕێکبخەن، خواردنی بدەنێو پاشانیش لێبگەڕێن با بخەوێت".

بەدەم پێکەنینەوە رووی کردە فەقێو گوتی: "گەرەکمە ئەمشەو هەموو زاناو شاعیرانو کەسایەتیەکانی جزیرە بانگهێشتی کۆشك بکەم، پشووێکی باش بدە".

"سەرچاوان میری من".

"هیچ هەواڵی باوکت هەیە؟"

"چەندین ساڵە هەواڵیانم نیە، ئەگەر خوا بیەوێت کە لێرە ڕۆیشتم دەمەوێت بچمە لای ئەوان".

لەبەرامبەر میردا دەست بەسینە ڕاوەستابوو.

"خوا دەزانێت باوکت کاتێك هەواڵی گەیشتنتان بەپلەی ئاوازخوێنی زانیوە چەند خۆشحاڵ بووە".

میر هەستا، لەسەر تەخت هاتەخوار، قۆڵی لەقۆڵی فەقێ هەڵکێشاو تا دەرگای تەلار لەگەڵی چوو.

دەوروبەری ڕۆژئاوابوون، شێخانی عارەب، ئاغاکان، پیاوە ئاینیەکانی ئاشووریان، زاناکان، دەنگبێژەکانو بەگەکانی جزیرە کەم کەم هاتنو لەسەر دۆشەکە ڕاخراوەکانی دیواخانی میر دانیشتنو پاڵیان بەپشتیەکان دایەوە. دوای ئەوەی کە تەلار پڕ بوو لەخەڵك. میرو فەقێ پێکەوە هاتنە ژوورەوە، میر لەسەر تەختی خۆی دانەنیشتو چوو لەسەر دۆشەکێکی پای تەختەکەی دانیشتو فەقێشی لەتەنیشت خۆی دانیشاند. دوای چاكو چۆنیو هەواڵپرسی، گوتی: "ئەم لاوەی کە لای من دانیشتووە میر فەقێ تەیرانی

عارفو ئاوازخوێنی باڵندەکانە. خەڵکی پێیدەڵێن تەیرانی ئاوازخوێن. هەموومان ناوو ناوبانگی ئەومان بیستووە، باوکی دۆستی منە".

هەموویان لەفەقێ تەیرانو هەروەها ئەو ئەنگوستیلەیەی کە لەپەنجەی بووو نیشانەی میرزادەیی بوو، رامابوون. فەقێ نەی لەکیفکەکەی دەرهێنا. رواڵەتی نەیەکە بۆ هیچکەس سەرنجڕاکێش نەبوو. نەیی هەژارترین شوانیش لەم بلووره قامیشە جوانتر بوو. فەقێ سەری نەیەکەی خستە نێوان لێوەکانی، چاوەکانی داخستنو دەستی بەژەنین کرد. چەندین کاتژمێر تێپەڕی. هیچکەس جووڵەی لەبەر نەهاتە دەر. هەمووان چاویان بڕیبووە نەیو فەقێو ئەنگوستە باریكو راکشاوەکانی. فەقێ دوای ئەوەی نەی دانایە پێش خۆی. دەستی بەگوتنی لاوکێك کرد، کە هیچکام لەئامادەبووان تا ئەو کات نەیانبیستبوو. ئەوان تێگەیشتن چیرۆکی ئەو لاوەکە فەقێ خۆی دایناوە. دەنگی فەقێ بێهاوتاو دڵڕفێن بوو.

فەقێ تا سپێدەی بەیانی هەر گۆرانی گوتنو نەی ژەنی. هەموو ئەو کەسانەی لەبەرامبەر ئەودا دانیشتبوون بووبوونە یەك کەس. لەپەنجەرە نووریێکی تۆپەڵئاسا لەسیمای ئاوازخوێنی دا، فەقێ نوقمی نێو رۆشنایی بوو. نەیەکەی لەتەك خۆی دانا. سازەکەی هەڵگرتو دوای ئەوەی هەندێك ئاوازی لێدان کە هیچکەس نەیبستبوون، سازیشی لەتەك خۆی دانا.

دەنگ لەبەر کەس نەهاتەدەر. لەشەوێوە تا ئەو دەمە هیچکەس تەنانەت هەناسەشی هەڵنەکێشابوو، تەنانەت خودی میریش.

میری بۆتان چەند مانگێك فەقێ تەیرانی لای خۆی هێشتەوە. ژووری میوانان کە تایبەت بوو بۆ سوڵتانو میرەکان بۆ ئەو داندرابوو. لەو چەند ماوەیەی کە فەقێ لەکۆشکی ئەو بوو، هیچکات لەکاتی ئامادەبوونی ئەو لەسەر تەختی خۆی دانەنیشت. تا ئەو رۆژەی کە فەقێ ئەوێی بەجێهێشت. کۆشکی میر بەردەوام جمەی دەهات لەخەڵکی. فەقێ لەو ماوەیەدا هیچ لاوكو ستڕانێکی دووجاران نەگوتەوە، چیرۆكو سترانو دەنگو ئاوازەکان وەکو قەڵبەزە لەدڵیەوە هەڵدەقوڵانو پەخش دەبوون. هەرچی دەیخوێندو دەیگوت لەبارەی باڵندەکانەوە بوو.

فەقێ لەکۆشکی میری بۆتانەوە یەکڕاست رووەو کۆشکی باوکی خۆی رۆیشت. هەر لەگەڵ ئەوەی پێی نایە ناو شار، شار خرۆشا. دایكو باوکی لەخۆشیان زۆری نەمابوو بکەونە سەما. شار سێ شەوو سێ رۆژ جەژنو ئاهەنگی گێڕا.

"سێ ڕۆژ بەر لەمڕۆ یەکێك نامەیەکی لەمیری بۆتانەوە هێنا. زۆر باسی تۆی کـردووە. نووسـیویە تـۆ عارفیـت، عـارفێکی جاویـدانی باڵنـدەکان. هـەموومان سـێ ڕۆژە چـاوەڕێت دەکەین. ئەمە نامەکەیە. بیخوێنەوە".

باوك نامەکەی دایە فەقێ.

فـەقێ زیـاتر لـەمانگێك لەکۆشـکی بـاوکی مایـەوە. لـەو ماوەیـەدا کۆشـکەکە هەمیشـە لەپیاوو ژنو پیرو لاو پڕبووو جمەی دەهات. فەقێ نەی بـۆ ژەنـین، سازی لێـدا، گـۆرانی لەبارەی باڵندەکانەوە بۆ چڕینو چیرۆكو لاوکی بـۆ گـوتنو گێڕانـەوە. خـەڵکی شـار هـەر ئەوەیان گـوت کـە مـیری بۆتـان گوتبـووی. دەنگـی فـەقێو ئـاوازی نـەی یـەکیان لـەوی دی خۆشترو جوانترە.

فەقێ، شاری بەتەواوی نوقمی نێـو شـادیو بەختـەوەری کردبـوو. تەنانـەت ئەوەشـیان بەمێشکدا نەهاتبوو بپرسن کوڕە میرێك چۆن بۆتە ئـاوازخوێن. کاتێـك دەنگبێـژی هێـژاو لاو ئـەوێی جێهـێڵا، خـەڵك بەخـەمو دڵتـەنگیو بێسەروسـەدا تـا دەرەوەی شـار لەگـەڵی چـوونو بـەڕێیانکرد. دەنگبێـژ سـواری ئەسـپێکی عـارەبی بـوو کـە زینێکـی تورکمـەنی نەخشێندراوی لێکرابـوو، کیسـەیەکی پـڕ لـەزێڕی بەکەمەربەنـدەوە بەسـتبووو نەیەکـەی لەبەر پشـتێنیو سازەکەی بەشانیەوە کردبـوو، ئـاوا کەوتـە ڕێ. دوای ئـەوەی کـە لـەماڵی بـاوکی دوورکەوتـەوە، سـەری ئەسـپەکەی ڕاکێشـاو ماوەیـەك بیریکـردەوە بچـێتە کـوێ، مــەزۆپۆتامیای لەمێشـك دەرنەدەچـوو. لەسـەر چـیاکانی وانــەوە بەبێئـەوەی لــەهیچ جێگایەك ڕابوەستێت، خـۆی گەیانـدە بیابـان. لەبیابانـدا لەگونـدەکان، لەشارەکانو لـەنێو هـۆزە کۆچـەریو ڕەشماڵنشـینەکاندا پێشـوازی لێکـرا. دەچـووە هـەر جێگایـەك هـەم وەك عـارفی باڵنـدانو هـەم وەکـو ئـاوازخوێن پێشـوازی لێـدەکرا. هـەموو ڕەشماڵنیشـنەکانو چیاییەکان ناوی ئەویان بیستبووو لاوكو شیعرەکانی ئەویان دەزانیو پێیاندەگوت عارفی باڵنـدەکان. نـاوو ناوبـانگی لەماوەیـەکی کورتـدا سەرتاسـەری مـەزۆپۆتامیای گرتبـووەوەو گۆرانیبێـــژو ئاوازخوێنـــەکان لەمـــەنزڵگاو کاروانســـەراو بـــازاڕو لەئاهەنگـــەکانی بووکگواسـتنەوە لەسـلێمانی، بەغـدا، بەسـڕە، حەلـەبو شـامدا چـیرۆكو سـترانو لاوكو لاوانەوەکانی ئەویان دەگوتەوەو ئاوازەکانی ئەویان بەنەیو شمشاڵەکانیان لێدەدایەوە.

فـەقێ لەمـەزۆپۆتامیاوە چووە ئەنـەدۆڵ. نـە ئەسـپەکەی مـابوو، نـە زێـڕو چـەکمەو جلوبەرگـەکانی. فـەقێ تـەیران، ئێسـتا جلوبـەرگی دەروێشـی لەبـەربوو، بـەم شـێوەو

رواڵەتەیەوە ڕێزو خۆشەویستیو هەستی دۆستانەی زیاتری خەڵکی بۆ خۆی رادەکێشاو خەڵك لەناخی دڵەوە پێشوازیان لێدەکردو ڕێزیان لێدەنا. هەرکەس ئەوی دەبینیو دەنگی دەبیست دڵی تژی دەبوو لەعیشقو میهرەبانیو شادی. زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئەویان دەناسیو گوێیان لەدەنگی دەبوو، دەیانگوت تا ئێستا دونیا کەسێکی وەکو عارفی باڵندەکانی کە ئەوەندە مایەی ڕێزو خۆشەویستی هەمووان بێت بەخۆیەوە نەبینیوە. هەڵبەتە ئەویش ئەمەی دەزانی، بەڵام زۆر بایەخی بەم بابەتە نەدەداو گوێی لێنەدەگرت. بینینی باڵندەی نەبیندراوو گۆرانی گوتن لەبارەی باڵندەکان، ئەویان نوقمی نێو شادمانی دەکرد. ئەمە کاری ئەو بووو تەنهاو تەنها ئاوازخوێنی باڵندەکان بوو.

بەمشێوەیە جارێکی دیکە سەرانسەری ئێرانو توورانو عارەبستانو کوردستان گەڕاو کە تەمەنی گەیشتە کامڵبوون، ڕێگای بەغدای گرتەوەبەر. دوای چەندین ڕۆژ گەیشتە بەغداو مەڵبەندی نەیسازان. مامۆستایانی گەنجی نەیساز، کە خەڵکی گۆشەو کەنارەکانی وڵاتو تەنانەت هی زێدی ئەویش بوون، بەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیەوە پێشوازیان لێکرد. بۆ ڕێزگرتن لەو، میوانداری گەورەیان ڕێکخستو چەندین ڕۆژ خزمەتیان کردو پێشوازیان لێکرد.

فەقێ تەیران کاتێك ویستی ئەوێ بەجێبێڵێتو لێیانجیابێتەوە، نەیەکەی لەبەر پشتێنی هێنایەدەرو گوتی: "فەرموون ڕۆڵەکان، ئەمە ئەمانەتی ئێوەیە، ساغو سلامەت هێناومەتەوە".

پیری مەڵبەندی نەیسازان گوتی: "سوپاست دەکەین میرێ مە، بەڵام بەمشێوەیە نابێت".

"باشە دەبێت چۆن بێت؟"

"تۆ بەر لەوەی ئەم نەیە رادەستی ئێمە بکەیتەوە، دەبێت سێ شەوو سێ ڕۆژ نەی بژەنی، دوای ئەوەش دەبێت لەمەڵبەندی نەیسازی داوای فەرمانەکە بکەیت. دواتر نەیە تازەکەت بخەیتە بەر پشتێنتو ئینجا بڕۆیت. نەیە تازەکەت چەندین ساڵە چاوەڕێتە".

فەقێ تەیران، کەوشەکانی داناو عەبا نەخشێندراوەکەی داکەندو لەسەر تەختدا چوار چنگی دانیشت، نەی لەبەر پشتێنی هێنایە دەرو سێ شەوو سێ ڕۆژ نەی ژەنی. پاشان داوایکرد باشترین بەرگدروو، کە لەڕەچەڵەکی ئیدریس پێغەمبەر بووو بەپیری بەرگدرووەکان ناودەبردراو لەبەغداوە هاتبوو دەستە جلکێکی بۆ بدوورێت. لەکێڵگەیەك کە ئەسپی رەسەنی بەخێو دەکرد ئەسپێکی عارەبی هەڵبژارد. جلەکانی کردنەبەرو ئامادەبوو، لەکاتێکدا دەیگوت شاری بەغدا هەر ئاوەدان بێت! بەرەو جزیرە وەڕێکەوت،

دوای چەندان ڕۆژ گەیشتەوە جزیرەو یەکسەر چووە کۆشکی بورجا بەلەك. میر کۆچی دوایی کردبووو کوڕەکەی لەشوێنی ئەو بووبووە میری بۆتان. میری تازە لەباخچەی کۆشکدا پێشوازی لەفەقێ کرد، دەستی ماچ کردو قۆڵی لەقۆڵی هەڵکێشاو بردیە ژوورەکەیو لەتەنیشت تەختی خۆیەوە داینیشاندو خۆیشی لەتەنیشتیەوە دانیشت. شەربەتیان بۆ هێنانو خواردیانەوە.

خەڵکی جزیرە هەواڵی هاتنی فەقێیان بیستبووو هاتبوون لەدەوری کۆشك ڕاوەستابوون. کەسانی بەرجەستەی شار، پیرەکان، شێخەکان، ژووری میریان پڕ کردبوو، هەر یەکێك دەگەیشت دەستی فەقێی ماچ دەکرد، فەقێ ریشێکی درێژو سپیو روخسارێکی گەنمی هەبوو، ئێستا پڕ رەنگتریش بوو لەجاران. خەڵکەکە بەڕیزو بەرەچاوکردنی پێگەو ئاستی کۆمەڵایەتیی خۆی، لەسەر بەڕەو تەختی بەئاوریشمداپۆشراو دادەنیشت.

میوانەکان تا نیوە شەوێکی درەنگ لەوێ مانەوە. هیچکەس بەفەقێی نەگوت سترانێك بڵێ، یان ئاوازێك بژەنە. فەقێش خۆی لێبێدەنگ کرد.

فەقێ بەیانی زوو لەخەو هەستا، ئاوێکی لەخۆی کردو چووە ژووری میر، میری لاو بەپێوە چاوەڕێی بوو. لەسەر سفرە دانیشتن. هەموو شتێك لەسەر سفرە هەبوو.

دوای خواردنی نانی بەیانی، میر قۆڵی لەقۆڵی فەقێ هەڵکێشاو چوونە نێو باخچەی کۆشك. ئەسپ ئامادەکرابوو هەردوو لای خورجین پڕبوو لەخواردەمەنی.

میر گوتی: "ئەم دیاریانە شتێك نین، لەڕاستیدا هیچشتێك لەئاست گەورەیی ئێوە نیە، پیری من".

فەقێ بەشەرمەوە گوتی: "ئەستەغفیروڵلا"

ئەسپەکەیان بردە ژێر بەردی تایبەت بەسواربوون تا فەقێ سوار بێت، کاتێك فەقێ سواری ئەسپ دەبوو، میر خۆی رکابی ئەسپی گرت.

فەقێ پێی لەرکابەکە کێشایە دواوەو گوتی: "ئەمە نابێت میرێ من، ئەمە هەرگیز ڕێی تێناچێت، میر چۆن دەبێت رکابی ئەسپی کەس بگرێت، ناتوانم ئەمە قبوڵ بکەم".

میر گوتی: "فەقێ تەیران، میری من، ڕێگەبدە". دەستی لەرکابەکە بەرنەدابوو. "ئەگەر شاو سوڵتانەکانیش رکابی ئەسپی تۆ بگرن، شانازییێکی گەورەیە بۆیان، ئەو شانازیە بەدەست هەموو کەس ناکەوێت، ڕێگە بدە پیری من".

فەقێ دابوویە مکوڕیو سوار نەدەبوو، میریش دەستی لەرکابەکە بەرنەدەدا، ئەو مشتومڕە درێژەی کێشا. بەگو پیرەکانی کۆشکو پیاو ماقووڵانی شار بۆ خواحافیزیکردنو بەرێکردنی فەقێ هاتبوونو لەدەوری ئەوان راوەستابوونو سەیری ئەوەیان دەکرد کە لەبەرانبەریان روویدەدا.

دواجار، فەقێ نەیتوانی بەرگە بگرێتو گوتی: "پایەدار بێت میرێ من"و سواری ئەسپ بوو بەرێکەوت.

فەقێ لەماوەیەکی کورتدا هاتەوە وان. دەریاچەی وان وەکو ئاسمان شین، ئارامو زوڵاڵ بوو، لەلێوی کانیەك لەئەسپ دابەزی، ئەسپی ئاوداو لەنێو مێرگێکی بەستەوە، خۆیشی لەڕۆخ کانیەکە دانیشتو بوخچەی خواردنەکانی کردەوەو نانی خوارد. لەسەر پشت لەسەر گیای مێرگەکە راکشا، چاوی بڕیە ئاسمان.

ئاسمان تا دەهات دوور دەکەوتەوە. دوای ئەوەی کە ماوەیەك ئاوا مایەوە هەستا، سواری ئەسپ بووەوەو بەرەو شار بەڕێکەوت لەبەردەم دەروازەی شاری وان راوەستا، لەنێو شار زرمەزرمی چەکوشان دەهات. بۆ چوونە ناوشارو گەیشتنەوە ماڵی خۆیان بێئوقرە بوو، بەڵام خۆی گرت. دەنگو زرمەزرمی چەکوشان لەبازاڕی مسگەرانو زێڕینگەرانو ئاسنگەران دەهاتو ئەم دەنگە ئەویان بەرەو ناو شار رادەکێشا. ئەسپی تاودا، رەنگەکان نەمانو کەوتنە دوای ئەوەوە.

تا بگاتەوە بەمۆکس شەوی خستە سەر رۆژ، خۆر خەریکبوو ئاوا دەبوو کە گەیشتە دەروازەی شار. لغاجەکانی ئەسپ کەفیان دەردابوو، ماوەیەك لەبەرانبەر دەروازە راوەستا پاشان گەڕایەوەو بەرەو دۆڵێك رۆیشتو شەو لەو دۆڵە مایەوە. لەگەڵ رووناکبوونەوەی هەوا چووە نێو شارەوە. وا وروژابوو کە دڵی بەتوندی لێیدەداو گوێی لەترپەکانی دڵی دەبوو، لەبەردەم دەروازەی کۆشکدا لەڕەوشێکی وا دانەبوو کە لەئەسپ دابەزێت، دواجار نەیتوانی چیدی خۆی رابگرێتو لەئەسپەکەی کەوتەخوار. چەند کەسێکی لەدەوردا کۆبوونەوە. لێیانپرسی کێیتو چیتدەوێت، گوتی: "بەمیر بێژن من هاتمەوە. دەربرینەکەی هێند فەرماندەرانەبوو کە چەند کەسێك پێکەوە رایانکردو بەمیریان راگەیاند: "میوانێك هاتووەو لەخوارەوە چاوەڕێی تۆیە".

"بیهێننە ئێرە، بابێت".

"لەخوارەوە لەتەك ئەسپەکەیەوە وەستاوە".

میر نیگەران بوو لەوەی کەسێك تا بەردەم دەروازەی کۆشك هاتووەو نایەوێت بهێتە سەرەوە لای میرو خۆی بەپلیکانەکاندا چووەخوار، بەخێرایی پلیکانەکانی بڕین و لەگەڵ پیاوەکانی کە چرایان بەدەستەوەبوو، خێرا خۆیان گەیاندە باخچەی کۆشك و پیاوێکی بینی کە حەوساری ئەسپێکی عارەبی بەدەستەوە بووو ریشێکی سپی بەردابووەوە کە تا سنگی هاتبوو. لەبەرخۆیەوە گوتی: "ئەمە کێیە؟" لێینزیك بووەوە، دەستی خستە سەرشانی پیاوە ریشسپیەکەو گوتی: "فەرموو، میوانی خوا".

میر وەپێش کەوت و فەقێ بەدوایەوە. ئەو دەمەی کە لەپلیکانەکان بەسەردەکەوتن پیرەژنێکی پشتکۆم کە لەسەر پلیکانەکان راوەستابووو چاوی لەسەر فەقێ هەڵنەدەگرت، کەوتە لەرزین، فەقێ خەریکبوو بەرۆخ ئەودا تێدەپەڕی و راوەستاو ماوەیەك لەڕوخساری پیرەژنەکە وردبووەوە، پاشان هاواریکردو گرتیە باوەشیەوە.

هەموو ئامادەبووانی کۆشك بازنەیان بەدەوریاندا کێشا. پیرەژنەکە هۆڕ هۆڕ دەگریا.

میر کە دەیویست دایکی لەباوەشی میوانەکە بکاتەوە، بەسەرسوڕمانەوە دەیپرسی: "چیبووە دایە؟ چیبووە؟ ئەمە کێیە؟"

دایك بەدەنگێك کە بەزەحمەت دەبیسترا توانی بڵێت: "فەقێیە، فەقێ تەیران".

دەستەکانی میر لەسەر شانی دایکی بەلاداهاتن، لەشوێنی خۆی رەقهەڵات و نەیتوانی لەشوێنی خۆی بجووڵێت. دایك کە خۆی بەگەردنی فەقێوە هەڵواسیبوو بەدەم گریانەوە شتگەلێکی دەگوت کە نەدەزاندرا چیدەڵێت.

روخساری میر زەرد زەرد هەڵگەڕابوو. خاتوون لەدوای میر راوەستابوو، میری گرت و رایهەژاندو گوتی: "هۆشت بێنەوە سەرخۆت، تۆ ئێستا دەبێت لەخۆشحاڵیان باڵ بگریت".

چاوەکانی میر بەفرمێسکان تەڕبووبوون. دایکی لەفەقێ جیاکردەوە، داهاتەوەو سێ جاران دەستی فەقێی ماچ کردو دەست لەنێو دەست بەرەو ژوورەوە بۆ سەرتەخت بردی، دایکیشی لەتەنیشت خۆیەوە دانا. دایك سەری خستە سەرشانەکانی کوڕەکەی و چاوەکانی دانانەسەریەك، هەموو ئەو کەسانەی کە لەکۆشك بوون هاتن و یەك دوای یەك دەستی فەقێیان ماچ کرد.

میر سەراپا چاوەڕێ بوو کە فەقێ پێیبڵێت دانیشە، فەقێ سەری دایکی گرتبووە باوەش و قژە سپیەکانی دەلاوانـدەوە، دایك هیچ ئاگای لەخۆی نەمابوو. کەمێك دواتر، فەقێ سەری دایکی بەرزکردەوە کە بڵێت ئاوی بۆ بێنن، لەم کاتەدا میری بینی کە بەسەر

سـەریەوە راوەسـتاوە. بـەئاماژەی دەسـت شـوێنێکی لەتەنیشـت خۆیـەوە نیشـان دا. مـیر لەتەنیشت فەقێ دانیشتو دەستەکانی خستنە سەر ئەژنۆکانی. تا دەمـەدەمی شێوان ئـاوا بێئـەوەی شـتاقیان قسـەیەك بكـات مانـەوە. مـیر بەحەسـرەتەوە سـەیری فـەقێی دەكـردو نەیدەتوانی چاوی لەسەر هەڵبگرێت.

کاتی بانگ، کچۆلەیەك لەگەنو مەسینەی هێنان. یەکـەمجار دایـك پاشـان فـەقێ دوای ئەوانیش میر دەستنوێژیان گرتو لەسەر دووگوردی ئاوریشمین پێکەوە نوێژیان دابەست. پاشان تا نیوەی شەو پێکەوە قسەیان کرد. هیچیان خەویان نـەدەهات، دایـك هەسـتا وەکـو سەردەمی منداڵیان پێیگوتن: "دەی منداڵینە یەکسەر بڕۆنە نێو جێوە".

یەکەمجار فەقێ هەستا، بەپێوە چاوەڕێ مـا ئینجـا مـیر خـۆی کـۆکردەوەو هەسـتا چـو لەتەنیشت فەقێ راوەستا.

دایـك بەپێشـیان کـەوت، هـاتن لەبـەردەم دەرگـای ژوورێـك راوەسـتان، دایـك پرسـی: "مەگـەر ئێـرە ژووری تـۆ نـەبوو فـەقێ؟" دەرگاکـەی کـردەوە. فـەقێ ئـەو دەمـەی کـە خەریکبوو دەچووە ژوورەوە دەستی دایکی ماچ کرد، میریشی گرتـە بـاوەش، لەژوورەکـەدا مۆمێکی درێـژو ئەسـتوور پێکـرا بـوو، بـۆنی بنیشـت لەژوورەکـە دەهـات. فـەقێ جلـەکانی داکەند، دەستەجلێکی بەنەخشو نیگاری چندراوی خـەوتن لەسـەر ئـەو نوێنـەی کـە بـۆ ئەو راخرابوو، داندرابوو، ئـەو دەسـتەجلەی پۆشـیو چـووە نێـو جێـوە، کڵاوەکـەی خستە سەرو سەری خسـتە سـەر بـالیف، بـەڵام خـەوی لێنەدەکـەوت. دەیویسـت بـیر لەسـەردەمی منداڵیی خۆی بکاتەوە، ئەو رۆژانەی کە بەدزیەوە لەکۆشك دەردەچووو دەچووە چیاکەی ئەوبەر بۆ راوەکەو، بیری لەو قەفەسانە دەکردەوە کە خۆی دروستی دەکردن. لەیەکـەمین جار کە سواری ئەسپ بووو چووە نێو دۆڵو نهالەکان. دیمـەنی چیاکانی مـەزۆپۆتامیا بـۆ ساتێك چیە لـەزەینی دەرنەدەچوو، باڵنـدە رەنگاوڕەنگـو بریقـەدارەکانی بیابـان، بەسـەر ئاسمانی سەریەوە نزیك دەبوونەوەو دیسان بۆ تاقی ئاسمـان تێهەڵدەچوونەوە. باڵنـدەکان رەنگەکان سیمای مرۆڤەکان، پەپوولـەکانو دەشـتە کـاکی بەکاکیـەکان، ئـەو باڵندانـەی کـە ئاسمانیـان داپۆشـیبوو، ئـەو گوڵـە نـارنجیو شـینو سـوورو زەردانـەی کـە یەکپارچـە دەشـتەکانیان گرتبـووە خـۆ، دەنگـی ئاوێتـەبووی دارسـتانو باڵنـدەکان، ئەمانـە هـەمووی لەگەڵ رووناکیەکی ورشەدار لەنێو مێشیکدا دەخولانەوە.

ئاگای لێنەبوو کەنگی خـەوی لێکـەوت. لەگـەڵ ئەلنـدی بەیانیـدا لەخـەو هەسـتا. چـووە حـەمام، ئـەو جلانـەی کردنەبـەر کـە دایکـی لـەنزیك سـەرینەکەیەوە بـۆی

دانــابوونو بــۆنی بنیشــتی دارەبــەنیان لێــدەهات. دایکــی ئــەو جلــە نوێیانــەی لەخورجینەکـەی ئـەوەوە هێنابوونـەدەر، فیـت ئەنـدازەی خـۆی بـوون، کـەمێك دوای ئەوەی لەسـەر تەختـە خەوەکـە دانیشـت کچۆلەیەکی گـەنج شـەربەتێکی بۆهێنـا کـە بۆنەکەی هەموو ژووری داگرت. فەقێ هێشتا شەربەتەکەی تەواو نەخواردبووەوە کـە دایکی‌و بەدواشـیەوە مـیر لەوسـەری کۆشـکەوە بەدیارکـەوتن، هـەر کـە ئـەوان نزیـك بوونەوە فەقێ شەربەتەکەی دانایە نێو قاپە سەدەفیە شینەکەی بەردەمی‌و هەستایە پێ‌و دەستی دایکی ماچ کردو میریشی گرتە ئامێز. دەسـتی دایکـی گـرت‌و داینیشـاندە سەرتەختەکەو خۆیشی لەتەنیشتەوە دانیشت. میریش هات‌و لەبەرانبەر فەقێ لەسەر ئـەژنۆ دانیشـت و دەسـتی بـردە گیرفـانی‌و قوتـوویێکی زێڕینـی بەئـەلماس چـندراوی هێنایەدەرو بەرەو لای فـەقێی راگـرت. فـەقێ بەکـەمێك سەرسـوڕمانەوە قوتووەکـەی لێـوەرگرت‌و سـەیری کـرد. مـیر سـەرنجی دایـە ئـەو سەرسـوڕمانەی‌و گـوتی: "مـۆری میرایەتیە نیشانەی میرایەتی".

یەکسەریش ئەوەی بۆ زیادکرد: "ئێستا کە تۆ هاتیتەوە میرایەتی مافی تۆیە".

دایك گوتی: "مافی تۆیە تۆ براگەورەی".

فەقێ سەری قوتووەکەی کردەوە، مۆرەکـەی دەرهێنـا، سـەیرێکی کـردو بەپێکەنینـەوە بۆلای براکەی راگرت کە بەرامبـەری لەسـەر ئـەژنۆ دانیشـتبوو. مـیر بەدەسـت لەرزینـەوە مۆرەکەی لێوەرگرت، فەقێ قوتووەکەشی پێدایەوە. میر مۆرەکەی خستەوە نێو قوتووەکە، روخساری میر هەروا زەرد زەرد بوو، دەستەکانی دەلەرزین.

فەقێ دەستی میری کەوا لەبەرانبەریدا چۆکی دادابـوون بەتونـدی گوشـی‌و لەتەنیشت خۆیەوە داینشاند.

دیسان شەربەتە بۆنخۆشەکەیان هێنایـەوەو خواردیانـەوە، دایـك بێـدەنگ دانیشـتبووو چێشتی بەیانیان خوارد.

ســەرگەرمی نــانخواردنی بــەیانی بــوون کــە لــەپڕ دەنگــەدەنگ‌و غەلبەغــەلبێك کەوتەبەرگوێ، غەلبەغەلبەکە تا دەهات زیادی دەکرد. کـە نـانخواردنی بـەیانی تـەواوبوو، میر چووە سەر پەنجەرە، بەرانبەر کۆشك، باخچەکان، پشت دیـوارو بورجـەکانی کۆشـك‌و مەیـدانی شـار پڕبووبـوو لەخـەڵك. بەرلـەوەی خـۆر هـەڵبێت هـەواڵی هاتنـەوەی فـەقێ تەیرانیان بیستبووو هەواڵەکە دەماو دەم بەهەموو لایەکـدا بڵاوبووبـووەوەو سەرتاسـەری مۆکس هەستابوو.

کاتێـک میریـان لەپشـت پەنجـەرەوە بینـی، هەراوزەناکـە زیـاتری کـرد، شووشـەی پەنجەرەکان کەوتنە جرینگەجرینگ.

میر بەڕاوێـژێکی تـژی ڕێـزو شـەیدابوونەوە گوتی: "ئـەم هـەراو بەزمـە لەبـەرخاتری تۆیە، لەبەرخاتری تۆ..".

فەقێ هات لەبەرپەنجەرەکە راوەستا، ئاپۆرەی خەڵکەکە لەگەڵ بینینـی ئـەو یەکسـەدا هاواریان کرد:

"فەقێ تەیران، تەیرانی ئاوازخوێن بەخێرهاتیەوە، بەخێرهاتیەوە!"

غەڵبەغـەڵبو هـاتو هاوارەکـە ماوەیـەکی درێـژ بـەردەوام بـوو، فـەقێ لەکۆشـك چـووەدەر، خەڵکەکـە بـەبینینی ئـەو کـە تـا کـولانی بـەردەم دەرگـای کۆشـك هـاتبوون هـەموویان پێکـەوە بێـدەنگ بـوون. لەمەیدانـدا کچـانو کـوڕان بەجلوبـەرگو کنجـی تایبەتی شاییکردن پاڵیان وێکدابووو لەگەڵ دەنگی دەهۆڵو زوڕنـاو بەوپـەڕی جۆشو خرۆشو بەشێوازی دێرین هەڵدەپەڕین.

شـاییو هەڵپـەڕکێ بەدرێـژایی شـەو هـەر بـەردەوام بـوو. لەلایـەك ئاوازخوێنـەکان دەیانخوێنـدو لەلایـەکی دی نەیژەنـەکان نـەیان لێدەداو سازژەنەکانیش ساز. لەمەیـدانی شارو لەبن دیوارو بورجەکانی قەلا ئاگریان کردنەوە، شاییو بەزمو سەما سێ شـەوو سێ رۆژ درێژەی کێشا. لەو ماوەیەشدا فەقێ تاوێك لەخەڵکەکە دوورنەکەوتەوە.

فـەقێ لـەدوایین رۆژدا، لەسـەروبەندی رۆژئاوابوونـدا، چـووە سـەربەرزترین بـورجی قەلاو گوتی: "زوڕنایەکم بۆ بێنن" زورنەکیان بۆهێنا کە کاری پێکرابووو دەنگێکی بـاشو بەرزتر لەدەنگی نەی هەبوو. لەجێگایەك راوەستابوو هەموو ئەوانـەی کـە لەمەیدانەکـەو دەتوانین بڵێین هەموو خەڵکی شارەکە دەیانتوانی گوێیان لەدەنگی زوڕناکەی بێت.

فەقێ تا ئەو دەمەی خۆرهەلات ئەو ئاوازانـەی ژەنـد کـە لـەبارەی باڵنـدان داینـابوون. فەقێ ژەنینی زوڕنای تەواوکرد، لەسەر بورجەکە هاتەخوارو بـەنێو خەڵکەکـەدا تێپـەڕی، بـەڵام خەڵکەکـە هـەروا لەشـوێنی خۆیـان بێـدەنگ رەق هـەلاتبوون. هـەموویان وەك جادوویان لێکرابێت تا خۆر بەتەواوی هـەلاتبوو نـەیانتوانیبوو لـەجێی خۆیـان بجووڵێن، بـەڵام دوای ئـەوەی دونیـا روونـاك بووبـووەوە هاتبوونـەوە سـەرخۆیانو وردە وردە مەیدانەکەیان بەجێهێشتبوو.

دوای ئـەوە فـەقێ چـیتر لـەنێو خـەڵك دەرنەکـەتو نەهاتـەدەر، بـەڵام ئـاوازخوێنو دەنگبێژانی گەنج تـا دەهـات ژمارەیـان رووی لـەزیادی کـردو ئـەوان ئـەو چیرۆكو لاوكو

ستڕانایەیان بردنە دێهاتو شارو شارۆچکەو ئەنەدۆڵ، قەفقاز مەزۆپۆتامیاو عارەبستان کە فەقێ داینابوون.

فەقێ بەیانیان هەڵدەستاو نوێژی دەکرد، لەبەر پەنجەرەی گەورەی کۆشك دادەنیشتو بەوشەو پەیڤی وەکو مرواری دیوانە شیعریەکەی خۆی دەنووسی. ئەو ماوەیە چەندە درێژەی کێشا دیارنیە. لەو ماوەیەدا دایکی کۆچی دوایی کرد. فەقێ زۆر بەمردنی دایکی دڵتەنگ بووو کەوتە جێگاوە. ماوەیەك دواتر لەڕۆژێکی هەتاوی بەهاریدا بەخۆی هاتەوە. پۆلە قورینگێکی بەئاسمانەوە بینی لەڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاواو بەسەر دەریاچەی وانەوە بۆ ئەوبەری چیای سیپانو لەوێوە بەرەو دەشتی پاتنۆس دەڕۆیشتن.

فەقێ سێ ڕۆژ لەبەیانیەوە تا شەو دادەهات هەرسەیری کرد کە ئاوا بەو ئاراستیەدا دەڕۆیشتن، چەند ڕۆژ لەژوورەکەی مایەوەو نەهاتەدەر. خواردنیان بۆ دەبردە ژوورەوە.

فەقێ بەجلوبەرگی دەرۆیشیەوە لەژوورەکەی هاتەدەر، بەپیاوەکانی گوت ئەسپەکەی بۆ ئامادەبکەن. ئەسپ لەماوەیەکی کورتدا ئامادەکرا. ئەسپەکەی باش خزمەت کرابوو.

بەنێو بازاڕدا تێنەپەڕی. ئەگەر بەبازاڕیشدا تێپەڕیبا کەس بەو جلوبەرگە نەیدەناسیەوە. لەشار چووەدەر. لەلای بەرانبەرەوە نەرمەبایەکی گەرمی دەهات، دڵی تژی بوو لەشادی. دوای ئەوەی کە لەشار دوورکەوتەوە، ئاوڕی دایەوەو سەیری بورجو قوللەکانی کۆشکی کرد. باووباپیرانی لەسەردەمانی زۆر زووەوە میرانی ئەم شارەبوون. یەکێك لەگۆڕستانەکانی شار مەزارگەی تایبەت ئەوان بوو. لەکاتێکدا بیری لەمەرگ دەکردەوە هاتە وان. دەریاچەی وان بێئەندازە شینو ئاسمانی بوو، ئەو کە زۆر جێگایان گەڕابووو زۆر دەریاو دەریاچەی بینیبوون لەهیچ جێگایەك ڕەنگێکی ئاوا شینی نەبینیبوو. لەنزیك دەروازەی شاری وان ڕاوەستا، بیریکردەوە، دەروێشێك ناتوانێت بەئەسپێکی ئاوا ڕەسەن بچێتە نێو شارەوە. پێشینەشی نەبوو کە دەروێشێك سواری ئەسپ ببێت. لەئەسپ دابەزی سەری ڕاکێشاو بردیە نێو مێرگێك کە لەپێشەوەبوو لەوێ لەژێر دارسپیندارێکدا مێخێکی داکوتاو سەری ڕێشمەی ئەسپی لێبەستەوە.

گەڕایەوە بۆ شار. یەکەمجار چووە بازاڕی ئاسنگەران پاشان چووە بازاڕی زیندرووانو ئینجا بەبازاڕی زێڕینگەراندا گەڕا. لەئاش فرۆشێکی سەری بازاڕی زێڕینگەران ئاشە بەماستێکی خوارد. لەکاتێکدا نوقمی نێو خەیاڵەکانی بووبوو، کۆڵان بەکۆڵانی شار گەڕا. تاریکی داهات، ئەوەی بەبیرداهات کە کەمێك دواتر دەروازەکانی شار دادەخرێن. بازاڕەکان ورد وردە چۆڵ دەبوون. تاوێکی دیکە هەمووان بازاڕ چۆڵ دەکەنو دەچنەوە ماڵەکانیان.

بەلەز چووەوە لای ئەسپەکەی، حەوساری کردەوە، لەکاتی داخستنی دەروازەکانی شار خۆی بەشاردا کردەوە. لەنێو شاردا کەسانێکی زۆر دۆستو ئاشنای هەبوون، بەلام نەیدەویست بچێتە ماڵی ئەوان، چووە کاروانسەرایەك، کابرای کاروانسەرادار بەباشی پێشوازی لێکرد، کابرا بەخۆی گوت ئەم دەروێشە سوورکەلانەیەی پێشتر لەجێگایەك بینیوە.

بیریکردەوە، بەلام نەیهاتەبیر لەکوێ بینیوە، ژوورێکی خاوێنی بۆ دانا، ئەسپەکەی بۆ بردە ئاخوڕێکی تایبەت. پێکەوە لەسەر سفرە دانیشتنو نانیان خوارد، خواردنەکان زۆر خۆشو بەتام بوون. فەقێ لەژووری کاروانسەراکە لەکاتێکدا گوێی لەدەنگی دەریاچە راگرتبوو کە لەوێوە نزیك بوو، چووە نێو خەوێکی وەکو خەوی باڵندان. بەیانی زۆر زوو لەخەوهەستا. هێشتا دەروازەکانی شار نەکرابوونەوە. چاوەڕێی کرد. دەروازەکان لەگەڵ دەرکەوتنی گزنگی بەیانی کرانەوە. خەڵکێکی زۆر لەدەرەوە چاوەڕێی بوون. سواری ئەسپ بوو، بەرەو لای چیای سیپانو بەرەو لای رۆژهەلات بەڕێکەوت، بەکەنار دەریاچەدا دەڕۆیشت. کاتێك کە خۆر هێندەی دارسپیندارێك بەرزبووەوە، تەمو هالاوی سەر دەریاچە رەویەوە. هەموو لایەك کەوتە نێو رەنگێکی شینباوی شەپۆئامێزەوە. چیای سەر بەبەفری سیپان بەهەمان شێوەی خۆیەوە کەوتبووە ژێر دەریاچە زولالەکەوە ئەو شەوەی لەگوندێکدا رۆژ کردەوە، رۆژی دواتر چووە شارۆچکەی ئەردیش. پێشتر ئەردیشی نەبینیبوو؟، بەلام خۆشی دەویست. ئەو شارۆچکەیە دەنگبێژانێکی ناوداری لێهەڵکەوتبوون. لەو کاروانسەرایەی کە لێیبوو رێکەوتی دەنگبێژێکی کرد. ئەو دەنگبێژە تا بەیانی ستڕانەکانی فەقێ تەیرانی کە بەمامۆستای خۆی ناوی دەهێنا، گوتنەوە. دەنگەکەی لەرادەبەدەر خۆش بوو. لەنەیژەنیشدا زۆر شارەزا بوو.

فەقێ سەری لەو هونەرە جوانەی کابرای دەنگبێژ سوڕما. ئەو دەمەی کە هەوا کەم کەم خەریکبوو رووناك دەبووەوە، دەنگبێژی لاو دەستی هەلگرت، نەیەکەی کە لەنێو باوەشی بوو داینایە تەنیشت خۆی، عارەقەی نێو چاوانی پاککردەوە، پاشان رووی کردە فەقێو گوتی: "لەم دونیایەدا هیچکەس ناتوانێت وەکو فەقێ تەیرانی مامۆستام، عارفی باڵندەکان، نەی بژەنێتو ستڕان بڵێت".

"تۆ ئەوت بینیوە؟"

"هیچکەس ناتوانێت ئەو ببینێت. هەندێك دەڵێن پەیوەستی باڵندان بووە، هەندێکی دی دەڵێن پەیوەستی عەودالان..".

فەقێ زۆر پێیخۆش بوو خۆی بەو دەنگبێژە لاوە بناسێنێت, بەڵام دەیزانی کە خۆیشی پێبناسێنێت ئەو هەر باوەڕ ناکات.. کێ هەیە بتوانێت باوەڕ بکات کەسێك کە بەعەبداڵ پەیوەست بووبێت لەبەرچاوی بێت... لەگەڵ ڕووناکبوونەوەی هەوا هەستاو چووە دەرێ. دەنگبێژی لاویش بەدوای ئەودا چووەدەر، ئەسپی فەقێیان هێنا، دەنگبێژە لاوەکە هەر لەگەڵ بینینی ئەسپە عارەبیو زینە پڕ نەخشو نیگارەکە دەمی لێبەش بوو، ڕکابی ئەسپی گرت. فەقێ سواری ئەسپەکە بوو. دەنگبێژە لاوەکە حەوساری ئەسپی گرتبوو لەکاتێکدا لەشەرمان سوور هەڵگەڕابوو، بەدەنگێکی لەرزانەوە گوتی:

"تۆ کێیت؟ ناوی خۆتت نەگوت. ڕەفتارو هەڵسوکەوتی تۆم کەوتە بەردڵ". حەوسارەکەی بەردا.

فەقێ دوای کەمێك بیرکردنەوە گوتی: "ناوم محەمەدە".

"لەکوێ دەتوانم بتدۆزمەوە؟"

فەقێ، دیسان دوای ئەوەی کەمێك بیریکردەوە، گوتی: "تۆ ئەگەر بتەوێت من ببینیت دەتوانیت بێیتە ئەمارەتی مۆکس، لەوێ من دەبینی". بەڕێ کەوت.

دەنگبێژی لاو، لەوێ بەگومانەوە تا ئەو کاتەی کە فەقێ لەبەرچاوان ون بوو لەدواوە هەر سەیری کرد.

فەقێ، دوای ماوەیەك لەوە پەشیمان بووەوە کە خۆی بەدەنگبێژە لاوەکە نەناساندبوو، بۆیە گەڕایەوە. دەنگبێژەکە هێشتا هەر لەشوێنی خۆی ڕاوەستابوو، کە فەقێ بینی، ڕوخساری لەخۆشیان گەشایەوەو بەزەردەخەنەوە گوتی:

"شتێکت لەبیرکرد، پیری من؟"

فەقێ گوتی: "لەبیرمکرد، لەبیرمکرد ناوی خۆمت پێبڵێم. من ناوم فەقێ تەیرانە، لەموکس چاوەڕێتم".

سەری ئەسپی وەرسووڕاندو بەڕێکەوتەوە.

دەم دەمی نیوەڕۆ گەیشتە دەشتی پاتنۆس، لەبناری چیای سیپان سەری هەڵبڕیو سەیری دوندی چیای کرد. چیا لەدیوارێکی شیری دەکرد. تەم ترۆپکی چیاکەی گرتبوو. قومریەکان قاچەکانیان بەرەو خوارەو وێکهێنابوونەوە وباڵەکانیان خڕکردبوونەوەو لەملاو ئەولای ترۆپکی چیاکە، بەدوای یەکدا بەرەو خوارەوە دەهاتنو لەدەشتە پڕ لەگوڵە هەمەڕەنگەکاندا هەڵدەنیشتن. ئینجا یاغر یاغر لەملا دەچوونە لایەکی دیکەی دەشتەکە قومریەکان بێوەستان لەئاسمانەوە شۆڕی زەویان دەکردەوە. دەشت پڕبووبوو

لەزوڕنا، چیای سیپانێ لەنێو تیشکی خۆردا لـەبلوورێکی دەکـرد. کـاکۆڵی سـوورو سـەوزو شینو زەردی شۆڕبووەوەی باڵنـدە قاچدرێژەکان. لـەژێر تیشکی هـەتاودا هـەزار ڕەنگیـان دێنا. باڵندەکان لەنێو ئەو ڕۆشناییە ووشەدارەی کە لەدەشتەکەی دەدا باڵەکانیان لێدەدا.

فەقێ ئەگەر چی ساڵانێکی زۆری ئەمـەش خـۆی لـەنێو باڵنـدان بردبووەسـەر، لـەهیچ جێگایـەك باڵنـدەی ئـاوا ڕەنگـاوڕەنگو چیاچـیای نـەبینیبوون. بەچـیاکەدا هەڵگـەڕا. ڕۆچوونە نێو بەفرو هاتنەدەر. بەدەست بەفری سـەر تاتـە بـەردێکی سافی لابـردو ڕووەو دەشـت دانیشـت. قومریـەکان لـەنێو هـاڵاوێکی تەنکـدا دەهـاتنو دەچـوون. ئەسـپ لـەو خوارەوە، لەنێو ئەو باڵندانەی کە دەورەوشانەوەو لەدەوروبەریدا دەخولانـەوە، دەڕۆیشـت. قومریەکان لەئەسپ نەدەڕەوینەوە.

فەقێ یەکسەر لەوێ ڕابوو، بەخێرایی لەقەدپاڵی چیاکە بەرەو خـوارێ شـۆڕی کـردەوە پاشان، ئارامو بێدەنگ چووە نێو باڵندەکان. قومریەکان لەئەویش نەرەوینەوە.

فەقێ بەمە خۆشحاڵ بوو. تا تاریکدا هات لەهەمان شوێنی لـەنێو باڵندەکانـدا دایـەوە. تـا زیـاتر بـەنێو باڵندەکانـدا دەڕۆیشـت دڵـی زیـاتر ڕۆشـن دەبـووەوەو زیـاتر هەسـتی بەبەختەوەری دەکرد.

بەرەو لای کانیەك چوو کە بەگوڵاڵە سوورەدەوردرابوو، ئەسپەکەی ئـاوداو بەسـتیەوە. لەنێو گوڵەکاندا دانیشت، بوخچەی خواردنەکانی لەخورجین دەرهێنا، نـانی خـوارد، ئـاوی خواردەوە، کەپەنکە خوریەکـەی لـەخۆی پێچاو سـەری خسـتە سـەر چـەمەنە نەرمـەکان. بایـەکی نـەرم دەهـاتو جورەهـا بـۆنو بەرامـەی لـەدوورو نزیـك لەگـەڵ خـۆی دەهێنـا. سێبەری قومریە ماندووو بەجێماوەکان لەڕیزی قومریەکانی دیکە لەهەوای نیوە تاریکدا ئارام ئارام لەئاسمانەوە بۆ زەوی شۆڕ دەبوونەوە.

فەقێ کە نوقمی نێو هەستی بەختەوەری بووبـوو، بەهەسـتێکی ئاسـوودەی بێوێـنەوە خـەوی لێکـەوت. خـۆر هەڵنـەهاتبوو کـە هەسـتایەوە. قومریـەکان لـەملاو لـەولا نزیکـەی لەسەر کەپەنـە خوریەکەشـی دەهـاتنو دەچوون. فـەقێ وەکـو باڵنـدان سـووکبار بووبـوو. بەئەندازەیەك کە ئەگەر دەستەکانی هەژاندبان دەیتوانی بفڕێت.

هەستا، خۆی لێککێشایەوە، دەستو دەمو چاوی لەسەر کانیەکـە شوشـتن. بۆخچـەکەی کـردەوە بـەهێمنی چێشـتی بـەیانی خـوارد. بـەنێو قومریەکانـدا بـەرەو لای ڕۆژئـاوا ملـی ڕێگـای گـرت. سـێبەرە درێژەکـەی لەقومریـەکانی دەدا، تـا دەچـووە پـێش زیـاتر سەرسـام

دەبوو. ئەو هەر هەنگاوێكی هەڵدەهێنا باڵندەكان بەركەنار دەبوون، بەڵام هەڵنەدەفڕینو نەدەڕەوینەوە. تا نیوەڕۆ تا گردە كۆنەكەی ناوەڕاستی دەشت ڕێگای بڕی. لەبن گردەكە دانیشتو پشتی بەبەردێكی سپی دا. سەری خستە نێو لەپی دەستیو كەوتە بیركردنەوە. قومریەكان باڵندەی ترسەنۆكن، ناهێڵن كەس نزیكیان ببێتەوەو هەڵدەفڕن.

تەمە تەنكەكە چڕتر بووبووەوەو لەولاتر كۆلكە زێرینەیەكی باریك كە بەقەد باڵای مرۆڤێك دەبوو دروست بووبوو، فەقێ مەستی ڕەنگەكانی بوو. لەسەردەمی گەنجێتیدا چەندان جار لەلێواری دەریاچەی وان دانیشتبووو سەیری چیای سیپانی بەرامبەر خۆی كردبوو، لەم لێوارەوە بەبەردەمی هێڵی سووورباوی پێچاوپێچ دادەكشانو بەسەر دەریاچەی وان ڕەت دەبوونو لەبناری چیادا لەبەرچاوان ون دەبوون.

هەستا، گەردی ڕەنگاوڕەنگی كە بەهۆی باڵەفڕكەی قومریەكان دروست بووبوو شەق كردو چووە لای ئەسپەكەی كە دەیحیلاند. دونیا كەم كەم تاریك دادەهات. مێخەكەی هەڵكێشا، ئەسپی بردە سەركانیەكەو ئاوی دا، پاشانیش بردیو كەمێك دوورتر مێخەكەی داكوتایەوەو حەوساری ئەسپی لێهالاند.خواردنی دەرهێنا. برسی بووبوو، نانی خواردو هەستایەوە، سەیرێكی ئاسمانی كرد، لەسەر ترۆپكی چیا لەرەلەری ئەستێران بوو. كەپەنكەكەی لەخۆپێچاو لەنێو بۆنو بەرامەی بەهار كە ئەو ناوەی داگرتبوو، خەوی لێكەوت.

سێ ڕۆژان لەوێ مایەوە. لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا بەبەردەوامی پۆل پۆل قومری لەهەرچوار لای ئاسمانەوەدا دادەڕژانە دەشتەكەو لەوێدا، ساڵدانە ساڵدانە بەقاچە درێژەكانیانەوە دەڕۆیشتن، تەنانەت بۆ جارێكیش نەیبینین سەریان نەوی بكەنو شتێك بخۆن. فەقێ سەری لەو رازە دەرنەدەكرد. قومریەكان بەتەك یەكدیدا ڕەت دەبوونو بێئەوەی تێكهەڵبنگون دەهاتنو دەچوون. ئەو دەشتە پانو بەرینە پڕبووبوو لەقومریو هێشتا قومری دیكەش هەر دەهاتن. خوا دەزانێت لەدونیادا ژمارەیەكی چەند زۆر قومری هەن، چەند كاكۆڵ، چەند ڕەنگ.. هێی ی ی قومریە كاكۆڵبەسەرەكان.

فەقێ بەدرێژایی تەمەنی خۆی هەمیشە بەهەستێكی تژی بەختەوەریو جۆشو شەوقو زەوقو لەكاتێكدا لەهەرجێگایەك بوایە ئەوێی دەگۆڕیو دەیكردە بەهەشت، ژیابوو، بەڵام لەماوەی ئەم سێ ڕۆژەی لەگەڵ قومریەكان لەهەموو كاتەكانی دیكە زیاتر نوقمی نێو شادیو بەختەوەری بووبوو.

فەقێ نوقمی ئەو شادمانیە هاتەوە کۆشکی خۆیان. لەڕێگادا نەبەردێکی بینی، نە ئاوێك، نەردەریاچەیەك، نەڕێبوارێك، نەگوندێك، نەشارێك، نەباڵندەیەك بەئاسمانەوەو نەمرۆڤێك. تەمێکی گەش بەسەرسەریەوە بووو ئەستێرەی گەلاوێژیش بەسەر ترۆپکی چیاوە، لەوە بترازێت هیچشتێکی دیکەی نەبینی.

میرهاتو دەستی ماچ کردو گوتی: "زۆر دڵخۆش دیاریت، تۆ پێدەچێت لەبەهەشتەوە بێیتەوە، قەت تۆم هێندە خۆشحاڵ نەبینیوە، نوورو رۆشنایی لەهەموو بوونتدا دەبارێت. مرۆ لەبینینی روخسارت تێرنابێت".

فەقێ میری لەباوەش ناو گوتی: "لەبەهەشت دێمەوە، لەبناری چیای سیپان، لەدەشتی پانتۆسو لەنێو قومریەکانەوە. لەتەمەنمدا قەت ئەو هەموو قومریەم لەجێگایەك پێکەوە نەبینیبوون، دەرزیت هەڵدابا بەعەرزی نەدەکەوت".

فەقێ، دوای ئەوەی لەنێو کۆشکدا وەکو شنەبایەك بێت لەشارەکە دەشنا. خەلیلۆی دەنگبێژیش مانگێك دواتر هاتەکۆشك. مانگێك لەوێ مایەوەو بۆ خەڵکی شار گۆرانی گوتنو چیرۆكو سەربوردەی گێرانەوەو لاوکێکی نوێشی دانا. خەلیلۆ ئەو لاوکەی لەبەرکردبوو. کورد بەچیای سیپانیان دەگوت چیای (سیپانێ خەلاتێ). لاوکەکە بەناوی قومریی چیای سیپانی بوو.

فەقێ، لەوە بەدواوە تا رۆژی مردنی هەموو ساڵێك لەگەڵ هاتنی بەهاردا دەچووە لای قومریەکانی چیای سیپانو رۆدەچووە نێو تەمی تەنكو هەزارو یەك رەنگو دەهاتەوەدەر. خەلیلۆی دەنگبێژ، دوای ئەوەی کە چەند ساڵ لەسەر یەك هاتوچۆی ئەوێی کرد، بوو بەدەنگبێژی ئەمارەتی مۆکس. فەقێ هەر لاوكو هەر سترانێکی دادەنا ئەو لەبەری دەکرد. هەموو ساڵێك بۆ ماوەی شەش مانگان بەئێرانو توورانێدا دەگەڕاو سترانەکانی فەقێ تەیرانی دەگەیاندنە خەڵك. فەقێ تەیرانی مامۆستاشی بێڕاوەستان سەرقاڵی هۆنینەوەو دانانی سترانو ئاوازی نوێ بوو.

چەندین ساڵ ئاوا تێپەڕین. فەقێ زیاتر بەتەمەن داچوو، بۆ دوایین جار ئەوو خەلیلۆ سواری ئەسپەکانیان بوون بەرەو بەهاری چیای سیپانێ بەڕێ کەوتن.

خەلیلۆ ماتو حەیران بووبوو، بەڵام هەستی بەخۆشحاڵی دەکرد. جەستەی وەکو جەستەی منداڵان بچووك بووبووەوەو پشتیشی کۆم. تا دوا تەمەنی هەر سترانی دڵەنگێزی گوتنو دایناںو لەنێو بەهەشتی باڵندەو داستانو لاوکی تایبەت بەباڵندان ژیا.

فەقێ ڕۆژێك لەنێو جێی نەهاتەدەر. دانیشتوانی كۆشك بازنەیان لەدەوریدا بەست.

فەقێ گوتی: "میر، لاۆو، باش گوێ لەقسەكانم بگرە من ئیدی تەواو، خەلیلۆ درێژە بەم ڕێگایە دەدات و ئەو نەوەو نەوەزادەیەی لەو دەكەوێتەوە دەبنە ئاوازخوێن و دەنگبێژی كۆشك".

میر گوتی: "فەرمان فەرمانی ئێوەیە".

"نوێنەكەم ببەنە بەردەم پەنجەری گەورە، ئێوەش بەدوای كاروباری خۆتاندا بڕۆن، جگە لەخەلیلۆ كەستان لێرە مەمێنن".

خەلیلۆ ژێر باڵی مامۆستاكەی گرت و بردیە بەرپەنجەری گەورە. نوێنەكەیان بۆ لەسەر تەختێكی بەرین ڕاخست. لەپەنجەرەڕا، چیاكان و دۆڵ و دەشتە كاكی بەكاكی و سەراپا سەوزو ڕۆشنەكان دیاربوون. فەقێ، چاوی بڕیە چیا تەڕو گەردەنكەشە بەهاریەكان، پاشان ئاوڕی دایەوە، خەلیلۆی بینی كە كەمێك لەولاتری نوێنەكەی ڕاوەستابوو، بەچاوەكانی ئاماژەی بۆ كرد كە دابنیشێت خەلیلۆ نزیك نوێنی مامۆستا دانیشت، بیریكردەوەو مامۆستا مرۆڤێكی بەختەوەرە، دونیا ئەمڕۆ چەند جوانە. هەموو شتێك تۆ دەڵێیت پارچەیەكە لەنوورو ڕۆشنایی. ئەمە شایستەی مامۆستا، دەرروێشی هەموو دەروێشان بوو كە لەڕۆژێكی وەهادا بچێتە ئەولایە. فەقێ رووی بۆلای دەرەوە وەرسووڕاند. بەزەحمەت هەناسەی هەڵدەكێشا. ئاسمان زۆر شین و جوان بوو. مامۆستا، ماوەیەك بێئەوەی كەمترین جووڵە بكات بەهەمان شێوە چاوی بڕیە ئاسمان. خەلیلۆ كە لەلای پایەكانی تەختەخەوەكە دانیشتبوو نەیدەتوانی چاو لەڕوخساری ئەو هەڵبگرێت.

نیگای كەوتە سەرپۆلی قومریەكان كە لەدوورەوە دەهاتن. حاڵەتی دەم و چاوی فەقێ گۆڕانی بەسەرداهات. خەلیلۆ تێنەگەیشت ئەم گۆڕانەی دەم و چاوی مامۆستا نیشانەی سەرسوڕمانە یان خۆشحاڵی. قومریەكان هاتن و بەبەردەم پەنجەرە ڕەت بوون و قاچەكانیان درێژو باڵەكانیان كۆكردنەوەو لەنێو دەشتەكە هەڵنیشتن. ماوەیەك هەر قومری دوای قومری لەو دەشتە هەڵنیشت. ئەو زەویە هەموارە پڕ بوو لەورشەو بریسكەی ڕەنگەكان كە لەكاكۆڵی قومریەكان بەو ناوە وەردەبوو. بتەوێت یان نا هاڵاو هەموو لایەكی گرتەوە. قومریەكان لەو دیوو هاڵاوەكە وەكو وێنەیەكی خەیاڵی ساڵدانە ساڵدانە بۆ ئەملاو ئەولا دەڕۆیشتن، وەك ئەوە وابوو كە هەزار كۆلكەزێرینە داڕژابنە سەرزەویەوە. قومریەكانی بەهاری چیای سیپانیش وەهابوون، بەمشێوەیە لەگەڵ هاڵاوێك

لەورشـەو بریسـکەدا دەڕژانـە سـەر زەویـە هـەموارە بەهاریەکـە، بـەدوای ئەوانـدا گـەردەلوولێك لەلەکلەکـەکان گەیشـتو بنـاری ئـەو چـیایەی ئەوبـەری داپۆشـی، چـیا لەترۆپکیەوە تا ئەو رووبارەی کە لەبناریدا هەبوو سپی سپی هەڵگەڕا.

دوای لەکلەکـەکان فلامینگـۆ هـاتن، لایـەکی ئاسمـان پەمـەیی هەڵگـەڕا. شـینە شـاهۆی بالگـەورە لـەلای چـیاکانی ئـاگریو سـیپانو چـیای نـەمروودو قـەفقازو زاگرۆسـەوە هـاتن، باڵـەکانیان لەئاسمانـدا لێکبلاوکـردنو بێئـەوەی باڵـەکانیان بـۆ ئـەملاو ئـەولا تـەکان بـدەن شۆڕبوونەوە خوارێ. هەڵۆی سووری ماسیگر، بازو شاهێنەکان بەدەوری هەڵۆکانـدا بازنـەیان بەست، باڵەکانیان لێککردنەوە، سنگیان بەرەو بای باشوور وەرسووڕاندو شۆڕبوونەوە.

لەشـوێنێکی نادیـار پۆلـە پەپوسـلێمانە دەرکـەوتن، بـەخۆیانو بـاڵی قـاوەیی گـەشو پۆپیتی درێژو گەردنو سینگی نارنجیانەوە بەبەر پەنجەرەدا رەت بوون. پەپوسلێمانەکان بڕانیـان نـەبوو. دەسـتە دەسـتە دەهـاتنو لەسـەر لکـی دارگوێزەکـان هەڵدەنیشـتن. دارگوێزەکان سـەرتاپا نـارنجی هەڵدەگـەڕان. پەڕەسـێلکەکانو باڵنـدەی رەنگـاوڕەنگی دیکـە وەك ئـەوەی لـەنێو رەشـەبایەکی تووشـدا گیریـان خواردبێـت بـۆ ئـەملاو ئـەولا دەکشـانو ئاسمـان وردە وردە بەباڵنــدەی بچـووك بچـووکی رەنگـاوڕەنگ پڕبـوو، بازەکـان، بـازە قاچسـوورەکان، هــەڵۆ سـوورباوو هــەڵۆ قاوەییــە باڵتیــژەکانیش بەنێویانــدا دەهــاتنو دەچوونو ئەمسەرو ئەوسەریان دەکـرد. لەپڕێکـدا مـەلانی هـەنجیرخۆری سـەرباڵزەردیش دەرکـەوتن، بـۆ چـەند سـاتێك هـەموو جێگایـان زەرد هەڵگەڕانـدو سـەیری هـەر لایـەکت دەکرد زەرد دەچووەوە. کەوە دەنووکسوورەکانیش لەکاتێکدا خێراخێرا سەریان بەرزونزم دەکرد لەچیاکان سەرەو ژێربوونەوەو هاتنو نێو مەیدانو باخچەکانی شاریان پڕکرد.

پەڕەسـێلکەکان دوانەکـەوتن، هـەموو پەڕەسـێلکەکان دەسـتە دەسـتە لەیـەك جێگـا خڕبوونـەوەو وەکـو بروسـکەو بـا لەلایـەك بـۆ لایـەکی دیکـە دەڕۆیشـتن. قەڵەڕەشـەکان، ئـەو قەڵەڕەشانەی کە لەڕەشیان سـەوز دەچـوونەوە لەکاتێکدا هـەر رەنگێکیـان دەهێنـاو رەنگێکیـان دەبرد، لایەکی ئاسمانی شینیان بەتـەواوی گرتبـووو لەوسـەری ئاسمـان بـۆ ئـەو سـەر دەفـڕینو باڵـەکانیان لێکـدەدا، هـەڵۆ ماسـیگرە سینگسـپیە باڵدرێـژەکانیش لەتـەك هـەڵۆکانی دیکـە کـە باڵـەکانیان فـش کردبـووەوەو سـینگیان دابـووە بـا دەفـڕین. باڵنـدە زەردەواڵەییـە قـاوەییو سـەرباڵزەردەکان، عەندەدیلـە دەنووکزەردەکـان، مـەلانی بـارانی گەردەنسـوورو شـینی تـۆخ، عەندەدیلە پەمەییە ریشسپیەکان، قەناریـەکان، ماسیخۆرکەکانو باڵنـدی دیکـە ئاسمانیـان پـڕ کردبوو. بەکورتی ئاسمانی مۆکس لەبەرباڵندان نەدەبیندرا.

دوایین ئەو باڵندانەی گەیشتن، بریتیبوون لەشاهێنە سوورە باڵتیژو هەڵۆ بچووکە قاوەییەکانی چیاکانی تورۆس. هەڵۆ قاوەییو هەڵۆ سوورەکان تا بەرپەنجەرە هاتنو بۆ تاوێك شاهێنەکانو هەڵۆکان پێش پەنجەرەیان داپۆشی، بەشێوەیەك کە هیچ لایەك نەدەبیندرا. دواتریش یەکسەر فڕینو بۆ کەشکەلانی ئاسمان بەرزبوونەوەو لەوێ باڵەکانیان لێکبلاّوکردنو بێئەوەی باڵەکانیان تەکان بدەن بەملاو ئەولادا شۆڕیان کردەوە.

فەقێ، بەچاوانی زەقیەوە سەیری ئەوەی دەکرد کە لەبەرچاویەوە روویدەدا، پچڕپچڕ هەناسەی دەداو نەیدەتوانی چاو لەسەر چیای سەر بەتەمی بەرامبەری هەڵبگرێت. لەدوور دوورەوە چاوەڕێی شتێك بوو. لەدەرەوە لەشەپەشەپی باڵی باڵندان بترازێت هیچ دەنگێکی دیکە نەدەهات. ئەمە چ پەرجوویێکی بێوەنەیە؟ ئەولیای باڵندان، خۆش بەحاڵی مامۆستام. لەکۆشکەوە یەکەمجار میرو بەدوایشیەوە ئەوانی دی بەرەو پەنجەرە رایانەدەکردو دوای سەیرکردنی باڵندەکان بەوپەڕی حەپەساویەوە دەگەڕانەوەو بەدەستپاچەییەوە لەشوێنێکی دوورتر لەنوێنگەی فەقێ رادەوەستان. ماوەیەك دواتر، پێشنوێژیکەرەکان، مەلاکان، زاناکان، قورئان بەدەستەوە هاتنو چوونە سەر بالینگانی فەقێو یەکڕیز لەتەنیشت یەکدیەوە دانیشتن.

قورئانەکانیان کردنەوە. دەستیان بەقورئان خوێندن کرد. میر هاتو بێدەنگی کردن. جارێ نابێت بخوێنن، دەبێت سەبر بگرن. ئەو خەریکبوو سەیری باڵندەکانی دەکرد.

سەری مامۆستا جارێك تەکانی خوارد، خەلیلۆ سەیریکردو نیگایان لێکگیربوو، مامۆستا یەکسەر سەری بۆلای دەرەوە وەسووڕاند. باڵندەیەکی شینی تۆخی بینی کە لەنێو باڵندەکاندا بەباڵەفڕکە هاتو خۆی بەژووریّ داکرد. باڵندەکە بەباڵە درێژو تەنکەکانی سێ جاران بەسەر فەقێدا سووڕاو سێ بازنەی نوورانی شینێکی تۆخی کێشاوو گەڕایەوە دواوەو باڵەکانی لێکدانو رۆیشت. لەژوور سەری فەقێدا سێ بازنەی نوورانی بەجێمان، نوورێکی سپیو شینو هەروەها بزەیەك کەوتە سەر روخساری مامۆستا.

دیسان رووی بۆ دەرەوە وەرسووڕاندەوە، چاوی بڕیە ئاسمان، تاوێك دواتریش چاوی دایە چیای ئەوبەریەوە. ئێستا ئیدی بەسەختی هەناسەی دەدا. سینگی کەوتبووە خنگەخنگو تا دەهات خنگەخنگی سینگی زیادی دەکرد. ئەگەر رێگەیان پێدرابا مەلاکان دەستیان بەخوێندنی قورئان دەکرد. بەبڕوای خەلیلۆ ئەو چاوەڕوانی شتێکی دەکرد کە ئاوا لەهەمبەر مەرگدا خۆی رادەگرت.

ماوەیەك ئاوا تێپەڕی، خنگەخنگی سنگی زیاتر بووبوو. هەر ئێستا نـا ئێستا، بـۆی هـەبوو هەناسـەی رابوەسـتێت. لـەپڕ لەشـوێنێکی زۆر دوورەوە دەنگێـك هـات. روخسـاری فـەقێ گەشـایەوە. دەنگەکـە دووبـارە بیسـترایەوە، مامۆسـتا بزەیـەکی هاتـێ. خـەلیلۆش بـزەی هاتـێ. دەنگ دەنگی هەمان باڵندە نادیارەکە بوو کە تـەنها دەنگی دەبیسـترا. دەنـگ، جارێکی دیکـەش هاتـەوە، چـاوەکانی فـەقێ بریسکانەوە. خـەلیلۆ خۆشـحاڵ بـوو، مامۆسـتا خـەریکبوو گیـانی دەهاتەوەبەر، دەژیایەوە. میرو ئەوانیدی سات بەسات چاوەڕێی مردنـی ئـەو بـوون، بـەڵام لـەپڕ مامۆستا ژیایەوە. هەموویان واقیان وڕمابوو. لەکاتێکدا کە مامۆستا هەروا چاوەڕوان بـوو، ئـەو باڵندەیـەی کـە سـێ جـاران دەنگەکـەی بیسـترا بـوو، دەبـوا خـۆی نیشـان بـدابا، زۆری نـەبرد لـەدوورەوە، لەسـەر چـیاکان، تۆپەڵـە نورێـك پـڕژاو بـەخێرایی بـۆ ئەملایـەهات. نوورەکـە نوورێکی ورشەداربووو ئاوی لەچاوان دەهێنا. تا زیاتر نزیك دەبـووەوە گـەش‌و ورشـەداریەکەی زیاتر دەبوو، کەمێك دواتر لەنێو تۆپەڵە نوورەکە کـە لەپەنجـەر نزیـك بووبـووەوە باڵندەیـەك هاتەدەر، باڵە درێژەکانی لێکبلاوکردبوون. فـەقێ چـاوەکانی خـۆی نەنووقانـدن. باڵنـدە، چاوی بڕیە دوڕ چاوەکانی فەقێ. نیگاکانیان تێکهەڵنگوتن. فەقێ بـەهیچ چەشـنێك نەیـدەتوانی چـاو لەچاوە سوورە تۆخ‌و درەوشاوەکانی باڵندەکە وەربگێڕێت. لەپڕ تاریکیـەکی ئەنگوستەچاو ئـەو نـاوەی داگـرت. دەنگـی باڵندەکـە لـەو دیـو چـیا دوور دوورەکانـەوە هـات. سـەری فـەقێ بەسـەر شانیدا کەوت. خەلیلۆ لـەجێی خـۆی هەسـتا، سـەری مامۆسـتاکەی بەئارامیـەوە گـرت‌و داینایـە سەر سەرین‌و چاوەکراوەکانی نووقاندن، مەلاکان یەکسەر دەستیان بەقورئان خوێندن کرد.

مەنجەڵە ئاوێکیان گەرم کرد. لـەپێش دەرگـای باخچـەی کۆشـك تـەرمی فـەقێیان شوشـت‌و کفنیان کرد. تەرمەکەیان خستە ناو تابووت. تابووتیان بەپارچـە پەڕۆیـەکی سـەوز کـە وشـەی زێڕینـی لەسـەر نەخشـێندرابوون داپۆشـی‌و بردیانــە مزگـەوتی گـەورە. نوێـژی مردوویـان بەئامادەبوونی خەڵکی شار لەسەر خوێند. لەکاتی نوێژکردندا ئاسمان‌و زەوی پڕبوون لەباڵندە.

لەو رۆژە بەدواوە، لەساڵیادی کۆچـی دوایـی فـەقێ، باڵنـدەکان بەرلـەوەی خۆرهـەڵبێت دەهاتنـە سـەر گڵکۆکـەی‌و ژمارەیـەکیان لەسـەر لکـی دارەکـان، دەوەنـەکان، قەدپاڵـەکان‌و دەشـتەکان دەنیشـتنەوەو ژمارەیەکیشـیان لەئاسمانـدا بـەملاو ئـەولادا دەڕۆیشـتن‌و پاشـان هەموویان بەسەر ئارامگای فەقێدا هەڵدەفڕین‌و چـەرخیان لێـدەداو وەختـی رۆژئـاوابوون بلاوەیان لێدەکرد.

لەو کاتەوەی دونیا دروستکراوە تا ئێستا تەنها دوو کـەس زمـانی باڵنـدەکانیان زانیـوە، یەکەمیان سلێمان‌و دووەمیان فەقێ تەیران.

# بەشی نۆیەم

ئـەو شـەوە پـویراز موسـا لـەنێوجێ هاتـەدەر، جلـەکانی پۆشـی، چـووە ئاودەسـتو گەڕایەوە گوێزانو سابوونی ریشتاشینو خاولیەکەی هەلگرتو چووە سـەرکانی. لەوەتـەی هاتبووە دوورگە. پێیخۆش بوو هەمیشە لەسەر کانی دەستو دەمو چاوی بشواتو ریشی بتاشـێت. خێـرا ریشـی تاشـی، بـەڕاکردن چـووەوە ماڵێو تـاوێکی بـاش لەئاوێنـەی رۆخ دەرگاکـە تەماشـای خـۆی کـرد، دەسـتێکی بەسمێڵـە سـوورەکانی داهێنـاو رێکیخسـتنەوە، باوەڕی بەوە کردبوو پیاوێکی رێكو هەڵكەوتووە. روخساری لەئاوێنەکەدا ئەو بۆچوونەی زیاتر بەهێز کرد.

لێنـا چـای دەم کردبـوو، هـەڵم لەچـایدانەکەی سـەرئاگردانەکە هەڵدەسـتا. خـواردنو قاپـەکانی دانـابووو قاپـەکانی دادەنایـە سـەر سـفرە. بـیری دەکـردەوە، سـەری بـۆ دواوە وەرسووڕاندو گوتی: "لاوۆ، تۆ چیتلێهاتووە؟ دوێشەو نەنووستیت؟"

پویراز بەدەنگێکی ماندووەوە گوتی: "نەنووستووم".

"دەبوا بنووستبایت".

پویراز گوتی: "بەڵێ".

"بریا بچووبایتە سەر لمەکانی لێوارو لەوێ پیاسـەت بکردبـاو هـەڵهاتنی خـۆرت بـدیبا، ماسیگرەکانی جاران ئەوەیان دەکرد".

پویراز خێرا خێرا چێشتی بەیانی خواردو هەستا.

"منیش ئێستا دەچمە لێوار پیاسە دەکەم دایکە، دەمەوێت هەڵهاتنی خۆرببینم".

"ماسـیگرەکانی ئێـرەش بـەر لەهەڵگیرسـانی جـەنگ وایانـدەکرد". بەهەسـت بەشانازیکردنەوە زەردەخەنەیەکی هاتە سەرلێوان.

پویراز بەبینینی زەردەخەنەکەی ئەو خۆشحاڵ بوو.

"ئەمڕۆ دەچینە راوەماسی؟"

"نازانم".

"ئەمڕۆ دەریا ئارامە، ئاو خواردنەوەی مێروولە...".
پویراز دەیزانی کە لێنا زۆر نیگەرانە. ئەو دەمەی کە لەدەرگای دەرەوەڕا دەهاتەوە گوتی: "ئەمڕۆ زۆر شیك و ڕێکیت لاوۆ. جلی ماسیگریت زۆر جوان لێدێت، روخسارت گەشاوەتەوە".
پویراز ئاوڕێکی لێدایەوەو بەزەردەخەنەیەك وەڵامی دایەوە، پاشان بەرەو لێوار رۆیشت. بەلەمەکەی راکێش راکێش بەسەر لمەکە بۆ ناو دەریا برد، کاتێك کە خەریکبوو سواری بەلەم دەبوو ئاوڕێکی دایەوەو سەیری ماڵی زەهرای کرد، هیچکەس لەوێ نەبوو، خەمێك چنگی لەناخی گیرکرد، بەلەمی لەناو ئاوەکەوە بۆ سەر لمەکە گێڕایەوە، چاوی بڕیە ماڵی زەهراو بەئارامی بەسەر لمەکەدا هەنگاوی نا. تا نزیك دارهەنارە خواروخیچەکەی سەرلێوی هەڵدێرگەکە چووە پێش، گوڵێکی زۆر گەورە لەسەر لمی سەرەوەی دارهەنارەکەوە بەجێمابوو. گوڵەکە، لەهەوای گورگەمیشدا کە وردە وردە ڕووناك دەبووەوە، گەورەتر دەهاتە بەرچاو. یەکسەر بۆ دواوە گەڕایەوە. لێنا بێدەستی خۆی گوێی بۆ دەنگی پێی پویراز راگرت کە لەسەر لم و وردەبەردەکانی لێواردا دەهاتو بیری لەدالغەو خەیاڵەکانی پویرازدەکردەوە.
پویراز لەکاتێکدا هەندێکجار خێراو هەندێکجاریش بەهێواشی هەنگاوی دەنا دەهاتو دەچوو. دەنگی چرپەی پێی لەسەر وردەبەردەکان زیاترو زیاتر بوو، پاشان هێواش و هێواشترو دواجار نەما، زەهرا نە لەبەردەرگاو نە لەپەنجەرە دەرنەکەوت. سەرەنجام پویراز رووی کردە ماڵەکەو بەو شێوەیە راوەستا. دونیا کەم کەم خەریکبوو ڕووناك دەبووەوە، دڵی تا دەهات توندتر لێیدەداو قەفەسەی سینگی بەرزونزم دەبووەوە. پویراز زیاتر چاوەڕێ نەما. دەرگای ماڵەکە کرایەوە، زەهرا لەنێو شیپانەی دەرگا بەدیارکەوت. پویراز جووڵا، چیوای نەمابوو دڵی لەلێدان بکەوێت، هاوکات شادیەکی لەئەندازەبەدەر هەموو گیانی داگرت. چاوێکی لەزەهرا داگرتو یەکسەر گەڕایەوە دواوەو بەرەو لای بەلەمەکەی چوو، دەنگی وردە بەردەکان لەو ناوە بەرزبووەوە. بەلەمەکەی هەر بەو خێراییە بردە نێو دەریاو ماتۆڕەکەی دوای چەندینجار هەندرلێدان خستەکار. رووی بەلەمەکەی بەرەو دوورگەی کابا سووڕاند، زەهرا لەنێو شیپانەی دەرگا وەستابوو. پویراز تا ئەو دەمەی خانووەکان لەبەرچاوان ون بوون، بەردەوام هەر ئاوڕی دایەوەو سەیری دوورگەی کرد.
ئاگای لێنەبوو چۆن گەیشتە دوورگەی کابا، کەی ماتۆڕەکەی خامۆش کردو قولابی کام ماسی هەڵدایە نێو دەریا. زەهرا لەهەوای گورگەمێشدا لەنێو شیپانەی دەرگا

راوەستابوو بەچاوانی گەش‌و شینی کاریگەرو دڵی پڕاوپڕ لەعەشق‌و خۆشەویستی سەیری ئەوی دەکرد.

ئەو قولابەی کە هەڵیدابووە نێو ئاوەوە، لەبیریکردبوو. دواجار بەهەر شێوەیەك بوو قولابەکەی هێنایەدەر، ئەو ماسیەی کە بەقولابەکەوە بوو لێیکردەوە، خستیە نێو لەگەنە تایبەتیەکە، ماتۆڕەکەی هەڵکردو سکڵێتەری بەنزینەکەی تا ئاخر فشاردا. نزیکەی نیوەڕۆ گەیشتەوە دوورگە. لەسەر کانی چاوی بەزەهرا کەوت، کاتێك خەریکبوو بەلەمەکەی بەسەر خیزو لمەکەدا رادەکێشا بەنزینەکەی گرتەوە. هاتە لێوارەکە، بەلەمەکەی راکێشاو هێنایە سەر لمەکە. ماسیی نێو لەگەنەکەی لەبیرنەکرد، هەڵیگرت، هاتەژێر چنارەکان، کەمێك لەولاتری کانیەکە دانیشت‌و چاوی بڕیە زەهرا. زەهرا ئەو سەتڵەی کە پڕی کردبوو لەئاو هەڵیگرت‌و روویکردە نێو ئەو جۆگەلە بەردینەی بەردەراوی کانیەکەو سەتڵەکەی خستەوەبەر شێرەی ئاوی کانیەکە. کەمێك دواتر سەتڵ پڕبووەوە، زەهرا سەتڵەکەی هەڵگرت‌و دیسان لەنێو جۆگەلەکە بەتاڵی کرد.

سەتڵ بڕئاو دەبووو زەهرا بەتاڵی دەکردو هەموو جارێکیش بەعیشق‌و شەیدابوونەوەو بەنیگا مەخمەڵیەکانیەوە سەراپای پویرازی تەماشا دەکرد.

هەموو دانیشتوانی دوورگە سەیری ئەوانیان دەکرد، بەڵام ئەوان نەیاندەزانی. ئەو ماسیەی کە لەنێو دەستی پویراز بوو یەکێك لەئەنگوستەکانی دەستی راستی ئەمی بردبووە نێو دەمی.

خەڵکەکە بۆ ئەوەی ئەو دووانە لەو خەونەیان بێدارنەکەنەوە لەکانی نزیك نەدەبوونەوە. موسا کازم ئاغا کە هیچ ئاگای لەو کەین‌و بەین‌و لەو بوویەرە نەبوو هەر لەگەڵ ئەوەی پویرازی لەژێر چنارەکان بینی لەپلیکانەکان هاتەخوارو بەرەو کانی رۆیشت. پویراز بەخێرایی هەستاو بەخێرایی بەپیریەوە چووو گوتی: "فەرموو ئاغا، فەرموو". لەو نێوەدا، زەهرا سەتڵەکەی بەتاڵ کردبووو دیسان خستبوویە بەرشێرەی ئاوی کانیەکە. گۆناکانی سوور سوور هەڵگەڕابوون‌و هەموو گیانی بووبووە عارەقە، دەتگوت لەجێژوانێکی زۆر نهێنی‌و ناپەسند بەگیرهاتبێت. رەوشی پویراز لەهی ئەویش خراپتر بوو.

زەهرا سەتڵە پڕ ئاوەکەی هەڵگرت، بەدەست‌و لاقی لەرزانەوە رووەو ماڵ بووەوە.

"فەرموو ئاغا، فەرموو".

لەڕۆخ یەکدی دانیشتن.

موسا کازم ئاغا گوتی: "من، من ناتوانم بەبێئەسپو کێلگە بژیم. تۆ برادەرێکت هەبوو، قاچێکی دەستکردبوو، ناوی چیبوو؟"

"عەلی چاوشەشەل".

"بەڵێ خۆیەتی، ئەوەی کەقاچە دەستکردەکەی لەعەرزی دەداو تەقو رەقی قاچەکە بەرزدەبووەوە. قاچەکەی لەچاناك قەڵا لەدەست دابوو".

"بەڵی وایە ئاغا".

"ئەی ئەوە چیبوو دەتگوت لەگوندەکەی ئەواندا زەویو زاری وا هەیە کە دەشێت کێلگەیان لێدروست بکرێت، دەتگوت کێلگەشی لێن، تۆ خۆت ئەمەت پێگوتم".

"دورستە".

"بابچین ئەو کێلگانە لەنزیکەوە ببینین".

"بابچین بیانبینین ئاغا. هەرکاتێك ویستت دەچین".

"هەر ئێستا کوڕم، ئەگەر رازی بیت هەر ئێستا دەچین".

پویراز بەرەو ماڵی مەلەك خانم رۆیشت، بانگی کرد: "مەلەك خانم، قەدریی بەلەموان لەماڵە؟"

مەلەك خانم گوتی: "لەماڵە، وادێت".

هەر لەگەڵ ئەوەی قەدریی بەلەموان لەنێو شیپانەی دەرگا بەدیارکەوت، پویراز بۆلای موسا ئاغا گەڕایەوە.

قەدریی بەلەموان یەکسەر هات:

"فەرموو سەرۆك".

"بڕۆ پزیشکی ئاژەڵانیش لەگەڵ خۆت بێنە".

"لەو ناوە بوو، هەر ئێستا دەیدۆزمەوە دەیهێنم".

"سوڵتانی من، ئاغای من، ئێستا کە دەمانەوێت کێلگەیەك بۆ بەخێوکردنی ئەسپان دروست بکەین باشتر نیە پزیشکێکی ئاژەڵانیشمان لەگەڵ بێت".

موسا ئاغا گوتی: "زۆر باشە، زۆر باشە". خۆشحاڵ بوو هەر بزەی دەهاتێ.

کەمێك دواتر قەدریی بەلەموان لەگەڵ پزیشکی ئاژەڵان گەیشتن.

"بەخێربێیت کوڕم".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "سوپاس ئاغا".

"قۆڵەکانم، قاچەکانم، هەموو جەستەم لەتوپەت بووە ئاغا. گوللەیەکیشم لەڕانی راستدایە".

"دکتۆرەکان گوللەکەیان دەرنەهێنا؟"

"نەیانتوانی دەریبێنن. زۆریان هەوڵ دا دەریبێنن، بەڵام بۆیان نەکرا، نەکرا دەستی لێبدەن. گوتیان بەخۆی دێتەدەر".

"ئازارو مازارت نیە؟"

"ئێستا نا".

پویراز گوتی: "منیش دوو دانە گوللەم پێوەیە، یەکێك لەساقی قاچی راستمەو یەکیشیان لەشانم دایە".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "من لەبەر کەمئەندامبوونم خانەنشینم. گوللە تۆپەکان، زیاتر ئەسپەکانو یەکەی سوارەی ئێمەیان بەهەموو سوارەکانیانەوە لەتوپەت کرد. ئەوانەیش کە زیندوومانەوە، لەسەر ئەو چیا نەفرەتیە لەسەرمان رەق بوونەوە. تەنها ئەسپێکی ئەبڵەق زیندوومابوو. لەنێو بەفری بنارچیاکە کە تا ناوقەدی دەهات وەکو شێتان بەدەوری خۆیدا دەسوڕایەوە. پاشانیش لەسەر بەفرەکە راکشاو بەجێما. ئەو دەمەی کە خەریکبوو گیانی دەدا هەر ئاوڕی لەئێمە دەدایەوەو سەیری دەکردین، هیچکەس دڵی نەهات بەگوللەی بەزەیی لەو ئازارەی رزگاری بکات".

پزیشکی ئاژەڵان کاتێك ئەم شتانەی دەگێڕایەوە چاوەکانی موسا کازم ئاغا پڕدەبوون لەئاو. فرمێسکەکانی وەکو هێڵێکی باریك بەسەر گۆناکانیدا دەهاتەخوار.

روخساری پویرازیش وەك ئەوەی ئازارێکی گەورە بکێشێت وێکهاتبووەوە.

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "لێمببوورە ئاغا، نەدەبوو ئەم شتانەتان بۆ باس بکەم".

"دەزانم جەنگ چۆنە کوڕم. خۆ تەنێ هەر مرۆڤەکان نین کۆمەڵکوژ دەکرێن، بەڵکو هەموو بوونەوەرەکان لەئەسپ بگرە تا زیندەوەرەکان، گژوگیاکان، هەروا ئاویش دەکوژرێن. منیش جەنگم بینیوە. خوا بیبڕێتەوە، مرۆڤ ئەوەیە".

پویراز گوتی: "ئەوەیە".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "ئەوەیە".

قەدریی بەلەموانیش گوتی: "ئەوەیە، هەموویان خوێنمژن. باوکم لەچاناك قەڵا بوو بەگەردو تۆز. تەنانەت پرتکە گۆشتێکی هێندەی ئەنگوستێکیشیان لێینەدۆزیبووەوە کە

بینێـژن. هاوڕێکانشـی هـەموویان وەك ئـەو بووبوونــە گـەردوتۆزو چـووبوونە هـەوا. خوێنیشیان بووبووە گەردو تەنانەت دڵۆپە خوێنێکیشیان نـەڕژابووە سـەرزەوی". ئـاهێکی قـووڵی هەڵکێشـا. "ئەوەیــە ئــادەمیزاد. مــن رادەکــەمو دەچــمە چــیای هــەزار کــانیی بەرامبەرمان، جا با بەدوامدا بێن بزانم چۆن دەمدۆزنەوە. بابێن بزانم چۆن دەمکوژن".

پویراز تا ئەم کاتە نەیبینیبوو قەدریی بەلەموان کە قەد لەو بارەیە قسەی نـەدەکرد ئاوا بوروژێتو ئـاوا بـەجۆشو هەڵچوونەوە دەردەدڵ بکات. بیریکـردەوە دەنـگو شـێوەی راوێژی، دەنگی سروودی رابوونو رقو راچڵەکینە.

هەموویان پێکـەوە هەسـتان. قـەدریی بەلـەموان رایکـردە لای ئەسکەلە لەبەرخۆیـەوە گوتی، ئەگەر جـەنگ نـەبا مەگـەر وەسـتای مـن، وەسـتای هـەمووومان، خـاكو زێـدی خـۆی جێدەهێشـتو دەڕۆیشـت؟ ئـەم بەلەمـە مـاتۆڕدارەی دەدایـە مـنو دەچـووە نێـو گـاوران؟ دەڕۆیشـت؟ سـواری بەلەمەکـەی بـووو بەیـەك هنـدر ماتۆڕەکـەی داگیرسـاند. دەڕۆیشـت؟ دەڕۆیشت؟ ئێمەو عێلو تایفەو دۆستەکانی خۆی جێدەهێڵانو دەڕۆیشـت؟ بشیانکوشـتبا نەدەڕۆیشت. ئەمەیە دونیا، دونیایەکی گواوی.

موسا کازم ئاغا روو لەماڵەکەی بانگی کچەکانی کرد:

"زەهرا، نەسیبە، ئێمە وا بۆ کێڵگە دەڕۆین، یەك دوو رۆژمان پێدەچێت".

پویراز بەخێراییەوە گوتی: "ئاغا گوێیان لێنابێت، مـن خێـرا دەچـم پێیانـدەڵێم. دەرگا داخراوە".

هێشـتا قسـەکانی تـەواو نـەکردبوون کـە بـەراکردن بـەرەو مـاڵی موسـا ئاغـا رایکـرد، پلیکانەکانی دوو دانە دوو دانە بڕینو بەسـەرکەوت، لـەو دەمـەدا زەهـرا دەرگـای کـردەوە، پویراز چووە ژوورەوە، روخساری سوور هەڵگەرابووو دڵی کـەوتبووە ترپـەترپ. بەرامبـەر یەکدی ئاوا مانەوە. نیگاکانیان لێکگیربووو زەهرا هەموو گیانی دەلەرزی.

پویراز کەمێك دواتر هاتەوە سـەرخۆیو گـوتی: "لەگـەڵ مـام ئاغـا دەچـین بـۆ کێڵگـە. کێڵگەی ئەسپ، سبەی دووسبەی دەگەڕێینەوە".

زەهرا بتەوێت یان نا زەردەخەنەیەکی کەوتە سەرلێوان. چاڵی چەناگەی زیـاتر قـووڵ بوو. "زۆر کێڵگەی یۆنانیـەکان بـەجێماونو زۆر هـەرزان دەیانفرۆشـن. عـەلی چاوشەشـەل وای پێگوتین. پیاوێکی باشە. قاچێکی لەچاناك قـەڵا لەدەسـت داوە. لـەجیاتی قاچـەکەی دارێکـی گـەورەیان بـۆ لەشـوێنی قاچـەکە دانـاوە، کـە بـەڕێگادا دەڕوات دەنگـی تەقەتـەقی مەودایەك دەبیسترێت".

"بەسلامەت بچنو بێنەوە". زەهرا دەیویست زیاتر قسان بکات، بەڵام دەنگی دەرنەدەهات.

پویراز پاشەوپاش گەڕایەوەو چووە دەرەوە، ئەگەر کەمێك زیاتر بۆ دواوە رۆیشتبا لەنۆهمی دووەوە دەکەوتەخوار، زەهرا خێرا خۆی درێژیکردو گرتیو بەرەو لای خۆی راکێشا، پاشان دەستی خۆی وەك ئەوەی کەوتبێتە سەر بڵێسەی ئاگر کێشایە دواوە، لەرزینەکەی زیاتر بووبوو. پویراز هەر لەگەڵ ئەوەی دەستی کچەکەی پێکەوت هەموو گیانی کەوتە راچڵەکین. ماوەیەك لەسەر پلیکانەکان مایەوە. هەردووکیان وەك ئەوەی ئەفسوون بووبن. ماوەیەك ئاوا لەیەکدیەوە رامان.

بەخێرایی لەپلیکانەکان چووەخوار. بیریکردەوە، ئێستا ئەوان هەموو شتێك تێدەگەن. بەرەو لای کانیەکە رایکرد. مست مست ئاوی بەسەروچاوی داکرد. کەمێك هاتەوەسەرخۆی. بۆلای بەلەمەکە رایکرد.

مام ئاغا پرسی: "پێتگوتن کوڕەکەم؟"

پویراز گوتی: "پێمگوتن".

موسا ئاغا بەڕاوێژێکی کەمێك شڵەژاوەوە گوتی: "پێتگوتن سەفەرەکەمان سێ رۆژ درێژە دەکێشێ؟"

پویراز گوتی: "پێمگوتن".

"ئاخر قەت لێیاندوورنەکەوتوومەتەوە".

"مەلەك خانمو شەریفە خانم بەتەنێیانناهێڵنەوە".

"وەلی نیشانچیش پاسەوانی دوورگەیە".

"ئەوە ماوەیەکە هەر نایبینم".

"هەموو رۆژێك بەرلەوەی دوندی چیاکان رووناك دابێن دەچێتە راوەماسی. ماسی لەنێو دەریا ناهێڵێت یەك بەیەك گوندو شارۆچکەکانی لێوار دەگەڕێتو تەنانەت ماسیەکانی دەفرۆشێتە ماسیگرە کۆنەکانی کوردیش، لەو سەریش بەجلە سەرتاپا بەپوولەکەی ماسیان داپۆشراوەکان دەگەڕێتەوە بۆ ساتێکی کەم هەر هێندەی چاو هەڵێنیت نەوەکانی دەبینێتو لەکاتێکدا بۆنی ماسی بەو ناوەدا بلاودەکاتەوە وەکو بروسکەوبا دەگەڕێتەوە نێو بەلەمەکەی.. ئەو کاتێك دێتەوە دوورگە ئێمە نابینێت، لەدوورگە نامێنێتەوەو هەر خێرا خێرا دەگەڕێتەوە نێو دەریا".

موسا کازم ئاغا گوتی: "کابرایەکی چەند سەیرە!"

پویراز گوتی: "منیش لەهەموو تەمەنمدا هیچکەسی وەك ئەوم نەبینیبوو پیاوێکی زۆر ئازایەو دڵێکی سافی هەیە".

پویراز چوو لەنێو کابینەی بەلەمەکە نیمدەرێکی ئەستوورو نەرمی هێناو داینایە سەر تەختەکانو گوتی: "فەرموو لێرە دابنیشە ئاغا. ئەگەر پشتیشتان بەتەختەکانەوە بدەیت دەتوانیت بەئاسوودەیی دابنیشیت".

موسا ئاغا لەسەر نیمدەرەکە دانیشت. ئەوانی دیکەش لەچوار دەوریدا دانیشتن.

قەدریی بەلەموان بەلەمی وەڕێخست. بەلەم لەسەر دەریای سافو بێشەپۆلدا دەخشی.

بێئەوەی هیچ قسەیەك بکەن دەمە دەمی عەسر گەیشتنە گوندەکەی عەلی چاوەشو لەئەسکەلەدا لەنگەریان گرت. بەلەموان. بەلەمەکەی لەشیشە ئاسنەکەی لێوار بەستەوە. گوندیەکان ئەوانیان ناسی. لەسەر تەختەکانی ژێر چنارەکان هەستان هاتن فەرموویان لێکردن.

پویراز گوتی: "هەموومان دەناسن، بەڵام موسا کازم ئاغا ناناسن. لەدوورگەی ئێمە دادەنیشێت. گەورەی ئێمەیە، هاتووین عەلی چاوەش ببینین".

کەمێك دواتر دەنگی قاچەدارینەکەی عەلی چاوەش کەوتەبەرگوێ.

"عەلی چاوەش خەریکە دێت".

"ئێوەی کە بەرێوەبوونە بینیوە بۆیە وادێت".

"بەلەمەکەی ناسیوەتەوە".

"دەزانێت بەلەمی دوورگەی ئێوەیە".

"ئەو هەر ئەوەندە بەسە کەسێك یان شتێك ببینێت. ئیدی لەبیری ناکات".

عەلی چاوەش هەرکە لەدارچنارەکان نزیك بووەوە هاواریکرد:

"بەخێربێن. بەخێربێن. سەفاتان هانی".

بەخێرایی هاتو هەمووان لەبەری هەستان.

عەلی چاوەش بەرلەوەی دابنیشێت گوتی: "بەخێربێیت موسا کازم ئاغا"و لەسەر تەختێکی چۆڵی تەنیشتیەوە دانیشت. پزیشکی ئاژەڵان واقی وڕمابوو.

"عەلی چاوەش مام موسا کازم ئاغا لەکوێ دەناسیت، مەگەر پێشتر بینیوتە؟"

"سەرسوڕمانی ناوێت، ئەوەندەتان باسی موسا کازم ئاغا کردووە، ئەگەر لەسەرچیایەکیش بەتەنیا بمدیبا دەمناسی".

موسا کازم ئاغا بەراوێـژێکی بەرزەفڕانـە گـوتی: "پایـەدار بیـت عـەلی چاوەش". عـەلی چاوەش بانگی لاوێکی کرد کە لەوێ راوەستابوو، هەستاو خـۆی بـۆلای ئاوەکـە لارکـردەوەو شتێکی چرپاندە گوێی‌و گوتی: "راکە بڕۆ".

ئینجا رووی لەوان کردو دەستیان بەقسان کرد.

عــەلی چــاوەش لــەپڕ بێــدەنگ بــوو، خــۆی درێــژکردو دەســتی پــویرازی گــرت‌و نیگاکانیان لێکگیربوو.

"بیستم ئەو کافرە، ئەو گورگە، لەوێ کوشکی چێشتلێنـەرەکانی تێکداوەو تەختەو دارەکانیشـی بــردووە لــەئزمیر فرۆشــتوویەتی. ئــەو کابرایــە بێناموســە کلێساشــی تێکداوە. چۆن توانیویە کلێسا تێکبـدات. ئێسـتا بـابلێین دەبـوا منارەتـان بـۆ دروسـت بکردباو جارێ پارەتان نەبووە، مزگەوت بەبێمنارەش دەبێت. دواجار دوورگە رۆژێك هـەردێت پڕببێـت لەخـەڵك‌و پـارەی دروسـتکردنی منـارەش پێکـدەهات‌و منارەیـەکی بەرزتان قیت دەکردەوەو دوورگەکەتان ئاوەدان دەبوو. لەم لێوارانە، دێهات‌و دوورگەو کێڵگەی زۆر هەن کە حکومەت تا ئێستا کۆچبەری وای دەست نەکـەوتووە ئاوەدانیـان بکاتەوە یان ئەو شوێنانـەیان نیشان بدات. ئەو خوانەناسـە کـە کوشـتنی بـەپێی هـەر چوار کتێبـان واجبـە، لـەژێرەوە لەگـەڵ حکومـەت رێککـەوتووەو دێهاتـەکانی نیشـانی کەس نەداوە. ئەو بێشەرەفە هـەموو خـانووو بینـای ئـەو گونـدە یۆنانیانـەی لێـواری وێـران کـردووەو کەلوپەلـەکانی بەداشـقەو کامیۆنـان بـردووە بـۆ شـار. لـەو خـوارەوە هەرچـی گونـد هەیـە تێکیـداوە. چـووین سـەرمان لەشارۆچـکەدا، گوتیـان پـارەی داو هەمووی لەئێمە کڕیوەو تێکیاندەدات... گوتیان نەمانفرۆشتبان‌و لێگەڕابایـن بڕمێن‌و دابڕزێنە سەریەك؟"

ئـەو گوندیانـەی کـە لـەوێ بـوون یـان بەقسـە یـان بـەئاماژەی سـەر قسـەکانی ئـەویان پشتڕاست کردنەوە.

عەلی چاوەش بەنیگەرانیەوە هەستا:

"وای، بەقسان سەرمان گەرم بووو ئێوە لەبرسان مردن. کابانی ئێمە زرنگـە، تـا ئێسـتا خواردنی ئامادەکردووە. زووبن هەستن، بۆنی خواردن دەکەم".

عەلی چاوەش لەپێشەوەو ئەوان بەدوایدا چوونەوە ماڵ. بەڕاستی بـۆنێکی خـۆش ئـەو ناوەی داگرتبوو. سفرە لەسەر عەرز نا لەسەر مێزێکی شەش کەسی پان کرابووەوە.

موسا کـازم ئاغایـان لـەلای سـەرەوەی مێـزو پزیشـکی ئاژەڵانیـان لەبەرانبـەر دانیشـاند. پویرازو عەلی چاوەش لەملاو ئـەو لای مێزەکـە دانیشـتن. قـەدریی بەلـەموان لەگـەڵ ئەوانـەی ماڵەکە لەسەر عەرز لەدەوری ئەو سفرەیە دانیشتن کە لەناوەڕاستی ژوورەکە پان کرابووەوە.

موسا کازم ئاغا دوای ئەوەی کە لەسـەرمێزەکە دانیشت بەعـەلی چاوەشـی گـوت: "ئـەو زەحمەتەتان بۆ کێشا. ئێمەش لەسەر عەزر دادەنیشتین".

عەلی چـاوەش بەهەسـتێکی شـەرمنانەوە گـوتی: "گـەورەم ئێمـە بـۆ میوانـانی بـەڕێزی وەك ئێوە ئاوا سفرە دادەنێین".

"تکاتان لێدەکەم، زۆر سوپاسی گەورەییتان دەکەم".

یەکـەمجار دۆڵمـەی کولەکـەیان هێنـا کـە بەنقیشـكو سـرکەی هـەنارو مەعـدەنووسو دۆشاوی تەماتە بەکەمێك سیرەوە لێندرابوو.

موسا کـازم ئاغـا ئـەو پیـاوە بەشـکۆو رووگەشـە بەزەردەخەنـەو شـادیەکی منداڵانـەوە گوتی: "من کاتێك وڵاتی خۆم جێهێشت بیرمدەکردەوە تازە چیدی ناتوانم دۆڵمەی کولەکە ببینمەوە. دیارە ئێوەش ئەو جۆرە دۆڵمەیە دروست دەکەن!"

"لەودیو ماڵەوە پارچە زەویەکی نزیکەی هەزار مەتر چوار گۆشەمان کولەکە لێچاندووە".

پویراز گوتی: "ئاغا ئێوە هیچ خۆتان نیگەران مەکەن. من لەباخچەی پشت ماڵی ئێـوە لەمسـەر تـا ئەوسـەر کولەکـە دەڕوێـنم. دەڵـێن مەلـەك خـانم دۆڵمـەی کولەکـەی بـەتام لێدەنێت لێناش هەروا".

پزیشـکی ئـاژەڵان بەشـانازیەوە گـوتی: "مەلـەك خـانم وەسـتایە. ئـەو دۆڵمانـەی ئـەو لێیدەنێت ئەنگوستی لەگەڵ دەخـۆین. مەلـەك خـانم دۆڵمـەی بەسـرکەی هـەنار لێـدەنێت دۆڵمەیەك کە بۆنو بەرامەکەی لەدوورە هەست پێدەکـەیت، ورگـت دەهێنێتـە قوڕەقـوڕو ئاوت لەدەمی دێنێت".

موسا کـازم ئاغـا لەکاتێکـدا کـە دەسـتی بەڕیشـە رێکوپێکەکـەی دادەهێنـا، گـوتی: "کەوایـە ئێمـە هاتووینەتـە بەهەشـتو خۆمـان پێماننـەزانیوە. بەمپێبـەبێت کـاری کێڵگەکەشمان رێکدەکەوێت".

پـویراز مەبەسـتی هاتنەکـەیانی روونکـردەوەو گـوتی کـە موسـا کـازم ئاغـا لەکرێتـەوە هـاتووە، لـەوێ کێڵگـەی بـەخێوکردنی ئەسـپی هـەبووەو ئەسـپی رەسـەنو زۆرباشـی بەخێوکردوونو ئێستاش بەتەمایە لێرە کێڵگەیەك بکرێتو ئەسپی تێدا بەخێو بکات.

عەلی چاوەش گوتی: "ئووهووو، لێرەوە بگرە تا بناری چیا تا دڵت حەزبکات کێڵگە هەیە. ئومێدەوارم هەموویان نەدابنە ئاوارەکان، هەر کامێکتان بەدڵ بوو بیکڕن".

"ئەگەر دابیتیانە ئاوارەکانیش، لێیاندەکڕینەوە. لێرە ئەسپی رەسەن رەسەن بەخێو دەکەم".

"چۆن دەتوانین بچینە ئەویّ؟"

"بەداشقە".

عەلی چاوەش بەشەرمنیەوە گوتی: "ئێمە لەگونددا داشقەمان نیە".

"بەسواری ئەسپ دەچین".

"من ناتوانم سواری ئەسپیش بم".

موسا کازم ئاغا گوتی: "دەتوانیت، دەتوانیت" راوێژەکەی فەرماندەرانەبوو. عەلی قاچە دارینەکەی نیشان دا:

"ئەمە چی لێبکەم؟"

"لێیدەکەیتەوەو دەیخەیتە سەر بەپشتی ئەسپ".

"کارێکی ئاسان نیە. تەنها ئەو گوندەی خواریّ داشقەی هەیە. گوندی ساڵحەکوێر منیش قسەم لەگەڵ ئەو کوێرە نەفرەتیەدا نیە. کاك پویرازو کاك جەمیل دەیناسن".

عەلی چاوەش بەنیگەرانیەوە باسی ئەوەی کرد کە چۆن لەگەڵ یەکدا برادەری گیانی بەگیانی بوون، چۆن لەچاناك قەلآ شان بەشانی یەك لەبەرانبەر دوژمن راوەستان. چۆن بوو ئەو چاوی لەدەست داو خۆیشی قاچیو دواجار چۆن لەیەك تووڕەبوون.

پویراز پرسی: "ئەی ئێستا چیبکەین؟"

"ئەگەر داوای داشقە بکەین من نایەمە ناو گوندی ئەو کوێرە لەژێر چنارەکان دەوەستم. ئێوەش دەچنە ماڵی کوێرە، ئەو بەباشی پێشوازیتان لێدەکات. داشقەشتان بۆ ئامادە دەکات. من لەژێر چنارەکان چاوەڕێتان دەکەم. نامەوێت روخساری ئەو بەرازە ببینم. ئەو کوێرەی نەفرەتی، منی کە لەبرا براتر بووم بۆی بەکەسێکی نەناس فرۆشت، کەسێك کە نەیدەناسی، نەیدیبوو، نیشانچیە نیشاندانەرە کێیە، چی پێدەڵێن هەرچەندی لەبەری پاڕامەوە بەلەمەکەی نەدایە من، قسەی منی شکاند، حسابی سەگێکی بۆمن نەکرد".

بەدەست ئاماژەی بەپویراز کرد: "منی لەبەرامبەر ئێوە، لەبەرامبەر هەموو خەڵك‌و دونیادا ریسواکرد. چوو ماتۆڕەکەی دایە ئەو نیشانچیە، نیشانچیە کێیە، هەر

کێ بێت، دایە ئەو کورتە باڵایە. تا ماوم قسەی لەگەڵ ناکەم، وەسیەتم کردووە ئەگەر مردیشم نەهێتە سەر تەرمم. ئەو بێدینەش کە کوشتنی واجبە، ئەگەر بمرێت ناچمە سەرتەرمی".

عەلی تا زیاتر قسەی دەکرد، زاری زیاتر کەفی دەکردو لەتووڕەییان دەماری ملی هێندەی ئەنگوستێك راکشابوون.

رۆژی دووەم، بەیانی زوو سواری بەلەم بوون‌و دەمەدەمی نیوەڕۆ گەیشتنە گوندی ساڵحەکوێر. کەس لەژێر چنارەکان نەبوو.

پویراز گوتی: "ئێستا هەوا فێنکە، کەمێکی دی کە هەوا گەرم داهات، ژێر چنارەکان پڕدەبێت لەخەڵك".

پویراز لەم قسانەدا بوو کە پیرەمێردێك لەولاتر بەدیارکەوت، پیرەمێردەکە کاتێك خەریکبوو لەسەر تەختەکان دابنیشێت ئەوانی بینی، گوتی: "بەخێربێن، فەرموون دابنیشن. "تەختەکانی ژێر چناری نیشان دان‌و خۆیشی دانیشت. "بەخێربێیت عەلی چاوەش، بیستوومە نێوانت لەگەڵ ئەو کوێرەی ئێمە تێکچووە، راستە؟"

عەلی چاوەش گوتی: "راستە".

"مرۆیەکی زۆر منجڕو بێنمەکە. خۆی دەیگوت ئەو رۆژەی کە گوللەی بەچاوی کەوت لەژێر بارانی گوللان تا شەو داهاتووە بەخۆت‌و خاچی بریندارتەوە ئەوت لەکۆڵ ناوەو گەیاندووتە چادری نەخۆشخانە. خۆی ئەمەی باسکرد. پاشانیش دەیگوت من چ خراپەیەکم دەرهەق عەلی چاوەش کردووە. ئێستاش بەردەوام کام جنێوی مزر هەیە پاشەملە پێتدەدات. هیوادارم بۆ بینینی ئەو نەهاتبیت".

"خوا بەلەعنەتی بکات".

کەمێك دواتر، ئەو دێهاتیانەی هەواڵی هاتنی میوانەکانیان بیستبوو ژێر چنارەکانیان پڕ کرد. هەموو دێهاتیەکان چ یۆنانیەکان چ موسڵمانەکان عەلی چاوەشیان خۆشدەویست‌و رێزیان لێدەگرت. دێهاتیەکانی لێوار بەر لەوەی بچێتە سەربازی‌و قاچی لەدەست بدات ئەویان دەناسی. هەرکەسێك بکەوتبایەتە تەنگانەیەك هانای بۆ ئەو دەبردو ئەویش تا بیتوانیبا یارمەتی دەدان.

"چەپەڵی کوێر لەوەتەی دڵی منی شکاندووە تەنانەت بەبەردێیەکەشماندا رەت نابێت. کاتێك لەگوندەوە دەچێتە شارۆچکە لەئاستی گوندەکەی ئێمە رێگای خۆی

دەگۆڕێت‌و بەو لای گونددا ڕەت دەبێت. دەزانێت چ گوویێکی خواردووە. تەنانەت کاتێک لەمەجلیسێکدا ناوی من بێنن سەری لەبەرخۆی دەنێتەوەو ناتوانێت سەرهەڵبڕێت‌و سەیری کەسیان بکات.

ئەو پیرەمێردەی کە لەڕۆخ موسا کازم ئاغا دانیشتبوو بەتووڕەییەوە گوتی:

"کسۆکی پێچاوو روو. بریا چاوەکەی دیکەشی گوللەی پێدەکەوت‌و ئیدی بەتەواوی کوێر دەبوو. تۆ بەقاچی بریندارتەوە لەکاتێکدا خوێنت لەبەر دەڕۆیشت ئەوت بەکۆڵی خۆتەوە گەیاندە لای دکتۆر، ئەگەر زیاتر خوێنت لەبەر رۆیشتبا دەمردیت. کاتێک لەژێر بارانی گوللەدا گەیشتنە بەردەم چادری دکتۆرەکان هەردووکتان لەهۆش چوون. دکتۆرەکان ئێوەیان بردبووە بن چادرەکەو هەردووکتانیان نەشتەرگەری کردبوون. عەلی چاوەش، ئەگەر تۆ نەبایت‌و ئەو سەگەت لەماوەی یەك سەعاتدا نەگەیاندبا نەخۆشخانە، هەردووچاوەکانیشی کوێردەبوون. ئەگەر ئەو کوێرە نمەکنەشناسەت لەکۆڵ نەناباو خێرا نەتبردبا نەخۆشخانە قاچیان نەدەبڕیتەوە. ئێستا ئەو قاچە..".

لەپڕ قسەی خۆی بڕی، هەمووان روویان بۆ رێگا سەرەکیەکەی گوند وەرسووڕاندبووو سەیری ساڵحەکوێریان دەکرد کە کەمێك لەولاتر ڤیتاوڤیت راوەستابوو. پیرەمێردەکە درێژەی بەقسەکانی دا: "ئێستا ئەم قاچە دارینەیەت نەدەبوو. ئەو شتانە هەموو ئەو ئەهریمەنە کوێرە بۆی باسکردووین. جارێك‌و دووجار نا، بەڵکو چەندین رۆژ. سەیری بکە لەوێ راوەستا، وەکو مار، نەدەتوانێت بهێتەپێش، نەبشگەڕێتەوە، کاتێك لەسەرچیایەك یان لەنێو کێڵگەیەك رووبەڕووی مارێك دەبێتەوە نەمارەکە دەتوانێت لەجێی خۆی بجووڵێت نەتۆ. لەجێی خۆتان ناچار دەبن رابوەستن. ناتوانن تەکان بخۆن. تا ئەو دەمەی گیاندارێك بەلاتاندا تێنەپەڕێت ئەمەش ئێستا..".

پیرەمێردەکە قسەکانی راگرت‌و رووی بۆلای لێوار وەرسووڕاند. خەڵکەکەش روویانکردبووە لێوارو دەنگ لەبەرهیچیان نەدەهاتەدەر.

عەلی چاوەش سات ناساتێك بێئەوەی ئەوانیدی سەرنج بدەن، لەژێرەوە تەماشەیەکی ساڵحەکوێری دەکرد کە بەپێوە وەستابووو پاشان چاوی لەسەرهەڵدەگرت‌و سەیری ئەو پیرەمێردەی دەکرد کە کەمێك لەولاترەوە دانیشتبوو.

بێدەنگی خەڵکەکەو راوەستانی ساڵحەکوێر ماوەیەك درێژەی کێشا. دواجار، ساڵحەکوێر تەکانێکی دایە خۆی، سەیرێکی ئەملاوئەولای خۆی کرد. پاشان سەری

هەڵبڕیو لەکاتێکدا قاچەکانی دەلەرزین هەنگاوی هەڵێناو هاتە پێش عەلی چاوەشو چاوی لەسەر هەڵنەگرت. ساڵح ملی لارو دەستەکانی بەملاو ئەولایدا شۆڕ بووبوونەوە. کەمێك بۆلای چەپو راستی هەژا. ئەوەی دەیویست بیڵێت لەقورگیدا گیریخواردبوو. هەوڵێکی زۆری دا قسەبکات، بەڵام نەیتوانی، خەڵکەکە چاویان بڕیبووە ئەوو چاوەڕوان بوون. هەر ئەوەتا دەبیستراو نەدەبیستڕا ناوی عەلی چاوەشی لەدەم دەرهات. لێوەکانی دەلەرزین. لەپڕ وەقسەهات:

"من نەدەبوو ئەوەم لەگەڵ تۆ کردبا عەلی چاوەش. دەزانم زۆر پێداگریت کرد. دڵم شکاندی. دونیایەك لەسەر هەقی. قاچت لەپێناوی من لەدەست دا. دکتۆرەکان گوتیان ئەگەر بەو قاچە برینداروو خوێناویەتەوە منت هەڵنەگرتبا قاچیان نەدەبڕیتەوە. ئەگەر کەمێك درەنگتر بگەیشتبایتە دکتۆرەکانو خوێنی دەمارەکانت چکی کردبا هەردووکمان دەمردین".

بەتەواوی هاتبووەوە سەرخۆیو روویکردە دێهاتیەکان:

"مەگەر هەزار جار ئەمەم بەئێوە نەگوتوە، بێژن! دەست بنێن بەویژدانتانەوەو بێژن".

دەنگ لەبەر کەسیان نەهاتەدەر.

"بۆ وەکو بەردی گۆڕتان لێهاتووە، ئەم شتانەم پێنەگوتوون؟"

ئەمجارەش هیچ دەنگێك نەهات.

ساڵح پەشۆکابوو، نەیدەزانی چیبکات، بەچاوانی نائومێدو حەپەساوەوە سەیری خەڵکەکەی دەکرد.

عەلی چاوەش نەیتوانی لەوە زیاتر بەرگە بگرێتو لەچاو قوچانێکدا هەستاو چوو ساڵحی گرتەباوەش. دوو دەست ماوەیەك ئاوا کە یەکدیان گرتبووە ئامێز بەملاوئەلادا هەژان، ئینجا عەلی چاوەش دەستی ساڵحی گرتو لەنێوان خۆیو پویرازی دانیشاند.

ساڵحەکوێر هەستی بەشادمانی دەکرد. چاوەکانی لەخۆشیان دەبریسکانەوە، دەستەکانی خۆی دانانە سەرشانی عەلیو گوتی: "ئەمانەتە، بەڵکو بشگەڕێتەوە. ئەمانەتە، خاوەنەکەی ئەگەر سبەی دووسبەی هاتەوەو هاتە سۆراغی بەلەمەکەی من دەتوانم چیپێبیڵێم، ئێوە بڵێن".

کەس وەڵامی نەدایەوە.

دووبارە لەکاتێکدا سەیری یەکەیەکەیانی کرد قسەکەی خۆی دووبارەکردەوە:

"چی پێدەڵێن، پێیدەڵێن، بەلەمەکەتمان فرۆشت؟"

ئـەمجارەش کاتێـك کـەس وەڵامـی نەدایـەوە تووڕەبـوو، دەمارەکـانی ملـی رەپ راوستان، بەدەست شانی عەلی چاوەشی گوشیو گوتی: "عەلی تۆ بڵێ، تـۆ بڵـێ براکـەم، ئەگەر تۆ بایت چیتدەکرد؟"

شانی عەلی چاوەشی زیاتر گوشی:

"لەم دونیایەدا تۆ بەهیچشتێك ناگۆڕمەوە. خۆت ئەمە دەزانیت، تۆ بوویتایە چیتدەکرد؟"

عەلی چاوەش هیچی نەدەگوت.

بەردەوام شانی عەلی چاوەش دەگوشی.

ساڵحەکوێر چاوی بەیەکەیەکەی ئامادەبووانـدا دەگێـڕاو نیگای لـەنیگای هەرکەسـیان گیردەبوو ئەو کەسە سەری لەبەرخۆی دەنایـەوە. دواجـار، نیگـای لەگـەڵ موسـا کـازم ئاغـا تێکهەڵنگوت. موسـا ئاغـا چـاوی دانەخسـت. چـاوە سـاغەکەی سـاڵح ئەوەنـدەی دی گـەورە بووبـوو لەبـەر ئـازار دەتریفنگایـەوە. سـاڵح شـتێکی وەك میهروخۆشەویسـتی لەچـاوەکانی موسا ئاغا دابینی، گوتی:

"ئەمانەت، دەکرێت خیانەت لەئەمانەت بکەین؟"

موسـا ئاغـا بەوپـەڕی شـکۆمەندیەوە گـوتی: "ناکرێـت، نابێـت بکرێـت. خیانـەتکردن لەئەمانەت لەشانی مرۆڤ نایە".

سـاڵح لـەوەی کـە موسـا ئاغـا پشـتیوانی لێکردبـوو کـەمێك هێـزی هاتەوەبـەر، هاتـەوە سـەرخۆی، دەسـتی لەسەرشـانی عـەلی چاوەش هـەڵگرتو لەکاتێکدا دەنگـی زیـاترو زیـاتر هەڵدەبڕی گوتی: "نەلەشانی مرۆڤ نەلەشـانی غـەیرە مـرۆڤ دایـە. ئەگـەر سـبەی بێتـەوە؟ مەگەر متمانە بەقسەی حکومەت دەکرێت؟"

موسـا ئاغـا گـوتی: "دەکرێـت". لەبەرخۆیـەوە گـوتی، بریـا ئـەو قسـانەم پێنـەگوتبایت ساڵح، بیریکردەوە، بەڵکو ئەو پیاو، لـەوێ مـەئموری حکومـەت بووبێـت، رێـك لـەم کاتـەدا عەلی چاوەشی دەستی گرتو گوشی.

موسـا ئاغـا گـوتی: "ناکرێـت خیانـەت لەئەمانـەت بکـەین. ئەمانـەت. مـن ئـەو کاتـەی دەهاتمە ئێرە، کێڵگەو کۆشكو تەویلەو شەستو حەوت ئەسپی رەسەنو بـاغو باغچـەکانم سـپاردنە دۆسـتو دراوسـێکانم ئەوسـا هـاتم، هـەر کاتێـك بگەڕێمـەوە کرێـت هـەموویان وەردەگرمەوە. چـەند بـاوەڕم بـەخوا هەیـە ئەوەنـدەش بـاوەڕم بـەم قسـەیەم هەیـە. هـەر کەسێك خیانەت لەئەمانەتدا بکات چەپەڵترین کەسە، کاك ساڵح لەسەر هەقە".

"ئەگەر لەسەر هەقە، ئەی بۆچی بەلەمی ئەمانەتی دایە کەسێکی دیکە، کەسێك کە هەر نەشیدەناسی؟"

سالْح گوتی: "دام، بەلاّم خۆیشم نازانم بۆچی ئەوەم کرد. نازانم بۆچی ئەمانەتم نەدایە ئەم کاك عەلیە کە لەبراش نزیکترە بۆم، گیانو چاویشمی لەفەوتان دەربازکردو دامە ئەو پیاوەی کە هەر نەشمدەناسی. ئەمانەتەکەم پێدا، بەلاّم وەك ئەوەی گیانی خۆمم پێدابێت ئاوا لێمتێکچوو، رۆژێك سەر لەبەیانی، پیاوێك هاتو لەبەر دەرگای ماڵەکەم راوەستا، سلاّوی کرد، وەلاّمی سلاّوەکەیم دایەوە، فەرمووم لێکرد بۆ ژوورەوە، نەهات، گوتی کاکە پویرازیش سلاّوی هەیە. چاومان بەچاوی یەك کەوت، نیشانچی بەرەو لێوار هەنگاوی هەڵێنا، منیش بێدەستی خۆم کەوتمە دوای، شان بەشانی یەکدی دەڕۆیشتین. تا ئاق قایای خوارەوە چووین بێئەوەی هیچ قسەیەك بکەین. پاشان گەڕاینەوە ئەو رۆژە جارێکی دیکەش چاومان بەچاوی یەکدی کەوتەوە. چاوەکانی ئەو پیاوە شتێکیان تێدابوو کە چاوم پێیاندەکەوت هەموو گیانم دەلەرزی. شەویش نەمدەتوانی بخەوم. سێ رۆژان بەو شێوەیە هاتینو چووین، سێ رۆژان ئاوا سەیری دوڕچاوی یەکدیمان کرد. نەمدەتوانی سەیری چاوەکانی نەکەم. دەمزانی جادووی لێکردووم، بەلاّم چم لەدەست نەدەهات. دەمزانی جادووگەرە.

نیگاکانی رۆچوونە ناخی دڵمەوە. چاوانی وردو بەقۆڵداچووی هەبوون کە دیار نەبوو شینن. سەوزن، سوورن، تێکەڵەیەك بوونو دەبریسکانەوە. بۆ هەر لایەك دەچوو هەنگاوەکانی منیشی بەدوای خۆیدا رادەکێشان. بەچەشنێك بۆ نموونە ئەگەر بەم دارچنارەدا هەلگەڕابا منیش بێدەستی خۆم پێیداهەڵدەگەڕام، ئەگەر خۆی هەڵدابایە نێودەریا منیش بەدوایدا خۆم هەڵدەدایە نێو دەریا، ئەگەر بەرەو ئەم چیایەی قازداغیەی بەرامبەرمان چووبا منیش دەکەوتمە دوای. ئەگەر باڵی گرتباو چووبایە ئاسمان، منیش باڵم دەگرتنو دوای دەکەوتم، من بووبوومە دیلی ئەو. دەمەدەمی نیوەڕۆی رۆژی سێیەم بەنەفرەت بێت یەکدیمان بینیەوە.

نەمدەزانی چیبکەم، بەئەنگوست ئاماژەی بۆ بەلەمە ئەمانەتیەکە کرد کە تەنانەت نەمدابووە عەلی چاوەشیش. نەمتوانی هیچ قسەیەك بکەم. سەری خۆم بەهێمای بۆ خۆتی ببە راهەژاندو خێرا رامکردەوە ماڵەوە، سێ رۆژان پێم لەماڵێ نەهاتەدەر. هەر بیرەمدەکردەوەو بەخۆمم دەگوت ئەمە مرۆڤ بوو، جنۆکە بوو، چیبوو، بەخۆمم گوت

نەكا پیر خدر بێت. لەو ڕۆژەوە تا ئێستا هەر خەریكم بیردەكەمەوە، بەڵام بۆم ڕوون نەبۆتەوە كێیە؟"

عەلی چاوەش بەڕاوێژێكی نەرمو میهرەبانەوە گوتی: "ئەو بنیادەمێكە ساڵحی برا، بنیادەمێك كە لەبەیانیەوە تا شەو دادێت هەر ترخێنەو دۆڵمەی كولەكە دەخوات".

هەموویان پێكەنین.

ساڵح بەبزەوە گوتی: "بنیادەم بوو؟"

عەلی چاوەش لەوەڵامدا گوتی: "بەڵكو خدریش بووبێت". دوای ئەوەی كەمێك بیریكردەوە گوتی:

بۆچی نابێت وەلی نیشانچی خۆی خدری زیندە بێت، سڵاوی خوای لەسەر، هەم دەتوانێت خدر بێت هەم بەراز".

"كوڕە كوێرە ئێمە بۆ كارێك هاتووینەتە ئێرە، ئەگەر ناتوانیت كارێكمان بۆ بكەیت بڵێ با وەلی نیشانچی واتە خدری زیندەت بۆ بانگ بكەین. بتەوێت هەر ئێستا بانگی دەكەین، لەچاو تروكانێكدا خۆی دەگەیەنێتە ئێرە، ئەو هەمان خدری سواری ئەسپە خاكیەكەی دەریاكانە، تێگەیشتیت؟"

"تێگەیشتم، تێگەیشتم هەر كێت دەوێت بانگی بكە، بەس ئەو جادووگەرە بانگ مەكە، تۆ ئەم خوایە بانگی مەكە، هەرچی دەڵێیت یەكسەر ئەنجامی دەدەم. سەرچاو، بەڵام بانگی ئەو مەكە".

"موسا كازم ئاغا، داواكاریەكی هەیە. ئاغا لەكرێت كێڵگەیەكی هەبووە كە ئەسپی رەسەنی تێدا بەخێو كردوون. دەڵێت كێڵگەكەی بەدراوسێكانی سپاردووە. لەم دەوروبەرانە بەدوای زەوییێكدا دەگەڕێت كە بیكاتە كێڵگە. ئێمە بۆ ئەوە هاتووینەتە گوندی جەنابی پایەدارتان.. كێڵگەیەك لەیۆنانیەكان؟"

ساڵحەكوێر گیانێكی هاتەوەبەر، بەتەواوی هاتەوە سەرخۆی. واپێدەچوو ئیدی لەگەڵ عەلی چاوەش ئاشتبووێتەوە بەدەربرینێكی شادمانانەوە گوتی: "هەیە، كێڵگەكەی ئێلیا چورباچی. سپاردوویەیتە وەستا سمایل، وەستا سمایل سەركاری ئێلیا چورباچی بوو.

چورباچی هەمیشە بەسمایلی دەگوت وەستا، تا ئێستاش تێنەگەیشتم وەستای چیە. سمایل خۆیشی تا ئێستا نەیتوانیوە ئەوەم بۆ ڕوون بكاتەوە".

پیاوێكی بەنێو ساڵانداچوو كە پشتی بەدرەختی لێوی دەریاوەدا بووو بەژنبڵندێكی روخسار باریكەڵەو چاوانی بەقووڵداچووو سەرو وەزعێكی ڕێكوپێكو شەلوارێكی

ئوتـوکراوو چـەکمەو ئێلـەگێکی خەتخـەتو سمێڵێکـی کشـتکراوی هـەبوو، لـەجێی خـۆی هەستاو گوتی: "من سمایلم، وەستای ئەسـپان مـنم، سـاڵح سـەری لەهیچشـتێك دەرنـاچـێت، بەرلەوەی بچێتە سەربازیش هـەرئاوابوو. هـەموو کاروبارەکـانی تایبـەت بەکێڵگـەی لـەمن دەپرسین. ئەسپی رەسەنیشمان بەخێو دەکردن. ئێلیـای چورباچـیش وەکـو جـەنابی ئاغـا، ئەسـپی رەسـەنی بـەخێودەکردن. مـن شـارەزای بـەخێوکردنی ئەسـپم. لەبەرئـەوەش چورباچی پێیدەگوتم وەستا".

سـاڵحەکوێر گـوتی: "ئـەو سمایلـە غەریبـە ئەوەنـدە لەئەسـپ نازانێـت کـە بشـێت پێیبگوترێـت وەسـتا. ئـەو بـەر لـەوەی کـە یۆنانیـەکان لێـرە بـڕۆن هەمیشـە بەخاچێکی زێڕین بەملیەوە لەم ناوە دەهاتو دەچوو".

"تۆ تا ئێستا قەت زێڕت بینیوە؟"

"خـوا لـەپای ئـەو هـەموو درۆیانـەت چـاوێکی لێسـتاندی بـاوکی ئـەو خاچـێکی مسـی بەملەوە بوو".

ساڵحەکوێر وەك بڵێیت تووڕەبووبێت، هەستاو ویسـتی بـۆلای سمایـل بچێت گرتیـانو لەشوێنی خۆی دیانیشاندەوە.

"ئەسپی بەخێو دەکردن سمایلی خاچی زێڕین بەملەوە. ئێلیا لانیکەم بیست مەیتـەرو بەخێوکەری ئەسپی لەکێڵگەکەیدا هەبوون. ئەو سمایلە دیـارە کـە وەسـتای خاچـی زێـرین بەملەوەکردن بووە، وەستای خاچی زێڕین بەملەوەکردن!"

سـاڵحەکوێر کـە ئـەم قسـانەی دەکـرد بێدەکـەنی. سمـایلیش لەگـەڵ ئـەودا دەسـتی بەپێکەنین کرد.

پویراز گوتی:

"راوەستن بزانم، ئێوە خەریکن یەکدی دەکوژن. ئێمە بۆ کاری گرنـگ هاتووینـەتە ئێـرە ئێوەش مشتومڕتانە".

"ئەم کوێرە نەفرەتیەیە دەرفەت نادات".

"ئـەم کەچـەڵە نەفرەتیـە خـۆی بەپزیشـکی ئـاژەڵان داوەتـە قەڵـەم، کەچـی تەنانـەت خوێندەواریشی نیە".

"ئەم هاوڕێیەمان پزیشکی ئاژەڵانە. ئەفسەریشە پزیشکی ئاژەڵانی سوپایە. ئێسـتا لـەو دەپرسم، ئەمە دەتوانێت وەستای ئەسپان بێت؟"

"دەتوانێت".

"خوێندەواریشی نیە ها!"

"با نەیبێت، خوێندەواری بەدەردی چ دەخوات. لەنێو سوپا کەسانی وا شارەزا لەبارەی ئەسپیان هەبوون کە ئێمەمانان لەئاستیاندا هیچ نەبووین".

"نەبوویتە قەترەیەك ئاوو بەزەیدا نەچوویتەخوار ساڵحەکوێر؟"

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "ئەسپەکان چیانلێهات؟"

"فرۆشتنمان".

"خۆ تۆ دەتگوت نابێت خیانەت لەئەمانەتدا بکەین؟"

سمایل گوتی: "دەکرێت، هیچ پارەیەکم نەبوو بەئەسپەکان رابگەم. ئەسپێکی رەسەنی عارەبیم بردو لەئزمیر فرۆشتم. ئەو پارەیە بایی ئالیکی شەش مانگی ئەسپەکانیش نەبوو. مەیتەرەکانیش کە پارە نەما وەریبگرن لێیاندا رۆیشتن". موسا ئاغا بەدەم ئاخ هەڵکێشانەوە گوتی: "وای وای، ئەی دوایی؟"

"بینیم ئەسپەکان ئاوا بمێننەوە دەمرن، هەموویانم بردنە ئزمیرو فرۆشتنم. جەنگ تەواو بووبووو خەڵك ئیدی سەیری ئەسپیشیان نەدەکرد. هەفتەیەك لەئزمیر مامەوە، هەموو خەڵکەکە ناوبانگی ئەسپەکانی ئێلیایان بیستبوو بۆیە لەماوەی سێ رۆژدا هەموویان فرۆشران. من پارەکەیانم هێنایەوەو لەشوێنێك قایمم کرد، بەڵام دواتر بەو پارەیە فیلینتایەکی ئەڵمانیو سەد دانە فیشەکم کڕی. لەم ناوەدا هەندێك لەئوفەکان لەدوای جەنگ بەزیندوویی مابوون. تا ئێستا هیچ کامیان نەهاتوونەتەماڵی من".

موسا ئاغا جارێکی دیکە گوتی: "وای، وای، واای! من ئەو دەمەی کە خەریك بووم بێم بەئەندازەی سێساڵیان پارەم دانێ. ئەگەر سێ ساڵی دیکەش نەتوانم بگەڕێمەوە... نۆ ماینم هەن، هەر نۆشیان ماینی رەسەنن، ئەگەر هەر ساڵەی یەك ئەسپیان لێبفرۆشرێت، بەو پارەیە دەکرێت ساڵێك ئەسپەکانی دیکەی پێ بەخێوبکەن. جگە لەوە نۆ دانە جوانووە ماینیش. جوانووەکانیش دێنە تەرەبو ئاوس دەبن. ماینە پیرەکان دەفرۆشن، تەنانەت ئەگەر نەشفرۆشرێن برادەرەکانم بۆ بەخێوکردنو پاراستنی ئەسپەکان لەگیرفانی خۆیان پارە دادەنێن. وای وای، وای بۆ ئێلیا، وای!"

هەموو ئەوانەی لەوێ بوون کەوتنە حاڵەتێکی سەیر. جگە لەوە وای وایەکانی موسا کازم ئاغا کاری لەناخی هەموویان کردبوو.

پویراز هەستاو گوتی: "ئەو کێڵگەیە لێرە دوورە؟"

سمایل گوتی: "ئەوەندە دوورنیە".

"ئەسپێکمان دەست دەکەوێت تا ئەویٚ سواری ببین؟"

ساڵحەکوێر گوتی: "دەست دەکەوێت".

سمایل گوتی: "دەست دەکەوێت. ئەسپتان دەوێت یان داشقە؟"

پویراز موسا سەیری موسا کازم ئاغای کرد.

موسا ئاغا بەشەرمەوە گوتی: "داشقە باشترە".

ساڵحەکوێر گوتی: "لێرە فایتون دەست ناکەوێت، فایتون تەنها لەئزمیر هەن. ئێمە تەنها داشقەی باریمان هەن کە لەفایتون جوانترن". روویکردە سمایل:

"زووبە بڕۆ داشقەکەی ئێلیا بێنە. خۆ داشقەکەشت نەفرۆشتووە؟"

نەمفرۆشتووە، چۆن دەتوانم داشقەیەکی ئاوا جوان بفرۆشم. داشقەکە سەرلەبەری کاری وەستاکارانی بۆرسایە، دڵم نایە".

سمایل هەستا:

"ئێستا دەچم داشقەکە دێنم".

کەمێك دواتر دەنگی زەنگوڵەی ملی ئەسپەکانو دەنگی تایەکانی داشقە هاتە.

سمایل گوتی: "فەرموون".

داشقەکە لەژێر دارچنارە گەورەکە راگیرابوو. دوو ئەسپی وشت بەداشقەکەوە بەسترابوون. سەرتاسەری داشقەکە سەوز بوو، لەسەر رەنگە سەوزەکەش نەخشو نیگاری بەڕەنگی سوورو زەردو شینو سپی بەدیدەکران.

"نیمدەریشم لەناو داشقەکە داناون".

هەموویان پێکەوە هەستان بۆلای داشقەکە چوون. کە گەیشتنە نزیك داشقەکە، ساڵحەکوێر پێڵاوەکانی داکەندو سواربوو، یەکەمجار پێڵاوەکانی دانانە ناو پێڵاودانی داشقەکەو پاشان گوتی: "عەلی چاوەش دەستت بێنە".

عەلی چاوەش گوتی: "بوەستە با قاچەدارینەکەم لێبکەمەوە".

موسا ئاغا دەمێك بوو پێڵاوەکانی داکەندبوونو چاوەڕوان بوو. پویراز، موسا ئاغای بەرزکردەوەو داینایە نێو داشقەکە، ساڵحەکوێر ئەوی لەسەر نیمدەری لای پێشەوەی داشقەکە دانیشاند. پزیشکی ئاژەڵانیش، عەلی چاوەشی کە قاچەدارینەکەی داکەندبوو، هەلگرتو داینایە نێو داشقەکە، پویرازیش سواربوو.

دوای ئـەویش جـەمیلی پزیشـكی ئـاژەڵان. دانیشـتن‌و پشـتیان بەتەختـەكانی رۆخـی داشقەكە دایەوە.

سـەعاتێك دواتـر لەكێڵگەكـە بـوون. پێڵاوەكانیـان كردنـەوە پـێ‌و لەداشـقەدابەزین. سمایـل كەوتە پێشیان‌و ئەوانی بردنە خانووی نێو كێڵگەكە. خانووەكـە خـانووی جـاران نـەبوو، تـەنها یەك دوو دیواری رووخاوو چەند بەردو شووشەی شكاو لەملاو ئەولا كەوتبوون.

"خـانووی وا جـوان نـە لـەئزمیر هـەبوو نـە لەئەسـتەنبوڵ‌و نەلەئەسـیناش. دەتگـوت كۆشكە. رەنگبێت بڵێن بۆچی وایلێهات؟"

"من پێتیاندەڵێم، ئەوە رەمزی كاولاكزادە بوو هات‌و ئێرەی ئاوا تێكومەكان دا".

"ئەو دەمەی ئەوان ئەم خانووەیان تێكدەدا تۆ چیتدەكرد؟"

"من؟ من گوتم ناهێڵم ئێرە تێكبـدەن، تەنانـەت ئەگـەر بشـمكوژن. رەمـزی كـاولاكزادە گوتی، ئێمەش بۆ ئەوە هـاتووین. ئیـدی مـن كۆنـترۆڵی خـۆمم لەدەست دا، پێمگوت ئـەی سەربازی راكردوو، ئەی سەگی سەگباب، من لەگـەلیبۆلو جـەنگاوم‌و بێئـەوەی برینـداریش بـبم بەسـاغ‌و سـلامەتی لێیدەرچـووم، ئێسـتا پێتوایـە لەچـوار پێـنج كـەس دەترسـم، پـەلاماریم داو دەسـتم خسـتە بیناقاقـای خـەریكبووم قـورگیم بەهـەردوو دەسـتەكانم دەگوشی‌و چاوەكانی تا دەهات زیاتر زەق دەبوونەوە لەو دەمەدا پیاوەكانی دارژانە سەرم‌و لەدەستیان دەرهێنام.

رەمـزی كـاولاك كـەمێك دواتـر كـە هاتـەوە سـەرخۆی، لـەولاتر راوەسـتابووو هـەر نەڕەنەڕی بووو دەیگوت، لێیدەن لێیدەن ئەو بەچكە یۆنانیە بكوژن. لێیدەن بیكوژن ئـەو لامەزەبە. لەهەمبـەر منـدا لەهەمبـەر موسڵمانێكی راستـەقینە دەوەسـتیتەوەو دەتـەوێت پارێزگاری لەدارایی گاورەكان بكەیت. پارچە پارچەی بكەن. هم ئەمانەتە، چ ئەمانـەتێك، واتـە ئێلیـا چورباچـی دەگەڕێتـەوەو ئـەم زەویـەو ئـەم خـانووە وەردەگرێتـەوە بیكـوژن. پارچە پارچەی بكەن.

ئیدی تەواو تێكچووبووم. نیـوە شـەوبوو ویسـتم هەسـتم. سـەیرمكرد نـاتوانم لـەجێی خۆم بجووڵێم. هەموو گیانم شـەلاڵی خـوێن بـوو. تـا نیـوەڕۆی رۆژی دواتـریش نـەمتوانی هەستمەوە كە شەو داهات حاڵم خراپتر بوو، دەستم لەخۆم شوشت، لەدڵی خۆمدا گوتم وا دەمرم، گوتم هەرچۆنێك: بێت ساڵح هەر دێتە كێڵگە. ساڵح كەسـێكی نائـارام‌و كونجكۆڵـە، دێت‌و دەبینێت لەكێڵگەدا چ باسە..".

"راوەستە، ئەوەی ماوەتـەوە مـن دەیگێڕمـەوە: کاتێـك بـەو شـێوەیەم بینـی، گوتم وای سمایل لەدۆزەخی گەلیبۆلو بەسەلامەتی دەرباز ببەو وەرە لێرە تووشـی ئـەو بەڵایـە ببـە، ئەو ئەسپەی سواری بووبووم ئەسپ نەبوو باڵندەی تیژڕەو بوو، هـەر ئـاوا کـە بـەخێرایی دەچوومە پێش ماوزەرەکەمم پـڕ فیشـەك کـردو دانەیـەکم رەپـێش کـردو دەسـتم لەسـەر پەلاپیتکەی دانا.

لـەپێش خانووەکـە ئەسـپـم راگـرت، ماوزەربەدەسـت، خـۆم لەسـەر پشـتی ئەسـپ فڕێدایـەخوار. رەمـزی کـاولاك کـە منـی بـەو شـێوەیە بینـی هـەڵاتو خـۆی گەیانـدە نێـو کرێکارەکان. لوولـەی دەمانچـەم لـەکرێکارەکان کـردو بـەخۆمم گـوت مەگـەر هـەر ئەمانـە بکوژی سمایل نین، خەریك بووم پەنجە بەپەلایتکەی دەمانچەکەم بکێشم کە مەمەد تاکـە دەستەکەی هەڵبڕیو لـەنێو کرێکارەکـان یەکڕاسـت بـۆ لای مـن هـاتو هـاواریکردو گـوتی: دەسـت هـەڵبگرە سـاڵح، دەسـت هـەڵبگرە، وەسـتا! دەسـتت بـەخوێنی ئـەو هـەموو خەڵکـە ئـاڵوودە مەکـە. ئەمانـە بەئـەمر سمایلیـان کوشـت، تـۆ رەحمیـان پێبکـە. ئەمانـە گشـتیان هەقیانە سەد جار بمرن. دەست هەڵبگرە ساڵح! خۆی گەیاندمیو هەر بەو تاکـە دەسـتەی گرتمیو گوتی دابنیشە ساڵح، ئەمان کردیان تۆ مەیکە، لەگەڵ مەمەدەگۆج پێکـەوەو شـان بەشانی یەك لەگەڵ دوژمن جـەنگابووین. پیـاوێکی چاونەترس بـوو. زۆر نەبـەردی تـەن بەتەنمان کردن، ئەو لەهـەمووومان ئـازاترو چاونەترسـتر بـوو. زۆر چاوتیژبووو هەمیشـە یەکەمین کەس بوو لەنەبەردە تەن بەتەنەکاندا بـەنێو سـەنگەرەکاندا رەت دەبـوو، لـەنێو سوپادا ناوبانگی دەرکردبوو. رووبەڕووم راوەستابووو دەیگوت: ئەگـەر دەتـەوێت بکوژیـت یەکـەمجار مـن بکـوژە، گـوتم: مـادام وایـە رەمـزیم رادەسـت بکـەن، گـوتی: ئێمـە لەسەنگەرەکانو لەنێو کەندڕەکاندا پێکەوە رووباری خوێنمان بینی.

لەقەدپاڵی چیاکاندا ئەوەنـدە تـەرمی سـەربازان هەڵوەریبوونـە سـەریەك کـە عـەرزت نـەدەبینی. مەگـەر بـەبیرت نـەماوە دوای ئـەو هـەموو شـەڕو شـۆڕو نەبەردانـە چـیمان بەسەرهات. مەگەر تەرمەکان وەکو گرد بەسەریەکدا کەڵەکە نـەبووبوون. کـەمێك لەگـەڵ ئەو قسانەی مەمەد خاوبوومەوە، بەڵام هێشتاش هـەر بەچـاو بـەدوای رەمزیـدا دەگـەڕام. هەر بمدۆزیبایەوە بەس بوو بۆ ئەوەی پەنجە بەپەلاپیتکەی دەمانچەکەم دابێنم. مەمـەد زۆر قسەی بۆ کردم، دواجار گوتی: ئەمانـە گشـتیان برسـینو نیازمەنـدی پـارەو نـانێکن، ئەگەر ئیش نەکـەن ژنو منـداڵیان لەبرسان دەمـرن، لێـرە کارێکیـان دۆزیوەتـەوەو پـارەو

نانێکی پێپەیدا دەکەن، واز لەڕەمزی کاولاك بێنە، ئەمانە چیبکەن، قۆڵی گرتم بردمیە لای داشقە. خەریکبووم سواری داشقە دەبووم کە گوتم مەمەد تۆش بەم تاکە دەستەت کاردەکەیت کار بۆ کاولاك دەکەیت؟ سەری دانەواندو گوتی: بەڵێ".

ساڵحەکوێر دەیویست زیاتر قسە بکات، بەڵام مەمەد هەوڵی دا قسەکانی پێببڕێت.

"ئەی مەمەدە گۆج، ئەی مەمەدی مەزن کە بەو ئازایەتیەت لەنێو هەموو سوپادا ناوو ناوبانگ دەرکردبوو، تۆ هی ئەوە نەبوویت بکەیوتە ئەو بارودۆخە ناهەموارە". مەمەد وا بەگرژیەوە سەیریکرد کە ساڵحەکوێر یەکسەر بێدەنگ بوو.

"من کاتێك کە سواری داشقەکە بووم، بینیم فرمێسك لەچاوەکانیدا قەتیس ماون. سەیر بکە چیان بەسەر هێناوم، من هی ئەوە بووم بکەومە ئەم حاڵو رۆژگارە؟ ئەگەر ئەو جەنگو نەبەردیانەم بەچاوی خۆم نەبینیبان دەمتوانی بەرگەی ئەمانە بگرمو نەیانکوژم؟ ئاخر تۆ دەزانیت ئەمە ئەمانەتە، خیانەتکردن لەئەمانەت لەچ کتێبێکدا نووسراوە مەمەد؟ مەمەد هەناسەی هەڵکێشاو گوتی ئەمانەت، گوتی لەهیچ کتێبێك نەنووسراوە، رووی وەرگێڕاو سەری لەبەرخۆی نایەوەو گەڕایەوەو رۆیشت".

سمایل گوتی: "من هیچیەك لەمانەم نەبینیبوو".

ساڵح بەنیگەرانیەوە پرسی: "تەویلەکان لەکام لان؟"

سمایل بەپێکەنینەوە گوتی: "نیشانتان دەدەم". وەرنە دوام.

کەوتنە دوای.

سمایل رۆیشتو لەجێگایەك راوەستا. پاش کەمێك ئەوانی دیکەش گەیشتن.

ساڵح خانوویێکی گەورەی نیشان دان کە تەنها بەردەکانی مابوونو گوتی: "ئێرە یەکێك لەتەویلەکانە". کەمێك چووە پێش "ئەمەشیان تەویلەی سێیەم. کاولاکزادە هەموویانی رماندنە سەریەكو تەختەو دارێکی زۆری لەم تەویلانە دەست کەوت".

لۆچی دەمو چاوی موسا کازم ئاغا لێکببونەوە، بەڵام هەروا بێدەنگ بوو. بەپەنجە ئاماژەی بۆ قاپۆری هەندێك درەختی بڕدراو کرد:

"ئەمانە قاپۆری دارچنارەکانن مام ئاغا. سیو سێ دانە، سەریان لەکەشکەڵانی ئاسمان دەسوو. ئەستووری هەر قاپۆرێکیان ئەوەندە بوو کە سێ کەس دەستیان بەدەوردا گرتبا دەستیان نەدەگەیشتەوە یەك".

"چیانلێهات؟"

"کاولاکزادە، ئەو سەربازە هەڵاتووە، بەداربڕو ئەوجەندرمانەی لەژێر فەرمانی بوون هاتو هەموو چنارەکانی بڕینەوە. ئەم چنارانە لەباپیری باپیریەوە بۆ کاك ئێلیا بەمیرات بەجێمابوون. رەمزی کاولاکزادە بەیانیان کە دەهاتە کێڵگە دەیگوت: "ئێلیا، ئێلیا، ئێلیای چۆرباچی، کێڵگەکەت سپاردۆتە ئەو بێسەرو بەرە، ئێستا وەرەو کێڵگەکەت ببینە، وەرەو کێڵگەی ئەو باوکە جەسوورەی خۆت ببینە چی بەسەرهاتووە، کاولاك بەردەوام ئاوا سووکایەتیم پێدەکات لەبەر جەندرمەکان ناتوانم هیچ بڵێمو خوێنی جەرگی خۆم دەخۆمەوە. داربڕو مشاربەدەستەکان بێڕاوەستان کاریان دەکرد، من دەنگم لەبەرنەهاتەدەر لەبەر جەندرمان. شێت دەبم، بەڵام هیچم لەدەست نایەت. جەندرمەکان باش دەناسم، نابێت گازیان لەدەستی بگریت. خوانەناسن، بکەویتە بەردەستیان ئیسقانەکانت وردخاش دەکەن. یان دەتکوژنو تەرمەکەشت فڕی دەدەنە کەندێکی چۆڵو هۆڵ یان فڕێی دەدەنە نێو دەریا، ئینشاللا ناگەڕێنەوە. ئێلیا بگەڕێنەوەو کێڵگەکەی ئاوا ببینێت بەرگە ناگرێت".

موسا کازم ئاغا وردە وردە روخساری دەگۆڕاو لۆچو پۆچی دەمو چاوی گرژدەبوون. بەدەربڕینێکی تاڵو دەنگێکی وەك مردووان پرسی: "کاك ئێلیا دەگەڕێتەوە؟ دەتوانێت بگەڕێتەوە؟"

عەلی چاوەش گوتی: "ئەو هەرگیز ناتوانێت بگەڕێتەوە. رێگە بەو کەسانەی کە گۆڕدراونەتەوە نادرێت بگەڕێنەوە. ئەم یاسایە لەلایەن ئەورووپاوە داندراوە".

سمایل گوتی: "ئینشاللا رێگەیان پێنادەن بگەڕێنەوە. کاك ئێلیا مرۆڤێکی باشە. دەستو دڵکراوەیە، پێیخۆشە یارمەتی خەڵکی بدات، میهرەبانە دڵێکی پڕ بەزەیی بەرانبەر مرۆڤەکان هەیە ئینشاللا ناگەڕێتەوە. ئەگەر بێتو بگەڕێتەوەو کێڵگەکەی ئاوا ببینێت یەکسەر دڵی رادەوەستێتو دەمرێت".

چەند باڵندەیەکی گەورە لەسەر سێ گردەکەی ئەوبەر چەرخیان دەدان.

پویراز پرسی: "ئەم کێڵگەیە چەند هیکتارە؟"

سمایل گوتی: "پێموایە دەبێت دە هیکتار بێت".

ئاماژەی بۆ گردەکانی ئەوبەر کرد:

"کێڵگەکە لەم گردانە دەست پێدەکات". رووی خۆی وەرگێڕاو شوێنە دوورەکانی نیشان دا "لەوێ رووبارێك هەیە، سەیر بکەن، لەو دیوەوە رەشایەتیەك دیارە کە درێژبۆتەوەو وەکو دارستان وایە. ئەو رووبارە بەنێوەڕاستی کێڵگەکەدا تێدەپەڕێت. ئەو رەشایەتیەش

دارستانی زەیتوونەکانە، دەیان هیکتارە. ئەو دارزەیتوونانەشی بەمن سپاردوون. قەباڵەی کێڵگەی ئێلیای چۆرباچیو هەموو ئەو شتانەی لێرەی هەن لای منن، کە وەختی هەڵگرتنەوەی بەروبوومی زەیتوونەکان داهات، من هەموو کرێکارەکانم بردنە ئەوێو دەستمانکرد بەلێکردنەوەی زەیتوونەکان، دوای سێ رۆژ کارکردنمان لەوێ، رەمزی کاولاکزادە بەخۆیو یەکەیەکی جەندرمە گەیشتە سەرمان. ئەو عەریفەی کە سەردەستەی جەندرمەکان بوو وەکو هەوری بەهار نەڕاندی: قەدەغەیە، قەدەغەیە، قەدەغەیە، چۆن دەتوانن زەیتوونەکانی رەمزی کاولاك کۆبکەنەوە هەی دزینە؟ دەزانن زەیتوون دزین سزاکەی چییە؟ بەتوندی فەرمانی بەجەندرمەکان دا ئەمانە دەستگیربکەن. داربڕەکان کە یەکەمجار لەواقوڕمانیان رەقهەڵاتبوون، دواتر وەکو تیری لەکەوان دەرچوو، بەخێرایی هەڵاتنو خۆیان لەنێو دارزەیتوونەکان شاردەوە، سێ جار دەنگی تەقە بەدوای یەکدا هات، بەڵام کەسیان نەپێکرابوو، رەمزی کاولاك منی نیشان دانو پێیگوتن هەموو لەبن سەری ئەم سەربازە هەڵاتووەیە. دەڵێت لەگەڵیبۆلو جەنگاوم، بەڵام درۆ دەکات. تا ئێستا ئێوە زانیوتانە کەس لەگەڵیبۆلو بەزیندوویی هاتبێتەوە؟ وەك سەگ درۆ دەکات، دزە بیگرن. بیگرنو کەلەپچەی بکەن. منیان گرت، دەستیان کەلەپچە کردم، بەنێو گوندەکەماندا بردمیان، کاتێك بەنێو گوندا دەیانبردم هەموو خەڵك لەماڵەکانیان هاتنەدەر. عەلی چاوەش بەدەم هەڕەشەوە گوتی هۆی رەمزی کاولاکزادەی چەپەڵ، سەربازی هەڵاتوو. پەلاماری دا، بەڵام جەندرمەکان داگژانەسەریو بەزەبری زۆرو لێدان دەستگیریان کرد".

موسا کازم ئاغا کەمێك دوورتر راوەستابووو بیری دەکردەوەو سەیری ئەو درەختە گەورەیەی ئەولای دەکرد، وەك ئەوەی گوێ لەقسەکانی سمایل نەگرێت. خەمێکی بێئامان روخساری داگرتبوو، پویراز کە ئاگای لەمەبوو گوتی: "مام ئاغا، دەتەوێت بچینە لای ئەو درەختەی کە لێیڕاماویت؟"

موسا ئاغا وەك ئەوەی دەمێك بێت چاوەڕێی پێشنیازێکی وەهابێت یەکسەر بەڕێکەوت.

هەموویان پێکەوە هاتنو لەژێر درەختەکە راوەستانو سەیری لكو چڵی درەختەکەیان کرد کە سەری لەئاسمان دەدا، لكو پۆپە بەرزو پەرشو بڵاوەکانی درەختەکە پانتاییەکی بەئەندازەی چوار سەد مەتری چوارگۆشەیان داپۆشیبووو لەژێر قاپۆرە ئەستوورەکەیدا کانییەك هەڵدەقوڵی. بنی کانیەکە هەموو بەوردە بەردی سپی داپۆشرابووو تیشکی ئاوی کانیەکە لەقاپۆری درەختە پیرەکەی دەداو دەلەرایەوە.

موسا ئاغا بەکونجکۆڵیو بەدەربڕینێکی نزم کە هەر ئەوەتا دەبیسترا پرسی:
"ئەمە چ درەختێکە؟"

"داربەڕووە ئاغا، لەوەرزی بەهاردا بەبن پۆخ دەکەوێت، پۆخی نارنجی، بەچەشنێك کە خودی درەختەکە دیارنامێنێت. کاك ئێلیا کە خۆر هەڵدەهات لەجێگا دەهاتەدەرو تا خۆرئاوا دەبوو لەبەرامبەر ئەم درەختە رادەوەستا.

کە خۆریش ئاوا دەبوو، زەردەواڵەکانی سەر گوڵو پۆخەکان بەئاگا دەهاتنو باڵەکانیان کە لەبەرخوناو تەڕدەبوون لێکدەدان، کە باڵەکانیان وشك دەبووەوە هەڵدەفڕینو ئیدی لەسەر گوڵێك هەڵدەفڕینو لەسەر گوڵێکی دیکە دەنیشتنەوەو دەنگی وزە وزیان رۆژەڕێیەك دەڕۆیشت. ئێلیای چۆرباچیش لەبینینی ئەو دیمەنە مەست دەبوو".

"باشە رەمزی کاولاکزادە ئەم درەختەی بۆ نەبڕیەوە؟"

"ترسا".

"لەچی ترسا".

"ئێرە جێگایەکی پیرۆزە، ئاوی ئەم کانیە دەرمانی زۆر دەردانە. موسڵمانەکان هەر نەخۆش ببن دێنە ئێرەو ئاوی ئەم کانیە دەخۆنەوە".

عەلی چاوەش گوتی: "کە منداڵ بووم نۆبەتێم گرتو هێنامیانە ئێرە، چلو یەك جامە ئاویان پێداکردم ئەوانەی کە مرازێکیشیان هەبێت دێنە ئێرە، مرازی خۆیان دەخوازن. ئەو ترسنۆکە، ئەو سەربازە راکردووە لەترسان زەندەقی چووبوو بۆیە نەیتوانی دەست بۆ ئەم درەختە درێژ بکات. ئێستاش با هەمووومان نیەت بێنینو دەستی یەك بگرینو بەدەوریدا بسووڕێینەوەو دەستی پێدابێنینو دواتریش هەریەکەمان مستێك ئاوی کانیەکە بخۆینەوە".

موسا کازم ئاغا بەڕاوێژێکی منداڵانەو چاوەڕواننەکراو گوتی: "من نیەتم هێنا". لەدرەختەکە نزیك بووەوەو دەستی بەقاپۆرو لکەکانیدا هێناو ئینجا چووە سەرکانیەکەو چۆکی داداو مستێك ئاوی خواردەوە، ئەژنۆی شەلوارەکەی داتەکاندنو گەڕایەوە.

موسا ئاغا لەوە بەدواوە ئەوەندە کەیفی ساز بوو کە پویراز ئیدی نەیدەناسیەوە تا شەو داهات شوێنێك لەکێڵگەکە نەمابوو نەگەڕابنو سەریان پێدانەگرتبێت.

دوای خۆر ئاوابوون بوو کە گەڕانەوە دێو لەبەردەم ماڵی سمایل لەداشقە دابەزین. بۆنو بەرامەی جیاجیا لەژوورەوە دەهات. پێڵاوەکانیان داکەندنو لەسەر نیمدەرەکان

دانیشتن. کچۆلەیەك هاتە ژوور کە لەگەن‌و سابوونی بەدەستەوە بووو خاولیەکی بەسەر شاندا دابوو. بەنۆرە دەست‌و دەم‌و چاویان شوشت. بەدرێژایی ئەو رۆژە بیریان نەکردبووەوە کە پزیشکی ئاژەڵانیان لەگەڵدایە. کاتێك خەریکی دەستشوشتن بوون تێبینیان کرد. پزیشکی ئاژەڵان کە هات‌و دانیشت، عەلی چاوەش گوتی: "پزیشکی هێژا تۆ بەدرێژایی ئەمڕۆ هەر بێدەنگ بوویت، تۆ لەهەمووان باشتر شارەزای ئەسپەکانی، بەڕای تۆ کێڵگەیەکی چۆنە؟"

پزیشکی ئاژەڵان لەوەی کە ئەویان بەبیرهاتبووەوە خۆشحاڵ بوو. بەدرێژایی ئەو رۆژە پویرازیش نەیبینیبوو.

"من زۆر کێڵگەم دیون، بەڵام ئەمە لەهەموویان باشترە. لێرە دەکرێت باشترین‌و رەسەنترین ئەسپی دونیا بەخێو بکرێن. ئەگەر پارەم هەبوایە یەکسەر دەمکڕی".

موسا ئاغا بێڕادە وروژابووو ئەمە لەدەنگیدا بەدەیدەکرا:

"سمایل، کاك سمایل، راستیم پێبڵێ، ئێلیاغا دەگەڕێتەوە؟ بۆ کێڵگەکەی دەگەڕێتەوە؟"

سمایل گوتی: "دەگەڕێتەوە، ئیدی زۆری نەماوە بێتەوە، ئەوسا رەمزی کاولاك بۆ کوێ رادەکات. ئینشاللا خوا هەرچی زووترە ئەو رۆژەم نیشان دەدات".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "چۆن دەتوانێت بگەڕێتەوە؟ ئەو گۆڕینەوە بەبڕیارێکە لەکۆنفرانسی لۆزان دراوەو دەوڵەتە گەورەکان فەرمانەکەیان داوە. هیچ دەوڵەتێك ناتوانێت ئەو فەرمانە هەڵبوەشێنێتەوە، نەیۆنانیەك دەتوانێت لەیۆنان بێتە ئێرەو نە تورکێك دەتوانێت لێرە بچێتە یۆنان. ئەمە بڕیاری هەموو وڵاتانی ئەوروپایەو لەکۆنفرانیسی لۆزان وەرگیراوە".

موسا کازم ئاغا بەڕوخسارێك کە زەردهەڵگەڕابووو لێوەکانی دەلەرزین پرسی: "ئەمە راستی تێدایە؟"

"چۆن راست نیە؟ ئەمانە دوورخراوەی کۆنفرانسی لۆزانن".

پویراز بەگوتنی: "ئێمەش ئەوە دەزانین". ویستی بابەتەکە بگۆڕێت. "ئەگەر وایە لێنا چۆن توانی بگەڕێتەوە؟"

"حکومەت پێبزانێت بەدوو جەندرمان دەیباتە ئزمیرو سواری کەشتی دەکات‌و دەینێرێتەوە یۆنان. رەمزی کاولاك لەترسی تۆ ناوێرێت زمانی لێبدات ئەگەرنا تا ئێستا لێنایان ناردبووەوە یۆنان".

سمایل گوتی: "ئێلیا چۆرباچی بەم زووانە دەگەڕێتەوە نیشتمانی خۆیو کێڵگەکەی لەکاولاك وەردەگرێتەوە".

عەلی چاوەش گوتی: "چۆن دەتوانێت بێتەوە؟"

سمایل کەسوورهەڵگەڕابوو گوتی: "ئەو دونیایەك کوپی پڕ لەزێڕی هەیە، یەکێکیان دەداتو دەگەڕێتەوەو دێتەوە بۆ کێڵگەکەی".

"ئەو زەمانە ئیدی تێپەڕی. مستەفا کەمال پاشا چاوی بەرتیلخۆرەکان دەردێنێت. بەو دەڵێن مستەفا کەمال پاشا".

"عەلی چاوەش خۆ تۆش دەزانیت، مەگەر کاك ئێلیا ساڵانە ئەسپی بەدیاری نەدەدایە هەموو والیەکان؟ لەئەستەنبۆل والیەك هەبوو ئێلیا ئەسپی بەدیاری نەدابێتێ؟ هەموو پاشاو بەگەکانی وڵات ئەویان دەناسی".

"ناتوانێت بێتەوە".

"دێتەوە".

لەو دەمەدا، سفرەیەك کە لەکلیمێکی پڕنەخشو نیگار دروستکرابوو، هێندراو داندرایە سەر حەسیرێك کە لەقامیشی باریك چندرابوو. سینیەکی مسی نەخشێندراو داندرایە ناوەڕاستی سفرەکە. ئاشی ماستیان هێنا کە لەنێو کاسەیەکی مسی قووڵو رۆخپان بووو هەڵمی لێهەڵدەستا. دوای ئاشی ماست، بەقاپی پان تاسکەبابیان هێنا، دوای تاسکەبابیش دۆڵمەی کولەکەیان دانایە سەر سفرە. موسا ئاغا هەر لەگەڵ ئەوەی دۆڵمەی کولەکەی لەسەرسفرەدا بینی تەنانەت دەستی بۆ خواردنەکانی دیکە درێژنەکرد، دەستی بۆ دۆڵمەکانی درێژکردو گوتی: "ئۆووە، پێموابوو تازە چیدی دۆڵمەی کولەکە ناخۆم، لەوڵاتی ئێمە دۆڵمەی کولەکەی تایبەت لێدەنێن. ئەم دۆڵمەیەش زۆر بەتامە، دەستی خاتوون خۆش بێت".

پویراز گوتی: "مام ئاغا، ساڵی داهاتوو تا حەزبکەیت کولەکە لەباخچەکەتان دەچێنین، لێناش بڕیارە لەباخچەی ئێمە بیانچێنێت، لێنا هەمیشە دەڵێت ئاااە دۆڵمەی کولەکە!"

موسا ئاغا نەیتوانی بڵێت ئینشاللا من تا ساڵێکی دیکە لێرە نامێنم، دەگەڕێمەوە دۆڵمەی کولەکە لەکریتی خۆمان دەخۆم.

"کچەکانی ئێمەش دۆڵمەی کولەکە زۆرباش لێدەنێن. ئینشاللا ساڵی داهاتوو زۆر لێدەنێن. دایکیشیان باشی لێدەنان".

"کولەکە تەنها مانگێك سوودی لێوەردەگیرێت. دوای مانگێك وشك دەبێت".

"ئەگەر ئاویان باش بدرێتێ لەمانگێك زیاتر دەمێننەوە. لەکریتی ئێمەدا کولەکە هێندەی دەستێك رادەکشێت. ئەم دۆڵمەیەش زۆر بەتامە بۆنی پونگە دەدات".

"ئێمە لەچیای قازداغی بەرامبەرمان پوونگە دێنین".

موسا ئاغا گوتی: "ئێوە بەو چیایە دەڵێن قازداغی یۆنانیەکانیش پێیدەڵێن چیای ئیلدای هەزارکانی".

"مەلەك خانمی ئێمەش خەڵکی ناو چیای ئیلدای هەزار کانیە، ئەو لەوێوە پونگەمان بۆ دێنێت".

سمایل گوتی: "مام ئاغا، ئێستا ئێمە پونگەی زۆرمان هەیە. بۆ هەموو خواردنەکانمان بەکاری دێنین. بۆ هەر یەکێکتان گونیەیەك پونگە دادەنێم، بەشتان بکات تا ئەو کاتەی مەلەك خانم بۆتانی دێنێت، کەمێك سرکەی هەناریشمان هەیە. دۆڵمەی کولەکە بەبێسرکەی هەنار خۆش دەرناچێت، هەرجارەی کەمێکی تێکەڵ بکەن".

موسا ئاغا بەمگێزەوە گوتی: "بێسرکە خۆش دەرناچێت".

تا وەقی نووستنان هەرباسی ئەسپ، کێڵگەی ئەسپان، رەمزی کاولاك، شارۆچکە، دوورگەکانو ئالوگۆڕکردنەکانیان کرد.

سمایل بەردەوام سەری قسانی دەگەڕاندەوە سەر ئێلیای چۆرباچی. دەیگوت: "ئێلیا دەگەڕێتەوە. هەر جۆرێك بێت رێگایەك دەدۆزێتەوەو دەگەڕێتەوە، ئەگەر نەگەڕێتەوە دەمرێت. ئەگەر بەیانیان زوو بەرلەوەی خۆر هەڵبێت نەچێتە ژێر ئەو درەختەو لەسەر کانیەکە چۆك دانەداتو مستێك ئاو لەکانی نەخواتەوە دەمرێت، ناتوانێت بژییێت".

پزیشکی ئاژەڵانیش هەموو جارێك دەیگوت: "کۆنفرانسی لۆزان، دەوڵەتە زلهێزەکان، هیچکەس ناتوانێت حوکمی گۆڕینەوەکە هەڵبوەشێنێەوە. هەموو وڵاتانی ئەوروپا واژۆیان کردووە. ئەو حوکمە بەهیچشێوەیەك هەڵناوەشێتەوە".

چاوەش گوتی: "هەڵدەوشێتەوە".

پویراز گوتی: "هەڵدەوەشێتەوە".

سمایل گوتی: "هەڵدەوەشێتەوە".

پزیشکی ئاژەڵان پرسی: "چۆن؟"

هیچکەس وەڵامی نەدایەوە. هەموو بێدەنگ بوون.

پزیشکی ئاژەڵانیش بێدەنگ بووو چاوەڕێی کرد، موسا ئاغاش سەری لەبەرخۆی نابووەوەو کەوتبووە نێو هرزو خەیاڵەوە.

"تەنها یەك ڕێگا هەیە کە ئەوانەی ڕۆیشتوون بۆ یۆنان بگەڕێنەوە ئێرەو ئەوانەی هاتوونەتە ئێرە بگەڕێنەوە یۆنان".

موسا ئاغا بەو وروژانەوە سەری هەڵبڕیو پرسی: "چ ڕێگایەك؟" لۆچی دەمو چاوی کرانەوە.

"من ئەو دەمەی لەئەنەدۆڵدا بەدوای خێزانی خۆماندا دەگەڕام لەئانتالیا تووشم بوو بەتووشی سەرهەنگوکەی خۆمان. پیاوێکی زۆر ئازاو مەرد بوو، جێی ڕێزی هەمووان بوو. کوڕی فەرماندەیەکی کۆنی سوپا بوو. لەخوێندنگەی ئینگلیزان دەرسی خوێندبوو، لەبەرئەوەی ئاژەڵو گیانەدارەکانی خۆش دەویست بووبووە پزیشکی ئاژەڵانو پاشانیش هاتبووە نێو سوپا، خزمو کەسو کاری لەیۆنان هەبوون کە ئەوانیش هاتبوونە ئێرە. هیچ جێگایەك نەمابوو بۆیان نەگەڕێت، بەڵام لەهیچ جێگایەك نەیدۆزیبوونەوە. سەرهەنگ لەبەدواداگەڕانیان بەردەوام بوو و نەیدەدۆزینەوە. بەقاچە شەلەکانی بۆ دۆزینەوەیان کەوبتووە ڕێ. ئانتالیا پێنجەمین شوێنی خزمەکانی بوو لەوێش نەیتوانی بیاندۆزێتەوە. ئەو پێیگوتم تورکەکانی گومولجینەو یۆنانیەکانی ئەستەنبۆل دوور نەخراونەتەوە".

"یانی هیچیەك لەتورکەکانی گومولجینە دورونەخراونەتەوە؟"

"نەخێر".

"بۆچی ئەوانیان دوورنەخستەوە؟ کەس تا ئێستا ئەوەی بەمن نەگوتووە".

"من لەسەرهەنگم پرسی، ئەویش نەیدەزانی".

موسا کازم ئاغا لەپڕێکدا کرایەوە. هەمووان هەستیان بەو حاڵەتەی ئەو کرد. سمایل دەستی بەقسان کرد:

"ئێلیا چۆرباچی شەش مانگی دیکە نابات دەگەڕێتەوەو دێتەوە ئێرە".

پزیشکی ئاژەڵان بەتووڕەییەوە پرسی:

"ئێلیا چۆرباچیی تۆ چۆن دەتوانێت بێتەوە، نەکا بیەوێت باڵ بگرێتو وەکو باڵندان بفڕێتو بێتەوە ئێرە؟"

"من نازانم، لێ ئەو دێتەوە".

"چۆن چۆنی دێتەوە، پێمبڵێ سووەزگمان مەکە".

"بۆ برای خۆم بێژم. ئەو دونیایەك پارەو زێری هەیە. لەیۆنانیشدا كێڵگەی هەن زۆر لەم كێڵگەیە گەورەترن. زۆر پاشای سەرزل سەرزل دەهاتنە ئەم خانووە. ئەو هەر یەكێكیان بهاتبا ئەسپێكی رەسەنی دەدایێ. تێگەیشتیت؟ پاشایەك نەماوە ئەسپی نەدابێتێ. تێگەیشتیت كاكی پزیشك؟ زێڕەكانو ئەسپەكان. پێویست ناكات باڵ بەخۆیەوە بنێتو بفڕێت".

"ئەی كەوابوو بۆچی لێرە رۆیشت؟"

"گرنگی پێنەدا، گوتی ئەمڕۆ دەچمو سبەی دێمەوە".

"ئەی بۆ دوای ئەو هەموو ماوەیە نەهاتەوە؟"

سمایل سەری لەبەرخۆی نایەوە.

"نازانم دەبوا تا ئێستا بهاتبایەتەوە. نازانم بەڵكو نەخۆش كەوتبێت یان بەڵایەكی بەسەرهاتبێت".

عەلی چاوەش گوتی: "سمایل دەمەوێت پرسیارێكت لێبكەم بزانم ئەو هەواڵانەی بیستوومن راستن؟"

"بپرسە".

"رەمزی كاولاك تۆی وەك جاسووسی ئینگلیز دایە دەستی جەندرمان، مەگەر تۆ ئەو كات لەبەرەی گەلیبۆلو دژی ئینگلیزەكان رانەوەستابوویتو گوللە تۆپت هەڵنەدەدانە ناو دووكەڵكێشی گەشتیەكانی ئەوان؟"

"من لەگەلیبۆلو بووم".

"باشە مەگەر تۆ لەدوملی پنار یۆنانیەكانت بەتۆپان سەروەش نەكردبوون؟ مەگەر تۆ دوای شكستی یۆنانیەكان نەچوویتە ئزمیز؟"

"من هەموو شتێكم بەجەندرمەكانو عەریفو ملازمەكە گوت، پێمگوتن من پسوولەی كۆتاییهاتنی خزمەتو زۆریش مەدالیاو تابلۆی رێزلێنانم هەن، گوێیان نەدامێ، گوتم دوو جەندرمان رەگەڵ بدەن بچمەوە ماڵێو ئەو نووسراوانەتان بۆبێنم، دیسان گوێیان نەدامێ. من چۆن بزانم كەسێك هەبێتو بتوانێت ببێتە جاسووسی یۆنان. منیان لەگەلیبۆلو یەكسەر بردە بەرەی دژی یۆنانیەكان. ئەگەر من مردبووبم چۆن توانیان كەسێكی مردووببەنە شەڕ؟ كەسێك كە لەگەلیبۆلو مردبووبێت چۆن توانی لەشەڕی دژی یۆنانیش گوللە تۆپی زەبەلاح دروست وەكو ئەوەی لەگەلیبۆلو دەیتەقاندن

لەویش بتەقێنێت؟ گوتم ڕێگە بدەن بچم لەماڵەوە کاغەزەکانم بێنم. ملازمەکە گوتی تۆ ئەگەر جاسووس نیت چۆنو بۆچی لای ئەو یۆنانیە مایتەوە؟

پیمگوت فەرماندە، جەنابی ملازم، ئەو لەیۆنانیەکانی یۆنان نەبوو، ئەو یۆنانی تورکیا بوو. کاتێك یۆنانیەکان هاتنە ناو ئزمیر، ئەو زۆر ترسا بوو، پێیگوتم ئەو یۆنانیانە چیمان بەسەردێنن؟ گوتم ملازمی بەڕێز، کاتێکیش سوپای یۆنان شکستی خوارد زۆر خۆشحاڵ بووو ئاهەنگی گێڕا، من بەڕێمکرد، ئەو بەگریانەوە ڕۆیشت. ئەو زۆر لەویّ نامێنیتەوە دەگەڕێتەوە، هەمووان لەبەری پاڕانەوە، بەڵام هیچشتێکی خۆی نەفرۆشت بەو نیازەی کە دەگەڕێتەوە. ملازمەکە گوتی ئەسپەکانی دانەدەست تۆ کە بیانفرۆشیتو تۆش فرۆشتنت مەگەر نە؟ بۆ فرۆشتنت؟ گوتم ئەو بڕە پارەیەی کە دایناوو بەشی بەخێوکردونیانی نەکرد. گوتی پارەی ئەو ئەسپانەی فرۆشتنت کوا؟ گوتم بەئەمانەت لای منە. گوتی ئەو پارەیە هی دەوڵەتە. بیانهێنەو بیاندە دەستی من. گوتم ناتوانم بیانهێنم جەنابی مولازم. گوتی دەبێت بیانهێنیت. نەیانهێنیت لاشەت لێرە دەچێتەدەر خۆت نا. گوتم ئامادەم لاشەم لێرە بچێتەدەر جەنابی مولازم، بەڵام ئەوە بزانە تۆ من لەبەرخاتری ئەو ڕەمزی کۆڵاکە ئەو سەربازە هەڵاتووە دەکوژیت. گوتی ئەو سەربازی هەڵاتوو نیە، ئەو قارەمانی ساری قامیشە. گوتم سەیر بکە. جەنابی مولازم ئێمە لەو سەربازانەین کە لەنەبەردی گەلیبۆلو بەزیندوویی ماوین. بەئێمەیان گوت هیچ سەربازێك لەبەرەی رووسەکان بەزیندوویی دەربازی نەبوو. نیوەی ئەو نەوەد هەزار سەربازە ئەسپێ خواردنیو نیوەشیان لەنێو سەرماو سۆڵە ڕەق بوونەوە، کاولاك چۆن دەربازی بوو، ئەگەر لێیبپرسیت پسوولەی کۆتاییهاتنی خزمەتی هەیە، ناتوانێت نیشانت بدات، مولازمەکە ئاگری لەناوچاوان هەستاو پێلاقەیەکی کێشا بەزگم، ئیدی من لاربوومەوەو بەلاداهاتم.

دەینەڕاند، دەماری ملی ڕاست بووبوونەوە، دەیگوت یان پارەکان دێنیت یان لاشەکەت لێرە دەچێتەدەر، پاشانیش ڕێی خۆی گرتو ڕۆیشت".

ئەمجارە جەندرمەکان داگژانە سەر سمایلو دایانەبەر مستو پێلەقان، دارکاریەکی بێڕەحمانەیان کرد، نازانم سەعاتێك یان پێنج سەعات سمایل لەهۆش چوو، پاشان ئاویان پێداکردو بەزۆر بەهۆشیان هێنایەوە. ئینجا دووبارە دارکاریان کردەوە. "پارەکان لەکوێن، لەکوێن ئەگەر هەر ئێستا نەیانهێنیت بەمردووی ڕاتدەکێشینە دەرەوە. تۆ سەربازی، دەزانیت فەرمان ئاسنیش دەبڕێت". سمایل تەنها ئەوەندەی بۆکرا بڵێت: "ئەمانەت".

ئیدی نەیتوانی قسە بکات. دوای ئەوە ئیدی نەهاتەوە هۆش، عەریفەکە چووە لای کابرای مولازمو پێیگوت: "ئێمە ئەومان کوشت جەنابی مولازم. زۆرم لێپرسی پارەکان لای ژنەکەت نین؟ لەماڵەوەت نین؟ لای کەسێکی دیکە داتناون؟ لەدواساتەکاندا تەنها یەکجار ئەویش بەدەنگێك کە هەر ئەوەتا دەبیسترا و نەدەبیسترا گوتی ئەمانەتو ئێمەیش کوشتمان".

"کەلاکی مرداری ببەن فڕێی بدەنە ناو چاڵێك. با سەگو گورگو باڵندەکان بیخۆن".

سمایلیان بردە دەرەوەی شارۆچکەو لەناو دەوەنەکان فڕێیاندایە نێو کەندڕێك، سمایل بەبێهۆشی تابەیانی ئاوا لەوێ مایەوە. خۆر کە هەڵات چاوەکانی کردنەوە بۆ ساتێك وای بەمێشکدا هات ئایا من مردووم یان زیندووم وەك ئەوەی جەستەیەکی نەبێت. لەپڕ هەستی کرد هەموو ئەدگاری بەدەنی لەبەرئێشو ئازار دەناڵێنن. تا دەهات ئازارەکەی زیاتر دەبووو تا ئازاریشی زیاتر دەبوو زیاتر بەخۆی دەهاتەوە. دەتگوت هەناوی دێنەدەر. ئازاری گیانی ئەوەندەبوو نەیدەتوانی سەریشی بەجێگایەك دابکێشێت. چەقچەقی ددانانی بوو. چەنگەڕنەی بەپاردەی کەندڕەکەدا دەکرد. ئەنگوستەکانی خوێناویو رووشابوون. دەردو ئازار ئەوەندە تینی بۆهێنا کە لەپڕ خۆی لەدەرەوەی کەندڕەکە بینیەوە. هاواری کرد، بەڵام نەیدەزانی دەنگی لەقورگی دەردەچێت یان نا، لەترسی گیان خۆی بەسەردەوەنەکاندا داو بۆخواری غلۆر بووەوە. کە گەیشتە سەرجادەکە، زامدارو خەستەو بێحاڵ یەك بەخۆی لەسەر رێگاکە راکشا. نیوە بێهۆش بوو. دوای ماوەیەك ئازارەکانی هێوربوونەوە. ئەمجارە بەدەنگێکی بەرزتر لەپێشان هاواری کرد. گوێی لەدەنگی خۆی دەبوو، چاوەکانی کردنەوە تاوێکی باش سەیری دەوروبەری خۆی کرد، تێگەیشت لەسەر ئەو رێگایەیە کە دەچێتە ناو شارۆچکەکە. جارێکی دیکە ئازار هێرشی بۆ هێناو لوولی دایەوە سەریەك، دەستەکانی دانانە سەر زەویو بەهەموو توانایەوە هەوڵی داو هەستایە سەرپێ، بەخۆی گوت: "ئەمانەت، ئەمانەت، ئێلیا بەمزووانە دێتەوە".

مولازمەکەی نەبەردی گەلێبۆلوی هاتە بەرچاوان راوەستاو دەیگوت خۆ رابگرە سمایل، رێك لەناوەڕاستی دووکەڵکێشی کەشتیەکە... وەکو باران گوللە بەسەر مولازم دادەبارین.

مولازمی لەبەرچاوان بوو بەهەڵمو بەهەوادا بڵاوبووەوە. سمایل کەوتە ژێر ئەو خاكو خۆڵەی کە بەرزبووەوەو بەو ناوەدا پەرشو بڵاوبووەوە. لەژێر ئەو خاكو خۆڵەدا هەناسەی لەبەربڕا. لەپڕ خۆیشی نەیزانی لەکوێیە، خۆی لەنێو تۆپەڵێك

ڕۆشنایی بینیەوە. نە زرمەی تۆپان دەهاتو نەئاسەواری سەربازەکان دیاربوو. ئەو ناوە چـۆڵو هـۆڵ بـوو، هـیچ دەنگێـك نـەدەهات. یەکـەمین شـت کـە کەوتـە بەرچـاوی چەکمەکانی مـولازم بـوون. خـوێن لەقاچـەبڕاوەکانی نـاو چـەکمەکانی مـولازم دەچۆڕا. سماسل وەکو بەرد وشك هەلگەڕابوو.

تا ئەو دەمەی سەربازێك لەدواوە هاتو ژێر باڵی گـرت. نـەیتوانی چـاو لەسەرچـەکمە خوێناویەکان هەڵبگرێت. کەمێك دواتر، دووبارە زرمـەو هـۆڕی تۆپـان بـەرزبووەوە. زەوی دەهەژایــە ســەریەك، ئــاوی دەریــای بەرامبــەری بەبــەرزایی منارەیــەك بــەرزدەبووەوە. ئەمانـەت نابێـت ئەمانـەت خیانـەتی تێـدابکرێت. لـەدوورەوە دەنگـی داشـقەیەك دەهـات. سمایل گوێیەکانی خەواندن. پاشـان دەنگـی زەنگوڵـەی ملـی ئەسـپەکانیش هـات. داشـقەکە خەریکبوو نزیك دەبووەوە. سمایل نەیتوانی بەپێوە بوەستێت، لەناوەڕاستی ڕێگـا ڕاقـەناو کەوتـەخوار. بەسـەختی ڕووی بـۆلای داشـقەکە وەرسـووڕاندو بـۆ ئـەولا ملـی هەڵکێشـا، بەچەشـنێك نزیـك بـوو سـەری هەڵبکەنـدرێت. چاوەکانیشـی بەتـەواوی کردبوونـەوە. داشقەکە نەدەگەیشت، ناچار بوو هەستێتەوە، بەڵام دیسان ڕاقەناو نەخشی ئەو گۆڕەبـوو، ماوەیەك دواتر داشقەکە گەیشتو بەسەرسەریەوە ڕاوەستا. سمایل نـەدەنگی زەنگۆڵـەکانی بیستو نەبـەهاتنو ڕاوەسـتانی داشـقەکەی زانـی. دووکـەس لەداشـقەکە دابـەزینو هـاتن لەنزیك ئـەو مـردووە نوقمبـووەی نێوخوێنـە ڕاوەسـتان. سمایـل چاوەکانی کردنـەوە لـەو دیوو تەمێکی دوور دوو کەسی بینین، ویستی هەستێت، نەیتوانی یەکێك لەو دووکەسەکە گوتی: "نەمردووە".

پیرەکەیان داهاتەوەو سەیری ڕوخساری سمایلی کرد. هەر لەگەڵ ئەوەی سـەیری کـرد، سمایل ناڵاندی.

پیرەمێردەکە گوتی: "ئەمە لەسمایل تۆپچی دەچێت".

ئەویان بەهێمنی هەلگرتو بردیان دایاننایە ناو داشقەکە درێژیان کرد.

لاوەکە گوتی: "ئەمە سمایلە، ئەوە بۆ وای لێهاتووە؟"

پیرەمێردەکە گوتی: "کوشتوویانە". لەنێو گوێی سمایلدا بەدەنگی بەرز بانگی کرد: "سمایل، سمایل، سمایل، منم من برایمم".

خۆی پێناساندو لەنێو گوێی سمایل دووبارەی کردەوە: "سەردەسـتە بـرایم لەیەکینـەی سێیەم". سمایل چاوەکانی کردنەوەو دایخستنەوە.

ئەودەمەی کە خەریکبوون لەشارۆچکەکە نزیك دەبوونەوە برایم کە بۆ ساتێك چیە چاوی لەسەر سمایل هەڵنەگرتبوون، بینی سمایل چاوەکانی کردنەوە. بەحەپەساویەوە لەدەوروبەری خۆی راماو چاوەکانی داخستنەوە. برایم کاتێك ئەمەی بینی زۆر خۆشحاڵ بوو.

"سمایل، سمایل، جارێکی دیکەش چاوەکانت بکەرەوەو دایانبخە، من برایمم برایم، برایمی یەکینەی سێیەم. گەلیبۆلو، گەلیبۆلو، کێ وای لێکردوویت؟ کێ ئەو بەڵایەی بەسەر هێناویت؟

سمایل هیچی نەگوت. نزیکەی شارۆچکە برایم سەیریکرد سمایل لێوەکانی دەکاتەوەو دایاندەنێتەوە سەریەك. سمایل رووداوەکەی بۆ پیرەمێردەکە گێڕایەوە. پیرەمێرد حەوساری ئەسپەکانی راکێشا. داشقەکە هێواش بووەوە. دەنگی زەنگوڵەکان کە شۆرابەی شینباویان پێوەبوو. راوەستا. بەئاستەم دەنگێك لەقورگی سمایل دەهاتەدەر. سمایل جارێکی دیکە ناڵاندی. لەماوەی ناڵاندنەکەشیدا یەك دوو وشەی لەدەم هاتنەدەر. برایم گوێی لەدەمی سمایل نزیکردەوە، قسە بکە سمایل، قسەبکە، منم من، برایم، برایم لەیەکەی سێیەم لەگەلیبۆلو، کەمێك دواتر سمایل بەقسەهات. برایم ئەمجارە گوێی زیاتر لەدەمی سمایل نزیك کردەوە. سمایل قسەی کرد. دیسان قسەی کرد. سمایل هەمدیسان قسەی کرد: "برایم جارێکی دیکە، جەندرمە، رەمزی کاولاك، یۆنانی، کوشتیان، خەیری ئەفەندی".

پیاوە گەنجەکە گوتی: "ئەمە چیدەڵێت، سەردەستە برایم؟"

"پێموایە دەیەوێت بڵێت جەندرمەکانی رەمزی کاولاك وایان لێکردووە. دەڵێت بمبەنە لای خەیری ئەفەندی. هەردوو کوڕەکانی خەیری ئەفەندی لەگەڵ ئەودا بوون. هەردووکیان شەهید بوون".

پیرەمێرد دانشقەکەی بەرەو ماڵی خەیری ئەفەندی لێخوڕی.

"بۆچی دەبێت جەندرمەکانی رەمزی کاولاك بیانەوێت بیکوژن؟"

"من چوزانم. هیچی دیکەی نەگوت".

"وای سەربازی هەڵاتووی چەپەڵ وای! وای بەرازی پیس وای! حەیفە بۆ سمایل".

برایم لەدەرگای ماڵی خەیری ئەفەندی دا. خەیری ئەفەندی هاتە بەرهەیوانەکەو پرسی: "چیبووە کوڕم؟"

برایم گوتی: "سمایل، سەردەستە سمایلی تۆپچی".

"چیلێهاتووە؟"

"وا دەمرێت، جەندرمەکان بەنیازی کوشتن لێیانداوە".

"هەڵیبگرن بیهێننە سەرەوە".

سمایلیان بەهێمنی هەڵگرت، بەزەحمەت گەیاندیانە ژوورەوەو بەهێواشی لەسەر ئەو تەختەیان درێژکرد کە خەیری ئەفەندی نیشانی دان. خەیری ئەفەندی کاتێك سمایلی ئاوا شەلاڵی خوێن بینی رەنگ بەرووانیەوە نەما. پرسی:

"کێ وای بەسەر سمایل هێناوە؟"

سمایل چاوەکانی کردنەوە خەیری ئەفەندی بەسەر سەری خۆیەوە بینی.

"سمایل، سمایل کوڕم کێ ئەو بەڵایەی بەسەر هێناویت؟"

لێوەکانی سمایل جووڵان، بەڵام هیچ قسەیەکی بۆنەکرا، لەم ساتەدا برایم لەتەکیەوە چۆکی دادا، داهاتەوەو گوێی لەدەمی سمایل نزیك کردەوە:

"سمایل، سمایل، هێناومانی بۆ ماڵی خەیری ئەفەندی، خەیری ئەفەندی خۆی لێرەیە، قسە بکە، خەیری ئەفەندی خەیری ئەفەندی!"

سمایل بەقسەهات. برایم هەستا.

"چ دەڵێت توانیت لێیحاڵی بیت؟"

برایم گوتی: "لێیحاڵی بووم. دەڵێت جەندرمەکانی رەمزی کاولاك دەیانویست بمکوژن".

"خانم زووبە وەرە ئێرە کچەکانیش بابێن".

خانم دەمێك بوو هەستا بووەوەو چاوەڕێ بوو کە خەیری ئەفەندی بانگی بکات. یەکسەر هاتو هەر کە سمایلی ئاوا بینی زریکاندی:

"وای، ئەمە کێیە؟ چ بەڵایەکی بەسەرهاتووە؟ کێیە ئەمە؟"

"ئەمە سمایلی ئێمەیە، هەمان ئەو کەسەی کە لەگەڵ منداڵەکانی ئێمە لەگەلیبۆلو لەگەڵ دوژمن جەنگابووو چاودێری تەرمەکانیانی کردبوون.

هەمان ئەو سمایلەی کە گۆڕی بۆ هەڵکەندبوونو ناوی لەسەر کێلی قەبرەکانیان نوسیبوو، سەردەستە سمایل".

"کێ وایلێکردووە؟"

"رەمزی کاولاكو جەندرمەکان".

خانم کە بەدەست لەئەژنۆکانی خۆی دەدا، گوتی: "وای کافرینە، وای بێویژدانیە، وای سمایلەکەی خۆم، وای کوڕەکەم وای. چۆن دڵیان هات ئەوە لەگەڵ سمایلدا بکەن،

وای بێدینینه وای، وای بێئمانینـه؟ وای خوانەناسـینه وای! "خـانم یـەکرِیز بەدەسـت دەیکێشا بەئەژنۆکانیدا.

کچەکانو ئـەو پیـاوه خزمـەتکارەی کـه لـەماڵی ئەوانـدا کاری دەکـرد بـەدوای خانمـدا هاتن. خەیری ئەفەندی ڕووی لەخزمەتکارەکه کردو گوتی:

"خێرا برِۆ سەعیده فەندی برینپێچ بانگ بکەو بیهێنه".

"شارۆچکەکه دکتۆری نەبوو. سـەعیده فەنـدی بـرینپێچ کەسـێك بـوو کـه برینـەکانی چاك دەکردنەوەو هیچکەس لەو کارەدا شانی لەشانی نەدەدا.

مردووی زیندوو دەکردەوه. کەمێك دواتـر، سـەعیدەفەندی بەلـەز هـات، پرسـی: "ئـەم پیاوه کێیه؟ چیان بەسەرهێناوه؟"

"ئەمـه سەردەسـته سمایلـه. هـەر ئـەو سمایلـەی کـه منداڵـەکانی ئێمـەی لەگـەلیبۆلو ناشتبووو ناوەکانیانی لەسەر کێلی قـەبریان نووسیبوو، سەردەسـته سمایـل، ئـەو کەسـەی وای بەسەرهێناوه ئەو پیاوه بیدێنو ئیمانه، ئەو سەربازه هەڵاتووەیه".

خەیری ئەفەندی هەر کە گویتی سەربازی هەڵاتوو، سەعیدی برینپێچ گوتی:

"مەبەستت ڕەمزی کاولاکی خاین بەنیشتمان نیه؟"

خەیری ئەفەندی گوتی: "خۆیەتی".

سەعیده فەندی لەڕۆخ برینداره‌کە لەسەر چۆکان دانیشت بەجوانی پشکنینی بـۆکرد. ئینجا گـوتی: "بـەئیزنی خـوای گـەوره ئـەم بەسـتەزمانه چـاك دەبێتـەوه "و ڕووی کـرده خزمەتکارەکـه: "بـەخێرایی بـرِۆ لـەماڵی ئێمـه جانتـای  دەرمانـەکانم بـۆ بێنـه. هـەموو دەرمانەکانم بـەخۆم دروسـت کـردوون. نـاتوانم متمانـه بـەدەرمانی دەرمانخانـەکان بکـەم. پارچه قوماشێکی کـەتان لەسـەر ئـەم تەختـه رابخـەن. دەبێـت سەردەسـته سمایـل لەسـەر تەخت درێژبکەینو جلەکانی دابکەنین".

خـانمو کچـەکان چـوونه ژوورەوه. کچـەکان پارچـه قوماشـێکی سـەوزی کـەتانیان هێناو بەدرێژی لەسـەر تەختەکـەیان ڕاخسـت، کشـانه دواوه، سـەعیدەفەندیو بـرایم جلـەکانی سـیمایلیان داکەنـدن. خزمەتکارەکـه جانتاکـەی بۆهێنـاو دایـه دەسـتی. سـەعیده فەنـدی شووشـەیەکی وەکـو شووشـەی گـوڵاوی لەجانتاکـه دەرهێنـاو گـوتی: "خوێنی وشـك بـووه، ئـەم بێویژدانانـه، هـەموو گیـانی ئـەو بەدبەختـەیان لـەت لـەت کردووه، بەڵام ئەو مەرهەمه نوێیەی کـه دروسـتمکردووه بـەئیزنی خـوا لـەماوەی ده ڕۆژدا برینەکانی سمایل چاك دەکاتەوه".

بەو شلەیەی کە بەکەمێك لۆکە لەشووشەکەی هەڵگرت. خوێنی برینەکانی سمایلی پاك کردەوە. لەنێو قوتوویێك بەپەنجە هەندێك مەرهەمی هەڵگرتو لەبرینەکانی هەڵسوی. لەگەڵ کردنەوەی زارکی قوتووەکە بۆنێکی خۆش لەهەموو ژوورەکە گەڕا، بۆنەکە جۆرێك بوو تەنانەت خەیری ئەفەندیش کە زۆر کەژو کێوان گەڕابوو، لەگەڵ بۆنی زۆر لەگوڵو گولیلکان ئاشنابووو لەوەدا خۆی وەستایەك بوو کەچی بۆنی ئاوای تا ئەودەم نەبینیبوو.

"دەرمانێك کە ئەو جۆرە بۆنەی هەبێت نەك هەر برینەکان چاك دەکاتەوە، بەڵکو مرۆڤی بێگانیش زیندوو دەکاتەوە. تۆ ئەم مەرهەمەت چۆن دروست کردووە؟ وەستایت، بەڕاستی دەبێت بڵێم ئەم بۆنەت بەخۆت دروستکردووە، لەکوێ هێناوتەو لەکوێ پەیدات کردووە؟"

سەعیدەفەندی پێکەنی:

"ئەگەر گیراوەی هەموو گیا شیفابەخشەکانی حەوت کێوان بگرینەوەو لەگەڵ یەکدا تێکەڵیان بکەین، دەتوانین مەرهەمێکی وەکو ئەمە دروست بکەین کە بۆنە خۆشەکەی هەموو دونیا بگرێتەوە".

سەعیدەفەندی پیاوێکی زۆر چوستو چالاكو تەڕدەست بوو، خێرا مەرهەمی لەهەموو برینەکانی سمایل هەڵسویی.

کە کاری تێهەڵسوینی مەرهەم تەواو بوو، سمایل چاوەکانی کردنەوە، وەقسەهات، سەیری دەوروبەری خۆی کرد، نیگای هاتو کەوتە سەرخەیری ئەفەندی راوەستاو گوتی:

"خوا خێرتان بنووسێت". ئەگەرچی دەنگەکەی نزم بوو، بەڵام هەمووان بیستیان لەقسەکانی گەیشتن.

برایم گوتی: "هەرکە زانیم بریندارەکە سمایلە، هەڵمگرتو یەکسەر هێنامە لای تۆ، مەگەر ئەو هەمان ئەو قارەمانە نیە کە گوللە تۆپەکانی دەهاوێشتنە نێو دووکەڵکێشی کەشتیەکانی دوژمنو نوقمی دەریای دەکردن؟"

"کارێکی زۆر باشت کردووە برایم. بەهەشتت بۆ خۆت مسۆگەر کرد. گیانی سمایلت دەربازکرد. خوا خێرت بنووسێتو هەر ساغ بیت".

"خوا حافیز".

لەماڵی سمایل لەنێو نوێنی خاوێنو بۆنخۆشدا خەوتن. بەیانی لەسەر سفرەی بەیانی هەموو شتێك هەبوو، هەرچی تۆ بیری لێدەکەیتەوە. هەموویان هەستیان

بەشادیو بەختەوەری دەکرد. تەنها موسا کازم ئاغا نەبێت. ئەو هیچ بزەیەکی بەسەر لێوانەوە نەبوو.

هاتنە ئەسکەلە. دێهاتیەکان بۆخوا حافیزیو بەڕێکردنی میوانەکان زووتر هاتبوونو ژێر چنارەکانیان پڕکردبوو. ئەو رۆژە قەدریی بەلەموان کە لەدێدا مابووەوە هەر زوو لەگەڵ خەڵکی دێیەکە ئاشنابووبوو، بەدرێژی سەبارەت بەوانەی چووبوونە کێڵگە قسەی بۆ کردبوون. سواری بەلەم بوون، موسا کازم ئاغا چووە لای پێشەوەی بەلەمەکە، پویراز خێرا نیمدەرێکی هەڵگرتو لەشوێنی پێشوو داینا. ئاغا لەسەر نیمدەرکە دانیشت، پشتی بەتەختەکانی کابینی بەلەمەکەدایەوەو گرمۆڵە بوو. پزیشکی ئاژەڵانو پویراز لەبەشی پێشەوە دانیشتبوونو یەکڕیز قسەیان دەکرد، لەبارەی سمایل، شوێنی دووخراوەکان رەمزی کاولاك، کێڵگە، شێوازەکانی بەخێوکردنی ئەسپی رەسەن، خەیری ئەفەندی، سەعیدەفەندی برینپێچو ئەوەی کە ئایا جادووگەرە یان کەسێکی پیرۆزو خاوەن کەرامەتە، لەبارەی ئەو دوورگەیەی کە باڵەخانەو خانووی وەك کۆشکی لێبوونو سەیریش بوو هیچ کەسی نەدەهاتێ. تا گەیشتنەوە دوورگە لەبارەی شتگەلێکی زۆری دیکە قسەیان کرد. موسا کازم ئاغا نێو چاوانی تێکنابووو هەندێکجار رووی بەرەو لای راست وەردەگێڕاو ماوەیەك تەماشای دەریای دەکردو پاشان بەری خۆی بۆلای چەپ وەردەگێڕایەوە. چەند جارێکیش سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕیو لەهەورە سپیە دوورەکان راما.

بەلەم هاتو لەئەسکەلەی دوورگەی لەنگەری گرت. موسا ئاغا هیچ نیشانەیەکی خۆشحاڵی پێوە دیارنەبوو، لەشوێنی خۆی نەجووڵا. ئەگەر پویراز دەستی نەگرتباو پێنەگوتبا: "مام ئاغا، مام ئاغا، گەیشتین". موسا ئاغا هەروا کە پشتی بەتەختەکانی کابینەکەوە دابوو، دەمایەوە.

"چیە، گەیشتین؟"

پویراز گوتی: "گەیشتین"و دەستەکانی گرتن، هەڵیستاندەوەو بردیە سەر ئەسکەلە، کچەکان بەڕاکردنەوە هاتن، پویراز خۆی کێشایە دواوە، ئەوان قۆڵیان لەقۆڵی باوکیان هەڵکێشاو بردیانەوە ماڵێ، لەپلیکانەکان سەرکەوتن. پویرازیش بەدوایانداچوو.

"باوکە، چیتلێهاتووە؟"

"هیچم لێنەهاتووە".

موسا ئاغا چاوی بەپویرازی کەوت:

"هیچم لێنەهاتووە. مەگەر نە کوڕم. پویراز؟ تۆش فەرموو، کەمێك ماندووم وانیە کوڕم؟"

"بەڵێ مام ئاغا، ماندووبوویت".

"کێڵگەیەکی زۆر جوانیشمان دۆزیەوە".

"بەڵێ ئاغا".

موسا ئاغا گوتی: "سمایل".

زەهرا گوتی: "سمایل کێیە؟ چ کارەیە؟"

"هیچکەس هیچی لەگەڵ مندا نەکردووە، جێم بۆ رابخەن".

پویراز گوتی: "مام ئاغا هیچی لێنەهاتووە. هەموو شتێك بەخێرو خۆشی گوزەرا. لێیبگەڕێن با کەمێك پشوو بدات. پاشان هەموو شتێکتان بۆ باس دەکەین. من ئیدی دەڕۆم".

لەکاتێکدا کە قاچەکانی تێکدەئالان بەرەو پلیکانەکان وەڕێکەوت. زەهراش بەدوایدا چوو، لەسەر پلیکانەکان دەستی پویرازی گرت:

"سبەی بەیانی زوو وەرە باوکم بەتەنێ جێمەهێڵە. ئەو شتێکی بەسەرهاتووە لەشتێك دلگران بووە. لەسەر خۆی نیە".

پویراز لەسەر پلیکانەکان راوەستا. نەیدەتوانی هەنگاو هەڵێنێت لەگەڵ زەهرا لەسەر پلیکانەکان راوەستابوو.

پویراز بەدەنگێکی لەرزانەوە گوتی:

"بەڵام... بەڵام کێڵگەکەی زۆر بەدڵ بوو". ئارام ئارام لەپلیکانەکان چووەخوار، ئاوڕی دایەوە سەیرێکی دواوەی کرد، زەهرا لەوێ بەخەمگینیو حەپەساویەوە سەیری ئەوی دەکرد. پویراز تا ئەودەمەی گەیشتەوە ماڵێ بەردەوام هەر ئاوڕی لەدواوە دەدانەوەو سەیری زەهرای دەکرد. زەهرا لەهەمان جێگا راوەستابوو.

پویراز بەیانی زوو چووە لای موسا ئاغا. ئاغا زوو لەخەو هەستابووو چووبووە سەرکانیو دەستو دەمو چاوی شوشتبوونو بەکچەکانی گوتبوو سفرەیان دانابوو.

هەرکە پویرازی بینی لەپلیکانەکان سەردەکەوێت، بەدەربڕینێکی پڕ لەشادمانیەوە گوتی:

"ئێمەش چاوەڕێی تۆ بووین".

هەرچـواریان لـەدەوری سـفرەکە دانیشـتنو چێشـتێکی جانانـەیان خـوارد. لـەکاتی نانخواردن وەکو خەڵکی ئەنەدۆڵ هیچ دەنگێکیان نەکرد. هەر دوای نانخواردن موسا ئاغـا هەستایە پێو گوتی: "سمایل"و بەرەو پلیکانەکان ڕۆیشت، پویرازیش کەوتە دوای. دەمێـك شـان بەشـانی یەکـدی ڕۆیشـتن. لـەپڕ موسـا ئاغـا راوەسـتا، روخسـاری حاڵـەتێکی تـەڵخی بەخۆوەگرت. گوتی: "سمایل، ئەو کابرایە سمایلی کوشتووە. یـانی کـارێکی لەگـەڵ کـردووە خراپتر لەکوشتن. ئـەویش بەدەسـتی جەنـدرمـەکانی دەوڵـەت. لـەیۆنان زوڵمـی وا لەکـەس نەکراوە. ئەو کابرایە، ئەو تواناو دەسەڵاتە لەکوێوە دێنێت".

پـویراز گـوتی: "برِیـار بـوو بەمزووانـە ببێتـە سـەرۆکی هێـزی بـەرگریی شارۆچـکە. دەنگۆیەکی وا لەشارۆچکە بڵاوبووبـووەوە. هێـزو توانـا لـەو دەنگۆیـە وەردەگرێـت. لەبـەر ئەوەیە کەس ناوێرێت خۆی لەقەرەی بدات".

"گوتتان ئەو کابرایە سەربازی هەڵاتووە".

"سەربازی هەڵاتووە. لەشارۆچکە کەس نیە ئەمە نەزانێت".

پاشـان باسـی ئـەوەی کـرد کـە چـۆن رەمـزی کـاولاکزادە دوای ئـەوەی لەجـەنگی سـەربەخۆیی وەکو قارەمـانی نەتـەوەیی گەڕاوەتـەوە شارۆچـکەو بڕیـارە ببێتـە سـەرۆکی هێزی بەرگری، هێزی بەرگری لەلایەن چ کەسانێك بـەڕێوەدەبردرێت، بۆچـی دامـەزراوەو سەرۆکی هێزەکە دەبێـە گەورەترین دەسەڵاتی شارۆچکە.

موسـا کـازم ئاغـا گـوتی: "تێگەیشـتم. هـەموو شـتێك بـاش تێگەیشـتم دەزانم، دەزانم هەمیشە هەر وایلێدێت".

دەستی خۆی دانایە سەرشانی پویراز:

"من ئەمڕۆ دەمەوێت بەتەنیا پیاسەیەك بکەم. نیگـەران مەبـە کـوڕم لەوەتـەی دونیـا هەیە هەر ئاوا بووە".

"ئاغا، دەچم لەماڵەوە گۆچانەکەت بۆ دێـنم. لـەم دوورگەیـە زۆر مـاری نـارنجی هـەن. ڤاسـیلی دەڵێـت مارەکـانی ئێـرە بـەدرەختو دارو دیوارانـدا هەڵدەگـەڕێنو جوجکـەی پەڕەسێلکان دەخۆن. من دەچم ئێستا دێمەوە، تۆ هەر لێرە دابنیشە".

خێـرا ڕۆیشـت. هـەلێکی دیکـە بـۆ بینینـی زەهـرا رەخسابوو لەچاوتروکانێکدا چووە ماڵەوەو گەڕایەوە.

"فەرموو ئاغا".

"بەمراد بیت کوڕم".

موسا ئاغا بەدەم گۆچان لەعەزردان بەنێو دارزەتوونەکاندا رۆیشتو لەوێوە بەرەو سەرگردەکە چوو. رووناکی لەدەریای دابوو. ئێرەو ئەوێی دەریا خەتخەتیو بازنە بازنەیی بوو. نێوان خەتەکان رەنگیان شینباو بووو ناو بازنەکانیش وەنەوشەیی. هێڵێکی نارجیش لەسەر رووی دەریا تا بناری چیای بەرامبەر درێژبووبووەوە، موسا ئاغا بیریکردەوە تا ئێستا دەریایەکی ئەوەندە ئارامو خەتخەتیم نەبینیوە".

نیشانچی، ئەو پیاوە سەیرە دەیگوت هەندێك رۆژ دەریا ئەوەندە ئارامو بێجووڵەیە کە مێروولە دەتوانێت ئاوی لێبخواتەوە. دیاربوو مەبەستی دەریای ئەمڕۆکە بوو. بەڕاستی زۆر ئارام بوو. دەریا ئەگەر بەئاستەم بجووڵابا مێروولەکانی هەڵدەگرتو لەگەڵ خۆیدا رایدەماڵین.

کاتێك لەگردەکەوە بەرەو لای کانی شۆڕبووەوە، دەنگی نزمی شوڕەشوڕی ئاوی هاتە بەرگوێ. بەدەم گۆچان لەعەرزدان بەرەو هەمان لا رۆیشت. هەرکە گەیشتە سەرکانی واقیوڕما. ئەو ناوە لەڕادەبەدەر جوانو خەملێو بوو. موسا ئاغا لەسەردەمی منداڵیەوە لەکرێت تا ئەودەمە چ جاران سروشتێکی واجوانی نەبینیبوو. ئەو شەوقو رووناکیەی کە لەوردەبەردەکانی بن کانی دەدا، لەسەر بەردەلانی پشت کانی رەنگی دەدایەو بەسەر بەردەکانەوە دەلەرایەوە.

موسا ئاغا لەسەر چیمەنەکانی رۆخ کانی دانیشتو پشتی بەقاپۆری دارکاژێکەوەدا ئەم دوورگەیە نەك هەرهێندەی لەپی دەستێك نەبوو، بەڵکو دوورگەیەکی زۆر جوانو زۆر گەورە بوو. کرێت کێڵگە، ئەسپو دۆستەکانی خۆی یەك بەیەك وەك نەوارێك بەبەرچاواندا رەت بوون. لەنێو گێڵگەدا لەدایك بووبووو هەر لەوێش گەورەبووبوو. هەم باوکیو هەم باپیری بەخێوکەری ئەسپ بوون.

بنەماڵەکەیان ئەسپی رەسەنو بەناوبانگی یۆنانیان بەخێوکردبوون. جگە لەوە ئەسپە ئەبلەقە رەشو سپیەکە بووبووە وێردی سەرزاران.

مردنی ژنەکەی لەنێو کەشتییێکی بچووك... شریتی بیرکردنەوەکانی لێرەوە بچڕاند. خووی بەوەوە گرتبوو. هەرلەگەڵ ئەوەی دەکەوتەوە یادی ژنەکەی هەر لەگەڵ ئەوەی روخساری ئەوی دەکەوتەوە بەرچاو یەکسەر بیری خۆی دەگۆڕیو لەزەینی خۆی پاکی دەسڕیەوە. ئەمجارەش وایکرد لەجیاتی ئەو مەلەك خانمی بەبیردا هات. ئەویش دوورخراوە بووو چیای ئیدای سەر بەتەمی بەرامبەر زادگای بوو. لەئاخاوتنەکانیدا

هەمیشە سەری قسانی دەهێنایەوە سەرچیای ئیدای هەزار کانی. هەموو جارێکیش حەکایەتی کچە زەردی بەشێوەو شێوازی جیاجیاوە دەگێڕایەوە. خوا دەزانێت دڵی چەندە بۆ چیای هەزارکانیو کچە روخسار زەردەکە تەنگ بووە. ئەگەر ماوەیەکی دیکە لێرە بمابا لەگەڵ خۆی دەیبردە چیای ئیداو خۆیشی ئەو چیایەی ئەڤینی دەبینی کە بووبووە سەرچاوەی چیرۆكو داستانان. لەئەسینا، نزیکەی هەموو خەڵك لەسترانو ئاوازەکاندا باسیان لەچیای ئیدا دەکردو بەردەوام رووداوەکانی چیای ئیدایان لەهزری خۆدا دووپات دەکردەوە. ناونانی چیای قازداغی بەچیای عەشق لەخۆڕانەبووە. بەو شێوە راوەستانە فریشتەئاساییەی، نیگاکانی ئاخاوتنەکانی رووخۆشیەکانی بەڕێگادا رۆیشتنەکانی غەمزەو نازونووزو چاوەکانی جوانیی بنیادەمی هەبوو. دڵی بەخشندەی پڕ لەمیهرو ئەڤینداریی کە لەناخیەوە سەرچاوەی دەگرت.. گوتی، ئامان لەم تەمەنە دەتەوێت چیبکەیت تۆ؟ زەینی لەسەر ئەسپەکان گیرساندەوە. ئەسپێکی کوێتی قاوەیی کە سواری دەبوو هات لەبەرچاوانی راوەستا، کاتێك بەسواری ئەسپی کوێت بەنێو شاردا تێدەپەڕی. لەبازاڕ، دووکاندارەکان بۆ سەیرکردنی دەهاتنەدەرو خەڵکی لەشەقامو کووچەو کۆڵانەکانو ژنان لەپشت پەنجەرەکاندا بەسەر سامیو حەپەساویەوە بۆ سەیرکردنی رادەوەستان.

ئەسپە کوێت وەکو مرۆڤو برا وابوو، کاتێك لەدوور دوورەوە دەهات بۆنی ئەوی دەکردو سێ جاران لەخۆشیان دەیحیلاندو بەپیریەوە دەچوو.

کاتێك سواری دەبوویت ئەگەر غەمبار بوایت شێوەی رۆیشتنی غەمەکەتی نیشان دەداو ئەگەر تووڕەبوایت تووڕەبوونەکەتی نیشان دەدا، ئەگەر شادمانیش بوایت لەکاتی رۆیشتندا چەند جارێك رادەوەستاو سێ جاران بەدوای یەکدا دەیحیلاندو خۆشحاڵیەکەی لەیاڵو بژووەکانی دادەچۆڕا. ئەگەر لەدەشتێك، چیایەك، رۆخ کانیەك ماندوو بووبایتو نووستبایت هەر لەوێ بەسەر سەرتەوە رادەوەستاو چاوەڕێی دەکردیت تا لەخەو هەڵدەستایت.

ئێستا ئەو ئەسپە کوێتە لەبەردەستی کێیە؟ ئایا ئاگایان لێیدەبێت، کێ دەڵێت تا ئێستا لەخەفەتان نەمردووە. لەوەرزی بەهاردا، کاتێك پشکوتنی گوڵان، کاتێك خانووی بەجێدەهێشتو دەگەیشتە دارزەیزەفوونەکەی ناوەڕاستی کێڵگە کە بەلكو پۆپەکانی پانەگۆڕێکی هێندەی جۆخینێکی دادەپۆشی، رادەوەستا، سەری هەڵدەبڕی، دوای ئەوەی دەیحیلاند، دەچوو لەژێر درەختەکە رادەوەستاو تفنکەکانی تەواو دەکردنەوە، سەری بەرز دەکردەوە، بۆنی دارزەیتوونەکە کە بەگولیلکان داپۆشرابوو لەگەڵ بۆنو بەرامەی

ئەو دەشتەی کە دەنگی دەهات ئاوێتە دەبووو ئەسپو مرۆڤو باڵندەو زیندەوەرە وردیلەو هەموو بوونەوەرە گیاندارەکانی مەست دەکردو موسا کازم ئاغا لەخۆشیان باڵی دەگرت. سەردەمیی منداڵیو گەنجیو دۆستەکانی بەڕوونی، وەکو خەونێك لەنێو هزریدا دەخولانەوە. کێڵگەی تازە ونبووی دوورەدەستەکان لەناوەڕاستی کێڵگەکە، کەمێك دوورتر لەخانووە وێرانکراوەکە، کانیی پیرۆزی هەڵقولاوی ژێر داربەڕووە گەورەکە.. کێ ناڵێت ئێستا خانووەکەیان تێکنەداوە. درەختەکانی بەرانبەر خانووەکە بڕاونەتەوە. باخچە فراوانە پڕ گوڵو گوڵزارەکە تەفرو توونا کراوە... هەر خوا دەزانێت ئەو کێڵگەیە چەند جوانو بەسەفابوو. چیا تەماویەکانی بەرامبەر دەریای نزیك... ئازار چنگی لەدڵیدا گیرکرد. نەیدەتوانی هۆی ئەو ئازارە دیاری بکات. کاتێك ژنەکەی لەنێو کەشتیە بچووکەکەدا مردو تەرمەکەیان هەڵدایە نێو دەریا ئازارو خەفەت تا ئەو رادەیە پەریشانی نەکرد. هەوڵی دا بیرلەمەلەك خانم، کچەکانیو ئەسپە کوێتەکەی بکاتەوە، ئەمانە ئازارو خەمەکانیان کەم نەکردنەوە.

هەستا خۆر خەریکبوو ئاوادەبوو، دەریای هێمنی ژێر تەمو هالاوکەوتوو، سێبەری ئەو زنارانە کە تا دوور دوور، تا دارهەرمێیەکە درێژبووبوونەوە. کەمێکی دیکە سێبەرەکە نەدەما. هێور هێور بەگردەکەدا هەڵگەڕا. تەنێ پەڵەیەکی ئەرخەوانی پڕ رەنگ لەو خۆرە مابوو کە خەریکبوو ئاوا دەبوو. ئاسمان مەیلەو سەوزو هەورە شینباوەکان بەڕیز پاڵیان بەیەکەوە دابوو.

خۆرئاوا بوو، بەڵام هێشتا هەندێك تیشکی نارنجی لەملاو ئەولا بەدیدەکران. موسا ئاغا بەدەم گۆچانکوتانەوە بەرەو لای خوارێ شۆڕبووەوە. ماندوو بوو تا نزیك دارهەرمێیەکە هاتو لەوێ راوەستا. سێبەری دارهەرمێیەکە لەجاران گەورەتر دەهاتە بەرچاو، چووە ژێر دارەکە. دانیشتو پشتی بەقاپۆرە ئەستورەکەیەوەدا دوای کەمێك حەسانەوە دەستەکانی دانانە سەر زەویو هەستایەوە، کەمێك خۆی لێککێشایەوە، ئیسقانەکانی قرچە قرچیان هات. پێیەکانی دەئیشان. کە هاتەوە ماڵێ بەسەختی لەپلیکانەکاندا سەرکەوتە سەرێو تا بەسەرکەوت چەند جارێك راوەستا. کچەکان بەنیگەرانیەوە بەپیریەوە هاتن.

"باوکە چیتلێهاتووە؟"

"هیچ، هیچم نەبووە".

"باوکە لەوەتەی لەکێڵگەکە گەڕایتەوە حاڵت باش نیە".

"باوکە چما هیچ ناڵێیت؟"

"من باشم".

"باوکە کەمێك پشوو بدە".

موسا ئاغا لەسەر کورسیەکی نەرم دانیشت. هەناسەی قووڵ قووڵی هەڵکێشان.

زەهرا گوتی: "باوکە، مەلەك خانم دۆڵمەی گەڵامێوی بۆ ناردووین. قەدریی بەلەموانیش لەسەر داوای من ماستو سەوزەی هێناوە".

"پارەکەیتان دابوو؟"

"دابوومان، مەلەك شیری بزنیشی بۆ هێناوین. منیش بۆ ئەوەی تێکنەچێت کولاندوومە گۆشتیشم ئاوەکولّ داوە".

کچەکان مێزی خواردونیان داناو سەیری باوکیان کرد. موسا ئاغا بەزەحمەت لەشوێنی خۆی هەستا، دەستی بەمیزەکەوە گرتو دانیشتە سەر کورسی. ئەو خواردنەی لەپێشیان دانا بەخێرایی خواردی. دەستو دەموچاوی شوشتنو چووە سەر جێگاو راکشا.

زەهرا بەهێواشیەوە گوتی: "باوکم هێزو بڕستی تێدا نەماوە".

نەسیبە گوتی: "کە لەکێڵگە گەڕایەوە وایلێهات. خوا دەزانێت لەوێ چی بەسەرهاتووە. لەو رۆژەوە پویرازیش باش دیار نیە. بەڵایەکیان بەسەرهاتووەو بەئێمەی ناڵێن".

"باوکمان رای لەکێڵگەکە بووە، گوایە دەیەوێت بیکرێت ئەگەر رووداوێکی خراپیان بەسەرنەهاتبێت ئاوایان لێنەدەهات. دوای مردنی دایە، قەت باوکمان ئاوا بەو حاڵو رەوشەوە نەبینیوە".

"پزیشکی ئاژەڵانو قەدریی بەلەموانیشیان لەگەڵدابوون، رەنگبێت ئەوان بزانن".

"بەڵکو قەدریی بەلەموان گرفتەکەی بەمەلەك خانم گوتبێت".

"سبەی بچینە لای مەلەك خانم".

"با ئێستا بچین".

زەهرا گوتی: "من دەچم، نەوەك بابە بانگمان بکات، تۆ لێرەبە".

نەسیبە گوتی: "تۆ بڕۆ".

زەهرا کە بۆ ماڵی مەلەك خانم دەچوو بەبەردەم ماڵی پویرازدا تێپەڕی. سەیری دەرگاو پەنجەرە کراوەکانی کرد. هیچکەس لەوێ نەبوو. لەکاتێکدا کە زەهرا چ لەوێدا

ڕەت بباو چ ڕەت نەبا. پویراز هەمیشه لەپشت پەنجەرەو بەردەرگا یان لەسەر کانیی چاوەڕێی ئەو بوو. گەڕایەوە دووبارە بەبەردەم ماڵیاندا تێپەڕی، بەڵام پویراز دیارنەبوو. ڕۆیشتو گەڕایەوە نیگەران بوو، ئایا ئەویش تووشی بەڵایەك بووە؟ هەنگاوەکانی هەڵیانگرتو بردیانە بەردەم دەرگا، چووە ژوورێ بەدەستو قاچی لەرزانەوە لەپلیکانەکان سەرکەوت. سەری بەژوورەکاندا کرد، کەس لەوێ نەبوو، بەلەرزە لەرزو خێرا خێرا لەپلیکانەکان هاتەخوار، بۆلای مەلەك خانم چوو. مەلەك خانم لەتەك لامپا گەورەو نەخشێندراوەکەیان خەریکی چنین بوو. لەگەڵ بینینی زەهرا بەسەرسوڕمانەوە هەستایەسەرپێ:

"چیبووە کچەکەم. باوکت شتێکی لێهاتووە؟ هەموو گیانت عارەقەیە".

زەهرا گوتی: "باوکم باشە، بەڵام نازانم بۆچی غەم دایگرتووە. قسەناکات. هەر دادەمێنێتو بیردەکاتەوە. گوتم رەنگبێت لەکێڵگەکە شتێکیان بەسەرهاتبێت. بەلەموان شتێك هەر دەزانێت، لەبەرئەوە هاتوومەتە لای تۆ، کاك قەدریی دەبێت شتێك هەر بزانێت".

"بەلەموان هیچی بەمن نەگوتوە. ئەگەر ڕووداوێکی نەخۆش ڕوویدابا بەمنی دەگوت. ئێستا دابنیشە با پێکەوە قسە بکەین".

زەهرا چوو لەسەر تەخت دانیشت، مەلەك خانمیش هەستاو لەتەنیشتەوە دانیشت.

زەهرا لەمێژبوو بیری لەوەدەکردەوە کە چما مەلەك خانم لەوەتەی باوکی ئەوی بینیوە وەکو دۆستێکی کۆنو کەسو کارێکی نزیك خۆی، بەگەرمو گوڕیو دڵسۆزیەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، بەڵام نەیدەتوانی لەهۆکاری ئەو دڵسۆزینواندنە بگات. مەلەك خانم ژنێکی زۆر جوان بوو، تەنانەت بەژنێکی گەنج دەژمێردرا. لەکاتێکدا کە باوکی ئەگەرچی ریشێکی تەنکی هەبوو داوی سپی کەوتبووە سەرو ریشی، ئەگەر ریشی نەبایە هێشتا گەنج دیاربوو. لەلایەکی دیکە کاتێك ئاوا بیریدەکردەوە تەریق دەبووەوە. زیاتر لەبەر هاوسەرگیری باوکی ئەویش یەکسەر دوای مەرگی دایکی... یەکسەر؟

"تا ئێستا نەمدیوە قەت ئاوابووبێت. تەنانەت کە دایکیشم مرد، ئەو کاتەی کە دووریشیان خستینەوەو تەنانەت ئەودەمەی تەرمی دایکمانی هەڵدایە ناو دەریاش".

مەلەك خانم گوتی: "وای میرم وای. خوا دەزانێت لەوێ لەچی دلگران بووە". فرمێسك لەگۆشەی چاوانی خڕبوونەوەو دایە پڕمەی گریان.

"نیگەرانت کردم مەلەك خانم. باوکم زۆر حەزی لێیە چیای هەزار کانیی تۆ ببینێت. ئەو چیایە دەبێت زۆر کۆنو بەناوبانگ بێت. باوکم ئێژێت کچانی ئەو چیایە جوانترین کچانی دونیابوون. تەنانەت کرێتی ئێمەیش کچانی واجوانی نەبووە. لەسەر ئەو کچە جوانانە شەڕو شۆڕی زۆر قەوماون. لەپێناو ئەو کچانە زۆر شارو وڵات سووتێندراونو لەگەڵ خاکدا تەخت کراون.

باوکم ئێژێت سەیر بکەن مەلەك خانمیش یەکێك لەکچانی ئەو چیایەی چل کانیەیە".

"ئەویٚ چیای چل کانی نا چیای هەزار کانیە".

"بمبوورە پوورە مەلەك، چل کانی نا؟، هەزار کانی، باوکیشم دەڵێت هەزار کانی، باوکم دەیەوێت بچێتە ئەویٚ".

"نیگەرانی باوکت مەبە، نیگەرانی سوڵتانی هەموومان مەبە. من سبەی قسەی لەگەڵدا دەکەم بزانم گرفتەکەی چیە. تۆ خۆت نیگەران مەکە کچم. من لەوەتەی ئەوم بینیوە زۆر کەیفم پێهاتووە. ئەگەر ئەو بچێتە ناو چیاییەکانی ئێمە هەمووان رێزی لێدەگرنو رازو نیازی لێدەخوازن.

"ئەمە چۆن دەزانیت؟"

نیگایەکی واتاداری لەمەلەك خانم کرد.

"بۆچی ئاوا سەیرم دەکەیت کچم؟ مەگەر تا ئێستا ئەو ئەنگوستیلەیەت نەبینیوە کە باوکت هەیەتی؟"

زەهرا بەسەرسوڕمانەوە گوتی: "بینیومە".

"ئەو ئەنگوستیلەیە دوازدە گۆپکەی هەیە".

"ئەنگوستیلە چی تێدایە. هەمووان ئەنگوستیلەیەان هەیە".

"جیاوازە، لەم دونیایە گەورەیە تەنها حەوت هەشت کەس لەو ئەنگوستیلەیان هەیە".

"مەگەر ئەو ئەنگوستیلەیە چیە؟"

"مەگەر ئەو ئەنگوستیلەیە چیە؟!"

"پیرانی زۆر گەورە لەو جۆرە ئەنگوستیلەیان لەپەنجە دایە".

"پیرانی زۆر گەورە یانی چی؟"

"ئێمە لەو چیایەی هەزار کانیەدا لەمەڵبەندی پیرانی گەورە داین. تەنها پیرمان دەتوانێت ئەو ئەنگوستیلەیە بخاتە پەنجەیەوە.

هەموو ڕۆژێکیش لەگەڵ ئەوەی خۆر لەئاسۆ هاتەدەر هەڵدەستین خۆمان دەشۆین، ڕوومان دەکەینە خۆرو کەربەلا و.. بانگ دەدەین، ئەم ئەنگوستیلەیەش دوازدە گۆپکەیە، واتە دوازدە گۆپکەی هەیە".

"پووری، بانگو کەربەلاو ئەنگوستیلەی دوازدە گۆپکە چین ئیدی؟"

"کچی سوڵتانمان بەو لەمن بپرسە! ئەو شتانە لەباوکت بپرسە".

"باشە پووری".

هەستاو گوتی: "ئێستا دەبێت بڕۆم. باوکم ڕەنگبێت کاری پێم هەبێت، دەبێت بچمەوە ماڵەوە". دەستی مەلەك خانمی گرتو ویستی ماچی بکات، مەلەك خانم نەیهێشت.

"من هیچشتێك نازانم پووری. باوکم ناردمیە خوێندنگەیەکی ئەمریکایی، لەوێ خوێندوومە".

مەلەك خانم گوتی: "ئەوێ ئیدی کوێیە؟"

زەهرا گوتی: "ماتە خوێندنگەی ئینگلیزی".

"یانی هی ئەوانەی کە ئەوەی ئێمەیان لەچاناك قەڵادا کوشت؟ ئینگلیزەکان گوللە تۆپیمان لەوەی ئێمە گرتبوو، تەنانەت پارچەیەکیش لەوەی ئێمە نەمابووەوە، بووبووە هەڵمو هاڵاوو بۆ ئاسمان بەرزبووبووەوە".

"سەرەخۆشیت لێدەکەم. تەمەنی درێژی بۆتۆو کوڕەکەت جێهێشتبێت".

"نیگەران مەبە کچم. من دێمە لای سوڵتانمانو قسەی لەگەڵدا دەکەم".

زەهرا لەماڵی مەلەك خانم هاتەدەرو بەڕاکردن چووە بەردەرگای ماڵی پویراز ڕاوەستا. چووە نزیك پلیکانە مەڕمەڕیەکان، قاچی ڕاستی بەرزکردەوەو لەجێی خۆی دایدەنایەوە سەر پلیکانە مەڕمەڕیەکە. قاچی ڕاستی بۆماوەیەك ئاوا بەرزبووەوەو کشایەدواوە. لەپڕ ڕاوەستاو بیریکردەوە، پاشان لەپڕ سێ پلیکانەش سەرکەوت، خۆی لەبەردەم دەرگا بینیەوە. نەیتوانی دەستی درێژبکاتو دەرگاکە بکاتەوە. یەکسەر گەڕایەوەو بێئەوەی بزانێت دەچێتە کوێ خولێکی بەدەوری خانووەکە لێدا پاشان بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. ڕایکردو بەخێرایی دەرگاکەی کردەوە. لەنێو تاریکی پلیکانەکان بەدەم کەوتنو هەستانەوە سەرکەوت. پویرازو لێنا لەهۆڵەکە ڕووبەڕووی یەکدی دانیشتبوون. پویراز لەگەڵ بینینی ئەو وشکهەڵات، نەیتوانی لەجێی خۆی تەکان بخوات. لێنا یەکسەر هەستا. دەستی کچەکەی گرتو هێنای لەسەر کورسیەکەی خۆی داینیشاند.

"بەخێربێیت کچەکەم، سەفات هانی".

لێناش حەپەسابوو. روخساری زەهرا سوور سوور هەڵگەڕابووو شەلاڵی ئارەقە بووبوو. لێنا نەیدەزانی چیبکات، لەو نێوە دەچووەخوارو دەهاتەوە سەرێ. دواجار هات بەرامبەر کچەکە راوەستاو توانی بڵێت: "ئاوم بۆ هێناویت، پاشان چایشت بۆ دێنم. ئێستا لەدێمم ناوە. چای تازە دێمکراو دەتهێنتەوە سەرخۆ". خێرا خێرا هەناسەی دەدا.

پاشانیش بەزمانی یۆنانی دەستی بەقسان کردن. لەگەڵ ئەوەشدا کە خێرا خێرا قسەی دەکرد زەهرا تێیدەگەیشت. قسەکردنی تێکەڵو پێکەڵی ئەو زەهرای هێنایە پێکەنین. لێنا ئاوی هێنا، زەهرا کاتێك ئاوی لێوەرگرت بەیۆنانی سوپاسی کرد. پویرازیش چاوی بڕیبووە زەهراو هیچ ئاگای لەخۆی نەمابووو سەیری دەکرد. چەند جارێك ویستی قسەبکات، دەمی کردەوە، دەنگی دەرنەدەهات. لێنا بیریکردەوە. کوڕێژگەی من لێیدراوە. ئینشاللا هیچی لێنەهاتووە. چای هێناو دایە زەهرا. کچەکە کاتی وەرگرتنی چایەکە دەستەکانی دەلەرزین.

لێنا پرسی: "چەند شەکری تێبکەم؟"

کچەکە بەدەنگێك کە دەبیسترا و نەدەبیسترا. گوتی: "یەك کەوچك".

چای بەدەستی لەرزانەوە خواردەوە.

"چایەکی دیکە بێنم کچم؟"

"نە، سوپاس لێنا خانم".

لێنا بەناوهێنانی بەلێناخانم خۆشحاڵ بوو، بەزمانی یۆنانی گوتی: "منیش سوپاست دەکەم". ویستی بڵێت ئینشاللا تۆش دەگەڕێتەوە زێدی خۆت، بەلام نەیتوانی دەریببڕێت. دوای کەمێك دەردەدڵکردن گوتی: "تۆ چەندە جوانیت کچەکەم، خوا لەچاوی بەد بتپارێزێت. خوا قسمەتو نسیبت بەئەندازەی ئەو جوانیەتو بەمرازی دڵی میهرەبانت بەجێبگەیەنێت". کە ئەو قسانەشی دەکرد لەژێرەوە چاوێکی لەپویراز کرد. زەهراش بەیۆنانی قسەی کردو سوپاسی کرد. پاشان گوتی: "خوا نزاکانت قبوڵ بکات".

پویراز، کاتێك ئەوان بەیۆنانی لەگەڵ یەکدی دەدوان کەمێك هاتەوە سەرخۆیو بەدەنگێکی لەرزانو بەشڵەژاویەوە گوتی: "تۆچی بەمیوانەکەمان دەڵێیت لێنا؟"

"پێمگوت زۆر جوانی، مەگەر وانیە؟ تۆ هەموو دونیا گەڕاویت، هەموو دونیا گەڕاویتو هاتیتە ئێرە، کچێکی لەزەهرای کچی خۆم جوانترت بینیوە؟"

پویراز لەناخی دڵەوە گوتی: "نەمبینیوە".
زەهرا لەرزی، روخساری کەمێك زیاتر سوور هەڵگەڕا.
"چایەکی دیکە. چایەکەم زۆر خۆش نیە؟"
زەهرا نەیتوانی هیچ بڵێت.
"لاوۆ چایەکیش بۆ تۆ بێنم؟"
زەهرا کاتی چایەکەی وەرگرت دیسان دەستەکانی لەرزین. دەستەکانی پویرازیش، ئەمەش لەچاوانی زەهرا نەشاردرایەوە. کاتێك چای بەئارامی دەخواردەوە سەری دانەواندبووو سەیری عەرزەکەی دەکرد.
"چایەکەم زۆر خۆش نیە؟ ببینە چ بۆنێکی هەیە بۆتۆش بێنمەوە لاوۆ".
دیسان پیاڵەیەك چای هێنا. پیاڵەکان ناوقەد باریك و لێوەکانیان ئاوەزێڕبوون. زەهرا توانی بڵێت: "باوکم".
پویراز بەنیگەرانیەوە پرسی: "باوکت شتێکی لێهاتووە؟" زۆری نەمابوو پیاڵەکەی لەدەست بکەوێت.
"هیچی لێنەهاتووە، بەڵام لەوەتەی گەڕاوەتەوە لەسەرخۆی نیە. هیچ قسەناکات تەنانەت ئەو کاتەی دایکیشم مرد ئاوا نەبوو. لەوێ شتێکی بۆهاتە پێش؟"
پویراز گوتی: "سمایل".
"چیبووە، سمایل کێیە؟ چیکرد لەگەڵتان؟ چی لەبابم کرد؟"
پویراز بەدرێژی باسی سمایل و ئەوەی بەسەری هاتووەو ئێلیاو کێڵگەی بەخێوکردنی ئەسپەکانی بەوردیو لەسەری تابنی بۆ زەهرا گێڕایەوە.
زەهرا پرسی: "ئەو رەمزی کاولاکە هەمان ئەو کابرایەیە کە کلێساو خانووی ئاغاکانی لەو خوارەوە تێك دان؟"
پویراز گوتی: "خۆیەتی".
"باوکم لەوە دڵی ئێشاوە، ئەو ناتوانێت بەرگەی ستەمکاریو بێدادی بگرێت".
لێنا گوتی: "چایەکی دیکە بێنم، ئێستا دامناوەتە سەر ئاگردان، دەمی داوە".
زەهرا بێئەوەی ئاگای لەوەبێت ماوەیەکی درێژە لەوێ ماوەتەوە، هەروەها بەتاسەوە چاوی بڕیبووە پویراز. پویراز تێبینی نیگاکانی ئەوی کردو لەخۆشیان سەرمەست بووبووو بۆ ئەوەی کچەکە زیاتر بمێنێتەوە لەسەریەك و سەرمەستانە قسەی دەکرد، لەبارەی قەفقاز، مەزۆپۆتامیا، تورۆس، ڤاسیلیو ئەمیر سەلاحەدینەوە قسەی بۆ کردن.

نەزرە قوربانیەکەی کە نیشانەی خۆری بەسەرەوە بوو هێنایەدەرو کردیەوەو بۆلای زەهرای درێژکرد. زەهرا بەوپەڕی تاسەوە سەیری ئەو شتانەی نێو دەستی ئەوی دەکرد.

"ئەمانە ئەمیر سەلاحەدین پێیدام، گوتی هی سێ چوار هەزار ساڵ پێش ئێستان. گوتی نابێت لەخۆتیان دووربخەیتەوە. کاتێك دەشمریت دەبێت بیاندەیت بەمنداڵە هەرە گەورەکەت، چ کوڕ بێت چ کچو ئەمەشیان پێدەڵێیت. ئەگەر منداڵیشت نەبوو دەبێت بیاندەیت بەژنەکەت. ئەمانە زۆر بەنرخن. ئەگەر برسی ببیتو تەنانەت لەبرسان بشمریت نابێت بیانفرۆشیت. نابێت بیاندەیتە مۆزەخانە. تا لەژیاندایت دەبێت بەملتەوە بن. نەکەیت بەبێگانەیان نیشان بدەیت.

ئەگەرنا جادووکەی بەتاڵ دەبێتەوە. کاتێك بوویتە خاوەن منداڵ دەبێت ئەو بەردە پیرۆزانە بەملی یەکەمین کوڕتەوە بکەیت. ئەو منداڵە تا ئەمانەی بەملەوەبن بەختەوەردەبێت، لەقەزاو بەلا پارێزراو دەبێت".

زەهرا لەو ماوەیەی کە ئەو قسەی دەکرد چاوی لەسەر ئەو شتانە لانەدەبرد کە بەدەستیەوە بوونو تەنانەت سەیری پویرازیشی نەدەکرد، ئەگەرچی لەبینینی تێرنەدەبوو.

پویراز کە قسەکانی تەواوکرد، دەستی خۆی درێژکردو پەیکەرە بچووکەکانی لەسەرلەپی دەستی زەهرا هەلگرتنو خستنیەوە نێو قوتووەکە کە وێنەی خۆری لەسەر هەڵکەندرابووو بەئارامی بەملیەوە کردەوە.

زەهرا بەدەستپاچەییەوە هەستا:

"باوکم مسۆگەر لەخەو هەستاوەو بانگی کردووم. سوپاستان دەکەم. باوکم قەت ئاوای لێنەهاتووە. بێگومان گرفتەکەی سمایل گرفتێکی جیاوازترە".

دەستی لێنای ڕامووسی، کاتێك خەریکبوو تەوقەی لەگەڵ پویرازدا دەکرد دیسان ڕوخساری پەمەیی هەڵگەڕا. چاوەکانی پویراز پڕبوون لەعەشقو بەختەوەری.

"دەتەوێت تا ماڵەوە لەگەڵت بێم، نیوەشەوە".

زەهرا تاوێك دوو دڵ ما، نەیتوانی بڵێت کەس لەو دوورگە چۆڵو هۆڵەدا نیە، هیچکەس نیە. بەرەو پلیکانەکان ڕۆیشت پویرازیش بەدوایدا چوو. کە بەرەو ماڵی زەهرا دەڕۆیشتن هێندە لەسەرخۆ دەڕۆیشتن دەتگوت هەر ناڕۆن. کاتێك گەیشتە بەردەرگای ماڵەوە، لەسەرەوە چراکە ڕۆشن بوو، لەنێو ئەو ڕووناکیە کەمەدا بەزەحمەت ڕوخساری یەکدیان دەبینی. ماوەیەکی درێژئاوا مانەوە لەسەرەوە نەسیبە هاواری کرد:

"کێیە؟ زەهرا تۆیت؟"

"منم".

پـویراز گـوتی: "بـەیانی زوو دێـم قسـە لەگـەڵ مـام ئاغـا دەکـەم، بـەڵکو بتـوانم هۆکـاری نیگەرانیەکـەی بـزانم. دوای بینینـی کێڵگەکـەو قسـەکانی سمایـل، مـام ئاغـا مـام ئاغـای جـاران نەبوو. حاڵەتی دەمو چاوی گۆڕا. پەیوەندی بەئێمـەو بـەدونیاوە بـڕی. دەتگوت لەبۆشاییەکی بێپایاندا ماوەتەوە. چووبووە نێو ناخی خۆیو سەیری هیچ لایەکی نەدەکرد".

زەهـرا کـە لەپلیکانـەکان بەسـەردەکەوت پـویراز لـەدواوە بـانگی کـرد. زەهـرا لەسـەر پلیکانەکان راوەستا.

"توانیت شتێك بزانیت؟ تۆ بڵێیت چی لێهاتبێت؟ خۆی هیچ قسەیەك ناکات؟"

"جارێك کە لەسەر کورسیەکەی دانیشتبوو بیریدەکردەوە، ناوی سمایلی لەدەم دەرچوو".

نەسـیبە بەئەسـپایی لەپلیکانـەکان هاتـەخوارو بەهێواشـی گـوتی: "ئێـوە دەتانـەوێت قسەبکەن، باوکم خەوتووە"و لەپلیکانەکان بەسەرکەوتەوە.

دوای رۆیشتنی نەسیبە، زەهراو پویراز ماوەیەکی درێژ بەرامبەری یەکدی راوەستانو ئاوا مانەوە تا ئەو دەمەی دەنگی پێخوست لەسەرەوە هات.

بەبیسـتنی دەنگـی پێیەکـە لـەو خـەوەیان بەئاگاهاتنـەوە، زەهـرا بەپلیکانەکانـدا سەرکەوت، نەسیبە چاوەڕوانی بوو.

زەهراو پویراز ئەو شەوە تا بـەیانی خـەویان لێنەکـەوت، بیریـان لەیەکـدی دەکـردەوە. پـویراز بەیانیەکـەی زوو چـووە لای موسـا ئاغـا. بـۆنی خۆشـی چـا ماڵەکـەی پڕکردبـووو کتریـی سـەرئاگردانەکە دەجۆشـاو هـەڵمێکی لێدەهاتـەدەر. موسـا ئاغـا لەپشـت مێـز دانیشـتبووو نـانو چـای دەخـوارد، بـەبینینی پـویراز بـەدەم پێکەنینـەوە هەسـتاو گـوتی: "بـەخێرهاتی کـوڕم. فـەرموو وەرە ئێـرە". کورسـیی بەرامبـەری خـۆی نیشـان دا، لەگـەڵ دانیشتندا نەسیبە قاپو پەرداغ و نانی بۆهێناو لەپێشی دانا. پەنیرو دۆڵکەیەکی پڕ شیر لەسـەر مێزەکـە دانـدرابوون. قـەدریی بەلـەموان هـەر جارێـك بچووبایە شارۆچکە نـانی تازەی دەهێنا. بۆنی نانی گەرم لەگەڵ بۆنی چا ئاوێتەی یەکدی بووبوون.

هەرچوار کەس لەدەوری مێزی نانخواردن دانیشـتنو نـانو چایان خـوارد. موسا ئاغـا هەستایەوە، ئەوانی دیش لەگەڵیدا هەستان. چوونە دەرەوە. موسـا ئاغـا یەکڕاسـت بـۆلای چنارەکان رۆیشت. ئەوانیدیکەش بەدوایدا.

موسا ئاغا گوتی: "من دەمەوێت ئەمڕۆکەش بەدوورگەدا بگەڕێم".

کەوتەڕێ. پویراز کە لەدوایەوە تێیەوە رامابوو بیریکردەوە، حاڵەتی روخساری ئاغا لەو کاتەی لەناو بەلەم بوون خراپتر دیارە. رەوشەکەی خراپە؟ بەکچەکانیشی گوت: "نیگەران مەبن کچینە، لێبگەڕێن با ماوەیەك ئاوابێت. رەنگبێت تەنیایی بۆ ئەو باشتر بێت. ئازارەکەی گەورەیە".

لەم کاتەدا مەلەك خانم هاتەلایان. بەهاتنی ئەو زۆر خۆشحاڵ بوون، لەسەر کاناپە تەختەییەکە دانیشتن.

زەهرا نەیدەتوانی چاو لەسەر پویراز هەڵبگرێت. هەندێکجار سوور هەڵدەگەڕا، هەندێکجاریش رەنگ بەڕووانیەوە نەدەما. مەلەك خانم بەپەلە هات لەڕۆخ پویراز دانیشت. هیچکەسیان قسەی نەدەکرد.

موسا ئاغا، سوڵتانی گەورەمان خەریکە تاكو تەنیا دەڕوات".

مەلەك خانم کە ئاگای لەهەموو شتێك بوو، دەستی زەهرای گرت:

"وابزانم تۆ زۆر دەمێکە سەری شەریفە خاتوونت نەداوە. کلیمەکە تەواو بووە.

دەڵێی باغی بەهەشتە هێند جوانە. هەستە باپێکەوە بچین سەرێکی لێیبدەین". هەستانو بەرەو ماڵی شەریفە خاتوون رۆیشتن. زەهرا تا ئەو دەمەی کە لەپشت خانووەکان ئاودیو بوون لێکلێکە ئاوڕی لەدوای خۆی دانەوەو سەیری پویراز موسای کرد. زەهرا تاوێك ئۆقرەی نەدەگرت لەپوپراز دووربکەوێتەوە. مەلەك خانم لەدڵی خۆیدا گوتی: "کار لەکارترازاوە. ئەویش ئاوا عاشقی شەهیدەکەی خۆی بووبووو دەستی لەگیانی خۆی هەڵگرتبوو رەدووی کەوتبوو. بەمە دەڵێن سەوداسەری، ئەگەر لەم دونیایەدا گرفتاری عەشقێکی ئاوا نەبیت وەك ئەوە وایە نەژیابیت. لەدەست دەرچووو رۆیشت. تەنانەت گۆڕیشی نیە. بوو بەهەڵم هەڵچوو. لێیگەڕێ بابڕوات. وا دەزانم هەموو رۆژێك وەکو گوڵێکی تازە لەسەر پەڕەی دڵم دەڕوێت.

رۆژانی عاشقبوونو دڵدادەیی بەبەرچاویدا تێپەرین. خۆی دایە دەست شەپۆلێك لەشەوقو تاسە، فرمێسك لەچاوانی قەتیس مان، لەپڕێکدا زەهرای کە لەتەنیشتیەوە دەڕۆیشت لەئامێز گرت. گوتی: "وای کچم، وای کچە شۆخەکەی خۆم. بۆ دەبێت ئەو بەڵایە بەسەر کچێکی جوانی وەك تۆوە بێت. ئێستا تۆ دەبێت چیبکەیت. موسا ئاغا تەنانەت نەیهێشتووە باولەکانیشتان بکەنەوە ئەو لێرە نامێنێتەوە. ئەگەر نەتوانێت

کارێك بكات رادەكات‌و دەڕوات. ئەگەر هیچی پێنەکرا کەشتی‌و بەلەم‌و کەلەکێکی دەست نەکەت خۆی بەدەریا دادەدات‌و بەمەلەکردن دەچێتەوە دوورگەی خۆی".

"دەیەوێت کێڵگە بکرێت، ئەمەت نەبیست مەلەك خانم؟"

"بیستم کچم، بیستم، بەڵام ئەو خەریکە یاری دەکات. خەریکە یاری لەگەڵ خۆیدا دەکات. ئەو دەگەڕێتەوە وڵاتەکەی خۆی. ئەگەر نەشتوانێت بگەڕێتەوە زۆر ناژیت".

"خوا نەکات مەلەك خانم، مەلەك خانم، خوا نەکات. تۆ نازانیت، ئەویش عاشقی تۆیە، هەمیشە لەخەودا بانگی تۆ دەکات. من دەزانم، نەسیبەش دەزانێت. تۆش دەزانیت مەلەك خانم".

هەرکە زەهرا ئەو قسانەی کرد، مەلەك خانم وەك ئەوەی دەستی بەرپۆلوان کەوتبێت لەکچەکە جیابووەوەو بەتەنیا رووەو ماڵ بووەوە. زەهراش خێرا خێرا بێئەوەی سەیری ژێر چنارەکان بکات گەڕایەوە ماڵێ.

موسا کازم ئاغا وەکو هەموو رۆژان بەرلەوەی خۆر لەئاسۆ دەرکەوێت، هەستا، هەر زوو نان‌و چای خوارد، لەماڵ دەرکەوت، چووە سەرکانی، دوای کانی سەرێکی بەملاو ئەولای دوورگەدا کرد، گۆڕەکان، ئەشکەوتەکان، باغەکان، شارە زەردەواڵەکان، جۆگەو جوێبارەکان، زەویە تەختانی‌و ئامادەکانی کێڵان، هێلانەی باڵندەکان. لەدامێنی گردێکدا گۆڕێکی یۆنانیەکانی بینی کە خاچێك لەسەر کێلەکەیدا هەڵکەندرابوو. لەسەر کێلی هەموو گۆڕەکان لەژێر نەخشی خاچدا ناوو ناوی خێزانی مردووەکان نووسرابوو. ناوی زۆربەیان تورکی بوو. ئەوە نەبووە مایەی سەرسوڕمانی موسا ئاغا. لەکرێت ناوی خێزانیی زۆربەی خێزانەکان تورکی بوو. بیریکردەوە، ئیدی من گۆڕی باوك‌و باپیرو کەسوکارەکانم نابینمەوە، لەبەرخۆیەوە گوتی، ئەم گۆڕستانە لەماوەیەکی کورتدا لەنێو دەچێت. خەمێکی سەیرو بێپێشینە زایە دڵیەوەو نەیتوانی بەپێوە رابوەستێت، لەسەر سەکۆیەك دانیشت. چاوی بڕیە دەریا. دەریا، چ دەریایەکی هێمن بوو. وەلی نیشانچی لەبەرامبەر چاوانیدا دەرکەوت، ئەو پیاوە وردیلەیە، ئەو جادووگەرەی دەریا کە دەیتوانی ژێر دەریاکان ببینێت، پویراز سوێندی دەخوارد کە ئەو دەتوانێت ژێر دەریاکان ببینێت. گۆڕی باوك‌و هەموو عێل‌و تۆرەمەو دەریای رەش‌و دارگوێزە زەبەلاحەکانی خۆی جێهێشتوون‌و هاتۆتە ئێرەو ژنەکەشی لەو گوندەی نێو چیاکان ماوەتەوە، بەڵام ئەو ئەگەر بیەوێت هەم دەتوانێت بچێتە دەریای رەش‌و هەم بچێتەوە گوندەکەی خۆی، هەم دەشتوانێت ژنەکەی ببینێت‌و هەم دارگوێزەکانی.

موسا ئاغا لەکاتی رۆژئاوابووندا گەڕایەوە ماڵەوە. سفرە ئامادەبوو، کچەکان بەنیگەرانیەوە چاوەڕێی بوون. پویراز سێ جاران سەری ماڵیانی دابووو سۆراغی موسا ئاغا پرسیبووو یەکسەریش گەڕابووەوە، لەکاتێکدا زەهرا هەموو جارێك کە پویراز دەهات بیری دەکردەوە تا باوکیان دەگەڕێتەوە ئەو هەرچاوەڕێی دەکات، بەڵام پویراز هەموو جارێك بێئەوەی تەنانەت سەیری زەهرا بکات گەڕابووەوەو رۆیشتبوو. کچەکە کە سەری لەو رەفتارەی پویراز دەرنەدەچوو فرمێسك لەچاوانی هاتبوونەخوارو زۆر خەمگین و نیگەران بووبوو.

پویراز کە دوای هاتنەوەی موسا ئاغا هاتبووە لایان بەعەشقەوە سەیری زەهرای کردبووو ئەمەش بووبووە مایەی ئەوەی کە زەهرا شێت و شەیدا ببێت.

مەلەك خانم بزنەکانی بۆ لەوەڕاندن دەبرد کە لەژێر چنارەکان رووبەڕووی زەهرا بووەوە.

"زەهرا کوا دەتگوت بچین گیاو گوڵ کۆبکەینەوە، زووبە بابڕۆین. ئێرە گیاو گوڵی زۆرە. دەتوانی خواردنی جۆراو جۆر بۆ باوکت لێبنێیت. موسا ئاغا رەنگبێت تاسەی خواردنەکانی خۆتانی کردبێت. باوکت خۆ لەماڵێ نیە".

"خانم سەبرت هەبێت با بانگی نەسیبەش بکەم".

بەرەو ماڵەوە رایکرد، کەمێك دواتر لەگەڵ نەسیبەو سەبەتە قامیشیەکانی هاتەوە لای مەلەك خانم. گیاو گوڵی جیاجیایان کۆکردەوە. سەبەتەکانیان پڕ کردن و دەمەدەمی رۆژئاوابوون هاتنە ژێر دارچنارەکان، گیاکانیان بەجوانی لەسەر کانی شوشتنەوە.

موسا ئاغا لەپلیکانەکان بەسەردەکەوت کە لووتی پڕبوو لەبۆن و بەرامەی ئاشنا، بەخۆشحاڵیەوە گوتی: "چ باسە، کچەکان، بۆن و بەرامەی خۆش و جیاواز لەچێشتخانەکە دێت".

قۆڵی پویرازی گرت و رایکێشاو گوتی: "دانیشە". خۆیشی چوودانیشت. زەهرا ئەوەی بینی کە باوکی قۆڵی پویرازی گرت و رایکێشا، بیری کردەوە، باوکم هەموو شتێك دەزانێت. تا ئێستا نەیبینیبوو باوکی لەگەڵ کەس ئاوا دۆستانە بێت.

"باوکە، ئەمڕۆ لەگەڵ مەلەك خانم چووینە دارستانی کاژەکان، لەگەڵ نەسیبە زۆرمان گیاو گوڵ کۆکردۆتەوە. لێرەش وەکو کێڵگەی خۆمان جۆرەها گیاو گوڵ هەن. هەرچی بتەوێت هەیە".

"دەستتان خۆش کچم. کەوابوو لەگەڵ پویرازی کوڕم لەو خواردنە گیاییانەی کرێت دەخۆین".

موسا ئاغا کە چەند رۆژێك بوو دڵتەنگو خەمگین بوو، ئێستا خەریك بوو پێدەکەنی.

"کەوابوو بڕیارە لەو خواردنە تایبەتیانەی کرێت بخۆین! کرێتیەکان لەبەرئەوەی هەمیشە خواردنە گیاییەکان دەخۆن زۆر تەمەن دەکەن".

ئامادەبوو بۆ خواردنو گوتی: "فەرمووو کاکە پویراز، کوڕم".

کچەکان بەوە خۆشحاڵ بووبوون کە بووبوونە مایەی ئەوەی باوکیان هەست بەسەرفرازیو خۆشحاڵی بکات. زەهرا وا تەماشای پویرازی کرد کە پویراز دڵی هاتە لەرزین. زەهرا کە پێدەکەنی چاڵی چەناگەی زیاتر قووڵ دەبووو جوانیەکەی دوو ئەوەندە دەبووەوە.

پویراز گوتی: "لەهەمووو تەمەنمدا خواردنی ئاوا بەتامم نەخواردووە. لەتورۆسی ئێمەیشدا خواردنی گیایی لێدەندرێت، وەلێ ناگەنە ئەمەی ئێوە. لەنێو ئێمەیشدا باوە کە سرکەی هەنار لەو خواردنانە دەکەن کە گوشتیان تێدایە".

"دایکیان خواردنی خۆش خۆشی لێدەنان. ئەمانەش لەدایکیان فێربوونە. کچینە دەستتانخۆش بێت".

"لام سەیر بوو کە ئەو هەموو گیایە لێرە هەیە. لێرە لەجیاتی لیمۆ زیاتر سوود لەسرکەی هەنار وەردەگرن. پوورە مەلەك ئەمەی پێیگوتم. سرکەی ئەم چێشتەش هەر ئەو بۆی هێناین".

"سبەی دەچمە شارۆچکە، ئەگەر پویرازی کوڕیشمان بێت باشتر دەبێت".

پویراز بەوروژانەوە:

"سەرچاو ئاغا. من لەخزمەتم، مەگەر دەکرێت تۆ ئەمرێکت هەبێت من جێبەجێی نەکەم ئاغا. چۆن دەتوانم تۆ بەتەنیا رەوانەی شارۆچکە بکەم ئاغا".

"سوپاست دەکەم کوڕم. سەرفراز بیت".

لەدەوری مێزەکە هەستا، پویرازیش بەدوای ئەوداهەستا. موسا ئاغا بۆ دانیشتن کورسی نیشان دا. تا موسا ئاغا دانیشتە سەرکورسیەکە ئەو بەپێوە چاوەڕێی کرد.

"رۆڵە ئێوە سفرەکە کۆبکەنەوە، کارەکانی چێشتخانە تەواو بکەنو ئینجا وەرنە لای ئێمە، تا ئێوە دێن ئێمە لەگەڵ پویرازی کوڕمان قسان دەکەین".

کچەکان تا ئەوان هاتن سفرەیان کۆکردەوە، ئاغاو پویراز هەر لەبارەی رەمزی کاولاكو ئەو خانوانەی کە لەگوندەکانی لێوار دەریاو شارەکاندا چۆڵو هۆڵ ماونەتەوە، هەروەها لەبارەی کێڵگەکانو ئەو خوێندنگایانەی کە بەنرخی کەم کڕیونیو تێکیداون

قسەیان کرد. کچەکان دوای ئـەوەی کارەکانیـان تـەواو کـرد هاتن‌و بەشـەرمنیەوە لەسـەر کاناپەی ئەولاوە دانیشتن. موسا ئاغـا ئـەوەی تێبینـی کـردو گـوتی: "شـەرم مەکـەن رۆڵـە. پویرازی کوڕمان بێگانە نیە. لێرە نزیکترین کەسم کاکە پویرازە".

"لەگەورەیی خۆتانە بەڕێزم".

"بەرلـەوەی ئێـوە بـێن باسـی رەمـزی کاولاکمـان دەکـرد. هـەر ئـەو کەسـەی کـە ئـەو کۆشکانەی ئەوبەرو کلێسای تەنیشتمانی رووخانـد. ئەگـەر پـویرازی کوڕمـان خوێندنگـەو خانووی مامۆستاو دووکانەکانی لێوار دەریای نەکڕیبان، ئەو رەمزی کاولاکزادەیەو هەموو یانی تێکوپێك دەدان".

کچەکان دەستیان لەسەر سنگیان تێهەڵینابووو گوێیان دابـووە قسـەکانی باوکیـان. زەهـراش بەتاسـەوە چـاوی بڕیبـووە پـویراز. تـا زیـاتر سـەیری ئـەوی دەکـرد، ئـەڤینی بەرامبـەر بـەو گـەورەتر دەبـوو. ئـەوەی دەزانـی کـە مسـتەفا کـەمال پاشـا لەجەنگـدا مـەدالیای سـەربەخۆیی داوەتێ. لێنا مەدالیاکەی نیشان دابوو. مەدالیایەکی گەورەو ساف، لەزێڕ دروستکرابوو.

موسا ئاغا کە دەمێك بوو لەگەڵ نـاخی خۆیـدا رۆچـووبوو. روخسـاری پڕبـوو لـەلۆچ‌و باڵای لاربووبووەوە، ئێستا قسەکانی گۆڕابـوون‌و لەپڕێکـدا گـەنج بووبـووەوە. وەك ئـەوەی ئاوی زیندەگانی خواردبێتەوە.

کەمێك دواتر دووبارە گۆڕان بەسەرحاڵەتی دەم‌و چاوی داهات، بەڵام هـەروەك پێشـان نا، گوتی: "پویرازی کوڕیشمان دەناسن، خوا دەست بەتەمەنیەوە بگرێت".

پویراز خۆی کۆکردەوەو گوتی: "خـوا تۆشمـان بـۆ بهێڵێـت ئاغـا. کـاك دکتـۆریش لای ئێمـە بوو. سمایل سەرکاری ئەو کێڵگەیە بوو کە بۆی چووین. ئێلیـا ئاغـا کێڵگـە، هـەموو ئەسـپەکان، تەویلـەکان، خـانووو گشـت دارونـەداری خـۆی بـەسمایل سـپاردووەو پێیگوتـوە سـاڵێك زیـاتری پێناچێت دەگەڕێمەوە، سمایل پێیوایە ساڵێك زیاتری پێناچێت ئێلیا دەگەڕێتەوە".

زەهرا بیری کردەوە، باوکم لەخەودا ناوی سمایلی دەهێنا. ئەمە شتێکی تێدایە.

موسا کازم ئاغا، یەکەمجار تێکـدانی خانووەکـان بەدەسـتی رەمـزی کـاولاك، بڕینـەوەی درەختەکان، فرۆشـتنی زەیتوونـەکان بـەنرخی هـەرزان بـەرەمزی کـاولاکزادە، پاشـان ئـەو بەلایەی کە بەسەر سمایلیش هاتبوو...

موسا ئاغا ئەو رووداوەی کە بەسەر سمایـل هـاتبوو ئەوەنـدە بەسـۆزوو وردەکاریـەوە بـۆ گێڕانەوە کە هەموویان لەشوێنی خۆیان وشك بوون، چەقۆت لێـدابان خوێنیـان لێنـەدەهات.

موسا ئاغا لەخەفەتان هەناسەبڕکێی پێکەوتبوو، لەنێو کورسیەکەیدا گرمۆڵە بووبووو شانەکانی داکەوتبوونو خڕبووبووەوە ناوخۆی. ماوەیەك دەنگ لەهیچ کامیان نەهاتو وەك ئەوەی ئەوان تاوانەکەیان کردبێت نەیانتوانی سەیری روخساری یەکدی بکەن.

کەمێك دواتر موسا ئاغا پشتی خۆی راست کردەوە. خۆی جووڵاندو هەستا، کشایە دواوە، نیگای یەکەمجار لەنیگای زەهرا هەڵنگوت، زەهرا چاوی لەچاوی لانەدا، پویرازیش نەیتوانی چاو لەنیگای پۆلائاسای ئەو لابدات.

نەسیبە ماتو حەیران مابوو، لەسەر سامی لەچاوەکانی باوکی رامابوو تا ئەو دەمەی باوکی دەستی بەقسەنەکرد نەیتوانی چاو لەچاوەکانی وەربگێڕێت.

"رۆڵەکانم، ئەو بەڵایەی بەسەر ئێمە هاتووە لەهیچ سەردەمێك بەسەر هیچ بەنی بەشەرێك نەهاتووە، سەیری بکەن ئێمە هیچ گوناهێکمان نەکردبوو چاوت دەکەیتەوە دەبینی جەندرمەو پۆلیس شارۆچکەو گوندو دوورگەت گەمارۆ دەدەنو پێتدەڵێن شارۆچکەو گوندوماڵەکانتان چۆڵ بکەن، یەکسەر بۆ وڵاتێکی دیکە. وشك دەبن. ئەمە لەمردن خراپترە. ئەوانەی هاتنە سەرمن، لەڕاستیدا کەسانێکی باشو رێکوپێك بوون. زۆر بەبەریەك هەڵچووین. پێمگوتن ئاخر بۆ دەبێت من خاکی سەدان ساڵەی خۆم بەجێبهێڵمو بچمە جێگایەك کە نازانم لەکوێشە. ناو بێگانان، کەس وەڵامی نەدامەوە. ئەگەر وەڵامێکی گونجاویان هەبوا لەبەردڵم گران نەدەبوو. تەنها چەند کەسێك پێیانگوتم ئەمە بڕیارێکە کە هەموو ئەوروپا لەلۆزاندا داویانە. دەڕۆن پاشان زوو دەگەڕێنەوە، ئەوانەی کە لەوێشن دەگەڕێنەوە. باشە دامانا ئێلیا چورباچی کە رۆیشتوە، گەڕایەوەو هاتەوە کێڵگەکەی خۆی، دامانا سمایلی دۆزیەوە، لەهەموو شتێك گەیشت".

دەنگی کەوتە خشەخش. لەپڕ بێدەنگ بوو. پاشان کە دووبارە سەیری یەك بەیەکیانی کرد، دەستیکردەوە بەقسان: "نالێیت کوڕە سمایل مەگەر من ئێلیا چۆرباچی نیم کە کێڵگەی بەئەمانەت سپاردە تۆ؟ مەگەر سمایل لەبراش باشترنەبوویت بۆم؟ مەگەر دارە لەبندا بڕاوەکان، ئەو کۆشکەی کە تێکیان دا، تەویلەکان، ئەو باخچەیەی وەکو پارك، ئەو گوڵستانەی کە هەزارو یەك جۆرە گوڵی تێدابووو ئێستا پنجە سەوزاییەکشی تێدابەدی ناکرێت، وشك بووە، وێران بووە، لەگەڵ خاکدا تەخت کراوە هی من نەبوو؟ مەگەر لەوێ باڵندەکان، پەپوولەکان، هەموو بوونەوەرەکان، درەختەکان، مرۆڤەکان، لەبۆنو بەرامەکەی سەرمەست نەدەبوون؟ مەگەر ئێلیا فەندی نەیدەگوت من لەبەهەشتدا

دەژیـم؟ مەگـەر ئـەو ئەسـپانەی کـە سمایـل لەبەربرسـیبوونیان بردنـیو لەبازاڕەکانـدا بەنرخی هەرزان فرۆشتنی هەموو ئەو ئەسپانەی کە کڕیارەکان بردیـانو لەگاریـەکانیان بەستنو شەوو رۆژ کاریان پێکردنو بوونە ئێسكو پێست، ئەو ئەسپانەی وەکو ئاسـك کـە فرۆشترانە بەگو پاشاکان یان بەدیاری درانو ناوبانگیان لەهەموو ئەنەدۆڵو عارەبستانو قەفقازو نێو عێلو هۆزە یۆنانیەکانیدا بڵاوبۆتەوە، ئەسپەکانی من نەبوون؟".

بێدەنگ بوو، هەناسەی لەقورگی گیرمابوو. دوای ئەوەی کە ماوەیەك ئاوا بێدەنـگ مـا دەستیکردەوە بەقسان:

"مەگەر سمایل، نیکۆی خۆمان نیە، سمایل چیدەگوت. ئێلیا فەندی گـوتی دێمـەوە، کـە گوتی دێمەوە دێتەوە دواجار هـەر دێتـەوە، ئەگـەر سمایـل وایگوتـوە ئێلیـا دێتـەوە، ئێسـتا سمایلیش چاوەڕێیە. سمایل بەمنی گوت نابێـت خیانـەت لەئەمانەتـدا بکرێـت، گـوتی مـن تاکو زیندووم برسیش بمێنمەوە لەبرسـان بشـمرم ئەسـپەکان نافرۆشـمو پارەکـان بۆخـۆم خـەرج بکـەم. هـەموو پارەکـەیان دەدەمـەوە ئێلیـا فەنـدی، ئەگـەر مـن مـردم منداڵـەکان بەپارەکە دەزانن، کـە ئێلیـا فەنـدی گەڕایـەوە هـەموو پارەکـەی دەدەنـەوە. دەیگـوت ئێلیـا فەندی زێڕو جەواهیریشی پێسپاردوومو لای داناوم. ئەگەر بەڵایەك بەسـەر ئێلیـا فەنـدی بێـت، هـەمووی دەدەمـەوە منداڵـەکانی. نیکـۆ جـوامێرە، قسـەی خـۆی ناشـکێنێت. ئـازاو بەجەرگە. کەسێکی چاوتێرە بڵێن کچەکانم. هەموو شتێکم بۆ باسکردن.

مەگەر پاولیش رێك وەکو رەمزی کاولاك نیە، نەکا پاولیش هەمان کار لەگـەڵ نیکـۆدا بکات کە رەمزی لەگەڵ سمایلدا کردوویە؟ مەگـەر حکومـەتو جەندرمـەو پۆلیسـی یۆنـان لەمانەی ئێرە زاڵمترنین؟ منـیش زۆر نابـات دەگەڕێمـەوە کرێـت. دوورگەکـە جوانـە، ئـەم دوورگەیە بەهەشتە، بەڵام من لەوێ لەدایك بوومە، لەوێش دەمـەوێت بمـرم. کچەکانیشـم لـەوێ لـەدایك بوونـە هێشـتا بـاوڵی جەهازیـەکانیان نەکردوونەتـەوە. لەبـەرخاتری مـن دەتـوانن بیانکەنـەوە. دونیـا هـەزارو یـەك رەنـگو حاڵـەت بـەخۆوە دەبینێـت. ئەگـەر نەشتوانم کارێـك بکـەم. دەچـمە لای مستەفا کـەمال پاشـا، ئـەو لـەبارودۆخی مـن دەگـات. عوسمـانی زۆرمـانی دوورخسـتنەوە، ئـەو رەوشـی مـن دەرك دەکـات، بـەڵکو بشـتوانێت لەگەڵیاندا بگاتـە رێککەوتنێكو مـن بـۆ سـەر کێڵگەکـەم بگەڕێنێتـەوە. ئێسـتا تێگەیشـتم بۆچی هیچ هەواڵێکی خۆشم لەنیکۆو ئەوانی دیکە پێناگات. چوومە هەر جێگایەك لەوێ نامەم بۆ نیکۆ نارد. ئادرێسی ئێرەشم بۆ ناردووە".

لەگەڵ ئەوەیدا سەیری زەهرای کرد زمانی گیرا. زەهرا ماندوو بوو، تاسابوو.

"ئادرێسی ئێرەم بۆ نیکۆو برادەرە بەرپرسەکانی دیکەشم ناردووە، بەڵام هیچ هەواڵێکیان نیە".

زەهرا بەدەنگێکی خەمبارانەوە گوتی: "ناردت بابە".

پویرازیش بەڕاوێژێکی نزمەوە گوتی: "هەموویشیان من بەدەستی خۆم بۆستم کردن".

موسا ئاغا بەڕاوێژێکی دڵنیاو بەوپەڕی متمانەوە گوتی: "کەوا بوو بەمزووانە وەڵامی نامەکان دێتەوە".

دەستی دانایە سەر شانی پویرازو گوتی: "ئەمجارە جیابوونەوە لەئێوە لەبەجێهێشتنی کرێت ناخۆشتر دەبێت. نازانم ئەو کات چۆنو بەچ شێوەیەك خوا حافیزیت لێبکەم".

پشتی راست کردەوە، حاڵەتی گۆڕا، گوتی: "ئەو کێڵگەیە دەکڕم".

چاوەکانی زەهراو پویراز لەخۆشیان شەوقیان دایەوە.

"دوورگەی کرێت ئەوەندەش لێرەوە دوورنیە. ئێمە ئەگەر لێرە بڕۆین" دەستی لەسەر شانی پویراز هەڵگرت چاوی بڕیە چاوەکانی ئەو "ئەگەر ئێمە لێرە بڕۆین، من هەموو ساڵێك چەند جار سەر کێڵگە دەدەمەوەو دەگەڕێمەوە، تۆ کاروباری کێڵگەکە هەڵدەسووڕێنیت، کەس ناتوانێت کێشەت بۆ دروست بکات. تۆ ئەفسەری جگە لەوە، مەدالیای قارەمانیشت هەیە. پزیشکی ئاژەڵانیش ئەفسەرە کەس ناتوانێت ئەویش ئەزیەت بدات. سبەی زوو بچینە شارۆچکە. دەبێت بزانین قەدریی بەلەموان کارێك شتێکی نیە؟"

پویراز گوتی: "ئەو کارێکیشی هەبێت، پزیشکی ئاژەڵان بەبەلەمەکەی دەمانبات".

موسا ئاغا بەرلەوەی کە پویراز قسەکەی تەواو بکات گوتی: "نابێت".

پویراز یەکسەر هەستایە پێ:

"من بچم سەرێك لەقەدریی بدەم". خێرا چووەدەرو بەلەز لەپلیکانەکان دابەزی.

"قەدریی بەلەموان، قەدریی بەلەموان!"

دەنگی مەلەك خانم هات: "کاکە پویراز تۆیت؟ قەدریی بەلەموان خەوتووە".

کەیفی بەوە هات کە کوڕەکەی بەبەلەموان ناو هێنا لەکاتێکدا تازە سمێڵی بۆر بووەو نەبووە.

پویراز بەخێرایی لەپلیکانەکان بەسەرکەوت. لەم ساتەدا قەدریی بەلەموان دەنگی ئەوی بیست هەستایەوە و چاوەڕێی کرد.

"فەرمoo کاك پویراز".

"سبەی زوو لەئەسکەلە بە! سبەی بڕیارە لەگەڵ موسا ئاغا بچینە شارۆچکە".

مەلەك خانم کە پێدەکەنی، پرسی: "دەچن کێڵگە بکڕن؟"

پویراز گوتی: "دەچین کێڵگە بکڕین. ئەگەر بتوانین".

مەلەك خانم دیسان بەدەربڕینێکی شادەوە گوتی: "ئینشاللا، ئینشاللا ئینشاللا دەیکڕن".

پویراز بیریکردەوە، بێچارە مەلەك خانم پێیوایە موسا ئاغا کە بڕیاری داوە کێڵگە بکڕێت واز لەچوونەوە بۆ کرێت دێنێت. هەموو ئەستەنبول‌و بورساش بکڕێت واز لەگەڕانەوە بۆ کرێت ناهێنێت، تەنها بەسە ڕێگای گەڕانەوە بدۆزێتەوە".

موسا ئاغا بەپێکەنینەوە گوتی: "کوڕم پویراز ماشەللا تۆ لەچاوتروکانێکدا چوویت‌و گەڕایتەوە".

"ئاغا، بڕیارە قەدریی بەلەموان سبەی لەئەسکەلە چاوەڕێمان بکات".

موسا ئاغا گوتی: "باشە"و هەستا: "کەوابوو زووبە با پێکەوە بچینە دەرەوەو هەوایەك هەڵبمژین".

موسا ئاغا لەپێشەوەو پویراز بەدوایدا هاتنە ژێر دارچنارەکان‌و یاغر یاغر چوون لەسەر تەختەکان دانیشتن، ماوەیەك بێدەنگ بوون.

موسا ئاغا گوتی: "دەبینیت کوڕم، بەرامبەرمان‌و ئاسمان دەبینیت؟ ئاسمانی کرێتی ئێمەش ئاوا ئەستێرەی زۆرە. ئاسمانی تورۆسی ئێوە چۆنە؟"

"ئاسمانی تورۆسەکەی ئێمەش ئاوایە ئاغا، بەڵام مەزۆپۆتامیا جیاوازە. بیابان جیاوازە، لەوێ ئاسمان پڕ لەئەستێرەیە. ئەستێرەکان یەکڕیز لەملاو ئەولای ئاسماندا دادەڕژێن". دەستی خستە سەرشانی پویرازو ئینجا دەستی گرت.

"من ببوورە رۆڵە، هیوادارم دلگرانم نەکربیت. دەزانی کە کێڵگەکە دەکڕین. دەیکڕین، بەڵام نەتۆ لێرە دەمێنیتەوەو نەمنیش. رەنگبێت بڵێیت ئەگەر لێرە نەمێنینەوە ئەی بۆچی کێڵگەکە دەکڕین. تا ئەو ڕۆژەی کە لێرە دەبین، بەهەرحاڵ تۆ ناتوانیت لەم دوورگەیەدا کار بکەیت. ئەگەر سبەی دووسبەی دوورگە پڕبوو لەخەڵك. ئێرە بۆ تۆ دەبێتە تەڵەیەك، من لەسەردەمی گەنجێتیدا هاتوچۆی عارەبستانم دەکرد. جوانترین جوانوە ئەسپی عارەبیم لەحەلەب وشام‌و بەغدا پەیدا دەکردن‌و چەندین ڕۆژ بەسەر پشتی ئەسپەوە دەمهاژواو خۆم دەگەیاندە بەیروت‌و لەوێ جوانوە ئەسپەکانم لەکەشتیان باردەکردن‌و دەمبردنە کرێت. هەندێك لەو جوانوە ئەسپانە دەبوونە جوانترین ئەسپ. ڕێگای نێوان بەغداو بەیروت

ڕێگایەکی دوورو درێژە. نەمدەتوانی ئەو هەموو ڕێگایە بەتەنێ تەی بکەم. هەمیشە ئەوانی ئەسپم لێدەکڕین حەوت هەشت پاسەوانی چەکداریان ڕەگەڵ دەدام. شێخو ئەمیرە عارەبەکان لەناوچەکانی خۆیاندا حوکمڕانیان دەکردو هەمووشیان کەسانێکی خوێنڕێژ بوون. پەیوەندیان لەگەڵ هەموو وڵاتانی دونیادا هەبوو. ئەگەر لەمیانی ئەو چل ڕۆژەدا بچووکترین جوولە ڕوویدابا ئاگادار دەکرانەوە. ئەمیر سەلاحەدین ڕاستی گوتووە کە ئەگەر تۆ بچیتە ژێر باڵی تەیری ئاسمانانیشو خۆت بشارێتەوە یان بچیتە کونی ماریشەوە دیسان هەر دەتدۆزنەوە. بەڵێ ئەو ڕاستی گوتووە".

پویراز بەدوودڵیەوە گوتی: "ڕاستە".

"تا ئێستا دوو گەنجی هاوشێوەی یەکدیان بۆ کوشتنی تۆ هاتوونەتە ئێرە؟"

پویراز بەدەنگێکی شڵەژاوەوە گوتی: "هاتوون".

"دیسانیش دێن؟"

"دێن".

"دوورگە بەزوویی پڕ دەبێت لەخەڵك، ڕەوشێکی نالەبارە، ئەنەدۆڵ پڕبووە لەئاواران. باوەڕ ناکەیت، لەپزیشکی ئاژەڵان بپرسە".

"منیش دەزانم ئاغا. بەرلەوەی زستان دابێت دوورگە پڕ دەبێت لەخەڵك".

"ئەگەر دوورگە پڕبوو لەخەڵك ئێمە چۆن ئەو کەسانە بناسین کە بۆ کوشتنی تۆ دێن، چۆن دەتوانین بیاندۆزینەوە؟"

"ناتوانین ئاغا".

"ئێمە چ بچینەوە کرێتو چ نەچین ناچارین ئەو دوورگەیە بکڕین، مەگەر نە؟"

"وایە ئاغا".

"کرێتیش جێگایەکی مەترسیدارە. لەکرێتدا ئێمە زۆر لەگەڵ یۆنانیەکاندا جەنگاین، خوێنێکی زۆر ڕژا. یەکدیمان کوشت. دواجاریش ئاوا دەربەدەرو ئاوارە بووین. بۆیە من هەرچوار دەوری دوورگەکەی خۆمم دڕکەسیم کردووە. لەهەموو لایەکیشدا پاسەوانی چەکدارم دانان. دوای ئەوەی کێڵگەی ئێلیامان کڕی دەبێت دڕکەسیمی بەدەوردا بکێشین. دڕکەسیمی بەرزبەرز. پاسەوانی جێگای متمانەش دادەنێین.

پزیشکی ئاژەڵانیش لەو کارەدا یارمەتیمان دەدات. کەسێکی ڕاستو جێی باوەڕە، ئەگەر بکرێت دەتوانین وەلی نیشانچیش لەگەڵ خۆماندا ببەینە ئەوێ، بەڵام ئەی چۆن دەتوانێت لەکێڵگە بەماسیگرتنەکانی ڕابگات؟"

"کێڵگەکە زۆر لەدەریاوە نزیکە ئاغا، تێبینیت نەکرد؟"

موسا ئاغا زەوقی بووەوە: "راستە وایە، وایە لەلێوارەکەوە رۆیشتین‌و بەلای راستدا پێچمان دایەوە. نیو سەعاتێك رۆیشتین گەیشتینە کێڵگەکە، بەڵێ راستە". خۆشحاڵیەکەی خستەڕوو". ئەو جنۆکەیە، ئەو شەیتانە ماسیمان بۆ دەگرێت. لەماوەی سێ رۆژانیش لەگەڵ ئەسپەکان دەبێتە هۆگر، وەکو هۆگریەکەی لەگەڵ شەیتاندا".

"ئوفە خەنجەریش بڕیارە بێت. لەجەنگی سەربەخۆییەوە چۆتە سەرچیاکان قارەمانێکە بۆ خۆی".

"خۆ تۆ دەتگوت ئیدی ئەو نایەتەوە؟"

"ئەو بەمنی گوت نایەمەوە، بەڵام چاوەکانی ئەوەیان نەدەگوت. ئەمڕۆ سبەی دەستی منداڵەکانی دەگرێت‌و دێتەوە. دەبێت خانووێکیش لەدوورگە بۆ ئەو بکڕین".

"خۆی ناوی ئەشقیا خەنجەرلیە؟"

"ئوفە خەنجەرلی، ئوفەکان بەنیشانەشکێنی بەناوبانگن، بەگوللە کونی دەرزی دەپێکن".

"سبەی خانوێکیش بۆ ئەو دەکڕین".

"دەبێت بکڕین ئاغا".

ئەوان پێکەوە دەدوان‌و زەهراو نەسیبە هاتبوون گوێیان لەقسەکانی ئەوان گرتبوو. نەیانبینیبوو باوکیان لەگەڵ هیچ کەسدا ئەوەندە قسان بکات. سەریان سوڕمابوو، تازیاتر باوکی قسەی دەکرد، ئەوان زیاتر بەسەرسوڕمانەوە سەیری یەکدیان دەکرد.

نەسیبە هەرکە چایەکەیان تەواو دەبوو دەچووە چێشتخانەو پیاڵەکانی دەخستنەوە ژێر شێرەی سەماوەری پەنگران‌و دەگەڕایەوە. کەمێك دواتر دەچوو بەسنییێکی زیوین چای دەهێنایەوە.

قسەکانی ئەوان تا نیوەشەوانێك درێژەیان کێشا، پویراز نەیدەتوانی قسەی موسا ئاغا بڕێت، بێدەنگ لەو پیاوە قسەخۆشە رامابوو، پەیتا پەیتاش چای دەهێنا. دواجار زەهرا بەفریایەوە چووو بەدەمی بەپێکەنینەوە رووەو پویراز، گوتی: "باوکە، باوکە، بەیانی دەبێت زوو وەرێ بکەون، دەبێت بخەویت".

"بێگومان کچم، بەتەواوی لەبیرمانکرد". سەعاتە زێڕەکەی لەگیرفانی پەستەکەکەی دەرهێناو سەیرێکی کرد، گوتی: "ئۆوو نیوەشەویش رەتی داوە".

پویرازیش لەگەڵ موسا ئاغا هەستا:

"من دەتوانم چل شەوو چل رۆژ گوێ لەقسەکانی ئاغای خۆم بگرم، قسەکانی ئەوەندە خۆشن کە... کاتێک باسی سمایلی دەکرد دەتگوت یەکەمجارە گوێم لێدەبێت، زۆری نەمابووو فرمێسکم بێنەخوار.

موسا ئاغا بەکەمێك شەرمنیەوە گوتی: "هەربژیت".

زەهراش گوتی: "منیش".

نەسیبە گوتی: "منیش".

"خواحافیز".

"خواحافیز کوڕم".

زەهرا تا دەم دەرگا لەگەڵ پویراز چووو بەڕێی کرد، دەرگای کردەوە، گوتی: "فەرموو بەڕێزم، خەوێکی خۆش".

کە پویراز دەڕۆیشت، موسا ئاغا بیریکردەوە، لەپشت ئەو دۆستایەتیە گەرمە دەبێت شتێك هەبێت. لەو ماوەیەدا لەسەری زمانی بوو، بەڵام نەیدەتوانی دەریببڕێتو بڵێت تۆ لێرە کفنی خۆتت پۆشیوە. نەیتوانی پێیبڵێت تۆ شێخەکانی عارەب ناناسیت، ئەوان هەر دەتکوژن، دواجار دەتدۆزنەوە، تاکە رێگای دەربازبوونت ئەوەیە لەگەڵ ئێمەدا بهێیتە کرێت. نەیتوانی پێیبڵێت چارەیەکی دیکەت نیە. دیارنیە تا بەیانی چ دەقەومێت. نەیتوانی بڵێت ئەمە ژیانە، لەپشت هەموو گردێکدا هەر یەکخۆر هەڵدێت. هەم گیانت قوتار دەکەیت، هەم نەیتوانی بڵێت... چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی رۆژێك ئەو شتانە بەخودی ئەو بڵێت.

لێنا هاتە ژووریو گوتی: "لاوۆ، شەوێکی خۆش بوو؟"

"زۆر دایکە".

"تۆ دەزانیت مەلەك خانم بۆتە ئەڤیندار؟"

"ئەو قسانە لەکوێ دەردێنیت؟"

"من لێنام، ئەو شتانە زۆر باش دەزانم. تۆ جارێ بنوو. من دەزانم".

یەکسەر لەژوورەکە چووەدەر، دەرگاکەی بەهێمنی پێوەدا.

موسا ئاغای هەر کە پویراز رۆیشت، چووە سەرەوە بۆ ژوورەکەیو جلەکانی داکەندو چووە نێو جێگا، چرای کوژاندەوە. دەیزانی خەوی لێناکەوێت، گوێی نەدایێ.

ئەو کۆشكو تەلارانەی لەباپیریەوە بۆی بەجێمابوون هاتنە پێش چاوی، پەردەی پەنجەرەکانیان یەکپارچە سپی بوونو گۆشەی پەردەکان بەنەخشی وەنەوشەیی گەورە

چندرابوون. لەسەردەمی منداڵیدا تا ئەمڕۆ زۆر گۆڕانکاری لەو خانووانەدا کرابوون، بەڵام وەنەوشە گەورەکانی گۆشەی پەردەکان هەروەك خۆیان مابوونەوە. پەردەکان کۆن دەبوونو پەردەی تازەیان دێنانو لەجێی پەردە کۆنەکانیان دادەنان، بەڵام وەنەوشە گەورەکان نەدەگۆڕدران. باخچەی گەورەی کۆشك هەزارویەك جۆر گوڵی تێدابوو، گوڵو پەپوولەی هەزارو یەك رەنگ، زەردەواڵەکان، باڵندەو ئەسپەکان. یەکەمین گلانی لەئەسپ ئەوەی سەر پشتی ئەسپە کۆێتەکە بوو کە ویستی بەوشتی بەسەرچاڵێکدا بازبدات، ئەودەم یازدە یان دوازدە ساڵان بوو، کە لەئەسپەکە گلابوو بێهۆش بووبوو، کە بەهۆش هاتبووەوە سەیریکردبوو ئەسپ بەسەر سەریەوە راوەستاوە. سواری ئەسپ بووبووەوەو دیسان خێراتر لەجاری پێشتر هاژۆتبووی‌و وەکو بروسکە لەدەرگای حەوشەیان چووبووە ژوورو بەهەستکردنێکی زۆر بەئازار بەدەوری خۆیدا سووڕابووو لەسەر پشتی ئەسپ کەوتبووەخوار.

ئەسپ ئەمجارەش بەسەر سەریەوە راوەستابووو تا ئەو دەمەی دایكو باوکی لەماڵێ هاتبوونەدەر لەوێ بەسەر سەریەوە راوەستابوو. خێرا هەڵیانگرتبووەوە سواری فایتونێکیان کردبووو بردبوویانە لای برینپێچ. هەرچەندە هەموو گیانی لەبەرئازار دەتلایەوە، کەچی لەشەرمان نەیدەتوانی بگرێیت.

پاشان لەگەڵ ئەسپە کویتەکە بوو بەدۆست. تا تەمەنی گەیشتە نۆزدە ساڵی سواری ئەو ئەسپە بوو، ئەسپ دەتگوت تیتراوسکەیەو هەرگیز جارێکی دیکە نەیگلاند. ئەسپە کوێت هەر کە دەنگی ئەوی دەبیست، شەو با یان رۆژ، هەڵدەستایە سەرپاشوانو بەکەیفەوە دەیحیلاند. هەر ئەسپەکەی دەیحیلاند موسا دەچووە لایو لەملیەوە تا سەر کلکی دەستی بێدادەهێناو نەوازشی دەکرد کاتێك لەئەسپەکەی دوور دەکەوتەوە ئەسپ سەری بەرزدەکردەوەو دەیحیلاند.

موسا کازم ئەسپەکەی خستبووە ناو ژوورۆچکەیەکی تایبەتی تەویلەو خۆی ئاوو ئالیکی دەدایێو هەر بەخۆیشی مشتوماڵو تیماری دەکرد. ئەگەر یەك دوو رۆژ چووبایە شار ئەسپی گۆرین مەزاجی تێکدەچوو، توند قاچەکانی لەزەوی دەدان. گازی لەوانە دەگرت کە ئاوو ئالیکیان بۆ دەبرد، لووشکەی تێدەسرەواندن هەندێکجاریش دەمی لەخواردن نەدەدا.

دۆستایەتیی نێوان ئەسپە کوێتو موسا کازم رۆژ بەڕۆژ بەهێزتربووو بەساڵان درێژەی کێشا. ئەسپە کوێت لەنیگاو هەڵسوکەوتەکانی موسا کازم لەمەبەستەکانی دەگەیشت. دواجار موسا کازم نەیدەتوانی سواری ئەسپی پیربێتو دڵی پێدەسووتا.

هەروەها ئالیك‌و ئاوەكەشی هەرخۆی پێیدەداو هەر خۆیشی تیماری دەكرد كە بەهار دادەهات دەیبردە لەوەڕاندن. موسا كازم هەموو ساڵێك كاتی بەتەرەبهاتنی ماینان ئەسپە كوێتی دەبردە لای باشترین‌و رەسەنترین ماین، ئەسپی گۆرین هەر كە چاوی بەماینی لەتەرەب دەكەوت، دەئاڵساو موسا كازم‌و چوار پێنج كەسی دیكە بەزەحمەت بۆیان دەكرا رایبگرن. ئەسپە كوێت هەموو ساڵێك لانیكەم هەڵدەهاتە دەمانیان.

لەساڵەكانی دواییدا، بژووو یاڵەكانی ئەسپە كوێت وەكو خوریی مەرانی لێهات، بینایی چاوانی لەدەست دان‌و بووە ئێسك‌و پرووسك.

موسا كازم وەكو هەمیشە ئەسپە كوێتی بەهاران بردە لەوەڕ، باشترین لەوەڕگای پەیداكرد، لەو لەوەڕگایە ئەسپ كەمێك هاتەوە سەرخۆی، هەرچەندە نەیدەتوانی وەك جاران بەبیستنی دەنگی هاوڕێكەی هەستێتە سەرپاشوان‌و حیلەو پڕمەپڕمی لەو ناوە دەنگ بداتەوە، بەڵام بەكەیفسازیەوە دەیحیلاند، كە ئەسپەكە دەیحیلاند موسا كازم دەچووە لای، یاڵە تێكئاڵاوەكانی لێكدەكردنەوەو روومەت‌و سەرپشتی نەوازش دەكرد. كە موسا كازم نەوازشی دەكرد وەك جاران گوێیەكانی مووت دەكردن‌و بۆنی جوانەوە ئەسپێكی لێدەهات.

موسا كازم ئیدی ئەسپەكەی نەدەبەستەوەو لەناو ئەو مێرگانە بەرەڵڵای دەكرد. دوای ماوەیەكی باش ئەسپ دەهاتەوە سەرخۆی‌و یاڵە تێكئاڵاوەكانی دەكرانەوەو دەنگی حیلاندنەكانی بەرزدەبووەوەو شادیان لێدەباری. تا ئەسپەكە باشتر دەبوو موسا كازم زیاتر خۆشحاڵ دەبووو لەخۆشیان هەر ئەوە نەبوو باڵ بگرێت، دوای ئەوەی بەشەوان تیماری دەكرد دەكەوتە دڵنەوایی‌و نەوازشكردنی.

رۆژێك وەكو رۆژانی دی موسا كازم چووە مێرگ‌و سەری ئەسپی دا، بانگی ئەسپی كرد، بەڵام وەڵامی ئەسپی نەبیستەوە، لەو رۆژە بەدواوە گەنجەكە بۆ دۆزینەوەی ئەسپەكەی ئەم دەشت‌و ئەو مێرگ، ئەم دۆڵ‌و ئەو كێوی لێكدان، سۆراغی ئەسپەكەی لەهەموان پرسی، بەڵام نە بەزیندوویی نە بەمردوویی ئەسپی نەدۆزیەوە. ئەسپێكی وەها بەچ كەڵكی دزان دێت! لەو دەڤەرە دزی ئەسپان هەر نەبوون. ئەسپە كوێت دوای ئەوەی كەمێك گورم بووبووەوەو هاتبووەوە سەرخۆی تا توانیبووی بڕوات، بۆ دووترین جێگا رۆیشتبوو.

شەو تابەیانی تا دونیا رووناك بووەوە خەیاڵی هەر لەسەر ئەسپە كوێت بوو، بەیانی زوو هەستاو جلەكانی پۆشی. ماوەیەك بەرامبەر ئاوێتە راوەستا. پاشان چووە سەركانی،

دەمو چـاوی شوشـت، بـەهێمنی ریشـی شـانەکرد، کچـەکانیش لەخـەو هەسـتابوون، خەریکبوون نـانو چـایان دادەنـا. نـانو چـای بـەخێرایی داندرایـە سـەر مێـز. موسـا ئاغـا بەلەز نانی بەیانی خواردو هەستا. چەند جارێکی دیکەش لەئاوێنەدا سەیری خـۆی کـرد. کـڵاوە مۆرەکـەی بـەلای راسـتدا خـوارکرد، خـوا حـافیزی لەکچـەکانی کـرد. بـەخێرایی لەپلیکانەکان چووەخوار. کە گەیشتە نزیك چنارەکان پـویرازو قـەدریی بەلـەموان لەسـەر کانی هەستانو بۆلای هاتن.

پرسی: "منداڵەکان درەنگم داهێنا. زۆر چاوەڕێتان کردم؟"

پویراز گوتی: "ئێمە زووتر هاتین".

پـویراز کـە زەهـرای بینـی لەسـەر پلیکانـەکان راوەسـتاوەو سـەیری ئـەو دەکـات زۆر خۆشحاڵ بوو.

"ئامادەن بەڕێ بکەوین؟"

"ئەگەر پێت باش بێت ئاغا".

"کەوایە با بەڕێ بکەوین، فەرموون".

قـەدریی بەلـەموان، هەنـدری راکێشـا، جـارێکی دیکـەش رایکێشـا، جـاری سـێیەم ماتۆڕ کەوتەکار.

پـویراز نیمـدەرێکی ئەسـتوورتر لـەلبادی هێنـابووو لـەکابین رایخسـتبووو بـۆ ئـەوەی موسا ئاغا بتوانێت پاڵ بداتەوە دوو بالیفی بەتەختەکانی کابیندا هەڵنابوون.

"فەرموو مام ئاغا ئێرە جێی تۆیە".

"سوپاس کوڕم، هەر خۆش بیت".

موسـا ئاغـا لەسـەر نیمدەرەکـە دانیشـت، بـەدەمی بـەبزەوە پشـتی بەبالیفەکانـەوەدا. پێڵاوەکانی داکەند، هەروا کە بزە بەسەر لێوانیەوە بوو سەیری بەرگـە بالیفـە بەسـامتین چندراوەکانی کرد.

"ژنەکانی ئێمەو یۆنانیەکان لەکرێت بەرگە بالیفـەکان بەسامتینو ژەنگیانـە دەنەخشێنن. هەروەها نەخشو نیگاری وەنەوشەیی شین لەسەر بەرگە بالیفەکان دەکێشن".

"لەناوچەکانی ئێمـەش نـەخشو نیگـاری وەنەوشـە دەکێشـن ئاغـا. لەدوورگـەش لـەبن دەوەنـە دڕکاویەکانـدا تـا حـەز بکـەیت وەنەوشـە هـەن. لـەژێر هـەر دەوەنێـك دونیایـەك وەنەوشەی شینباو هەیە، بۆنو بەرامەکەیان مرۆڤ مەستو کاس دەکات".

"هەرکەسێك تەنها جارێکیش وەنەوشەی شینباو بۆن بکات تا ماوە لەبیری ناکات. بۆنی وەنەوشە رۆدەچێە نێو رەگو خوێنی مرۆڤەوە. من ئەم دوورگەیە بست بەبستو دەوەن بەدەوەن گەڕاوم. نەوەنەوشەیەکم بینیوەو نە بۆنەکەیم بۆ هاتووە".

"منیش کە یەکەمجار هاتمە دوورگە هەمووی بەرد بەبەردو درەخت بەدرەختو گوڵ بەگوڵی گەڕام، نەوە وەنەوشەیەکم بینیو نە بۆنێکم بۆهات. دایکە لێناو مەلەك خانم پێیان نیشاندام. وەنەوشەیەکی زۆرم لەژێر دەوەنە دڕکاویەکان بینین، بەڵام نەمتوانی دەستیان بۆ درێژبکەمو تەنانەت دانەیەکیان لێبچنم. دڵم نەهات ئەو کارە بکەم".

موسا ئاغا بەدەربڕینێکی لێبڕاوانە گوتی: "نابێت وەنەوشە بکوژرێت".

"نەمتوانی بیانچنم ئاغا".

"کاتی وەنەوشان بەسەرچووە؟"

"نازانم ئاغا دوای ئەوەی کە گەڕاینەوە دوورگە یەکەمین کارێك کە بیکەین ئەوەیە دەچین ژێر دەوەنەکان سەیر دەکەین".

"بەڵام ئەگەر وەختیان بەسەرچووبێتو تا بەهار رێگەی رۆیشتنەوە بۆ کرێت درا، ئیدی ساڵی داهاتوو ناتوانین وەنەوشەکان ببینینو بۆنیان بکەین".

"ئینشاللا وەختیان بەسەر نەچووە".

موسا ئاغا گوتی: "ئینشاللا". سەری نایەوە بەرخۆیو ئیدی لێوی لێکنەکردنەوە. بیریکردەوە، تەنانەت ئەگەر هەموو دوورگەش بەوەنەوشان داپۆشرێتو شنەبای دوورگە تەنها بۆنی وەنەوشەی لێبێت، من هەر دەڕۆم. تەنانەت ئەگەر خەڵکی دوورگە فریشتەو عارفیش بن، من هەر ئێستا بۆنی نیشتمانی خۆم دەکەم. نازانم تا بەهار لێرە لەم شوێنەجوانو دلگیرە دەتوانم بمێنمەوە یان نا. دەتوانم وەنەوشەکان ببینمو بۆنیان هەڵبمژم؟

ئەسپە کوێت لەپشت تەمێکی خەست ماوەتەوە. لەدوور دوورەوەو دەنگی حیلاندنێك دێت. دەنگی سمکۆڵێك لەو دیو تەمەوە دەنگی پێی ئەسپ هێواش هێواش نزیك دەبێتەوە. سەرهەڵدەبڕێت ئەسپە کوێت دەبینێت کە بەسەر سەریەوە بەتفنکە بەرینەکانیەوە هەناسە هەڵدەکێشێت. ورگی بەرزو نزم دەبێت. گەردەنو کەفەڵو پێیەکانی کەفاوین، موسا ئاغا چۆك دادەدات، دادەهێتەوەو سەیری وەنەوشە تۆپەڵبووەکانی ژێر دەوەنێك دەکات. لەدواوە بۆنی خەستی ئارەقەی ئەسپ دێتو لەبەرامبەریش بۆنی خەستی وەنەوشە. یاڵی ئەسپەکە داکەوتوون. سەری ئەسپ بەنێو وەنەوشەکاندا بەرزدەبێتو نەوی

دەبێتــەوە. لمــووزی دەباتــە نێــو گوڵــەکان لــەنێو گوڵەکانــدا زەردەواڵــە هەڵــدەفرن، ئەســپ بەخێرایی سەری خۆی دەکێشێتە دواوە. بای هەناسـەی ئەسـپ مـووی سـەرو سمێڵی موسـا کازم دەجووڵێنێت. لەنێو دەوەنەکان رادەکیشێتو دەچێتە ئەولا، لەپشت تەمدا ون دەبێت. دەنگی پێی ئەسپ وردە وردە دووردەکەوێـەوەو نامێنێت.

پویراز کە بینی وا موسا ئاغا سەری دانەواندوەو رۆچوۆتە نێـو خەیاڵـەوە یـان خـەوی لێکــەوتووە، بەهێواشــی هەســتا، دەســتی بەکابینــەوە گــرت. هاتــەپێش، لەپەیــژەکان چووەسەرو چووە لای قـەدریی بەلـەموان. کـە خـەریکی لێخۆڕینی بەلـەم بـوو، دانیشـتو گوتی: "موسا ئاغا خەوتوە".

ئەسپە کوێت کاتێك کە دیارنامێنێت دەچێتە کویَ، ئەگەر یـەکێك بیگرێـتو داشـقەی پێـوە ببەسـتێت، ئایـا ئەسـپە کوێـتی رەسـەن بـەو تەمەنـە دەتوانێـت بەرگـەی بارکێشـی بگرێت؟ ئەسپی بارکێش؟ نەك سێ مانگ بـەڵکو سـێ رۆژیـش بەرگـە ناگرێـتو دەمرێـت. خۆزگە سەری خۆی هەڵبگرتباو چووبوایە سەر ئەو کێوە شینە. خۆزگە بیتوانیبـا بچێت لەکانیەکەی ئەویَ ئاو بخواتەوە، پاشان لەنێو مێرگـە سـەوزو تـەڕو بـەڕەکانی دەوروبـەری کانیەکە بلەوەڕێت خۆزگە لەنێو چەمەنزارەکانی ئەوێدا خۆی بگەوزێنێتو لێیڕابکشێت، سەری بخاتـە سـەر بـەردێکی قـەوزەگرتوو. خۆزگـە لـەژێر دەوەنـەکانی سـەرەوە بـا بـۆنو بەرامەی وەنەوشەکان بەو ناوەدا پەخش بکات. ئەسـپە کـوێتیش چـاوەکانی لێکبنێـت. بـا بۆنو بەرامەی وەنەوشەکان پەخش بکات. با بۆنو بەرامەی وەنەوشەکان پەخش بکات... ئەگــەر لەئاسمانــدا سیســارك هــەبنو بەکومــەڵ لــەدوورەوە باڵــەکانیان لێکبــدەنو بەوشەوشــەوە بــێنو شــۆڕببنەوەو لەشــوێنە تــەڕو ئاودارەکانــدا هەڵبنیشــنو بەهەڵبــەز هەڵبـەزەوە دەوری ئەسـپە کوێـت بـدەن... بـۆ ئـەوەی بیرلەدرێـژەی ئـەو هـزرە نەکاتـەوە چـاوەکانی کردنـەوە، بەلەمەکـە بـەخێرایی دەچـووە پـێشو لـەدوای خۆیـدا رێچـکەیەکی کەفاوی زراوی جێدەهێشت.

بەڵکو ئەسپە کوێت لەپانە گوڕێکی چیایەکدا، تـا ئـەژنۆیان رۆچـووبێتە نێـو گیاکـانو شــەوو رۆژ خــەریکی لــەوەڕخواردن بێـت. لـەئاوی زولاڵـی بـۆن وەنەوشـەی کانیـەك ئـاو بخواتەوە کە هەرچواردەوری بەدەوەنان گیرابێت، ئەو ئاوە ئاوی زیندەگانیە. ئەسپە کوێت تا رۆژی قیامەت، پیردەبێت، گەنج دەبێـتەوەو ئـاوا درێـژە بـەژیانی خـۆی دەدات. مەگـەر دولدولی عەلی وەها نیە؟ عەلی چەند سەدەیە مردووە، بەڵام دولدول هێشتا هەر زیندووە.

مەگـەر ئەسـپە کـوێتی کـوێرۆغلی بەخواردنـەوەی ئـاوی کانیـەك نەگەیشـتە ژیـانی هەتاهەتایی؟ ئێسكو پرووسكی کوێرۆغلی رزینو لەنێوچوون، کەچی ئەسپە کوێت ئـاوی کانیەك دەخواتەوەو تا دونیا دونیایە دەژیتو بـەژیانی جاویـدانی دەگـات. خـدرو ئەسـپە بۆزە خاڵدارەکەشی، هەمان ئەو خـدرەی کـە بەئەسـپە بۆزەکـەی بەسـەر ئـاوی دەریاکانـدا دەڕۆیشتو دەریاو وشکانیەکانی دەبڕینو دەچووە یارمەتیدانی نیازمەندان، بەڵکو ئەسپە کـوێتی منـیش ئەسـپێکی وەهابێـت، بـەڵکو لەگۆشـەو کـەنارەکانی دونیـا بـەهانای ئـەو کەسانەوە بچێت کە دەکەونە تەنگانەو پێویستیان بەیارمەتیـدان هەیـە، بـەڵکو.. خۆزگـە ئەسپە کوێت ئێستا دەهات.

ئێستا، ئێستا، باڵەکانی بکردبایەوە، وەکو ئەسـپە بـۆزە خاڵدارەکـەی حـەزرەتی خـدری لێهاتبا، منـی دانابایـە سـەر باڵـەکانیو بردبامیـەوە بـۆ کرێـت. لای ئەسـپەکانم چاوەکانی هەڵێنانو سەیری هێڵی دوای بەلەمی کرد کە ئاوە کاکی بەکاکیەکەی کردبووە دوو لەت.

ئەگـەر توانـای دەبـوو ئەسـپە کوێتەکـەی دەگەیانـدە ژیـانی جاویـدانی. سـواری باڵەکانی دەبووو وەکو بروسکەو بـا بەسـەر دەریـادا رەت دەبـووو خـۆی دەگەیانـدەوە کرێت. پێشنیان باوەڕیان بەمە دەکرد. ئێستاش دەیانەوێت باوەڕبکەن، بـەڵام توانـای باوەڕکردنیان نیە. تەنانەت منیش لەم تەمەنەمـدا جاویـدانی هەنـدێك لەئەسـپەکان باوەڕ ناکەم، دەمەوێت بـاوەڕ بکـەم، بـەڵام نـاتوانم. ئەگـەر دەمتـوانی ئەسـپە کـوێتم دەبردە دەم کانیی ئاوی زیندەگانی سەر چیای ئیدا. کەمێك دواتـر سواری سەر پشـتی دەبـوومو دەیبردمـەوە کرێـت. ئـاخر ئەسـپە کوێـت لـەوێ، لـەکرێت سـەدان جوانـووە ئەسپی هەیە، یانی نایەوێت ئەوان ببینێت؟

مەلـەك خـانم لەپشـت خـۆم سـواردەکەمو لەگـەڵ خۆمـدا دەیبـەم. ئـەو ئەسـپەی کـە بەژیانی جاویدانی گەیشتبێت دووکەس کـە هـیچ پێـنج کەسـیش هەڵدەگرێت. سـەیرێکی چیای ئیـدای کـرد. چیای ئیـدا لـەنێو تەمـدا بـوو. کەوایـە ئـەم چیایە ئیدایـە. دووکـانی لەڕۆخ یەکدا هەڵدەقوڵین. یەکێکیان ئاوەکەی شیرین شیرین بوو وەکو هەنگوینیو ئـەوەی دیکەیان تاڵ وەکو ژەهر. ئێستا کەس هەیـە بـەو کانیانـە بزانێـت. یـان بیـدیتبن؟ مەلـەك خانم لەهەمبەر مردنـدا خـۆی راگرتـووە. ئیـدای هـەزار کـانیی خـۆی جێهـێڵاوەو بـەدوای ئەڤینەکـەی خـۆی کـەوتووەو دڵخوازەکەشـی بۆتـە گـەردو غوبـارو بەهـەوادا بڵاوبۆتـەوە. لەدڵی خۆیـدا گـوتی: "ژنێکی چـەند جوانیشـە ئـەو مەلـەك خانمـە، تەمـەنی چـەند سـاڵ

دەبێت؟ تەمەنی ژنانی جوان دیاری ناکرێت. ئێستا ئیدی مەلەك خانمیش بەو هەموو هزرو خەیاڵی رۆژانەو خەونی شەوانەی پەیوەست بووبوو. ئەو خەیاڵانەی کە تایبەت بوون بەئەسپەکانیو هەروەها کرێتش.

دەمە دەمی عەسر، بەلەم هاتو لەئەسکەلەی شارۆچکە لەنگەری گرت. پویراز بۆ دواوەی کابینی بەلەمەکە چوو، داهاتەوە، دەستی موسا ئاغای گرتو بڵندی کرد، پێکەوە لەبەلەم دابەزین.

پویراز گوتی: "کاك قەدریی لەم شوێنانە لەجێگایەك چاوەڕێمان بە، لەجێگایەك کە بتوانین بتدۆزینەوە. دەتوانیت بچێتە دووکانەکەی خەیری ئەفەندی. لەشارۆچکە لەهەرجێگایەك بین دەتوانیت بماندۆزیەوە". دەستی بردە گیرفانی، بڕێك پارەی دەرهێناو داینایە سەر لەپی دەستی بەلەموان "خواحافیز".

یەکسەر بەرەو دووکانی خەیری ئەفەندی رۆیشتن. خەیری ئەفەندی پشوازییێکی دۆستانەو پڕ لەخۆشەویستی لێکردن.

"بەیانی زوو لەخەو هەستام. قاوەم دەم کرد، دەمکردنی قاوە خۆی هونەرێکە، نابێت دەمکردنەکە زیاد یان کەم بێت، دەبێت بەچەشنێك دەم بکرێت کە بۆنەکەی هەموو لایەك دابگرێتو لەگەڵ ئەوەی خواردتەوە هەموو گیانت بکاتە بۆنو بەرامەی خۆی. ببوورن مرۆڤ کە پیردەبێت وەکو من حەزی لەقسانە ئێستا دەتوانم بڵێم قاوەتان بۆ بێنن؟ قاوەکانتان چۆن بن؟"

موسا ئاغا گوتی: "بەڵام ئەو جۆرە قاوانە ناکرێت بەشەکرەوە بخورێنەوە  قوربان".

"هی تۆ چۆن بێت؟"

"با سادە بێت قوربان".

خەیری ئەفەندی بانگی گەنجێکی کرد کە لەپشت مێزێکی بچووکی ئەو لاوە دانیشتبووو جلوبەرگێکی شیكو رێکوپێکی لەبەردابوو:

"زووبە کوڕم. سێ دانەی سادە بۆ ئێمەو دانەیەکی بەشەکریش بۆخۆت".

دوای کەمێك بۆنی خۆشی قاوە لەناو دووکاندا بلاوبووەوە. قاوەکان لەفنجانی لێو ئەستووری خەتێکی باریكو سوورباو بەناوقەدەوەو هەڵمیان لێهەڵدەستا گەیشتن.

"تەنانەت نەشیانخۆیتەوە، بۆنەکەی مەستت دەکات". بەدەم پێکەنینەوە سەیری کوڕە گەنجەکەیان کرد. گەنجەکەش بەپێکەنینەوە سەیری ئەوانیکرد. خەیری ئەفەندی بیریکردەوە. ئەگەر وەلی نیشانچیشیان لەگەڵ بایە زۆر باشتر دەبوو.

پویراز بەدەم قاوەخواردنەوە لەموسا ئاغای پرسی: "دەتوانم لەبارەی مەسەلەکە قسە لەگەڵ خەیری ئەفەندی بکەم؟"

"فەرموو".

پویراز گوتی: "خەیری ئەفەندی، بەڕێزتان دۆستی ئێمەن. ئێمە هاتووین قسەت لەگەڵدا بکەین. موسا کازم ئاغا لەکرێتدا کێڵگەیەکی گەورەی هەبووەو ئەسپی ڕەسەنی تێدا بەخێو کردوون. ئەسپەکان موسا کازم ئاغا لەیۆنان‌و هەموو بالکاندا بەناوبانگ بوون. دەیەوێت لێرەش هەمان ئەو کارە بکات‌و ئەسپی ڕەسەن بەخێو بکات".

موسا کازم ئاغا گوتی: "بنەماڵەی ئێمە پشتاوپشت ئەسپیان بەخێوکردوون. ڕاستە کە دوورخراوینەتەوە، ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی دەست لەو کارو پیشەیەمان هەڵبگرین".

"زۆر ڕاستە قوربان".

"ئێمە لەگەڵ موسا کازم ئاغا چووینە کێڵگەکەی ئێلیا چورباچی، مام ئاغا کێڵگەکەی زۆر بەدڵ بوو. ڕەمزی کاولاکزادە..".

هەر کە پویراز ناوی ڕەمزی هێنا، خەیری ئەفەندی قسەی پێبڕی، سەرەتا هەڵچوو پاشان هەوڵی دا بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. دەستی بەباسکردنی ڕەمزی کرد. هەموو ئەو قسانەی کە سمایل نەیتوانیبوو بیانکات‌و دەرفەتی باسکردنیانی بۆ پێکنەهاتبوو، ئەو بەوردی باسیکردن.

گوتی: "ئەو سەربازی هەڵاتووە، هەمووان ئەمە دەزانن. بەرگەی کۆتایی خزمەتی سەربازی پێیە، بەڵام هەمووان دەزانن کە سەربازی هەڵاتووە.

ئەوەش دەزانن کە جاسووسی بۆ یۆنان کردووەو لەگەڵ پیاوە چەکدارەکانی خۆیدا سوپای یۆنانی تا شاری بۆرسا بردووە".

"بیستوومانە بەمزووانە دەبێتە سەرۆکی هێزی بەرگری، ئەمەت بیستووە؟ خۆی بەمنی گوت".

"ڕاست دەڵێن. ئەو هەرچیەکی بیەوێت ئەوە دەبێت، دەتوانێت ببێتە نوێنەرو نایبیش، تەنانەت دەتوانێت ببێتە والیی ئزمیرو ئەستەنبۆلیش. ئەو کەسێکی بێڕەگ‌و ڕیشەیەو خاکێکی نیە کەتێیدا پەروەردە بووبێت. ئەو دەتوانێت لەهەموو خاکێکدا خۆی بگونجێنێت‌و ڕیشە دابکوتێت.

بەمزووانە هەمووومان دەبینین کە جەنابی ڕەمزی کاولاکزادە تا کوێ هەڵدەکشێت. کەس ناتوانێت وا بەئاسانی عوسمانی لەناو ببات. عوسمانی بەردەوام

دەبێت. عوسمانی خۆی واتە گەندەڵی. ئەو گەندەڵیە رۆچۆتە ناخی ناخیەوە کەس ناتوانێت ریشەکێشی بکات. ئاااخ دۆستەکانی خۆم، ئێمە چەندمان رەمزی کاولاکزادە بینین. لەمەودواش هەردەیانبینین".

"ناتوانێت رێگری کارەکەمان بێت؟"

"ناتوانێت، چونکە لەتۆ دەترسێت".

"بۆچی لەمن دەترسێت؟"

"زەندەقی چووە".

"لەبەرچی؟"

"ترسی گەورەی لەوەلی نیشانچیە. ئەو پیرەمێردە وردیلەیە. رەنگبێت پێیوابێت ئێوە سەر بەئەنقەرە بن. جگە لەوە پێیوایە نیشانچی شەیتانێکە بۆخۆی. نیشانچی ترسێکی وایداوەتێ هەر ناوی ببیستێت زەندەقی دەچێتو لەرز دایدەگرێت.

مەترسن تا ئەو کاتەی ئێوە بەتەواوی نەناسێت ناتوانێت هیچ کارێکتان لەدژدا بکات. بەپێچەوانە، تا بۆی بکرێت هەوڵ دەدات خۆتان لێنزیك بکاتەوەو برادەرایەتیتان بکات. تەنانەت پێڵاوەکانیشتان ماچ دەکات. جارێ ئێوە لەدیدی ئەودا وەك مەتەڵێك وان. ئێستا هەستن بابچینە لای وەهاب بەگ. ئەویش کاس بووە کە نەیتوانیوە بتانناسێت".

فەرمانگەی دارایی نزیك بوو. دوای پێنج خولەك لەوێ بوون. وەهاب بەگ بەگەرمی پێشوازی لێکردن. لەسەر کورسی نوێو جواندا دانیشتن. لەهەمان کاتدا بێئەوەی تەنانەت کەس بانگی قاوەیان بۆ بکات. قاوەیان بۆهێنان. خەیری ئەفەندی سەری قسانی کردەوە، یەکەمجار باسی موسا کازم ئاغاو پاشان باسی ئەسپو کێڵگەی ئەسپانی کرد، قسەی بەزیادەوە لەبارەی جوانیی ئەسپەکانەوە بۆ کردن. باسی لەناوبانگی ژمارەیەکی زۆر لەئەسپەکانی موسا کازم ئاغا لەئەوروپاو لەناو کۆشکی ڤیەننا کردو پێیگوتن بەنیازە لێرە ئەسپی باشترو رەسەنتریش لەوانەی کرێت بەخێو بکاتو کاتێك قسەکانی تەواوکرد، لەچاوەکانی وەهاب بەگ وردبووەوەو چاوەڕێی رەزامەندیی ئەوی کرد. ئەوانیدی بەشانازیەوە پێکەنین.

وەهاب بەگ گوتی: "ئێمە لەخوامان دەوێت، بەڵام مخابن کە خانووی کێڵگەی ئەم شارۆچکەیە کە نموونەی تەنانەت لەئزمیریشدا نەبوو، کاك رەمزی کاولاکزادە کڕیو تێکیدا، تەختەودارو بەردە نەقارو نەخشێندراوەکانو هەموو ئەو شتانەی کە تێیدا بوون گواستیەوەو بردنی بۆ ئزمیر. لەئزمیری وێراندا ئەو تەختەو بەردە نەخشدارانە لەهەوادا

دەقۆزنەوە. گەورەم، کاك ڕەمزی کابرایەکی چاوچنۆکە، هەرچی خانووی بەرزو جوانی ئەودیو ئەم دەشتە، لێواری ئەم دەریایەو ناو ئەو گوندو شارۆچکەیە هەبوو هەمووی تێکدانو بردنی بۆ ئزمیر.

"ئەی، ئەگەر ئێمە ئەم کێڵگەیە بکڕین".

"ڕەمزی ناتوانێت هیچ کارێك بکات. هۆیەکەی چییە نازانم، بەڵام زۆر لەئێوە دەترسێت جگە لەوە گوایە لەدوورگەی ئێوەدا پیرەمێردێکی کورتەباڵا هەیە، هەر باسی ئەو بکرێت زمانی دەگیرێت. ئێمە لەخوامان دەوێت. کاك وەلی نیشانچی..".

بانگی کاتبەکەی کردو پێیگوت: "مخابن کە خانووەکانی کێڵگەمان فرۆشتن هەروەها پارچەیەك زەوی دارزەیتوونەکان".

موسا کازم ئاغا گوتی: "کێشە نیە، خانووێکی باشتری تێدا دروست دەکەین". بەکاتبەکەی گوت: "حەواڵەکە بنووسەو لەجێگای پێویستی دابنێ".

کاتبەکە گوتی: "سەرچاو قوربان هەر ئێستا دەینووسمو دایدەنێم". چووە دەرێ.

"عوزێر خانو بەڕێوەبەری ناحیە ئاگاداری هاتنی ئێوەن؟ دۆزگەرێکیش هاتۆتە ئێرە. پیاوێکی زۆر باشە، مرۆڤێکی نموونەییە، کەسێکی زۆر بەئەزموونە. مرۆ لەقسەکانی تێر نابێت، بەڵام کەمێك ناڕازیە. چی خراپە بەهەمووان دەڵێت. گاڵتە بە(دادگای ئیستقلال) دەکات. زۆر مەترسیدارە، مستەفا کەمال پاشا ئەو دادگایانەی (ئیستقلال) ی پێکهێناون. بەئاشکرا فشە بەو دادگایانەی (ئیستقلال) دەکات. ناهێڵن دۆزگەرێکی وەکو ئەو زیندوو بمێنێت قوربان. هەربینیتان لەناویان برد. ئەویش لەبەرەی جەنگدابووە. جێی ساغی نەماوە. کەسێکی ماندووو تێکشکاوە. لەجیاتی ئەوەی کە لەئەندامانی دادگای پێداچوونە بێت. کراوەتە دۆزگەری شارۆچکەیەك ئەمە بێویژدانی نیە؟"

دیسان بانگی کاتبەکەی کردەوە:

"ئێمە لێرەین، عوزێرخان ئاگاداربکەوە. بەبەڕێوەبەری ناحیەو دۆزگەریش بڵێ ڕاکە، چیتکرد؟"

"نووسیمو داشمنا، قوربان".

"لەوێ کەس نایبینێت؟"

"لەبەرچاوان نیە. لەجێگایەکی تاریکم داناوە".

وەهاب بەگ لەژوورەکە چووەدەرو ڕۆیشت، یەکسەریش گەڕایەوە.

"بەڵێ، ئافەرین لەجێگای پێشترە، کەس ناتوانێت بیدۆزێتەوە. دوای پازدە ڕۆژی دیکە.. واتە بەنیازی لەوێ ئەسپی ڕەسەن بەخێوبکەیت. کەواتە ئەسپەکانی تۆ لەکۆشکی ڤیەننان؟ شانازێیکی چەند مەزنە. مایەی سەرفرازیە بۆ ئێمە. کەواتە بڕیار وایە لێرەوە ئەسپ ڕەوانەی کۆشکی ڤیەننا بکرێن. وایە؟"

"بۆنا؟"

"بەڵێ هەڵبەت. شاکانو سەرۆککۆمارو مارشالەکان سواری ئەسپەکانی ئێمە دەبن. ئینجا ئێمە پێشدەکەوین. خۆمان دەگەیەنینە ئاستی ئەوروپا. خوا ئەسپو تورکی پێکەوە لەقوڕ دروست کردوون. لەیەك ڕۆژو یەك سەعاتو یەك خولەکدا. ئاتیلا بەسەرپستی ئەسپەوە پەلاماری ئەوروپای داو ئەسکەندەری مەزن بەسەر پشتی ئەسپەوە تاچینو هیندوستان ڕۆیشت. هەروەها چەنگیزی باپیرەی ئێمەی تورك. گەورەترین خوێنمژی مێژووی مرۆڤایەتی بەسەر پشتی ئەسپە بچووکەکانیەوە چینو هیندوستانی داگیرکرد. هەروەها ئەنەدۆڵو فەرەنگستانیش.

ئێمەی تورك، ئەگەر بمانەوێت ڕاستی بڵێین، بەسەر پشتی ئەسپەوە هاتووینەتە دونیاو بەسەر پشتی ئەسپیشەوە دەمرین.

پیاوە ئازاکانی تورك لەگەڵ ئەسپەکانیاندا دەنێژرێن. ئاتیلایان لەگەڵ ئەسپەکەیدا لەنێو چاڵی (تونان)دا ناشت. ئەسکەندەری مەزنیان بەئەسپەوە لەناو زێی فوراتدا ناشت. چەنگیزخانیان لەناو ڕووباری سنددا ناشتو گەورە گەورەکانی دیکەی تورکو بەهادوریەکان لەگەڵ ئەسپەکانیاندا لەئامێزی یەکدیدا خەوتوونو سلێمان پاشا، داگیرکەری ڕۆمیش لەگۆڕستانی مەڕمەڕی خۆیدا لەگەڵ ئەسپەکەی خۆیدا لێیڕاکشاوە".

کاتبەکە گوتی: "بەعوزێر بەگم گوت. ئێستا دێت".

بۆ دواوە کشایەوەو چووە دەرێ. لەو دەمەدا عوزێر خان بەخۆیو سمێڵی گەورەیەوە هاتە ژوور. هەمووان پێکەوە لەبەری هەستان.

کاتبەکە لەدەرەوە کورسییەکی مەخمەڵی سەوزی هێناو لەتەنیشت وەهاب بەگی دانا. عوزێر خان بەگەرمیەوە یەکەم جار پویرازو موسا ئاغای گرتە باوەشو لەسەر کورسیەکە دانیشت. لەبەرجۆشو خرۆشی خۆی خێراخێرا هەناسەی دەدان. دوای ئەوەی کە پشووێکی دا، گوتی: "بەخێربێن. سەفاتان هانی". لەخۆشحاڵیان دەمی پێکنەدەکەوتەوە.

کەمێك دواتر بەڕێوەبەری ناحیەش هات. دیسان هەموویان هەستانەوە، کاتبەکە کورسیەکی دیکەی هێنا. بەدوای بەڕێوەبەری ناحیە، ماهیربەگی دۆزگەریش هاتە ژوور،

هەمووان پێکەوە لەبەری هەستان. کاتبەکە کورسیەکی مەخمەلی رەنگ مۆری بۆ هێنا. کە لێوارەکانی بەداوی زێڕین چندرابوون. بەڕێوەبەر ماهیربەگی دۆزگەری وەك پیاوێکی گەورەی شارۆچکەکە بەئامادەبووان ناساندو هەرچی لەبارەی ئەوەوە دەیزانی پێیگوتن.

وەهاب بەگ گوتی: "خۆ گوێتان لێبوو، ئێمە کەسانێکی چەند بەختەوەرین کە کەسێکی قارەمان لەبەرامبەر خۆماندا دەبینین".

بەڕێوەبەر بەچاوانی کە فرمێسکیان تێزابوون گوتی: "ئەمە قارەمانە، جا چ قارەمانێك! دەبێت سوپاسی خوا بکەین کە قارەمانێکی ئاوای بۆ ئافراندووین".

وەهاب بەگ گوتی: "بەڕێوەبەری هێژا، گیانی ئەویش وەکو هی من هەموو کون کون بووە. وەکو سەرەد، لەڕاستیدا نازانم چۆن دوای ئەو هەموو گوللەیەی پێکەوتوون زیندووە؟"

بەڕێوەبەری ناحیە گوتی: "وەهاب بەگ، وەهاب بەگ، کە تۆش بەزیندوویی ماویتەوە پیاو سەری لێدەرناکات. چەند گوللەتان پێکەوتووە، توانیوتە بیانژمێریت وەهاب بەگ؟"

وەهاب بەگ بەخاکەڕاییەوە گوتی: "کاتی ژماردنیانم نەبوو. خوا خۆی نەیەوێت کەس نامرێت".

وەهاب بەگو ماهیر بەگ سەیری یەکدیان کرد. ئەو دەردو نەهامەتیو ناخۆشیانەی کە لەبەرەکانی جەنگدا بینیبوویان لەڕوخساریان رەنگی دابووەوە. لەو دەمەدا هەرکەس سەیری روخساریانی بکردبایە دلگران دەبوو.

عوزێرخان گوتی: "هەواڵێکی خۆشم پێیە بۆتان". کەمێك بێدەنگ بوو. سەیری چاوەکانی پویرازی کرد. "ئەم هەواڵە بۆ تۆیەو موژدەیەکیشە بۆ موسا ئاغا، کۆمەڵێك دکتۆر خەریکن دێنە دوورگە. دوورگەکەی ئێوە، بۆ ئەوەش دێن کە نیشتەجێی ببن".

"من بۆ خزمەتکردن هاتووم قوربان. زۆر خۆشحاڵ بووم گەورەم".

"هەردوو دکتۆرەکە بەهۆی کەمئەدامبوونیانەوە خانەنشین کراون. دەیانەوێت ببنە مامۆستاو دەرس بڵێنەوە، بەڵام دوورگە منداڵی لێنین".

پویراز گوتی: "چەند منداڵێکی لێهەن، وردە وردە زیاتر دەبن. زۆر نابات دوورگە پڕ دەبێت لەخەڵك".

ماوەیەك لەبارەی دکتۆرەکانەوە قسەیانکرد. قارەمانانی ئەو جەنگەیان بردنە کەشکەلانی ئاسمان.

خەیری ئەفەندی گوتی: "کلێسای رووخاوی چاناك قەلأیان کردبووە نەخۆشخانەی سەربازە بریندارەکان. هەر ئەو دکتۆرانە لەگەڵ هاوڕێکانی دیکەیان لەگەرمەی شەڕو پێکدادانەکاندا هەفتەیەك دە رۆژ بێئەوەی تەنانەت تاوێکیش بخەون هەر خەریکی دەرمانکردنی برینداەکان دەبوون. ئێستاش ئەو سەربازە هەڵاتووە ئەو کلێسایەی لەگەڵ عەرزدا تەخت کردووە. سمایلیشی کوشت. کێڵگەی ئێلیاو دوورگە پڕیبوو لەسەربازانی بریندار. سەرباز وەکو شارە مێروولە تێکدەقژقژان. ئەو دکتۆرانە لەنێو ئەو کلێسا دارماوەدا هەزاران سەربازی نەخۆش‌و برینداریان دەرمان کرد. بەخێربێن، سەفایان هێنایە شارۆچکەو دوورگەکەمان. ئەو جۆرە مرۆڤانە پێ بنێنە هەر شوێنێك خێرو بێر لەگەڵ خۆیاندا دێنن. رەنگبێت بەنیاز بووبن کلێسا بکەنە نەخۆشخانە. کاتێك بێن‌و ببینن کلێسا ئاوا تێکوپێك دراوە شێت دەبن، بەڵکو بیرێك لەو رەمزی کاولاکە نەفرەتیە، ئەو سەربازە هەڵاتووە، ئەو لەدەست سزای لەسێدارەدان هەڵاتووە بکەنەوە".

وەهاب بەگ گوتی: "ئەو نەفرەتیە".

بەڕێوەبەری ناحیە گوتی: "چەپەڵی پیس. لەهەر جێگایەك ببینم سەرو دڵم تێك دەچن‌و هێڵنجم دێت. جگە لەوە هەر کاتێك ئەوەم بەبیردێتەوە کەچی بەسەر سمایل هێنابوو شێت دەبم. ئەگەر من لێرە نەبام تا ئێستا سمایلیان لەدار دابوو".

موسا کازم ئاغا کە تا ئەودەم بێدەنگ بوو، گوتی: "خوا خێرتان بنووسێت جەنابی بەڕێوەبەری بەڕێزی ناحیە. کەسێك کە خیانەت لەئەمانەتدا نەکات خیانەت لەهیچکەس ناکات".

عوزێر خان گوتی: "ئەو رەمزی کاولاکە زۆری نەماوە هەموومان دووردەخاتەوە. یەکەمجار من. بابیکات. هەرکەس ئەوە دەدورێتەوە کە چاندوویە".

سمێڵی گەورەی عوزێرخان لەتووڕەییان پفی کردبووو روخساری سوور سوور هەڵگەڕابوو.

"ئەو خائینەی خاك‌و نیشتمان‌و ئەو سەربازە هەڵاتووە بەمزووانە دەبێتە سەرۆکی هێزی بەرگری میللی‌و گەورەی سەرتاسەری ئێرە.

وەهاب بەگ گوتی: "منیش هەر زوو لێرە دوور دەخاتەوە، خانووەکانیشمان تێکدەدات".

خەیری ئەفەندی گوتی: "ببێتە سەرۆککۆماریش ناتوانێت هیچ بەرامبەر تۆ بکات. هەترەشی لەتۆ چووە. پیاوێکی وردیلەش لەدوورگەدا هەیە کە وەستا کارێکی

دەستڕەنگینە، لەنێو سوپا لەنیشانەشکێنیو دەستڕاستیدا هاوتای نەبووە، یەکێك لەسەربازە تایبەتیەکانی مارشاڵ بووە، کەسێك بووە کە مارشاڵ ئەوی بۆ ئەرکێکی گەورە رەوانەی دوورگە کردووە، لەهەر جێگایەك بیویستبێت لەکەسێك بدات لێیداوە. کەس پێناوێرێت. ئەفسەرێکی پزیشکی ئاژەڵانیش هەیە، کاولاکزادە لەئەنقەرە پێیڕاگەیاندراوە. لەوانەی هاتوونەتە دوورگە کەسێکی یۆنانیش هەیە، هەموویان ئەرکی گەورەیان هەیە. دوورگەی کارینجایان بۆخۆیان کردووەتە بارەگای سەرەکی، بڕیارە دوو دکتۆریش بێن. بۆچی؟ کاولاکزادە لەبەر ئەوەی لەئێوە دەترسێت تەنانەت ناتوانێت رووشی وەرگێڕێتو سەیری دوورگە بکات".

وەهاب بەگ روویکردە پویرازو بەنیوەگاڵتەو نیوەڕاستی گوتی:

"تۆ کاروبارەکەت باشە. لەوە باشتر هەرنابێت کە ئەنقەرە بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە گەورەیە ئێوەیان هەڵبژاردووە".

"مادام ئاوایە ئێوە هەر هیچ مەترسن. ئێستا کە ئێمەیان بۆ چاودێریو پاراستنی دەریاو ئەنجامدانی ئەرکی گەورە هەڵبژاردووە، ئەو ئەگەر نەك هەر ببێتە سەرۆکی هێزەکانی بەرگری میللی، بەڵکو ببێتە سەرۆکی ئەژدیهاکانیش تا ئێمە هەبین ناتوانێت هیچ بکات".

بەڕێوەبەری ناحیە لەپڕ هەستاو گوتی: "سەیر بکەن ئاوا لێرە دانیشتووین، من خەبەرم داوەتە خواردنگە، زووبن هەستن".

هەموویان پێکەوە هەستان. بەرەو لای خواردنگەکە رۆیشتن. مێزەکان ئامادەکرابوون. پەرداغی راکی لەسەر مێزان داندرابوون، موسا کازم ئاغایان لەپشت مێز دانیشاند، ئەوانی دیکەش لەدەوری مێزەکان دانیشتن.

بەڕێوەبەری ناحیە پرسی: "ئاوی ساردتان هەیە؟"

دوورسونەفەندی کە کاری پێشخزمەتیی لەخاوەن ریستورانتەکانی یۆنان فێربووبوو گوتی: "هەمانە قوربان. هێشتا ساردنەبووە".

"سوپاست دەکەم دورسونەفەندی.

"سەوزی، خواردن؟"

"مەعدەنۆس، توور، بیبەری سەوز، تەرەپیاز".

"ئەی پەنیر؟"

"دوێنی لەناو ڕەوەندەکانەوە هێناویانە. تازەیە، ئەو پەنیرەی کە حەزتان لێیەتی".

"ئـەوەی دی خۆتـان باشـی لێـدەزانن. میـوانێکی زۆر بـەڕێزمان هەیـە، لەڕێگایـەکی دوورەوە هاتووە". موسا کازم ئاغای نیشان دا.

"سەرچاومان ئاغا، زۆر بەخێربێن. سەفاتان هێنا بەڕێزمان. ئەمر بفەرموون. میـوانی وەکو ئێوە دەخەینە سەر سەرمان".

لەماوەیـەکی کورتـدا سـەرمێزەکان پڕکـران لەزەلاتـەو جۆرەهـا مـەزەی جیاجیـا، هـەم دەیانخواردەوەو هەم لەبارەی ڕەوشی وڵاتو دونیا قسەیان دەکرد.

لەنێو خواردنگەکەدا جگە لەئەوان سێ مێـزی پـڕی دیکـەش هـەبوون. لـەدەوری ئـەو مێـزەی ئـەولاتر پێـنج کـەس دانیشـتبوون. لەهەڵسـوکەوتیان دیـاربوو کـە خـەڵکی ئـەم ناوچەیە نین. هەر پێنجیان قاتو شـەلواری شـینی یـەك شێوەیان لەبـەربوو کـە دەتگوت کـاری یـەك بەرگـدروون. کراسـە خەتخەتیـەکانیان یاخـەیان نـەبوو. پشـتێنێکی بـاریکی شامیان لەپشتیان ئاڵاندبوو. هەموویان چـاو ڕەشـی چـاو گـەورە ئـەبرۆی پەیوەسـتو پـڕ، سمێڵی بابڕیو لووتیان هـەڵۆیی بـووو پەسـتەکی شـینی چـل دوگمـەی کـاری بەرگـدروانی حەلەبیان لەبەردابوو.

بەڕێوەبەری ناحیە پەرداغەکەی بەرزکردەوەو گوتی: "بەخۆشیتان!"

موسا کازم ئاغا گوتی: "بەخۆشیتان".

ئەوانیدی یەکدەنگ گوتیان: "بەخۆشیتان!"

پـویراز موسـا کاتێـك سـەری هـەڵبڕیو تەماشـای بەرامبـەر خـۆی کـرد، سـەیریکرد ئەوانەی کە لـەوێ دانیشـتبوون گشـتیان سـەیری ئـەویان کردبـوو، یەکسـەر چـاوی لەسـەر ئەوان لاداو سەیری پەرداغەکەی خۆی کرد. دەمێك ئاوا لەپەرداغەکەی خۆی ڕاما. پاشـان لـەتێك باینجـانی سـوورکراوەی خسـتە دەمیـەوە. دووجـار لەسـەریەك پەرداغەکـەی بەرزکردەوە. خواردنەوەکەی گەیاندە نیوە. جارێکی دیکە سـەیری ئەوانـەی بەرامبـەری کرد. هەر پێنج کەسەکە تەماشای ئەویان کردبـوو. زریـرەی سـەعاتە زێڕەکـانی هـەرپێنج کەسـەکەو چـاکەتو شـەلوارە شـینەکانیان کـە لـەگیرفانێکی ئێڵەگـە شـینەکەیانەوە بـۆ گیرفانێکی دیکە بردرابوو، دەبریسکانەوە.

موسـا کـازم ئاغـا، بەڕێوەبـەری ناحیـە، عوزێرخـانو پـویراز سـەرگەرمی قسـان بـوون، لـەبارەی ئەسـپەوە دەدوان. پـویراز بـەوردی گـوێی لـەو قسـانە گـرت کـە سـەبارەت

بەئەسپەکان دەکران. لەلایەکی دی، بەخۆی گوت: "من دەبێت چەرکەس بم. سەیرکە ئەو پیاوە چەندە زانیاری لەبارەی ئەسپەکانەوە هەیە. چەندیش بەباشی باسیان دەکات.

دوای باسکردنی ئەسپەکان هاتنە سەرباسی شەڕی چاناك قەلا، پاشان قسەیان لەجەنگی یۆنانو مەیدانی شەڕی دوملی پنارەوە کردو دوای ئەمانەش باسی گۆڕینەوەکانیان کرد.

پویراز تەنها تا دواییهاتنی باسکردن سەبارەت بەئەسپەکان توانی گوێ بگرێت. تەنانەت ئەگەر سەیری ئەو پیاوانەی بەرامبەریشی نەکردبا، زنجیری زێڕی سەعاتەکانی لەزەیندا بەردەوام دەبریسکانەوەو پێدەبوونو دەکوژانەوە. هەر جارێکیش سەری هەڵدەبڕی دەیبینی هەر پێنج کەسەکە چاویان بڕیوەتە ئەو. سەرەنجام بڕیاری دا چیدیکە سەیریان نەکات. ماوەیەکی درێژ خۆی گرت، سەیری نەکردن. بیریکردەوە ئەوان رەنگبێت هەر سەیری بکەن. سەری هەڵبڕیو سەیریکرد وا هەرپێنج کەسەکە لێی نز بوونەتەوە.

نانی خوارد. ئاوی خواردەوە پشت ملی خۆی خوراند، خێرا دەستی بۆلای دەمانچەکەی چووو کشایەوە. قسەی ئەوانەی دەوروبەری نەدەبیست، جگە لەو چاوانەی لەو رامابوونو پێبوونو خامۆشبوونی زنجیری سەعاتەکان شتێکی دیکەی نەدەبینی.

هەستانی ئەوانەی دەوروبەری هەست کرد. سەری هەڵبڕی لەگەڵ بینینی رەمزی لەشوێنی خۆی حەپەسا، ئەو بریسکە زەردانەو چەند جووتە چاوی لەو راماو دیارنەمان.

بەڕێوەبەری ناحیە بەپێوە راوەستابووو دەیگوت:

"فەرموو میری من، گەورەی من".

وەهاب بەگیش بەپێوە وەستابووو دەیگوت: "ئێمەت سەرفرازکرد، فەرموو جەنابی کاك رەمزی دابنیشە. لەئەنقەرە چ باسە؟ ئینشاللا دامەزراندنەکەتان بۆ سەرۆکی هێزی بەرگری میللی مسۆگەرە".

خەیری ئەفەندی بەپێوەبوو، دلگران بوو، نەیدەزانی چیبکات. بەردەوام دەستەکانی دەکردنەوەو دەیخستنەوە ناویەك. زۆر هەوڵی دا، بەلام نەیتوانی هیچ قسەیەك بکات. بەئارامی لەدەوری مێزەکە دانیشتەوە.

شەلالی عارەقە بووبوو.

"قوربان گوتم ئێوەم بینی باسلاوێکتان عەرز بکەم. کاك پویرازی بەڕێزیش لێرەیە. هەمیشە لەبینینی ئەو خۆشحاڵ دەبم. کاك پویراز کاتی تێکدانی کلێسا زۆر یارمەتی دام.

ئەگەر ئەو نەبوایە ئەو شەموولەیە، ئەو پیرە پیاوکوژە منی کوشتبوو، خوێنی رشتبووم. بۆتە برادەری مارشال لوس. ئەو هەموو خەڵکەی کوشتووە. خوێنی رشتووە، بەڵام تێرنەبووە. ئەگەر کاکە پویراز خۆی نەگەیاندبایێو دەمانچەکەی لەدەستی دەرنەهێنابا، ئێستا بستێك گیام لەسەر گۆڕی شین بووبوو".

پویرازو موسا ئاغا ماتو حەپەسابوونو تێیەوە ڕامابوون.

"من بەڕۆح قەرزداری کاك پویرازی بەڕێزم. عەبدولوەهاب بەگ، ئەگەر کاك پویراز پێیخۆش بێت من سێ دانە دوورگەی گەورەتری دیکە دەکڕمو بەدیاری پێشکەشیانی دەکەم. ئەگەر تەنانەت داوای گیانی شیرینی خۆمو منداڵەکانیشم بکات بەفیدایان دەکەم. ئەو قارەمانی جەنگی سەربەخۆییە".

"فەرموو دابنیشە قوربان، بۆ هەر بەپێوە وەستاویت؟"

وەهاب بەگ دەستپاچە بووبوو.

"سێ دوورگەی جوانی نەفرۆشراو هەن؟"

"بەڵێ قوربان".

"سبەی دەیانکڕمو دەیانکەمە دیاری بۆ کاکە پویراز. ئەو گیانی منی رزگار کرد مەدالیای سەربەخۆییش..".

عوزێر خان کە لەتووڕەییان دەلەرزی هەستا:

"فەرموو موسا کازم ئاغای بەڕێز. زۆر درەنگ داهات. بابچینەوە ماڵ، حسابەکە دراوە".

هەستان، هەموویان پێکەوە چوونەدەر. رەمزی کاولاکزادە بەتەنیا لەنێو خواردنگەکە مایەوە.

بەڕێوەبەری ناحیە بەوردی سەیرێکی دەوروبەری کرد. سەیریکرد رەمزی کاولاکزادە لەوێ نیە. گوتی: "سەگ، سەگی بەرەڵلا، کاك پویراز ئەو سەگەی زۆر ترساندووە".

وەهاب بەگ گوتی: "سەگ، سەگی بەرەڵلا".

خەیری ئەفەندی گوتی: "جا چ سەگێك، لەهەموو دەورو زەمانێکیش هەروابووە. باشەکان هەمیشە ستەمیان لێکراوە. سەگو کاسەلێسەکانیش هەمیشە لەجێی خۆیان دەمێننەوە، مەگەر وانیە؟"

رێك لەم ساتەدا رەمزی کاولاکزادە لەنێو شیپانەی دەرگا دەرکەوت، هەمووان بێدەنگەیان لێکردو خۆیان وێکهێنا.

"من سێ دانه دوورگەی وەك بەهەشت دەكەمە دیاری بۆ تۆ كاكە پویراز، هەرچی بتەوێت لەو دوورگانە دەیكەیتو هەرچی بتەوێت تێیاندا دەڕوێنیت، قەباڵەشیان هەر بەناوی تۆوە دەبێت".

"سوپاست دەكەم كاك رەمزی هەربژیت. هەربژیت، دوورگەكەی خۆمان بەسمانە خانووەكەشم هەروا بەسە بۆم".

رەمزی بەگ دەستی لەقۆڵی هەڵكێشاو كەمێك بردیە ئەو لاوە، چرپاندیە گوێیو گوتی: "بەمزووانە هێزەكە رێكدەخەین. یاوز عیسمەت دەستی خۆش بێت منی بەسەرۆكی هێزەكە دامەزراندووە. تۆش بۆ رێوڕەسمی راگەیاندنی هێزەكە بانگهێشت كراویت. بێگومان ئەم زانیاریانەت زۆر لەمێژە پێگەڕاگەیاندراون لەبارەی سێ دوورگەكانیش باش بیربكەرەوە. سێ دوورگەی چۆڵ زۆر سوودیان لێوەردەگرن. دوور لەدیدی خەڵكان دەتوانیت ئەركەكانت بەباشی ئەنجام بدەیت. ئەزیش زۆر هاوكاریتان دەكەم".

"سوپاست دەكەم كاك پویراز. ئێمە ئاواش باش كاردەكەین. سبەی دووسبەی بڕیارە دووكەسی دیكە بێنە دوورگە. دوو دكتۆر".

"ئەگەر پێویستت بەشتێك بوو، من بەچاوان ئامادەم".

"سوپاس كاك رەمزی".

عوزێر خان كە سمێڵە هەڵمساوەكانی زیاتر پفیان كردبوو هاتە لای ئەوانو گوتی: "فەرموو بابچینەماڵەوە..".

"بمبوورە عوزێرخان، ئێمە دەچینەوە ناو بەلەم، سبەی دووسبەی بڕیارە میوانی تازە بهێنە دوورگە. بمانبوورە دەبێت بگەڕێینەوە".

رەمزی كاولاكزادە گوتی: "نەخێر دەبێت تەشریف بێنن بچینە ماڵی ئێمە. ئەمشەو میوانی ئێمەن".

خەیری ئەفەندی گوتی: "نابێت، ئەمشەو میوانی ئێمەن".

بەڕێوەبەری ناحیە گوتی: "میوانی ئێمەن".

عوزێرخان هەڵیدایێ: "ئەوان ئەمشەو ناتوانن لەماڵی هیچتان تەنانەت ماڵی ئێمەشدا بمێننەوە. ناتوانن سبەی میوانیان دێن. خۆ میوانەكانیان لەدوورگە بەتەنیا بەجێناهێڵن".

دەستی رەمزی کاولاکزادەی لەقۆڵی پویراز هێنایە دەر، دەستی خۆی درێژکرد یەکەمجار دەستی موسا کازم ئاغای گوشیو ئینجا دەستی پویراز:

"خواتان لەگەڵ قوربان. هەوا خۆشەو دەریا ئارامە. خوا ئاگادارتان بێت".

بەم قسانەی عوزێرخان، هەمووان بێدەنگەیان کرد. موسا کازم ئاغاو پویراز دەستی هەمووانیان یەك یەك گوشی، کاتی خواحافیزی رەمزی بەگ هاتو هەردووکیانی گرتنە باوەشو پێکەنی:

"لەمەودوا هەرکاتێك هاتنە شارۆچکە دەبێت بێنە ماڵی ئێمە. چیدیکە لەمن دڵگران مەبن. ناکرێت بەسەر ماڵی سەرۆکدا بازبدەنو بچنە ماڵێکی دیکە. خوا حافیزتان بێت".

تا کۆتایی رێگاکە چووبوونو خەریکبوون بۆلای ئەسکەلە پێچیان دەدایەوە کە خەیری ئەفەندی خۆی پێگەیاندن:

"وای، وای دەبێت زۆر وریابن رەمزی دەیەوێت بتانخاتە نێو تەڵەوە دەنا ئەو هەموو زمانلووسیەی نەدەکرد. ئەو پێنج کەسەتان لەخواردنگەکە بینی کە هەر پێنجیان لەیەك دەچوون؟ لەوێ ئەو ماوەیە هەموو هەر سەیری کاکە پویرازیان دەکرد هەر پێنجیشیان دەمانچەیان پێبوو. سەرنجتان دا، هەرکە کاولاك هاتە ژوور هەموویان لەبەری هەستان. بەرێزەوە راوەستان. رەمزی تەنانەت سەیریشی نەکردن. هیچ بایەخی پێنەدان. نەیدەویست کەس تێبگات کە ئەوان یەکدی دەناسن. بەبڕوای من هەرپێنجیشیان عارەب بوون. عارەبی ئورفا یان ماردین یاخود هی حەلەب. من رەمزی باش دەناسم. لەمنداڵیەوە ئاوا بەدزیەوە کار دەکات. وریابە کوڕە لاو. ئەو خوێنمژە لەتۆ دەترسێت، بێهونەبوو چووە چیا، نیشتمانو میللەت پەشمە لەلای، ئەو بۆ ئەوە چووە چیا تا دەوڵەمەندە یۆنانیەکان رووت بکاتەوە. زۆر لەیۆنانیەکانی رووت کردنەوە. دوای جەنگی سەربەخۆییش بەپێش ژمارەیەك سەربازی هەڵاتوو کەوتو بەئاڵای مانگو ئەستێرەوە هاتە شارۆچکە. ئێستاش زۆری پێناچێت دەبێتە سەرۆکی هێزی بەرگری میللی".

"بەمنی گوت بۆتە سەرۆك، قوربان".

"وریابن، لەتۆ دەترسێت. تا ئەو کاتەی تۆ لێرەبیت ئۆقرە ناگرێت".

قۆڵی پویرازی گرت:

"ئەو لەتۆ دەترسێت. رۆژ بەڕۆژیش ترسەکەی زیاد دەکات. تا زیاتریش بترسێت تاوانەکانی زیاد دەبن. تا ئەودەمەی تۆ لێرە بیت ترسو نیگەرانیەکەی ئەوەندە گەورە دەبێت کە نەتوانێت بەرگە بگرێت.

ئـەو تـەنها یۆنانیـەکانی نەکوشـت، موسـڵمانێکی زۆریشـی کوشـت. ئەوانـەی نـاو خواردنگەکە کێ بوون. مرۆڤ سەر لەکارەکانی ئەو کاولاکزادەیە دەرناکات".

بەدەم پیاسەوە گەیشتنە ئەسکەلە. قەدریی بەلەموان کە چاوەڕێیان بـوو لەبەرامبـەر قاوەخانە رووبەڕوویان بووەوە. هاتنە ئەسکەلەو سواری بەلـەم بـوون. قـەدریی بەلـەموان لەناو کابیندا نوێنی بۆ موسا ئاغا راخستبوو.

مەلەك خانم بالیفی کە لەگۆشەکانیان نەخشی وەنەوشە کشرابوو دانابوونە ناو نوێنەکە.

موسا ئاغا کاتێك نوێنەکـەی بینـی سـەیرێکی پـویرازی کـردو ئینجا سـەیری قـەدریی بەلەموانیشی کردو پێکەنی. جلەکانی داکەندو چووە نێو جێگا، بۆنی بنیشت لەمەلافـەو بالیفەکانەوە دەهات.

ئەو پیاوانەی کە لەنێو خواردنگەکەدا بینیبوونی ئەو پیاوانەی کە دەتگوت بەمەکینە وەکـو یـەك دروسـتکراون‌و چـاویان لەسـەر پـویراز هەڵنـەدەگرت‌و زنجـیری سـەعاتە زێڕەکانیـان کـە بەسـەر ورگیانـدا دەبریسـکایەوە سـاتێك لەبەرچـاوانی لانەدەکـەوتن. دەمانچەکانیان لـەژێر چاکەتە کراوەکانیانـدا بـەدی دەکـران. ئامـادەبوون، هـەر ئێستا نـا ئێستا ئامادەبوون دەمانچەکانیان رابکێشین‌و تەقە لەپویراز بکەن.

موسا ئاغا، گورگی پیر، گومانی لەو سێ کەسە کردو لـەوێ هەسـتا. رەمـزی کـاولاکزادە زەندەقی لەپویراز چووەو ترسەکەشی تادێت زیاتر دەکات.

تـا ئـەو رۆژەی پـویراز لـەم دوورگەیـە بێـت ئـەو هـەموو رۆژێـك دەمرێـت‌و زینـدوو دەبێـتەوە. هەترەشی لەپویراز چووە، بەڵام هەر هۆیەکی هـەبێت بەمزووانـە یـان پـویراز دەکوژرێت یان رەمزی کاولاك ئایا پویراز ئەمە دەزانێت؟

ئەگـەر تـا ئێسـتاش نـەیزانیبێت ئەمشـەو تێگەیشـت. ئەگـەر کەسـێك ئـاوا بێپـەرواو ئەوەندە لەناو خەڵکدا بەکەسێك هـەڵبلێت دیـارە شـتێکی تێدایـەو ماسـتەکە بێمـوو نیـە. مرۆڤ تەنها دەتوانێت ئاوا بەکەسێکی مردوو هەڵبلێت‌و ئاوا بەکەیفی خۆی پەسنی بکـات. کەسـانی وەکـو کـاولاکزادە بەشـەوان خـەڵك دەکـوژن یـان پیاوەکانیـان رادەسـپێرن خـەڵك بکوژن‌و بەڕۆژیش لەڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنیدا بەشـدار دەبـن‌و نوێـژی مـردووان لەسـەر تەرمەکەی دەخوێنن، بەچاوی بەگریانەوە تابووتەکەی هەڵدەگرن‌و دەینێـژن. پـویرازیش ئەمە دەزانێت، بۆیە کاتێك ویستمان کێڵگەکە بکڕین خۆشحاڵ بوو. کێڵگە وەکو دوورگـە نیە. دوورگە ئەگەر سبەی پڕبـوو لەخـەڵك ئیـدی کـەس نازانێـت کـێ دێـت‌و کـێ دەڕوات، بـەڵام لەکێڵگـە ئێمـە هەرچوار دەوری دەگـرین‌و چـەند کەسـێکی چـەکداریش لـەناوەوەو

بەردەم دەرگاکەی دادەنێین. پویراز هەموو شتێك دەزانێت، بەڵام کارێکی لەدەست نایەت. زەهرا ئەگەر ئاگای لەهیچشتێکیش نەبێت، لەحاڵو رەوشی پەشۆکاوی پویرازەوە لەهەموو شتێك دەکات. مرۆڤێکی ئازاو لێهاتووی وەکو ئەو کە قارەمانی جەنگیشە بۆ دەبێت لەدوورگەیەکی چۆڵو هۆڵ بژیت. ئایا زەهرا هیچ بیر لەمە ناکاتەوە؟ بەڵکو هیچ پەیوەندێیکشیان لەنێواندا نەبێت. نەیبێت، هەر کاتێك من گەڕامەوە بۆ کرێت ئەویش لەجیاتی لێرە بمینێتەوەو لێرە بیکوژن، لەگەڵ من دێت بۆ کرێت. ئەویش وەکو گشت چەرکەسیەکان دوورخراوەتەوە. کرێت یان تورکیە چ جیاوازیەکیان بۆ ئەو هەیە. گوندەکەشیان باریان کردووە رۆیشتبوون.

دیاریش نیە چوونەتە کوێ. خوشكو براو باوكو دایکیشی نین. ئەگەر پویراز بیربکاتەوە گوندەکەیان بۆ کوێ چووە بەئاسانی دەتوانێت بیاندۆزێتەوە.

جارێ دەبێت سەبر بگرین بزانین چ دەبێت، ئەگەر پێکەوە بیرێکی لێبکەینەوە بەڵکو بتوانین کێشەکە چارەسەربکەین. زەهرا جوان سەیری پویراز دەکات. پویرازیش هەروا. ئەگەر ئێمە نەتوانین لێرە بڕۆین کچەکانیش ناتوانن باولەکانیان بکەنەوە. کاتێك دایکیان خەریکبوو دەمرد چ گفتێکیان پێدا؟ دایکیان چی لێداوا کردبوون؟ پێیگوتبوون تا باوکتان ماوە بەتەنیا جێیمەهێڵن، هەروەها باولی جەهازیەکانتان تا ماون نەکەنەوە...

ئەمەی پێگوتبوون؟ دایکیان چۆن توانیویە وەسیەتێکی ئاوایان بکات؟ ئایا ئەمە ستەمێکی گەورە نیە دەرهەقیان؟ دایکێك چۆن دەتوانێت ئەو جۆرە قسانە بەکچەکانی بڵێت؟.

ئەو شەوە خەو نەچووە چاوی. بیری لەکچە دڵخوازە تورکو یۆنانیەکان کردەوە. ژنەکەی خۆی زۆر خۆشدەویست ئەگەر لەکچێکی ئاواجوانو خوڵقخۆشدا راست نەهاتبا هەرگیز هاوسەرگیری نەدەکرد. لەدەریاوە هاتو چووەوە دەریا. نزیکەی بەرەبەیان هەستا. میزێکی کردە دەریا. ئەگەر بەلەمەکە کەمێکی دی تەکانی خواردبا دەکەوت. ترسا. هات لەنێو جێگادا راکشا. تا بەتەواوی بەیانی دا لەنێو جێدا بەچاوانی کراوەوە مایەوە. کاتێك یەکەمین تیشکەکانی خۆر لەپەنجەرەی بچووکی کابینی بەلەمەکە هاتنە ژوور لەنێو جێ هاتەدەر، جلەکانی پۆشی، سەتڵێك ئاوی لەدەریا هەڵێنجا. دەستو دەمو چاوی شوشت. هەرکە ئاوڕی لەلای راست دایەوە پویرازی بینی.

"ئاغا بەرچایی ئامادەیە. نافەرموویت؟"

"تۆ بەرچایت خواردووە؟"

"نە ئاغا".

"درەنگ لەخەو هەستام. دیارە خۆر بەدرەنگەوە لەکونی کابینەکە هاتۆتە ژوور. قەدریی بەلەموان؟"

"ئەو دەمێکە بەرچایی خۆی خواردووە".

"هەموو ئەو شەوە هەر ئەو بەلەمی لێخوڕیوە؟"

"بەنۆبەت لێمانخوڕی. نۆبەتی من کە دەریا سپی بوو بانگیم کردو لەخەوم هەستاند".

دەوریان لەو سفرەیەدا کەلەبەشی لای سەرەوە راخرابوو.

سفرەکە پڕبوو لەخواردنی جیاجیا، بەمگێزەوە بەرچاییەکەیان خوارد. هەستان، پشتیان بەتەختەکانی کابینەوە داو چاویان دایە دەریا. دەریا ساف ساف بوو. رۆشنایی وەکو پوولەکە بەسەر دەریادا دەڕژا. هێڵێکی درێژی سووورباو لەقەدپاڵی چیای تەماویی بەرامبەرەوە دەهاتو لەکاتێکدا کە رەنگێکی شینباوی زراوی لەوسەری دەریاوە بەدوای خۆیدا رادەکێشا. لەکلکەی چیایەك کە پەڵە هەوری سپی بەسەرەوە بوون کۆتایی دەهات. کاتێك لەناوەڕاستی دەریادا بەشێوەیەکی لەباوەڕکردننەهاتوو دەدرەوشایەوە، لێوار دەریاکە بتەوێت نەتەوێت کەوتبووە ئەو دیو تەمەوە.

ئەمڕۆ بەیانی سیمای پویراز نوقمی نێو شادی بوو. موسا ئاغا ئەمەی بەچاکی تێبینی دەکرد. منیش کاتێك بۆ گەیشتن بەدایکی منداڵەکان دەکەوتمە رێ لەخۆشحاڵیان هەر ئەوەبوو نەفرم. ماوەیەکی درێژ سەیری پویرازی کرد. پویرازیش چاوی بڕیبووە دەریاو سەیری ئەو تیشکانەی دەکرد کە وەکو پوولەکە لەئاسمانەوە بەسەر دەریادا دەڕژانو پەخشوپەلا دەبوون، بەڵام هەستێکی نیگەرانی لەچاوەکانی بەدی دەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا دڵی تژی بوو لەشادی.

"پویراز، کوڕم".

"فەرموو ئاغا".

"هەموو شتێك روونو ئاشکرایە".

"روونو ئاشکرایە ئاغا".

"دەبێت سەبارەت بەهەموو شتێك پێکەوە بدوێین".

روخساری موسا ئاغا رەش داگەڕاو راوێژی قسەکردنی راشکاوانە بوو. پویراز تاسابوو، وێڕای ئەمەش دڵی پڕبووبوو لەشادمانی.

"هەڵبەتە ئەو کەسانەت بینین کە لەنێو خواردنگەکە بوون".

"بینمن قوربان".

"رووبەڕوو سەیری تۆیان دەکرد".

"سەیریان دەکرد".

"دەستیان بەسەر دەمانچەکانیانەوە بوو".

"بەسەر دەمانچەکانیانەوە بوو".

"هەمووشیان دەتگوت لەکارخانەیەك دروستکراون".

"هی کارخانەیەك بوون".

موسا ئاغا لەپڕ بێدەنگ بوو. سەیری ئەولای کردو کەوتە بیرکردنەوەوە لۆچ کەوتە نێوچاوانیەوە. کەمێك دواتر گوتی: "هەموو شتێك روونە، ئێمە دەمانویست بێپەردە قسەبکەین، وانیە؟"

"دەمانویست بێپەردە قسەبکەین. ئێمە هەمیشە بێپەردە قسەمان لەگەڵ یەکدیدا کردووە ئاغا".

"ئەو دەمەی کە ئێمە چووینە ناو خوێندنگەکەوە، رەمزی کاولاکزادە لەنێو خواردنگەکەدا نەبوو، وانیە؟"

"لەوێ نەبوو، ئاغا".

"لەپڕێکدا سەرو کەللەی بەدەرکەوت؟"

"نازانم".

"بینیت کە هاتە ژوورەوە ئەو پێنج کەسە پێکەوە لەبەری هەستان؟"

"بینیم".

"رەمزی لەهەستانیان زۆر تووڕە بوو، سڵاوی نەکردو یەکسەر هاتە سەرمێزی ئێمەوە".

"هات ئاغا".

"تەنها لەگەڵ تۆدا قسەی کرد. تۆی بردە کەشکەڵانی ئاسمان، دەزانی ئەمە واتاکەی چیە؟"

"دەمەوێت بیری لێبکەمەوە".

"زۆر لەتۆ دەترسێت".

"دەترسێت".

"ترسکەشی رۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبێت. دەزانی ئەگەر ئاوا بچێتە پێش چی روودەدات؟ من ئەو جۆرە مرۆڤانە باش دەناسم کەسێك کە تاو ئەو رادەیە بترسێت، دواجار یان

خۆی دەکوژێت یان لایەنی بەرامبەری. رەمزی لەکێ ئاوا وەکو شێتان دەترسێت؟ تۆ چۆنی تێدەگەیت؟"

"خەریکم بیری لێیدەکەمەوە ئاغا".

"بۆچی ئەوەندە پەسنی تۆی دەکرد؟ دەیەوێت تۆ لێرە بڕۆیت. ئەگەر تۆ بڕۆیت خەیاڵی ئاسوودە دەبێت. ئێستا رۆژ دوای رۆژ زیاتر بەخوێنت تینوو دەبێت. دەزانی شەوان کە دەیەوێت بخەوێت چەند کەسی چەکدار پاسەوانی لێدەکەن؟"

"نازانم".

"لانیکەم حەوت تفەنگداری وریا".

"چ بکەین کە ترسکەی بڕەوێتەوە؟"

"ئەگەر ئەو سێ دوورگەیە قبوڵ بکەیت کە پێشنیازی بۆ کردی هەموو شتێك جێبەجێ دەبێت".

"لەم دەوروبەرانە سێ دوورگەی چۆڵ هەربوونیان نیە، جگە لەوە مەگەر دەکرێت دوورگەکان بفرۆشرێن، مەگەر دوورگەکان هی دەوڵەت نین؟"

"ئەو پێنج کەسە؟"

"نایانناسم. ئەوانم پێشتر نەبینیبوون".

"هیچ هەواڵێکی ئەمیر سەڵاحەدینت هەیە؟"

"نە ئاغا".

"لەکێ دەتوانین زانیاری سەبارەت بەو پێنج کەسانەوە وەدەست بێنین؟"

پێکەنی:

"رەنگبێت خەیری ئەفەندی. بۆی هەیە عوزێر خان بزانێت. رەنگبێت رەمزی کاولاکیش بزانێت، کە هاتوونەتە شارۆچکە رەنگبێت بەشێوەیەك لەشێوەکان یەکدی بناسن. دەبێت شتێك هەڵکرێنین".

نزیکەی دەمەدەمی نیوەڕۆ گەیشتنەوە دوورگە. کچەکان، لێناو مەلەك خانم بەلەمەکەی قەدریی بەلەموانیان لەدوورەوە بینیبوو، بەخێرایی خۆیان گەیاندبووە ئەسکەلەو چاوەڕێ بوون. یەکەم کچەکان باوەشیان بەباوکیان داکرد، دوای ئەوان مەلەك خانم دەستی موسا ئاغا گرتو گوشی. پاشان دەستی پویرازی گرت. گوتی: "بەخێربێنەوە". لێناش کوڕەکەی گرتە ئامێز.

دوای ئـەوان لێنـاو کچـەکان تەوقـەیان لەگـەڵ پـویرازدا کـرد پـویراز بتـەوێت یـان نـا دەلـەرزی. دوای هـەمووان قـەدریی بەلـەموان لەبەلـەم دابـەزی. بەشـادیو خۆشـحاڵیەوە پێشوازیان لەئەویش کرد.

مەلەك خانم گوتی: "ئێستا هەموومان پێکەوە دەچینە مـاڵی سـوڵتانمان موسـا ئاغـا. میواندارییەکی شکۆدارانەتان بۆ ڕێکخراوە ئاغا زۆر خۆشحاڵ دەبێت".

موسا ئاغا گوتی: "کەوایە زووبن بابچینەوە ماڵ. لەبرسان مردین".

دەستی خستە نێو دەستی پویراز، هەموویان پێکەوە چوونەوە ماڵ. سفرە دانـدرابوو. کچەکان تەشتو مەسینەیان هاورد. هەمووان دەستو دەمو چاویان شوشت. زەهرا کاتێـك خـەریکبوو ئـاوی بەدەسـتی پـویراز دادەکـرد، هێشـتا دەلـەرزی. دەسـتەکانی پـویرازیش دەلەرزین. ئەمەش لەدیدی زەهرا شاراوەنەبوو.

قاپە چینیە پـڕ نـەخشو نیگارەکـان لەسـەر سفرەکە دانـدرابوونو چاوەڕێی هاتنی خـواردن بـوون. یەکـەمجار بەمەنجـەڵ سـوپی ماسـی بـەبۆنی پونگـە هـات کـە هـەڵمی لێهەڵدەسـتا. زەهـرا یەکـەمجار سـوپی لەقاپەکـەی لێنـا کـرد، پاشـان هـی مەلـەك خـانمو پویرازو باوکیو بەلەموان و...

موسا ئاغا گـوتی: "دەسـتتانخۆش منداڵینـە. سـووپێکی بـەتامتان دروسـتکردووە. ڕێـك وەکو دایکتان. "لەگوتنی ڕستەی وەك دایکتان پەشیمان بووەوەو سەری دانەواند.

"ماسیتان لەکوێ پەیداکرد؟"

زەهرا گوتی: "هوسمەن هێنای".

پویراز گوتی: "زۆر دەمێکە نەهاتۆتە ئەم ناوە. ئێمەش نەچووینەتە لای".

"هوسمەن بەلەمێکی ماتۆڕداری زۆر جوانی کڕیـوە، نیشانچی بەلەمەکـەی بـەنرخێکی هەرزان بۆ کڕیوە".

مەلـەك خـانم گـوتی: "نیشانچـی ئـەوی بردۆتـە لای خـۆیو زۆر بەباشـی فێـری ماسیگریی کردووە".

"ئومێدەوارم لێمان دڵگران نەبووبێت".

دوای ئەوەی کە سووپەکەیان خوارد، نەسیبە قابلەمەو کاسەکانی کۆکردنـەوەو بردنـی لەمەتبەق دانیانو بەقابلەمەیەکەوە گەڕایەوە، هەر لەگەڵ ئەوەی سەرپۆشی قابلەمەکـەی هەڵدایەوە بۆنو بەرامەیەکی خۆش لەگـەڵ هاڵاوێك هۆڵەکـەی پڕکـرد. پـەڕەکانی لـووتی

موسا ئاغا لەرزین. گوتی: "تێگەیشتم، تێگەیشتم خواردنەکە چیە. تێگەیشتم دۆڵمەی کولەکەیە، کولەکەتان لەکوێ پەیداکرد؟"

"نازانم".

"چۆن دەکرێت نەزانن؟"

"نیشانچی هێنای ئێمە لەکوێ بزانین لەکوێی هێناوە ئەمە تەنها خوا دەزانێت".

"شەیتانەکەی بۆی هێناوە".

پێکەنین. نەسیبە دۆڵمەکانی یەك یەك دانانە نێو قاپەکان. دوای ئەوەی کە دۆڵمەی کولەکەیان هێنا، هەندێك خواردنی دیکەی گیاییش هێندران، هەر لەگەڵ ئەوەی سەرپۆشی قابلەمەکان هەڵدەدرایەوە. موسا ئاغا یەکسەر دەیگوت خواردنەکە لەچ جۆرە گیایەك دروستکراوەو قسەکەشی تەواو دەردەچوو.

خواردنەکەیان تەواو کرد، قاوەکەشیان خواردەوە. تا نیوە شەوانێك دانیشتنو قسەیان کرد. مەلەك خانم دیسان کەوتەوە باسکردنی قازداغی هەزار کانی. باسکردنی رێورەسمێك کە لە"رۆژی خدرولاس"[1] دا بەرێوەدەچێت. باسکردنی ژەنینی سەد پیر پێکەوەو شان وەشاندنی سەدان کەسو پێکەوە سەماکردنیان. تا ئەو زیاتر باسی بۆ دەکردن، فرمێسك زیاتر لەچاوەکانی موسا ئاغا خڕدەبوونەوە. هەروەك خۆیان دەیانگوت ئەوانیش هەر لەم ناوچەیەی تورۆسەوە چووبوونە کرێت. سەدان مرۆڤ بەسەماو خولانەوە دەریاکانیان خستە پشت سەرو بۆ ئەو خاكو وڵاتە دێرینو ئەو دونیا پڕشکۆیە کۆچیان کرد.

مەلەك خانم گوتی: "ئۆووی، عەشق مرۆڤ دێنێتە گریان، مرۆڤ ناچار دەکات باس لەئازارو دەردی دڵ بکات. یانی جارێکی دیکە چیاکەم دەبینمەوە یان لەم دوورگە بچووکەدا دەنێژرێم؟ هەموو لایەکی هەر دەریاو ناتوانیت لێیڕەت بیتو بڕۆیت. یانی وابڕیارە تا رۆژی قیامەت لەناوەڕاستی ئەم دەریایە بمێنمەوە؟ ئەگەر دەریا دوورگە بۆ خۆی رابکێشێت ئەوا من گۆڕەکەم..".

پویراز کزەی لەدڵیەوە هاتو گوتی: "مەلەك خانم تۆ هەر کاتێك بتەوێت، من دەتبەمە چیا هەزار کانیەکەت. ئەگەر بتەوێت هەر ئێستا یان سبەی زوو دەتبەم".

"ئاااە، قوربانی پویرازی کوڕی خۆم بم، تۆ باشترین کەسێکی دونیایت، دەزانم دەمبەیتە چیای هەزارکانیو هەزار گوڵم، بەڵام ئایا هێشتاش ئەو چیایە هەزار کانیو

---

[1]- رۆژی خدرو لاس دەکاتە 6ی مانگی 5.

هەزار گوڵو هەزار ژنو پیاوو هەزار کەس کە دەستیان دەخستە نێو دەستی یەکدیو هەڵدەپەڕین، هەرماون؟ لەپشت ئەو چیایەدا ژنێك گۆرانی دەڵێت، گۆرانیەکە چیابەچیا دێت: "زوو وەرە زوو بەڕێزەکەم، زوو وەرە لەپشت ئەو چیایەدا مەمێنە، ئەوەی دەبێتە باعیسی دوو دڵان خێر لەخۆی نەبینێت. چیای هەزار کانیی خۆم هێشتاش هەر لەشوێنی خۆیەتی؟"

موسا ئاغا گوتی: "نەبینێت. باعیسی لێککردنی دوو دڵانو هەڵایسێنەری شەڕو شۆڕو دەربەدەری".

مەلەك خانم هەستا:

"وای، نیوەشەوە نەمانهێشت سوڵتان بخەوێت".

پویرازو قەدریی بەلەموانیش هەستانو گوتیان:

"بمانبوورە قوربان، خەومان لێزڕاندی تابەیانی".

"بەیانی زوو بەر لەخۆرهەڵاتن بۆ بەرچایی وەرنە ماڵی ئێمە".

مەلەك خانم گوتی: "منیش شیرتان بۆ دەدۆشمو بۆتانی دەنێرم. راستە کە بزنەکانی من ناگەنە ئاستی بزانەکانی خدر، بەڵام شیری بزنەکانی ئێمەش شیفابەخشە".

"هەربژیت مەلەك خانم".

"تۆش هەر ساغ بیت سوڵتانی خۆم".

"شەوێکی خۆش بوو؟"

پویراز گوتی: "خۆش بوو، زۆر".

"مەبەستم شارۆچکە نەبوو کوڕۆ".

"منیش مەبەستم شارۆچکە نەبوو دایێ".

"راستیت بووێت کچێکی باشە، جوانە. تۆ چ دەڵێیت خوا زۆر بەجوانی خوڵقاندویەتی".

"دایکە دەمەوێت بخەوم. سبەی کەللەی سەحەر بانگم بکە، مام ئاغا بۆ بەرچایی بانگهێشتنی کردووم".

خێرا جلەکانی داکەندو چووە نێو جێگاو یەکەسەریش خەوی لێکەوت. لێنا تابەرەو بەیان نیوەخەوو نیوەبێدار مایەوە. هێشتاش خۆر هەڵنەهاتبوو کە هەستابووەوە. یەکسەر پویرازی هەستاند:

"ئاو گەرمە، ریشت بتاشە، دەستو دەموچاوت بشۆ، پاشان بڕۆ ئەوان هێشتا هەڵنەستاون. چراکانیان رۆشنە".

پویراز لەژوورۆچکەی حەمامەکە روومەتەکانی کەفاوی کردنو بێئەوەی هیچ برینو رووشانێك لەروومەتیدا دروست بێت، ریشی تاشی، دەموچاوی شوشت، سەرو قژی شانەکرد، کەمێك کۆلۆنیای لەروومەتی هەڵسویی، چووەخواریۆو هەر لەگەڵ ئەوەی گەیشتە دەرگای باخچەکە سەیرێکی پەنجەرەکانی کرد، چراکان رۆشن نەبوون. چووە لێوار بەدەم چاوبڕینە پەنجەرەکان بەسەر لی لێواردا هەنگاوی نا. دوای ئەوەی چەند جارێك چووەخوارو هاتەوە سەرەوە. بێئەوەی لەماڵەوە دووربکەوێتەوە، لەکاتی گەڕانەوەیدا چاوی بەچرایەکی رۆشن کەوت. لەهەمان شوێن بەدەم چاو بڕینە چراکە راوەستا. کەمێك دواتر، دەرگای خانووەکە کرایەوە، سێبەرێك هاتە بالکۆنەکە. لەچەپو راستی روانی، پاشان گەڕایەوەو چووەوە ژووریۆ. سێبەرەکە ئەوی بینیبوو. لەچاوتروکانێکدا خۆی لەسەر پلیکانەکاندا بینیەوە. لەو ئانەدا دەرگاکە کرایەوە. زەهرا گوتی: "فەرموو، باوکم هەستاوەو چاوەڕێی تۆیە".

نەسیبە قۆرییێکی چینی کە هەڵمی لێهەڵدەستا بەدەستەوە بوو لەمەتبەقەکە هاتەدەرو گوتی: "بەخێربێیت".

موسا ئاغا نوقمی نێو بیرکردنەوەبوو. کەمێك دواتر هاتەوە سەرخۆی، هەستا، بەدەستی راستیەوە ئەوی گرتە باوەش، پێکەوە دانیشتنە سەرسفرەکەو یەکسەر بەرچاییەکەیان خواردو چوونە دەرەوە. کچەکان هێشتا چایەکەیان تەواونەکردبوو، هەستان. زەهرا بەسەرسوڕمانەوە پرسی: "پەلەی چیتان؟ مەلەك خانم هێشتا نەهاتووە".

موسا ئاغا گوتی: "ئێمە زۆرمان پەلەیە کچم، بەرلەوەی درەنگ دابێت دەچینە لای وەنەوشەکان، کاتێك مەلەك خانم هات پێیبلێن".

زەهرا سەری سوڕمابوو لەبەرخۆیەوە پێکەنی. یانی ئەگەر چەند کاتژمێرێك یان چەند رۆژێك درەنگتر چووبان وەنەوشەکان بەسەردەچوون؟ ئاوا خێرا!"

بەخێرایی لەپلیکانەکان چوونەخوار. لەسەرکانی ئاویان خواردەوەو بەرەو لای دەونجاڕەکە رۆیشتن. موسا ئاغا بۆ ئەوەی هەرچی زووتر وەنەوشەکان ببینێت وا دەڕۆیشت کە پویراز نەیدەتوانی خۆی پێبگەیەنێت. چوونە نێو دەوەنجاڕەکە. هێشتا تاوێکی باشی مابوو بۆ خۆرهەڵاتن. ئەو شنەبا نەرمەی کە دەشنا بۆنو بەرامەی جیاجیای لەگەڵ خۆیدا دەهێنا. لەوێوە دەریا سپی سپی دەینواند.

پویراز گوتی: "ئەگەر بچینە لێوار، دەریا ئێستا ئەرخەوانی دەنوێنێت".

موسا ئاغا گوتی: "ئێستا کە ئەم شنەبایە نەرمە هەڵیکردووە دونیا چەندە جوانە".

پویراز لەلایەك قسەی دەکردو لەلایەکی دیکە بیری لەیەکەمین ئەو ڕۆژە دەکردەوە کە هاتبووە دوورگە. دەریا وەکو ئەمڕۆکە سپی سپی بوو. شنەبایەکی وەکو ئەمەی ئێستای دەهات، بۆنو بەرامەیەکی لەگەڵ خۆیدا دەهێناو هەموو لایەك ڕەنگی وەنەوشەیی هەڵگەڕابوو. ئەوان ڕۆژان نەیدەزانی مەرگێك کە ناوی ڤاسیلی بوو، بووبووە ئیزرائیلی ئەو، هەروا هەرگیز بەزەینی دانەدەهات کە شێخی کۆچەرەکان بتوانێت لەم دوورگەیەدا بیدۆزێتەوە. چاوی بڕیبووە چیای ئیدا. لەو هەوا کورگەمێشەدا لەکاتێکدا کە دەوەنەکانی لێکدەکردنەوە، زەهرای لە بەرچاوان، بەخۆیو باڵای بەرزو چاوەشینو کاریگەرو گۆنا بەقووڵدا کەوتووەکانو قژە بۆرو بریسکەدارەکەیەوە بەرجەستە دەبوو. دەچووە هەر لایەك بیری لەهەرشتێك دەکردەوە، بەردەوام زەهرای دەبینیو هەموو هۆشو بیری هەر لای ئەو بوو. چیرۆكو داستانی زۆری لەبارەی چیای ئیداوە بۆ گێڕابوونەوە. موسا کازم ئاغا باش شارەزای ئەم ناوچەیە بووو ئاگاداری مێژووەکەی بوو. موسا کازم ئاغا پیاوێکی زۆر هۆشیارو بەئاگا بوو.

پویراز هەرزوو دەکەوتە ژێر کارتێکردنی ئەوەوەو تا دەهات ڕێزی بەرامبەر ئەو زیادی دەکرد. جگە لەوە لەوەی کە بەبەردەوامیەوە بەمام ئاغا ناوی دەبرد، هەستی بەڕەزامەندی دەکرد.

ئەوان ئەو کاتەی کە لەنێو دەوەنەکان بەرامبەر بەتەماشاکردنی دەریاو چیای بەرامبەریانەوە ڕاوەستابوون، ئاسمانی تاریك کەمێك ڕووناك بووەوە، دەریاو ئاسمانی پڕ لەئەستێرە بەڕەنگی وەنەوشەیی هەڵگەڕا. تاری جاڵجاڵۆکان کە لەدەوەنێکەوە بۆ دەوەنێکی دیکە چندرابوون دەرکەوتن. تەونەکان زۆر گەورە بوون. شەونمیان نیشتبووە سەر. دڵۆپە شەونمەکان لەگەڵ ڕۆشنبوونی دەوروبەر درەوشانەوەو کەمێك دواتر لەگەڵ ڕۆشنایی زیاتر دیارنەمان.

موسا ئاغا گوتی: "سەیر بکە، من لەهەموو تەمەنمدا تەونە جاڵجاڵۆکەی وا گەورەم نەبینیوون. جاڵجاڵۆکەکانی ئێرە چۆن چۆنین، ژەهراوین؟"

"نازانم. لەڤاسیلیشم نەپرسیوە. ئەو خەڵکی ئێرەیە، دەزانێت".

موسا ئاغا وا نوقمی سەیرکردنی ئەو جاڵجاڵۆکانە بووبوو کە وەنەوشەو چیای ئیداو دەریای سپی لەبیرکردبوو، بەنێو دەوەنەکاندا یەکڕاست بۆ سەر کانی دەڕۆیشتن کە لەپڕ موسا ئاغا ڕاوەستاو گوتی: "سەیر بکە کوڕم، ئەم ئاوە لەکوێوە دێت؟"

پویراز گوتی: "لەکانیڕا دێتو دەڕژێتە نێو دەریاوە".

موسا ئاغا گوتی: "کانیەکی چەندە جوانە، من لەهیچ جێگایەكو هیچ چیایەکدا ئاوێکی ئاوا زوڵاڵم نەبینیوە. مەلەك خانم نازانێت لەچیای ئیدای هەزارو یەك کانیەکەی ئەویشدا کانیەکی ئاوا پەیدا نابێت".

"لەچیاکانی تورۆسی ئێمەدا لەو جۆرە کانیانە هەن".

موسا ئاغا بەڕاوێژێکی لێبڕاوانەوە گوتی: "پێموانیە".

پویراز پێداگری نەکرد.

"بەڵکو نەشبن ئاغا. زنجیرە چیاکانی تورۆس هێندە درێژبوونەتەوە کە لەچوکوراڤاوە دەگەنە رۆژهەڵاتو رۆژئاواوە. ئێمە بەتورۆسەکان دەڵێین بین بوغا".

"ئێمەیش بەچوکوراڤا دەڵێین کلیکیا. ناوی چوکوراڤا لەمێژوودا کلیکیایە. هەروەك ناوی قازداغی ئیلدایە.

"سوپاست دەکەم ئاغا. من لەڤاسیلیم بیست کە ناوی چیای قازداغی ئیدایە کلیکیاشم لەتۆ..".

دەستی دانایە سەرشانی پویراز: "سەیر بکە پویراز کوڕم. ئێمە بۆچی بەم بەیانیە زووە هاتوونیەتە ئێرە؟"

"باخێرا دەست پێبکەین".

لەپێش دەوەنێکدا چۆکی دادان. لکی دەوەنەکانی بەرزکردنەوەو سەیری ژێرەوەی کردن. سەری بردە ژێر لکی دەوەنەکانو ماوەیەکی باش ئاوا هەموو رەگو ریشاڵی دەوەنەکانی تەماشاکردو لێیانوردبووەوە. پاشان سەری هێنایە دەرەوەو گوتی: "نیە ئاغا. تێپەڕیوە وەنەوشەی مل لار نیە، بەڵام رەگو ریشاڵەکانی هەن. دەتەوێت سەیری بکەین؟"

موسا ئاغا لەتەك ئەودا کەوتە سەر ئەژنۆ. داهاتەوەو سەری بردە ژێر لکەکان.

"ئەم گەڵاو ریشاڵانە هی وەنەوشەن، ئەم رەگە باریکانەش". هەر لکێك لای زۆری پێنج گوڵە وەنەوشە دەدا. بۆنو بەرامەکەشیان هەموو لا دەگرێتەوە".

"کەوایە ئەگەر دە پازدە رۆژ زووتر بهاتباین دەمانتوانی بیانبینم، ئەمانە تەنها لەژێر دەوەنەکان دەڕوێن؟"

"تەنها لەژێر دەوەنەکان..".

هەستان. ئەژنۆی شەلوارەکانیان تەکاند.

پـویراز گـوتی: "دەسـت هـەڵناگرم. سـەیری ژێـر هـەموو دەوەنـەکان دەکـەمو ئەگـەر هەبوون بانگت دەکەم. سەرتاسەری بین بوغا پڕە لەوەنەوشان".

"هەر بژیت کوڕم".

پویراز دەچووە پێش. لەپێش هەموو دەوەنێکدا چۆکی دەدایەوە. لەسـەر ئەژنۆکانیـدا وەردەچەرخا. بێوچان بەڕۆخ ئەو جۆڕاوە باریکەی کە لەکانیەکەوە دەهاتەخوار، دەهاتو دەچـوو. هـەردوو لای چـۆڕاوەکە بەچـیمەنی سـەوزو تـازە رواو داپۆشـرابوو. دوو هێڵـی سـەوزی چـیمەنەکان لـەدوو لای چـۆڕاوەکەی کـە لـەو کانیـەوە دادەڕژا خـوارەوە لـەژێر زنارەکانەوە هەڵدەقولاو تا دەگەیشتە دەریا درێژ بووبووەوە.

پویراز، هەرجارەو دوای هەستان لەپێش دەوەنێك دەیگوت: "سات بەسات ئومێدەوارتر دەبم. دواجار لەژێر دەوەنێکدا وەنەوشـە دەبیـنمو بۆنیـان دەکـەم. خـەریکین لەگوڵـەکان نزیك دەبینەوە. لەنێو گەڵاکاندا وەنەوشە دەبینین کە تازە وشك بوونەتەوە".

پـویراز لەبـەردەم دەوەنـەکان دادەنیشـتە سـەر ئـەژنۆو سـەری دەبـردە ژێـر لکـەکانو پاشان هەڵدەستاو دەچووە لای دەوەنێکی دیکە.

کـە لەکانیەکـە نزیـك بـووەوە بـۆ لای دەوەنێـك قەڵـەمبازی داو گـوتی: "دۆزیمـەوە، دۆزیمەوە، ژێر ئەم دەوەنە هەموو وەنەوشەیە. یەك!"

موسا ئاغا یەکسەر خۆی گەیاندە دەوەنەکە، چۆکی دادا، لکەکانی هەڵدانـەوە. سـەری بـردە ژێـر لکـەکان. بەسـەر ئـەژنۆوە لێیچووە پـێش. تفنکـەکانی کرابونـەوە. هـەموو لای دەوەنەکەی بەجوانی پشکنی. سەری بەرزکردەوە. روخساری نوقمی نێو شادی بوو.

"چ بۆنێك، چ رەنگێك!"

لێکێکە دووبارەی دەکردەوە: "چ بۆنێك، چ رەنگێك چ بۆنێك. چ رەنگێك!"

وەکو سەرخۆشان بەلاکەلاك بۆلای کانیەکـە رایکـرد، لـەڕۆخ کانیەکـە چـۆکی دادا، چـەند مسـتێك ئـاوی خـواردەوە، لەسـەر چـیمەنەکان دانیشـت، سـەری خسـتە سـەر ئەژنۆکانی، لەنێو خۆیدا خڕبووبووەوە. ئەم پارچە زەویە بچووکە لەناوەڕاسـتی ئـەم دەریایـەدا، لەباڵنـدان، لەجاڵجالۆکـە زەبەلاحـەکان بەتـەونی وەکـو مەلافەیانـەوە، لەخاڵخالۆکە سوورەکان بەخاڵی رەشیانەوە...

ئەو وردە تەپۆیانەی کە بەسەر ئاوەکەوە لەم سـەر بـۆ ئـەو سـەر دەخـزینو سێبەرەکانیان بەسەر وردە بەردەکانی ژێر ئاوەکە دەخشی. بێڕاوەسـتان لەمبـەر بـۆ ئـەو بـەر دەچوون. سێ،

چوار، پێنج لەو جۆرە تەپۆ وردیلانە لەگۆشەیەکی دیکەی ئاوەکە بەبێهیچ جووڵەیەك ڕاوەستابوونو چاوەڕێ بوون وەکو تیر لەمسەر بۆ ئەوسەری ئاوەکە بخزنو لەپڕێکدا دەستیان بەخزین کرد... هەموو شتێك، هەموو بوونەوەرەکان، زەردەواڵەکان، زیندەوەرە باڵڕەقەکان، هەموو شتێك دەتوانێتو بۆی هەیە کە لەهەمووجێگایەکەوە بهێتە ئەم دوورگەیە، بەڵام ئەم تەپۆیانەی کە بەسەر ئەم ئاوەدا دەخزن لەکوێو بۆچیو چۆن دەهێنە ئەم دوورگەیە؟ ئایا ئەمانە باڵندەیەك بەسەر باڵەکانی خۆیەوە یان زەردەواڵەیەك بەدەمیەوە یان مشێك بەسەر باڵیەوە یان تۆوێك لەگەڵ هەڵگردنی بایەك هێناویانن؟ یان ئەو وەنەوشانەی دوور لەڕووناکیو لەنێو تاریکی ئەنگوستەچاودا کە بۆنو بەرامەکەیان کار لەمێشکی ئێسقانی مرۆڤیش دەکات لەکوێی ئەم دونیایەدا هەن؟ ئەم شنەبایە ئاوێتەبووە لەگەڵ بۆنو بەرامەو شنەی شەوانە ڕۆژی لەکام لاوەڕادێت؟و بەزوویی دارهەنجیرەکانی بەردەگرنو هەر دارهەنجیرێك دەبینی هەنجیری زەردو شیرینی وەکو هەنگوین دەدەنو دارهەنارەکان هەناری پەمەیی هێندەی کەللەسەری منداڵێك، دارەمێوی ڕەزەکانو هەموو شتێك موعجیزە ئاسا. پیاو ناتوانێت باوەڕ بکات کە دوورگە بەم بچووکیە ئەوەندە دەوڵەمەندبێت. ئەگەر ئەم دوورگەیە ئەوەندە دەوڵەمەند بێت خوا دەزانێت ئەم دونیایە چەند دەوڵەمەندە. پەپوولەی باڵبزوێن بەسەر پەرەی گوڵو گەڵای دەوەنەکانەوە سەرباڵەکانیان مەخمەڵیی زێڕینو وەنەوشەییو ژێر باڵەکانیشیان سوورێکی بێهاوتایە. نەرمی، مەخمەڵی، هەموو بینەرێك سەرمەست دەکەن. وەکو بۆنو بەرامەی وەنەوشە مرۆڤ وڕوکاس دەکەن. هەروەها ئەسپەکان، جوان، ڕەسەن، خەمگین، چاوغەزاڵ، لەکاتی بازبازێندا لەو دەشتەدا دەخلیسکێنو یالیان وەکو قامیش ڕاست دەبێتەوە...

کە سەری بەرز کردەوە خەریکبوو نیوەڕۆ دادەهات. پویرازیش لەو لای کانیەکە دانیشتبووو پشتی بەبەردێکی نارنجیەوە دابووو نوقمی نێو خەیاڵان بووبوو. قژی بۆرو مەمکە لەرزانەکانی زەهرا، شوڕەشوڕی نزمی ئاوی زوڵاڵی کانیەکە، تیشکی هەتاو کە لەکانیەکەی دەدا.

هەروەها مەمکە بڕاوە خوێن لێچکاوەکانی کچانی ئێزدی کە لەگەڵ لی لێوارەکانی ڕووباری دیجلە تێکەڵ دەبوون، دابەزینی باڵندەکانی دەبینی، چاوەکانی دەگرت.

هەردووکیان پێکەوە هەستان. چوونە نێو دارزەیتوونەکان، بێئەوەی هیچ ئاخاوتنێك لەنێوانیاندا ڕووبدات هاتنە ئەسکەلەو لەسەر تەختەکان دانیشت.

لـەم سـاتە، لەپڕێکـدا زەهـرا بـەگۆنا بەقووڵداچـووەکانی‌و چـاوو دەسـت‌و بەهـەموو جەستەو لێوە بەبزەکانیەوە لەبەرامبەریان بەدیارکەوت. پویرازیش کاتێك ئەوی ئاوا دەم بـەبزەوە بینـی پێکـەنی. بـزەو زەردەخەنـەکانی ئـەوان بـۆ موسـا ئاغـاش گوازرایـەوە. ماوەیەك بەگەرمی پێکەنین.

موسا ئاغا گوتی: "وەنەوشەم بینین. وەنەوشەی مل لاری شینباو. هـەموو گیـانم بـۆنی وەنەوشەی گرتووە". بەچاوانی تژی میهر سەیرێکی زەهراو ئینجا سـەیری پـویرازی کـرد. زەهـراو پـویراز هەسـتی بەختـەوەریان لەچـاوانی ئـەودا بـەدیکردو لەپشـت ئـەو شـادی‌و بەختەوەریەشدا خەمێکی قووڵی بێچارەسەر.

"بەیانی دوای ڕۆیشتنی ئێوە نیشانچی هاتەماڵەوە. چەندین جـۆرە ماسـی بـۆ هێنـاین. ماسییێکی گەورەی سووریشـی هێنـابووو گـوتی بـەم سـوورە ماسـیە سـووپ دروسـت بکـەن. منیش پێمگوت چۆن سووپ بەمە دروست بکەین؟

گوتی مـن ئێسـتا دەڕۆم بـەلێنا دەڵـێم بێـت‌و پێکـەوە دروسـتی بکـەن، مـن زۆرکـارم هەیە، دەڕۆم، گوتی هـەموو  ماسـیەکانی دەریـاو ماسـیخوازەکانی دێهـات‌و شارۆچـکەکان چاوەڕوانی منن‌و ڕۆیشت. هەر ئەو ڕۆیشت لێنـا هـات. سـووپێکی ماسـیمان بـۆ دروسـت کردوون کە هـەم سـیری تێدایـەو هـەم سـرکەی هـەنار. لێنـا زۆر بـاش شـارەزای لێنـانی خواردنی ماسیە. بڕیارە هەموو خواردنەکانم فێر بکات، ئەوسا منـیش هـەموو ڕۆژییێـك خواردنی ماسیشان بۆ لێدەنێم".

"تۆ ئێستا پێمبڵێ ئەو خواردنە ماسیەی کە باسی دەکەیت، ئامادەیە؟"

زەهرا وەکو کچۆلەیەکی دە ساڵە سوورو سپی هەڵدەگەڕاو پێدەکەنی‌و گاڵتەی دەکرد.

"دەبـوا نیشانچیشـی بـدیبا، دە، پـازدە سـاڵ گـەنجتر بووبـووەوە، حـەجمانی نـەبوو، لەخۆشحاڵیان ئۆقرەو ئارامی لێهەڵگیرابوو".

"سفرە ئامادەیە؟"

"سفرە ئامادەیە، بەڵام سووپەکە ساردبۆتەوە، گەرمی دەکەمەوەو ئاگادارتان دەکەمەوە".

بەڕاکردن چووەدەر.

"خوێنی جەستەم بۆنی وەنەوشەی لێدێت‌و ڕەنگی وەنەوشەی گرتوە".

"با بەهار بێتەوە، مرۆڤ وەنەوشەکان وەنەوشە شینەکانی ژێـر دەوەنـەکان بـۆن بکـات. جارێ با بەهاربێت. جارێ بابگەینەوە بەهار".

موسا ئاغا گوتی: "ئاااااه، ئااااه، ئاه، ئااه، پویراز کوڕم من تا زستان دادێت دەگەڕێمەوە کرێت. دەگەڕێمەوەو هەر لەگەڵ هاتنی بەهاردا رادەکەمو دەچم رادەکشێمو ژێر دەوەنەکانو وەنەوشە مل لارە شینباوەکان بۆن دەکەم. بۆنیان دەکەمو ئێوەو دوورگەو دۆستانو وەلی نیشانچی بەبیردێنمەوە".

وەك ئەوەی ئاوت بەسەر پویراز داکردبێت لەجێی خۆی رەق هەلات. ئەو پێیوابوو ئەو پیاوەی کە بەتەمابوو لێرە کێڵگەیەك بکرێت، ئەم، ئەم پیاوەی کە شەیدای وەنەوشەکانە، ئیدی بەتەمانیە بچێتەوە کرێت. زۆر باشە کاتێك، دەگەڕێتەوە کرێت ئەی کچەکانی دادەتە کێ؟ دەیانداتە کێ؟ ئایا بەڕاستی لەوێدا تورکێك، موسڵمانێك ماوەتەوە؟ موسا ئاغا لەسەریەك قسەی دەکرد، لەکاتێکدا کە پویراز لێوی لێکنەدەکردەوە. موسا ئاغا کاتێك نیگای کەوتە سەر روخساری پویراز سەیریکرد رەنگی مردووانی گرتووە. رێك لەم ساتەدا زەهرا هات. زەهرا بەبینینی روخساری پویراز هەستێکی سەیری لادروست بوو، گوتی: "سووپەکە خەریکە گەرم دەبێتەوە".

پویراز بەزەحمەت پشتی خۆی راستکردەوە، هەستا بەلاکەلاك بەرەو ماڵ بووەوە. چوونە سەرەوە، زەهرا بەقابلەی هەڵماویی سووپەوە هاتە سەر مێزەکەو قابلەمەی دانایە سەر قاپێکی دارینەوە. کونی لووتیان بەبۆنی ماسی کرایەوە. موسا ئاغا باش شارەزای ئەو بۆنە بوو، لەکاتێکدا ئەمە جاری یەکەم بوو کە پویراز لەو جۆرە سووپە بخوات، تا دەهات روخساری زیاتر بەیەکدادەچووو گرژبوونی بەخۆوە دەگرتو ئەم حاڵەتەی پویراز موسا ئاغای نیگەران دەکرد.

"تا بەهار ئێمە لەم دوورگە جوانە دەگەڕێینەوە بۆ وڵاتمان بۆ زێدی باوو باپیرانمان. دەڕوێنەوە، بەڵام نیوە گیانمان لێرە بەجێدەمێنێت. تەنها ئەوە دەبێت بزانن کە لەمەودوا ئێرە نیشتمانی دووەمی منە، ئەم دەریایە هێمنە. من ئەم کێڵگەیە هەروا لەخۆڕا دروست ناکەم. مەگەر کرێت چەند لێرە دوورە، شەش مانگ جارێك، لانیکەم ساڵی جارێك بۆ سەردانی دۆستەکانمو هەروەها بۆ بینینی ئەسپەکانم دێمەوە ئێرە".

رووی کردە زەهرا. نەسیبە لەتەکیەوە بوو.

"هەموو ساڵێك لەوەرزی بەهاردا دێینەوە ئێرە. مەگەر نا زەهرا، نەسیبە؟"

زەهرا گوتی: "هەروایە باوکە".

نەسیبە گوتی: "دێینەوە".

"دەبینە میوانی پویرازی کوڕم".

"دەتانخەمە سەر سەرم".

"ئەگەر پویرازی کوڕم بیەوێت لەگەڵ ئێمە دێتە کرێت".

"سوپاست دەکەم قوربان".

موسا ئاغا چاوە شینەکانی برینە دوڕ چاوەکانی پویراز. روخساری پویراز بەتەواوی گۆڕابوو، چاوەکانی پێدەکەنین، زەهراش هەروا.

"خۆشحاڵ بووم کوڕم".

"چۆنی تۆ بڵێیت ئاغا. مانەوەشم لەدوورگەدا باش نیە ئاغا".

تروسکایی ئومێد زابووە دڵیەوەو هەستی بەئارامی دەکرد. پویراز لەمە بەدواوە نەیدەزانی چی دەخوات. هەر ئەوە بوو شتێکی دەخوارد. هەستی بەئاسوودەیی دەکرد.

نەك هەردەچووە کرێت، دۆزەخیش با دەچوو. ئەگەر بچووبایە کرێت هەم لەمەرگ رزگاری دەبوو هەم بەمرازی دڵی خۆیشی دەگەیشت. بەتیرێك دوونیشانە.

"فەرمایشتان سەرچاوم ئاغا. تۆ بۆ هەر جێگایەك بچیت".

"سەلامەت بیت کوڕم. مرۆ دەتوانێت ئەم دوورگە جوانو بەهەشتیەو ئەم وەنەوشە لارانە بدۆزێتەوە، ئەم چیا پیرۆزەی ئیدا ببینێت، دوورگەیەك بکڕێت کە کانیەکی لەناوەڕاستەوە بێت، لەگەڵ کەسانێکی ئاوا باش ببێتە دۆستو برادەرو دراوسێو پاشان هەموو ئەمانە جێبهێڵێتو بڕوات؟"

پویراز گوتی: "ناتوانێت بڕوات، بەڵام چیبکات؟"

سەیرێکی زەهرای کردو پێکەنی.

پویراز بێئەوەی چاو لەسەر زەهرا لابدات، هەستا:

"رێگەم پێدەدەن زەحمەت کەم بکەمەوە، دەمەوێت بچمەوە ماڵ".

موسا ئاغاش هەستا.

"بەسەلامەت کوڕم، شەوشاد".

هەرسێکیان تا بەردەرگا لەگەڵی چوون. موسا ئاغا دەستی خستە نێو دەستیو لەتەك یەکەوە لەپلیکانەکان چوونەخوار.

موسا ئاغا هێندە شاد بوو کە کارێکی کردبوو قەت نەیکردبوو، پویرازی گرتە باوەشو ماچی کرد.

ئەو شەوە تا بەیانی پویراز لەنێو جێدا گێنگلی دا. کاتێك خەوبردیەوە کە بەرەبەیان بوو. لەم دوورگەیەدا هەرچەندە درەنـگ بخـەوتبا بـەیانیان لەگـەڵ رووناکبوونی ئاسـۆگە هەڵدەستا، بەڵام ئـەمجارە عەسـریش داهـاتبوو پـویراز هێشـتا لەخـەو هەڵنەسـتابوو. لێنـا لەمە نیگەران بووبوو، دەم نادەم بەسەرو سەدا دەهاتـە ژووری پـویراز، بـەڵام نەیـدەتوانی لەخەوی هەستێنێت.

دەنگی قـەدریی بەلـەموان لـەژێر چـنارەکانەوە هـات: "لێنـا، لێنـا، لێنـا، لێنـا، لێنـا، سـەرۆك پویراز لەکوێیە، بەدوایدا دەگەڕێن".

"وەرە ئێرە قەدریی".

قەدریی بەلەموان لەخوار پلیکانەکان هەناسە بڕکێی پێکەوت.

"بەلەموانۆ بچـۆ سـەرەوە لەخـەوی هەڵسـتێنە، رۆژ خەریکـە ئـاوا دەبێـت هێشـتا هـەر خەوتووە. کارێکت پێی هەیە؟"

"من کارم پێی نیـە، لەشارۆچـکەوە دوو کەسـم هێنـاون، هـەردووکیان دکتـۆری سـوپان بەدوای سەرۆك پویرازدا دەگەڕێن".

"بچۆ سەرەوە بانگی بکە. دڵم نەهات هەڵیبستێنم".

قـەدریی بەلـەموان پلیکانــەکانی دوو دوو بــڕین. ئــەو دەنگــە دەنگــەی لەپلیکانــەکان دروست بووبوو هەموو کەسی لەخەو هەڵدەستاند، بەڵام پویراز هەر هەڵنەستا.

"سەرۆك پویراز، سەرۆك پویراز، هەستە میوان هاتوون".

چـووە ژووریێ، لـەڕۆخ نـوێنی پـویراز دانیشـتو بەهاوارکردنێکـەوە گـوتی: "سـەرۆك پویراز، سەرۆك پویراز، لەخەو هەستە سەرۆك پویراز".

پویراز لەخەو راپەڕی، چاوەکانی هەڵگلۆفی سـەیری چـەپو راسـتی کـردو خـەریکبوو دووبارە بخەوێتەوە کە بەلەموان بەتاسـاویەوە بـانگی کـردەوە: "سـەرۆك پـویراز، سـەرۆك پویراز!". پویراز وڕوکاس چاوی بڕینە قەدریی بەلەموان.

لەئەسکەلەن. بەلەمێك شمەکیان پێیـە. سێ کـەس خـەریکن شـتەکانیان دادەگـرن. هـەر شمەکەو دەیهێننەخوار، بەڵام تەواو نابێت، گردێك شمەك لەسەر ئەسکەلە کەڵەکە کراوە".

پویراز هێشتا وڕوکـاس بـوو: "تـۆ ئـەوە چـیدەڵێیت بەلـەموان؟ چـیدەڵێیت؟ چـی کەڵەکە کراوە؟"

"شمەك، شمەکی ئەو دوو کەسە".

"کام دوو کەس؟"

"دکتۆرەکانی سوپا".

"دکتۆر؟"

"دوو دکتۆر، یەکێکیان ڤاچێکی دەستکردنی هەیە. یەکێشیان گۆجە. ئەوەی کە ڤاچی دەستکردە گوێچکەیەکیشی نیە. دکتۆری بێگوێچکە".

"تۆ زوو بچۆ بەلەموان، من خێرا جلەکانم دەپۆشم‌و دێم".

پویراز خێرا جلەکانی پۆشی، ریشی تاشی‌و چووەخوار، بەنەرمە راکردنێکەوە چووە ئەسکەلە. دکتۆر سەلمان سامی بەپێکەنینەوە هاتەپێش پویراز، لەدڵی خۆیدا گوتی وای مانگامان زا خوا بەندەکانی خۆی لەدەست ئەم دکتۆرە بپارێزێت.

"بەخێربێیت جەنابی سەرگورد، سەفاو خۆشیتان هێنا. خۆشحاڵتان کردین".

یەکدیان گرتە ئامێز.

"ئەمە دکتۆر خەلیل رەفعەت بەگە. لێرە پێکەوە لەم کلێسایە لەچاناك قەڵا بەسەربازە بریندارەکان رادەگەیشتین".

"بەخێربێن جەنابی دکتۆر".

"ئەمە هەمان ئەو کاك پویرازەیە کە بۆم باسکردیت. یەکێك لەو تاك‌و تەرا ئەفسەرانەیە کە لەبەرەی چیای ئەللاهوئەکبەر ماونەتەوە".

خەلیل رەفعەت گوتی: "سەیرە کەوابوو کەسێك لەچیای ئەللاهوئەکبەر بەزیندوویی دەربازی بووە! یەك کەس لەنەوەد هەزار کەس!"

"یەك کەس نا، دە کەس".

"لەنەوەد هەزار کەس، دە کەس ها!"

"تا ئەوەندەی من ئاگاداربم".

"لوتفی ئەسپێیان بووە. دیارە ئەسپێکان لەخواردنی خوێن تێربوونەو گوتوویانە با ئەم دە کەسە بەئەنوەر پاشا ببەخشین".

پێکەنین.

"بەلەموان تۆ برۆ بانگی ڤاسیلی بکە، خێرا بابهێت کارمان پێیەتی. سڵاو لەمام ئاغاش بکە، پێیبڵێ میوانەکان هاتوون. بابفەرمووێت بۆ ژێرچنارەکان".

چوونە ژێرچناران، لەسەر تەختەکان دانیشتن. پویراز باسی موسا ئاغای بۆ دکتۆرەکان کردو باسی بۆ کردن کە لەکرێتەوە هاتووە. لەوێ کێڵگەی هەبووە، ئەسپی

ڕەسەن‌و زۆرباشی بۆ شارو لۆردەکانی ئەوروپا بەخێو کردوون. ئێستا لەلێوارەکەی ئەوبەر کێڵگەی کابرایەکی یۆنانی کڕیوە. کاتی گۆڕینەوەو ئەودەمەی بۆ ئێرە هاتوون ژنەکەی مردووە. ئەو کاتەی خەریکبوو باسی ئەوەی بۆ دکتۆرەکان دەکرد کە موسا ئاغا تەرمی خێزانەکەی فڕێ دەداتە دەریا، موسا ئاغا بەدیار کەوت. هەمووان پێکەوە لەبەری هەستان.

موسا ئاغا گوتی: "بەخێربێن، سەفاتان هانی". دانیشتن.

"بەڕێز سەرگورد دکتۆر سەلمان سامی، بەڕێز سەرهەنگ خەلیل ڕەفعەت".

"هەردووکمان بەهۆی کەمئەندابوونمانەوە خانەنشین کراوین، قوربان هەموو ئەو ئەفسەرانەی کە لەجەنگی چاناك قەڵا دەربازیان بووەو ماون خانەنشین کراون".

موسا ئاغا بەسەرسورمانەوە گوتی: "کەواتە جەنگی چاناك قەڵا ئاوا بووە!"

"جەنگێك بوو کە هەموو ئەنەدۆڵی هەڵلووشی، ڕەگ‌و ڕەچەڵەکی لەنێو بردین، ریشەی ژیانی وشك کردین".

"ئیمپراتۆریای گەورەی عوسمانی تارومار کرد. ئیدی دەتەویست چ ببێت، ملیۆنان کەس لەسەر ماڵ‌و حاڵی خۆی ئاوارەو دەربەدەر کرد. تۆوی دوژمنکاری‌و دووبەرەکی خستە نێو خەڵکەوە".

"ئەوانەی لەدوای جەنگ زیندووماون گشتیان کەمئەندامن، نیوەیان مردوون. هەرکەسێك کە لەشەڕدا بەشداری کردبێت ئیدی هەمان کەسی جاران نیە. بووەتە کەسێکی کەمئەندام‌و نائومێد. ئەوانە تازە تا ماون بەختەوەری بەخۆوە نابینن، بۆ لەبیرکردنی ئەو دونیا دزێوە بەردەوام بەدوای جێگایەکی ئاوا چۆڵ‌و ئارامدا دەگەڕێن".

"بەڵکو دوورگەیەکی ئاوا کە خواوەند بەوپەڕی وردەکاری‌و وەستاییەوە دروستی کردووە ببێتە هەتوانێك بۆ برین‌و ئازارەکانیان. من شارو زێدی خۆم بەجێهێشت، هاوسەرەکەم لەنێو کەشتیدا مرد، خۆم تەرمەکەیم فڕێ دایە نێو دەریا، بووە خۆراکی ماسیان. ڕەنگبێت بڵێن ئەگەر لەوشکانیشدا بنێژرابوا دەبووە خۆراکی مارو مشك‌و زیندەوەرە خاکیەکان".

ڤاسیلی هات، پویراز گوتی: "ڤاسیلی، نزیکترین هاوڕیی منە، لەو کەسانەیە کە لەچاناك قەڵا جەنگاوە، پاشانیش لەکاتی جەنگی سەربەخۆیی لەفەوجی کارگەرەکاندا بووە، لەم دوورگەیەدا گەورە بووە".

دكتۆر سەلمان سامی پرسی: "ئەی چۆن گۆڕینەوە نەیگرتۆتەوە؟ نەكا كاك ڤاسیلی قارەمانی جەنگی سەربەخۆیی بێت؟"

"نەخێر قوربان، ئەو لەدایكبووی ئەستەنبۆلە، دەزانیت قوربان بەپێی ئەو بڕیارەی كە لەكۆنفرانسی لۆزاندا وەرگیراوە گۆڕینەوە ئەستەنبۆڵی و گومو لجینەكان ناگرێتەوە".

ڤاسیلی هێشتا بەپێوە راوەستابوو:

"فەرمووو قوربان، فەرمایشكتان هەیە؟"

پویراز گوتی: "ڤاسیلی دەكرێت تكایەكت لێبكەم، دكتۆرە بەڕێزەكان بۆ ماڵەكانیان رێنوێنی بكەیت؟"

ڤاسیلی گوتی: "سەرچاوان قوربان، دكتۆر بەخێربێن".

دكتۆرەكان گوتیان: "سوپاس"و هەردووكیان هەستان.

"فەرموون دانیشن بەڕێزان نانی بەیانی بخۆین. لەو ماوەیەشدا بەلەمەكە دادەگرن‌و شمەكەكانتان هەڵدەگرین‌و دەیانبەینە ماڵەكانتان".

چاوەڕێ بوون تا بەرچایی هات. لێناو بەلەموان، ڤاسیلی، هوسمەن بەرچاییان بەخوانچەیەك هێنا، قاپ‌و چەنگاڵ‌و كەوچكەكانیان دانانە سەرمێزێك كە رووميزێكی لەسەر راخرابوو. بۆنێكی خۆشی چا لەو قۆریە هەڵماویە جوانەدا بڵاودەبووەوە. ڤاسیلی چای تێدەكردە ئەو پیاڵە لێوپانە زێڕینانە.

لەسەر مێزەكە كەرە، هەنگوین، پەنیرو زەیتوونی جیاجیا، بیبەری سەوزی تازە، تەماتەو نانی تەنوور داندرابوو.

دكتۆر سەلمان سامی وەك كەسێك نانی دەخوارد كە چل رۆژبێت هیچی نەخواردبێت‌و دەیگوت: "چەندین ساڵە، ساڵانێكی زۆرە بەرچایی ئاوام نەخواردووە. بەخوا نەمخواردووە".

نانخواردنەكە درێژەی كێشا. لەو میانەدا مەلەك خانم پزیشكی ئاژەڵان‌و هوسمەنیش هاتبوون‌و لەسەر كاناپەكان دانیشتبوون. پویراز ئەوانی بەدكتۆرەكان ناساند.

"جگە لەئێمە چەند كەسێكی دیكەش لەدوورگەدا هەن. ئەمشەو هەموویان بۆ میوانداریەكەمان دێن".

"قوربان، ئەمەشیان پزیشكی ئاژەڵانە، لەنیشتەجێ دێرینەكانی دوورگەیەو ئەفسەریشە".

"خۆشحاڵم قوربان".

دكتۆر سەلمان گوتی: "دوورگەكەمان باش ئاوەدانە".

هوسمەن گوتی: "بەزوویی پڕ دەبێت، کەس بەم بەهەشتە نازانێت. بەمزووانە دوورگە واپڕدەبێت لەخەڵك دەرزی هەڵاوێیت بەعەرزی نەکەوێت، هەرکەس ئەم دوورگەیە ببینێت دڵی نایەت بەجێی بێڵێت".

پویراز کە سەیری ڤاسیلی کردبوو، گوتی: "کێ دەچێتە ماسیگرتن؟"

ڤاسیلی گوتی: "من دەچم، با خانووەکانیان نیشان بدەم ئینجا دەڕۆم".

کەوتە پێش. هاتنە ئەو دوو خانووەی کە دیوار بەدیوار بوونو دوو خانوو ئەو لاتری خانووەکەی موسائاغا بوون.

"خاوەنی ئەم خانووانەش وەکو خاوەنی خانووەکانی لای دەربەندەکە دەوڵەمەند بوون. کەسانێکی باش بوون. زۆر لەماڵەکانیان نەدەهاتنەدەر. وەکو ئەوە وابوو لەو دوورگەیەدا نەبن. خەڵکی دوورگە کاتێك بۆ یۆنان دەڕۆیشتن ئەمانەیان لەنێو خەڵکەکە نەبینی".

خانووەکان لەنێو باخچەدا دروست کرابوون. هەر باخچەیەکیش سێ دارهەناری تێدابوو. بەری ئەو دارهەنجیرە گەورەیەی کە لکەکانی بەسەر پەرژینی باخچەکە بۆ دێوی دەرەوە شۆڕ بووبوونەوە، زەرد بووبووو هەنجیرەکان لەشیرینیان ڕەواقیان دەردابوو. لەمسەر بۆ ئەوسەری باخچە تەماتە، بیبەرو باینجان چاندرابوون. لەگەڵ ئەوەشدا کە باخچەکە لەبەر بێئاوی وشك بووبوو کەچی لەژێر بڕکە تەماتەکاندا کە هێشتا تەڕاتیان مابوو تەماتەی سوور بەدی دەکران.

ڤاسیلی گوتی: "خەلیل ڕەفعەت بەگ فەرموو قوربان، ئەمە خانووی تۆیە، کلیلکەی لەسەرە، بێکەرەوە بچۆ ژوورەوە. پیرۆزتان بێت".

بەرەو خانووی دووەم هەنگاوی هەڵێنا، دکتۆر سامی سەلمانیش کەوتە دوای، هەردووکیان پێکەوە گەیشتنە بەردەرگای خانووەکە.

"فەرموو کاکە سەلمان سامی کلیلکە لەسەر دەرگایە. پیرۆزتان بێت".

ئەوان چوونە ژوورەوە. ئەوانیدی کپو بێدەنگ لەنێو باخچەکە چاوەڕێ مان. هەنجیرێکی گەورە لەگۆشەی باخچەی لای دەریای خانووەکەی سەلمان سامی هەبوو، زۆری نەمابوو بەری هەنجیرەکە پێبگاتو شیلەی هەنجیرەکان لەدەمیانەوە بڕژێت.

ئەو باخچەیە ڕێك وەکو باخچەی خەلیل ڕەفعەت بەگ وابوو، بەتەماتەی سووری گەورە گەورە، بیبەری وشکەوەبوو، باینجانو بڕكو ڕەگو ریشاڵی تەماتەکانەوە. کەمێك دواتر، دکتۆرەکان لەخانووەکانیان هاتنەدەرو چوونە ژێرچنارەکان.

پویراز بەخەلیل رەفعەتی گوت: "دکتۆر، هوسمەن‌و قەدریی بەلەموان لەگەڵ خۆتدا ببەو بچنە ئەسکەلە، لەوێ شمەکەکان جیابکەنەوە با برادەران بۆتان بگەیەننە ماڵەوە".

کەلوپەلێکی زۆر لەبەلەمەکە داگیراو سەر هەموو ئەسکەلە پڕبوو لەکورسی، مێز، کاناپە، مافوور، پەردە، تەختی خەوی فلزی‌و قوتووی داودەرمان.

شمەکەکان تێکەڵ یەك بوون. جیایانکردنەوە، خەلیل رەفعەت شمەکەکانی خۆی بردنە ماڵەوە.

خۆر خەریکبوو ئاوا دەبوو کە کاری گواستنەوەی شمەکەکان لەئەسکەلەوە بۆ ماڵی دکتۆرەکان تەواو بوو.

ماوەیەك پێشتر ئاگرێکی خۆش کرابووەوەو خەریکبوو دادەمرکایەوەو دەبووە پشکۆ.

ڤاسیلی‌و پزیشکی ئاژەڵان کە چووبوونە ماسیان زۆریان پێنەچوو، بەلەگەنێکی پڕماسیەوە گەڕانەوە. ماسیەکانیان رۆکردنە نێو سەتڵەکان‌و بردنیانە لێوارو بەوردی دەستیانکرد بەپاککردنەوەیان، لێناو مەلەك خانمیشیان هاتنە یارمەتی. ئەو ماسیانەی پاکیان کردبوونەوە هێنایان‌و دایاننانە سەر پشکۆکان. بەر لەهەموو شتێك شەراب‌و راکیان هێنابوو. پویراز دوو لەماسیە سوورکراوەکانی هێناو داینانە نێو قاپەکانی سەلمان سامی‌و خەلیل رەفعەت. ماسیی سێیەمیشی بۆ موسا ئاغا دانا. هوسمەن بەپویرازی گوت:

"تۆش دابنیشە". پویراز دانیشت. مەرجانە ماسیێکیان هێناو. دایاننایە نێو قاپەکەی ئەوەوە. سەرپەنگرەکان پڕبووبوو لەماسی. دووکەڵێکی چڕ لەماسیەکان بەرزدەبووەوە. بۆنی ماسیی سوورکرایەوە ئەو ناوەی داگرتبوو.

هەموویان لەدەوری مێزەکە دانیشتبوون‌و لەناو هەر قاپێکدا ماسیەك داندرابوو. دوای هەمووان ڤاسیلی قاپێك بەدەستەوە هات‌و لەپشت مێزەکە دانیشت، پویراز پەرداخەکەی ئەویشی پڕکردبوو لەشەراب.

پویراز پەرداخەکەی خۆی بەرزکردەوەو گوتی: "بەخۆشی، دکتۆرە خۆشەویستەکان، بەخێربێن بۆ دوورگەکەمان. ئەم دوورگە بەر لەئێمە هی ئێوەیە. جەنابی سەرگوردی هێژا جەنابی سەرهەنگی هێزا بەخۆشیتان".

تێکڕا پەرداخەکان بەرزکرانەوەو لێکدران.

"لەچاوترووکانێکدا چوون ماسیتان گرتن‌و گەڕانەوە. چۆن ئەوەندە زوو توانیتان ئەو هەموو ماسیە بگرن؟"

"لەسایەی وەلی نیشانچیەوە. نیشانچی هەندێك جێگای نیشان داین كە لەرەلەریان بوو لەماسی، وەكو خیزو چەوی رووباران ماسی رژابوونە ئەو جێگایانە. هەر قولابمان هەڵداو ماسیمان راكێشا، هەڵمان داو رامانكێشا. هەر زوو لەگەن پڕبوو لەماسیو گەڕاینەوە".

پویراز پرسی: "نیشانچی چیلێهاتووە ماوەیەكە نایبینین؟ هەر نایەتە دوورگە نایەتە سەردانی نەوەكانیشی؟"

"زۆر دەمێكە كەس لەم ناوە نایبینێت، بەڵام جگە لەئێمە هەمووان دەیبینن، نیشانچی لەم دەریایەدا ناوبانگی دەركردووە. دەڵێن ماسی لەدەریادا نەهێشتن. ماسیەكانیش لەم دەوروبەرەو لەجێگاكانی دیكە دەگرێتو دەیانباتە گوندو شارۆچكەكان، هەر لەم ناوانە دەیانفرۆشێت دوور ناكەوێتەوە. دەچێتە ئەو گوندو شارۆچكانەی كە هێشتا ماسی پێنەفرۆشتوون، لەوێ لەلێوار دەریا رادەوەستێتو سەیری دەریا دەكات، شوێنی ماسیەكان دەدۆزێتەوەو بەئەحمەد ئێژێت ئەحمەد كوڕم بۆ ئەو لایە لێخوڕە.

ماسیان دەگرێت. لەگەنەكان پڕ دەكاتو دەچێتە ئەو گوندو شارۆچكە نزیكانەی ئەو دەوروبەرەو لەسەر ئەسكەلە بەدەنگی بەرز هاوار دەكات. جا دەنگێكیشی هەیە كە هاوار دەكات ئەوسەری گوند گوێی لێدەبێت. كاتێك سەر ئەسكەلەكە قەرەباڵغ بوو ماسیەك لەناو لەگەنەكە هەڵدەگرێتو ماسیەكە لەبەرامبەر خۆر رادەوەشێنێت. ماسیی دووەمیش بەهەمان شێوە هەڵدەگرێتو لەبەرامبەر تیشكی خۆر رایدەوەشێنێت. ئینجا دەڵێت: "ئەحمەد ماسیەكانم بدەرێ". تا شەو دادێت هەموو ماسیەكان دەفرۆشێت. ئەوەندە ماسی گرتوونو فرۆشتوونی. ئەوەندەی گرتوونو فرۆشتوونی. ناو بەلەمەكەی پڕ دەكات لەپارە". ئەو شەوە لەبارەی شارۆچكە قسەیان كردو هەروەها باسی نیشانچیان كرد. هەموویان ئەوەندە شەیدای نیشانچی بوون كە پێنەدەچوو قسەكردن لەبارەی ئەو ئاوا بەئاسانی تەواو ببێت.

سەلمان سامی گوتی: "لەم دونیایەدا كەسانێكی وا هەن. لەجەنگیشدا كەسانێكی وامان بینیون، كارەساتی دڵتەزێنمان بەسەرهاتوون. سەربازێكی خەڵكی ئورفامان هەبوو كە پێماندەگوت حاجی كەكۆ، كوڕێكی قەڵەوی كورتەباڵا بوو، رۆژێك ملازمەكەیان فەرمانی بەحاجی كەكۆ دابووو پێیگوتبوو بڕۆ ئەو عەمبارەی تەقەمەنیەی خوار ئەو گردەی بەرامبەرمان بتەقێنەوەو وەرەوە. حاجی كەكۆ خۆی ئامادەكردو گوتی دەچم دەیتەقێنمەوە. ئێمە هەموومان سەرمان سووڕمابوو كە حاجی كەكۆ چۆن بەڕۆژی

رووناك‌و بەنێو ئەو هەموو سەربازەی دوژمندا دەیەوێت ئەو کارە بکات؟ چاوەڕێمان کرد. دەمەدەمی عەسر، کاتێك دونیا کەمێك تاریك داهات. لەپڕێکدا لەخوار تەپۆلکەکە دەنگی تەقینەوە بەرزبووەوەو هاوکات گڕو بڵێسەی ئاگر ئاسمانی رووناك کرد، زەوی ژێر پێمان لەرزی، دەتگوت بەردەکان خۆیان پێکداداوە... نەخواردنمان خواردو نەئاومان خواردووە. زۆر بۆ حاجی کەکۆ نیگەران بووین ، لەنیگەرانیدا دڵمان لای خۆمان نەمابوو، تا نیوەشەو ئاوا چاوەڕێیمان کرد، لەپڕ سەیرمان کرد واحاجی کەکۆ بەرامبەرمانەو خەریکە راپۆرتی خۆی دەداتە ملازمەکەمان: فەرماندە چوومەخوار تەپۆلکەکە، عەمباری تەقەمەنیەکەم دۆزیەوەو یەکسەر تەقاندمەوە. بەڵێ کەسانی ئاواش هەن. لێمانەپرسی چۆن توانیت لەنێو ئەو هەموو سەربازەی دوژمن ئەم کارە بکەیت. بمانپرسیبا چ دەبوو، حاجی کەکۆ منەمنێکی دەکردو نەیدەتوانی هیچشتێکمان بۆ روون بکاتەوە. نەمانتوانی پرسیاری لێبکەین".

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "بەکورتی ئاوا".

خواردنەکان تەواوو بتڵەکان بەتاڵ بووبوون، کەچی کەس لەجێی خۆی نەدەجووڵا، لەکاتێکدا موسا ئاغا خەوی لێکەوتبوو. مەلەك خانم کە ئەوی بینی گوتی: "زۆر لەنیوەشەو تێپەڕیوە. چیوای نەماوە دونیا رووناك دابێت. خوا دەزانێت ئەم میوانانە لەچ جێگایەکی دوورەوە هاتوون. ناڵێن چەند ماندوون‌و چەند پێویستیان بەخەو هەیە. نیشانچیش لێرە نەبێت وەك ئەوە وایە لێرەبێت، لەم دەریا گەورەیەدا ماسیەکی نەهێشتۆتەوە".

پویراز هەستا:

"دکتۆرەکان ئەمشەو لەماڵی ئێمەدا دەمێننەوە".

دەستی خۆی دانایە سەرشانی ڤاسیلی کە دانیشتبوو:

"تۆش بڕۆ لەماڵی خۆتەوە دەستە نوێنێك بێنە".

مەلەك خانم راوەستابوو.

"ماڵی ئەوان دوورە ئێمە لەماڵێ نوێنمان هەیە. ئێستا دەیاندەمە قەدریی بۆتانی بێنێت".

موسا ئاغا دەستی یەکەیەکەیانی گوشی‌و بەیارمەتی کچەکانی بەرەو ماڵ بووەوە.

پویراز لەدواوە بانگی کرد: "مام ئاغا، مام ئاغا، سبەی بۆ بەرچایی لەژێر چنارەکان دەبین".

"سوپاس، دێم".

بەرچاییان لەژێر چنارەکان خوارد، دوای بەرچایی هەموو خەڵکی دوورگەکە لەژێر چنارەکان کۆبوونەوە. مەلەك خانم ژنەکانو منداڵو پیاوەکانی بەدوو دەستە دابەش کردن. بەشێکیان دەبوا لەگەڵ دکتۆر سەلمان سامی چووبانو خانووەکەیان بۆ پاك بکردبایەتەوە. گروپەکەی دیکەش لەگەڵ دکتۆر خەلیل رەفعەت.

کاری پاککردنەوەو گواستنەوەی شمەکەکان سێ رۆژان درێژەی کێشا. لەکاتێکدا کە دکتۆر سەلمان سامی بەیەك مانگ ئەو کارەی پێنەدەکرا، بۆ نموونە ئایا دکتۆر دەیتوانی یازدە جار شوێنی تەختە خەوەکەی بگۆڕێت؟ مەلەك خانم، زەهراو پویرازی ناردبووە ماڵی دکتۆر سەلمان سامی. ئەوان پێکەوە لەو خانووەداو لەتەك یەکدا زۆر خۆشحاڵ بوون. دکتۆر سەلمان سامی هیچ چاوی لەزەهرا هەڵنەدەگرتو بەردەوام لەبەرخۆیەوە دەیگوت کچێکی چەندە جوانە، کچێکی چەندە جوانە! خۆ جگە لەو کچە، کچانی زۆر جوانی دیکەش لەدوورگەدا هەبوون، بەڵام کچی وا جوان لەهیچ جێگایەکدا نەبووەو نیە، ناسكو شیکپۆش بوو. لەماوەی ئەو سێ رۆژەدا کەوتە گومان کە سەرو سەودایەك لەنێوان زەهراو پویرازدا هەبێت. نەیدەتوانی لەهیچکەس بپرسێت. هەستی نیگەرانبوونی ئەو دووە کاتی تەواوبوونی کارەکان لای دکتۆر سەلمان شاراوە نەبوو. کچەکە جوان بوو، بەڵام ئەلهەقە کوڕەکەش زۆر رێکوپێك بوو، جگە لەوە لەکچەکەش عاشقتر دیاربوو.

"ئیدی شتومەکەکانمان رێکخست، ئێستا دەبێت بڕۆین بەکارەکانی دیکەمان رابگەین".

پویراز پرسی: "کارێکی دیکەشمان هەیە".

"کاری ئێمە تەواو نابێت. دکتۆرەکان کاریان زۆرە".

دکتۆر خەلیل رەفعەت گوتی: "کاریان زۆرە".

"دووکانێکیشمان پێویستە. وەك دەڵێن ئێوە گشت دووکانەکانتان کڕیوە، بەسکەی زەردی عوسمانی".

لۆچەکانی دەمو چاوی دکتۆر سەلمان سامی خاوبوونەوەو دەنگی گۆڕا. بەڕاوێژێکی گاڵتەئامێزانەوە گوتی: "ئیدی چیتانکڕیوە؟"

پویراز بەخوێنساردیەوە گوتی: "مەکتەبەکە هی دەوڵەتە، ئەومان نەکڕیوە، تەنها خانووی مامۆستاکانمان کڕیوە".

سەلمان سامی قسەکەی پێبڕی:

"خانووی مامۆستاکانتان بۆچیە؟ کلێساشتان بکڕیبا هەرباشتر بوو".

"بریا بمانکڕیبا دکتۆر". خەمێکی ئاشکرا ل دەنگیدا هەبوو کە بەری بەرهەڵچوون و تووڕەیی دکتۆر گرت.

"خۆزگە عەقڵم بەکارهێنابا و کلێسام بکڕیبا".

دکتۆر زۆر لەو باسە کەوتە گومانەوە. تووڕەبوونەکەی دامرکایەوە. لەوەی کە ئەم گەنجە تا ئەو رادەیە نیگەران بوو. بۆی هەیە ماستەکە مووێکی تێدابێت، روخساری پویراز زەرد هەڵگەرابوو و دەستەکانی دەلەرزین.

"چیدیکەتان کڕی، کورە تووڕەکەی خۆم؟"

"غەلێفەی هەنگەکانمان کڕی دکتۆری هێژا. نزیکەی دووسەد غەلێفە، بەڵام لەبەر ئەوەی من سەرم لەهەنگەوانی دەرناچێت بەهاوبەشی لەگەڵ جەمیلی پزیشکی ئاژەڵانم کڕین".

"چیدیکە".

پویراز بەسەر لەبەرخۆنان و زەردەخەیەکەوە وەڵامی ئەو پرسیارەی دایەوە:

"ئاشێکی هەواییشم کڕیوە، لەو سەرەوە واپەروانەکانی دەخولێنەوە".

"ئەم کارەت کارێکی باش بوو. ئەم کارەتم زۆر بەدڵە هەربژیت. هەربژیت کوڕەلاو. ئاشی هەوایی بیرێکی زۆر زۆر باشە. پەروانەکانی هێشتاش دەخولێنەوە؟ دەخولێنەوە مەگەر نا؟ ئاشیش ئاشێکی واجوان. بەو پەروانانەیەوە کە دەخولێنەوە لەباڵندەیەکی گەورە دەچێت کە بەئاسمانەوە دەفڕێت. وانیە؟"

پویراز دەستی دکتۆری گرت:

"وەرن، کاك خەلیل، مام ئاغا، ڤاسیلی، مەلەك خانم، هوسمەن، قەدریی تۆش وەرن. سەیر بکەن باڵی باڵندەکەم چەند جوان دەخولێنەوە. دەیەوێت بفڕێت".

لەژێر چنارەکان هەستان، بەکوچەیەکی تەنگەبەردا رەت بوون و چوونە لای خانووەکانی سەرەوەتر، ئاش لەنێو دەوەن و درەختەکانەوە دیاربوو، پەروانەکانی دەخولانەوە، وەکو باڵندەیەك کە خۆی بۆ هەڵفڕین ئامادە بکات.

گەڕانەوە ژێر چنارەکان و لەسەر کاناپەکان دانیشتنەوە.

پویراز گوتی: "ئێوە ناوی رەمزی کاولاکزادەتان بیستووە؟ مسۆگەر بیستووتانە".

سەلمان سامی گوتی: "بیستوومانە".

پویراز گوتی: "باشە، ئەگەر حەوسەڵەتان هەبێت جارێکی دیکەش باسی ئەو کابرایە لەهەوەڵ تا ئاخیری لەمنەوە ببیستن".

ڤاسیلی لەلایەك‌و پویراز لەلایەکی دیکەوە باسیان لەکۆشکەکانی چورباچی کرد کە هەر یەکێکیان لەناو باغێکدا دروست کرابوون. پویراز وردەکاریی تێکدانەکانیانی باسکرد. لەکاتی باسکردنی کۆشکەکان رەگی ملی رەپ دەبوون. دەنگی بەرزو نزم دەبووەو حاڵەتی ناڵەو نووزانەوەی بەخۆوە دەگرت. جگە لەوە دەم بەدەمیش دەنگێکی وەکو زریکاندن لەقورگیەوە دەردەچوو، هەموو شتێکی بەوردی باسکرد، هیچ قسەی لەبارەی کلێساوە نەکرد، هەر چۆنێك بێت کلێسای دەبینی.

"بەکورتی جەنابی دکتۆری هێژا، من بۆ ئەوەی نەهێڵم رەمزی کاولاك خانووی مامۆستاکان بکرێت‌و تێکیان بدات، خانووەکانم کڕین، ئەگەر دووکانەکانیشم نەکڕیبان ئەوا ئەوانیشی تێکدەدان. ئەم دوورگەیە ئاوەدان دەبێتەوە، ئەگەر دووکانەکان لەنێوچووبان لەکوێ دەمانتوانی دووکان دروست بکەینەوە؟ ئێوە ئێستا چۆن دەتانتوانی جێگایەکتان بۆ نوڕینگەو دەرمانخانە هەبێت؟ ئەگەر ئاشە هەواییەکەشمان نەکڕیبا کاولاك ئەویشی تێکدەدا. ئێوە ئیدی نەتاندەتوانی هەمو رۆژێك فڕینی باڵندە گەورەکە ببینن. ئێستا با هەستین بچینە دووکانەکەی ئێوە. ئێمە ژمارەیەکی زۆر دووکانمان هەن بابزانین کامەیان پەسند دەکەن".

بەدەم پێکەنینەوە هەستان‌و رۆیشتن‌و گەیشتنە دووکانەکان. پویراز دەرگای دووکانەکانی دەکردنەوەو ئەوان سەیریان دەکرد.

"هیچ دارتاشێك لەدوورگە ماوە؟"

قەدریی بەلەموان گوتی: "بەڵێ، حوسێنی شاگردی باربا ماوە لەگوندەکەی عەلی چاوەشە".

سەلمان سامی گوتی: "کەوابوو، دەبێت بیدۆزینەوە. دەبێت بۆ دەرمانەکان رەفەمان بۆ دروست بکات. هەروەها مێزو کورسی".

"هەرچەندەی بتەوێت هەن. جا رەفەو قەفەسەی چەند جوان. پێویست بەدروستکردن ناکات. جەعفەر باشترین قەفەسەو رەفەمان بۆ دێنێت، رەنگبێت پارەش وەرنەگرێت".

"جەعفەر کێیە؟"

"جارێ بابڕۆین، بابڕۆین، باسی جەعفەرتان بۆ دەکەم. دایکە لێنا هەموومانی بۆ فراوین بانگهێشت کردووە".

گەیشتنە ژێر چنارەکان، پویراز، یەکەمجار باسی جەعفەری کرد ئینجا باسی لێنای بۆ کردن. باسکردنی ئەو دووانە زۆر کاریان لەسەلمان سامی کرد، حاڵەتی روخساری بەجارێك گۆڕا. لەگەڵ هەر جووڵەیەکیدا هەستت بەخەمێکی قووڵ دەکرد.

موسا ئاغا گوتی: "کام دووکانتان پەسند کرد؟ کەس هیچی نەگوت".

سەلمان سامی گوتی: "دروستە، من هۆشم هێشتا هەر لای باڵندەیەکە کە باڵەکانی دەخولێنەوەو دەیەوێت بفڕێت. من زۆر نانی ئەو باڵندەیەم خواردووە. لێرە لەم دوورگەیە تێگەیشتم ئەو دێوەی کە ئەو جەنگەی هەڵگیرساندووە کێیە. تێگەیشتم کە مرۆڤبوونی مرۆڤ چ واتایەکی هەیە، لێرە لەم دوورگەیە"

پویراز پرسی: "کام دووکان؟"

"رات چۆنە کاک دکتۆر خەلیل رەفعەت؟ بڕیار وایە هەردووکمان لەیەك جێگا کار بکەین. ئەو دووکانەی یەکەم باشترە، پاك‌و خاوێنترەو دەبریقێتەوە. جگە لەوە دەریاشمان لێوە نزیکە. ئەو خەڵکە رەفەو مێزو کورسیەکانیان بۆ کوێ بردوون؟"

پویراز گوتی: "نازانم هەرزوو مێزو کورسی نوێتان بۆ دەکڕین".

"باشە، باشە، ئەی کرێکەی چەندە؟"

"ئەمە دیاریی ئێمە دەبێت بۆتان".

"مەگەر تۆ بۆ ئێرە پارەت نەداوە؟"

"با داومە".

"پارەش لەئێمە وەرناگریت، باشە ئەگەر بتەوێت ئەو شتانەی کە بەپارەت کڕیون ئاوا بەدیاری بیانبەخشیەوە خۆت دەتوانیت شتێك بکڕیت؟"

"منیش بەهۆی کەمئەندامبوونم خانەنشین کراوم قوربان. جەمیلی پزیشکیش هەروا. تازە، بڕیارە دەست بەماسیگری بکەین. دەمانەوێت ئەستەنبول‌و ئەنقەرە پڕ بکەین لەماسی، جگە لەوە ئەوەندەی خانووێك غەلێفەم هەن. نزیکەی دووسەد دانە. هەنگەکانیش زۆر ساغ‌و چالاکن.

دوورگەکەشمان دەبینی کە پڕە لەگوڵ‌و گوڵزار. کاك جەمیل پسپۆری هەنگەکانە. بڕیارە لەوەرزی پایزدا هەنگەلانەکان ببڕینەوە، تا ئێستا سەیری سێ دانە غەلێفەمان کردووە، هێشتا پڕ هەنگوین نەبوونە. شانەکان کەمێکیان ماوە پڕ ببن. هەموو جۆرە هەنگوێنکمان دەبێت. شیریشتان بۆ لەبزنەکانی دایکە لێنا دەدۆشین".

سەلمان سامی گوتی: "ئۆۆهۆۆ، چەندە باشە!"

"ماسیشتان هەموو رۆژێك لەسەر ئێمە. جگە لەمانە دوورگە گیاو گوڵی شیفابەخشیشی هەیە. ئێمە لێرە کەسانێکمان هەن کە لەناسین‌و کۆکردنەوەی گیاکان‌و لێنانیان شارەزان، بەڵکو بتوانین هەر ئەمڕۆش خواردنێکی شیفابەخشی گیایی بخۆین".

سەلمان سامی گوتی: "بینیت خەلیل، من دەمگوت بابچینە دوورگە تۆ خۆت دەگنخاند؟"

"کەس سەری لەتۆش دەرناچێت، مەگەر هەر تۆ نـەبوویت ئـەو کاتانـە وەکـو پڵنگێکـی توورە لەم دوورگەیە گەڕابوویتەوەو ئۆقرەو ئارامت لێهەڵگیرابوو؟"

"دڵم گیرابوو".

"کەواتە ئیدی دڵت ناگیرێت".

دکتۆر سەلمان سامی پێکەنی.

"پێموایە ئیدی قەت دڵم ناگیرێت. دەمەوێت تەمەنی خۆم لـەم دوورگەیـە لـەنێو ئـەم خەڵکە باشەدا ببەمەسەر. بەبیرت نیە کاتێك کە شەڕ راوەستا پێمگوتی دەمـەوێت بچمە دوورگەو تاماوم لەوێ بمێنمەوە؟ مەگەر لەجەنگدا ئەو کاتەی لێـرە بـووین پێمنـەدەگوتی بالەم دوورگەیەدا بمێنینەوە؟"

"پێتدەگوتم قوربان".

موسا ئاغا گوتی: "هەرکەسێك ئێرە ببینێت ئیدی ناتوانێـت دەسـتبەرداری بێـت. خـوا ئێرەی وەکو گۆشەیەك لەبەهەشت دروست کـردووە. ئێـوە بـەم چیایەی بەرامبـەر دەڵێن قازداغی یۆنانیەکان پێیدەڵێن چیای ئیـدا. ئـەو چیایەی پێیـدەگوترێت ئولـەمپ دەبێـت هەر ئەم ئیدایە بێت. ئەو چیایە مـەکۆی خواکـان بـوو. ئـەوێم نـەبینیوە، بـەڵام دەتـوانم سوێند بخۆم کە جێگای خواکان ئەو چیایە نیە، بەڵکو ئەم دوورگەیە. ئێـوە بـەهاران ئـەم دوورگەیەتان بینیوە؟ ئاوی کانیەکانی ئاو نیە، تیشکی خۆرە. لەکانیەکەیـدا لـەجیاتی ئـاو رۆشنایی هەڵدەقوڵێت. سپێدان زوو رۆشنایی بەرەنگی ئەرخەوانی دەردەکەوێت. نزیکـەی نیـوەڕۆ کـە دادێـت هـەموو لایـەکی دوورگـە بـەبن بـۆن‌و بەرامـەی وەنەوشـان دەکـەوێت. درەختـەکان گـژوگیاکان، زنارەکـان، دەریـا، ئەسـتێرەکانی ژوور سـەریان هـەموویان بـۆنی وەنەوشە دەدەن. هەنگەکان، پەپوولەکان، میروولەو ماسیەکان بـۆنی وەنەوشـەی مـل لاری شین دەدەن. بۆنی وەنـەوشە رۆدەچێتە ژێـر پێسـت‌و نێـو خـوێن‌و مـۆخی ئێسقانەکانمان. هەواکەی هەوانیە ئاوریشمە".

پـویراز لەشـوێنی خـۆی مـالق مـابووو بـەو پـەڕی سەرسـامبوون‌و تاسـەوە گـوێی لەقسەکانی موسا ئاغا گرتبووو نەیدەتوانی باوڕ بکات. ئەمە هەمان ئەو کەسە نـەبوو کـە ئەو دەمەی هاتبوونە دوورگە بـەردەوام هـەر کرێـت کرێتـی بـووو لەبەرئـەوەی پێیوابـوو ئەمڕۆ یان سبەی دەگەڕێنەوە کرێت لێنەدەگەڕا کچەکانی باولـەکانیان بکەنـەوەو شـەو تـا بەیانی نەدەخەوت‌و هەرچاوەڕێی مۆڵەتنامەی گەڕانەوە بۆ کرێت بوو.

"مرۆڤەکان نامێنن، هەموو شتێك لەم دونیایەدا، هەموو بوونەوەرێك لەم دونیایەدا لەنێو دەچێتو نامێنێت، هەموو شتێك. مرۆڤەکان دەمرن، ئاشکرایە، بەڵام چ باشتر کە لەدوورگەیەکی ئاواو لەم بەهەشتەدا بمرن. ئەو کاتەی شۆڕی ناو گۆڕی دەکەنەوە بۆنی وەنەشان هەڵبمژێت. کارێکی باشتانکرد برایانی دکتۆر هاتنە ئێرە. ئاااە، ئاااە، خوا ئەو گرفتاریانەی من نەسیبی هیچکەس نەکات. من دەبێت بگەڕێمەوە زێدی خۆم. دەزانم لێرە با بۆنی وەنەوشەو بۆنی دەریا بەسەر گۆڕمدا دێنێتو پەپوولەو هەنگەکان بەسەریدا هەڵدەفڕن. مخابن، مخابن بۆ ئەسپەکانم ئەو ئەسپانەی کە بەدەستی خۆم رامهێناو بەخێوم کردوون، لەوێ ماون. لەکرێت چما لەدونیادا هیچ بوونەوەرێك لەئەسپ جوانتر دەست دەکەوێت؟"

قسەو باسکردن لەبارەی ئەسپەکان تا شەو داهات هەربەردەوام بوو. موسا ئاغا رووداوی هێند سەرنجڕاکێشی لەبارەی ئەسپەکانەوە دەگێڕانەوە کە هەموویان بەتاسەوە گوێیان بۆ راگرتبوو، بەڵام ئەو کەسەی لەهەمووان وردو باشتر گوێی رادێرابوو ئوسوی دەنگبێژ بوو کە کاتی موسا ئاغا دەستی بەقسان کردبوو تازە گەیشتبووە ئەوێ. ئەگەرچی نیوەی قسەکانی ئەویش تێنەدەگەیشت کەچی ئەوەندە بەحەزو تاسەوە گوێی بۆ قسەو شێوازی گێڕانەوەکانی موسا ئاغا راگرتبوو کە ئاگای لەخۆی نەمابوو.

موسا ئاغا هەرباسی ئەسپەکانی دەکردو دەکردو قسەکانی تەواو نەدەبوون. موسا ئاغا یەکسەر چاوی بڕیبووە ئەو کەسەی کە بەوردی گوێی بۆ قسەکانی راگرتبووو لەسەر یەك قسەی دەکرد. ئوسوش ئەو رەفتارەی موسا ئاغای بەدڵ بووو خۆشی لێهاتبوو. ئوسوش هەروابوو، کاتێك چیرۆکێکی دەگێڕایەوە ئەو کەسەی دەدۆزیەوە کە لەهەمووان زیاتر شەیدای قسەکانی دەبووو وەك ئەوەی چیرۆکەکە بەبێئەو کەسە ناتەواوبێت، تا ئاخیری رووی لەو دەکردو چیرۆکەکەی دەگێڕایەوە.

دکتۆر سەلمان سامی چەند جارێك کۆکی، چەند جارێك لەگەڵ ئەو کەسەی تەنیشت خۆی قسەی کرد، سەرەنجام نەیتوانی خۆی بگرێت.

"مام ئاغا، مام ئاغا، موسا کازم ئاغا، زۆر سوپاستان دەکەم. ئەوەندە جوان سەبارەت بەئەسپەکانت قسەت بۆ کردین کە بەڕاستی دڵمان پێخۆش بوو. وا لێنا خانم بۆ نانخواردن بانگمان دەکات. لەوێ درێژە بەقسەکانمان دەدەین".

موسا ئاغا گوتی: "وای خوایە. خۆمان لەبیرکرد. ئێوەشمان لەبرسان کوشت".

هەمووان پێکەوە هەستانو بۆماڵی پویراز چوون. موسا ئاغا لەگەڵ پویراز خۆی دایە دواوەو بەهێواشی گوتی: "کوڕم، زەحمەت نەبێت، ئوسوش بانگهێشت ناکەیت؟" پاشان رووی کردە ئوسوو گوتی: "ئوسو نەیەکەت هەڵبگرەو وەرە، من دەمەوێت".

ئوسو لەوان جیا بووەوە. کەمێك دواتر لەکاتێکدا نەیەکەی بەدەستەوە بوو گەڕایەوە.

لێناو مەلەك خانم خواردنی بەتامو خۆشیان لەسەر مێز ریزکردبوون. زەهراو نەسیبەش یارمەتی ئەوانیان دابوو. لەخانووەکەی تاناسی شەرابو راکیو ماستیکیان هێنابوو.

دکتۆر سەلمان سامی بەکونجکۆڵیەوە لەبارەی تاناسی پرسیار لەسەر پرسیاری دەکردو ڤاسیلیو لێناش یەکڕیز بەجۆشو خرۆشەوە باسی تاناسیان بۆ دەکردو قسەکانیان لەبارەی تاناسی تەواو نەدەبوون.

کاتێك ئەوان ویستیان ناوبڕێك بدەنە قسەکانیان، سەلمان سامی دەستی بەقسان کردەوە:

"ستەمو خراپەکاریەکی زۆرمان بینی، بەڵام لەم دونیایەدا کەسانێکی وەکو تاناسیشمان بنییون. لایەکمان دۆزەخەو لایەکمان بەهەشت. ئێمە لەم دوورگەیەدا سەدان سەربازمان دەرمان کرد. سەربازێکی زۆریش لەژێر دەستماندا مردن. ئەو بریندارانەی کە لەچاناك قەڵاوە هێنایانن بۆ ئێرە، لەنێو کلێساکەی ئێرە دەرمانمان کردن. لێرە کۆمەڵێك دکتۆر هەبوون. نازانم ژمارەیان چەند بوو. کلێسای دوورگەمان کردە نەخۆشخانە. کچانو ژنانی دوورگە چاودێریان لەنەخۆشو بریندارەکان دەکرد. هەندێك شەوان تابەیانی بەسەر ئەو بریندارانە ئێشکیان دەگرت.

هەندێکجار ئەوەندەیان بریندار دەهێنان کە کلێسا پڕ دەبوو خوێندنگەکەمان چۆڵ دەکردو بریندارمان لەوێش دادەنان. پاشانیش هەموو خانووەکانی دوورگەمان پڕ دەکردن لەبریندارا‌ن. خەڵکەکە هەموو خواردنو ئازووقەی خۆیان بەسەر بریندارەکاندا دابەش دەکردو هیچیان بۆ خۆیان نەدەما. تورکمەنەکانی دێهاتی لێوار دەریاو دێهاتە یۆنانیو کۆچنشینەکان کە ئەمەیان دەبیستو هەواڵی ئێرەیان پێدەگەیشت بەبەلەمان خۆراكو جلوبەرگیان بۆ دەهێنایین. جلوبەرگی هەموو بریندارەکان خوێناوی بوو. جلی ژێرەوەشیان لەنێوخوێندا رەق بووبوون. هەندێك لەبریندارەکان ئەوەندە برسیەتیان کێشابوو هەرکە چەند کەوچکێك شۆربایان دەخوارد چاویان هەڵدەهێناو گیانێکیان دەهاتەوە بەر. من چاکەی زۆرم لەخەڵکی ئەم دوورگەیەدا بینیوە. رەفتاری دۆستانەم لەنێویاندا بینیوە. دڵسۆزیەکانیان، هەستی مرۆڤدۆستانەو رەفتاری گەرمو گوڕیان،

ئەوەی کە بەدڵو گیان یارمەتی یەکدیان دەداو بەوپەڕی دڵسۆزیەوە باوەشیان پێکدا دەکرد. من دەمزانی ئەوانە لێرە دوورخرانەوە، ئەم دوورگەیە دوورگەیەکی جوانە، گۆشەیەکە لەبەهەشت، ئەوان بووبوونە مایەی ئەوەی کە ئێرە جوانتر بێت. من هاتمە ئێرە تاکو پێکەوە بەدڵسوزیەوە لەگەڵ خەڵكو سروشتی جوانی ئێرەدا بژین. گوتم بێم لێرە بژیم دەتوانم هەموو رۆژێك لەگەڵ یادەوەریەکانی ئەوانو لەگەڵ ئەواندا بم. تەنانەت ئەگەر لێرەش نەبن".

سەلمان سامی راوەستا. نیگەران بوو.

کاتێك ئەو بێدەنگ بوو، پویراز هەستی بەنیگەرانی کرد، دکتۆر ئەگەر سبەی کلێسا، ئەو شوێنەی کە سەدان برینداری تێدا دەرمان کردووە ببینێت خوا دەزانێت چ کاردانەوەیەکی دەبێت. کێ نالێت بەرِكو تووڕەییەوە ناچێتە شارۆچکە رەمزی کاولاك نادۆزێتەوەو دونیای بەسەردا وێران ناکات!"

"ئەم دونیایە جوانە، بەڵام ئەو جێگایەی کە مرۆڤ تێدا لەدایك دەبێتو تێیدا گەورە دەبێت جوانترە. ئاوارەبوون، لەمەرگو جەنگیش زاڵمانەترە. ئەگەر من هەستم بەئاوارەبوون نەکردبا مەگەر دەمتوانی هەموو رۆژێك چاوەڕێی ئەوە بکەم کە کەی دەگەڕێمەوەو جێگایەکی ئاواو خەڵکانێکی وەکو ئێوەم جێدەهێشت؟ دەمگوت کرێتەکەی خۆتان پیرۆزی خۆتان، ئەسپەکانم کە لەچاوی خۆم خۆشترم دەویستن..".

دەستی خستە سەرشانی پویراز.

"ئەم منداڵە باشانەو ئەسپە جوانەکانی خۆم لێرە بەخێودەکردن. لایەکم ئەو خاکەیە کە تێیدا لەدایك بووم، لایەکەی دیکەم ئێوەن، کاك دکتۆر سەلمان سامی کە دەستبەرداربوون لێتان سەختە".

"سوپاست دەکەین گەورەم. سوڵتانی من".

سەلمان سامی هێشتا قسەکەی خۆی تەواو نەکردبوو کە دەنگی نەی لەهۆڵەکە دەنگی دایەوە. کەمێك دواتر سەروسەداکان دامرکان. دەتگوت هیچ یەك لەوانەی لەوێ بوون هەناسەش هەڵناکێشن.

ئەو ئاوازەی ئوسو دەیژەنی ئاوازێکی خەمگین بوو. دڵی هەمووانی دەگوشی. نەی باسی لەجەنگو مەرگو کوشتو کوشتار دەکرد. تا لەئاوازێکەوە دەچووە سەر ئاوازێکی دیکە، کەشو هەوای دانیشتنەکە خامۆشترو خەمگینتر دەبوو. هەموویان لەنێو خۆدا

گرمۆڵــە بووبــوون‌و رۆچــووبوونەوە خەیاڵــەوە.. فرمێســك بــەگۆناکانی ســەلمان ســامی دادەهاتنەخوار. موسا کازم ئاغا بۆ شاردنەوەی گریان‌و هەڵڕشـتنی فرمێسکەکانی هـەوڵ‌و تەقـەللای دەدا. سـەری خـۆی بـۆ ئـەملاو ئـەولا وەردەسـووڕاند. سـەیری دواوەی دەکـرد. تەماشای ئاسمانی دەکردو دواجار سەری لەبەرخۆی دەنایەوە، بەڵام مەلەك خـانم دووسـێ جار دایە پرمەی گریان، زەهرا سەری نووساند بەسنگی خۆیەوە.

هەریەکەو ئازاری خۆی چەشتبوو ئینجا هاتبووە ئێرە. هەندێکیان برسێتی‌و هەژاری، هەندێکیان جەنگ‌و شـەڕو شـۆڕ، بەشـێکیان لێمشـتی خـوێن، بەشـێکی دیکـەیان رەتبـوون بەسەر ئەو تەرمانەی دەشتێکی کاکی بـەکاکیان دادەپۆشـی، هەنـدێکیان فەزایـەکی پڕبـوو لەبۆنی گەنیوی تاقەتپروکێنی تـەرمی سـەربازانیان بەچـاوی خۆیـان بینیبـوو. بـەبینینی ئەوانــە، بەهەڵوێزتنــەوەی شــریتی ئــەو دیمەنانــە، بەلەهۆشچــوون بــەهۆی ئــەو بۆنــە گەنیوانەو دەست‌و پەنجەنەرمکردن لەگەڵ مەرگدا، چووبوونە نێو خۆیان.

ئوسو لەپڕ هاتــە ســەر ژەنینــی ئـاوازێکی شـاد. هـەموویان بەیـەکجار کەوتنـە جۆش‌و خرۆش. زەهرا کە لەئێوارەوە هەر سەیری پویرازی کردبوو، چاوە پـڕ لەشادیبەخشـەکانی خـۆی بڕینــە دوڕ چـاوی پـویراز. پـویرازیش چاوەڕوانی ئەمـەبوو. هـەر لەگـەڵ ئـەوەی بروسـکەی شادیبەخشـی چـاوەکانی زەهـرای بینـی هـەموو شـتێکی لـەبیرکردو هەسـتی بەئاسوودەیی کرد.

کاتێك ئوسو نەی لەدەمی دورخستەوە. موسا ئاغا دەستی بەقسان کـرد. باسـی ئەسـپە جادووییەکانی‌و دۆستی‌و هاوڕێیەتی نێوان مرۆڤ‌و ئەسپەکان، باسی ئەوەی کە ئەسـپەکان بـەزمانی بێزمانیـان لەگـەڵ مرۆڤەکانـەوە دەدوێـن‌و خـەم‌و کۆڤـان، میهـرو خۆشەویسـتی، عەشق‌و دەردو ئازارەکانیان درك دەکەن. هەندێك لەئەسپەکان جادووگەرن، باس لەغەیب دەکـەن. هەرچـەندە بڵـێن کـاملترینی گیانـداران بـریتین لەباڵنـدان مـەلی هـەنجیرخۆر، کـەناری، مـەلی بـاران، کـەوی سەرشـاخان، یـان لـەنێو چـوارپێیاندا ئاسـك کـە چـاوەکانی لەچاوی هەموو گیاندارانی دیکە جوانترە، یان شوور کە شاجوانی کێـوو جەنگلسـتانەکانە، لەگەڵ ئەمانە هەمووی دیسان ئەسپی رەسەن جوانترین گیاندارو هەروەها نزیکترینشیانە لەمرۆڤەوە. ئەسپەکەی ئەسکەندەر لەدونیادا لەهەموو شتێك نزیکتربـوو لەئەسـکەندەری مەزن. بەرلەدەستپێکردنی هەر جەنگێك ئەسـپەکەی دەبـردە کونجێـك‌و راوێـژی لەگەڵـدا دەکرد. کاتی مردنیش هەواڵی مردنی خۆی تەنها بەو گوتوە. ئەو شەوەی کـە ئەسـکەندەر

مـردووە وەكـو شـێتان بیپسانەوە حیلاندویـەتیو بـەدەوری شـاری بابلـدا سـووڕاوەتەوەو پاشـانیش سـەراپا شـەلاڵی ئارەقـە بـووەو هـاتووە بەرامبـەر كۆشـكو ئـەو شـوێنەی ئەسكەندەری لێ مردووە راوەستاوە، تا ئەو دەمەی تەرمی ئەسكەندەر لـەدەرگای كۆشـك هێندراوەتـەدەر بێجووڵـە چـاوەڕێی كـردووە. كاتێـك سـەربازەكان ویسـتوویانە تـەرمی ئەسـكەندەر بەسەرشـانیانەوە لەكوشـك ببەنـەدەرێ وەكـو پڵنگـی بـەنگال بـازێكی داوەو ئەسـكەندەری بەددانـەكانی هـەلگرتووەو خسـتوویەتیە سەرپشـتیو ملـی داوەتـە بیابـان. دوای ئــەوە نەكــەس تــەرمی ئەســكەندەری دۆزیوەتــەوەو نەئەسپەكەشــی. ئەســپی چـەنگیزخانیش هـەروابووە. كاتێـك چـەنگیزخان مـردووە ئەسـپەكەی داویەتیـە كێـوان. چەندان شەوو رۆژ حیلەی ئەسـپەكە لـەو دۆڵو كێوانـە دەنگـی داوەتـەوە. لـەوان رۆژانـدا شاو فەرماندە گەورەكانیان لەگەڵ ئەسپەكانیان ناشتووە. هـەزاران سـەرباز روویانكـردۆتـە چیاكانو بەدوایدا گەڕاون، بەڵام هەموو ئـەو گـەڕانو هەوڵانـەیان بێهـوودە بـووە. دەنگـی حیلاندنی، چیاو دۆڵەكانی هێناوەتەلەرزە. سەربازانی سوپای چـەنگیزخان لەدۆزینـەوەی بێئومێد دەبـنو دەگەڕێنـەوە. ماوەیـەك بەسـەر ئـەو رووداوەدا تێدەپـەڕێت. رۆژێـك لـەو شوێنەی چـەنگیزخانی لێنێـژراوە حیلـەی ئەسـپەكە دەبیسـتن. دەنگـی حیلـە سێ جـاران لەسـەریەك دەبیسـترێت. بەلـەز خۆیـان دەگەیەننـە سـەر گـۆڕی چـەنگیزخان. ئەسـپ نەلێیانترساوەو نـە سڵی كردۆتـەوە، لەوێـدا ماوەتـەوە. ئەسـپەكە دەكـوژن. دیسـان گـۆڕی چـەنگیزخان هەڵدەدەنـەوەو گـەورەی دەكـەن. ئەسـپەكە هـەرئاوا بـەپێوە دەخەنـە نێـو گۆڕەكەو چەنگیزخانیشی دەخەنە سەرپشت.

ڤیرئــاتی كوێرئــۆغلیش جــوانترین ئەســپ بــووە. لــەو رۆژگــارەی كــە كوێرئــوغلی دەوڵەمەندەكانی رووت دەكردەوەو دارایی ئەو دەوڵەمەندانەی بەسەر هەژارەكاندا دابـەش دەكـرد، پـێش ئـەوەی دەسـتكەوتەكان بەسـەر هەژارانـدا دابـەش بكـات سـەیری چـاوەكانی ڤیرئـاتی دەكـرد، ڤیرئـات گیـانو رۆحـی كوێرئـوغلی بـوو. ئەگـەر بیانویسـتبا كوێرئـوغلی بكوژن پێشتر دەبوا ڤیرئاتیان بگرتباو بیانكوشتبا. سەربازانی هیچ یەك لەپادشاكان بۆیان نەكرابوو ڤیرئات بگرن.

كوێرئـوغلی پـیر دەبێـتو ئـەو كاتـەی ئاسـنە كونەكـە دروسـت دەكرێـت، مـەردیو مەردانــەگی لــەنێو دەچــێتو ئــەو شمشــێرەی كــە هەمیشــە بەكەمــەرەوە بێــت ژەنــگ هەڵدێنێت، بۆیـە كوێرئـوغلی چیاكان بەجێـدێڵێت. پاشـان چـل زرێپۆشـەكان لەبـەر ئـەو

هەموو چاکەیەی لەگەڵ خەڵکدا کردوویەتی لەگەڵ خۆیدا دەیبەن‌و لەگەڵ ئەودا دەبن بەچل‌و یەك زرێپۆش. قیرئاتیش پێشتر ئاوی حەیاتی خواردبووەوەو بەجاویدانی گەیشتبوو. قیرئات چووە لەبەردەم دەرگای کۆڕی چل‌و یەك زرێپۆشەکە راوەستاوە. سەرکردەی چل‌و یەك زرێپۆشەکان بەکوێرئوغلی گوتوە ئەم ئاژەڵە بەستەزمانە زۆر خۆشی هاتووە لەبینادەمەکان. گوتویە نەفرەتی لەهەژاری‌و نەداری کردووە، بەمشێوەیە بەپلەو مەرتەبەی عارفان گەیشتووە. لەدیدی ئێمەدا بەهای لەمرۆڤەکانیش زیاترە. گوتویە ئێمە تا رۆژی قیامەت چاومان لێیدەبێت، بابێت‌و لەگەڵ ئێمەدا بژیت.

لەبەر ئەوە بوو ئوسو ئاوازی ئەسپەکانی لێدا. بیسەران هاوکات لەگەڵ ئەو ئەسپانەی کە لەگەڵ دەنگ‌و ئاوازی نەیدا بوون کەوتنە سەربالی خەیالان. دوای ئەو هەموو دەردو ئازارەی چەشتبوویان پەرجووەکان وەڕاستی گەڕان. دکتۆر سەلمان سامی وەکو منداڵێکی حەوت ساڵە شادبوو. لەدەردو ئازارو خوێن‌و ستەم‌و خراپەکاریەکان پاك بووبووەوە. لەوە دەترسا ئەو دەردو ئازارانە دووبارە بێنەوە وێزەی‌و ژیانی لێتاك بکەنەوە. ئامادەبوو. ئایا دەیتوانی ئەو شادی‌و خۆشحاڵیە تا ئاخیری لەنێو دڵیدا بپارێزێت؟

یەکەم، موسا ئاغا مۆڵەتی خواست‌و هەستا. زەهراو پویراز جارێکی دیکە نیگاکانیان تێکهەڵنگوت. پویراز چووە خوار دەستی لەقۆڵی موسا ئاغا هەڵکێشاو ئاوا پێکەوە رۆیشتن تا گەیشتنەوە ماڵەوە.

دایکە لێنا گوتی: "کاك دکتۆر جێگاکانتان ئامادەیە".

لەسەر جێگای هەر یەکێکیان دەستێك جلی خەوتن‌و خاولێیەك داندرابوو. گوتیان: "شەو شاد!"و چوونە ناو جێگا. پویراز چرا هەڵواسراوەکەی تەنیشت دەرگاکەی کوژاندەوە.

دکتۆر سەلمان سامی لەوەتەی جەنگ کۆتایی هاتووە لەنێو نێویندا ئەویش نوێنێکی ئاوا پاك‌و بۆنخۆشدا نەخەوتبوو تا بەدڵی خۆی هەناسە هەڵبکێشێت‌و بۆن‌و بەرامەکەی هەڵبمژێت‌و ئاوا هەست بەئارامی‌و ئاسوودەیی بکات، بۆیە هەرسەری نایە سەر بالیفەکەی خەوی لێکەوت.

پویراز لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شەوە زۆری خواردبووەوە، کەچی بەیانی زوو لەخەو هەستا. لەسەرشۆرگەکە دەست‌و دەموچاوی خۆی شوشت. ریشی تاشی‌و کۆلونیای لەڕوومەتی هەڵسویی. ئینجا یارمەتی لێنای دا کە خەریکبوو ئاگردانی هەڵدەکرد. لەو میانەدا دکتۆرەکانیش لەخەو هەستان.

سەرشۆرگەکەی نیشان دان. یەکێك لەگویزانە زیادەکانی دایە دکتۆر سەلمان و ئەوەکەی دیکەشی دایە دکتۆر خەلیل ڕەفعەت. تا چایەکە دەمی دا لەگەڵ لێنا بەرچاییان ئامادەکرد. دکتۆرەکانیش ریشیان تاشی و هاتن لەدەوری مێزی نانخواردن دانیشتن. هەر دانیشتن لێنا بەپیالەی کەمەرباریکی لێوپانەوە چایی بۆهێنان، چایەکە دەتگوت خوێنی کۆترە هێندە چایەکی باش بوو. پیاڵەی چاکان هەڵمیان لێهەڵدەستا.

سەلمان سامی پیاڵەی چایەکەی هەلگرت و لەبەر رووناکی رایگرت و سەیری کرد. پاشان رووی بۆلای لێنا وەرگێڕاو گوتی: "تەنها چایچیە شارەزاکان دەتوانن چای ئاوا لێبنین. دەستتان خۆش لێنا خانمی بەڕێز. بەڕاستی چایەکی باشە! چا دەڵێیت تیشکی رووناکیە ئاوا زولاڵە".

یەکسەر چایەکەی لەگەڵ نان و پەنیردا خوارد. چای دووەمی بەخۆی تێکردو ئەمجارەش لەبەر رووناکی رایگرت.

"ئەم چایەو ئەم پەنیرە چەندە بەتامن. مەگەر نە خەلیل ڕەفعەت؟ نەمگوت ئێمە لەم دوورگەیە تا تەمەنمان ماوە ئاسوودەین؟ نەمگوت؟ چەندین مانگ بەشەوو رۆژ مێشکم نەبردبوویت ئەوەندەی پێتبلێم؟"

خەلیل ڕەفعەت گوتی: "سەرەنجام هاتین، ئیدی هاتین و ئەم دۆستانەمان پەیداکرد".

سەلمان سامی گوتی: "پەیدامان کردن، جا چ کەسانێك!"

"هەروەها موسا ئاغا، دیسان کاك ئوسو، ئینجا مەلەك خانم!"

خەلیل ڕەفعەت گوتی: "هەروەها دایکە لێنای بەڕێز".

"کەسانێك خاکەکەیان باش بێت خۆشیان باش دەبن. خاکی باش دەبێتە بەشی کەسانێکی باش، وانیە؟"

خەلیل ڕەفعەت گوتی: "وایە موسا کازم ئاغا لەکرێتەوە هاتووە کە خاکێکی باشە. چەند جار باسی ئەسپەکانی دەکرد. هیوادارم کێڵگەکەی دروست بکات و دیسان ئەسپی رەسەن بەخێو بکات. ئەو پیاوە ئەسپی نەبێت زوو دەمرێت".

پویراز گوتی: "نامرێت، چونکە کێڵگەمان کڕیوە، هەفتەیەکی دیکە قەباڵەکەی وەردەگرینەوە".

"زۆرتان پارە پێدا؟"

"نەخێر؟، لەموزایدە کڕیمان. دواکڕیار ئێمە بووین".

"تۆش پشکت تێیدا هەیە؟"

پویراز گوتی: "زۆر کەم".

"کەوایە ئینشاللاّ سەلامەت دەبێت. تەمەندرێژ دەبێت موسا غا، ئێمەش باس‌و چیرۆکی ئەسپە رەسەنەکانی لێدەبیستین. هەروەها ئوسو، ئوسوی دەنگبێژ؟ ئوسو مانای چیە، ناوی خۆی چیە؟"

پویراز گوتی: "لەیەکینەی ئێمەدا پێنج دانە ئوسو هەبوون، لەفەوجیشدا هەرخوا خۆی دەزانێت. هەمووشیان لەئەللاّهوئەکبەر لەژێر بەفردا مانەوە".

"ئێوە لەبەری رووسەکان بوون؟"

"من یەکێك لەو چوار پێنج کەسانەم کە لەوێ بەزیندوویی گەڕاومەتەوە. ئوسوەکان هەندێکیان لەژێر بەفردا مانەوە. هەندێکیشیان هەر بەپێوە رەق بوونەوە. دەیان کەس ئاوا بەپێوە بووبوونە قالّبێك سەهۆڵ‌و رەقبوونەوە. کوردەکان بەیوسف دەڵێن ئوسو".

"کاتێك ئەو خەریکی نەیژەنی بوو، من لەجەستەی خۆم جیابوومەوەو تەنها خۆم لەگەڵ خۆمدا مابوومەوەو بەس. بەسەر بەهەشتدا هەڵدەفڕیم، بەعەشق‌و ئازارەوە. چیرۆکبێژیشە؟"

"نەیژەنی لەچاو دەنگ‌و ئاوازەکەی هەر هیچ نیە. دەنگ‌و ئاوازێکی هەیە دڵی مرۆڤ دەتوێنێتەوەو ناخی مرۆڤ پڕ دەکات لەمیهرو مرۆڤدۆستی.

لەنێو چیرۆك‌و لاوژەکانیدا ئەوەی کە ناتوانێت بەقسە بیلێت بەنەی دەریدەبڕێت، بەلاّم تورکی نازانێت. هەر بەکوردی دەیلێت‌و دەیخوێنێت.

لەڕۆژهەلاّتی ئەنەدۆڵەوە بەپای پیادە هاتووەو ئاوا لاوك‌و داستانی کوردی گوتوەو نەی ژەنیوەو هاتوە گەیشتۆتە ئێرە. چەند ساڵ بەڕێگاوە بووە. هەر جێگایەکی بۆی چووە خەڵکەکە رێزیان لێناوەو پێشوازیان لێکردووە، هەرچی لەتوانایان هەبووە یارمەتیان داوە. لەگوندێکەوە تا گوندێکی دیکە بەڕێیان کردووەو لەدەستێکەوە داویانەتە دەستێکی دیکە".

سەلمان سامی گوتی: "ئێستا بابچین کلێسا ببینین". پاشان ئەوەشی گوت: "دەترسم".

ئەوانیدیکەش بەدوایدا هەستان‌و کەوتنەڕێ.

دکتۆر سەلمان سامی کاتێك گەیشتە بەردەم کلێسا کە سەردەمانێك کردبوویە نەخۆشخانەو بۆ دەرمانکردنی سەدان برینداری چاناك قەلاّ سوودی لێوەرگرتبوو.

بەجارێك هێزی لەبەربڕا. لێناش کە ئەو حاڵو ڕەوشە پەڕێشانەی ئەوی بینی ڕەنگ بەڕوخساریەوە نەما.

پویراز گوتی: "ئەمەش کلێسا. کاك دکتۆر، کلێسا، ئەمەش کلێسا!"

پویراز چەند جارێکی دیکەش قسەکەی خۆی دووپات کردەوە.

دکتۆر دەنگی نەکرد، نەجووڵا، بووبووە بەرد. وەکو مردووانی لێهاتبووو فرمێسکی لەچاوان قەتیس مابوون.

خەلیل ڕەفعەت توانی بڵێت: "چیبووە دکتۆر؟" لێینزیك بووەوە، سەیری روخساری کرد، بەڵام پەشیمان بووەوە. خۆی بێدەنگ کردو ئیدی قسەیەکی نەکرد.

دکتۆر سەلمان سامی ماوەیەکی درێژ بێئەوەی هیچ قسەیەك بکاتو سەیری هیچ لایەك بکات. ئاوا بەحەپەساوی ماڵق مابوو. پاشان چەند جارێك تەکانی دایەبەر خۆیو بەئارامیو لاکەلاك بەرەو کلێسا هەنگاوی هەڵێنا.

ماوەیەك لەناو کلێسا سووڕایەوە. کاتێك دەنگی زریکاندنێکی بەرز لەناوەوە بەرزبووە پویرازو خەلیل ڕەفعەت بەخێرایی رایانکردە ژوورەوە.

خەلیل ڕەفعەت گوتی: "چیت بەسەر هاتووە دکتۆر؟"و ژێر باڵی گرتو بەرەو دەرەوەی راکێشا. پویرازیش ژێرباڵی دیکەی گرت. هاتنە ژێر چنارەکان. دکتۆریان بەئارامی لەسەر تەختەکان دانیشاند. خەلیل ڕەفعەت بەخێرایی چووەوە ماڵێ. جانتاکەی کردەوەو دەرمانێکی ئارامبەخشی هێناو بەڕاکردن هاتەوە ژێر چنارەکان. سەلمان سامی چاوەکانی گرتبوون. روخساری هێشتا وەکو بەرد وابوو. خەلیل قۆڵی گرتو بەتوندی رایهەژاند. دکتۆر چاوەکانی کردنەوە. بەسەرسامیو حەپەساویەوە وەك ئەوەی بڵێتو بپرسێت چیم بەسەرهاتووە سەیری دەوروبەری خۆی کرد. خەلیل ڕەفعەت دانەیەك حەبی بەدەستێکیەوە بوو بەدەستەکەی دیکەشی پەرداخێك ئاوی گرتبوو.

"قوربان دەکرێت دەم بکەنەوە؟"

سەلمان سامی دەمی کردەوە، خەلیل ڕەفعەت هیچ چاوەڕوان نەبوو دکتۆر سەلمان ئاوا بەنەرمی بجووڵێتەوە. حەبەکەی خستە دەمیەوە. پەرداخە ئاوەکەی دایێ. سەلمان سامی دووبارە چاوەکانی داخستن. ماوەیەکی درێژ ئاوا مایەوە. هیچکەس قسەی نەدەکرد.

هەموان کپو خامۆش بووبوون. تەنانەت دەنگی باڵندەیەکیش نەدەهات. تەنها هەر دەنگی دەریا ماوە ماوە دەکەوتە بەرگوێ.

کەم کەم خوێن هاتەوە بەر روخساری سەلمان سامی، سیمای حاڵەتێکی نەرمو نیانی بەخۆوە گرتو هاتەوە سەرحاڵەتی ئاسایی خۆی.

دکتۆر چاوەکانی هەڵێنان. کەمێك بەزەحمەت سەیری پویرازی کرد کە لەلای راستیەوە بوو. نیگای کەوتە سەر خەلیل رەفعەتو گوتی: "سوپاس". بتەوێت یان نا بزەیەکی بۆ لێناو مەلەك خانم کەوتە سەر لێوان. هەستایەوە گوتی: "دەمەوێت کەمێك پیاسە بکەم. بچمە سەر ئەو کانیەی کە ئاوەکەی وەك تیشکی خۆر روونو زوڵاڵە، ئەستێرەکانی ئاسمان لەنێویدا رەنگیان داوەتەوە، رووناکیەکەی دەجۆشێتو سێبەری تەپۆو زیندەوەرە چکۆلەکان کە بەسەریدا دەخزن لەبەردەکانی ژێرەوەی دەدات. ژێر دەوەنەکان، گەڵای وەنەوشە مل لارەکان ببینم، ئەگەر زەرد هەڵنەگەڕابن پڕ بەسییەکانم بۆنیان هەڵبمژم. بۆنی وەنەوشان رۆبچێتە ژێر پێستمو نێو مۆخی ئێسقانەکانم... بۆ ئاوا سەیرم دەکەن، ئەم بەهارەش نەبێت بەهارێکی دیکە. بەهاری داهاتوو لەژێر هەموو دەوەنەکانی خوار تەپۆلکەکە وەنەوشە سەردەردێنن. بەبۆنی وەنەوشەکان هەموو مرۆڤو باڵندەو پەپوولەکان مەست دەبن. هەر هەموویان. هەر کارێکی دەتانەوێت بیکەن بیکەن، من ئەم دوورگەیە بەجێناهێڵم، من لەم دوورگەیەدا زەجرو ناخۆشی وام بینیوە کە هیچ بەنی بەشەرێك نەیبینیوە. من لێرە لەگەڵ ئەو بریندارو نەخۆشانەدا ژیاوم کە نەمتوانی لەمردن رزگاریان بکەم. لەگەڵ ئەو مرۆڤانەی کە بەهەموو توانایانەوە دەستیان بەژیانەوە گرتبوو کە نەمرن. خۆم لەنێو شادیی ئەو کەسانەدا بینیوەتەوە کە لەمردن گەڕابوونەوە، لەگەڵ ئەو شادیو خۆشحاڵیانەدا تێگەیشتم کە دڵبەستەییو پابەندبوونی بێسنووری کەسەکان بەرامبەر بەژیان مانای چیە. ئێستا لەم کلێسایەدا کە ئازارو شادیم تێدا بینوە، تەنانەت ئەگەر بەردێکیشی لەشوێندا نەمێنێت. ئەو ئازارو دەردو خۆشبەختیو شادیانە رۆچوونەتە نێو بەردو خاكو دەریاو ئاوو هەوای ئەم دوورگەیە. باتێکیشی بدەن ئەو سەگانە. لەم کلێسایەدا مەرگ هەیە، ستەم هەیە، هەستی دڵسۆزیی مرۆڤ بەرامبەر بەخۆیەوە هەیە، خۆشویستنو رکو ترس قووڵترین هەستەکانی مرۆڤ نین. قووڵترین هەستی مرۆڤ دڵسۆزبوونی خودی مرۆڤە لەگەڵ خۆی. من ئەم

هەستەو ئەو هەموو مرۆڤبوونەم لێرەدا بەتاقیکردنەوە بینیوە. تا ئەو دەمەی دەشمرم لێرە ناڕۆم. لەنێو بەهەشتی خۆمدا لەگەڵ کۆمەڵێك مرۆڤی زۆر باشدا پێکەوەبن. تێگەیشتووم کە تاکە ڕۆژێکیش، تەنانەت چرکەیەکیش لێرە بارتەقای هەموو تەمەنی مرۆڤە. ئەوەش تێگەیشتم کە تەمەن کۆتایی نایەت".

پشتی خۆی وەرگێڕاو بەرەو لای سەرەوە ڕۆیشت. بەتوندی هەنگاوی دەنا. تا زیاتر قسەی دەکرد روخساری گرژداهاتووی نەرمو نیانتر دەبوو. روخساری لەگرژیو تووڕەییەوە بەرەو نەرمو نیانی. لەخەمگینەوە بۆ شادمانی بۆ حەپەسان، بۆ نیگەرانیو گەشانەوە دەگۆڕاو هەموو هەستو نەستەکانی ناخی لەسیمایدا دەردەکەوتن.

هەموو شتێکمان تێکدا. چاناك قەڵا سیمبولی پارێزگاریکردن بوو لەمرۆڤبوونی مرۆڤەکان. چاناك قەڵا، کاتێك جونك بایری، ئانافارت داکۆکیان لەکەسایەتیو تاکایەتی خۆیان دەکرد شوێنی یادەوەریی مردووەکان بوو. ئەم کلێسایەش یادەوەریی دۆستیو دڵسۆزیو بەزەییو میهرەبانی بوو. بەهەشتی یۆنانیەکانو تورکمەنەکانی نیشتەجێی دێهاتەکانی لێوار دەریاو ئەو کۆچنیشنانە بوو کە بۆ ئەوەی سۆزو خۆشەویستی خۆیان بەبریندارەکان ببەخشنو ژیانێکی تازەیان بۆ فەراهەم بکەن دەستیان دابووە دەستی یەك. ئایا ئەوەی دەهێنا ئەم کلێسایە لەپێناو کەمێك پارچە ئاسنو تەختەدارو چەند شووشە پەنجەرەو دوو تابلۆ ئاوا تێکوپێك بدرێن؟ ئەم کلێسایە هەر ئەو شوێنە نەبوو کە یۆنانیو تورکمەنو کۆچنیشنەکان، بەکچو ژنو پیاوو منداڵو پیرو گەنجەوە دەستیان خستە نێو دەستی یەکدی تاکو پێکەوە بەبریندارەکان رابگەنو برینەکانیان دەرمان بکەن، دەردو ئازارەکانیان کەم بکەنەوە، چەندین شەو بەژوور سەریانەوە بنو میهرو دڵسۆزیو گەرمیو بەزەیی خۆیانیان پێبەخشن، خۆیان خواردن نەخۆنو خواردنەکانیان بدەن بەوان، کەوچێك شیر نەدەنە منداڵەکانیانو هەرچی شیر لەدوورگەدا هەیە بیدەن بەسەربازە بریندارەکان؟ ئەم کلێسایە مەگەر هەر ئەو شوێنە نەبوو کە هەموو لایەك تیایدا وەك برا دەژیان؟ ئەمەی دەهێنا لەپێناو ماڵی دونیا ئەو یادگاریە برایانەیە ئاوا تێکوپێك بدرێت؟ مەگەر لەم کلێسایەدا سەردوولکەو داستانو لاوكو ستران نەهۆندراونەتەوە؟ دوای ئەو برایەتیو دۆستایەتیە قووڵە، ئەم دوژمنایەتیە چ واتایەکی هەیە؟ بۆچی

مرۆڤـەکان کاتێـك دەکەونـە تەنگاویـەوە پـاڵ بەیـەك دەدەن‌و دەسـت دەدەنـە دەسـتی یەکدی‌و لەشادی‌و خۆشیەکانیاندا ناتوانن پێکەوە بن؟ ئێستا کە جەنگ تەواو بـووەو ژمارەیەك مردوون‌و ئەوانیدیکە دەژین، بـەچ حـەقێك‌و بۆچی خـەڵکێکی ئـاوا باشـی ئـەم دوورگـەیان لەسـەر مـاڵ‌و حـاڵی خـۆی‌و لەزێـدی هـەزاران سـاڵەیان هـەڵگرت‌و گواستیانەوە بۆ وڵاتێکی دیکە، وڵاتێك کە پێشیاننەدەزانی؟

بنەماڵە وهۆزی دکتۆر سەلمان سامی لەدوورخراوەکانی قەفقاز بـوون. سێ نـەوەی دواییـان هەمیشـە قـەفقازیان هـەر لەسـەر زار بـووو هەرباسـی ئـەوێیان دەکـرد. زۆر شتیان سەبارەت بەخاك‌و ئاوو چیا سەر بەبـەفرەکانی قـەفقاز دەزانـی‌و لەماڵەوەشـدا بەزمانی چەرکەسی دەدوان. لەماڵەوە ئەگـەر کەسـێك تەنانـەت یـەك وشـەی بەهەڵـە دەربڕیبا گاڵتەیان پێدەکردو سەرزەنشت دەکرا. چیرۆك‌و سترانەکانی قـەفقاز لـەنێو چـەند هـۆزو تـیرەی چەرکەسـی کـە لەئەنـەدۆڵ‌و لەئەسـتەنبول ئـاکنجی کرابـوون، دەگوترانەوە. ئێستا چەند هـۆزو تیرەیـەك ئـەو چیرۆك‌و داسـتان‌و سترانانەیان هـەر لەبیریش نەماوە. رەنگبێت هێشتا ئەو چیرۆك‌و داستان‌و سترانانە لـەنێو هـۆزو تـیرە قەرەباڵغەکانی ئـەو چەرکەسانەی کـە لەئەنەدۆڵدا نیشتەجێکراون هـەر بگوترێن‌و دەمـاو دەم بکـرێن. دکتـۆر لەئەسـتەنبول لـەدایك بووبـووو لـەوێ گـەورە بووبـووو بووبـووە دکتـۆرو خـولی پسـپۆریەکەی لەفەرەنسـە تـەواوکردبوو، بـەڵام هیچشـتێك نەیتوانیبوو قەفقازی زێدی باووباپیرانی لەمێشکی رەش بکاتـەوە. ئـاوات‌و ئـارەزووی یەهوودیەکانی لەلا شتێکی سەیر نەبوو، ئاوات‌و ئارەزووی زێدی باپیران ئـارەزووێکی هەزاران ساڵە بوو. چیاکانی قـەفقاز هێشـتاش شـیرو هـەنگوینیان لێهەڵـدەقوڵا. هـیچ چەرکەسـێکی نـەبینبوو کـە لـەدوا سـاتەکانی ژیانیـدا ئـاخ بـۆ داغسـتانەکەی هەڵنەکێشێت. لێرە، لەم کلێسایەدا لاوانـی برینـداری چەرکەسـی داغسـتان، داغسـتان ئاااخ داغستانیان دەگوت‌و گیانیان دەسپارد. داغستان کاریگەرییێکی وای لەسەر هەبوو کە پێدەچوو ئەویش لەدواساتەکانی ژیانیدا بڕیارە بەدەم ئاااخ داغسـتانەوە بمرێـت. لەسـەردەمانی رابـردوودا، بـەر لەجـەنگ، خـەڵکانێکی زۆر لەقـەفقازو داغسـتانەوە دەهاتنە ئەستەنبول. هەندێکیان بۆ خوێندن، هەندێك بۆ کارو بەشێکی دیکـەیان بـۆ بینـی خـزم‌و کـەس‌و کارەکانیـان، بـەڵام هیچـکامیان بـۆ هەمیشـە لەئەسـتەنبول

نەدەمانەوەو دەگەڕانەوە. دکتۆر سەلمان سامیش بۆ گەڕانەوە بۆ داغستان زۆر هەوڵی دابوو، بەڵام نەیتوانیبوو. ژمارەیەکی زۆر لەدۆستو هاوتەمەنەکانی لەکاتو سەردەمە جیاجیاکاندا گەڕابوونەوە زێدی دێرێنی خۆیان. سەیری ئەم موسا ئاغایە بکەن، لەکاتێکدا دوو کچی جوانی خۆی لەگەڵ دان کە دڵیان بۆی لێدەدا، بەڵام ناتوانێت دوور لەکرێتی خۆی بژیت. زۆربەی ئەمانە ناتوانن زۆر بژین. بشژین، یەك سات چیە ناتوانن زێدی باوو باپیرانیان لەبیربەرنەوە. بەردەوام هەرباسی وڵاتی خۆیان دەکەن. وای موسا کازم ئاغا! دوای ئەوە، ئەگەر ئەم دوورگەیە پڕبوو لەخەڵك، دەبێتە دوورگەی ئاوارەکان. خوا دەزانێت ئەوخەڵکەو ئەو کۆمەڵە چ جۆرە کۆمەڵێكو چ جۆرە خەڵکێك دەبن.

دکتۆر خەلیل رەفعەت گوتی: "با پیاسە بکات، با تاکو پێیخۆشە بگەڕێت. ئەو قارەمانی مرۆڤایەتیە. لەجیاتی چوون بۆ چاناك قەڵاو بەشداربوون لەشەڕ، ئەم دوورگەیان بەنزیکترینو گونجاوترین شوێن بینیو کلێساشیان کردە نەخۆشخانە. هەموو بەلەمێکی ماتۆڕدار دەیتوانی بهێتە لێواری دوورگەو لەئەسکەلەی دوورگەدا لەنگەر بگرێت. لەمانگەکانی یەکەمی جەنگدا ئەوەندەمان برینداڕو کوژراو دان بەناچاری کەوتینەخۆ بۆ پەیداکردنی جێگایەك کە بیکەینە نەخۆشخانە. نۆ کەس لەدکتۆرەکانیان ناردنە ئێرە کە لەنەبەردیەکاندا بریندار بووبوون. لەنێویاندا چەند کەسێك برینەکانیان چاك بووبووەوەو هەندێکیشیان برینەکانیان سووك بوو. دوو لەدکتۆرەکان دوای بیستو یەك رۆژ، لەکاتی کارکردندا مردن. سەلمان سامی بەگی ئێمەش یەکێك لەو بریندارانە بوو. بەشەوان بەردەوام بەسەر بریندارەکانەوە دەهاتو دەچوو، شەونخونی دەکێشا. بەپێوە خەوی لێدەکەوتو هەر خەریکی کارکردن بووو دەکەوتو هاوکارەکانی دەیانگرتو یەکسەر دەهاتەوە سەرخۆی. هەمووومان لێیدەپاڕاینەوەو پێماندەگوت جەنابی سەرگورد کەمێك پشوو بدە. ئەو بەحاڵەتێکی سەیر تەماشایەکی دەکردین. بچووکترین هەدادانی نەبوو. رانەدەوەستاو بەردەوام لەسەر ئەم بریندار بۆ لای ئەو بریندار دەهاتو دەچوو. رۆژانە بەلەم بەلەم بریندار دەهاتن. وەك چۆن نەخۆشخانە پڕدەبوو لەبریندراران، ئەو کۆشکانەش کە خەڵکەکەی چۆڵیان دەکردوو خۆیان دەچوونە لای خزمو کەسو کارەکانیان

پردەبـوون لەبرینـدار. هـەموو ژنـانو کچـانی گونـدو هـەروەها ئـەو پیاوانـەیش کـە نەدەچـوونە ماسـیگرتن لەتـەك ئێمـەدا کاریـان دەکـردو نـانو ماسـیو داودەرمـانو خۆراکیان دەگەیاندە دوورگە. ئێمە حەوت دکتـۆر بەسـەر پەرشـتی سـەرگورد سـەلمان سامی شەوو  رۆژی کارمان دەکـرد. سـەرگورد زەردو لاواز بووبـوو لـەکاتی کارکردنـدا دەسـتەکانی دەلـەرزین. بـەخورتی توانیمـان حەفتەیـەك بیخـەوێنین، خـواردنو دەرمانمـان دایـێ تـا هێزێکـی هاتـەوە بـەر، کـە کـەمێك هاتـەوە سـەرحاڵەتی ئاسـایی، بەپەلە لەنێو جێدا هاتەدەرو دەستی بـەکارو نەشـتەرگەریەکانی کـردەوە. سـەرگورد کەسێك بوو کە لەگەڵ هەر برینداریێکدا دەمـردو بەئەنـدازەی ئـەو بریندارانـەی کـە لەڕەوشێکی خراپ دادەبوون، ئازاری دەکێشا".

"من لەوە ترسام کاتێك دێتەوە ناو ئەم نەخۆشخانەیە یان شێت دەبێـت یـان دەڕواتـە شارۆچکە رەمزی کاولاك دەدۆزێتەوەو دەیکوژێت. هیچی نەکرد تـەنها نیگـەران بـوو. بیر لەوە دەکەمەوە رەنگبێت دوورگە بەجێبێڵێتو بڕوات".

خـەلیل رەفعـەت گـوتی: "مـن پێموانـەبوو. ئـەو پیـاوێکی زۆر بـەهێزە، هەرچـەندەش دلگرانو نیگەران بێتو ئازاری بکێشێت دەرینابڕێتو بەسەرخۆی ناهێنێت".

"پێموایـە دەبێـت زۆری پێچووبێت تـا تـووڕەییو دەردو ئازارەکـانی دامرکاونەتـەوەو توانیویە تازە بەتازە دوێنێ بهێتە دوورگە".

"ئەگەر کەسێك ئەو ئازارانەی کێشابان کە ئێمە بەرگەمان گرتن نەیـدەتوانی بـژێتو لەژیاندا بمێنێت. ئێمە ئەو مافەمان بەخۆمان نەدەدا کە بمـرین یـان نیگـەران بـین. هـۆی راکردنـی ئێمـە ئـەوەبوو کـە بتـوانین ئـەو دەردو ئازارانـە بـەخۆڕاگرتنو بـەردەوامبوون لەسـەر ژیـان لێـرە لـەم دوورگەیـەدا واتـە مـەکۆی خـودی دەردو ئازارەکـان ئـەویش بەتەنگهەڵچـنین بـەدەردو ئازارەکـان لـەنێو ببـەین. ئـازار لـەنێو ناچـێت، تـەنها دەبێـت گوشـارەکەی کـەم بکرێتـەوە. ئێمـە سـەبارەت بـەو شـتانە قـەت قسـەمان لەگـەڵ یەکـدا نەدەکرد. پێموایە راستی ئەمە بوو. ئاسن دەتوانێت ئاسن ببڕێت. ئێشو ئازارە گـەورەکان دەکرێت بەو ئێشو ئازارانەی کە مرۆڤ توانای بەرگەگرتنیانی نیە وەلام بدرێنەوەو لەناو بـبردرێن. باپیرانمـان گوتویانـە ئاسـن ئاسـن دەبڕێـت. ئێمـە بۆچـی هاتینـەوە ئێـرە، لـەم دوورگـە بچـووکەدا دەتـوانین چـی بکـەین، ئـەویش کاتێـك کـە کلێسـاکەمان واتـە

نەخۆشخانەکەمان ئاوا وێران کرابێت؟ گۆڕی ئەو کەسانەی کە لێرە مردوون لەکوێیە، ئەو مردووانەیان بۆ کوێ بردن، لەدوورگەیان ناشتن؟ مردوو زۆر زۆر بوون. ئەو مردووانەیان چی لێکرد؟ ئێستا لێرە پێموایە کە ئازار دەتوانێت بەرپەرچی ئازار بداتەوەو بیبەزێنێت".

تا بەیانی خۆرهەڵات بەدەم قسەکردنەوە لەکاتێکدا کە هەندێکجار پیاسەیان دەکرد، هەندێکجار لەلێوار لەبەرزاییەك رادەوەستانو هەندێکجاریش دەهاتنو لەسەر تەختەکان دادەنیشتن ئاوا چاوەڕوانی دکتۆر سەلمان سامیان کرد.

رێك ئەو دەمەی کە خۆر خەریك بوو دەرکەویت، دکتۆر سەلمان سامی لەو لاوە هات. شێوەی رۆیشتنو راوەستانی تەواو ئاسایی بوو. سەلمان سامی بەڕاویژێکی هێمنانەوە گوتی: "برادەرینە زووبن بابچینەوە ماڵەوە، من لەبرسان مردم. پاشان دەبێت بشنووین. وەختی نیوەڕۆ با لێنا بەئاگامان بێنێتەوە. ئەمڕۆ کارمان هەیە. میوانداری سێ رۆژ بوو، رۆژی چوارەم دەبێت لەماڵەکانمان بین".

"ماڵی منیش ماڵی ئێوەیە".

رووەو سەرەوە بەرەو ماڵەوە کەوتنەڕێ. لێنا مێزی نانی بەیانی زۆر دەمێك بوو ئامادەکردبوو. بەبێدەنگی، بەڵام بەسەرێکی پڕ لەبیرو خەیاڵاتەوە بەرچاییان خوارد. شادمانیی دکتۆرو گەشاوەیی روخساری کاری لەوانی دیکەش کرد. تەنانەت لێناش حاڵەتێکی وەکو سەماکارانی هەبوو.

نووستن. رێك نیوەڕۆ بوو کە لێنا بانگیکردن. لەم میانەدا، کاتێك هەمووان لەخەودا بوون وەلی نیشانچی هاتبووو دوو لەگەنی پڕ لەماسی بۆ پویراز هێنابوون: "دەمەوێت مەنجەڵێکی گەورە دانێمە سەر ئاگردانو سووپی ماسی بۆ میوانەکان دروست بکەم".

کەمێك دواتر بۆنی سرکەی هەنارو سیرو ئەو سووپەی کە هاتبووە کوڵ فەزای ماڵەکەی وا پڕکردبوو کە چیوای نەمابوو میوانەکان هەموویان لەخەو هەستن.

دوای ئامادەبوونی سووپەکە نیشانچی گوتی: "باشە ئیدی خوا حافیز، ئەحمەد لەنێو بەلەمدا چاوەڕێمە. نیوەڕۆ داهات، ئێمەش دەبێت خواردن لێبنێینو نان بخۆین. لەدەریا لەرە لەری ماسیانە، پێویست بەقولابو تۆڕو نێزە ناکات. هەردەستت درێژبکەو ماسی هەڵبگرەوە. باشە ئیدی بەتواتان دەسپێرم".

لێنا گوتی: "سەبر بگرە، کەمێك سەبر بگرە".

نیشانچی گوتی: "کەمێك سەبرمان گرت. ئێستا کەی وەختی سەبرگرتنە هەی ژنی غەوارە. مەگەر پێمنەگوتی دەریا لەرەلەریەتی لەماسیان؟"

"گوتت، ژنی غەوارە. دایکت غەوارەیە کە بەهەرحاڵ تۆی هێناوەتە دونیا. بوەستەو وەکو بنیادەم گوێم لێبگرە".

"وەرە وەستاوم".

"ها، ئێستا تەواوە، خەریکی هێواش هێواش دەبیە بنیادەم. نیگەرانی منداڵەکان مەبە. مەلەك خانم وەکو کوڕەکەی خۆی چاودێریان لێدەکات. شیرو ماستی بزنە سوورەکانی خۆیانیان دەداتێ. منیش پێیانڕادەگەمو چاوم لێدەبن. منداڵی زۆر باشو عاقڵن. دەیاندوێنم. زۆرم خۆشدەوێن. بڕۆ خوا حافیزت بێت نیشانچی. نیگەرانی ئەوان مەبە". لێنا کەمێك بیریکردەوە، بیڵێم یان نەیڵێم، پاشان گوتی: "لەگەڵ منداڵە گەورەکەتان دانیشتبوومو پێکەوە قسەمان دەکرد، منداڵەکە لێپرسیم چاوەڕێی نەنە سوڵتانمم، بەڵام دیارنیە بێتەوە، لێیپرسیم دەبێت لەکوێ بێت، تۆ دەزانیت کەی دێتەوە؟"

نیشانچیو روژابووو وەکو کەوان کشرابوو:

"ئێ، تۆ چیت پێگوت؟ چیت پێگوت؟ چیت پێگوت؟"

"من پێمگوت نەنکە سوڵتانت لەگوند چاوەڕێیە، نیشانچی بەمزووانە دەڕوات دەیهێنێتەوە. کوڕێژگە لێیپرسیم نەنکم لەوێ چاوەڕێی چیە؟"

"ئێ تۆ چیتگوت؟"

نیشانچی زیاتر درێژ بووبووو چاوەکانی دەبریسکانەوە.

"منیش پێمگوت چاوەڕێی گوێز کۆکردنەوەیە. زۆر دارگوێزیان هەن کە گوێزەکانیان دەداوەشاند کۆیاندەکردنەوەو دەیانخستنە نێو گونیەکانو دەیانبردن دەیانفرۆشتنو پارەیەکی باشیان دەست دەکەوت. نەنکت بۆیە لەوێ ماوەتەوە کە گوێزەکان نەدزرێن".

نیشانچی بازی دایە لێناو ماچی کرد:

"تۆ خوشکە باشەکەی خۆمی، تۆ دایکە میهرەبانەکەی منیت، تۆ چ مرۆڤێکیت خوشکە لێنا، تۆ خوشکێکی چوند عاقڵیت، راستە سوڵتان چاوەڕێی گوێزەکانە".

"من دەزانم کە ئاوایە".

"خواحافیز".

بەخێرایی لەپلیکانەکان چووەخوار.

دروست نێوەڕۆ سێ لەو کەسانەی خەوتبوون پێکەوە هەستان. بەخێرایی خۆیان ئامادەکرد. ڤاسیلیو پزیشکی ئاژەڵانیش هاتن. موسا کازم ئاغا چاوەڕێی هەواڵێك بوو، پویراز بەپەلە رۆیشتو پلیکانەکانی دوو دانە دوو دانە بڕینو چووە سەرەوە. موسا ئاغا ئامادە بووبووو بەپێوە راوەستابووو چاوەڕوان بوو.

"چاوەڕێی ئێوەن ئاغا"

زەهرا بەبینینی پویراز وەك هەمیشە سوور هەڵگەڕاو چاوەکانی بریسکانەوە. لەکاتی رۆیشتنیان تا ئەو دەمەی لەپشت ڤامیشەڵانەکە لەبەرچاوان ون بوون هەروا سەیری پویرازی کرد. ئەمڕۆ سیمای پویراز نوقمی نێو شادی بوو.زۆر دەمێك بوو وەك ئەم بەیانیە ئاوا خۆشحاڵ نەبیندرابوو.

موسا کازم ئاغا کەمێك لەپێشەوەترو ئەوانی دیکە بەدوایدا هەنگاویان دەنا. موسا ئاغا سەری بۆ دواوە وەرسووڕاندو گوتی: "دەچینە لای دووکانەکان، مەگەرنا ڤاسیلی؟"

"ئەمانە دووکانەکانن مام ئاغا"و بەدەست ئاماژەی پێدان.

بەپێش کەوتو لەبەرامبەر یەکەمین دووکاندا راوەستا. لەپویرازی پرسی: "دەرگاکە بکەمەوە؟"

پویراز گوتی: "بیکەرەوە، بیکەرەوە".

ڤاسیلی لەسەر ئەژنۆ دانیشتو قفڵەکەی کردەوە. دەرابەکەی بەسەرو سەداوە بەرزکردەوەو لوولی دایەوە. رووناکیو تیشکی خۆر بەناو دووکانەکەدا پەخش بوو. لەبەر دەرگای دووکانەکە راوەستان. تاوێك ئاوا سەیری نێو دووکانەکەیان کرد. ناوەوە پاكو خاوێن بوو، مێزێك لەنێوەڕاستی دووکانەکە داندرابوو کە دەتگوت دوێنی جەلادراوە. پێنج دانە کورسیش کە وەك مێزەکە بریقەیان دەدا. چوار دانە مۆبلیش کە لەچەرمی بزن دروست کرابوونز چوونە ژوورەوە. رەفەو قەفەسەکانیشجەلا درابوون، تۆزقالێك گەردو تۆزیان پێوە نەبوو، مۆبلەکانو نێو دووکانەکەش هەروا بوو.

دکتۆر خەلیل رەفعەت بەپێکەنینەوە گوتی: "ئێرەیان دوێنی پاککردۆتەوە".

دکتۆر سەلمان سامی کە دەستی بەنێو رەفەکاندا دەگێڕا گوتی: "دوێنی پاکیانکردۆتەوە".

ڤاسیلی بەشانازییێکەوە هاتە قسە: "لەم دوورگەیەدا تۆزو گەردێك نیە تا لەدووکان بنیشێت".

ڤاسیلی بەدەم پێکەنینەوە گوتی: "نیە، چونکە هەر چوار لای دەریایە. جگە لەوە هەمووی مێرگو گوڵو گوڵزارو پڕ دارو درەختە. خەڵکی ئەم دوورگەیە کەسانێکی تەمەندرێژ بوون".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "چ باش! لەوانی ئێمەشدا خەڵکی زۆر تەمەن دەکەن.

دەریاچەی وان بەرامبەرمان بوو".

"هەموو شت هەیە، هەرچی بمانەوێت فەراهەمە".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "تەنها دوو شتمان کەمە".

دکتۆر سەلمان سامی بەڕاوێژێکی گاڵتەئامێزەوە پرسی: "ئەو دووشتانە چین؟"

"مێزێکی پشکنینو مێزێك بۆ نەشتەرگەری. ناتوانین هیچکامیان لەشارۆچکە یان لەشارێکی نزیکدا پەیدا بکەین".

سەلمان سامی گوتی: "ئێمە هەردووکیانمان هێناون. کاك جەمل ئێمە لەم دوورگەیەدا کاری پزیشکیمان کردووە، شەوو رۆژ لەنێو خوێنو کێمو زوخاو. سبەی دەرمانو کتێبو کەلوپەلەکان دێنینو دووسبەیش دەست بەکار دەبین".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "مەگەر چاوەڕین لەچاناك قەڵاوە بریندارتان بۆ بێن؟"

"ئەم دوورلاگەیە زۆر نابات پڕ دەبێت".

دکتۆر خەلیل رەفعەت بەهەڵچوونێکەوە گوتی: "پڕیش نەبێت پڕی دەکەین".

پزیشکی ئاژەڵان گوتی: "ئینشاللا. بەلای ئێمەوە پڕیش نەبێت گرنگ نیە. ئێمە ئیدی، دەستمان بەماسیگری کردووە".

سەلمان سامی گوتی: "پیرۆزبێتو خوا بەرەکەتتان بدات". بۆ جاری سێیەم سەرلەبەری قەفەسەو رەفەکان گەڕا. دەستی بەهەموو جێگایەك داهێنا. سەیری دەکردو یەکڕیز دەیگوت: "زۆر جوانە، زۆر جوانە. پاكو خاوێن، پاكو خاوێن".

دوای ئەوەی کە جارێکی دیکەو بۆ دواجار دەگەڕا، لەبەردەم پویراز راوەستا:

"ئێستا دەبێت چیبکەین پویرازی برا، ئێرە ئەو شوێنەیە کە بەکەڵمان دێتو بۆ کارەکەی ئێمە زۆر باشە".

"لەبارەی چیەوە چیبکەین؟"

"ئەم دووکانە هی کێیە؟"

"پێمگوتن قوربان، ئەم دووکانە هی منو کاك جەمیلی پزیشکی ئاژەڵانە".

"دەبێت کرێیەکەی بدەینە ئێوە، یان گەرەکتانە بیفرۆشن؟"

"کرێ نادەن. ئێمەیش نایفرۆشین. ئەگەر بتانەوێت ئەم دووکانەو دووکانەکەی تەنیشتی بەدیاری دەدەینە ئێوە".

ئەوەی لەتەك پزیشکی ئاژەڵان راوەستابوو قۆڵی گرتو بۆ لای خۆی رایکێشا:

"بێژە برا، ئەم دووکانەو ئەوەی تەنیشتیشمان بەدیاری دایە دکتۆرەکان".

پزیشکی ئاژەڵان بەخۆشحاڵیەوە گوتی: "بەدیاریمان دانێ وەکو شیری دایکیان حەڵاڵیان بێت".

"دامان دکتۆر، دامان". "ئینجا؟"

"ئیدی تەواو، ئینجاو مینجای ناوێت دکتۆر. ئەم دووکانەو ئەوەکەی تەنیشتمان بەدیاری دایە ئێوە".

"مەگەر دەشێت، ئاخر ئێوە ئەو هەموو پارەیەتان پێداوە".

"دەشێت دکتۆری هێژا. ئەگەر ئەو هەموو پارەیەشمان لەسەر دابێت کە تۆ دەیڵێییت هێشتاش هەر دەمانکردە دیاری بۆ ئێوە، تکایە قبوڵی بکە".

"سەیرە".

"هیچ سەیر نیە دکتۆر. دەزانیت ئێمە بۆچی ئەم دووکانانەمان کڕین، رەمزی کاولاکزادە دەناسیت، هەر ئەو کەسەی کە کلێساو کۆشکی چورباچیەکانی تێکداو کەلوپەلو کەرەسەکانی فرۆشت، لەوە ترساین کە ئەم دووکانانەش بکڕێتو هەموویان تێك بدات. بۆ ئەوەی نەتوانێت تێکیان بدات کڕیمانن. خانووی مامۆستایانیشمان کڕین. خوێندنگەیان پێنەدەفرۆشرا، ئەومان نەکڕی. یانی کاتێك ئەم دوورگەیە پڕ دەبێت لەخەڵك پێویستی بەدووکان نیە؟ ئەمە شتێکی سەیرە کاك دکتۆر؟ تکایە قبوڵی بکە".

سەلمان سامی بەپێکەنینەوە گوتی: "دوای ئەو هەموو قسە باشەنەتان مەگەر دەتوانم قبوڵی نەکەم؟ قبوڵمان کردو تەواو. رات چیە خەلیل؟"

"قبوڵمان کردو تەواو، بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە. بابچین دووکانەکەی تەنیشتیشمان بکەینەوە، بەڵکو گۆزەیەك زێری عوسمانی تێدا بدۆزینەوە".

پویراز گوتی: "نا، زێڕی ناپلیۆنی. ئێمە لەم ناوچەیەدا زێڕی ناپلیۆنی بەکار دێنین!"

موسا ئاغا سەری لەبەرخۆی نابووو گوتی: "کاکە پویراز راست دەکات. راستە ئێمە هەمیشە لەم دوورگەیەدا پارەی ناپلیۆنی بەکاردێنین".

پویراز دەرابەی دووکانی دووەمی بەسەرو سەداوە هەڵدایەوە. لەناو ئەم دووکانەش مێزێکی جەلاکراو هەبووو لەسەر مێزەکە شووشەی مەرەکەب، چەند دانەیەك قەڵەم، چەند دەفتەری بەرگ چەرمیو کتێبی قەبەقەبە لەسەریەك داندرابوون. هەروەك موسا کازم ئاغا دەیگوت ئەو کتێبە زێرچنەی کە لەسەر کتێبەکانی دیکە داندرابوو ئینجیل بوو. کتێبەکەی کە لەبن ئینجیل داندرابوو مێژووی یۆنان بوو. ئەم دووکانە لەدووکانەکەی دیکە پاكو خاوێنتر بوو.

"ئێرە دەکەینە ژووری نەشتەرگەری".

دکتۆر سەلمان سامی گوتی: "باشە، ئێستا دەبێت داودەرمانو ئامێرو شمەکەکانو هەموو ئەو شتانەی لەگەڵ خۆمان هێناومانە بێنینو دایانبنێینە ئێرە".

پویراز گوتی: "ئەمە کارێکی ئاسانە. تەنها دەبێت یەکێکتان لەماڵەوە بێتو دەرمانەکان بداتە ئێمەو یەکیشتان لێرە لێمانوەربگرێتو دایانبنێتە نێو رەفەکان. دووکەسیش دادەنێین کە دەرمانەکان لەو جێگایە دابنێن کە ئێوە دەیڵێن. لێرە کەسانێکی زۆر بۆ ئەم کارانە هەن. منداڵەکان، ژنەکان... فراوینیش هەر لەژێر چنارەکان دەخۆین.

باشە، ئیدی تەواو، هەر سەرکەوتوو بن".

دکتۆر خەلیل رەفعەت لەدووکانەکە مایەوە. دکتۆر سەلمانیش لەگەڵ ئەوان چووە ژێر چنارەکان. هوسمەن کە ماوەیەك بوو لەم ناوەدا نەدەبیندرا لەسەر تەختەکان دانیشتبووو چاوەڕوانی ئەوان بوو.

"زووبە هوسمەن خێرا بڕۆ سەبیحەو منداڵەکان بانگ بکە، پێکەوە بچنە ماڵی دکتۆرو دەرمانو کەسەرەتەو کەلوپەلەکانو هەرچی کە بۆ ژووری نۆڕینگە پێویستە

هـەڵبگرنو بیانبـەن لەدووکانەکـەیان دابنـێن. یارمـەتی دکتـۆر خـەلیل ڕەفعـەت بـدەن. لەکوێ بوویت هوسمەن، نەکا تۆش بووبیتە ماسیگر؟"

هوسمـەن بەحاڵـەتێکی لەخۆباییانـە گـوتی: "بوومەتـە ماسـیگر، جـا تـۆ بڵـێ چ ماسیگرێك! نیشانچی بەلـەمێکی زۆر هـەرزانی لـەو کـابرا کوێرە بـۆ کڕیـوم. کـابرای کوێر پارەی وەرنـەدەگرت. نیشانچی بەزۆری هەندێك قرۆشی پێدان. شتێکت پێبڵێم، ئا ئەو کوێرە نـاوی چـیبوو؟ سـاڵحەکوێر. ئـەو زۆر لەنیشـانچی دەترسـێت. نیشـانچی ئەگەر بەتوندی قسەی لەگەڵ بکات بەخۆیدا دەمیزێت. باشە ئیدی تۆ لێرە بمێنەوە، ئێمـە دەرمانــەکان دەبــەین. شـتگەکێکی زۆر هەیـە کـە دەبێـت پێتـی بڵـێم. دەبێـت ئاگامان لەو نیشانچیە هەبێت".

لەم ساتەدا قەدریی بەلەموانیش هاتە ژێر چنارەکان.

"هوسمەن، قـەدریی بەلـەموانیش هـات. ئـەویش لەگـەڵ خۆتـدا ببـە. بـڕۆن نـەوەکانی نیشانچیش بدۆزنەوە. لێنا دەزانێت لەکوێن. ئەوانیش دەتوانن لەگواسـتنەوەو ڕێکخسـتنی کەلوپەلەکان یارمەتیتان بدەن.

"منداڵـەکان ئێسـتا لـەماڵی ئێمـەن، دایکـم کـاری پێیـان هـەبوو. هـەر ئێسـتا دەچـم دەیانبەمە لای دکتۆر".

"مـن لەگـەڵ ڤاسـیلیدا دەچمە ڕاوەماسـی. تـا مـن دەگەڕێمـەوە بەمنداڵـەکان بڵـێ دارو چیلکەی زەیتوون کۆبکەنەوە، تێگەیشتی؟ ئەو ماسیانەی نیشانچی هێناونی بەش ناکەن".

"تێگەیشتم. سوپاس، سەرۆك".

"منیش سوپاسی تۆ دەکەم کاك قەدریی بەلەموان".

دکتۆرەکان، هوسمەن سـەبیحەو قـەدریی بەلـەموان دەسـتیان بـەکارکرد. پـویرازو ڤاسـیلی بـەرەو ئەسـکەلە ڕۆیشـتن. موسـا کـازم ئاغـا گـوتی: "خـوا ئاگادارتـان بێـت منداڵینـە.... بەدەسـتی پـڕ بگەڕێنــەوە. نیـوەڕۆ ڕێـك ئـەو دەمـەی خـۆر بـەژوور سەرمانەوەیە من لێرە دەبم".

پویرازو ڤاسیلی لەسـەر ئەسکەلە بـوون کـە پزیشکی ئـاژەڵان بەنەرمـە ڕاکردنێکـەوە هاتو خۆی گەیاندە ئـەوان وگـوتی: "منـیش دێـم. بەبەلەمەکـەی مـن دەچـین. چیدەبێت ئەگەر جارێکیش بەبەلەمەکەی من بچینە ڕاوەماسی".

پویراز گوتی: "بابڕۆین‌و ماسیان بگرین. بەلەمەکەی تۆ ئەوەنـدە جوانـە کـە ناکرێـت مرۆ دڵی نەهێت بیباتە راوەماسی. پیـاو لـەنێو دەریـای روونـدا لەنگـەر بگرێـت‌و لـەلێوار دابنیشێت‌و سەیری بکات. سێبەرەکەشی بکەوێتە سەردەریا".

تـا نیـوەڕۆ هـەموو دەرمانـەکان‌و کەرەسـتەو کەلوپـەل‌و هـەموو شـتێکی کـە بەکـەڵکی دکتۆرەکان بێت گوازرانەوە نێو دووکانەکان. دوای ئـەوەی کـە سـەبیحە دووکانـەکانی وەك ئــەوەی خــۆی حــەزی لێبــوو جــارێکی دیکــەش پــاککردەوە، هــەموو شــتێك بــەوردی‌و هەستیاریەوە لەشوێنی خۆی داندران‌و رێکخران. کارەکە کە تەواو بوو هـەموویان چـوونە نێو دارزەیتوونەکان‌و هەریەکەو بەباوەشێك دارو چیلکە گەڕانەوە بۆ ژێر دارچنارەکان.

هوسمـەن خـۆی گەیانـدە سـەر تەپۆلکـە بچـووکەکەی نێـو مـاڵان‌و سـەیری رێـڕەوی ماسیگرانی کردو هاواری کرد:

"وا خەریکە دێنەوە، ئاگر بکەنەوە. چەند خولەکێکی دیکە دەگەن".

دکتۆرەکان لـەو هـەموو پـەنگرە لەسـەر یـەك کەڵەکەبووانـە سەرسـام بـوون. لەلایـەك لەلێوار ماسیان پاك دەکردەوە لەلایەکی دیکـە ماسـیە خـۆی لێـدراوەکانیان دادەنایـە سـەر پەنگران‌و بەمەقاش ماسیەکانیان بەسەر پۆلوان هەڵگێرو وەرگێـڕ دەکـردو دەیانبرژانـدن. بۆنی ئـەو ماسـیانەی کـە بەسـەر پۆلوەکانـدا ئەمـدیوو ئـەو دیویـان پێـدەکرا زگـی برسـی خەڵکەکەی دەهێنایە قۆڕەقۆڕ.

دکتۆرەکان ئەوەندەیان ماسی خوارد کە ورگیان هەڵمسابوو.

دکتـۆر سـەلمان سـامی گـوتی: "لەهـەموو تەمەنمـدا نـە ماسـیی ئـاوا خـۆش‌و بـەتامم خواردووەو نە زەلاتەی وا".

دکتۆر خەلیل رەفعەت گوتی: "منیش هەروا".

نانیان خواردبوو کە بەلەمێکی مـاتۆڕدار هـات‌و لەئەسـکەلە لەنگـەری گـرت. دوو ژن‌و دوو مێرمنــداڵی دە دوازدە ســاڵە لەبەلەمەکــە دابــەزین. هوسمــەن‌و ڤاســیلی بــەخێرایی خۆیان گەیاندە ئەسکەلەو چـوونە لای ئـەو دووژنـە کـە لەسـەر ئەسـکەلە راوەسـتابوون‌و پێیانگوتن: "بەخێربێن".

ژنەکان هیچ قسەیەکیان نەکرد، وەکو خەواڵوان وابوون، سـەریان لەبـەرخۆیان نـابووو لەنێو خۆیاندا گرمۆڵە بووبوون. یەکێك لەمێرمنداڵەکان گوتی: "سوپاستان دەکەین".

بەلەموانەکـــەش لەبەلەمەکـــەی هاتـــەدەر. ڤاســـیلی هـــەموو ماســـیگرکانی ئـــەو دەوروبەرانـەی دەناسـی. چ یۆنـانیو چ موسـڵمان. بیریکـردەوە ئـەو پیـاوە خـەڵکی کوێیـە، لەکوێوە هاتووە. ماوەیەکی باش لێیڕاما، بەڵام نەیناسیەوە.

پیاوەکە گوتی: "ئاوا سەیرم مەکە سەرۆك، ناتوانیت من بناسیت، چونکە پێشـتر منـت نـەبینیوە". بەشـێوەزارێکی تێکەڵوپێکـەڵی دەریـای ڕەش دەدوا. "ئـا، ئـەوەم بـۆ بـانگ بکـە بابێتە ئێرە. دەمەوێت دوو قسانی لەگەڵ بکەم".

"مەبەستت کێیە؟"

"ئا، پێمگوتی، لەگەڵ سـەرۆك پـویراز، کەسـێك بـەو نـاوە لـەم دوورگەیـەدا هەیـە؟ ئـا، گوتم سەرۆك پویراز، ئێرە هەمان ئەو دوورگەیە؟"

"ئێرە ئەو دوورگەیە، ئەو کەسەی باسی دەکەیت خۆیەتی. پشتی کردە کابراکە:

"سەرۆك پویراز، سەرۆك پویراز، ئەم ماسیگرە کاری بەتۆ هەیە".

ژنەکانو منداڵەکان پاڵیان دابووە یـەكو لەتـەك کەلوپـەلو بارەکانیـان راوەسـتابوون. کاتێك پویراز هات ژنەکانو منداڵەکان کەمێك زیاتر پاڵیان بەیەکەوەدا.

"بەخێرهاتی بەلەموان".

"سـوپاس تـۆ پـویرازی، هـاااا تـۆ ئـەویت. کەسـێکی سـەر بەحکومـەت پێیگـوتم". بەدەست ئاماژەی بەژنو منداڵەکان کرد. "پێیگوتم ئەمانە هەڵبگرەو بیانبـە بـۆ ئـەو دوورگەیەو کرێیەکەشیان لەو وەربگرە. ئەمانە هیچ پارەیەکیان نیە. نانیشیان نیـە. وەك دەڵێن بڕیار وایە تـۆ خـانووو نـانو پارەیـان پێبـدەیت. پێتخۆشـبێت دەتوانیـت پارەکەی من نەدەیت. تەنها ئەگەر کەمێك بەنزینم بدەیتێ. ئەویش مـەدە. مـن لـەم دەوروبەرانە هاوشاریەکی بزۆزی خـۆم هەیـە بەڕاسـتی بـزۆزە. فـەرمانڕەوای ماسـیی حەوت دەریایان بوو.

هـەموو دێهاتـەکانی لێـوار دەیناسـن. ئێسـتا دەڵەمەنـدبووە، چـونکە باشـترین جـۆری ماسیەکان دەگرێتو دەیانفرۆشێت. تۆ دەیناسیت؟"

"دەیناسم. چەند پارەت دەوێت؟"

"نازانم. خۆت دەزانیت".

"ڤاسیلی پارەی بەلەموان بدە".

"من کەی لەشارەکەی خۆم سەرۆك بووم؟"

ڤاسیلی کیسە زەنگیانەچنەکەی لەگیرفان دەرهێنا کە دەستچنی کچانی تورکمەن بووو برێـك پـارەی خـوردەی لێهنایـەدەرو دوای ئـەوەی چـەند جارێـك لەسـەریەك ژمـاردنی هەمووی خستنە سەر لەپی دەستی سەرۆك.

سەرۆك دوای ئەوەی تاوێك لەپارەکانی سەر لەپی دەستی راما، خستنە نێو گیرفانی.

"سفرە ئامادەیە، پشکۆکان گەشاوەن. نانو ماسی تـا بلێیـت هەیـەو ئـاویش هەیـە. مەلـەك خانم زەلاتەیەکی بەتەماتەو پیازو بیبەری سەوزو پونگەی دروستکردووە. دێیت؟"

"هەڵبەتە دێم، دەمم پڕبوو لەئاو. پڕ لەئاو".

"خانمەکان ئێوەش زووبـن وەرن. منداڵـەکان بـۆ هـەر یـەکێکتان دانەیـەك ماسـیی گەورە داندرداوە".

منداڵەکان شەکەتو ماندوو بوون. پێکەنین.

"دەی بابڕۆین. ڤاسیلیو هوسمەن ئێوە کەلوپەلەکان هەڵبگرن".

هوسمـەنو ڤاسـیلی چـوون کەلوپەلـەکانیان هـەڵبگرن، داهاتنـەوە کەلوپەلـەکانیان هەلگرت، ژنو منداڵەکان بەکەلوپەلەکانەوە چەسیبوون لێیجیانەدەبوونەوە.

"خانمەکان کەلوپەلەکانتان هەڵبگرنو وەرنە ژێر چنارەکان، نان بخۆین".

ژنەکان کەلوپەلەکانیان هەلگرتو بەرەو ژێر چنارەکان رۆیشتن.

مەلـەك خـانم گـوتی: "بـارو کەلوپەلـەکانتان بێـننو دایانبنێنـە ئێـرە، سـەر چیمەنەکە".

ژنـەکان گوێیـان پێنـەدا، لەکاتێکـدا بارەکانیـان بەسـەر کۆڵیانـەوە بـوو، هـەروا وەستابوون. مەلەك خانم چەند جار دووپاتی کردەوە، ژنەکان خۆیان لەگوورە نەبرد. تا هاتنی پویراز لەگەڵ بەلەموانەکە قسەیان کرد.

"بۆچـی بارەکانتـان هـەر بەسـەر کۆڵتانەوەیـە؟ هـەر لێرووکانـە لەشـوێنێکیان دابنێن".

مەلەك خانم گوتی: "پێمگوتن، بەڵام گوێیان نەدامێ".

ژنــەکان بــەوردی ســەیری دەوروبــەری خۆیــان کــردو بارەکانیــان بــرد لەســەر چـیمەنەکە دایاننـان خۆیشـیان لـەپێش بارەکانیـان دانیشـتن. تـا تـەواوکردنی نـانو

ماسیو زەڵاتەکە چاویان هەر لەسەر بارەکانیان بوو. کە لەنانخواردنیش بوونەوە هەستانو چوون لەسەر چیمەنەکە دانیشتنو پشتیان بەبارەکانیانەوەدا. منداڵەکانیش هاتنو لەتەك دایکەکانیان دانیشتن. ژنەکان بەپرچی بۆریان، چاوی شینیان، چاڵی گۆناکانیان، چەناگەی باریکیان، کەپووی هەڵۆیی، رووپۆشی خەتخەتی رەشو کۆنیانو کەزیە هۆندراوە درێژەکانیان هەموویان لەیەك دەچوون. منداڵەکانیان قژیان بۆر بوو، روومەتیان چاڵو چەناگەشیان چاڵ، ملدرێژ، کەپووی باریکی لەبەر هەتاو هەڵقرچاو لەدایکەکانیان دەچوون. ژنەکان ناسكو بەژندرێژ بوونو دەستو مەچەکیان جوان بوو. کامڵە پیاوەکانی ئەوێ بەکەمێك شەرمەوە سەیری ئەو دووجوانانەیان دەکرد. مێرمنداڵەکانیش مێرمنداڵی جوانکیلە بوون. شەلواری سەیرو دڕاو، بەڵام پاکیان لەبەربوو، ئێلەگە خەتخەتیەکانیان پاكو خاوێنو پینەلێدراو بوون. کوڕێژگەکان پێدەچوو دە دوازدە ساڵە بن، لەبنەوە بەنەرمی سەیری یەکدیان دەکردو پێدەکەنین، ژنەکانیش لەو کەسانەی کە لەژێر دارچنارەکان دانیشتبوون رامابوون وەك ئەوەی بەنیگاکانیان هەڵیانبسەنگێنن.

پویراز پرسی: "کێ ئێوەی ناردووەتە ئەم دوورگەیە؟"

ژنەکان سەیرێکی یەکدیان کرد. ژنەی لای دەستە راست گوتی: "تا ئێستا لەم کێڵگەو لەو کێڵگە کارمان کردووەو ئاوا هاتووین تا گەیشتینە ئەو شارۆچکەیە، لەوێ هیچ جێگایەکمان بۆ حەوانەوە دەست نەکەوتو پارووە نانێکمان بۆ پەیدا نەکرا، کە شەو داهات چووینە حەوشەی مزگەوتو لەبن درەختێکدا دانیشتین. دیارنەبوو کێ دێتو کێ دەڕوات. کەس پرسیارێکی لێنەکردین. رادەوەستان سەیرێکیان دەکردینو پاشان ملی رێگایان دەگرتو دوور دەکەوتنەوە. هەوا خەریکبوو رووناك دەبووەوە کە ژنێکی نوورانی هاتو قابلەمەیەکی بەدەستەوەو باغلەمەیەك کلیمیشی بەبن هەنگڵیەوە بوو. قابلەمەکەی دانایە سەر عەرزەکە. بۆنێکی خۆشی خواردن لەقابلەمەکەوە هات. سفرەیەکی لەسەر چیمەنەکە راخست. نانەکان تازە لەتەنوور دەرهاتبوون، تەنانەت لەخواردنی ناو قابلەمەکەش خۆشتر بوون.

هەریەکەو کەوچکێکی داینێو گوتی نۆشی گیانتانو رۆیشت، کەمێك دواتر دیسان بەگۆزەیەك ئاوو کاسەیەکەوە هاتەوەو ئاوەکەی لەپێش ئێمەی دانا.

نزیکەی نیوەڕۆ بوو هات قابلەمەکەی هەڵگرتو بردیەوە. نیوەڕۆ ژنێکی نوورانی دیکە هات. گەنجێکیش بەدوایدا هات کە سەبەتەیەکی پێبوو. ئەو خاتوونەش گۆزەیەك ئاوو کاسەیەکی بەدەستەوەبوو... ئەو سفرە لەکلیم دروستکراوەی کە لەژێر هەنگڵی بوو لەسەر چیمەنەکە پانیکردەوەو نانێکی سوورو گەرمو بەتامی لەو کیسەیە دەرهێنا کە پێیبووو هەریەکەو پارچە نانێکی بۆ لێکردینەوەو دایە دەستمان. هەریەکەو کەوچکێکی نەخشێندراوو رەنگاوڕەنگی دایە دەستمان کە دەستکردی شاری قۆنیە بوونو گوتی کەوچکەکان بابۆ خۆتان بن. پاشان بەدەستی خۆی ئەو پەتاتەو گۆشتەی نێو قابلەمەکەی بۆ لەنێو قاپەکانی بەردەممان کردو ئەویش بێئەوەی هیچ قسەیەکی دیکە بکات گوتی: (نۆشی گیانتان بێت)و رۆیشت. حەوت رۆژ لەنێو حەوشەی مزگەوتەکە ماینەوە".

بێدەنگ بوو، سەری لەبەرخۆی نایەوەو ئاوا مایەوە.

پویراز گوتی: "بێژە، خوشکەکەم، سەیر بکە، ئەو هەموو خەڵکە سەیری دەمی تۆیان کردووە. بێژە تا..".

"دوایێ سەر لەبەیانی رۆژی حەوتەم یەکێك هاتو گوتی ئاوا نابێت. تاکەی دەتوانن لەحەوشەی مزگەوت بمێننەوە. دراوسێکان تاکەی دەتوانن کۆمەکتان بکەن، گوتی وەرن، ئێمەی بردە ئەسکەلە. لەمزگەوتەکە بەپێ توانیمان بچینە ئەسکەلە. هەفتەیەك پێشتر بەرلەوەی خەڵکەکە خواردنمان بداتێ تەنانەت نەماندەتوانی دوو هەنگاویش هەڵێنین. ئەو کابرایە ئێمەی بردە قاوەخانەی ئەسکەلەو لەوێ داینیشاندین. لەقاوەخانەکە هەر کەسێك ئەوی دەبینی لەبەری هەڵدەستا. ئەو پێیدەگوتن دابنیشنو خەڵکەکە دادەنیشتنەوە.

لەوێ خواردنی جۆراوجۆریان بۆ هێنایین. دونیایەك چامان خواردەوە. شەویش هەر لەقاوەخانەکە خەوتین. بەیانیەکەی زوو ئەو کابرایە لەگەڵ حەسەنی بەلەموان هاتو گوتی ئەمانە ببە بۆ دوورگەی پویراز، پێیگوت دوورگەی پویراز پێدەزانیت. حەسەنی بەلەموان گوتی، رێڕەوەکەی پێدەزانم، ئەو کابرایە گوتی ئەمانە ببە لای ئەو".

"ئەو کابرایە ناوێکی نەبوو؟"

"هەڵبەتە دەبێت هەیبێت، چما دەشێت بێناو بێت؟"

"کابرایەکی چۆن چۆنی بوو؟"

"پیاوێك بوو وەکو چیا. بەمووی سپیو پڕ، سمێڵیشی سپی بووو دەمی داپۆشیبوو. سمێڵی وەکو کلکی ڕێوی وابوو. من لەتەمەنمدا سمێڵی ئاوام نەبینیوە. ئەوەی لەدواوەمان دانیشتبوو گوتی پادشا راستەقینەکان بەو شێوەیەن. ئەوەکەی دی گوتی هەموو پادشاکان بەم شێوەیە نین.

ماوەیەك ئەو گوتی بەو شێوەیەنو ئەم گوتی بەو شێوەیە نین. لێیانبووە شەڕ. ئەو پیاوەی کە دەیگوت ئاوا نین لەقاوەخانەکەیان دەرکردە دەرەوە دوای ئەوە تا نیوەشەو لەبارەی ئەو پاشایە قسەیان کرد.

پاشانیش سواری ئەم بەلەمە ماتۆڕدارە بووینو هاتینە ئێرە".

"بەخێربێن. ئێمە لەدوورگەکەمان هەم کارمان هەیە بۆتانو هەم خانووش".

"تۆ ناوت چیە؟"

"پویراز موسا".

"ئەم دوروگەیە بەم هەموو گەورەییەیەوە هی تۆیە؟"

"نا هی من نیە". ڤاسیلی نیشان دا "بەرلەمن ئەمە لێرە بوو. دوای ئەو من هاتم. بۆیە ئەو پیاوەی کە سمێڵی لەکلکی ڕێوی دەچێت ناوی ئەو دوورگەیەی ناوە دوورگەی پویراز".

"ئەو پاشایە؟"

"جاران پاشا بووە".

"خوا خێرت بنووسێت".

"خوشکەکەم، منداڵەکان، حەسەنی بەلەموان، ئێمە نانمان خواردووە. چی زۆر ماسی زۆرە، سەیر بکەن ڤاسیلی وا خەریکە بۆ ئێوە دەیانبرژێنێت. سەر مێزەکەش پڕە لەزەڵاتە، دەستی لێنەدراوە. سرکەی هەناریش هەیە، تەنانەت سماقیش".

بەرلەوەی کە قسەکەی تەواو بکات حەسەنی بەلەموان گوتی: "ئەگەر تۆ کارەکەی من جێبەجێ نەکەیت منیش ئیدی نەماسی دەخۆم نە ئاو، لەبرسانیش بمرم. تەرمەکەم فڕێبدەنە نێو دەریای گەورە".

"سەبر بگرە بەلەموان. مخابن نیە بۆ تۆ؟ نەکەی ئەم کارە بکەیت. نابێت خۆت فڕێبدەیتە نێو دەریا".

"باشە ئێستا کە ئاوایە، بەڵێ مـن دەمـەوێت لـەم دوورگەیـەدا بمێنمـەوە. تـەنها چـەند قسەیەکم هەیە دەمەوێت پێتبڵێم، با جارێ نان بخۆم ئینجا".

پویراز گوتی: "باشە. جارێکی دیکە ورگت تێر بکە تا زمانت ببێتەوە".

ڤاسیلی ماسیەکانی بەسەر سینیەکەوە هێنان. هـەر لەگـەڵ ئـەوەی سـینیەکەی لەسـەر مێز دانا منداڵەکان هەریەکەو ماسـیەکیان هـەڵگرتو وەکـو برسـی سـاڵی گرانـی دەسـتیان بەخواردن کرد".

حەسەن بەپەلە ماسیەکەی خۆی تەواو کردو چووە لای پویرازو گوتی:

"هەستە برا، با کەمێك لێرە پێکەوە پیاسە بکەین تا..".

هەستانو بەرەو قامیشەڵانەکە چوون.

"تۆ بەرلەوەی بهێیتە ئەم دوورگەیە چیتدەکرد؟"

"سەرباز بووم".

"ئەفسەر بوویت وانیە؟"

"چۆنت زانی؟"

"ئەفسەرەکان هەموویان پێکدەچن. جێی سەرسوڕمان نیـە. چ بچووکیان چ گـەورەیان جیاوازی نیە".

"ئەفسەرم".

"تۆ هێشتا هەر منداڵیت، لەکام بەرەی جەنگ بوویت؟"

"لەبەرەی رووسەکان، لەساری قامیش، لەچیاکانی ئەللاهوئەکبەر لەئورفا".

"ماشەللا سەرو سەکۆتێکی باشت هەیە، بەڵام هێشتا منداڵیت".

"تەمەنم شازدە حەڤدە ساڵ بوو کـە لەخوێندنگـەی سـەربازیەوە یەکسـەر بردیـانم بـۆ نێو بەرەی جەنگ".

"چەند کەس لەئێوە بەزیندوویی دەرچوونو ماونەتەوە؟"

"نازانم، ئێستا تۆ چیتدەوێت ئەوە بڵێ".

"دەیڵـێم هەڵبەتــە دەیڵـێم، بــەڵێن بــدە کــە کــارت بەمنــەوە نــەبێت، مــن رادەســت نەکەیتەوە کە لەدارم بدەن. ئەگەر ئـەو قسـەیەی دەیکـەم بـەدڵت نـەبوو وازم لێبێنـە بـۆ خۆم لێرە دەڕۆمو دوور دەکەمەوە، بەڵێن دەدەیت؟"

"بەڵێن دەدەم".

"من سەربازی هەڵاتووم".

پـویراز لەپێشـی راوەسـتا، چـاوی بڕیـە نێـو چاوەشـینە زەقـەکانی کـە حاڵـەتێکی پاڕانەوەیان هەبوو. ماوەیەك ئاوا لەچاوی یەکدی رامان. حەسـەنی بەلـەموان هەنـدێکجار سوور هەڵدەگەڕاو هەندێکجاریش رەنگ بەڕووانیەوە نەدەما.

ورده ورده گـرژو تـووڕە دەبـوو، سـەری لەگێـژەوە دەچـووو چـاوەکانی دەکەوتنـە رەشکەوپێشکە. ئـەو حاڵەتـە گـرژو تووڕەیـەی حەسـەن تـا ئـەو دەمـەی پـویراز پێکـەنی بەردەوام بوو.

پویراز گوتی: "نیوەی خەڵکی ئەم وڵاتە سەربازی هەڵاتوون".

"تۆش؟"

"دوای ئـەوەی سـوپا لەبـەرەی رووسـەکان شکسـتی خـوارد، پەیوەنـدیم بـەهێزەکانی بەرگریی میلليی دژی فەرەنسیەکان کرد لەبەرەی ئورفا.

"پاشان؟"

"پاشان، هەر ئەوەیە".

"هەر ئەوە؟ راست دەڵێیت؟"

"سـبەی پزیشـکی ئـاژەڵان بەبەلەمەکـەی خـۆی دەتگەیەنێتـە شارۆچـکە. ناسـنامەو قەباڵەی خانووەکەت بۆ وەردەگرێتو دەیخاتە نێو گیرفانتەوە. هەر بیریـش لـەوە مەکـەوە کە سەربازی راکردوویت. لەسەربازیەکەتدا لەدەربەند بوویت. باشە؟"

لەوێ بەرامبەر ئینگلیزەکان بوویت، تێگەیشتیت؟"

"باشە، بەڵام ئەو دەربەندە لەکوێیە؟"

"میسـر، فەلەسـتین ئـەو دەوروبەرانـە. لـەوێش بـەرەی دژی ئینگلیـزەکـان هـەبوو. لەبـــەرەی دەربەنـــد ســـەربازێکی زۆر کـــوژران. تـــۆ لـــەوێ عـــەریف بوویـــت. عەریف حەسەن".

"دەترسم. تۆ دەتوانیت لـەجیاتی مـن لەگـەڵ پزیشـکی ئـاژەڵان بچیتە شارۆچکە؟ تـۆ لەجیاتی من ئەم کارانە ئەنجام بدە. ئەگەر من بناسنەوەو بمبیـنن‌و بمگـرم، گـوێ نادەنـە پاڕانەوەو فرمێسکەکانم‌و یەکسەر لەسێدارەم دەدەن".

"ببینه دۆستی هێژام، عەریف حەسەن، هیچ مەترسە. ساڵەهایە کە جەنگ کۆتایی هاتووە. ئەو مەسەلەیەی سەربازی هەڵاتوو زۆر لەمێژە تەواو بوو. تەنانەت ئەگەر بشتگرن لەسێدارەت نادەن، تەنها دەتبەنەوە بۆ سەربازی. سەربازیەکەت تەواو دەکەیتو دەگەڕێیتەوە".

حەسەن لەرزی: "من ناچمەوە سەربازی. دەمنێرنە بەرەی جەنگ".

"دەڵێم جەنگ کۆتایی هاتووە، جەنگ کۆتایی هاتووە، کۆتایی هاتووە".

"تۆ ئاوا بیردەکەیتەوە. جەنگ هیچکات تەواو نابێت کاکە. وازم لێبێنە بابڕۆم. پارەشم لێتناوێت. چیدەبێت لێمگەڕێ بابڕۆم، کەسێکی باشیت کاکە. تێگەیشتووو خاوەن هەست، بەڵام هێشتا منداڵیت، عەقڵت پێیداناشکێت. ئەگەرچی لەسەر لێواری مەرگ گەڕاویتەوەو گیانی خۆت دەربازکردووە، هیچشتێکت نەبینیوە، تێبینی هیچشتێك ناکەیت. توخوا هیچ کارت بەمن نەبێت.

لێبگەڕێ بابڕۆم. ئەگەر من بگریتو بمدەیتە دەستیان لەسێدارەم بدەم چیتپێدەبڕێت؟ ئەگەر لەسێدارەم بدەن. حکومەت چیپێدەبڕێت؟"

"هۆی حەسەن پێتدەڵێم جەنگ تەواو بووە، سوڵتان هەڵات، لەجێگای ئەو کۆمار دامەزراوە. مستەفا کەمال پاشاش سەرکۆمارە، ئیدی هیچ جەنگێك لەگۆڕێ نیە".

"وای کوڕە باش باشەکەی خۆم، تۆ باڵات کردووە، بەڵام عەقڵت عەقڵی منداڵێکە. باش گوێ لەقسەکانم بگرە، جەنگ هیچکات تەواو نابێت. باش گوێ لەقسەکانم بگرە. ئەو کەسانە شێتن، هەر جەنگێك تەواو بوو هەر ئەو کەسە شێتو خوێنمژانە یەکسەر جەنگێکی دیکە هەڵدەگیرسێنن.

مرۆڤ وەك گورگ وایە. ئەو کەسانە گورگی لموز بەخوێنن. تاکو یەکدی نەخۆن ئارام ناگرن. لێبگەڕێ با من بڕۆم. خانووشم پێناوێت. ناسنامەشم ناوێت. لێبگەڕێ با بڕۆم". بەخێرایی هەنگاوی ناو چووە سەر ئەسکەلە پویرازیش بەدوایدا هاتو لەبەرامبەریدا راوەستا.

"بوەستە بزانم تۆ بەردەوام لەنێو دەریاکان بوویتو ئاگات لەهیچشتێك نیەو هیچیشت نەبینیوە. بوەستە بزانم چیدەڵێم، وەرە با لێرە دابنیشینو قسان بکەین. ئەگەر نەمتوانی دڵنیات بکەمەوەو ئەگەر نەتتوانی متمانەم پێبکەیت ئازادی بڕۆیتو

ڕێگا کراوەیە دەڕۆیت بەخێرو سلامەت. تا ماوی هەر دەتوانیت بڕۆیتو هەر جێگایەکت ویست هەر دەریایەکت ویست دەتوانیت بچیتە ئەوێ. کاتێکیش ئەو دەریایانە دەبینیت دڵت لەترسان دەتۆقێتو خۆت فڕێدەدەیتە نێو دەریا. ترس مرۆڤ زوو لەپەلوپۆ دەخات. من وا پێتدەڵێم جەنگ کۆتایی هاتووە. پێتدەڵێم من خۆم کێشەی سەربازیەکەت بۆ چارەسەر دەکەم".

بەددان گڕساندنێکەوە درێژەی بەقسەکانی دا: "پێتدەڵێم جەنگ تەواو بووە".

"باپیرەمیان بردەسەربازی، ناردیانە ناو کوورەی جەنگ، نەگەڕایەوە. خاڵەکانو مامەکانیان بردە سەربازیو ناردنیانە نێو جەنگ، هیچکامیان نەگەڕانەوە. باپیرەم کە بۆم باس کردیت، براو برازکانی ئەویشیان بردنە سەربازی لە هەموویان تەنها یەك کەسیان گەڕاوەتەوە ئەویش بەخۆی قاچێکی لەبنەوەڕا بڕدراویەوە. باپیری باپیرەمو باپیری ئەویش هەروا. ئێمە سێ برابووین هەردوو برا گەورەکانمیان بردنو پاشان پلاکە سەربازیەکەیان هاتەوە. یەکێك لەکوڕە خاڵەکانم بەچاوانی کوێرەوە گەڕایەوە. لەگوندەکەی ئێمەدا نزیکەی هەموو ئەو سەربازانەی کە گەڕاونەتەوە کەمئەندامن. قسەکانمت بیست گەورەم؟ لەلای ئێمە زۆر کەس بۆ ئەوەی نەچنە سەربازی رایانکردووەو چوونەتە سەرچیاکان، زۆر لەوانەیان گرتنو جارێکیش زۆر لەو راکردوانەیان لەنێو بازاڕە درێژەکەی شارۆچکەکەمان لەمسەر بۆ ئەوسەر بەسێدارە هەڵواسین. رەنگبێت سەد کەس بووبن".

"تۆ چۆن نەکەوتیتە داویان؟"

"بەهۆی عەقڵو وریاییەوە، بینیم ئەوانەی دەچنە چیاکان دەگیرێن. بۆیە من ڕێگای نێو دەریام گرتەبەر. لەو رۆژەوە من هەر لەنێو دەریا دەژیم. عەقڵیان پێی نەشکاوە لەنێو دەریا بەدووی سەربازانی راکردوودا بگەڕێن. لەوەتەی لەنێو دەریام تا ئێستا کەس لێینەپرسیومە لەکوێ دێیت، دەچیتە کوێ، کێیتو چ کارەیت".

"سەیر بکە. باش گوێ لەو قسانەم بگرە، بەدڵو گیان گوێم لێبگرە، لەم وڵاتەدا بەم گەورەییەی، نیوەی خەڵکەکە سەربازانی هەڵاتوون. ئەگەر ئەو سەربازە هەڵاتووانە نەبان ئێستا لەم وڵاتەدا پیاوێکت نەدەبینی. ئێستا ئێمە کەسانێکی هێندە داماوو بێچارەین کە دیارنەمانی یەکێکی وەکو من هیچ کێشەیەك بۆ وڵاتەکەمان دروست

ناکات. حکومەت چۆن دەتوانێت ئەو هەموو خەڵکە لەسێدارە بدات. لەسێدارەیان بدات ئیدی لەم وڵاتەدا پیاوێك نامێنێتەوە. ژنەکانیش ئەگەر نەتوانن منداڵ بخەنەوە حکومەت سەرباز لەکوێ پەیدا بکات؟"

عەریف حەسەن قسەی پویرازی بڕی:

"راستە ئەگەر ژنەکان منداڵیان نەبێت حکومەت ناتوانێت پیاو بۆ جەنگ ئامادە بکات، واتە تۆ دەڵێیت ژنەکان سەرباز دێننە دونیا؟"

پویراز گوتی: "نایهێننە دونیا؟".

"هاااا تێگەیشتم. ئەگەر ژنەکان سەرباز نەخەنەوە کەس ناتوانێت جەنگ هەڵبگیرسێنێت. ئۆووە، ئەمە زۆر باشە ئیدی ناتوانن پیاوێك بدۆزنەوە، تەنانەت ئەگەر بشیدۆزنەوە ئەو هەموو پارەیە لەکوێ دێنن پێیبدەن. پیاوێك دەتوانێت چەند لەژنەکان ئاوس بکات، ئاوی پشتی پیاو چارەسەر نیە، تۆ دەتەوێت چیبکەیت کە لەسێدارەم نەدەن؟"

"ئەمە کارێکی ئاسانە. ئەو پاشایەی کە سمێڵی وەکو کلکی رێویە دۆستو برادەرێکی زۆری لەشارۆچکە هەن".

"ئەو پاشایە دەتوانێت چیبکات؟"

پویراز بەدرێژی لەبارەی عوزێرخان، خانی دێرینی چەچەنی، مەئموری فەرمانگەی نفوسی ئێستا قسەی بۆ حەسەنی سەربازی هەڵاتوو کرد. بۆی باسکرد کە ئەو دۆستو برادەری دەستڕۆیشتووی هەن. باسیکرد کە دۆستەکانی ئەو دوای کۆتاییهاتنی جەنگ هیچ کەسیان لەسێدارە نەداوە. باسیکرد کە لەجەنگدا کەسانێکی زۆر کوژران. باسیکرد کە دامەزرێنەرانی کۆمار لەسێدارەدانی هەڵاتووانی دوای جەنگ بەکارێکی نادروست دەزانن‌و هەموو ئەو شتانەی بۆ باسکردو باسکرد تا عەریف حەسەنی رازیکرد.

گوتی: "تۆ کەسێکی لەبەرەی ئەللاهوئەکبەر گەڕاویتەوە. تۆ نەك هەر لەسێدارە نادرێیت، بەڵکو بەوپەڕی میهرەبانیەوە هەڵسوکەوتت لەگەڵدا دەکەن". هەروەها باسی رەمزی کاولاکزادەی بۆ کرد. باسیکرد کە ئەویش سەربازی هەڵاتووەو هەمووانیش ئەوە دەزانن. باسیکرد کە ئێستا نووری چاوی حکومەتە.

حەسـەن کـە شـەلاڵی عارەقـە بووبـوو، دوای ئـەوەی کـە ماوەیـەك سـەری لەبـەرخۆی نایـەوەو دەفکـرەوە راچـوو، گـوتی: "باشـە، بـاوەڕ بەقسـەکانت دەکـەم. متمانـەت پێدەکـەم گفتم پێبدە ئەگەر نەتتوانی دەربازم بکەیت لێنەگـەڕێیت لەسـێدارەم بـدەن. کارێـك بکـە کە لەجیاتی لەسێدارەدان گولله بارانم بکەن. گفت دەدەیت؟"

پویراز بەپێکەنینەوە گوتی: "گفت دەدەم".

"باشە، دەچمە شارۆچکە، بەڵام بـەو مەرجـەی تـۆم لەگـەڵ بێیـت، ئەگـەر تـۆم لەگـەڵ نەهێیت ناچمە هیچ جێیەك، لێرەش رادەکەم".

پـویراز حەسـەنی زۆر کەوتـە بـەردڵ. ئـەویش وەکـو نیشانچـی لایـەنێکی جـادوویی تێدابوو. لەدەریای رەشەوە، ئەو دەریایە گەورەیەڕا هاتووە تا گەیشتۆتە ئێرە.

"ئەگەر تۆم لەگەڵدا نەبێت، ئەوان ئـەو بەخوێنتینوانـە دەمگـرنو لەسـێدارەم دەدەن. مخابن نیە بۆ من؟ ئەو هەموو ماوەیە رامکردووەو گیانی شیرینی خۆم دەرباز کردووە".

پویراز گوتی: "مخابنە، لەگەڵت دێم بۆ شارۆچکە".